

# ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ

## لە قورئان و فەرموودەکاندا

محمد ملا فائق شارەزووری





# پێناسی کتێب


**ناوی کتێب:** ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودەکاندا

**نوسەر:** محمد ملا فائق شارەزووری

**تایپ و دیزاین:** ئومێد محمد

**ساڵی چاپ:** ٢٠٢٣ز- ١٤٤٥ك

**تیراژ:** ٢٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١١٣٨) ی ساڵی (٢٠١٧) پێ دراوە.



بۆ گەیاندنی هەر سەنج و تێبینیەك دەتوانن

پەیوەندی بەم ژمارە موبایلەوە بکەن

(٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥)




# ژیانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

## لە قورئان و فەرموودەکاندا

نووسینی

محمد مەلا فائق شارەزووری

بەرگی یەکەم



# پێشەکی

إنَّ الحمدَ للهِ، نَحْمَده ونستعينهُ ونَستغفرهُ، ونعوذُ باللهِ مِنْ شرورِ أنْفُسِنا وَسَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فلا مُضلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِل فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ لاإلهَ إلا الله وَحْده لاشَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْده وَرَسُولُه.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ (النساء).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأحزاب).

أما بعد فإن أصدق الحديث كتابُ الله، وخير الهدى هدى محمد ﷺ وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار[1].

خوێندن و ناسینی ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویست ﷺ یەکێکە لەو زانستانەی کە پێویستە موسوڵمان بیزانێت، خوای گەورە ژیاننامەی پێغەمبەرانی ﷺ بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕوونکردۆتەوە وەکو دەفەرموێت: ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ....﴿١١١﴾ ﴾ (یوسف) واتە: بەدڵنیایی لە ناسینی ژیانی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن بیروهۆشن، ئەگەر پێویست بێت لەسەرمان ژیاننامەی پێغەمبەران بزانین ئەوا زیاتر پێویستە کەلە نزیکەوە بەئاگابین لە ژیانی پێغەمبەری خۆمان ﷺ، خوای گەورە سوودی بە ئاگابوونمان لە ژیاننامەی پێغەمبەران بۆ ڕوون دەکاتەوە وە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ

---

(١) هذه خطبة الحاجة التي كان الرسول ﷺ يفتح بها خطبة ويعلمها أصحابه وروي هذه الخطبة ستة من الصحابة ﷺ وقد أخرجها جمع من الأئمة في مصنفاتهم، مثل: الامام أحمد في (المسند) (٢٧٢/٥)، ومسلم في (الصحيح) (٤٦٧/٢،٥٩٢)، وفي (١٥٧/٦،١٥٦،١٣٥) (بشرح النووي)، وأبو داود في (السنن) (٢٨٧/١) (١٠٩٧)، والنسائي في (المجتبى) (١٠٥/٣،١٠٤) و (١٨٨/٣)، وابن ماجه في (السنن) (١٨٩٢)، والحاكم في (المستدرك) (١٨٢/٢،١٨٢)، والطياليسي في (المسند) (٣٣٨)، والبيهقي في (السنن الكبري): (١٤٦/٧) و (٢١٤/٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجه) (١٥٣٥)، و في (صحيح النسائي) (١٣٣١)، وفي (المشكاة) (٣١٤٩)، وفي (الكلم الطيب) (٢٠٥)، وانظرها بتوسع في (خطبة الحاجة) (ص:١٤،١٩).

بِهِۦ فُؤَادَكَ ....﴿١٢٠﴾ (هود) واتە: بە سەرهاتی پێغەمبەرانی پێشووتر دەگێڕینەوە بۆ تۆ ئەی محمد بۆ ئەوەی دڵت ئارام و جێگیر بێت، وە بزانیت ئەوەی کە بەسەر تۆدا هاتووە پێشتریش بەسەر پێغەمبەرانی پێش تۆدا هاتووە.

وە بۆ ئەوەی بزانیت ئەوان ژیانیان چۆن بردۆتەسەر، چۆن ڕووبەڕووی بێ باوەڕان بوونەتەوە، بۆ ئەوەی موسوڵمانیش بزانێت پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ چۆن ژیانی بردۆتە سەر و ئاینی ئیسلامی چۆن بڵاوکردۆتەوە.

دەتوانین بڵێین شارەزابوونمان لەسیرە و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سوودانەی خوارەوەمان دەست دەخات:

١- فێربوونی بەندایەتی وچەسپاندنی بۆ خوای گەورە، لە سیرەوە فێردەبین کە بیروباوەڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و یارانی چۆن بووە، لە هەمان کاتدا بیروباوەڕی کافران و دووڕووەکان چۆن بووە ئەو کاتە زیاتر لەعەقیدە و باوەڕمان حاڵی دەبین و لە بارودۆخ و هاوچەرخی خۆمان باشتر ئاگادار دەبین.

٢- هەر لە سیرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤێکی ئاسایی بووە، بەڵێ پێغەمبەری خوا بووە بەڵام وەك کەسانی تر مرۆڤ بووە، ترساوە و گیروگرفتی دونیایی بە سەردا هاتووە، خاوەن خێزان ومنداڵ بووە، ڕابەر و پێشەوا و دادوەر بووە.

٣- ناسینی مامۆستا و نمونەی پێشەوایەتیە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الأحزاب) واتە: پێغەمبەری خوا باشترین سەر مەشق و نموونەتانە کە چاوی لێ بکەن. بێ گومان تا ژیاننامەی پێغەمبەرەکەمان ﷺ نەزانین و نەیناسین، نازانین چۆن بیکەین بەنمونەی خۆمان، چۆن سونەتەکانی جێ بەجێ بکەین و ئاینەکەی بەر قەرار بکەین.

٤- هەر لە سیرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە قۆناغەکانی بانگەوازی ئیسلام چۆن بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن لە قۆناغی نهێنییەوە گەیاندیە قۆناغی ئاشکرا، چۆن بەرەنگاری دوژمنان بوونەوە، و شێوازەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ بێ باوەڕان و دووڕووەکان چۆن بووە، چۆن توانیویەتی بەرپەرچی هەموو ئەو دژایاتی و توانج و ڕەخنەو گومانەکانیان بێتەوە.

٥- هەر لە ڕێگەی سیرەوە چەندەها زانیاری و زانستی شەرعی فێر دەبین وەك:

- زانستی هۆیەکانی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان (أسباب النزول).
- زانستی ناسینەوەی (ناسخ) و (المنسوخ).
- زانستی ناسینی مانا و ناوەڕۆکی ئایەتەکانی قورئان و چۆنێتی جێ بەجێ کردنیان.
- زانستی ناسینی هۆکارەکانی وتنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ وە هۆی هاتنی (اسباب الورود)ی چی بووە؟.

٦- ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ پەند و ئامۆژگاریەکی یەکجار گەورەیە بۆ هەموو مرۆڤێك لێوەی فێردەبێت.

أ- گەر باوك بوو چۆن باوکایەتی بکات.

ب- گەر مێرد بوو چۆن مێردایەتی و مەردایەتی جێ بەجێ بکات.

ج- گەر سەرکردە بوو چۆن سەرکردایەتی بکات.

د- گەر (موفتی) بوو چۆن فتوا بدات.

ه- گەر دادوەر بوو چۆن دادوەری بکات.

و- گەر مامۆستا بوو چۆن مامۆستایەتی بکات...... هتد.

٧- ئیمامی زەرقانی ﵀ لە کتێبەکەیدا ((شرح المواهب)) دەفەرموێت:

١- لە زەین و لعابدینی عەلی کوڕی حسین ﵁ دەگێڕێتەوە کە چۆن لە زەمانی خۆیدا گرنگی دراوە بە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێت: (كُنا نَتعلمُ مَغازي رسول الله ﷺ كما نَتعَلمُ السورةَ مَنْ القرانِ) واتە: لەزەمانی ئێمەدا چۆن سورەتی قورئانیان فێردەکردین، هەرواش باوانی بەڕێزی ئێمەش ژیاننامەی پێغەمبەریان ﷺ فێردەکردین.

٢- ئیسماعیلی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەفەرموێت: باوکم هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ بوو ژیان وغەزاکانی پێغەمبەری خوای فێر دەکردین و دەیفەرموو: (يا بُنَيَ هذهِ شَرَف آبائكَ فلا تَضيعْ ذِكْرُها) واتە: ئەی کوڕم ئەمە ڕێزو سەربەرزی باوباپیرتانە بە هیچ جۆرێك لە بیری نەکەیت.

٣- زانای پایەبەرز ئەبو شەهابی زوهری ﵀ سەبارەت بە زانستی (السيرة) دەفەرموێت: ((عِلمُ السيرةِ عِلمُ الدُنيا والآخِرة)) واتە: زانستی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوی ناسینی زانیاریەکانی هەموو دنیاو قیامەتە.

# چۆنێتی نووسینی ئەم ژیاننامەیە

لە نووسینە ئەم ژیاننامەیدا ئەمانە ڕەچاوکراوە:

١- کۆکردنەوەی سەرجەم باسەکان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

٢- کۆکردنەوەی سەرجەم باسەکان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و نووسینی بەم جۆرەی خوارەوە:

أ- زیاتر پشتبەستن بە فەرموودە (صحیح)ەکان، و هێنانی هەندێك فەرموودە و (أثر)ی (ضعیف) ئەویش تەنها بۆ بەئاگابوون لێیان و زیاتر دەوڵەمەندکردنی باسەکە.

ب- دیاری کردنی هەموو سەرچاوەکان وپلەی فەرموودەکان.

ج- سودوەرگرتن لە (تخریج، تحقیق)ی هەموو زانایانی فەرموودەناس لە کۆن و تازە، بەلە بەرچاوگرتنی بەهێزترین (حکم) لەبارەی ئەو فەرموودانەوە.

د- کۆکردنەوە و ڕێکخستنی باس و بەسەرهاتەکان لەسەرجەم سەرچاوەکاندا. بۆ نموونە لای (ئیمامی موسلیم) بە (٦ لفظ) هاتووە، وەلای (ئیمامی بوخاری)بە (٣ لفظ) وەلای (ئیمامی ئەبوداد) بە (٤ لفظ) وەلای (ئیمامی طەبرانی) بە (٢ لفظ) هەروەها..... لەپێشدا هەر (٦) فەرموودەکەی (ئیمامی موسلیم) ڕێکخراوە پاشان (٣) فەرموودەکەی (ئیمامی بوخاری) ڕێکخراوە...... وە هەورووەها لە دوایدا هەموو ئەو فەرموودانە ڕێکخراون وەك بەسەرهاتێکی تەواو تۆمارکراون.

٣- کۆکردنەوەی باسەکان لەسەرجەم سەرچاوەکانی (السیرة) ژیاننامە. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

أ- زیاتر پشت بەستراوە بە (حدیث) واتە: فەرموودە، نەك بە (روایة أهل السیرة) واتە: گێڕانەوەکانی ژیاننامە نووسان.

ب- ڕێکخستنی گێڕانەوەکانی ژیاننامە بەگوێرەی کۆنترینیان بۆ نموونە:

سەرەتا کەڵك وەرگیراوە لە گێڕانەوەی عوروەی کوڕی زوبەیر پاشان موسی کوڕی عوقبە پاشان ئەبو شیهابی زوهری پاشان ئیبنو ئیسحاق پاشان ئیبنو هیشام (خوا لەسەرجەمیان ڕازی بێت) هەروەها.......

ج- ئەگەر بەسەرهاتێك لە دوو سەرچاوەی سیرەدا بە دوو جۆر هات بێت زیاتر پشت بەسراوە بەڕاست ترو بەهێزترینیان.

د- ڕێکخستنی بەسەرهات و ڕووداوەکە لەسەرجەم (روايات أهل الحديث) پاشان ڕێکخستنیان لەگەڵ سەرجەم (روايات أهل السيرة).

٤- لابردنی زۆرێك لە (شعر) و (ناو) کە بایەخی زۆری نەبێت بۆ باسەکە.

٥- دارِشتن و نوسینەوەی باسەکان بە شێوازی (أهل السير والمغازي) نوسراوەتەوە.

٦- سەرجەم بەسەرهات و ئەو ڕیوایەتانەی کە لەم ژیاننامەدا هاتووە دەقاو دەق لە دەمی ئەو کەسانەوە وەرگیراوە کە خۆیان ئامادەی بەسەرهاتەکە بوون و بەشێوە و زمانی ئەو کاتەی خۆیان دەیگێڕنەوە، و منیش بە بێ دەستکاری وەرم گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی تام و چێژی مێژوویی قسەی ئەو کاتە وەکو خۆی بمێنێتەوە.

باوکی عبدالله

موحەمەد مەلا فائق شارەزووری

١١/ شعبان/ ١٤٢٢

## نەسەبی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبولقاسم محمدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدول موطەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدول مەنافی کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕەی کوڕی لوئەی کوڕی غالیبی کوڕی مالیکی کوڕی نەضری مەدرەکەی کوڕی خوزامەی کوڕی ئلیاسی کوڕی مەضری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە)[٢]. زانایان دەڵێن ئەوەی لەدوای عەدنان باس کراوە لەنەسەبی پێغەمبەر ﷺ ڕاست نی یە وەك ئیمامی (بەغەوی) دەفەرموێت: تا وەکو عەنان هیچ جیاوازیەکی تێدا نیە لە ڕاوبۆچوونی زاناکاندا بەڵام لەدوای عەدنانەوە ڕاوبۆچونی جیاواز هەیە لە ناویاندا، هەروەها وەك لە پەراویزەکەدا ئامازەی بۆ کراوە. پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە ناردنی لە چاکترین تیرە و هۆزدا ئەم ڕاستیانەی خوارەوە ڕوون دەکاتەوە:

١. وائیلی کوڕی ئەسعەف ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى مِنْ وَلَدِ إِبْرَاهِيمَ إِسْمَاعِيلَ , وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي إِسْمَاعِيلَ بَنِي كِنَانَةَ , وَاصْطَفَى مِنْ بَنِي كِنَانَةَ قُرَيْشًا , وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ , وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ)) واتە: (خوای گەورە لە کوڕانی ئیبراهیم ئیسماعیلی هەڵبژاردووە لە کوڕانی ئیسماعیلیش کینانەی هەڵبژارد وە لە کینانەش قوڕەیشی هەڵبژارد، وە لە قوڕەیشیش بەنی هاشمی هەڵبژارد، وەلە بەنی هاشمیش منی هەڵبژارد)[٣].

٢. ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((بُعِثْتُ من خيرِ قُرونِ بَنِي آدَمَ قَرْنًا فقَرْنًا ، حتى كُنتُ من القَرْنِ الذي كُنتُ فِيهِ))[٤] واتە: (نێرراوم لە چاکترین زەمان و سەدەی کوڕانی ئادەمدا سەدە لە دوای سەدە تا ئەو سەدە و کاتەی کەمنی تێدا نێردراوم).

---

(٢) أخرجه: البخاري (٣٨٥١)، وأحمد في (فضائل الصحابة) (٩٢٩) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال البغوي في (شرح السنة) (١٩٣/١٣) لا يصح النسب فوق عدنان، وقال ابن قيم في (زاد المعاد) (٧٠/١) بعد ذكر نسبه إلى عدنان: إلى ها هنا معلوم الصحة متفق عليه بين النسابين و لاخلاف فيه البته و فوق عدنان مختلف فيه، وابن سعد في (الطبقات)(٤٨/١) وابن الجوزي في (الوفا) (٦٣) وقال: ما وجدنا أحد يعرف ما وراء قعد عدنان، وقال البيهقي في (دلائل النبوة) (١٨٠/١) و كان أبو عبدالله (حاكم) يقول: نسبة رسول الله ﷺ صحيحة إلى عدنان و ما وراء عدنان فليس فيه شيء يعتمد عليه.

(٣) أخرجه: مسلم (٢٧٧٦)، والترمذي (٣٦٠٩)، وأحمد (١٠٧/٤)، وأبو يعلى(٣٥٢/١)، والطبراني في (الكبير) (١٦١/١٢)، والبيهقي في (الدلائل) (١٦٥/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٨٥٥)، وفي (السلسلة الصحيحة) (٣٠٢)، وصححه الشيخ الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٤٤/٣).

(٤) أخرجه: البخاري (٣٥٥٧)، وأحمد (٤١٧/٥).

ئەبو سفیان پێش موسوڵمان بوونی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دوای ئەوەی چوومە لای هێرقل پرسیاری لێ کردم لەبارەی نەسەبی پێغەمبەرەوە ﷺ منیش لەوەڵامدا وتم: پێغەمبەری خوا نەسەبێکی پایە بەرزی هەیە، هێرقلیش پێی ڕاگەیاندم وتی: (نَسَبٍ، فَكَذلكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي نَسَبِ قَوْمِهَا)[٥]. واتە: پێغەمبەران هەموویان سەرجەم لە نەسەبی بەرزی قەومی خۆیاندا دەنێرێن.

پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خۆشمان ﷺ هەر لەپێش دروست بوونی ئادەمەوە ؑ خوای گەورە ئەو بڕیارەی لەسەر داوەو لە (لوح المحفوظ)دا نووسیویەتی. بەڵام وا تێنەگەین کە پێغەمبەری خۆمان ﷺ لە پێش ئادەمدا ؑ خوای گەورە کردوویەتی بە پێغەمبەر بەڵکو لە سەدە و کاتی دیاری کراوی خۆیدا بووە.

ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (متى وَجَبَتْ لك النُّبوَّةُ؟) واتە: کەی پێغەمبەرایەتیت بۆ مسۆگەر بووە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە. فەرمووی: ((وآدمُ بينَ الرُّوحِ والجسَدِ))[٦] واتە: لەو کاتەی کە ئادەم هێشتا لە نێوان ڕۆح و لاشەدا بوو. واتە: پێش ئەوەی خوای گەورە ئادەم بە تەواوی دروست بکات من بووم بە پێغەمبەر. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: ((إنِّي عندَ اللهِ مَكْتوبٌ خاتَمُ النَّبيِّينَ، وإنَّ آدَمَ لَمُنجَدِلٌ في طِينَتِه))[٧] واتە: من لەلای خوای گەورەوە نوسرابووم کە دواهەمین پێغەمبەرم، هێشتا ئادەم لە قوڕەکەیدا بوو.

---

(٥) أخرجه: البخاري (٧٥)، وأحمد (٢٣٧٠)، وأبو داود (٥١١٤)، والترمذي (٢٨٦٠)، وابن حيان (٦٥٥٥).

(٦) أخرجه: أحمد (٥٩/٥) (١٦٦٢٣) وقال محققه: إسناده صحيح، والترمذي (٣٦٠٩)، والطبراني في (الكبير) (٨٣٤/٢)، وابن أبي عاصم في (السنة) (٤١٠)، والحاكم (٦٠٨/٢)، وصححه ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير في (السيرة) (٣١٨/١): إسناده جيد، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٨٥٦)، وفي (السلسلة الصحيحة) (١٨٥٦)، وفي (المشكاة) (٥٧٥٨)، وفي (ظلال الجنة) (١٤١٠).

(٧) أخرجه: أحمد (١٢٧/٤) (١٧١٥٠) وقال محققه: حديث صحيح، والطبراني في (الكبير) (٢٥٢/١٨)، وابن حبان (٦٤٠٤)، وصححه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٥٧٥٩).

## مژدەی ناردنی پێغەمبەر ﷺ

ئەبو ئومامە دەفەرموێت: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سەرەتای پێغەمبەرایەتیت چۆن بوو؟) فەرمووی: ((دعوةُ أبي إبراهيمَ ، وبِشارةُ عيسى بِي ، ورُؤيا أُمِّي التي رَأَتْ ، وكذلك أُمَّهاتُ النَّبِيِّينَ))[8]. واتە: (سەرەتای پێغەمبەرایەتیم دوعای ئیبراهیمی باوە گەورەم بوو، وە مژدەی عیسا بوو، وە دایکم کاتێ منی لە سکدا بوو بینی نورێك لێوەی دەردەچوو هەموو کۆشکەکانی وڵاتی شامی ڕوناك دەکردەوە، بەهەمان شێوە دایکی پێغەمبەران).

جولەکەکانیش پێش هاتنی پێغەمبەری خودا ﷺ بە گوێی عەرەب و خەڵکانیان دەدا: کە ئێستا ئەو کاتە نزیکە خوای گەورە پێغەمبەری کۆتایی زەمانی تیا بنێرێت، وە ئەگەر بەرچاویان بکەوتایە دەیان ناسی بەوە وەکو چۆن کوڕانی خۆیان دەناسی بەوە ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَهُمۡ ..... ﴿١٤٦﴾﴾ (البقرة). واتە: ئەوانە کە کتێبمان بۆ ناردوون (جولەکە و گاور) پێغەمبەر ﷺ دەناسنەوە وەکو چۆن کوڕانی خۆیان دەناسنەوە. ئەویش بەو شێوە و باسەی کە خوای گەورە لە تەورات و ئینجیلدا باسی کردووە، وە جولەکەکانی ناو شاری مەدینە زوو زوو مژدە یان بەخەڵکی ئەو شارە دەدا کەکاتی هاتنی ئەو پێغەمبەرە نزیك بووەتەوە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە سەلەمەی کوڕی سەلامەوە دەفەرموێت: (دراوسێ یەکی جولەکەمان هەبوو لە کوڕانی بەنی ئەشهەل ڕۆژێك هاتە دەرەوە و لای کۆمەڵێك لە بەنی ئەشهەل وەستا. من ئەو ڕۆژە زۆر منداڵ بووم، بوردەیەکم لەسەر شان بوو پاڵم دابوو بە دیوارەکەی ماڵی خۆمانەوە، ئەو جولەکەیەش هات بۆ لامان و باسی قیامەت و حساب و میزان و بەهەشت و دۆزەخی دەکرد، و ئەمانەی بە کەسانێك دەوت هاوبەش پەیداکەر بوون وە بێ ئاگابوون، کەسانێك بوون نەیان دەزانی کە مردن و زیندووبوونەوە چی یە؟ وە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نەبوو

---

(٨) أخرجه: أحمد (٣٦٢/٥) (١٧١٥١) وقال محققوه: حديث حسن، والبزار (٢٣٦٥)، والحلية (٨٩/٦)، والطبراني في (الكبير) (٧٧٢٩)، والبيهقي في (الدلائل) (٨٤/١)، والحاكم (٦٠٠/٢)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان في (الصحيح) (٢٠٩٣)، والبغوي (شرح السنة) (٣٦٢٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٢٢/٨): إسناد أحمد حسن، وقال ابن كثير في (البداية) (٢٥٦/٢): إسناده قوي جداً، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٥٤٥).

ئەوانیش پێیان وت: ماڵت ئاوا بێت فلان کەس تۆ بڵێی خەڵکان دوای مردن زیندوو ببنەوە پاشان بڕۆنە جێگایەك کە بەهەشت و دۆزەخی تێدایە و سزاو پاداشتی کردەوەکانی دنیایانی تیادا وەرگرن؟. ئەویش وتی: بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەوە دەبێ و ڕاستە، خۆزگە دەخوازم تەنورێك بە ئەندازەی هەموو دنیا بێت وە بە ئەندازەی هەموو دنیاش داری تێدابێت، وە من فڕێبدرێمە ناوی و سەرەکەی قەپات بکرێت، خۆزگە دەخوازم بچمە ناو ئەو تەنورەوە و نەچمە ناو ئەو دۆزەخەوە کە لە دوای زیندووبونەوە هەیە، دوایی پێیان وت: ئەی فلان کەس نیشانەی ئەوەی تۆ دەیڵێیت چی یە؟ کەدێت؟ ئەویش وتی: پێغەمبەرێکی نێرراوە لە ئەم وڵاتانەوە (پەنجەی درێژ کرد بۆ لای شاری مەککە و یەمەن) وتیان: تۆ بڵێی کەی بێت؟ ئەویش سەیری منالێکی کرد کە دانیشتبوو وتی: پێ ناچێت ئەمە تەمەنی تەواو بێت تا بەو پێغەمبەرە نەگات، سەلەمە دەفەرموێت: وەڵاهی شەو و ڕۆژێك تەواو نەبوو تاپێغەمبەر ﷺ لە ناوماندا دەرکەوت و باوەڕمان پێی هێنا و جولەکەکان کافربوون و باوەڕیان پێ نەهێنا لە حەسوودی خۆیاندا، وە دەفەرموێت: دوایی بەو کابرا جولەکەمان وت کە ئەوانەی بۆ دەگێڕاینەوە: ئەی تۆ نەبوویت باسی ئەو پێغەمبەرەت بۆ دەکردین؟ وتی: بەڵێ، بەڵام ئەو، ئەو پێغەمبەرە نی یە کە من بۆم باس دەکردن)[٩].

هەروەها زانایانی شارەزای گاورەکان بەهەمان شێوە مژدەیان داوە بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو سەلمانی فارسی ﷺ دەفەرموێت: (ئەوە بوو دوا مامۆستام کە چوومە لای بۆ ئەوەی ئامۆژگاریم بکات پێم وت: کێ هەیە لە سەر ئاینی ڕاستەقینەی عیسا ﷺ ما بێت لە سەر زەویدا تا منیش بچمە لای و خزمەتی بکەم، و ئاینی لێوە فێربم؟) ئەویش وتی: ((بُنَيَّ، واللهِ ما أعلَمُه أصبَحَ اليوم أحَد على مِثْلِ ما كُنَّا عَلَيْهِ مِنْ النَّاسِ آمُرُكَ بِهِ أنْ تَأتِيه...الخ)) واتە: کوڕەکەم وەڵاهی کەس شك نابەم لەسەر زەویدا مابێت لەسەر ئەو ئاینە بێت کە من و تۆی لەسەر بووین تا بتنێرم بۆ لای بەڵام وا نزیك بۆتەوە کاتێ هاتنی پێغەمبەرێك کە لە حەرەمدا دەنێردرێت بە ئاینی ئیبراهیم ﷺ وە کۆچ دەکات بەرەو شوێنێکی دوو بەرزایی لە ناوچەی عەرەبەدا کە

(٩) أخرجه: ابن هشام في (السيرة النبوية) (٢٥٦/١)، وأحمد في (المسند) (٤٦٧/٣) (١٥٨٤١) إسناده حسن والبخاري في (التأريخ الكبير) (٦٨/٤)، والحاكم في (المستدرك) (٤١٧/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي والطبراني (الكبير) (٦٣٢٧)، والبيهقي (الدلائل) (٧٨/٢)، وحسن إسناده محققاً (السيرة النبوية) لابن هشام (٢٥٦/١)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٤٤٣): حديث حسن.

پڕ لە دارخورمایەو نیشانەیەکی هەیە کە پێی دەناسرێتەوە. دیاری وەردەگرێت و خێر و یارمەتی وەرناگرێت، لە نێوان هەردوو شانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی پێوەیە. ئەگەر توانات هەیە بگەی بەو وڵاتە پێش ئەوەی خوای گەورە بینێرێت، تۆ بگەرە ئەو وڵاتە تاکو بچیتە خزمەتی و بە دیداری شاد ببیت)[١٠].

## هەڵکەندنی بیری زەم زەم

عەبدول موطەلیب یەکێك بوو لە پیاوە ڕیش سپی و ناودارەکانی قوڕەیش، باپیری پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە خەویدا، خەوی بینی پێی وترا کە هەستێ بە هەڵکەندنی بیری زەمزەم وە شوێنەکەی بۆ دیاری کرا؛ چونکە بیری زەمزەم دوای پێغەمبەر ئیسماعیل عليه السلام پڕبووبووە وە و کەس نەیدەزانی ئەو بیرە شوێنەکەی لە کوێ دایە تا دەری بدەن و تازە ببێتەوە و پڕ ئاو بێت.

بەسەر هاتی ئەم خەوەی عەبدول موطەلیب. ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیب رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە بۆمان لەسەر زمانی عەبدول موطەلیب و دەفەرموێت: (من کاتێ خەوتبووم لە پەنا کەعبەدا یەکێك هات بۆ لام وتی: هەستە پاکەکە هەڵکەنە! وتم پاکەکە چی یە؟ خەوەکەم نەما هەستام بۆ بەیانی گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم لەوێدا خەوتم و لە خەومدا هەمان دەنگی پێشوو هاتەوە گوێم وتی: هەستە پڕ خێرەکە هەڵکەنە! وتم: پڕخێرەکە چی یە؟) و دەنگەکە نەما منیش بە ئاگاهاتم، دەفەرموێت: بۆ ڕۆژی (سێ یەم) هاتمەوە و خەوتم وە هەمان دەنگ هاتەوە و پێی وتم هەستە هەرە گران بەهاو بەسوودەکە هەڵکەنە! وتم: گران بەهاکە چی یە؟ دەنگەکە نەما بۆ ڕۆژی چوارەم هاتمەوە و خەوتم دیسان هەمان دەنگم لە خەودا لێ پەیدا بوو وتی: هەستە زەم زەم هەڵکەنە! وتم زەم زەم چی یە؟ وتی: زەم زەم بیرێکە ئاوەکەی هەرگیز کۆتایی نایەت و کەم ناکات حاجیەکانی ماڵی خوای پێ تێر ئاو بکە لە نێوان خوێن وتەرسەکاندا لای جێ دەنوکی قەلە ڕەشەکە و پەلاویەکەی لای شارە مێرووڵە کە دایە، (واتە: ئەو سێ نیشانەیەی پێدام کە بیرەکە لە وێدایە).

(١٠) أخرجه: أحمد (٥/٤٤٦) (٢٣٧٣٧) وقال محققه: إسناده حسن، والبيهقي في (الدلائل) (٢/٩٢)، والبزار (٢٥٠٠)، وابن هشام (السيرة) (١/٢٦١) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني في (الكبير) (٦٠٦٥)، والحاكم (٣/٦٠٣) وصححه وافقه الذهبي، وابن حبان (٧١٢٤)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٨٩٤)، وقال الشيخ مقبل: في (الصحيح المسند) (٤٤٣): حديث حسن.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرمویێت: (کاتێ شوێنەکەی بۆ ڕوون بووەوە و جێگەکەی پێ نیشان درا بۆی دەرکەوت کە ئەو خەوە ڕاستەو لە لایەن خواوەیە، هەر بەیانی لەگەڵ تاقە کوڕەکەیدا (حارثی کوڕی عەبدول موطەلیب کە ئەو کاتە هەر ئەو کوڕەی هەبوو) هەستا بە پاچ و خاکەنازی خۆیەوە ڕۆیشت بەرەو ئەو جێگەیەی پێی نیشان درابوو کەلە شوێنی قەلەڕەشەکەدا هەڵی کەنێت، وە (دەفەرموێت) کە هەڵی کەند و گەیشتە تەڕایی وتی: (اللّهُ أكبر)، وە قوڕەیش زانیان کە بیرەکەی دۆزیوەتەوە و گەیشتۆتە ئاو. ئەوان هاتن و هەڵیان کوتایە سەری وتیان: ئەی عەبدول موطەلیب ئەمە بیری ئیسماعیلی باوە گەورەمانە و مافی ئێمەشی تێدایە بەشدارمان بکە؟ وتی: نەخێر ئەمە شتێکە تەنها بە من دراوە، و تایبەتە بەمن، وتیان: نەخێر یان دەبێ بەشمان بدەیت یان وازت لێ ناهێنین و دادگاییت دەکەین لای یەکێك، ئەویش وتی: کێ بە دادوەر دەزانن با بچین بۆ لای دادگاییم بکەن، ئەوانیش کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە بچنە لای قەشەیەکی بەنی سەعدی کوڕی هوزەیم لە چوار دەوری شام دا. تا ئەو دادوەریان بێت کە ئەو بیرە مافی کێ یە).

عەبدول موطەلیب خۆی و هەندێ لە پیاوانی عەبدول مەناف لەگەڵ لایەنەکانی تری قوڕەیش وەکو بەنی موغیرە و بەنی عەدی و بەنی عەبدول دار هەر لایەنێك لەمانە چەند کەسانێکیان لێ هەڵبژێررا هەموویان پێکەوە بەرێگادا بەرێکەوتن بەرەو شام کاتێ گەیشتنە جێگەیەکی چۆڵەوانی و بێ ئاو عەبدول موطەلیب و بەنی مەناف ئاویان پێ نەما داوای ئاویان کرد لە هاوەڵانی تریان، ئەوانیش وتیان: ناتوانین ئاوتان بدەینێ چونکە شوێنەکە چۆڵەوانی یە و دەترسین ئێمەش ئاوەکەمان کەم بکات و لە تینوویەتیدا بخنکێین، دەفەرموێت: بەم جۆرە تینوویەتی یەکەش گەیشتە ئەوان و گەیشتە تیرەو هۆزەکانی تر.

عەبدول موطەلیب زانی کە پاش ماوەیەکی تر ئاو دەبڕێت لە هەر هەموویان نەك لەوان بە تەنها بۆیە ڕاوێژی پێکردن وتی: چی بکەین ئێستا؟ ئەوانیش وتیان: بۆچوونمان وەکو بۆچوونی تۆ وایە چی دەڵێیت: با ئەنجامی بدەین؟، عەبدول موطەلیب وتی: من وای بەباش دەزانم هەموو پیاوێك لە ئێمە گۆڕی خۆی بە دەستی خۆی هەڵکەنێت و لەناویدا دابنیشێت و چاوەڕوانی مردن بکات، ئەگەر

مردیش ئەوا یەکێکمان دەبێت پاڵێك بەیەکێکمانەوە بنێت و بیخاتە ناوگۆڕەکەیەوە وە بیشارێتەوە تاکو هەمووومان دەشاردرێینەوە وە دوا کەسمان ئەگەر نەشاردرێتەوە یەکێك دەبێت بیشارێتەوە؛ واتە لە شاردنەوەی یەك کەس چاکترە لە نەشاردنەوەی کۆمەڵێك، دەفەرموێت: هەموویان چاڵیان هەڵکەند و چاوەڕێی مردنیان دەکرد لەناکاو عەبدول موطەلیب وتی: وەڵاهی ئێمە بە دەستی خۆمان خۆمان دەخەینە ناو گۆڕەوە بەڵام با هەستین سۆراخێکی پەیداکردنی ئاو بکەین، بەڕاستی ئەمە بێ دەسەڵاتی یە. هەستن با بگەڕێین بەڵکو خوای گەورە ئاوێکمان پێ ببەخشێت، لە هەندێ جێگەدا، ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە و عەبدول موطەلیبیش وتی: من دەڕۆم، هەر هەڵسا و سواری وشترەکەی بوو لەژێر پێی ڤاچی وشترەکەیدا یەك کانی ئاوی شیرین دەرچوو عبد المطلبیش کە ئاوەکەی بینی وتی: (الله أكبر). هاوەڵەکانیشی بە هەمان شێوە.

پاشان عەبدول موطەلیبیش دابەزی ئاوە شیرینەکەی خواردەوە و کوڕانی بەنی مەناف لێیان خواردەوەو ئەو شتانەی پێیان بوو پڕیان کرد لە ئاو، پاشان داوای لە لایەنەکانی تری ڤوڕەیش کرد کەبێن لەو کانییە تێر ئاو بخۆنەوە و تێرئاوبن ئەوانیش هاتن و تێر ئاویان خواردەوە دوای خواردنەوەی ئاوەکە لایەنەکانی تری ڤوڕەیش وتیان: ((قَدْ وَاللهِ قَضى لَكَ عَلَيْنا يا عبد المطلب)) واتە: وەڵلاهی خوا کارەکەی بۆیەکلایی کردینەوە و بەخشییە تۆ وەڵاهی بەهیچ جۆرێك ململانێت لەگەڵ ناکەین لەسەر ئاوی زەم زەم، ئەو خوایەی لەم زەوی یە چۆڵ و بیابانەدا ئەم ئاوەی بۆ تۆ هەڵقوڵاند هەر ئەو خوایەیە کە زەمزەمی نیشان داویت وە کردوویەتی بەموڵکی خۆت بڕۆ بە دەستی خۆت ئاو ببەخشە زەم زەم تەنها موڵکی تۆیە. بەم شێوەیە هەموویان ڕازی بوون کە عەبدول موطەلیب و بەنی مەناف ئاو بەخشەری (سیقایەتی) حاجی یەکان بکەن، وە خاوەنی بیری زەم زەم بن تا کۆتایی زەمان)[11].

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕزگارکردنی مەککەدا هەمان سەروەری گێڕایەوە بۆ بەنی مەناف بۆیە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە کوڕانی بەنی مەنافی فەرموو: ((انزعوا بني عبدِ المطلبِ ، فلولا أن يَغْلِبَكُمُ الناسُ على سقايتِكم لنزَعْتُ مَعَكُمْ)) واتە: ئاوی زەم زەم

(١١) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١/١٩٠) وقال محققاه: إسناده حسن، والبيهقي في (الدلائل) (١/٩٣،٩٧)، وقال إبراهيم العلي في (صحيح السيرة) (١٦): إسناده صحيح.

هەڵگۆزن ئەی کوڕانی بەنی عەبدول موطەلیب، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت خەڵکان بە سونەتی بزانن و زاڵ ببن بە سەرتاندا و بەخشینی ئاوی زەم زەمتان لێ زەوت کەن، ئەوا منیش دەهاتم و لەگەڵتاندا ئاوی زەم زەمم هەڵدەهێنجاو دەم بەخشی بە حاجیەکان)[١٢].

## لە دایك بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (عەبدول موطەلیب چوو بۆ لای وەهەبی کوڕی عەبدل مەنافی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلاب کە بەناوبانگ بوون بەبەنی زوهرە لەناو قوڕەیش دا، ئەو پیاوە ئەو ڕۆژە گەورە و سەرکردەی بەنی زوهرە بوو، لە هەموویان گەورەتر و بە تەمەن تر بوو چووە لای و داوای ئامینەی کچی وەهەبی لێ کرد بۆ عەبدوڵلای کوڕە خۆشەویستی خۆی، ئامینە ئەو ڕۆژە ئافرەتێکی پایەبەرزی ناو هەموو قوڕەیش بوو نەك کوڕانی بەنو زوهرە بە تەنها، بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێگەی دایك و باوکی یەوە بووە خاوەنی بەرزترین نەسەب و نەژاد.

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (عەبدوڵلا ئامینەی خواست و پاش ماوەیەك عەبدوڵلا مرد و هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سکی دایکیدا بوو)[١٣].

وە ئیمامی زوهری ﵀ دەفەرموێت: عەبدول موطەلیب عەبدوڵلای باوکی پێغەمبەری بۆ شاری مەدینە نارد بۆ ئەوەی هەندێ لە خورما چاکەکانی شاری مەدینەی بۆ بکرێت و بۆی بهێنێت بۆ مەککە ئەوە بوو عەبدوڵلا ڕۆیشت و لە شاری مەدینە مردو نێژرا لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لەسکی دایکیدا بوو وە ئامینە کاتێ پێغەمبەری ﷺ بوو لەماڵی عبدالمطلبدا بوو[١٤]. وە خوای گەورە ئاماژە دەدات بەوەی باوکی هەر لە منالی یەوە مردووە و خوای گەورە دالدەی داوە بەهۆی باپیری یەوە وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ۝٦﴾ (الضحى).

(١٢) أخرجه: أحمد (٣٥٢٧) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني (٨٠/١١)، وقال ابن كثير: في (البداية) (١٩٣/٥) رواه أحمد و إسناده على شرط مسلم، وأخرجه البخاري (١٦٣٥)، وابن خزيمة (٢٩٤١)، وابن حيان (٥٣٩٢) والطبراني (١١٩٦٣)، والحاكم (٤٧٥/١)، والبيهقي (١٤٧/٥) بلفظ: ((لولا ان تغلبوا لنزلت حتى اضع الحبل على هذه)) و أشار إلى عاتقه.

(١٣) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٠٣/١).

(١٤) أخرجه: عبدالرزاق في (المصنف) (٣١٧/٥)، وقال العمري: في (السيرة الصحيحة) (٩٥) إسناده صحيح إلى الزهري لكن الخبر مرسل.

ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت (پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووشەممەی (١٢)ی (ربیع الأول)ی (عام الفیل)دا لەدایك بووە)[١٥]، قەیسی کوڕی مەفرەمە دەفەرموێت: (من و پێغەمبەری خوا لەساڵی فیل لەدایك بووین)[١٦]. ئەم وتەیش چەند پاڵپشتیکی بەهێزی هەیە بە فەرموودەی(صحیح) لەوانە:

- فەرموودەکەی ئەبو قەتادە کە دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ بۆچی تەنها لە هەفتەیەکدا بەس دووشەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبێت؟ پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرمووی: ((ذاكَ يَوم ولدتُ فِيْهِ وَيَومَ بُعِثْتُ وأنْزِلَ عليَّ فِيْهِ))[١٧] واتە: چونکە دووشەممە ڕۆژێکە کەمن تیایدا لە دایك بووم وە ڕۆژێکە تیایدا بووم بە پێغەمبەرﷺ و سرووشم (وحي)م بۆدا بەزی.

- ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دووشەممەدا لە دایك بووە وە هەر لەو ڕۆژەدا کراوە بە پێغەمبەر وە هەر لەو ڕۆژەشدا وەفاتی کردووە)[١٨].

وە ئەو ڕیوایەتانەی کە هاتووە سەبارەت بەوەی کە چەند نیشانەیەکی سەرەتایی ڕووی داوە پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ لەو نیشانانە (وەك لەرزینی هەیوانی کیسرا وە کەوتنە خوارەوەی چواردە تاقی وە کوژاندنەوەی ئاگری فارس وە ڕۆچوونی دەریاچەی ساوا)[١٩]. هەمووی تێکرا (ضعیف)ە، وە ئەو فەرموودەیە کە ڕیوایەت کراوە:

---

(١٥) أخرجه: ابن هشام في (السيرة النبوية) (٢٠٥/١).

(١٦) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٦٠٣/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:١٣).

(١٧) أخرجه: أحمد (٢٧٩/٥)، ومسلم (١١٦٢،١١٩)، وأبو داود (٢٤٢٦)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٢٩٣/٤) والبيهقي في (السنن الكبرى) (٢٩٣/٤).

(١٨) أخرجه: أحمد (٢٧٧/١) (٢٥٠٦) وقال محققه: إسناده ضعيف، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٨٤٩)، والبيهقي في(الدلائل) (٢٣٣/٧)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (١٩٦/١) فيه ابن لهيعة و بقية رجاله ثقات من أهل الصحيح، وقال إبراهيم العلي: في (صحيح السيرة) (١٩) حديث حسن.

(١٩) قال ابن كثير في (السيرة) (٢١٥/١): لاأصل له، وقال الزرقاني: في (شرح المواهب) (١٥٦/١): قال ابن حجر: لم يثبت منها شيء بل بعضها باطل و بعضها ضعيف، وقال الذهبي: في (تأريخ الاسلام) (٢٨/١): حديث منكر غريب، وقال السيوطي: في (الخصائص) (٥١/١) هذا الأثر فيه نكارة شديدة، وقال الشيخ على القارىء في (المصنوع) (٩١): ليس بصحيح.

((أنْ كَرَامَتِي أنِيْ وُلِدتُّ مختونًا ولم يرَ أحدٌ سوْأَتِي))[٢٠]. واتە: (مایەی ڕێز لێ گرتنم ئەوەیە کە بە خەتەنەکراوی لە دایك بووم) ئەمەش بە هەمان شێوە (ضعیف)ە و بە بەڵگە ناژمێررێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ نەسەبی نەك لە قوڕەیشدا پاك بووە بەڵكو لە ئادەمەوە نەسەبی پاك و بەرز بووە و هیچ زیناکارێکی تیا نەبووە تا لەڕێگەی ئەو زیناکارەوە پێغەمبەری خوای ﷺ پێ لەکەدار بکرێت. ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خَرجتُ مِن نِكاحٍ ولم أخرُجْ من سِفاحٍ من لَدُنْ آدَمَ إلى أنْ ولَدَني أبي وأُمِّي ولم يُصبْني مِن سفاحِ الجاهليةِ))[٢١]. واتە: هاتوومەتە دەر لە نیکاحێکی شەرعی یەوە نەك لە زیناکاری یەوە لە ئادەمەوە هەتاوەکو دایك و باوکم منیان بووە و هیچ زیناکاریەکی زەمانی نەفامی تووشم نەبووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایك بوو یەکەم کەس کە شیری پێ داوە ثوەیبەی خزمەتکاری ئەبو لەهەب بوو کە پێشتر شیری دابوو بە حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب وە ئەبو سەلەمەی کوڕی ئەبو ئەسەدی مەخزوومی. بەڵگەش:

- فەرموودەکەی ئوم حەبیبەیە کە دەفەرموێت: بە پێغەمبەری خوام ﷺ وت: (دەڵێن دەتەوێت کچی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت. فەرمووی: کچی ئوم سەلەمە؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: بەڵام ئەو کچی برای شیریمە وپێم ناشێت، چونکە ثوێبە شیری داوە بە من و ئەبو سەلەمە)[٢٢].
- ڕیوایەتەکەی ئیبنو عەباس ﷺ کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((حمزةُ بنُ عبدِ المطَّلبِ أخي من الرَّضاعةِ))[٢٣] واتە: حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب برای شیریمە.

(٢٠) أخرجه: الخطيب (٣٢٩/١)، والطبراني في (المعجم الصغير) (٥٩/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٦٤/١) و (الحلية) (٢٤/٣)، وقال ابن كثير في (السيرة) (٢٠٩/١): فيه نظر، وقال القرطبي: في (الإستعاب) (٣٩/١) إسناده ليس بقائم، وقال ابن الجوزي: في (العلل المتناهية) (٢٦٤) لايصح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٢٤/٨): فيه متهم، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع الصغير) (٥٣١٠).

(٢١) أخرجه: البيهقي في (دلائل النبوة) (١٧٤/١) و (السنن الكبرى) (١٩٠/٧)، وحسنه الشيخ الألباني في (الإرواء) (١٩١٤) و (صحيح الجامع الصغير) (٣٢٢٥).

(٢٢) أخرجه: البخاري (٥١٠)، ومسلم (١٤٤٩)، و أبو داود (٢٠٥٦)، وابن ماجه (١٩٣٩)، والنسائي (٦٦/٦)، وأحمد (٢٩١/٢).

(٢٣) أخرجه: البخاري في (الفتح) (٤٠/٩)، ومسلم بشرح النووي(٢٣/١٠) و انظر صحيح الجامع (٣١٥٧).

## دایەنگاکردنی پێغەمبەر ﷺ لەبەنی سەعد

بەسەرهاتی دایەنگاکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ وە پەروەردەکردن و پێ گەیاندنی لە بەنی سەعددا بەم شێوەیە هاتووە:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (دایەنگاکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن ئافرەتێکەوە بوو لە بەنی سەعدی بەنی بەکر بەناوی حەلیمەی کچی زوئەیبی....)[٢٤].

(حەلیمەی کچی زوئەیبی سەعدی خۆی و مێردەکەی لەگەڵ کوڕێکی بچوکی خۆیاندا کە بە باوەشیەوە بووە و شیری پێ داوە لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتانێکی بەنی سەعد، هاتوون بەرەو شاری مەککە بۆ ئەوەی منداڵیان دەست کەوێت و دایەنگایی بکەن، ئەوەش لە ساڵێکدا بووە کە قات و قڕی و گرانی بووە، حەلیمە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: من بە سواری گوێ درێژەکەمانەوە بووم وشترێکمان پێ بوو زۆر لەڕ بوو، قەترە شیری تێدا نەبوو سەرتاسەری شەو نەدەخەوتین لەبەر گریانی مناڵەکەم، ئەوەندەم شیر تێدا نەبوو بیدەمێ و وشترەکەش شیری تێدا نەبوو هیوامان وابوو کە فەڕو بەرەکەت ڕوومان تێ بکات و دەرگای خێرمان لە ڕوودا بکرێتەوە، سواری گوێدرێژەکەمان بووم ئەو گوێدرێژە نەی دەتوانی بڕوات، هاوەڵانم بەجێیان دەهێشتم و زۆر جار پێم دەوتن: لەسەرم بوەستن، ڕۆیشتین تا هەموومان گەیشتینە مەککە کوڕێکمان بینی و نیشانمان درا.

بەڵام هەمووممان پێمان خۆش بوو وەری بگرین کاتێ دەیان گوت ئەمە باوکی نەماوە، لە خەیاڵێ خۆماندا دەمان وت جا چی بکەین لە دایکی ئێمە دەمانەوێت باوکی لە ژیاندا بێت پاداشتی بە خێوکردنەکەمان بەباشی بداتەوە، منیش پێم ناخۆش بوو بە دەستی خاڵی بگەڕێمەوە و هیچم پێ نەبێت بە مێردەکەم وت: دەچم ئەو منداڵە بێ باوکە دەهێنم ئەویش وتی: قەینا بچۆ بیهێنە بەڵکو خوای گەورە بیکاتە بەرەکەت بۆمان. هەر ئەوەندە بوو چووم و هێنام بۆلای شت ومەکانم و هەرگرتم بە باوەشمەوە هەر دوو مەمکم پڕبوون لەشیرو وتێر شیری خوارد و هەردوو منداڵەکەشم تێر شیریان خوارد و تێر خەوتن، وە مێردەکەشم هەستاو چوو

(٢٤) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٠٨/١)، وقال الذهبي: في (السيرة) (٥١/١) وهذا حديث جيّد الإسناد.

بۆ لای وشترە بە ساڵاچووە لەڕەکە هەر ئەوەندە نزیك بووە وە لێی سەیری کرد گوانەکانی سەرتاسەر پڕبووە لە شیر ئەوە بوو شیرێکی یەکجار زۆری دۆشی و ئەو شەوە بە تێرو تەسەلی خەوتین و شەوێکی خۆشمان بردە سەر، کاتی ڕۆژ بووەوە پێی وتم: وە الله ئەی حەلیمە منداڵێکی موبارەکە، پێم وت: والله منیش بەهیوای ئەوەم، پاشان سواری گوێدرێژەکەمان بووین و بەرەو جێ و ماڵی خزمانی خۆمان لە بەنی سەعد بەڕێ کەوتین.

ئەوە بوو مەسەلەکەم بۆ ئافرەتانی هاوڕێم گێڕایەوە و ئەوانیش وتیان: وادیارە منداڵێکی زۆر بە بەرەکەتت گرتۆتە خۆ ئەی حەلیمە، حەلیمەش دەڵێت: وەڵاهی هەمان گوێدرێژ پێشی هەموویانی دەدایەوە ئەوان هیلاك بووبوون و دەیان وت: دە ڕاوەستە لەسەرمان ئەرێ ئەوە گوێ درێژەکە نەبوو کە یەکەم جار هێنابووت، دەرەحمێکمان پێ بکە وە لەسەرمان بوەستەو پەلەمەکە! هەر ئەوەندەی پێ نەچوو تا گەیشتینەوە جێی خۆمان وەڵاهی جێگەیەك بوو کە هیچ زەوی یەك لە زەوییەکانی خوای گەورە بەوشێوەیە وشك و بیابان نەبوو، مەڕەکانم هەر ئەوەندەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ئەوێ ئێوارە دەهاتنەوە و هەر هەموویان تێر دەبوون، تێر لەوەڕیان دەخوارد وە گوانیان پڕ لە شیر دەبوون، والله هەموو مەڕەکانی خێڵکەی خۆمان بە برسێتی دەگەڕانەوە و چۆڕەچۆڕ شیریان تیا بوو، تا وایان لێ هاتبوو سەرسام بوون لەو باسە و تورە دەبوون لە شوانەکانی خۆیان وە دەیان وت: ماڵتان وێران بێ بچن لەو شوێنە بیلەوەڕێنن کە مەڕەکانی حەلیمەی تیا دەلەوەڕێت با وەك ئەوان تێربن وگوانیان پڕ شیر بێت، دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ گەورە بوو وەك منداڵێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو زۆر زوو خۆی گرت وە زۆر وریابوو ئێمەش زۆر سوور بووین لەسەر ئەوەی کە لەناوماندا بمێنێتەوە، چونکە دەمانزانی بە هاتنی ئەو چ بەرەکەتێك ڕووی تێکردبووین شتی وامان بە خۆمانەوە نەبینیبوو.

پاش ماوەیەك هاتینەوە بۆلای دایکی و پێمان وت: با کوڕەکەت هەر لەلای ئێمە بمێنێتەوە ئێمە دەترسین گەرمای شاری مەککە کاری تێ بکات ونەخۆش بکەوێت ڕێگەمان بدە (تا دوو ساڵێ تریش بووە) تا بگەڕێتەوە ناومان ولامان بێت ئەویش ڕێگەی داین و هێنامانەوە بۆ لای خۆمان.

وە لەدوای هاتنەوەمان بەچەند مانگێگ ڕوداوێك ڕوویدا ئەویش ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ لە ناو مەڕەکانمان دابوو ئەی لەوەڕاندن لەپشت ماڵەکەمانەوە تەنها خۆی و کوڕەکەم بەیەکەوە بوون ئەوەندەمان زانی کوڕەکەم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە وتی: دوو پیاو پۆشاك و بەرگی سپی یان لەبەردابوو (محمد)ی برامیان گرت و بەپشتدا خستیان وسنگیان لەت کرد وا پارچە پاچەی دەکەن، (دەفەرموێت) من و باوکی بە پەلە ڕامان کرد بینیمان پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ڕەنگی تێکچوو بوو ، پێمان وت: چیت بینیوە؟ پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان شێوە گێڕایەوە و وتی: دوو پیاوی بەرگ سپی هاتن بۆ لام ومنیان خست بەپشت داو سکیان لەت کردم و شتێکیان لێ دەرهێنام نازانم چی بوو. حەلیمە دەڵێت: ئێمەش گێڕامانەوە بۆ لای خێوەتگاکەی خۆمان ومێردەکەم وتی: حەلیمە دەترسم ئەو کوڕە تێك چووبێت، تکایە با زۆر زوو بیبەینەوە بۆلای دایکی و خزمانی لە مەککە.

حەلیمە دەڵێت: ئێمەش زوو هێنامانەوە بۆ لای دایکی و ئەویش سەری سوڕما چونکە ماوەیەکی کەم لەمەو پێش ئێمە داوامان لێ کردبوو تا ڕێگەمان بدات بیبەینەوە بۆ لای خۆمان، دایکی وتی: بۆچی وەها زوو هێناتانەوە، ئێوە زۆر پێداگریتان دەکرد لەسەر مانەوەی لای ئێوە؟ حەلیمەش وتی: کوڕەکەمان بەخێوکردووە و خۆی گرتووە و ڕاسپاردەی خۆمان وەکو پێویست جێبەجێ کردووە و ئێمە ترساین نەوەك تووشی شتێك بێت بۆیە وا باشە هەرلای خۆت بێت. وتی: قەت کاری تۆ بەم جۆرە نەبووە ڕاستم پێ بڵێ چیت بینیوە لەم کوڕە؟ حەلیمە دەڵێت: ئەوەندەی وت تا ناچاری کردم کە بۆی بگێڕمەوە، منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە بەڵام هەر بە خەیاڵیشیدا نەهات و بایەخی پێ نەدا و وتی: ترسایت کە شەیتان دەستی لێ بوەشێنێت؟ منیش وتم بەڵێ، ئەویش وتی: نەخێر وەڵاهی شەیتان دەستی ناگاتە ئەم کوڕەم، و لە پاشەڕۆژیشدا دەبێت بە کەسێکی بایەخدار، چونکە من کاتێ لە سکمدا بوو بینیم لە خەومدا نورێك لێمەوە دەرچوو کۆشکە بەرزەکانی کیسرا و هەرقلی شامی ڕووناك کردەوە)[٢٥].

---

(٢٥) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢١٣/١) وقال محققاه: إسناده ضعيف، وأبو يعلى(٧١٦٣)، وابن حبان (٦٣٣٥) وقال محققه: في سنده إنقطاع، و باقي رجاله ثقات، وأبو نعيم في (دلائل النبوة) (٩٤)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٣٢/١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٥٤٥/٢٤)، والطبري (١٥٨/٢)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (٢٢٠/٨) رواه أبو يعلى والطبراني ورجالهما ثقات، و ضعف إسناده الشيخ الألباني في (دفاع عن الحديث السيرة) (٣٩) (ئەم ڕیوایەتە لای زانایانی فەرموودەناس ثابت نەبووە وتەنها بۆ زانیاریتان هێناومە، بەڵام زۆربەی

## بەسەرهاتی لەتکردنی سنگی پێغەمبەر ﷺ

ئەم بەسەر هاتە لە چەندین ڕیوایەتدا هاتووە لەوانە:

**یەکەم**: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: جبریل ﷺ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ یاری دەکرد لەناو منداڵەکاندا گرتی و دای بە زەویدا و لای دڵی لەت کرد و دڵی دەرهێنا و پارچە گۆشتێکی لێ دەرکرد و فڕێیدا وتی: ئەوە بەشی شەیتانە لە تۆدا فڕێمدا، پاشان دڵی شۆردەوە لە تەشتێکی ئاڵتوندا کە پڕ بوو لە ئاوی زەم زەم، پاشان خستیەوە جێی خۆی و بەیەکیەوەی لکاندەوە و منداڵەکان ڕایان کرد بۆ لای (حەلیمە) و پێیان وت: محمد کوژراوە ئەوانیش، چوون بۆ لای و بینیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی تێکچووە، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: من جێگەی دورینەوەکەیم دەبینی لە سنگیدا)[٢٦].

**دووەم**: لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو ئیسحاقدا ﷺ لە سەوری کوڕی یەزیدەوە ئەویش لە خالدی کوڕی مەعدانەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لە پێغەمبەرکرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان بگێڕەرەوە سەرەتای پێغەمبەرایەتیت چۆن بوو، فەرمووی: (([نَعَمْ، أَنَا دَعْوَةُ أَبِي إِبْرَاهِيمَ ، وَبُشْرَى (أَخِي) عِيسَى، وَرَأَتْ أُمِّي حِينَ حَمَلَتْ بِي أَنَّهُ خَرَجَ مِنْهَا نُورٌ أَضَاءَ لَهَا قُصُورَ الشَّامِ ، وَاسْتُرْضِعْتُ فِي بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، فَبَيْنَا أَنَا مَعَ أَخٍ لِي خَلْفَ بُيُوتِنَا نَرْعَى بَهْمًا لَنَا، إِذْ أَتَانِي رَجُلَانِ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ مَمْلُوءَةٍ ثَلْجًا، ثُمَّ أَخَذَانِي فَشَقَّا بَطْنِي، وَاسْتَخْرَجَا قلبِي فشقّاه، فاستخرجنا مِنْهُ عَلَقَةً سَوْدَاءَ فَطَرَحَاهَا، ثُمَّ غَسَلَا قَلْبِي وَبَطْنِي بِذَلِكَ الثَّلْجِ حَتَّى أَنْقَيَاهُ])) ، [((ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ زِنْهُ بِعَشَرَةٍ مِنْ أُمَّتِهِ، فَوَزَنَنِي بِهِمْ فَوَزَنْتهمْ، ثُمَّ قَالَ: زنه بِمِائَةٍ مِنْ أُمَّتِهِ، فَوَزَنَنِي بِهِمْ فَوَزَنْتهمْ، ثُمَّ قَالَ: زَنِّهِ بِأَلْفٍ مِنْ أُمَّتِهِ، فَوَزَنَنِي بِهِمْ فَوَزَنْتهمْ، فَقَالَ: دَعه عَنْك، فو الله لَوْ وَزَنْتَهُ بِأُمَّتِهِ لَوَزَنَهَا))].
واتە: (من دوعاکەی ئیبراهیمی باوەگەورەم بووم، ومژدەی عیسای برام بووم ودایکم کاتێك من لە سکیدا بووم بینی نورێك لێوەی دەرچووە کۆشکەکانی شامی ڕوناك کردۆتەوە و لە ناو کوڕانی بەنی سەعدی کوڕی بەکردا لە دایەنگا بووم و لەوێ بە خێوکرام وە کاتێ من و برایەکم لە پشتی ماڵەکانماندا مەڕمان دەلەوەڕاند، دوو

---

باسەکە لەفەرموودەی صحیح داهاتووە، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢٥، ٢٦).

(٢٦) أخرجه: مسلم (٢٦١)، وأحمد (١٢١/٣)، والحاكم (١١٦/٢).

پیاو کە پۆشاکی سپییان لەبەردا بوو هاتنە لای من و تەشتێکی ئاڵتونییان پێ بوو کە پڕ بوو لە بەفر، پاشان منیان گرت و دڵیان دەرهێنام و کردیان بە دووکەرتەوە و پارچەیەکی ڕەشیان لێ دەرهێنا و فڕێیادا، پاشان دڵیان شۆردمەوە بەو بەفرە و سکیشیان شۆردم تا پاکیان کردەوە و یەکێکیان بەوی تریانی وت: بیکێشە بە دەکەس لە ئومەتەکەی (واتە: ئیمانی دە کەس لە ئومەتەکەی) ئەویش منی کێشا لە دە کەسەکە قورستر بووم، پاشان وتی: بیکێشە بەسەد کەس لە ئومەتەکەی، ئەویش منی کێشا لە سەد کەسەکەش قورستر بووم، پاشان وتی: بیکێشە بە هەزار کەس لە ئومەتەکەی ئەویش منی کێشا من لە هەموویان قورستر بووم دوایی وتی: وازی لێ بهێنە ئەگەر بیکێشیت بە هەموو ئومەتەکەی هەر ئەو قورسترە)[٢٧].

**سێهەم**: عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمی ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو پێی وت: سەرەتای پێغەمبەرایەتیت چۆن بووە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەویش فەرمووی: ((كَانَتْ حَاضِنَتِي مِنْ بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَابْنٌ لَهَا فِي بَهْمٍ لَنَا، وَلَمْ نَأْخُذْ مَعَنَا زَادًا، فَقُلْتُ: يَا أَخِي، اذْهَبْ فَأْتِنَا بِزَادٍ مِنْ عِنْدِ أُمِّنَا، فَانْطَلَقَ أَخِي وَمَكَثْتُ عِنْدَ الْبَهْمِ، فَأَقْبَلَ طَيْرَانِ أَبْيَضَانِ كَأَنَّهُمَا نَسْرَانِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَهُوَ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَقْبَلَا يَبْتَدِرَانِي، فَأَخَذَانِي فَبَطَحَانِي إِلَى الْقَفَا، فَشَقَّا بَطْنِي، ثُمَّ اسْتَخْرَجَا قَلْبِي، فَشَقَّاهُ فَأَخْرَجَا مِنْهُ عَلَقَتَيْنِ سَوْدَاوَيْنِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: - قَالَ يَزِيدُ فِي حَدِيثِهِ، ائْتِنِي بِمَاءِ ثَلْجٍ - فَغَسَلَا بِهِ جَوْفِي، ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِمَاءِ بَرَدٍ فَغَسَلَا بِهِ قَلْبِي، ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِالسَّكِينَةِ فَذَرَّاهَا فِي قَلْبِي، ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: حِصْهُ، فَحَاصَهُ، وَخَتَمَ عَلَيْهِ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ - وَقَالَ حَيْوَةُ: فِي حَدِيثِهِ حِصْهُ فَحَصَّهُ وَاخْتِمْ عَلَيْهِ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ -، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ اجْعَلْهُ فِي كِفَّةٍ، وَاجْعَلْ أَلْفًا مِنْ أُمَّتِهِ فِي كِفَّةٍ، فَإِذَا أَنَا أَنْظُرُ إِلَى الْأَلْفِ فَوْقِي، أُشْفِقُ أَنْ يَخِرَّ عَلَيَّ بَعْضُهُمْ، فَقَالَ: « لَوْ أَنَّ أُمَّتَهُ وُزِنَتْ بِهِ لَمَالَ بِهِمْ، ثُمَّ انْطَلَقَا وَتَرَكَانِي، وَفَرِقْتُ فَرَقًا شَدِيدًا، ثُمَّ انْطَلَقْتُ إِلَى أُمِّي فَأَخْبَرْتُهَا بِالَّذِي لَقِيتُهُ، فَأَشْفَقَتْ عَلَيَّ أَنْ يَكُونَ أُلْبِسَ بِي، قَالَتْ: أُعِيذُكَ بِاللَّهِ، فَرَحَلَتْ بَعِيرًا لَهَا فَجَعَلَتْنِي، - وَقَالَ يَزِيدُ: فَحَمَلَتْنِي - عَلَى الرَّحْلِ، وَرَكِبَتْ خَلْفِي حَتَّى بَلَغْنَا إِلَى أُمِّي، فَقَالَتْ: أَوَأَدَّيْتُ أَمَانَتِي، وَذِمَّتِي؟ وَحَدَّثَتْهَا بِالَّذِي لَقِيتُ، فَلَمْ يَرُعْهَا ذَلِكَ،

---

(٢٧) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢١٤/١)، وقال محققاه: إسناده جيد وقوي، والطبري في (التفسير) (٤٣٥/١١) والحاكم(٦٠٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (١٤٥/١)، والدارمي (١٤/١٣)، وقال ابن كثير في (البداية) (٣٣٥/٢)، وفي (السيرة) (٢٢٩/١): إسناده جيد قوي، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٥٤٦)، وفي (صحيح السيرة) (ص:١٧).

فَقَالَتْ: إِنِّي رَأَيْتُ خَرَجَ مِنِّي نُورًا، أَضَاءَتْ مِنْهُ قُصُورُ الشَّامِ))[٢٨]. واته: (دایەنگا و ساوایەتیم لە بەنی سەعدی کوڕی بەکر بوو، من و کوڕێکی ئەو ئافرەتە (واتە: برای شیریم) کاتێك لە ناو مەڕەکانماندا بووین خواردنمان لەگەڵ خۆماندا نەبرد بوو، من بە براکەم وت: بڕۆرەوە بۆلای دایکمان و هەندێ پێویستیمان بۆ بهێنە براکەم ڕۆیشت و من بە تەنیا مامەوە ئەوەندەم زانی دوو باڵندەی سپی بەرەو لای من هاتن وەك داڵ وابوون، یەکێکیان بەوەی تریانی وت: ئەوە ئەوە، ئەویش وتی: بەڵێ ئەوە، پاشان هاتن ومنیان گرت و خستمیان بە پشتا بە سەر زەویدا و سکیان لەتکردم، و دڵمیان دەرهێنا و کردیان بە دوو پارچەوە، و پاشان دوو پارچەی ڕەشیان لێ دەرهێنا و یەکێکیان بە هاوەڵەکەی تری وت: ئاوێکی بەفراوم بۆ بێنە، ئەویش بۆی هێناو هەموو ناوسکمی پێ شۆردەوە پاشان وتی: ئاوێکی سەهۆڵاوم بۆ بێنە ئەویش هێنای و دڵمی پێ شۆردەوە دوای ئەوە وتی: هێمنی وئارامیم بۆ بهێنە. ئەویش هێنای و پاشان ئەوی تریان پرژانی بەسەر دڵمدا.

دوای ئەوە یەکێکیان بە هاوەڵەکەی تری وت بیدورەرەوە، ئەویش دوورییەوەو مۆری پێغەمبەرایەتی پیاناو ئەوی تر بەوی وت: بیکەرە لایەکی تەرازووەکەوە. وە هەزار کەسیش لە ئومەتەکەی بکەرە ئەولایەکەی تری. دەفەرموێت: من بەچاوی خۆم تەماشای هەزار کەسەکەم دەکرد لە سەر و خۆمەوە، دەترسام کەهەندێکیان بکەونە خوارەوە بەسەرمدا، ئینجا وتی: ئەگەر بە هەموو ئومەتەکەی بیکێشیت هێشتا ئەم قورسترە، ئینجا هەردووکیان ڕۆیشتن و منیان بەجێهێشت، وە من زۆر زۆر ترسام و گەڕامەوە بۆ لای دایکم و پێم ڕاگەیاند ئەوەی بەسەرمدا هات، ئەویش ترسا لەوەی کە من ئەقڵم تێکچوو بێت وتی: (أُعِيذُكَ باللهِ) پەنات پێ دەگرم بە خوا. دوای ئەوە وشترێکی ئامادەکرد و منی خستە پێش خۆی، بەڕێکەوتین هەتا هێنامیەوە بۆ لای دایکم و پێی ڕاگەیاند و وتی: ڕاسپاردەکەی خۆمم بەجێ گەیاند و هێنامەوە، پاشان بە سەرهاتی منی بۆ گێڕایەوە کە دایکم بەلایەوە سەیر نەبوو، وتی: من کاتێك لە سکمدا بوو ڕووناکیەکم بینی لێمەوە دەرچوو، هەموو کۆشکەکانی شامی ڕووناك کردەوە).

---

(٢٨) أخرجه: أحمد (١٨٤/٤) (١٧١٥١) وقال محققه: حديث حسن، والدارمي (٨/١)، والحاكم (٦١٦/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٧/٢)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (٢٢٢/٨) رواه أحمد و إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٥٩/٤) (٣٧٣)، وفي (صحيح السيرة) (ص:١٨).

## مردنی دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ و گرتنە ئەستۆی لەلایەن باپیریەوە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: عەبدوللای کوڕی ئەبوبەکر ﷺ بۆی گێڕامەوە (کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایکی بردوویەتی بۆ لای خاڵوانی لە بەنی نەجاڕ بۆ سەردانی شاری مەدینە لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ شاری مەککە لە (ئیبواء) کە ناوچەیەکە لە نێوان مەککە و مەدینە، لەوێدا دایکی پێغەمبەر ﷺ مرد لەوکاتەدا تەمەنی شەش ساڵان بوو دوای ئەوەی دایکیان لەوێ ناشت). پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئوم ئەیمەن وە لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا گەڕاوەتەوە بۆ شاری مەککە)[٢٩].

بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرمودەکەی بورەیدەیە ﷺ کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەساڵی (ڕزگارکردنی شاری مەککەدا) سەردانی گۆڕی دایکی لەو جێگەیەدا کرد، وەك ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوەو گەیشتە (ئیبواء) لەوێ وشترەکەی ڕاوەستاند، پاشان چووە لای گۆڕێکی کۆن و زۆر گریا ، و وەك ڕێز کەس نەچوو تا بزانێت بۆ دەگری تەنها ئیمامی عومەر نەبێت نزیك بووە وە لێی و پێی وت: بۆچی دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا تا ئێمەش بگرین؟ فەرمووی: [(ئەمە گۆڕی ئامینەی کچی وەهابە داوام کرد لە خوای گەورە ڕێگەم بدات سەردانی گۆڕەکەی بکەم ڕێگەی دام، دوایی داوام کرد کە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم ڕێگەی نەدام)][٣٠].

پاشان عەبدول موطەلیب زۆر بەجوانی پێغەمبەری ﷺ گرتبووە خۆی و زۆر بەزەیی پیادە هاتە وە چونکە دایکی بەو شێوەیە ڕۆیشت و باوکیشی پێشتر بەو شێوە ڕۆیشت ئێستا بێ باوك ودایکە و هەرخۆی تەنهایە نەبرای هەیە و نەخوشك.

---

(٢٩) أنظر: سيرة ابن هشام (٢١٧/١) وقال محققاه: إسناده ضعيف لإعضاله، وأخرجه ابن سعد في (الطبقات) (٩٣/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٨٨/١). (لاوازە تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

(٣٠) عن بريدة ﷺ قال: كنا مع النبي ﷺ (في غزوة الفتح) فنزل بنا و نحن معه قريب من ألف راكب فانتهى إلى رسم قبر فجلس و جلس الناس حوله، فجعل يتحرك، رأسه كالمخاطب ثم بكى، فاستقبله عمر فقال: ما يبكيك يا رسول الله؟ قال: ((هذا قبر أمنة بنت وهب استاذنت ربي في ان ازور قبرها فاذن لي واستاذنته في الأستغفار لها فابى على [فدمعت عيناى رحمة لها من النار])) أخرجه: أحمد (٣٥٥،٣٥٧،٣٥٩/٥)، وابن أبي شيبة (١٣٩/٤)، والحاكم (٣٧٦/١)، والبيهقي (٧٦/٤)، وصححه الشيخ الألباني في (احكام الجنائز) (ص:٢٣٨)، وفي (صحيح السيرة) (ص:٢٣)، و(الأرواء) (٢٥٥/٣).

عەبدول موطەلیب زۆر ڕێزی لێ دەگرت و بەجوانی سەرپەرشتی دەکرد. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەبدول موطەلیب گەورەی قوڕەیش فەرشێکی تایبەتی هەبوو لەژێر سێبەری دیواری کەعبەدا وە کوڕانی هەمووی بە چوار دەوریدا لەسەر زەوییەکە دادەنیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنداڵی دەهات لەسەر فەرشەکە دادەنیشت بەڵام کوڕانی عەبدول موطەلیب دووریان دەخستەوە، عەبدول موطەلیب ئەگەر ئاگای لێ بووایە و دەیوت: واز لە کوڕەکەم بهێنن وەڵاهی ئەم کوڕەم دەبێتە کەسێکی زۆر گەورە، پاشان دەیهێناو لە پەنا خۆیدا لەسەر فەرشەکە دای دەناو ڕێزی لێ دەگرت و بەزەیی پیا دەهاتەوە و دەستی دەهێنا بە پشتیداو زۆر خۆشحاڵ دەبوو بە بینینی ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ)[٣١].

## نمونەیەك لە خۆشەویستی عەبدول موطەلیب بۆ پێغەمبەر ﷺ

کەندری کوڕی سەعید ﷺ دەیگێڕێتەوە لە باوکیەوە و دەڵێت: (لەنەفامیدا چوم بۆ حەج و بینیم پیاوێك زۆر پەرۆشانە دەسوڕایەوە و تەوافی دەکرد بەچواردەوری کەعبەدا و دەیوت: ((رَبِّ رُدَّ إِلَيَّ رَاكِبِي مُحَمَّدًا رُدَّهُ رَبِّ إِلَيَّ ، وَاصْطَنِعْ عِنْدِي يَدًا)). واتە: ئەی پەروەردگار محمدی سوارچاکی خۆمم بۆ بگێڕەوە خوایە ئەم چاکەیەم لەگەڵدا بکە. منیش وتم: ئەمە کێ یە؟ وتیان: ئەمە عەبدول موطەلیبی کوڕی هاشمە، هەندێك وشتری لێ ون بووە و کوڕێکی خۆی ناردووە بە دوایانداو هێشتا نەگەڕاوەتەوە کوڕەش هەرگیز وانەبووە دوابکەوێت بۆ هەر ئیشێکی ناردبێ زوو گەڕاوەتەوە. دەفەرموێت: ئەوەندەی پێنەچوو پێغەمبەر ﷺ پەیدابوو وشترەکانیشی لەگەڵ خۆی هێنابووەوە کە عەبدول موطەلیب بینی پێی وت: (يا بُنَيَّ لقَدْ حَزِنْتُ علَيْكَ كالْمَرْأَةِ حُزْنًا لَا يُفَارِقُنِي أَبَدًا)[٣٢]. واتە: کوڕم خەمێکم بۆ خواردی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە هەر لە دڵم دایە وەك دایکێکی جگەرگۆشە چەند خەمی منداڵی خۆی دەخوات بەو شێوەیە منیش خەمی تۆم بوو).

(٣١) أنظر: سيرة ابن هشام (٢١٧/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢١/٢)، وابن سعد في (الطبقات) (٩٤/١).

(٣٢) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٦٤/٦) (٥٥٢٤)، وأبو يعلى (٨٥/١)، والحاكم (٦٠٣/٢)، وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٠/٢)، وابن سعد في (الطبقات) (١١١/١)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (٢٢٤/٨): رواه أبو يعلى والطبراني و إسناده حسن.

## بەسەرهاتی بوحیرای ڕاهیب

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەبدول موطەلیب لەسەرە مەرگدا بوو کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی هەشت ساڵان بوو، سپاردی بە ئەبو طالیب چونکە لە هەموو کوڕانی گەورەتربوو، هەروەها ئەبو طالب و باوکی پێغەمبەر ﷺ هەردووکیان لەیەك دایك و باوك بوون. عەبدول موطەلیب ئەبوطالیبی بانگ کرد وەسێتی بۆ کرد تا ئاگای لە کوڕەکەی بێت، چونکە بێ دایك وباوکە تا زۆر چاك چاودێری بکات و بیباتەماڵی خۆیان و ئاگای لێ بێت ئەبو طالبیش ئەم ئەرکەی بە جوانی گرتە ئەستۆ).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو طالیب لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا ویستی بەرە و شام بڕوات، کاتێ ویستی دەربچێت و بڕوات تەماشای پێغەمبەری کرد زانی ئەم منداڵە بێ دایك و باوکە بێ تاقەتە و زۆر دڵی بۆ نەرم بوو وە بەزەیی پێداهاتەوە و وتی: وەڵلاهی دەبێ بەبێ ئەو نەچم بۆ هیچ شوێنێك دەبێ لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ئەم سەفەرە، کاتێ گەیشتنە بوصرا نزیکی خاکی شام ڕاهیبێکی لێ بوو ناوی بوحەیرابوو لە (صەومعە) کەی خۆیدا بوو زۆر شارەزایی لە هەموو نەصرانیەتدا هەبووە زۆر زانا بووە)[٣٣].

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو طالیب چوو بۆ شام و پێغەمبەری ﷺ برد لەگەڵ خۆی لەگەڵ هەندێ لە پیاوە ناودار و ڕیش سپییەکانی قوڕەیش، کە گەیشتە جێگەی ڕاهیبەکە و بەرەولای ئەو ڕۆیشتن تا پشوو بدەن، ڕاهیبەکە کە زانی ئەوان لایان داوە هات بۆلایان و دانە بەدانە گەڕا بەناویاندا و سەیری ڕوخسار و دەم و چاوی هەموویانی دەکرد، هەتا گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ و دەستی گرت و وتی: (هذا سيدُ العالمين ، هذا رسولُ ربِّ العالمين) واتە: ئەمە سەروەری هەموو جیهانە (واتە: سەروەری کوڕانی ئادەم لە جیهاندا) ئەمە پێغەمبەری هەموو جیهانە و خوای گەورە بە ڕەحمەت و بەزەیی دەینێرێت بۆ هەموو جیهان، هەندێ لە پیاو ناوداران و ڕیش سپیانی قوڕەیش وتیان: تۆ چۆن دەزانیت؟ وتی: کاتێك ئێوە هاتن لەو بەرزاییەوە بینیم دار و درەختەکان سوجدەیان دەبرد و سوجدەش نابەن تەنها بۆ پێغەمبەرێك نەبێت، وە من دەیناسمەوە بەوەی کە مۆری پێغەمبەرایەتی لە ڕێکی پەراسویدایە

(٣٣) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٢٦/١)، و ذكره ابن كثير في (البداية) (٣٤٤/٢).

لە پشتیەوە وەکو سێوێك وایە، دوای ئەوەی بوحەیرا گەڕایەوە بۆ صەومەعەکەی دەعوەتی کردن و پێغەمبەر ﷺ نەهات وخزمانی بەجێیان هێشت بۆ لەوەڕاندنی وشترەکان و ئاڵف پێدانیان، دوای ئەوە داوای کرد کە ئەویش بێت بۆ دەعوەتەکە، پاشان پێغەمبەر ﷺ هات و هەورێکی بەسەرەوە بوو سێبەری بۆ دەکرد، کە کاتێ نزیك بووە وە لە قەومەکەی ئەوان هەموویان لە ژێر سێبەری دارەکەدا دانیشتبوون و ئەویش لەولاوە دانیشت سێبەری درەختەکە لاچوو لەسەر ئەوان و چووە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕاهیبەکە وتی: جوان تەماشا بکەن ئەها سێبەرەکە چۆن لە ئێوەوە تێپەڕی بۆ سەر ئەو، پاشان ئەوان بە پێوە بوون ویستیان ئەو جێگەیە بەجێ بهێڵن، ڕاهیبەکە زۆر پاڕایەوە لێیان کە ئەو کوڕە لەگەڵ خۆیان نەبەن بۆ شام چونکە ڕۆمەکان ئەگەر ئەو ببینن نیشانەکانی دەناسنەوە و دەیکوژن.

لەم قسانەدا بوون بوحەیرا ئاوڕی دایەوە و بینی وا چەکداری ڕۆمەکان هاتنە ئەو شوێنە، ڕاهیبەکە دەست بەجێ بەرەو ڕوویان ڕۆیشت و پرسیاری لێ کردن و وتی: بۆچی هاتوون بۆ ئەم شوێنە؟ ئەوانیش وتیان: هاتووین چونکە پێمان ڕاگەیەنراوە کە پێغەمبەرێك لەم مانگەدا پەیدا دەبێت و هیچ ڕێگەیەك نەماوە کە چەندین چەکداری بۆ ئامادە نەکرابێت، و ئێمەش هەواڵی خۆمان پێ گەیەنرا و هەندی لە هەرە چەکدارە بەدین و چاکەکان بۆلای تۆ نێرراون بۆ گرتن و دەست بەسەرکردنی ئەو پێغەمبەرە، وتی: هیچ کەسێکی سەرباز لە ئێوە چاکتر هەیە؟ وتیان: نەخێر ئێمە لە هەموویان چاکترو و بەدینترین کە نێرراوین بۆلای تۆ، وتی: پێتان دەڵێم ئەگەر خوا ویستی لەسەر شتێك بێت هیچ کەسێك دەتوانێت ویستەکەی بگێڕێتەوە؟ وتیان: نەخێر، وتی: بگەڕێنەوە و پەیمانی لێ وەرگرتن کە جارێکی تر نەیەنەوە بەم ناوەدا.

دوای ئەوە ڕووی کردە قورەیشییەکان و وتی: داواتان لێ دەکەم لەبەر خودا کامتان سەرپەرشتی ئەم منداڵەتان لە ئەستۆ گرتووە؟ وتیان: ئەبو طالیب، پاشان بوحەیرا زۆر بە گەرمی پاڕایەوە لە ئەبو طالیب کە ئەم کوڕە نەبات بۆ شام و بیگێڕێتەوە، پاشان ئەبو طالیب گێڕایەوە لەگەڵ ئەبوبەکر و بیلالدا ڕاهیبەکە هەندێ لە ڕۆن و دیاری لەگەڵدا ناردنەوە بۆ مەککە)[٣٤].

---

(٣٤) أخرجه: ابن أبي شيبة (٤٧٩/١١)، والترمذي (٣٦٢٠) وقال حديث حسن غريب، والحاكم (٦١٥/٢) وصححه على

## پەیمانی فزوڵ

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (هۆزەکانی قورەیش هەمووی بانگکران بۆ خانووەکەی عەبدوللای کوڕی جەدعان چونکە ئەو لەو ڕۆژەدا بەتەمەن ترین کەس بووە، سەروەری دانیشتوانی مەککە بوو، لەوێ کوڕانی بەنی هاشم و بەنی مطلب و کوڕانی بەنی ئەسەدی کوڕی عەبد عوزا و زوهرەی کوڕی کیلاب و تەیمی کوڕی مورڕە کۆبوونەوە و پەیمانیاندا هەر ستەم لێکراوێك ببینن لە شاری مەککە و لە دەرەوەی شاری مەککە لایەنگری بکەن تا مافی خۆی بۆ بگێڕنەوە وە ئەو پەیمانەشیان ناونرا بە پەیمانی فزول)[٣٥].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە بۆ ئەوپەیمانە دەکات کە ڕازی بووە پێی و پێی خۆش بووە کە لە ئیسلامیشدا پەیمانێکی وەها هەبێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە فەرموودەکانیدا ئاماژە بۆ ئەو پەیمان نامەیە دەکات و ناوی پەیمان نامەی (مطيبين) ی لێ دەنێت و سەبارەت بە (مطيبين) ئەهلی سیرە هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێش پەیمانەکەی عەبدول موطەلیب نی یە، بەڵکو پەیمانی فزوڵە، کە پێغەمبەر ﷺ بەشداری تیادا کردووە، وە مەبەستیشی لە (مطيبين) هەر ئاماژەکردن بووە بۆ (حلف الفضول)، پێغەمبەر ﷺ لە چەند فەرموودەیەکدا باسی ئەم پەیماننامەیەی کردووە بەم جۆرە:

عەبدول ڕەحمانی کوڕی عەوف رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((شَهِدْتُ مع عمومتي حِلْفَ المُطَيَّبِينَ [و أنا غلام] فما أُحِبُّ أنَّ لي حُمْرَ النَّعَمِ وأنِّي أنكُثُه) [و أنا غلام] ))[٣٦]. واتە: (لەگەڵ ئامۆزاکانمدا ئامادەی پەیمانی (مطيبين) بووم

---

شرطهما، والبيهقي في (الدلائل) (٣٤/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٠٩)، وابن عساكر (١٨٧/١)، وقال الحافظ: في (الإصابة) (٧٩٥) رجاله ثقات وليس فيه منكر إلا هذه اللفظة (أى ذكر بلال و أبابكر)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٦٨)، وفي (صحيح الترمذي) (٢٨٦٢)، وفي (المشكاة) (٥٨١٩)، وقال: لكن ذكر أبابكر و بلال فخطأ ويحتمل أنها مدرجة فيه منقطعة من حديث آخر، وقال في (دفاع عن السيرة) (٧١): صحح حديث (بحيرى) كل من الترمذي والحاكم و الجزري وابن كثير وابن حجر و العسقلاني و السيوطي، وصحح إسناده أيضا الأرناؤوط في تحقيقه لـ(زاد المعاد) (٦٧/١).

(٣٥) أنظر: سيرة ابن هشام (١٨٢/١)، وابن كثير في (البداية) (٣٥٥/٢)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٨/٢).

(٣٦) أخرجه: أحمد (١٩٠/١)(١٦٥٥) وقال محققه: إسناده صحيح، والبخاري في (الأدب المفرد) (٥٦٧)، والحاكم (٢٢٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو يعلى (٨٤٤)، والبزار(١٩١٤) كشف الأستار، والطبري في (التفسير) (٣٦/٥)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٦٦/٦)، وفي (دلائل النبوة) (٣٧/٢)، وابن حبان (٤٣٧٣) وقال محققه إسناده صحيح، و صحح إسناده الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٧٥)، وفي (صحيح الأدب المفرد) (٤٤١) وفي (السلسلة الصحيحة) (١٩٠٠).

من ئەو کات منداڵ بووم، پێم خۆش نی یە هەموو وشترێکی قەڵەو و سەروەت و سامانێکی گەورەم بدەنێ بەوەی کە ئەو پەیمانە بشکێنم و نەیهێنمەدی).

١- جوبەیری کوڕی موطعم ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ما يسُرُّني أنَّ لي حمرَ النعمِ وأني نقضتُ الحلْفَ الذي في دارِ الندوَةِ))[٣٧] واتە: (پێم خۆش نی یە ئەگەر مێگەلێك وشتری قەڵەوی سوورم پێ ببەخشرێت، لەسەر ئەوەی پەیمان نامەکەی ناو (دار الندوة) هەڵبووە شێنمەوە).

٢- لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((قد شَهِدتُ مع عمومَتي حِلفًا في دارِ عبدِ اللَّهِ بنِ جُدعانَ ما أُحبُّ أن لي بهِ حُمْرَ النَّعَمِ ، ولَو دُعيتُ بهِ في الإسلامِ لأجَبتُ))[٣٨] واتە: (لە خانووەکەی عەبدوڵڵای کوڕی جودعاندا ئامادەی پەیمانێك بووم لە وشترە سوورە قەڵەوەکانم پێ خۆشترە وە ئەگەر لە ئیسلامدا هەمان پەیمانم لێ داوا بکرێت بۆ جێ بەجێ کردنی دەچم).

پەیمانی (مطيبين) کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ باسی کردووە هەمان پەیمانی (الفضول) چونکە پەیمانی (مطيبين) پێش لە دایك بوونی پێغەمبەری خوایە ﷺ وەك ئیبنو حەبان دەفەرموێت: (ئەو پەیمانی (مطيبين)ەی کە پێغەمبەر ﷺ ناوی دەبات لە فەرموودەی (صحيح)دا پەیمانی (فضول)ە نەك پەیمانی (مطيبين)ی پێش لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ ، ئەوانەی کە (پەیمانی فزول) یان بەرپا کرد هەر ئەوانە بوون کە (حلف المطيبين) یان بەرپا کرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دووەمیش هەر ناو دەبات بە (حلف المطيبين))[٣٩].

پەیمانی فزوڵ هەر لەناو موسوڵمانانداا مابووەوە تا دوای پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ دەمە قاڵەی بوو لەگەڵ ئەمیری مەدینەدا هەمان شتی دووبارە کردەوە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە کە

---

(٣٧) أخرجه: الطبري (٩٢٩٠)، و صحح إسناده على شرط مسلم الشيخ شعيب الارناؤوط في تخريجه لـ (ابن حبان) (٢١٤/١٠).

(٣٨) أخرجه: ابن هشام في(السيرة) (١٨٢/١) وقال محققاه: مرسل حسن الإسناد، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٦٧/٦)، وابن سعد في (الطبقات) (١٠٣/١).

(٣٩) أنظر: صحيح ابن حبان (٤٣٧٤).

جەنگی (فوجار))[٤١]، لێرەدا ئاماژە بەشەڕی فوجاری یەکەم دەکات.

وە سەبارەت بە جەنگی فوجاری دووەم ئیبنو ئیسحاق ﷬ دەفەرموێت: ((جەنگی فوجار بەرپا بوو کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی بیست ساڵ بوو (واتە: پێنج ساڵ دوای جەنگی فوجاری یەکەم)، بۆیە ناوبراوە بە (جەنگی فوجار)، چونکە هەردوولا کینانە و قورەیش لەلایەك و قەیسی کوڕی عەیلان لەلایەك، هەرچی سەروەری و شکۆمەندی شاری مەککە کە بەهۆی کەعبەوە هەیبوو، پێشێلیان کرد، سەرۆکی قورەیش لەو کاتەدا حەربی کوڕی ئومەیە بوو، بەیانی تا نیوەڕۆ قەیسی کوڕی عەیلان سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر قورەیشدا و لە نیوەڕۆ بە دواوە قورەیش سەرکەوتنی بەدەست هێنا دژ بە قەیسی کوڕی عەیلان)[٤٢].

## کاری شوانێتی پێغەمبەر ﷺ و بەشداری کردنی لە بازرگانی دا

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەرەتاوە نەیدەویست ئەرك بێت بەسەر ماڵی مامیدا، ئەگەر بیر بکەیتەوە لە کەسێك کە بێ دایك و باوك و بێ خوشك و برا بێت لە ماڵی مامیدا شەو و ڕۆژ چۆن دەباتە سەر لەگەڵ هەژاری و بێ دەرەتانی ئەبوطالیب، چونکە دەست کورت بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو کە دانیشێت و ئەوان کاسبی بکەن و بیدەن بەم تا بیخوات، بەڵکو هەر لە منداڵییەوە بوو بە شوان) و نەیدەویست لەسەر ماندوو بوونی خەڵکی تر بژی، بەڵکو بە عارەقی ناوچەوانی خۆی دەیویست نان و پارەی خۆی پەیدا بکات، هەتا دەستی کرد بەو کارەی کە سەرجەم پێغەمبەرانی تر کردوویانە ئەویش شوانێتی مەڕ بوو.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: [((ما بعثَ اللّٰهُ نبيًّا إلَّا رعى الغنمَ))] واتە: (هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی خوا نەهاتووە کە شوانی مەڕی نەکردبێت، هاوەڵانی وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ فەرمووی: [بەڵێ منیش لەسەر چەند قیراتێکی کەم شوانیم دەکرد بۆ دانیشتوانی مەککە][٤٣].

---

(٤١) انظر: سيرة لابن هشام (١/٢٣٠).

(٤٢) انظر: سيرة لابن هشام (١/٢٣٠).

(٤٣) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٢٢٦٢)، وإبن ماجه في (السنن) (٢١٤٩) وسبق تخريجه.

لە ڕیوایەتی عەبدەی کوڕی حەزەنی ﷺ دەفەرموێت: (خاوەن وشترەکان و خاوەن مەڕەکان دەمەقاڵەیان بوو لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لایەکیان شانازیان بە خۆیانەوە کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بُعِثَ موسَى وهوَ راعي غنَم ، و بُعِثَ داود وهوَ راعي غنَمٍ ، و بُعِثْتُ أنا وأنا أرعَى غنمًا لأهلي بأجيادٍ))[٤٤] واتە: موسا کاتێك خوا کردیە پێغەمبەر ﷺ شوانی مەڕ بوو، داودیش کاتێك خوا کردیە پێغەمبەر ﷺ شوانی مەڕ بوو ، منیش کاتێك خوا ناردمی شوان بووم، شوانی هەندێك لە مەڕەکانی خزمانم بووم لە شاخەکانی (ئەجیاد) دەملەوەڕاندن).

پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەورە بوو وەکو باقی پیاوەکانی ناو شاری مەککە خۆی سەرقاڵ کرد بە بازرگانی کردنەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە شاری مەککەی ئازادکرد چاوی کەوتەوە بە شەریکە کۆنەکەی کە ناوی سائیبی کوڕی ئەبو سائیب بوو، یادی زەمانی زووی لەگەڵ کردەوە کە هەر دووکیان بەیەکەوە قازانج بە شەراکەت ئیشیان دەکرد و بازرگانیان دەکرد، وەك لەو ڕیوایەتەدا هاتووە کە دەفەرموێت: (کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ بە شەریکەکاری کۆنی خۆی گەیشت لە کاتی گرتنەوەی شاری مەککەدا کە ناوی ئەبو سائیب بوو پێی فەرموو: ((مرحبًا بأخي وشريكي كان لا يُدارِي ولا يُمارِي يا سائبُ قد كُنْتَ تعمَلُ أعمالًا في الجاهليَّةِ لا تُقبَلُ منك وهي اليومَ تُقبَلُ منك))[٤٥] واتە: (پێشوازی دەکەم لە برا و شەریکم کە هیچی لێ نەدەشاردمەوە دەمەقاڵەی لەگەڵمدا نەدەکرد، ئەی سائیب چەند کارێکت دەکرد لە زەمانی نەفامیدا لێت وەرنەدەگیرا، ئەو کارانە ئەمڕۆ لێت وەردەگیرێت)، وە سائیبیش شانازی دەکرد بە کار کردنی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ، و باسی خوڕەوشتی جوانی پێغەمبەری ﷺ دەگێڕایەوە وە کاتێك بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت دەیفەرموو: (ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ شەریکم بوویت لە زەمانی پێشتردا، و چاکترین شەریك هەر تۆ بوویت، دەمەقاڵەت لەگەڵ نەدەکردم و هیچت لێ نەدەشاردمەوە)[٤٦].

---

(٤٤) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٢/٣) (١١٩١٨) وقال محققه: حديث صحيح، والبخاري في (الأدب المفرد) (٥٧٧) والنسائي (الكبرى) (١١٣٢٤)، والبيهقي في (الدلائل) (١٣٤/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (٤٤٩) وفي (السلسلة الصحيحة) (٣١٦٧).

(٤٥) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٢٥/٣) (١٥٥٠٥) وقال محققه:إسناده ضعيف، وابن أبي شيبة (٥٠٥/١٤)، والنسائي في (عمل اليوم و اليلة) (٣١٢)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٦٦١٨)، والحاكم (٦١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٣٧): رواه أحمد والطبراني في الكبير ورجاله رجال الصحيح.

(٤٦) أخرجه: ابن ماجه (السنن) (٢٢٨٧)، وأبو داود (٤٨٣٦)، والبيهقي (٧٨/٣)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٦٦٢٠)،

# ژن هێنانی پێغەمبەر ﷺ

ئیبنو هیشام ﵀ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی گەیشتە بیست و پێنج ساڵ خەدیجەی کچی خوەیلیدی ﵂ خواست. ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: خەدیجەی کچی خوەیلید ئافرەتێکی بازرگانی ناو شاری مەککە بوو، خاوەن پارە بوو سەروەر و شکۆمەند بوو، پیاوانی بەکرێ دەگرت و شەراکەتی لەگەڵدا دەکردن بۆ سەر مەرزی شام، قورەیش هەر هەموویان سەرقاڵ بوون لەو کاتەدا بە بازرگانی یەوە، وە کاتێ هەواڵی پیاوێکی دەست پاك و داوێن پاکی پێگەیشت کە ناوی محمدە پێی خۆش بوو کە کەسانێکی وا بگرێت بەکرێ و کاربکات لە ماڵەکەیدا، و هەر لەبەر دەست پاکی و خورەوشت جوانی پێغەمبەر ﷺ خەدیجە ناردی بە دوایدا و پێشنیارێکی خستە بەردەم کە بەشداری بکات لە بازرگانیەکەیدا بۆ مەرزی شام، و پەیمانیشیدا بە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەو ڕازی بێت و بەشداری ئەو بازرگانی یە بکات ئەوا لە هەموو کەس چاکتر پاداشتی بداتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو بەو پێشنیارە، لەگەڵ خزمەتکارەکەی خەدیجەدا کە ناوی مەیسەرە بوو بەڕێکەوت بەرەو مەرزی شام)[٤٧].

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قازانجی لەم کارکردنەدا چی بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها لە یەك فەرموودەدا هاتووە کە (ضعیف)ە و لە جابرەوەیە کە دەڵێت: (کرێی خۆم وەردەگرت لە خەدیجە لەو دوو سەفەرەدا کە بەشداریم کرد بۆ مەرزی شام بۆ هەر جارەش بە قەلوسێ (واتە وشترێکی سێ ساڵ))[٤٨].

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (خەدیجەی کچی خوەیلید ﵂ ئافرەتێکی زۆر ژیر و وریا بوو، لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەورە دەیویست زیاتر ڕێزی پێ ببەخشێت ئەویش لە ڕێگەی کردنی بە هاوسەری پێغەمبەرەکەی خۆی، کاتێ کە مەیسەرە گەڕایەوە و هەواڵی پێغەمبەری ﷺ گەیاند بە خەدیجەی خاوەنی، خەدیجەش ﵂

وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٨٥٣).

(٤٧) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٣٣/١).

(٤٨) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٨٢/٣)، وصححه ووافقه الذهبي، وضعفه الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (١٤٨٣) و(ضعيف الجامع) (٢)، (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).و(لايحتج به)).

وەکو دەگێڕنەوە پێغەمبەری ﷺ بانگ کرد و پێی وت: ئەی ئامۆزا من تۆم زۆر چووە بە دڵدا لەبەر نزیکی و خزمایەتی وە لەبەر پلە بەرزی و خوڕەوشت جوانی و دەست پاکی و ڕاست گۆییت، پاشان خۆی پێشنیاری کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ تا بیخوازێت، خەدیجەش ﷺ ئەو ڕۆژە گەورەترین و ناودارترین ئافرەتی بازرگانی ئەهلی مەککە بوو چ لە سەروەت و ساماندا و چ لە سەروەری و سەربەرزیدا وە خەدیجە زۆری پێ خۆش بوو کە پێغەمبەر ﷺ ڕازی بێت و بیخوازێت، پێغەمبەریش ﷺ ئەم مەسەلەیەی درکاند لای مامەکانی و پاشان حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیبی برای شیری و مامی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتن بۆلای خەدیجەی کچی خوەیلیدی کوڕی ئەسەد ﷺ لەوێ خەدیجەیان خواست بۆ پێغەمبەر ﷺ)[٤٩].

لە ڕیوایەتێکی لاوازی ئیبنو عەباسدا ﷺ هاتووە کە خەدیجە خۆی وای کرد کە باوکی قایل بکات بەوەی کە ڕازی بێت لەسەر ئەو کارە بۆ پێغەمبەر ﷺ وەك دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی داوای خەدیجەی کرد باوکی ڕازی نەبوو کە خەدیجە بدات بە پێغەمبەر ﷺ، خەدیجەش ﷺ دەعوەتێکی ئامادە کرد بۆ پیاوانی قوڕەیش و شەرابێکی زۆری بۆ ئامادە کردن، و پاشان پیاوانی بەرزی قوڕەیشی هاتن بۆ ئەو دەعوەتە و نانیان خوارد و شەرابیان زۆر خواردەوە تا هەموو سەرخۆش بوون، پاشان خەدیجە لە ناو هەموو کەسانی قوڕەیشدا کە لەوێ بوون بە باوکی وت کە محمدی کوڕی عەبدوللا هاتووە بۆ داوام و تۆش ڕازی ببە و ئەویش ڕازی بوونی خۆی ڕاگەیاند، و خەدیجەش پۆشاکێکی تازەی کرد بە بەری باوکیدا چونکە عادەت وابوو ئەو زەمانە کە دەبوو کچ شتێ بکات بۆ باوکی، و پاشان کاتێ باوکی سەرخۆشی یەکەی بەریدا و هاتەوە هۆشی خۆی و تەماشای کرد بەرگێکی تازەی لەبەردایە وتی: ئەمە چی یە من بۆ وام؟ خەدیجەش ﷺ وتی: ئەی منت مارە نەکرد لە محمدی کوڕی عبدالله؟ وتی: چۆن من مارەت دەکەم لە کابرایەکی بێ باوك، نەخێر شتی وا ناکەم، خەدیجەش ﷺ وتی: بۆ شەرم ناکەیت لە خۆت دەتەوێ لەلای قوڕەیش خۆت بە بێ ئەقڵ بناسێنیت وە دەتەوێت خەڵکی بزانن تۆ سەرخۆش بوویت و وا و وا

(٤٩) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٣٥/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٦٦/٢)، والطبري في (التأريخ) (٢٨٠/٢) عن طريق ابن إسحاق.

بوویت...... بەم شێوەیە قسەی بۆ کرد تا ڕازی کرد)[٥٠]، وە مارەییەکەی وەکو ئیبنو هیشام رحمه الله دەفەرموێت: (بیست وشتری دوو ساڵان بوو).

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (خەدیجەش رضي الله عنها یەکەم ئافرەت بوو کە پێغەمبەر ﷺ بیخوازێت ، و تا لە ژیاندا بوو بەهیچ جۆرێك ژنێکی تری بەسەر نەهێنا، هەموو منداڵەکانیشی کە خوای گەورە پێی بەخشی بوو لە خەدیجە بوو جگە لە (إبراهیم)، ئەوانیش (قاسم) کە کونیەی بوو (واتە بە پێغەمبەر ﷺ دەوترا (ئەبو قاسم) (لەگەڵ کوڕەکەیدا کە ناوی (عبدالله) بوو کە نازناوی (طیب و طاهر) ی لێ نرابوو لەگەڵ چوار کچە بەڕێزەکەیدا (ڕوقیە و زەینەب و ئوم کلثوم و فاطمە))[٥١].

تەمەنی خەدیجە رضي الله عنها لە دوو ڕیوایەتدا هاتووە، ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (خەدیجە رضي الله عنها کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ خواستی تەنها تەمەنی بیست وهەشت ساڵ بوو)[٥٢]، وە لە ڕیوایەتێکی ئیمامی واقیدیدا رحمه الله دەفەرموێت: (لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو)[٥٣]، دیارە ڕیوایەتەکەی ئیبنو ئیسحاق لە پێشترە و نزیکترە لە ڕاستی یەوە، چونکە واقیدی (متروك)ە وەحەدیسی لێ وەرناگیرێت.

## تازە کردنەوی کەعبەی پیرۆز

ئیبنو هیشام رحمه الله دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو، قوڕەیش هەموو کۆبوونەوە بۆ بنیات نانی کەعبە، تا سەرلەنوێ تازەی بکەنەوە و نیازیان وابوو کە بەرزی بکەنەوە و سەربانی بۆ دروست بکەن، چونکە کەعبە سەرەتا بەرزە کەڵەکێك بوو وە سەربانی نەبوو، وە بە ئەندازەی باڵای پیاوێك بوو، دەیان ویست بەرزی بکەنەوە، چونکە هەندێك لە چەتەکان درکیان کردبوو بە گەنجینەکەی ناو کەعبە و دزیبوویان لە لای دەریای سووریش بەلەمێك کەوتبوو

---

(٥٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٣١٢/١) (٢٨٤٩) وقال محققه: إسناده ضعيف، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٧٣/٢)، والطبراني في (الكبير) (١٢٨٣٨)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (٢٢٠/٩) رواه أحمد والطبراني ورجالهما رجال الصحيح، وقال ابن أثير (أسد الغابة) (٨١/٧) قيل: أن عمها عمرو بن أسدٍ قد زوجها، وإن أباها ماتت قبل ذالك.

(٥١) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٣٦/١).

(٥٢) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٨٢/٣).

(٥٣) أخرجه: ابن سعد في (الطبقات) (١٧/٨).

تێك شكابوو لای (جده) كه هی پیاوێكی بازرگانی ڕۆم بوو، قورەیش پێیان وابوو كه داری ئەو بەلەمه بهێنن و دیسان كەعبەی پێ بنیات بنێنەوە، چونكه له شاری مەككەدا كابرایەكی دارتاشی (قبطی) لێ بوو، بۆیه به پێویستیان زانی كەعبەی پێ بنیات بنێنەوە)[٥٤].

ئەبو توفەیل ﷺ دەفەرموێت: (كەعبه له زەمانی نەفامیدا كەڵەكێكی بەرد بوو، دیوارەكانی كۆن بوو وه كەلەبەردەكانی بزنی پێوه دەچوو، سەقفی نەبوو بۆیه سەرەتا بەرگێكیان بۆ كەعبه دروست كرد، بۆ ئەوەی كه ئاژەڵ نەچێته ناوی، و (الحجر الاسود)یش وەك ڕیزێك دانرابوو لەسەر دیوارەكەی، وه كەعبەش ئەو كاته چوار گۆشه نەبوو بەڵكو خڕ بوو وەكو ئەڵقه و تەنها دوو ڕوكنی هەبوو، كەشتی یەك له وڵاتی ڕۆمەكانەوه بەڕێكەوت تا گەیشته نزیك (جدة) لەوێ تێك شكاو پەكی كەوت و قورەیش ویستیان بچن دارەكەی بهێنن و چاویان به ڕۆمی یەكی دارتاش كەوت داوای دارەكانی كەشتیەكەیان لێ كرد و ئەویش پێی بەخشین، ڕۆمییەكەشیان هێنا و دارەكەشیان هێنا بۆ بنیات نانەوەی كەعبه، قورەیش وتیان: بەم دارەی كه هێناومانه ماڵەكەی خوای خۆمانی پێ بنیات دەنێین و دروستی دەكەینەوە، له كاتێكدا ویستیان ئەو كەڵەكه دیوارانەی كەعبه بڕوخێنن بینیان لەسەر ئەو كەڵەكه گەورانه ڕەشمارێكی گەوره هەبوو سەری پشتی ڕەش بوو وه سەرسنگی زۆر سپی بوو، كاتێ كه نزیك دەبوونەوه له كەعبه تا بیڕوخێنن، مارەكه پەلاماری دەدان و شاڵاوی بۆ دەبردن و ئەوانیش دەترسان، پاشان پاڕانەوه له خوای گەوره و وتیان: خوایه ئێمه تەنها ڕێز و تەشریف نەبێت بیگەیەنین بەماڵەكەی تۆ نیازی هیچ شتێكی ترمان نی یه ئەگەر پێت خۆشه ئەمەمان لێ دوور بخەرەوه و پەروەردگار ئەگەر ڕازی نیت چی دەكەیت بیكه بەویستی خۆت، دەڵێن: گوێیان له شتێك بوو له ئاسمان هاته خوار و تەماشایان كرد باڵندەیەكی ڕەشی گەورەیه سەر پشت و سنگ و هەردوو قاچی سپی یه و زۆر گەورەتر بوو له مرۆڤ، هات به هەردوو چنگی پەلاماری مارەكەیدا و هەڵی گرت، دووری خستەوه بۆ شوێنێكی زۆر دوور و فڕێی دا)[٥٥].

---

(٥٤) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢٣٩/١)، والبيهقي في (الدلائل) (٦١/٢)، والطبري في (التأريخ) (٢٨٦/٢).

(٥٥) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢٤٠/١)، والبيهقي في (الدلائل النبوة) (٦١/٢).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کۆبوونەوە بۆ ڕوخاندنی کەعبە و تێکدانی دیوارەکانی ئەبو وەهبی کوڕی عەمری کوڕی عائز هات و ویستی بەردێك لە کەعبە لابدات، بەردەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە و چووە وە شوێنی خۆی لە ناو کەڵەکەکەدا، ئەویش ڕووی کردە کۆمەڵانی قورەیش و پێی وتن: هۆ کۆمەڵانی قوڕەیش بە هیچ شێوەیەك پارەی حەرام تێکەڵاوی ئەو پارەیە مەکەن کە ئامادەتان کردووە بۆ دروست کردنەوەی کەعبە، بەو شێوەیە ڕازی بوون کە مارەیی ئافرەتی داوێن پیس و پارەی سو وە پارەیەك کە لە زوڵمدا پەیدا کرابێت تێکەڵ بەو پارەیە نەکەن، خەڵکان زۆر دەترسان لەوەی کە چۆن ئەو کەڵەکە دیوارانە تێك بدەن و بیڕوخێنن، چونکە ئەمە ماڵی خوای گەورەیە، تا ئەوە بوو وەلیدی کوڕی موغیرە وتی: ئەوا من دەست پێشخەری دەکەم لە ڕوخاندنیدا، پاچی هەڵگرتوو چووە سەر دیواری کەعبە و وتی: خوای گەورە خۆت دەزانیت کە تەنها مەرامی خێر نەبێت هیچ نیازو مەرامێکی ترمان نیە بە حەرەمی ماڵی خۆت، لایەکی ڕوخاند و ئەو شەوە هیچ کەس نەیدەوێرا نزیك بکەوێتەوە لە کەعبە، وتیان: تەماشای وەلید دەکەین ئەگەر خوا غەزەبی لێ گرت و لە ناوی برد تا بەیانی ئەوا دیارە خوا پێی ناخۆشە کە کەعبە دروست بکەینەوە، ئەگەر هیچیشی لێ نەهات دیارە پێی ڕازی یە و ئێمەش بەشداری دەکەین، ئەوە بوو بەیانی هەمووی چاوەڕێی وەلید بوون، کە بینیان وەلید سەلامەتە و هیچی لێ نەهاتووە و دێت کارەکەی دوێنێی تەواو بکات ئیتر هەموویان بەیەکجار چوون و یارمەتیاندا لە هەڵوەشاندنەوەی کەعبەدا و هەڵیان کەند تاگەیشتنە بناغەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ کە چەند بەردێکی سەوز بوو بەیەکەوە لکابوو وەکو سمی وشتر)[٥٦].

پاشان قورەیش ڕوخاندیان و بە بەردەکانی شیوی شاری مەککە دروستیان کردەوە، ئەو بەردانەیان بەسەر شان هەڵ دەگرت، دروستیان کرد و بەرزیان کردەوە بە ئەندازەی بیست گەز بە ئاسماندا، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان بەردی لە (ئەجناد)ەوە دەهێنا پۆشاکێکی خەت خەتی لەبەردا بوو پۆشاکەکەی لەبەر خۆی داکەند و خستییە سەرشانی بۆ ئەوەی بەردەکە ئازاری شانی نەدات، هاواری لێ

(٥٦) أخرجه: الطبراني في (الكبير)، وأحمد (٤٥٥،٤٥٤/٥)، وقال الهيثمي: في (مجمع الزوائد) (٢٨٩/٣) (٥٧٢٩) رواه الطبراني في (المعجم الكبير) بطوله وروى أحمد طرفا منه ورجالهما رجال الصحيح، و صحح إسناده العمري من طريق (أحمد) في (السيرة النبوية الصحيحة) (١١٥/١).

کرا: ئەی محمد عەورەتت داپۆشە، ئیتر دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ عەورەتی بە هیچ شێوەیەك نەبینراوە، ماوەی نێوان تازەکردنەوەی کەعبە تا هاتنی (وحي) بۆ پێغەمبەر ﷺ تەنها پێنج ساڵ بوو)[٥٧].

وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا وە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەردی لەگەڵ دەگوێزانەوە و پەشتەماڵێکی لەبەردا بوو مامی پێی وت: ئەی برازام ئەوە بۆچی پۆشاکەکەت ناکەیتەوە و بیخەیتە سەرشانت تا بەردی بخەیتە سەر بۆ ئەوەی سەرشانت ئازاری پێ نەگات؟ ئەویش پەشتە ماڵەکەی لە خۆی کردەوە کاتێك ویستی بیخاتە سەرشانی بە پشتدا کەوت و بورایەوە، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بە ڕووتی نەبینراوە)[٥٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو طوفەیلەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کەعبە دروست کرایەوە خەڵکی هەموویان بەردیان دەهێنا بۆ دروست کردنەوەی، پێغەمبەریش ﷺ هاوکاری دەکردن، کاتێ پۆشاکەکەی دانا لەبەر خۆیدا و خستی یە سەر شانی هاواری لێ کرا: عەورەتت دابپۆشە، پێغەمبەر ﷺ بەردەکەی فڕێدا و پۆشاکەکەی لەبەر کردەوە....)[٥٩]. لە ڕیوایەتێکی تردا لە عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ بەردمان دەگوێزایەوە بۆ کەعبە پیاوانی قوڕەیش دوو دوو بەردیان دەهێنا و ئافرەتانیش ئاویان دەکێشا بۆ دروست کردنەوەی کەعبە، من و پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە بەردمان بەسەر شان دەگوێزایەوە کراسەکانمان لەبەر خۆمان داکەند و دەمانخستە سەرشانمان و بەڕووتی دەڕۆیشتین، ئەگەر خەڵکانێکمان لێ نزیك ببوایەوە خۆمان دادەپۆشی، جارێکیان کە دەڕۆیشتین پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە بوو جلێکی لەبەردا بوو دایکەند بوو بە پشتا کەوت و منیش بەردەکەم لەسەر شانم فڕێدا و گەیشتمە سەری تەماشام کرد چاوی ئەبڵەق بووە بەرەو ئاسمان وتم: ئەوە چیتە؟ ئەویش هەستا و پەشتە ماڵەکەی دایەوە بە خۆیدا و فەرمووی: [من داوام لێکراوە کە هەرگیز بە ڕووتی نەگەڕێم]، دەفەرموێت: منیش ئەم وتەیەم دەشاردەوە لە خەڵکی نەوەك بڵێن محمد

---

(٥٧) أخرجه: ابن هشام في (السيرة النبوية) (٢٤٠/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٦٠/٢).

(٥٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٢٩)، ومسلم (الصحيح) (٣٤٠).

(٥٩) أخرجه: أحمد (٤٥٥/٥) (٢٣٧٩٤) وقال محققه: إسناده قوي، وعبدالرزاق (١١٠٥)، والحاكم (١٧٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني: في (الثمر المستطاب) (٢٥٠/١) إسناده صحيح.

شێت بووە تاکو خوای گەورە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ﷺ ئاشکرا کرد)[٦٠].

دوای دروست کردنەوەی کەعبە و خۆئامادەکردن بۆ جێگیر کردنەوەی (الحجر الأسود) لەو کاتەدا قورەیش لێیان بوو بە دەمەقاڵە و سەرهەڵدانی شەڕ و ناکۆکی و دووبەرەکی لە ناویاندا، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (هۆزەکانی قورەیش دوای ئەوەی هەموو بەردەکانیان کۆکردەوە بۆ دروست کردنەوەی کەعبە، هەموو خێڵێك بەجیا بەردی بۆ خۆی دەهێنا، بۆ ئەوەی سەروەری بەجیا بۆ خۆی تۆمار بکات، کە دروستیان کرد و گەیشتنە شوێنی جێگیر کردنی بەردە ڕەشەکە هەموو تیرە و هۆزێك دەیویست ئەو سەروەرییە بۆ خۆی بێت، بۆیە هاوپەیمانیەتی یەکتریان دەکرد بۆ دژایەتی کردنی یەکتری تا وەخت بوو شەڕ دروست ببێت لە ناویاندا.

دەگێڕنەوە کە ئومەیەی کوڕی مەغیرە بەتەمەنترینی کەسانی ناو قورەیش بوو، سوڵحی کردن بەوەی پێی وتن: هەر کەسێك بەیانی زوو هاتە مزگەوتەکە (واتە کەعبە) ئەوا ئەوە بکەن بە حەکەم لە نێوانی خۆتاندا و لە قسەی دەرمەچن، هەموویان بەم پێشنیارە ڕازی بوون، و بەیانیش یەکەم کەس هاتە مزگەوتی کەعبەوە پێغەمبەر ﷺ بوو کە تەماشایان کرد وتیان: ئەوە ئەمینی دەست پاکە، ئێمە ڕازی دەبین ئەوە محمدە، کاتێ نزیك بوویەوە لێیان هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پۆشاکێك بهێنن، کاتێ هێنایان بە دەستی موبارەکی خۆی بەردە ڕەشەکەی خستە سەر پۆشاکەکە و پاشان داوای کرد لە هەموو هۆزەکانی قورەیش کە هەریەکەی چمکێکی بگرن، ئەوە بوو هەموویان هەڵیان گرت و بەرزیان کردەوە کاتێ گەیشتە جێی خۆی پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی (الحجر الأسود)ی لەو جێگەیە دانا.....)[٦١].

لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەفەرموێت: (کەعبەمان نۆژەن کردەوە، تا گەیشتینە شوێنی دانانی بەردە ڕەشەکە کە لە شێوەی سەری پیاودا بوو، زۆر بریقەدار بوو بە چەشنی ئاوێنە بوو کە مرۆڤ خۆی تیا دەبینی، هەموو

(٦٠) أخرجه: أحمد (٢٣٨٥) وقال محققه: إسناده قوي الطبراني في (المعجم الكبير) (٣٠٥/١٨)، والبزار (١١٥٨،١١٥٩)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٩٠/٣): رواه الطبراني في المعجم الكبير والبزار بنحوه و فيه (قيس بن الربيع) وثقه شعبة والثوري والطيالسي وضعفه جماعة.

(٦١) أنظر: (السيرة) ابن هشام (٢٤٢/١).

هۆزێك لە هۆزەکانی قوڕەیش دەیان وت: دەبێ ئێمە بیخەینە شوێنی خۆی و کەس بەشداریمان نەکات.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: قوڕەیشییەکان کاتێ کە دەمەقاڵەیان بوو تا نزیك بوو شەڕێکی گەورە بەرپا ببێت لە نێوانیاندا، وتیان: یەکەم کەس کە دێتە ژوورەوە لە دەرگای بەنی شەیبەوە ئەوە بکەن بە حەکەم لە نێوانتاندا، ئەو ڕۆژە یەکەم کەس کە هات پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە ناویان دەبرد بە (الأمین) وتیان: ئەوە محمدی متمانە پێکراو و دەست پاکە و ڕازین بە هەموو بڕیارێکی، پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی داوا کرد، پاشان ئامادەکرا و ڕاخرا و بە دەستی موبارەکی بەردەکەی خستە سەر[٦٢]، و هەموو تیرە و هۆزەکانی شاری مەککەی بانگ کرد، و هەر یەکەی چەمکێکیان گرت، پاشان هەڵیان گرت و بەدەستی موبارەکی خۆی بەردەکەی خستە جێی خۆی)[٦٣].

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی عەلیدا ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کەعبە ڕووخا دوای جورهوم قوڕەیش دروستی کردەوە ، کاتێ گەیشتنە شوێنی دانانی (حجر الأسود) لەناو خۆیاندا بوو بە دەمەقاڵەیان لەسەر ئەوەی کامیان دای بنێت، ڕێکەوتن کە یەکەم کەس لەدەرگای بەنی شەیبە بێتە ژوور بیکەن بەدادوەر لە نێوانیاندا، دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ هات و بەو شێوەیەی پێشوو باسکرا ڕێکی خستن)[٦٤].

قوڕەیش بەو جۆرە کەعبەیان دروست کردەوە، بەڵام پارە و خەرجی تەواویان نەبوو تا کەعبە لەسەر بناغەی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ دروست بکەنەوە، لەبەر ئەوە بەشێك لە کەعبەیان بۆ بنیات نەنراو وازیان لێ هێنا و ناویان لێنا (حیجر)، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی گێڕایەوە و ویستی وا بوو کە دیسان کەعبە بڕوخێنێت و بنیاتی بنێتەوە، بەڵام ویستەکەی خۆی نەهێنایە دی لەبەر بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان.

---

(٦٢) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (١٧٩/٤).

(٦٣) أخرجه: أحمد في (المسند) (٤٢٥/٣) (١٥٥٠٤) وقال الأرناؤوط في تحقيقه: إسناده صحيح، والطيالسي في (المسند) (٨٦/٢)، والحاكم في (المستدرك) (٤٥٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٤٨)، حديثٌ حسن، وكذلك وفي (صحيح السيرة النبوية) (ص:٤٥) محقيق كتاب الشفا (٣١٦) إسناده حسن.

(٦٤) أخرجه: البيهقي في (دلائل النبوة) (٥٦/٢)، وحسنه الشيخ شعيب الأرناؤوط في تحقيقه (المسند) (١٥٥٠٤).

دایکی باوەڕداران عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يا عَائِشَةُ، لَوْلَا أنَّ قَوْمَكِ حَديثُ عَهْدٍ بجَاهِلِيَّةٍ، لَأَمَرْتُ بالبَيْتِ، فَهُدِمَ، فأدْخَلْتُ فيه ما أُخْرِجَ منه، وأَلْزَقْتُهُ بالأرْضِ، وجَعَلْتُ له بَابَيْنِ: بَابًا شَرْقِيًّا، وبَابًا غَرْبِيًّا، فَبَلَغْتُ به أَسَاسَ إبْرَاهِيمَ)). واتە: عائیشە لەبەر ئەوە نەبووایە کە قوڕەیش هێشتا نزیکن لە نەفامیەوە و تازە موسوڵمان بوون، ئەوا فەرمانم دەدا کەعبە بڕوخێنن و ئەوەی کە لێیان تەرك کردووە بیخەمەوە سەری، و دەرگاکەی بلکێنم بە زەوی یەوە و دوو دەرگای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بۆ دروست بکەم و بیگەیەنمەوە سەر بناغەکەی ئیبراهیم ﵇)[٦٥].

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە عائیشەوە ﵂ دەفەرموێت: (پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئایا (حیجر) (بەشێکە لە کەعبە یان لە دەرەوەی کەعبەیە؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ بەشێکە لە کەعبە، وتم: ئەی بۆچی نەیان خستە ناو کەعبەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بهِمُ النَّفَقَةُ)) واتە: قەومەکەت خەرجییەکەیان دەری نەهێنا تا ئەویش بخەنە ناو کەعبەوە، وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەرگاکەیان بەرز دروست کردووە؟ فەرمووی: ((فَعَلَ ذلكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَن شَاؤُوا ويَمْنَعُوا مَن شَاؤُوا، ولَوْلَا أنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بالجَاهِلِيَّةِ، فأخَافُ أنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، أنْ أُدْخِلَ الجَدْرَ في البَيْتِ، وأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بالأرْضِ.)) واتە: خزمەکانت وایان کرد بۆ ئەوەی تەنها کەسانێك کە خۆیان بیانەوێت بچێتە ناوی و کەسی تر نەچێتە ناوی، بەڵام لەبەر ئەوە نەبێت کە خزمەکانت تازە موسوڵمانن و نزیکن لە زەمانی نەفامییەوە، ئەترسم کە دڵیان بگۆڕێت، ئەو بەشەی بخەمەوە سەر کەعبە و دەرگاکەی بلکێنم بە زەوی یەوە (گەر وانەبووایە بەو جۆرە دروستم دەکردەوە)[٦٦].

مەقامی ئیبراهیم هەر لە زەمانی ئیبراهیم ﵇ و زەمانی پێغەمبەریش ﷺ لکابوو بە دیواری کەعبەوە تا ئیمامی عومەر لە زەمانی خۆیدا دووری خستەوە لە کەعبە. قتادە ﵀ دەفەرموێت: (مەقامی ئیبراهیم ﵇ هەر لە کۆنەوە لکابوو بە دیواری کەعبەوە تا ئیمامی عومەر ﵁ دووری خستەوە لە کەعبە)[٦٧].

---

(٦٥) أخرجه: البخاري (١٨٥٦)، واللفظ له، ومسلم في (الصحيح) (١٣٣٣)، وأحمد في (المسند) (٥٧/٦)، والنسائي في (السنن) (٢١٦/٥)، و مالك في (الموطأ) (٣٣٢/١)، وعبدالرزاق في (المصنف) (٩١١٦)، والحاكم في (المستدرك) (٤٧٩/١)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٩٠/٥)، وابن حبان في (الصحيح) (٣٨١٦).

(٦٦) أخرجه: البخاري (١٥٨٤).

(٦٧) أخرجه: عبدالرزاق بإسناد صحيح، كما قال ابن حجر العسقلاني في (فتح الباري) (١٦٩/٨).

## خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ دەپارێزێت لە پێش بوون بەپێغەمبەریدا

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری ئازیز ﷺ گەورە بوو ، خوای گەورە پاراستی لە هەموو کارێکی نابەجێی نەفامی، چونکە دەیویست ئەو هەموو ڕێز و سەروەری یەی پێ ببەخشێت و بیخاتە ڕیزی پێغەمبەرانەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە ناو خزمەکانیدا لە هەموویان خوڕەوشت جوانتر بوو، لە هەموویان چاکەی زۆرتر بوو، لە هەموویان بەشەرمفتر بوو، لە دراوسێتیدا لە هەموویان چاکتر بوو، لە هەموویان لەسەر خۆتر بوو، لە هەر هەموویان ڕاستگۆتر و دەستپاکتر بوو، دوورترین کەس بوو لەو خراپانەی کە مرۆڤی پێ لەکەدار دەبێت. خزمانی خۆی بەدان پیانانی خۆیان نازناوی (الصادق الامين) واتە: ڕاستگۆ و متمانە پێکراویان لێ نابوو چونکە خاوەنی ئەو هەموو خوڕەوشتە جوانانە بوو)[٦٨].

### لەو نموونە بەرزانەی کە ئەم ڕاستی یە دەسەلمێنن:

**یەکەم:** ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما همَمْتُ بقبيحٍ ممَّا يهُمُّ به أهلُ الجاهليَّةِ إلَّا مرَّتَيْنِ مِن الدَّهرِ كلتاهما عصَمني اللهُ منهما......الخ) واتە: نیازی ئەنجامدانی شتێکی ناشرینم نەکردووە لەوەی کەسانی زەمانی جاهیلی کردوویانە تەنها دوو جار نەبێت، هەردوو جارەکەش خوای گەورە منی پاراست. شەوێکیان گەنجێك لە قوڕەیش لەگەڵمدا بوو لە ناو مەڕەکاندا هەردووکمان دەمانلەوەڕاندن پێم وت: ئاگات لە مەڕەکانم بێت تا ئەم شەو دەچمەوە مەککە و شەوچەرە دەکەم وەك گەنجەکانی مەککە شەوچەرە دەکەن، وتی: بەڵێ باش، منیش چووم تا گەیشتمە یەکەم خانوو لە خانووەکانی مەککە (واتە: ئەو پەڕی شاری مەککە) گوێم لە دەنگی گۆرانی و دەف و جوزەلە بوو وتم: ئەمە چی یە؟ وتیان: ئەوە فلاَن ژنە شووی کردووە بە فلاَن پیاو ، باسی پیاوێکی قوڕەیشیان کرد کە کچێکی قوڕەیشی گواستۆتەوە، منیش وەستام لەوێ و ویستم گوێ بگرم لە ئاهەنگەکە دەست بەجێ چاوم چووە خەو و خەوم لێ کەوت، تا گەرمایی تیشکی خۆری بەیانی بە ئاگای هێنامەوە، پاشان هاتمەوە بۆلای هاوەڵەکەم و پێی وتم: چیت کرد؟ منیش

(٦٨) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٢٩/١).

هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە، و پاشان شەوی دووەمیش بە هەمان شێوە دووبارەم کردەوە و بە هەمان شێوە هاتم تا گوێ بگرم بەڵام بە هەمان شێوە چاوەکانم چووەخەو تا تیشکی خۆر بەئاگای هێنامەوە و گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکەم و هەمان شێوە پرسیاری لێ کردم و وتی: چیت کرد؟ منیش لە وەڵامدا وتم: هیچم نەکرد، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: وەڵاهی دوای ئەو دوو جارە نیازی هیچ کارێکی ناشرینم نەبووە لەوکارانەی خەڵکانی لەسەردەمی نەفامی ئەنجامیان دەدا تا پەروەردگار ڕێزی لێ گرتم بە پێغەمبەرایەتی)[٦٩].

**دووەم:** عوروەی کوڕی زوبێر ﷺ دەفەرموێت: (دراوسێیەکی خەدیجەی کچی خوەیلید ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ بە خەدیجەی دەفەرموو پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ﷺ: (أيْ خديجةُ، واللهِ لا أعبُدُ اللَّاتَ أبدًا، واللهِ لا أعبُدُ العُزَّى أبَدًا) واتە: ئەی خەدیجە وەڵاهی من هەرگیز (لات) ناپەرستم و هەرگیزیش (عوزا) ناپەرستم، خەدیجەش ﷺ لە وەڵامدا دەیوت: باشە واز لە (لات)، و لە (عوزاش) بهێنە. لات و عوزا دوو بت بوون لە زەمانی جاهلیەتدا هەبوون)[٧٠].

**سێهەم:** زەیدی کوڕی حارثە ﷺ دەفەرموێت: (جارێکیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ تەوافم دەکرد بە چوار دەوری کەعبەدا هەر بە ئەنقەست دەستمدا لە یەکێك لە بتەکانی ناو کەعبە، پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: [دەستی لێ مەدە]، منیش دووەم جار وتم ئەبێ دەستی لێ بدەم تا بزانم چی وەڵام دەداتەوە دووەم جاریش هەروام کرد و فەرمووی: [ئایا پێم نەوتی دەستی لێ مەدە!!] دەفەرموێت [سوێند بەو خوایەی کە ڕێزی لە پێغەمبەر ﷺ گرتووە لەو دوو جارە بە دواوە دەستم بە هیچ بتێکدا نەهێناوە و پێغەمبەر ﷺ دەستی لە هیچ بتێك نەداوە تا خوا ڕێزی لێ گرت بە پێغەمبەرایەتی][٧١].

(٦٩) أخرجه: أبو نعيم في (الدلائل) (١٢٨)، والحاكم (٢٤٥/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٣٣/٢)، والبزار (٢٤٠٣)، وابن حبان (٦٣٧٢) واللفظ له، وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٢٦/٨): رواه البزار ورجاله ثقات، و حسن إسناده أيضاً الحافظ كما في (المطالب العالية) (٤٢٥٩)، و البوصيري كما في (مختصر الأتحاف) (٧١١٩).

(٧٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٢٢/٤) وفي (٣٦٢/٥) رقم (١٧٩٤٧) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٢٥/٨): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ مقبل في (الجامع الصحيح) (١٩٥/٦): حديث حسن، وحسنه ايضا الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:٣٢).

(٧١) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٤٦٦٥) واللفظ له، والبزار في (كشف) (٢٨٣/٣)، والحاكم (المستدرك) (٢١٦/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وأبو يعلى (٣٧٢/٦)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٢٦/٨): رواه

له بایەخ دانی خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە پاراستی لەو داهێنراوانەی لە زەمانی جاهیلیدا لە حەجدا دروست کرابوون وەکو ئەوەی کە هاوبەش پەیداکاران لایان سووکی بوو خەڵکی مەککە بچنە ناو خەڵکی دەشتەکی یەوە و بوەستن لەگەڵیاندا لە عەرەفات، بەڵکو لەو بەری عەرەفەوە بۆ خۆیان دادەنیشتن لە ژێر سێبەردا و دەبووایە دەشتەکیەکان و عەشایەرەکان بچن لەوبەر شاخی عەرەفەوە لەبەر خۆرەکەدا بوەستن، جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوام بینی ﷺ پێش ئەوەی کە وەحیی بۆ بێت، بەسەر حوشترەکەیەوە لە عەرەفات لەگەڵ خەڵکەکە وەستا بوو ، لەگەڵیاندا دەڕۆیشت منیش پێم سەیربوو)[٧٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وشترێکم لێ وون بوو بوو لە کاتی ئەنجام دانی حەجدا ڕۆیشتم تا بیدۆزمەوە لای کێوی عەرەفە لەوێ چاوم بە پێغەمبەر ﷺ کەوت کە لەناو خەڵکاندا دەڕۆیشت و منیش پێم سەیر بوو وتم: باشە خۆ پێغەمبەر ﷺ خەڵکی مەککەیە لە ناو ئەم خەڵکانەدا چی دەکات؟ بۆ لێرە وەستاوە؟)[٧٣].

**چوارەم:** ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر لە خوارووی (بەلدەح)، کە نزیکی شاری مەککەیە گەیشت بە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، زەیدیش سفرەیەکی گۆشتی نزیك کردەوە لە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لێی نەخوارد و فەرمووی: ((إِنِّي لا آكُلُ مِمَّا تَذْبحونَ على أنصابِكم، ولا آكُلُ مِمَّا لم يُذْكَرِ اسمُ اللهِ عليه.))[٧٤] واتە: من لەو گۆشتە ناخۆم کە بۆ بتەکانتان سەر بڕیوە، وە من لەو گۆشتەش ناخۆم کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە.

---

الطبراني ورجاله رجال الصحيح، وَحَسّنَهُ مصطفى بن العدوي في (الصحيح المسند من فضائل الصحابه) (ص:٢٠٢)، وقال الشيخ مقبل الوداعي في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٣٦٢): حديثٌ حسن، وحسنهُ الشيخ الألباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:٣٢).

(٧٢) أخرجه: أحمد (٨٢/٤) (١٦٧٥٧) وقال محققه: إسناده حسن، وابن خزيمة (٣٠٥٧)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٥٧٧)، والحاكم (٤٦٤/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٧/٢)، وابن هشام في (السيرة) (٢٤٩/١) وقال محققاه: إسناده حسن.

(٧٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (١٦٦٤)، ومسلم (الصحيح) (١٢٢٠).

(٧٤) أخرجه: أحمد (المسند) (٨٩/٢) (٥٣٦٩) وقال محققه: إسناده صحيح، ابن سعد (الطبقات) (٣٨٠/٣)، والنسائي (الكبرى) (٨٠٨٩)، وقال الشيخ الألباني في: (صحيح السيرة) (ص:٣٤) إسناده صحيح على شرط الشيخين.

## سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ

خوای گەورە پێش ئەوەی پێغەمبەرایەتی ببەخشێت بە پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەدا، بەردێکی هێنا بووە زمان و سڵاوی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد پێش بوونی بە پێغەمبەر.

جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ))[٧٥] واتە: (من بەردێك دەناسم کە لە مەککەدا سەلامی لێ دەکردم پێش ئەوەی ببم بە پێغەمبەر و ئێستاش دەیناسمەوە). لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە جابرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنَّ بِمَكَةَ لَحَجَرًا كانَ يُسَلِّمُ عليَّ لَيالِيَ بُعِثْتُ، إنِّي لَأعْرِفُهُ إذا مَرَرتُ به))[٧٦] واتە: (بەردێك هەیە لە مەککە سەلامی لێ دەکردم لە شەوانی بوونم بە پێغەمبەردا، گەر بەلایدا تێبپەڕم دەیناسمەوە).

لەڕیواتێکی تردا لە عەلیەوە ﷺ دەفەرموێت: ((كنتُ معَ رسولِ اللهِ ﷺ بِمَكَّةَ فخرجنا في بعضِ نواحيها فما استقبلَه جبلٌ ولا شجرٌ إلَّا وَهوَ يقولُ السَّلامُ عليكَ يا رسولَ اللَّهِ ﷺ))[٧٧] واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە مەککە، کەدەردەچوین بۆ هەندێ ناوچە ڕووی دەکردە هەر دار و چیایەك پێیان دەفەرموو: سەلامت لێبێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ﷺ ڕووناکی دەهاتە بەرچاوی ئەویش ڕوناکی مەلائیکە بوو، وە گوێشی لە دەنگ بووە (دیارە دەنگی مەلائیکە بووە (والله أعلم) وە ترساوە لەوەی کە تێك چوو بێت!! وەك ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بە خەدیجەی فەرموو: ((إني أرى ضوءًا وأسمعُ صوتًا وإني أخشى أن يكونَ بي جَنَنٌ )) واتە: من ڕوناکیەك دەبینم و دەنگێك دەبیستم دەترسم کە تێك چووبم،

---

(٧٥) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٢٢٧٧)، والترمذي (السنن) (٣٦٢٤)، وأحمد (المسند) (١٠٥،٨٩/٥)، والطيالسي (المسند) (٢٤٥٠)، والدارمي (السنن) (١٧)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٩٠٧)، وابن سعد في (الطبقات) (١٥٦/١)، وابن حبان (٦٤٨٢).

(٧٦) أخرجه: أحمد (المسند) (١٠٥/٥) (٢١٠٠٥) وقال محققه: حديث حسن.

(٧٧) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٦٢٠/٢)، وصححه ووافقه الذهبي وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:٩٥).

خەدیجەش دەیفەرموو: نەخێر خوای گەورە هەرگیز وات لێ ناکات، وەرە با بچین بۆلای وەرەقەی کوڕی نوفەل پاشان چوون بۆلای وەرەقە، بۆیان گێڕایەوە، وەرەقەش وتی: گەر ئەوە ڕاست بێت ئەو فریشتەیەی هاتووە بۆلای تۆ هەر ئەو فریشتەیەیە کە هاتووە بۆلای موسا عليه السلام ، و ئەگەر تۆ ببیت بە پێغەمبەر و من زیندووبم باوەڕت پێ دەهێنم و سەرت دەخەم)(٧٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای پێغەمبەرێتی بە خەوی ڕاست دەستی پێ کرد کە وەك بەرەبەیان دەهاتە دی، لە دایکی باوەڕداران عائیشە وە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هەر خەوێکی ببینیایە وەك ڕووناکی ڕۆژ لە بەرەبەیاندا دەهاتە دی)(٧٩).

وە پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی بە گۆشەگیری دەکرد و هەموو جارێ دەچووە ئەشکەوتی (حراء) و تیایدا دەمایەوە بۆ عیبادەت کردن و بیرکردنەوە لە ئاسمان و زەوی و کاروباری خەڵکان و گەڕانەوەیان بۆلای خوا.

## دابەزینی وەحیی بۆ پێغەمبەر ﷺ

دەست پێ کردنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ئەشکەوتی (حراء) بوو، ئەو کاتە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ لە چلساڵیدا بووە، دابەزینی (سروش) لە شەوی دووشەممەدا بووە کە شەوی پیرۆزی (ليلة القدر) بووە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ .......﴿١٨٥﴾ ﴾ (البقرة)، هەروەها لە ئایەتێکی تردا سەبارەت بە (١٧)ی مانگی ڕەمەزان کە جەنگی بەدر تیایدا ڕوویدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ........﴿٤١﴾ ﴾ (الأنفال) واتە لە ڕۆژی فورقان، وە لە ئایەتەکەی تریشدا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ ﴾ (الدخان). واتە: ئێمە قورئانمان لەشەوێکی پیرۆزدا دابەزاندووە کە ئەویش لەرەمەزاندایە....

---

(٧٨) أخرجه: أحمد (المسند) (٣١٢/١) رقم (٢٨٤٥) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده على شرط مسلم، وصحح إسناده أيضاً أحمد شاكر، وابن سعد في (الطبقات) (١٩٥/١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٨٣٩)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٥٥/٨): رواه أحمد متصلاً و مرسلاً، ورجال أحمد رجال الصحيح.

(٧٩) أخرجه: البخاري (٦٩٨٢).

## چۆنێتی دابەزینی سروش و وەحی

سەبارەت بە سەرەتای هاتنە خوارەوەی سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (یەکەم شت لە وەحی کە بۆلای پێغەمبەر ﷺ دەستی پێ کرد، خەوی ڕاست بوو هەر خەوێکی ببینیایە وەکو ڕۆژی ڕووناك دەهاتە دی، پاشان خەڵوە و گۆشەگیری لا خۆشەویست بوو، دەچووە ئەشکەوتی (حراء) و عیبادەتی تیا دەکرد و چەند شەوێك لەوێ دەمایەوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆلای خێزانی و پاشان دەگەڕایەوە و خواردنی دەبرد، تا خوای گەورە فریشتەی بۆ نارد لە ئەشکەوتی (حراء)، فریشتەکە هات بۆلای واتە: جبریل ﵇ پێی فەرموو: بخوێنە، فەرمووی: من خوێندەوار نیم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی گرتمی و گوشیمی بە خۆیەوە)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (قوڕگی گرتم)[٨٠]، هەتا وای لێ کردم زۆر ناڕەحەت بووم پاشان بەریدام و دووەم جار پێی وتم: بخوێنە، وتم: من خوێندەوار نیم، گرتمی و گوشیمی بە خۆیەوە هەتا زۆر ناڕەحەت بووم پاشان بەریدام، بۆ سێهەم جار پێی وتم: بخوێنە، من پێم وتەوە: خوێندەوارنیم ، ئینجا گرتمی و گوشیمی بە خۆیەوە پاش کەمێك بەریدام و پێ وتم: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ﴾ (العلق). واتە: ئەی موحەممەد! بخوێنە، ئەوەی وەحیت بۆ دەکرێ بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە، کە هەموو شتێکی دروستکرد. خەڵقی نەوەکانی ئادەمی کرد لە خوێنێکی وەستاوی هەڵواسراوی شێوە زەروو، بخوێنە، وە پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەسێك بەخشندە ترە و خاوەن ڕێزێکی بێ سنوورەو هیچ کەسێکی ناگاتێ؟!

کە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی گوێ لێ بوو دڵی کەوتە لەرزین، و گەڕایەوە بۆلای خەدیجە و پێی وت: بم پێچەوە و دام پۆشە، هەتا تۆزێ هۆشی هاتەوە سەر خۆی، پاشان هەواڵەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە و پێی فەرموو: (لقد خَشِيتُ على نَفسي) ترسام لە نەفسی خۆم کە تووشی شتێك بوویم، خەدیجەش فەرمووی: وەڵاهی هەرگیزا و هەرگیز خوا ڕیسوات، ناکات تۆ سەردانی خزمانت دەکەیت و یارمەتی هەژاران دەدەیت

---

(٨٠) أخرجه: البخاري (٤٩٥٦/٣،٦٩٨٢)، ومسلم (الصحيح) (١٦٠)، وأحمد (المسند) (٣٧٧/٣)، والترمذي (السنن) (٣٦٣٦)، وابن أبي شيبة (٩٧١٩)، و الطيالسي(١٤٦٧)، وابن سعد في (الطبقات) (١٩٤/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٣٥/٢)، وابن حبان (الصحيح) (٣٣).

و دەستی بێ نەوایان دەگریت و ڕێز لە میوان دەگریت، وە لە هەموو کارێکی چاکەدا دەست پێشخەری دەکەیت (مژدە بێت ئەوەی هاتووە بۆ لات فریشتەی خوایە نەك شەیتان، تۆش خۆگربە، پاشان بڕوای پێ هێنا و شایەتی بەڕاستی پێغەمبەرایەتی دا)[٨١]. پاشان خەدیجە بردی لەگەڵ خۆی تا گەیاندییە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە شارەزا بوو، وە نووسینی عەرەبی دەزانێ و کتێبی لە عەرەبی یەوە وەردەگێڕایە سەر زمانی عیبری و ئینجیلیشی دەنوسیەوە بە عەرەبی، پیاوێکی پیرو زانا بوو لەو کاتەدا چاوی کز بوو بوو، خەدیجە پێی وت: ئەی ئامۆزا گوێ بگرە لە ئامۆزاکەت بزانە چیت بۆ دەگێڕێتەوە.

پاشان وەرەقە گوێی لێ گرت و پێی وت: ئەو فریشتەیەی کە هاتووە بۆلات هەر ئەو فریشتەیەیە کە هاتووە بۆلای موسا ﷺ، خۆزگە من گەنجێکی بە توانا و زیندوو دەبووم کاتێ کە خزمانت دەرت دەکەن، و شاربەدەرت دەکەن تا یارمەتی تۆم بدایەو تۆم سەربخستایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی ئەوانە من شاربەدەر دەکەن؟ وتی: بەڵێ هەر کەسێ ئەو بەرنامە و پەیامەی پێ بوو بێت بۆ قەومەکەی بێگومان قەومەکەی دژایەتیان کردووە، ئەگەر بێت و من بگەمە ئەو ڕۆژە ئەوا یارمەتیت دەدەم و سەرت دەخەم بە سەرخستنێکی سەربەرزانە، پاشان ئەوەندەی پێ نەچوو وەرەقە مرد و وەحییش پچڕا....)[٨٢]، وە بەڵگەش بۆ ئەوەی کە وەرەقە بە موسوڵمانی مردووە و باوەڕی بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە هەر لە سەرەتاوە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لا تسبُّوا ورَقةَ بنَ نوْفلٍ ، فإنِّي قدْ رأيتُ له جنةً أوْ جنَّتيْنِ)) واتە: قسەی ناشرین مەڵێن بە وەرەقەی کوڕی نەفول چونکە من بینیم بەهەشتێك یان دوو بەهەشتی هەبوو)[٨٣].

ئینجا دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەحی لێپچڕا و دلگران و نێگەران بوو بەپچڕانی وەحی، ماوە پچڕانی وەحی تا ئێستا فەرموودەیەکی صەحیحی و دیاری

(٨١) أخرجه: الطبراني في (الأوسط) (٣٤٩٧)، وأبو نعيم (الدلائل) (٢٨٠/١)، البيهقي في (الدلائل) (١٥١/٢)، وأورده قاضي عياض في (الشفاء) (١٥٢٧) وقال محققه: إسناده حسن.

(٨٢) أخرجه: الطيالسي في (المسند)، وإسناده حسن كما قال الحافظ ابن حجر العسقلاني في (فتح الباري) (٢٤/١).

(٨٣) أخرجه: البزار (٢٧٥٠)، والحاكم (٦٠٩/٢) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وقال ابن كثير في (البداية) (٩/٣): إسناده جيد، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٤١٦/٩): رواه البزار ورجاله رجال الصحيح، و صحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧١٧٩) وفي (السلسلة الصحيحة) (٤٥) و في: (فقه السنة) (ص:١٠٠)، وصححه الشيخ شعيب الأرناؤوط وعبدالقادر الأرناؤوط على شرط الشيخين في (زاد المعاد) (٢١/٣).

**کراو نیە لەوبارەیەوە، بەڵام لەهەندێك ریوایەتدا هاتووە کە سێ ساڵ یان دوو ساڵە وە هەندێك دەڵێن شەشە مانگ یان چەند رۆژێك بووە.**

**وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە لاوازە و ناکرێت بە بەڵگە ئەویش ئەوەیە: (پاشان وەحی پچڕا لە پێغەمبەر ﷺ و نیگەران بوو، دەچووە سەر لوتکەی شاخەکان و دەیویست لەوێوە خۆی بخاتە خوارەوە، و هەر کاتێك ئەو بچوایەتە سەر لوتکەی شاخێك جبریل عليه السلام خۆی نیشان دەدا و دەیوت: ئەی محمد تۆ پێغەمبەری خوای بەڕاستی، ئەویش دەهاتەوە هۆشی خۆی و پاشان دەگەڕایەوە، بەو شێوەیە ماوەیەکی زۆر وەحی لێ پچرا، دوای ئەوە هەر دەچووە سەر لوتکەی شاخەکان و جبریلیش عليه السلام خۆی نیشان دەدا هەمان شتی پێ دەوتەوە)[٨٤] ئەم ڕیوایەتە بە هیچ شێوەیەك ناکرێت بە بەڵگە چونکە پێغەمبەران عليهم السلام گوناهکار نەبوون، گوناه ناکەن چ جای گوناهی گەورەی وەك خۆکوشتن و خۆ لە شاخ خستنە خوارەوە[٨٥].**

**لە جابرەوە رضي الله عنه دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ماوەی پچڕانی وەحی دەگێڕایەوە و دەیفەرموو:** ((بينما أنا أمشي سمعتُ صوتًا منَ السَّماءِ فرفَعتُ رأسي فإذا الملَكُ الَّذي جاءني بحراءَ جالسٌ على كرسيٍّ بينَ السَّماءِ والأرضِ......)) **واتە: لە کاتێکدا کە من دەڕۆیشتم بە ڕێگەیەکدا گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانە وە سەرم بەرز کردەوە، و تەماشام کرد ئەو فریشتەیەیە کە لە حیراء هات بۆلام بینیم لەوێدا دانیشتووە لەسەر کورسیەك لە نێوان ئاسمان و زەویدا ترسام و (هەتا کەوتم بە پشتا) و گەڕامەوە بۆلای خێزانم و وتم: بمپێچنەوە و دام بپۆشن، پاشان خوای گەورە ئایەتی:** ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤ وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ۝٥﴾ (المدثر) **دابەزاند، جابیر رضي الله عنه دەفەرموێت: (ئەمە ڕوویدا پێش ئەوەی خوای گەورە نوێژی لەسەر فەرز بکات. و (ئەبو سەلەمەش) دەفەرموێت: ئەو** (رجز)**ە مەبەستی لە** (أوثان) **ە واتە: خەڵکان لە هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن دوور بخەرەوە)[٨٦].**

---

(٨٤) ضعيف: أخرجه: البخاري (٦٩٨٢).

(٨٥) أخرجه: البخاري (٦٩٨٢) مرسلًا، أحمد(٢٣٢/٦) (٢٥٩٥٩) وقال محققه: ليست بشيء، وعبدالرزاق (٩٧١٩)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٧٣٥)، وأبو نعيم في (الدلائل) (ص:٦٨)، والبيهقي في (الدلائل) (٣٩٣/١)، وابن سعد في (الطبقات) (١٣٠/١)، وابن حبان (٣٣) وقال محققه: حديث ضعيف، وقال الحافظ في (الفتح) (٤٤٦/١٢): مرسل وهو من بلاغات الزهري، وضعفه الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (١٠٥٢) وفي (دفاع عن الحديث و السيرة) (ص:٤١).

(٨٦) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٩٢٥،٤٩٢٦)، ومسلم (الصحيح) (٢١٦)، وأحمد (٣٢٥/٣)، والترمذي (السنن) (٣٥٦٠)،

لە ڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەدووبارە بوونەوەی وەحی دەفەرموێت: ((جاوَرْتُ في حِراءٍ، فلمَّا قَضَيتُ جِواري، نَزَلْتُ فاستَبطَنتُ الواديَ، فنوديتُ، فنَظَرْتُ بَيْنَ يَدَيَّ وخَلْفي، وعن يَميني وعن شِمالي، فلم أرَ شَيئًا........)). واتە: چوومە ئەشكەوتی حیراء و كاتێ مانەوەم لەوێ تەواو كرد، و هەستام بڕۆم گەیشتمە ناو شیوەكە بانگم لێ كرا و تەماشای دوا و پێش و لای ڕاست و لای چەپی خۆمم كرد هیچم نەدی، پاشان بانگم لێ كرایەوە و سەیری ئاسمانم كرد بینیم ئەو فریشتەیەیە لەسەر عەرشێكە لە هەوادا لە نێوان زەوی و ئاسماندا، زۆر ترسام تا جەستەم كەوتە لەرزین و هاتمەوە بۆلای خەدیجە و وتم: دام بپۆشە و ئاوی ساردم بەسەردا بكەن، پاشان خوای گەورە ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١﴾ ی دابەزاند)[٨٧].

شێوەكانی هاتنە خوارەوەی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ چەندین جۆر بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر نارەحەت بووە بە هاتنە خوارەوە و وەرگرتنی وەحی چونكە پەیوەندی كردنی جیهانێكی نادیارە وەكو مەلائیكە بەتایبەتی بەڕێزترین و بەهێزترین مەلائیكەی خوای گەورە كە جبریلە ﷺ، لەگەڵ ئادەمیزاددا كە خوای گەورە بە لاوازی دروستی كردووە بۆیە پێغەمبەر ﷺ هاتنی وەحی زۆر لەسەرگران بووە.

عائیشە ﵂ سەبارەت بەو باسە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئەم بینی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێكی ساردی زستاندا وەحی بۆ دەهاتە خوارەوە، كە تەواو دەبوو ناوچەوانی ئارەقی لێ دەتكا)[٨٨].

لە ڕیوایەتێكی تردا لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﵁ دەفەرموێت: (كاتێ پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ بهاتایەتە خوارەوە زۆر قورس ونارەحەت دەبوو وە ناوچەوانی ئارەقی لێ دەتكا وەك مرواری هەرچەندە لە زستانیشدا بووایە)[٨٩].

---

والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٣٨/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٤٩).

(٨٧) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٠٦/٣)، والبخاري (٤٩٢٤)، ومسلم (١٦١،٢٥٨)، والترمذي (السنن) (٣٣٢٥)، وأبو يعلى (١٩٤٩)، وابن حبان (الصحيح) (٣٥،٣٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين واللفظ له.

(٨٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢)، ومسلم (الصحيح) (٦٠١٣)، ومالك (الوطأ) (٢٠٢/١)، والبغوي (الشرح سنة البغوي) (٣٧٣٧)، والحميدي (٢٥٦)، والترمذي (السنن) (٣٦٣٤)، وأحمد (المسند) (١٥٨/٦)، والنسائي (السنن) (١٤٧/٢)، وابن حبان (الصحيح) (٣٨)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٢/٢).

(٨٩) أخرجه: أبو نعيم في (الحلية) (ص:٧٣)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٠٨٨).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەدووبارە بوونەوەی وەحی دەفەرموێت: ((جاوَرْتُ في حِراءٍ، فلمَّا قَضَيتُ جِواري، نَزَلْتُ فاستَبطَنتُ الواديَ، فنوديتُ، فنَظَرْتُ بَينَ يَدَيَّ وخَلْفي، وعن يَميني وعن شِمالي، فلم أرَ شَيئًا........)). واتە: چوومە ئەشکەوتی حیراء و کاتێ مانەوەم لەوێ تەواو کرد، و هەستام بڕۆم گەیشتمە ناو شیوەکە بانگم لێ کرا و تەماشای دوا و پێش و لای ڕاست و لای چەپی خۆمم کرد هیچم نەدی، پاشان بانگم لێ کرایەوە و سەیری ئاسمانم کرد بینیم ئەو فریشتەیەیە لەسەر عەرشێکە لە هەوادا لە نێوان زەوی و ئاسماندا، زۆر ترسام تا جەستەم کەوتە لەرزین و هاتمەوە بۆلای خەدیجە و وتم: دام بپۆشە و ئاوی ساردم بەسەردا بکەن، پاشان خوای گەورە ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١﴾ ی دابەزاند)[٨٧].

شێوەکانی هاتنە خوارەوەی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ چەندین جۆر بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ناڕەحەت بووە بە هاتنە خوارەوە و وەرگرتنی وەحی چونکە پەیوەندی کردنی جیهانێکی نادیارە وەکو مەلائیکە بەتایبەتی بەڕێزترین و بەهێزترین مەلائیکەی خوای گەورە کە جبریلە ﷺ، لەگەڵ ئادەمیزاددا کە خوای گەورە بە لاوازی دروستی کردووە بۆیە پێغەمبەر ﷺ هاتنی وەحی زۆر لەسەرگران بووە.

عائیشە ﵂ سەبارەت بەو باسە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئەم بینی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکی ساردی زستاندا وەحی بۆ دەهاتە خوارەوە، کە تەواو دەبوو ناوچەوانی ئارەقی لێ دەتکا)[٨٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﵁ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ بهاتایەتە خوارەوە زۆر قورس وناڕەحەت دەبوو وە ناوچەوانی ئارەقی لێ دەتکا وەك مرواری هەرچەندە لە زستانیشدا بووایە)[٨٩].

---

والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٣٨/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٣٦٤٩).

(٨٧) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٠٦/٣)، والبخاري (٤٩٢٤)، ومسلم (١٦١،٢٥٨)، والترمذي (السنن) (٣٣٢٥)، وأبو يعلى (١٩٤٩)، وابن حبان (الصحيح) (٣٥،٣٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين واللفظ له.

(٨٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢)، ومسلم (الصحيح) (٦٠١٣)، ومالك (الوطأ) (٢٠٢/١)، والبغوي (الشرح سنة البغوي) (٣٧٣٧)، والحميدي (٢٥٦)، والترمذي (السنن) (٣٦٣٤)، وأحمد (المسند) (١٥٨/٦)، والنسائي (السنن) (١٤٧/٢)، وابن حبان (الصحيح) (٣٨)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٢/٢).

(٨٩) أخرجه: أبو نعيم في (الحلية) (ص:٧٣)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٠٨٨).

لە ڕیوایەتێکی تردا عبادەی کوڕی صامت ﷺ دەفەرمویێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کاتێ وەحی بۆ بهاتایەتە خوارێ زۆر نارەحەت دەبوو، ڕەنگی دەم و چاوی وەك تۆزاویی وخۆڵاوی لێ دەهات)[٩٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرمویێت: (پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ و وتم: ئایا هەست دەکەیت بە هاتنی وەحیی؟ فەرمووی: ((نعم أسمعُ صَلاصلَ ثمَّ أسكتُ عندَ ذلكَ فما من مرةٍ يوحَى إليَّ إلا ظننتُ أنَّ نفسي تَفيضُ)) واتە: بەڵێ گوێم لە زەنگۆڵە دەبێت. پاشان بێ دەنگ دەبم و هەر جارێ کە سروشم بۆ دێت گومانم وایە کە ڕۆحم دەردەچێت)[٩١].

لە ڕیوایەتێکی تردا عائیشە ﷺ دەفەرمویێت: (کە وەحی دەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتی وا هەبوو بەسواری وشترەکەیەوە بووە ئەوەندە قورس دەبوو وشترەکەی خۆی پێ نەدەگیرا ، خەریك بوو دەکەوتە سەر زەوی وە وشترەکەی نەیدەتوانی هەنگاو بنێت بەرەو دواوە یان بەرەو پێش یان لای ڕاست یان لای چەپ)[٩٢]. لە ڕیوایەتێکی تردا زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەفەرمویێت: (جارێکیان وەحی هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ ڕانی لەسەر ڕانم بوو کە وەحی یەکە هاتە خوارەوە ڕانی ئەوەندە قورس بوو لەسەر ڕانم هەتا وتم: ئێستا ڕانم دوو کەرت بووە لە ژێر ڕانی پێغەمبەری خوادا ﷺ.....)[٩٣].

لەگێڕانەوەیەکی تردا عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرمویێت: (سورەتی مائیدە کاتێك دابەزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پشتی وشترەکەی بوو، خەریك بوو ئێسکی وشترەکەی بشکێت، نەی توانی هەڵی بگرێت دابەزی لەسەری)[٩٤] لە ڕیوایەتێکی تردا لە زەیدی کوڕی ثابتەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (من وەحیم دەنووسی

---

(٩٠) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٦٠١٤).

(٩١) أخرجه: أحمد (المسند) (٧٠٧١) (البخاري) (٢)، ومسلم (٢٣٣٣)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٥٦/٨): رواه أحمد والطبراني و إسناده حسن.

(٩٢) أخرجه: أحمد (المسند) (١١٨/٦) (٢٤٨٦٨) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (المستدرك) (٥١٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٥٥/٨): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٧٨/١).

(٩٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٥٩٢).

(٩٤) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٧٦/٢) و (٤٥٥/٦)، وحسن إسناده الشيخ الألباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:١٠٩).

بۆ پێغەمبەر ﷺ و هەر کاتێك وەحی بۆ بهاتایە زۆر نارەحەتی تووش دەبوو ، ناوچەوانی ئارەقی لێ دەتکا و من وەحیم دەنووسی و تەواو نەدەبووم تا وام دەزانی کە قاچم لە ژێر رانی پێغەمبەردا ﷺ دوو کەرت دەبێت لە قورسی قورئانەکە، وە دەم وت: من هەرگیز بڕواناکەم جارێکی تر بتوانم بەو قاچەم بەسەر زەویدا بڕۆم تا تەواو دەبوو، کە تەواو دەبوو دەیخوێندەوە بۆ من و من دەمنووسی بۆی و دوای ئەوە دەیفەرموو: بۆم بخوێنەرەوە، وەمنیش بۆم دەخوێندەوە ئەگەر هەڵەیەکم بکردایە ڕاستی دەکردەوە بۆم)[95]. لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ زۆر نارەحەت دەبوو بە هاتنە خوارەوەی سروش بۆی و لێوەکانی دەجوڵاند بۆ ئەوەی ئەو وەحیەی کە هاتووە بۆی لەبیری نەچێتەوە تا خوای گەورە ئایەتی بۆ هێنایە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ (القيامة)[96]. خوای گەورە خۆی پێغەمبەری ﷺ ئارام کردەوە ئەوەندە نەیڵێتەوە و خۆی نارەحەت نەکات و گفتیدا بە پێغەمبەر ﷺ کە کۆکردنەوەی قورئان و پاراستنی لە سنگی پارێزراو دەکات، وە خۆی وا دەکات کە هەرگیز لە بیری نەچێتەوە، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ چی هاتووە بۆی بیری بووە و هیچ وشەیەکی بیرنەچووەتەوە و لێی تێك نەچووە.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (حارثی کوڕی هیشام پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وەحیت بۆ دێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [أَحْيانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الجَرَسِ، وهو أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فيُفْصَمُ عَنِّي وقدْ وعَيْتُ عنْه ما قالَ، وأَحْيانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ المَلَكُ رَجُلًا [وفي رواية: وهو أهونُ عليَّ]])[97]، واتە: جار جار وەك دەنگی زەنگۆڵە دێت ئەوە لە هەموو جارەکان نارەحەت و سەخت ترە لەسەرم، و قسەم لەگەڵ دەکات و زۆر باش بەئاگام کە چی دەڵێت[98]، وە جار جاریش فریشتەکە بە شێوەی پیاوێك دێت بۆلام [ئەمەیان ئاسانترە و لەگەڵم دەدوێت منیش باش لە وتەکانی حاڵی دەبم])[99].

(٩٥) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٤٨٨٩)، وقال الهيثمي في(المجمع) (٢٥٧/٨): رواه الطبراني بإسنادين ورجال أحدهما ثقات.

(٩٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٤٣/١)، والبخاري (الصحيح) (٧٥٢٤)، ومسلم (الصحيح) (٤٤٨)، والنسائي (السنن) (١٤٩/٢).

(٩٧) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٢)، ومسلم في (الصحيح) (٦٠١٣).

(٩٨) أخرجه: البخاري (٢)، ومسلم (٦٠١٣).

(٩٩) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٣٣٤٦،٣٣٤٣)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٣٩٣٨): رواه الطبراني

خوای گەورە بە چەند جۆرێکی تریش سروشی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنارد:

**یەکەم:** بەخەوی ڕاست.

**دووەم:** بەخستنە ناو دڵ.

بەوەی کەپێغەمبەر ﷺ خوا وەحی بۆ دەنارد لە ڕێگەی خستنە ناو دڵەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خواش ﷺ بیگێڕێتەوە بۆ هاوەڵانی خۆی و بنوسرێتەوە.

ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ رُوحَ القُدُسِ نفَثَ في رُوعي أنَّه لن تَموتَ نَفْسٌ حتى تَستَكمِلَ رِزقَها، فاتَّقوا اللهَ وأجمِلوا في الطلَبِ...))[100] واتە: ڕۆحی پاك جبریل ﷺ خستویەتی یە دڵمەوە کە هیچ نەفسێك نامرێت تا ڕزقی تەواو نەکات، ئەی خەڵکان ئێوەش لە خوا بترسن و جوان بچن بە دەم ڕزقەوە.....)[101].

**سێهەم:** هەندێك جار فریشتەکە خۆی نیشان دەدا و ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکرد و ئەویش بە ئەوپەڕ بەئاگاییەوە لێی وەردەگرت: دایکی بڕوادران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (لم يرَ جبريلَ في صورتِه إلا مرتينِ : مرّة عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، ومرّة في أجياد)[102] واتە: پێغەمبەر تەنها دوو جار (جبريل) ی لە شێوەی خۆیدا بینیوە جارێك لە چیای ئەجیادی مەککە و جارێکیش لە (سدرة المنتهى) ئاسمانەکانەوە.

**چوارەم:** هەندێك جاریش ڕاستەوخۆ خودای گەورە قسەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەی کردووە، وەك ئاخاوتنەکەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەشەوی ئیسراو میعراجدا

---

بإسنادين و رجال أحدهما ثقات.

(١٠٠) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٤/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو نعيم في (حلية الأولياء) (٢٧/١٠)، والبزار في (المسند) (١٢٥٣)، والبغوي في (شرح السنة) (٤١١١)، والقضاعي (١١٥٢) والبيهقي في (سنن الكبرى) (٢٦٤/٥)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) ص (٩٦)، وفي (صحيح الجامع) (٢٠٨٥) وفي (مشكاة المصابيح) (٥٣٠٠) وفي (مشكلة الفقر) (١٥)، وَصَحَّحَه أيضاً الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٧٧/١).

(١٠١) أخرجه: الحاكم (٤/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو نعيم في (الحلية) (٢٧/١٠)، والبزار (المسند) (١٢٥٣)، والبغوي في (شرح السنة) (٤١١١)، و القضاعي (١١٥٢)، والبيهقي في(السنن الكبرى) (٢٦٤/٥)، وصححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٩٦) وفي (صحيح الجامع) (٢٠٨٥) وفي (مشكاة المصابيح) (٥٣٠٠) وفي (مشكلة الفقر) (١٥)، وصححه الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٧٧/١).

(١٠٢) أخرجه: الترمذي في (السنن) (٣٢٧٨)، وإبن حبان في (الصحيح) (٦٠) وقال محققه: إسناده صحيح.

## سەرەتای فەرز بوونی نوێژ

خودا گەورە لە هەموو ئاینێکدا چەند ئەرکێکی داناوە لەسەر بەندەکانی لەوانەش نوێژ کردن بوو کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا لە ئاینی ئیسماعیلدا عليه السلام هەبووە کە دوو رکات بوو بەیانیان و ئێوارانیش و ئەمەش لەسەر پێغەمبەر ﷺ و ئومەتەکەی فەرز کرا. وە عائیشەوە رضي الله عنها دەفەرموێت: (نوێژ فەرز کرا لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتادا دوو رکات دوورکات بوو، پاشان کاتێ موسوڵمانان جێگیر بوون و ئاسوودەیی رووی تێکردن خوای گەورە تەواوی کرد (واتە: کردی بە پێنج نوێژ لەرۆژێکدا و چوار رکات لەئیسراء و میعراجدا)، وە لە سەفەریشدا ئەو دوو رکاتە وەکو خۆی خوای گەورە هێشتیەوە)[١٠٣].

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (کاتێ خوای گەورە نوێژی لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرز کرد لەو سەری شاری مەککەوە جبریل عليه السلام هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پاژنەی پێدا بە زەویدا و لەوێدا کانی یەك هەڵقوڵاو لەو کانی یە جبریل عليه السلام دەست نوێژی شۆرد و پێغەمبەریش ﷺ سەیری کرد کە چۆن دەست نوێژ دەشۆرێت و ئەویش بە هەمان شێوە دەست نوێژی شۆرد و پاشان جبریل عليه السلام نوێژی لە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ کرد)[١٠٤].

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە رضي الله عنه: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((علَّمَني جبريلُ الوضوءَ)) واتە: (جبریل عليه السلام دەست نوێژی فێر کردم)[١٠٥].

---

(١٠٣) أخرجه: مالك (١٤٦/١)، والبخاري (٣٥٠)، ومسلم (٦٨٥)، وأبو داود (١١٩٨)، والنسائي (٢٢٥/١)، وابن حبان (٢٧٣٦)، وابن خزيمة (١٥٦/١)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٦٢/١) وفي (دلائل النبوة) (٤٠٦/٢)، وابن هشام (٢٨٦/١) وقال محققه: إسناده حسن.

(١٠٤) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٨٦/١)، و تأريخ الطبري (٣٠٧/٣)، البداية (٣٣/٣).

(١٠٥) أخرجه: ابن ماجه (٤٦٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (٣٧٥) وفي (صحيح أبي داود) (١٥٩) وفي (السلسلة الصحيحة) (٨٤١).

# ئەو موسوڵمانانەی لەسەرەتای ئیسلامدا موسوڵمان بوون

محمدی کوڕی کەعب ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەس لەم ئومەتەدا موسوڵمان بوو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ خەدیجە بوو وە ئەو دوو پیاوەی یەکەم جار موسوڵمان بوون ئەبوبەکر و عەلی بوون)(١٠٦)، ئیبراهیمی نەخەعی ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەسێك موسوڵمان بوو بێت لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەبوبەکر بووە)(١٠٧) بەڵگەش بۆ ئەمە فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە کاتێ ئەبو بەکریان زویرکرد، ئەبوبەکریش سکاڵای خۆی بردە لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ ڕووی کردە هاوەڵەکانی و فەرمووی: ((إِنَّ الله بعَثَنِي إِلَيْكُمْ فَقُلْتُمْ كَذَبْتَ، وقَالَ أبو بَكْرٍ صَدَقَ، ووَاسَانِي بنَفْسِهِ ومَالِهِ، فَهلْ أنتم تاركوا لِي صاحبي)) واتە: (خوای گەورە کاتێ منی نارد بۆلای ئێوە هەر هەمووتان وتتان: درۆ دەکەیت تەنها ئەبوبەکر وتی تۆ ڕاست دەکەیت و بەماڵ ونەفسی لە خزمەتمدا بوو ئایا ئێوە واز لە هاوەڵەکەم دەهێنن بۆ من)(١٠٨)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (یەکەم کەسێك کە موسوڵمان بووە لە پیاواندا هاوەڵی پایەبەرز ئەبوبەکر بووە)(١٠٩)، ئیبنو مسعود ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەسانێك کە ئیسلام بوونی خۆیان ئاشکرا کرد حەوت کەس بوون: پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبوبەکر، عەمماری کوڕی یاسر، سومەییەی دایکی یاسر، صوهەیبی ڕۆمی، میقداد، بیلال)(١١٠).

بە کۆکردنەوەی هەموو ڕیوایەتەکان دەتوانرێت بووترێت: یەکەم کەس لە پیاواندا

(١٠٦) أخرجه: أحمد (الفضائل) (٢٨٦) وقال محققه: إسناده حسن، والبيهقي في (الدلائل) (٤١٦/١).

(١٠٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣١٧/٤) (١٩٣٠٦) وقال محققه: إسناده ضعيف، وفي (فضائل الصحابة) (٢٦٣) وقال محققه: إسناده صحيح، والترمذي (٣٧٣٥)، والنسائي (٨٣٩٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٩٣٧) وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٠٣/٩): رواه أحمد ورجال أحمد رجال الصحيح.

(١٠٨) أخرجه: البخاري (٣٦٦١).

(١٠٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣١٧/٤) وفي (فضائل الصحابة) (٢٦٣) وقال محققه: إسناده صحيح، وابن سعد في (الطبقات) (١٧١/٣)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٠٣/٩): رجاله رجال الصحيح.

(١١٠) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢١/١) (٣٨٣١) وقال محققه: حديث صحيح، وفي (كتاب فضائل الصحابة) (١٩١) وقال محققه: إسناده حسن، الترمذي (٢١٨٨)، والنسائي(٧٤/٢)، وابن ماجه (١٥٠)، وابن حبان (٧٠٨٣) وقال محققه: إسناده حسن، والحاكم (٣٤٩/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو نعيم في (حلية الأولياء) (١٤٩/١)، وابن سعد في (الطبقات) (٢٣٣/٣)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٧٠/٢)، وصحح إسناده الحافظ في (الإصابة) (٢٨٥)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٢٢)، وحسنه ايضا الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٨٦٣).

کە موسوڵمان بوو بێت ئەبوبەکر ﷺ بووە ، یەکەم کەس لە منداڵاندا عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ بووە، یەکەم کەس لە ئافرەتاندا کە موسوڵمان بووە خەدیجە ﷺ بوو ، پاشان ئوم ئەیمەن و پاشان سومەیە، وە یەکەم کەس لە مەوالیەکاندا واتە: هاوپەیمانانی قورەیش موسوڵمان بوو بێت زەیدی کوڕی حاریسە بووە، و یەکەم کەس لە عەبدەکان (بیلال و عامری کوڕی فوهەیرە و ئەبو فوکەیهە مەولای سەفوانی کوڕی ئومەییە و شەقرانی خزمەتکاری پێغەمبەر بوو ﷺ)[111].

سەبارەت بە تەمەنی ئیمامی عەلی ئەوکاتە منداڵ بووە وەك ڕیوایەتەکەی یەعقوبی کوڕی سینان ﷺ کە دەفەرموێت: (ئیمامی عەلی کاتێ کە موسوڵمان بووە هەشت ساڵان بووە)[112]. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم پیاوێك کە موسوڵمان بووە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ و باوەڕی پێ هێناوە ئیمامی عەلی بووە کە کاتێ تەمەنی دە ساڵان بووە)[113].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئاڵاکەی دایە دەست ئیمامی عەلی ﷺ لە جەنگی بەدردا. لەو کاتەدا تەمەنی بیست ساڵ بوو)[114] واتە سیانزە ساڵی ناو شاری مەککە و هاتنی وەحیی و دوو ساڵی ناو شاری مەدینە و هاتنی جەنگی بەدر ئەمە پانزە ساڵ کەواتە تەمەنی پێنج یاخود شەش ساڵان بووە کە موسوڵمان بووە (والله أعلم).

لەو موسوڵمانە دێرینانەی کە لە پێش هاوەڵە بەڕێزەکانی ترەوە موسوڵمان بوون لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ: عەمری کوڕی عەبەس ﷺ خۆی دەیگێڕێتەوە سەبارەت بە چۆنیەتی موسوڵمان بوونی: (کە چۆن هاتووە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و ناسیویەتی و کەوتۆتە گفتوگۆ لەگەڵیدا و وتویەتی: ئەی محمد ئێستا کێت لەگەڵدایە لەسەر ئەم بیروباوەڕە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: [یەك ئازاد و یەك کۆیلە] (واتە: ئەو ڕۆژە تەنها بیلال و ئەبوبەکری لەگەڵدا بووە)، و دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندووە کە [بگەڕێتەوە بۆناو قەوم و هۆزەکەی تا خوای گەورە ئاینی خۆی بەرقەرار دەکات]،

---

(١١١) أخرجه: البخاري في (الفتح) (٣٤/٧) (٣٦٦١).

(١١٢) أخرجه: الطبراني الكبير (١٦٢)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٧١/٧): رواه يعقوب بن سنان بإسناد صحيح.

(١١٣) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٨٨/١)، والبيهقي في (الدلائل) (١٦١/٢).

(١١٤) أخرجه: الحاكم (١١١/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في (الإرواء) (١٣٣/٨).

وە عەمری کوڕی عەبس ﷺ دەفەرموێت: (ئەت بینی من چوارەم کەس بووم کە موسوڵمان بووم لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ)[١١٥]، وە لەو موسوڵمانە بوو کە هەر لەسەرەتاوە موسوڵمان بوو، عەبدوڵلای کوڕی مەسعودە ﷺ کە دەفەرموێت: (وەڵاهی من شەشەم کەس بووم کە موسوڵمان بووم ، هیچ موسوڵمانێك نەبوو جگە لەو شەش کەسە نەبێت لەسەر زەویدا)[١١٦]، کەواتە ئیبنو مەسعودیش ﷺ شەشەم کەس بووەکە موسوڵمان بوو، سەرەتای موسوڵمان بوونی ئەوە بووە کە کاتێ شوانی مەڕ بوو خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (من گەنجێکی چالاك و وریا بووم شوانی مەڕەکانی عوقبەی کوڕی موعیط بووم، ئەملەومڕاندن لە شاخی بەرزی ئەجیادی پشت مەککە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا ﷺ ڕێیان کەوتە لای من و پێی وتم: ئایا هیچ شیرێکت لایە تا بیخۆینەوە؟ منیش وتم: بەڵێ، بەڵام من متمانە پێکراوم و هیچ شیرتان نادەمێ چونکە ئەوانە مەڕی من نین و ناتوانم شیرتان بدەمێ، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بزنێکم بۆ بهێنە بەران لێی نەپەڕیبێت و هیچ شیری تیادا نەبێت؟ منیش چتیرێکم بۆ هێنا (لە ڕیوایەتێکی تردا دوو ساڵان یان سێ ساڵان بوو) هێنام و پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بە گوانیدا و دوعای کرد هەتا گوانی پڕ بوو لە شیر و شیرەکەی دۆشی، و ئەبوبەکریش چوو شتێکی هێنا و پێغەمبەر ﷺ شیرەکەی دۆشی یە ناوی، پاشان بە ئەبو بەکری فەرموو: تێر بخۆرەوە، پێغەمبەریش ﷺ خۆی تێری خواردەوەو بەشی منیشی لێدا.

پاشان فەرمووی (گوانەکە): وەرەوەیەك و هاتەوە یەك وەکو یەکەمجار قەترە شیری تیا نەما، پاشان دوا بە دوای ئەوەی ئەمەم بینی لە پێغەمبەر ﷺ، چوومە خزمەتی و پێم وت: فێرم بکە ئەو قورئان و وتەیەی کە خوای گەورە بۆ تۆی ناردووە؟ پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بەسەرمدا و فەرمووی: [خوای گەورە ڕەحمت پێ بکات تۆ بە ڕاستی منداڵێکی فێرکراویت]، دەفەرموێت وەڵاهی حەفتا سورەتم لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە و لەبەرم کردووە کە هیچ کەسێك لەو کاتەدا ئەو

---

(١١٥) أخرجه: مسلم (٨٣٢)، وأحمد (١١٢/٩)، والطبراني في (ألأحاديث الطوال) (١١).

(١١٦) أخرجه: ابن أبي شيبة في (المصنف) (١١٤/١٢)، والبزار (٢٦٧٦)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٨٤٠٦)، و إبو نعيم في (الحلية) (١٢٦/١)، والحاكم (٣١٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٠٦٢) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٨٧/٩): رواه البزار والطبراني ورجاله رجال الصحيح.

سورەتانەی لەبەر نەبووە تەنها من نەبێت)[١١٧].

وە لەو هاوەڵە بەڕێزانەی تر کە سەرەتا موسوڵمان بوون: ئەبو زەڕی غیفاری ﷺ و خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ هەروەها [زوبێری کوڕی عوامیش کە لە تەمەنی هەشت ساڵیدا موسوڵمان بووە][١١٨].

## ئاشکرا کردنی بانگەوازی ئیسلام لە شاری مەککەدا

سەرەتا بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەکی نهێنی بوو لەگەڵ چەند کەسانێکی کەمدا بوو کە متمانەی پێ دەکردن، و ئیسلامی پێ ڕادەگەیاندن. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (سێ دانە ساڵ بەم جۆرە بانگەوازی نهێنی بەردەوام بوو تا خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە ئاینی خوا بەرقەرار بکات و بە ئاشکرا بیگەیەنێتە بێ باوەڕانی قوڕەیش و ئاشکرای بکات لەناو خەڵکیدا.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: پاشان خەڵکان پۆل پۆل دەچوونە ناو ئیسلامەوە لە پیاوان و ئافرەتانەوە تاوای لێهات باسکردنی ئاینی ئیسلام زۆر باوبوو وە بووە گفتوگۆ وباس لە نێوان خەڵکانی شاری مەککەدا، پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەو ئاینە ڕاستەی هاتووە بۆی ئاشکرای بکات لەناو بێ باوەڕەکاندا و ئاینەکەی خۆی بگەیەنێت بە خەڵکی و بانگەوازیان بکات و پێیان ڕابگەیەنێت وە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا سێ ساڵ وەکو پێم گەیشتووە بە نهێنی ئاینی خوای گەیاندووە تاوەکو خوای گەورە فەرمانی ئاشکراکردنی پێ گەیاند و ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾ (الحجر) هەروەها ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ

---

(١١٧) أخرجه: ابن أبي شيبة (٥١٠/١١)، وأحمد (٣٧٩/١) (٤٤١٢) وقال محققه: إسناده حسن، و الطيالسي (٣٥٣)، وأبو يعلى (٤٩٨٥)، والطبراني في (الكبير) (٨٤٥٥،٨٤٥٦)، وأبو نعيم في (الحلية) (١٢٥/١)، والبيهقي في (الدلائل) (٨٤/٦)، وابن حبان (٧٠٦١، ٦٠٥٤) وقال محققه: إسناده حسن، وصححه ابن كثير في (البداية) (١٩٥/٣)، والحافظ العراقي في (الإحياء) (٣٧٨/٢) وقال رواه أحمد بإسناد جيد، وقال الحافظ في (الإصابة) (٣٦١/٣)، (٧٢٤٣): رواه الطبراني و سنده صحيح، وصحح إسناده الشيخ أحمد شاكر في (المسند) (٢١٠/٥، ٣٥٩٨) وحسن إسناده الشيخ الالباني في (صحيح السيرة) (ص:١٢٤)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٨٥٥): حديث حسن، واللفظ لابن حبان والطبراني.

(١١٨) أخرجه : الحاكم (٣٦٠/٣)، وصحح إسناده الحافظ في (فتح الباري) (٨٠/٧)، وحسن إسناده أيضاً الشيخ الألباني في: (صحيح السيرة) (ص:١٢٤).

﴾ (الشعراء)[١١٩]. واتە: (سەرەتا عەشرەت و خێڵە نزیکەکەت بەسزای خوا بترسێنە، نەوەك وا بزانن کە هەر لەبەر ئەوە خزمی تۆن لەسزا ڕزگار دەبن.. باڵی میهرەبانی و سۆزت نەوی بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی کە پەیڕەوییت لێ دەکەن. ئینجا ئەگەر- ئەو خوا نەناسانە- یاخی بوون و بەگوێیان نەکردیت، پێیان بڵێ: بەڕاستی لەهەموو کاروکردەوەیەك کە ئێوە ئەنجامی بدەن من بەریی و بێزارم و دڵنیاشبن دەرەنجام دووچاری سزا دەبن).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە خزمانی (بەنی عەبدول موطەلیب و بەنی عەبدول مەناف و بەنی نەوفەل و بەنی هاشمی) کۆکردەوە و بانگەوازی ئیسلامی سەرەتا پێ ڕاگەیاندن وەکو خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (الشعراء)، وە ویستوویەتی بیگەیەنێت بە خزمە نزیکەکانی خۆی، (وەکو ئیمامی عەلی دەیگێڕێتەوە)، و دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ بەنی عەبدول موطەلیبی بانگ کرد و تاقمێکی زۆریان تیا بوو کە زۆرخۆر بوون و خواردنێکی زۆریان دەخوارد وە خواردنەوەیەکی زۆریان دەخواردەوە، پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی زۆر کەمی بۆ دروست کردن، کە چەند مشتە جۆیەکی کەم بوو بۆی ئامادە کردن و هەر هەموویان هاتن و تێر لەو خواردنەیان خوارد و ئاوێکی یەکجار زۆریان خواردەوە و هێشتا ئاوەکە و نانەکە هەروەکو خۆی مابووە وە و هیچی لێ کەم نەبوو بووەوە، دوای ئەوەی تێریان خوارد پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ((يا بني عبدِ المطَّلبِ إنِّي بُعثتُ إليكم خاصَّةً وإلى النَّاسِ عامَّةً......)) واتە: ئەی کوڕانی عەبدالمطلب خوای گەورە منی بە تایبەت ناردووە بۆلای ئێوە و بۆلای خەڵکانیش بە گشتی، و ئەم نیشانەیەی کە ئێوە بینیتان نیشانەیەکی بەسە بۆ ناسینی من، کێ لە ئێوە هەڵدەستێ و پەیمانم دەداتێ کە برام بێت و هاوەڵم بێت؟ دەفەرموێت: هیچ کەس هەڵنەسا، ئیمامی عەلی دەفەرموێت: من لە هەموویان بچوکتر بووم هەستام و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دانیشە سێ جار ئەمەی وتەوە، دوای سێ جارەکە کە کەس نەبوو هەستام و پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە ناو دەستم)[١٢٠]

(١١٩) أنظر: (سيرة) لابن هشام (٢٩٥/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٧٥/٢).

(١٢٠) أخرجه: أحمد (المسند) (١٥٩/١) وفي (كتاب فضائل الصحابة) (١٢٢٠) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٠٢/٨): رواه أحمد ورجاله ثقات، وقال الشيخ الألباني في: (صحيح السيرة) (ص:١٣٦) إسناده جيد.

واتە: پەیمانی لێ وەرگرتم، دوا بە دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ وەکو سەرەتای گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام لە شاری مەککە چووە سەر تەپۆڵکەی صەفا و ئەم بانگەوازەی ئاراستەی دانیشتوانی مەککە کرد:

ئیبنو عەباس رضي الله عنه دەفەرموێت: (کاتێ خوای گەورە ئایەتی ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (الشعراء)ی ناردە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ چووە سەر تەپۆڵکەی صەفا وهاواری کرد (واتە دەنگی بەرز کردەوە تاکو خەڵکی گوێیان لێ بێت و بەئاگاببنەوە) خەڵکی لە ناو خۆیاندا وتیان: ئەوە کێیە هاوار دەکات؟ وتیان: ئەوە محمدە، دوای ئەوەی لێی کۆبوونەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أرَأَيْتُمْ إنْ أخْبَرْتُكُمْ أنَّ خَيْلًا تَخْرُجُ مِن سَفْحِ هذا الجَبَلِ، أكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟.....)) واتە: ئایا پێتان ڕابگەیەنم کە چەند ئەسپ سوارێك لەودیوی ئەو شاخەوە خۆیان ئامادە کردووە بۆ پەلاماردانتان ئێوە هەواڵەکەی من بە ڕاست دەزانن؟ وتیان: بەڵێ ئێمە بەهیچ جۆرێ درۆمان لێ نەبینیوێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فإنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ..)) واتە: ئاگادار بن من ئاگادار کەرەوەیەکم بۆ ئێوە لە پێش سزایەکی سەختی خوای گەورە کە بگات بە ئێوە، پاشان ئەبولەهەب لەناو هەموویاندا وتی: دەستەکانت بشکێ و وشك بێت بۆ ئائەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە بەم بەیانی یە، دواجار خوای گەورەش ئەم سورەتەی دابەزاند: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ ﴾ (المسد)[121]. واتە: یا خوا هەر دوو دەستەکانی (أبولهب) بە بڕین چن و تیابچن خۆ تیاش چوو.

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرموێت: (کاتێ خوای گەورە ئەو ئایەتەی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (الشعراء)ی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ قورەیشی هەموو بانگ کرد و کۆبوونەوە، بە تایبەتی و بەگشتی قسەی لەگەڵ کردن وە دەقی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بەم جۆرە بوو پێی فەرموون: [(يا مَعْشَرَ قريشٍ ! اشْتَرُوا أنفسَكم من اللهِ، لا أُغْنِي عنكم من اللهِ شيئًا ، يا معشرَ بَني كَعْبِ بنِ لُؤَيٍّ، أَنقِذوا أنفُسَكم مِنَ النار......)] واتە: (هۆ کوڕانی قورەیش خۆتان بکڕنەوە لە خوای گەورە، من هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆتان لە قیامەتدا لە بەرامبەر خوادا (واتە: تەنها خزمایەتی نێوان من و ئێوە هیچ

---

(١٢١) أخرجه: البخاري (٤٧٧٠)، ومسلم (٥٠٧)، وأحمد (٢٨١/١)، والترمذي (٣٣٦٣)، والطبري (٣١٩/٢)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٧٤٢)، وابن منده (٩٥٠)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٨١/٢)، وابن حبان (٦٥٥٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وابن سعد في (الطبقات) (١٣٣/١).

سوودێکتان پێ ناگەیەنێت، ئەگەر باوەڕ نەهێنن)، هۆ کوڕانی کەعبی کوڕی لوئەی خۆتان ڕزگار کەن لە ئاگر من هیچم پێ ناکرێت بۆ ئێوە لە قیامەتدا لای خوای گەورە، هۆ کوڕانی مورەی کوڕی کەعب خۆتان ڕزگار کەن لە ئاگر من هیچم پێ ناکرێت بۆتان لای خوای گەورە، هۆ کوڕانی عەبدل شمس خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر من هیچم پێ ناکرێت بۆتان لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، هۆ کوڕانی عەبدول موطەلیب خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر من هیچم پێ ناکرێت بۆتان لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، هۆ عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب من هیچم پێ ناکرێت بۆت لای خوای گەورە، هۆ صەفییەی پوری پێغەمبەر ﷺ هیچم پێ ناکرێت بۆت لای خوای پەروەردگار، هۆ فاطمە کچی لە ماڵ و سامانم چیت دەوێت بیبە و خۆت بپارێزە لە ئاگر، هیچم پێ ناکرێت بۆت لای خوای گەورە تەنها ئەو پەیوەندی یە خزمایەتی یەی هەیە لە نێوانماندا و ئەویش بە مافی خۆی دەگەیەنم)[١٢٢].

لە ڕیوایەتەکەی قوبەیسە و زوهیری کوڕی عەمر ﷺدا دەفەرموێت: (کاتێ خوای گەورە ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (الشعراء)ی دابەزاند بۆ پێغەمبەر ﷺ چووە لای کۆمەڵە بەردێکی شاخەکەوە و چووە سەر هەرە بەرزترین بەردیان و هاواری کرد: هۆ کوڕانی عەبدالمناف من ئاگادار کەرەوەم بۆ ئێوە، نمونەی من و ئێوە وەکو نمونەی پیاوێك وایە کە دوژمنی بینیوە و ڕای کردووە بۆ ئەوەی خزمانی لێ ئاگادار بکاتەوە و ترساوە لەوەی کە دوژمنانی پێش بکەوێت و هاوار دەکات و رادەکات هۆ بەیانیتان، هۆ بەیانیتان، بۆتان هاتن، بۆتان هاتن، منیش بە هەمان شێوەم بۆ ئێوە.....)[١٢٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا قەتادە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چووە سەر تەپۆڵکەی صەفا و هەموو تیرەکانی قورەیشی بانگ کرد بۆ ئاینی خوا و ئاگاداری کردنەوە و هەڕەشەی لێ کردن لە تورەیی خوای گەورە، بەڵام هەندێك لەوان وتیان: ئەم هاوەڵەتان شێت بووە، و لە شەوەوە وڕێنەی کردووە تا بەرە بەیان، پاشان خوای

---

(١٢٢) أخرجه: البخاري (٤٧٧١، ٢٧٥٣)، ومسلم (٥٠٣، ٥٠٨)، وأحمد (٣٣٣/٢)، والدارمي (٧٦١/٢) وفي (٢٦٣٢)، والنسائي (٢٤٩/٦)، والترمذي (٣١٨٥)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٢٩/١٣)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٢٨٠/٦)، وابن حبان (٦٤٦).

(١٢٣) أخرجه: أحمد(٦٠/٥)، ومسلم (٥٠٥).

گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ ﴾ (الأعراف)[١٢٤] واتە: ئایا بیر ناکەنەوە کە هاوەڵەکەیان بە هیچ جۆرێك جنۆکەی لەگەڵدا نی یە و شێت نی یە تەنها ئەوە نەبێت ئاگادار کەرەوەیە و هەڕەشە کارێکی ئاشکرای خوای گەورەیە بۆلای خەڵکان).

بەم شێوەیە بۆ یەکەمجار قوڕیش لە خودی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم وشانە دەبیستن (خۆتان ڕزگارکەن لە ئاگر!!) هەروەها (من پێغەمبەرم بۆلای ئێوە)، وە بیستنی مقۆمقۆی موسوڵمانان لەناو خۆیاندا سەبارەت بە ڕاگەیاندنەکەی پێغەمبەر ﷺ ، و ڕونکردنەوەی ئاینی بێ باوەڕان، کە ئەو بتانەی ئەوان دەیانپەرسستن پەرستنێکی پووچە و هیچ قازانج و زەرەرێکی بەدەست نی یە، و هیچ پیرۆزییەکی تێدا نی یە، و نابێ بە هیچ جۆرێك لێیان بترسێن و ئەویش بەردێکە وەك ئەو بەردانەی کە خوای گەورە دروستی کردوون بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ، نەك خۆیان بەڵکو باوك و باپیرانیشیان گومڕا و سەرلێشواو و نەفام بوون، وە تەنها ئاینی خوای گەورە ئاینی پێغەمبەرە ﷺ وە ئەو ئاینانەی تر هەمووی پووچن، بێ باوەڕەکان بەم شێوەیە نەیان دەزانی چی بکەن، بۆیە سەرەتا کەوتنە گفتوگۆ و شەڕەقسە و دەمەقاڵە وە بە هەموو شێوەیەك ڕێگریان دەکرد، لە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ و ئاینی ئیسلامدا. چونکە دەیانزانی ئەم دینە تازەیە دەبێتە هۆی لەناوبردنی پێگەی ئاینی قوڕەیش و لەناوبردنی بەرژەوەندیە ئاینیەکانیان، بێ باوەڕەکان زۆر کەلەڕەقانە سوور بوون لەسەر مانەوەیان لەسەر بیروباوەڕە پوچەکەی خۆیان و باوك و باپیرانیان، بۆیە سەرەتا کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا پێش ئەوەی هەموو قافڵەی حاجییەکانی دوورگەی عەرەب بگەنە ناو شاری مەککە تا هەموویان یەك ڕاوبۆچوونیان هەبێت بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ، وە لای هەموو حاجییەکان ئاشکرای بکەن کە ئەم کابرایە کێیە؟ و چی یە؟ بۆ ئەوەی یەکێ لە قوڕەیشییەکان نەڵێ ڕاست دەکات و یەکێکی تر بڵێت درۆ دەکات ، تاوەکو هۆزەکانی عەرەب گومانیان بۆ دروست نەبێت کە ئەمانیش لەناو خۆیاندا گومانیان هەیە یەکێ دەڵێ وایە و یەکێ دەڵێ وانی یە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەیگێڕێتەوە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ کە فەرمویەتی: وەلیدی کوڕی موغیرە و کۆمەڵێ ناودار و سەرکردەی قوڕەیشی لەلا کۆبوونەوە، و وەلید ئەو

(١٢٤) أخرجه: الطبري بإسناد صحيح إلى قتادة، كما قال الحافظ في (الكافي الشاف) (١٨٧/٢).

ڕۆژە لە هەموویان بە تەمەنتر و پایە بەرزتر بوو وە نزیکی کاتی حەج کرن هاتبوو، وەلید بە کۆمەڵی قورەیشی وت: ئەی کۆمەڵانی قورەیش خۆتان دەزانن وا کاتی حەج نزیک بۆتەوە و پیاوانی عەرەب دەگەنە ئێرە و بێ گومان هەواڵی ئەو کابرایەی کە لەناوتاندایە پێیان گەیشتووە، لەبەر ئەوە هەستن تا یەك بڕیارتان هەبێت و یەکتر بە درۆ نەخەنەوە، بۆ ئەوەی سبەینێ هەندێکتان وتەکەی پێچەوانەی ئەوانی ترتان نەبێت، ئەوانیش وتیان: ئەی ئەبو عبدالشمس تۆ؟ چی دەڵێیت تا ئێمەش ئەوە بڵێینەوە؟

وەلید وتی: نەخێر ئێوە بڵێن و منیش گوێتان لێ دەگرم، یەکێکیان وتی: دەڵێین فاڵچی یە! ئەویش وتی: نەخێر وەڵاهی فاڵچی نییە و فاڵچی و فاڵ گرەوەمان بینیوە، و نەزمزمە و نەوەسوەسە و نەوتەی بچوکی ناو کاهینانی لێ ئاشکرایە، هیچی بە موحەمەدەوە نی یە، یەکێکی تریان وتی: دەڵێین شێتە!! ئەویش وتی: نەخێر شێت نی یە و شێتمان بینیوە و ناسیومانە، نەدەست وەشاندن و نە چاوتروکاندن و نەکەف کردنی لێوی پێوە دیارە و نەوەسوەسەشی لەگەڵدایە، یەکێکی تریان وتی: دەڵێین: شاعیرە!! وتی: نەخێر شاعیر نی یە و شیعرمان ناسیوە بە ڕەجەز و ڕەوان بێژی و......هتد، بە هیچ جۆرێك وتەکانی لە شیعر ناچێت، یەکێکی تر وتی: دەڵێین: ساحیرە!! وتی: نەخێر ساحیر نی یە، سیحرباز و سیحرەکانیشمان بینیوە، نە موحەمەد فوو دەکات و نەشتیش گرێ دەدات، وتیان: ئەی چی بڵێین؟ ئەی ئەبو عبدالشمس تۆ شتێکمان بۆ بدۆزەرەوە ئەویش وتی: وەڵاهی وتەکانی زۆر شیرینە و بناغەکەی زۆر ڕیشەدارە و ڕەگی داکوتیوە و سەرەوەشی بە ڕاستی پڕ فەڕ و بەهایە (و لە وتەی مرۆڤ ناچێت) و هەر شتێك بڵێین بەرامبەری هەموو خاوەن ئەقڵێك دەزانێت کە ئێوە هەڵەن و درۆ دەکەن، و نزیکترین قسە بکرێت بەرامبەری ئەوەیە کە بڵێن: سیحرباز نی یە بەڵام وتەکانی سیحرە! سیحرێکە لە کەسانی ترەوە وەری گرتووە و هاتووە، بە سیحرێك کە پیاو لە برای خۆی دەکات و کوڕ لە باوکی خۆی دەکات و پیاو لە ژنی خۆی دەکات و پیاو لە خزمانی خۆی دەکات و ئاژاوە دەنێتەوە لە هەموو شوێنێك.

پاشان قورەیشیەکان دڵخۆش بوون بەوەی کە شتێکیان دەست کەوتووە ئەویش پڕ و پاگەندەیەکی درۆیە بۆ ناشیرین کردنی پێغەمبەر ﷺ. ئەوەبوو کەکاتی حەج هات

کۆمەڵ کۆمەڵ هەریەکەی چوونە سەر ڕێگەیەك لەو ڕێگایانەی کە حەجاج پیایاندا تێدەپەڕین بۆ ناو شاری مەککە و لەولای ڕێگەکە دادەنیشتن بۆ پێشوازی کردن لە حاجیەکان وە کە حاجیەکان بەلایاندا تێدەپەڕین بەسەرهاتەکەی پێغەمبەریان ﷺ بۆ باس دەکردن و هەمووشیان دەیان وت: ئەم کابرایە بەو شێوەیەیە، تا ئەوەبوو خوای گەورە سەبارەت بە تاوانکاری گەورە وەلیدی کوڕی موغیرە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ ﴾ (المدثر)[١٢٥] واتە: (لە من و لەو کەسە گەڕێ دروستم کردووە بە تەنیا خۆی، واتە: تا لە سکی دایکیا بوو نە ماڵ، نە منداڵ، نە هێزو نە دەسەڵاتی هەبوو، کەچی ماڵ و کوڕیشم دایەو هەر بڕوای نەهێناو چوو بە گژ پەیامبەرەکەیشدا!. ماڵ و داراییەکی زۆرم پێبەخشی (مەڕو ماڵات، باخ و بێستانی جوان و دڵگیر) وە کوڕانی هەمیشە ئامادەو بەر دەست وە دونیام بۆ ڕاخستبوو بە ڕاخستنێکی تەواو، پاشان ئەوەندە تەماعکارە هەر بەتەمایە بۆی زیاد بکەم..

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وەلیدی کوڕی موغیرە هات و پێغەمبەر ﷺ قورئانی بەسەردا خوێندەوە ئایەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ (النحل)، وا دەرکەوت کە دڵی نەرم بووە بۆ ئیسلام، ئەم باسە گەیشتەوە بە ئەبوجەهل و ئەویش هات بۆلای و پێی وت: مامە خزمانت دەیانەوێت هەندێك پارەت بۆ کۆبکەنەوە، وتی بۆچی؟ ئەبوجەهل وتی: بۆ ئەوەی پێت بدەن، بۆ ئەوەی لەو قورئانەی کە بیستوتە پاشگەز ببیتەوە!! وەلید وتی: قوڕەیش هەموویان باش دەزانن کە من لە هەموویان پارەدار ترم، ئەبوجەهل وتی: وتەیەك بڵێ بەرامبەر بە موحەممەد و قورئان تا خزمانت بزانن کە تۆ ڕازی نیت بە ئاینی موحەممەد!! وەلید وتی: جا چی بڵێم؟ وەڵاهی پیاوتان تیا نی یە وەك من شارەزا بێ لە شیعر و جۆرەکانی، وەڵاهی ئەو قسانەی کە ئەو دەیکات ڕەونەقدارە و شیرینە، سەرەوەی پڕ بەرە، قەدەکەی ئەستورە

---

(١٢٥) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٠٢/١)، والبيهقي في (الدلائل) (١٨٧/١)، والطبري في (التأريخ) (٣٢١/٢)، وابن كثير في (البداية) (٦٣/٣)، و أخرجه ايضاً الحاكم (المستدرك) (٥٠٧/٢) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي، ووافقه ايضاً الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٥٩) وقال محقق (الشفاء) (٦٩٢): حديث حسن.

هەر بەرز دەبێتەوە و ئەوەی خوار خۆی تێك دەشکێنێت و هیچ شتێك بەسەریدا بەرز نابێتەوە، ئەبو جەهل وتی: خزمانت ڕازی نابن لێت تا وتەیەکی پێ نەڵێیت!! وەلید وتی: دەڵێم گەڕێ تا بیرێکی لێ دەکەمەوە، کاتێك بیری لێ کردەوە وتی: ئەمە سیحرێکە لە کەسانێکی ترەوە فێری بووە، وە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ ﴾ (المدثر) دابەزاند)[١٢٦].

## دەمەقاڵەکردنی بێباوەڕەکان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

هاوبەش پەیداکەران و بێ باوەڕانی قوڕەیش لەسەرەتادا هاتنە دەست و کەوتنە دەمەقاڵە کردن و موجادەلە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ، بە هیچ جۆرێك مەبەستێکی لێکۆڵینەوەیان نەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تا بگەنە ڕاستی، تەنها هیوای سەرەتا و کۆتاییان ئەوەبوو بەهەر هۆیەك بووە و هەر جۆرە وتەیەك بووە پێغەمبەر ﷺ لەکەدار بکەن و ئاینی خوا پەك بخەن، چەندین ڕێگەیان گرتەبەر ڕێگەکانیش بەمجۆرە بوون:

**یەکەم:** لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بە قوڕەیشی فەرموو: [( يا معشرَ قريشٍ ! إنَّهُ ليس أحدٌ يُعْبَدُ من دُونِ اللهِ فيهِ خيرٌ .....)] واتە: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش هەر کەسێك دەپەرستن جگە لە خوا بە هیچ جۆرێك خێر و چاکەی تیادا نییە، وە قوڕەیش باش ئاگادار بوون کە گاورەکان عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دەپەرستن بۆیە هاتن و دەمەقاڵەیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردو پێیان وت: موحەممەد تۆ دەڵێیت عیسا پێغەمبەر بووە و بەندەیەك بووە لە بەندە چاکەکانی خوا بەڵام پەرستراویشە جگە لە خوا گەر تۆ وادەڵێیت کەواتە عیساکەشیان هیچ جۆرە خێرێکی تێدا نەبووە بەپێی وتەکەی تۆ، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند بۆ دەمکوت کردنی ئەوان کە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ (الزخرف)[١٢٧]. واتە: قوڕەیش

---

(١٢٦) أخرجه: الحاكم (٥٠٧/٢) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (١٩٨/٢) وصححه ايضا الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٥٩): على شرط البخاري.

(١٢٧) أخرجه: أحمد (٣١٧/١) (٢٩١٨) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٥٣/١٢) (١٢٧٤٠)، و صحح إسناده السيوطي في (لباب النقول) (ص:١٨٩)، حسنه الشيخ مقبل في (الصحيح من

خزمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون پشتیان هەڵکرد لە پێغەمبەر ﷺ و دەهاتن موناقەشەیان لەگەڵ دەکرد سەبارەت بە عیسا ﷺ و دەیان وت: تۆ دەڵێی هەرچی یەك جگە لە خوا بپەرسترێت بەکەڵك نایەت، خۆ عیسا بەپێی وتەی هەندێ لە گاورەکان خوایە و هەندێکیان بە کوڕی خوای دەزانن و پەرستوویانە جگە لە خوا، خوای گەورە ڕوونی کردەوە کە ئەمانە مەبەستیان لێکۆڵینەوە نی یە لەگەڵ تۆدا، و هەروەها مەبەستیان گەیشتن بە ڕاستی نی یە تەنها ئەوە نەبێ کە دەیانەوێت بێ دەنگت بکەن و دەمەقاڵەت لەگەڵدا بکەن و بەرپەرچت بدەنەوە.

**دووەم:** لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾ (الأنبياء) واتە: ئێوە و ئەوەی دەیپەرستن جگە لە خوای گەورە هەردوولاتان سوتەمەنی دۆزەخن و پێی دەگەن. ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: بێ باوەڕانی قوڕەیش ئەمەیان زۆر بەلاوە سەخت بوو، وتیان: محمد جوێنی بە خواکانی ئێمە داوە، یەکێ لە ناودارەکانیان کە ناوی ئیبنو زەعبەری یە هاتەلای قوڕەیش و پێی وتن: ئەوە چی بووە؟ وتیان: موحەممەد جوێنی بە خواکانمان داوە، وتی: چی وتووە؟ وتیان: وتویەتی هەر شتێك بپەرسترێت جگە لە خوا لەگەڵ پەرستراوەکەش هەردووکیان سوتەمەنی دۆزەخ دەبن، وتی: خەمتان نەبێت من موحەممەدتان بۆ بێدەنگ دەکەم و خۆم دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکەم، وتی: بانگی بکەن بۆم؟ ئەوە بوو بۆیان بانگ کرد و ئیبنو زەعبەر پێی وت: ئەی موحەممەد ئایا ئەمەی تۆ دەیڵێیت تایبەتە بە بتەکانی ئێمە یان تایبەتە بە هەموو شتێك کە پەرستراوە جگە لە خوای گەورە؟ ئەویش فەرمووی: ((بل لكلِّ مَن عُبِدَ من دونِ اللهِ عزوجل)) واتە: بەڵێ بۆ هەموو شتێکە کە پەرسترا بێت جگە لە خوای گەورە. ئەویش وتی: سوێند بە خوای کەعبە زاڵبووین بەسەریدا و بردمانەوە! باشە تۆ دەڵێیت عیسا بەندەی خوایە و پیاوچاکە و فریشتەکان بەندەی چاکن؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش وتی: کەواتە گاورەکان عیسا دەپەرستن و جولەکەکان عوزەیر دەپەرستن و ئەوەتا کوڕانی بەنی تەمیم فریشتەکان دەپەرستن

---

أسباب النزول (ص:٢٠٥)، حسنه أكرم ضياء العمري في (السسيرة الصحيحة) (١٦٣/١)، حسنه ايضاً الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٣٢٠٨).

**کەواتە هەر هەموویان لە دۆزەخدان (عیسا و فریشتە و عوزێریش)!! دانیشتووانی مەککە زۆر خۆشحاڵ بوون بەم وتەیەی ئیبنو زەعبەر وە وتەکە کەوتە دەمی هەموو خەڵکی مەککەوە و ویستیان بەمە بەرپەرچی پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە، تا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١﴾ (الأنبياء)[١٢٨] واتە: ئەوانەی پێش وەخت لەلایەن ئێمەوە مژدەی چاکیان پێدراوە ئەوانە دوورن لە دۆزەخ> کەواتە ئەوان بێ ئەقڵ بوون، چونکە پێغەمبەر (عیسا و عوزێر) بە هیچ جۆرێك ڕازی نەبوون کە بپەرسترێن، وە فریشتە و پێغەمبەران ﷺ بەرین لەو هاوبەش پەیدا کەرانە، ئەوە کاری ئەو بێ باوەڕانەیە کە ئەوانیان کردووە بەجێی تکاکردن و کردوویانن بە هاوبەشی خوا بەنەزانین.**

**سێهەم: لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەفەرموێت: پیاوانی (قوڕەیش چوون بۆ لای جولەکەکان و پەیوەندیان پێوە کردن و پێیان ڕاگەیاندن و وتیان: شتێکمان پێ بڵێن تا لەم پیاوەی بپرسینەوە ودژایەتی ئەم پیاوەی پێ بکەین. جولەکەکان وتیان: بچن پرسیاری ڕۆحی لێ بکەن، هاتنەوە پرسیاری ڕۆحیان لێ کرد ئینجا خوای گەورە ئایەتی: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾ (الإسراء)[١٢٩] نارده خوارێ و ڕوونی کردەوە کە ڕۆح شتێکی نادیارە (غیب) پەیوەندی تەنها بە خوای گەورەوە هەیە و کەس لێ ی حاڵی نی یە.**

**چوارەم: هەر لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (عاصی کوڕی وائیل هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پارچە ئێسکێکی ڕزیوی لەو پەڕی شاری مەککەوە دۆزیبووەوە بە دەستیەوە گرتبوو، وە لە بەردەم پێغەمبەردا ﷺ پروانی هەتا بوو بە خۆڵ ئینجا وتی: ئەی محمد ئایا خوا کەی تۆ ئەمە زیندوو دەکاتەوە دوای ئەوەی بووە بە خۆڵ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نعم يَبْعَثُ اللهُ هَذَا، وِيُمِيتُكَ ثُمَّ يُدْخِلُكَ جَهَنَّمَ)). واتە: بەڵێ**

---

(١٢٨) أخرجه: الطحاوي في (مشكل الآثار) (٤٣٢،٤٣١/١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٥٣/١٢) (١٢٧٣٩)، والحاكم (٣٨٤/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وقال ابن القيم في (شفاء العليل) (ص:٦٥): إسناده صحيح، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند من أسباب النزول) (ص:١٥٣):حديث صحيح لغيره.

(١٢٩) أخرجه: أحمد (٢٥٥/١)، والترمذي (٣١٤٠) وقال حديث حسن صحيح، والحاكم (٥٣١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٦٩/٢)، وابن حبان (٩٩) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الحافظ في (الفتح) (٤٠١/٨): رجاله رجال الصحيح رجال مسلم، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥١٠)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦١٥): صحيح على شرط البخاري.

خوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە و پاشان دەت مرێنێ و پاشان زیندووت دەکاتەوە پاشان دەتخاتە ناو دۆزەخەوە، دەفەرموێت بە هۆی ئەمەوە بوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ ﴾ (يس)[١٣٠]. واتە: ئایا ئەو مرۆڤە کە ئینکاری تواناو دەسەڵاتی خوا دەکا لەسەر زیندوبوونەوە نەیزانیوە کە ئێمە ئەومان لە تنۆکە ئاوێکی قێزەون دروستکردووە؟ کەچی وا ئێستا –لە باتی سوپاسگوزاریی- دوژمنێکی ئاشکرایەو، نکوڵی زیندووبوونەوە دەکات!!. مەسەل و نموونەیەکی بۆ هێناینەوەو، ئینکاری دەسەڵاتی ئێمەی کرد بۆ زیندووکردنەوەی ئادەمیزادو جن، وە دروستبوونی خۆی لە بیر کرد!

**پێنجەم:** لە عەبدوڵڵای کوڕی موسلمی حەزرەمیەوە ﷺ دەفەرموێت: (دوو خزمەتکاری خەڵکی نەجرانی یەمەنمان لابوو، یەکێکیان ناوی یەسار بوو ئەو یتریان ناوی جەبر بوو. لە ڕیوایەتێکی تردا (خەیر)ی ناوبوو دەفەرموێت: ئەمانە ئیشیان بۆ دەکردین و شمشێریان بۆ تیژ دەکردین، و بۆیان پاك دەکردینەوە وە کتێبێکیان هەبوو، لە ڕیوایەتیکی تردا (تەورات) بوو کە بەزمانی خۆیان نوسرابوو (واتە: بە عیبرانی) دەیان خوێندەوە و دەوریان دەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ بەلایاندا تێدەپەری و گوێ ی لێ دەگرتن، هاوبەش پەیداکەرەکان وتیان: موحەمەد لەو دوو کەسەوە فێربووە و فێر دەبێت.

(لە ڕیوایەتیکی تردا دەیان وت: کابرای عابدی حەزرەمی فێری دەکات و دەچێت بۆ لای ئەو گوێ دەگرێت و فێر دەبێت) لە ڕیوایەتیکی تردا وتیان: (ئێمە دەزانین کە ئەوە بە هیچ شێوەیەك لای خواوە نی یە بەڵکو ئەو دوو منداڵە فێری دەکەن) خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ (النحل)[١٣١].

(١٣٠) أخرجه: عبدالرزاق في (المصنف) (٢٤٩٨)، والطبري: ٢١/٢٣، وابن هشام في (السيرة) (٣٧٦/١)، وابن أبي حاتم كما في (تفسير ابن كثير) (٥٨١/٣)، والحاكم في (المستدرك) (٤٢٩/٢) وقال حديث صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه ووافقه الذهبي، و عزاه السفاريني في (اللوامع) (١٥٨/٢) إلى ابن منذر وابن جرير و الأسماعيلي و الضياء وابن مردوية والبيهقي في (البعث)، وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:٢٠٠): سنده صحيح مرسل.

(١٣١) أخرجه: الطبري في (التفسير) (١٧٩/١٤)، وابن أبي حاتم كما في (لباب النقول) (ص:١٣٤)، والحاكم (٣٥٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي، و صحح إسناده الحافظ من طريق البغوي كما في (الإصابة) (٤٤٧/٢) (رقم/٥٣٦١)، و صحح إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٦٥/١) من طريق بحشل في (تأريخ واسط) (ص:٤٩).

کەوابوو بێ باوەڕەکان بێ عەقڵ بوون چونکە ئەو دوو منداڵە تەوراتیان بە عیبرانی دەخوێندەوە و عەرەب بەهیچ جۆرێك لێیان تێنەدەگەیشت، وە ئەو دوو منداڵە پێ دەچێت کەسەرتاسەری بەهەڵە خوێندبێتیانەوە چونکە عیبرانی یەکێکە لەهەرە زمانە کۆنەکان کە عەرەبەکانیش نەیان زانیوە چ جای پێغەمبەرێکی ﷺ نەخوێندەوار کە تێپەڕیبێت بەلای دوو منداڵدا، ئایا لەوانەوە فێربووە؟ نەخێر! ئەم قورئانەی کەخوا ناردویەتی نەعیبرانی یەو نەتەوراتە بەڵکو بەزمانێکی عەرەبی پاراو خوای گەورە دای بەزاندووە بۆلای پێغەمبەرەکەی ﷺ.

**شەشەم:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (بێ باوەڕان و هاوبەش پەیداکەرانی قورەیش دەهاتن و دەیان کرد بەموجادەلە کردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەڵام ئەم جارەیان لە سەر مەسەلەی قەزاو قەدەربوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ۝٤٨ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ۝٤٩ ﴾ (القمر)[١٣٢]. واتە: خوای گەورە هەڕەشەی ئەوەی لێ کردن کە ڕۆژێك دێت لەسەر دەم و چاو ڕادەکێشرێن و بەرەو دۆزەخ دەبرێن وفرێش دەدرێنە ناویەوەو پێیان دەوترێت: بچێژن گەرما وتینی سەقەر، ئێمە هەموو شتێکمان بەقەدەر دروست کردووە.....

**حەوتەم:** ئیبنو عەبباس ﷺ سەبارەت بەو ئایەتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ..... ۝١٢١ ﴾ (الأنعام). دەفەرموێت: (خوای گەورە داوای ئەوە دەکات ئەو ئاژەڵانەی کەدەکرێن بەقوربانی بۆ بتەکان لێی مەخۆن، چونکە ئەوانە لەبەر خوا ئەنجام نەدراون و ناوی خواشیان لەسەر نەهێنراوە، دەفەرموێت: موشریکەکان کردیان بە دەمە قالێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ سەبارەت بەم مەسەلەیەش وتیان: ئەمە وانییە ئەوەی خوا کوشتوویەتی و سەر نەبڕراوە (واتە:مردار بۆتەوە) ئەوە مەخۆن، بەڵام ئەوەی ئێمە بەدەست سەری دەبڕین بۆ بت بێت یان بۆ غەیری بت بێت هەمووی بخۆن، پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴾ (الأنعام)[١٣٣].

---

(١٣٢) أخرجه: أحمد (٤٤٤/٢)، ومسلم (٦٦٩٤)، والترمذي (٢١٥٧، ٣٢٩٠)، وابن ماجه (٨٣).

(١٣٣) أخرجه: ابن جرير (١٣٨١٥)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٩٢/١١)، والنسائي (٢٣٧/٧)، والترمذي (٣٢٧٧)، وابن ماجه (٣١٧٣)، وأبو داود (٢٨١٧)، والحاكم (١١٣/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصحح إسناده

**هەشتەم:** لە ئیبنو عەبباسەوە رضي الله عنه دەفەرمویت: (کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ۝٤٣ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ۝٤٤ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ۝٤٥ ﴾ (الدخان) خوای گەورە ڕوونی کردەوە دارێك هەیە لە ناوەڕاستی دۆزەخدا کەداری زەقومە و خواردنی تاوان بارانە، وەك قوڕقوشمی تواوە وایە و دەکرێتە ناو قورگیانەوە، وشەی (زقوم) مانای پاروی (زل زل)ە لەزمانی عەرەبیدا ئەبو جەهل وتی: ئەمانە دەمان ترسێنن بەداری زەقوم پاشان زەقوم کێ دەستی دەکەویت وەرە باخواردنی چاك بهێنین و پەنیر بهێنین و پاروی چاکی گەورەی لێ بخۆین)[134].

ئەبو جەهل زۆر نەفام بوو، نەی دەزانی خوای گەورە چی بۆ ئامادەکردووە لە دۆزەخدا وە خوای گەورە چۆن وەسفی ئەو دارەی کردووە ئەمە ئەو پاروە زلانەیە کە ئەو تێی گەیشتووە، بەڵکو ئەمە سزای هەرە سەختە کە چاوەڕێی ئەو کەسانە دەکات سەرپێچی فەرمانی خوا دەکەن.

**نۆیەم:** لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه دەفەرمویت: (ئەبو جەهل دوعای کرد و وتی: خوایە ئەگەر ئەمە ڕاست، و ڕەوایە و لای تۆ وە هاتووە بۆلای موحەمەد خوایە بەرد ببارێنە بەسەرماندا، پاشان خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمویت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ .... ۝٣٣ ﴾ (الأنفال). واتە: چۆن خوای گەورە سزایان دەدات لەکاتێکدا تۆ لە ناو ئەواندا بیت)[135].

**دەیەم:** لەعائیشەوە رضي الله عنها دەفەرمویت: (کاتێ سورەتی ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ ﴾ (عبس) هاتە خوارەوە ڕووداوەکەی بەم شێوەیە بوو: سەبارەت بە نابینایەك هاتە خوارەوە کەناوی عەبدوڵلا کوڕی ئوم مەکتوم رضي الله عنه بوو دەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە دەیوت: ئەی محمد ئاینی خوام نیشان بدە و فێرم بکە؟ پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا یەکێ لەسەرکردەکانی قورەیشی لابوو کە ناوی (ئوبەی کوڕی خەڵەف)ە[136] وە ڕووی کردبووە ئەو سەرکردەیە و زۆر بە هیوا بوو کە موسوڵمان ببێت، و قسەی بۆ دەکرد

---

الحافظ في (الفتح) (٦٢٤/٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٤١٣٤) وفي (صحيح الترمذي) (٢٤٥٤) وفي (صحيح ابن ماجه) (٢٥٦٩)، و (صحيح أبي داود) (٢٤٤٤).

(١٣٤) أخرجه: النسائي في (التفسير) (٥٠٤) وقال محققه: حديث حسن، والبيهقي في (البعث) (٥٩٨).

(١٣٥) أخرجه: البخاري (٤٦٤٨).

(١٣٦) أخرجه: عبدالرزاق في (التفسير) (٣٤٨/٢) وفي رواية ابن هشام (٣٧٨/١) انها: الوليد بن المغيرة.

ئەویش زوو زوو دەیوت: ئەی موحەممەد فێرم کە لەوەی خوا فێری کردوویت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد ئەو بێ باوەڕە موسوڵمان بێت، چونکە زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگ بوو، وە گۆڕانکاریەکی زۆر ڕووی دەدا بە موسوڵمان بوونی ئەو پیاوە، بەڵام ئوم مەکتومیش چاوی نابینێت ئەوە نازانێت بۆیە هەر دەیوت: موحەممەد فێرم کە، بەم شێوەیە ئەمەندەی وت: ئەی موحەممەد فێرم بکە تا پێغەمبەر ﷺ بێزار بوو وە ڕووی لێ وەرگێرا، وە ئەو جێگەیەشی بە جێهێشت، و پاشان خوای گەورە ڕەخنەی لە پێغەمبەر ﷺ گرت و ئەو ئایەتانەی لە سەر دابەزاند کە دەفەرمویێت: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ① ﴾ (عبس)[137]. وە دەری خست کە نابینایەکی موسوڵمان لای خوا زۆر بەڕێزترە لە چاو ساغێکی بێ باوەڕ، وەڕوونی کردەوە کە دەبێت ڕووبکەیتە ئەو نابینایە کە بە ویستی خۆی هاتووە، و داوا دەکات کە فێربکرێت، وە تۆ دەبێت پشت هەڵبکەیت لەو بێ باوەڕە کە دانیشتووە و بە وردی قسەی بۆ دەکەیت تەنها لەبەر ئەوەی قەناعەت بکات کەواتە، سەرکەوتنی ئاینی خوا بە هەژارەکانە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: ((هل تُنصَرون و تُرزقون إلا بضُعَفائكم))[138] واتە: خوا ڕزقتان زیاد دەکات یان سەرکەوتنتان پێدەبە خشێت خۆ بەهۆی بە هێزەکانتانەوە نی یە بەڵکو بە هۆی موسوڵمانە لاوازە هەژارەکانەوە سەرتان دەخات.

**یانزەهەم:** موشریکەکان دەیان وت: هەق ئەگەر هەق بێت دەبوو پیاو ماقوڵان دوای بکەوێت، نەك هەژارو چەوساوەکان کە نەفامن و نازانن هەق چۆنە. بۆیە موشریکەکان وایان دەزانی کە هەق تەنها دەبێ پیاو ماقوڵان و دەوڵەمەندان و گەورەکانی لەگەڵ دابێ ئینجا پێی دەوترێت حەق بۆیە موشریکەکان دەیان وت: ﴿ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ㉟ ﴾ (سبا) واتە: ئێمە سامانمان لەوان زیاترە کوڕمان لەوان زیاترە چۆن دەبێ لە ئێمە باشتربن.

وە دەیان وت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ㉛ ﴾(الزخرف) واتە: ئەو قورئانە گەر ڕاست بوایە دەبوو دابەزیایە بۆ سەرکردەی مەککە کە وەلیدی کوڕی مەغیرە، یان بۆ عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی کە سەرۆکی طائیفە نەك دابەزێت بۆ نەخوێندەوارێکی بێ دایك و باوك.

(١٣٧) أخرجه: الترمذي (٣٣٣١)، وأبو يعلى (٤٨٤٨)، والحاكم (٥١٤/٢) وصححه على شرطهما، والطبري (٥٠/٣٠)، وابن حبان (٥٣٥) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٥١).

(١٣٨) أخرجه: أحمد (١٧٣/١)، والبخاري (٢٨٩٦).

وە ئەیان وت: ﴿ ......لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ...... ﴾ (الأحقاف) واتە: ئەم ئایینە ئەگەر خێری تیابووایە ئەمانە پێش ئێمە نەدەکەوتن چونکە ئێمەش عەقڵمان هەیە و پێشیان دەکەوتین لە باوەڕبوونمان پێی وە کاتێك موسوڵمانانیان بەلادا تێدەپەڕی ڕایان دەبووارد و گاڵتەیان پێ دەکردن.

ئەیان وت: ﴿ ......أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآ...... ﴾ (الأنعام) واتە: ئەوانەن کە خوا منەتی کردووە بەسەریاندا و هەڵیبژاردوون ڕێنمونی کردوون ئەوانە مرۆڤن ئەوان بەهەشتی یەکانن بەم شێوەیە زوو زوو دەیان وت: ﴿ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴾ (الشعراء)[139] واتە: دەیان وت باوەڕی چی بە تۆ بهێنین تۆ کێ دواتکەوتووە هەموو هەژار و داماو و چەوساوەکانن.

بەم شێوەیە بێ باوەڕەکان زۆر خۆیان بە گەورەتر دەزانی کە دابنیشن وە لە دانیشتنەکەیاندا یەك دوو هەژاری تیا بێت بۆیە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ ئەم پێشنیارەیان کرد: لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ﷺ دەفەرموێت (کۆمەڵێك لە سەرکردە بە ناوبانگەکانی قوڕەیش تێپەڕ بوون بەلای پێغەمبەر ﷺدا لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لە ناو موسوڵمانانی چوار دەوری خۆیدا کە بریتی بوون لە (صوهیب وبیلال و عەممار و میقداد و ئیبنو مەسعود و سەعد کوڕی ئەبو قاص) کە هەر هەموویان هەژار و بێ دەرەتان بوون، موشریکەکان هاتن وتیان: ئەی موحەممەد ئا ئەمانەن کەخوا ڕێنموونی کردوون و پیاو چاکن لەناو ئێمەدا، وە شایەنی ڕێنمایی نین، ئایا لە خزمانت دوور کەوتوویتەوە بەمانە ڕازی بوویت ئێمە شوێن کەوتووی ئەوانە نابین، وە بەهیچ جۆرێك قایل نین لەگەڵ ئەوانەدا دانیشین، وە ئەوانە ببن بە شوێن کەوتەی تۆ، وا چاکە دەریان بکەیت لای خۆت وە دووریان بخەیتەوە بانزیکی ئێمە نەکەونەوە، ئەوانە پیاوێکی ئاوها و ئاوهان، پێغەمبەریش ﷺ وەك مرۆڤێك خەیاڵێك کەوتە دڵیە وە سەبارەت بەو باسە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ...... ﴾ (الأنعام)[140] واتە: بەهیچ جۆرێك نابێت ئەوانەی لەخوای خۆیان

(١٣٩) أخرجه: ابن هشام في (السيرة النبوية) (٣٧٦/١).

(١٤٠) أخرجه: مسلم (٦١٩١)، وأحمد (٣٩٨٥)، وابن ماجه (٤١٢٨)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٠٥٢٠)، وأبو نعيم في (الحلية) (٣٤٦/١)، والطبري في (التفسير) (١٣٢٦٣)، والحاكم (٣١٩/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن

لەبەیانیان و ئێواراندا داوا دەکەن وە تەنها هەموو شتێك لە پێناوی خوادا جێ بەجێ دەکەن هەرگیز بۆت نی یە لە دانیشتنەکانی خۆتدا دەریان بکەیت (واتە: هەر ئەوانە بەرێزن، چونکە ئەوانە باوەڕدارن)، وە خوای گەورە کاتێ بەهەشتی نیشانی پێغەمبەر ﷺدا زۆربەی ئەهلی بەهەشت هەژارەکان بوون.

**دوانزەهەم:** بێباوەڕەکان و هاوبەش پەیداکارەکان دەمەقاڵەیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ سەبارەت بە هەموو ئایەتێك کە دەهاتە خوارەوە، بۆیە کاتێك کە دەوڵەتی ڕۆم شکا و دەوڵەتی فارسی ئاگر پەرست بە سەریاندا زاڵبوو، موشریکەکان زۆر خۆش حاڵبوون، پاشان سورەتی ڕۆم دابەزی وە خوای گەورە تیایدا ڕوونی کردەوە کە ئەنجامەکەی پێچەوانە دەبێت، ئەمان دیسان هاتنەوە بۆ دەمەقاڵە کردن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، سەبارەت بەم باسەش ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (هاوبەش پەیداکارەکان زۆریان پێ خۆش بوو کە خەڵکی فارس سەرکەوێت بەسەر ڕۆمەکاندا، چونکە قوڕەیش و فارسەکان وەك یەك بێ باوەڕبوون، بەڵام موسوڵمانان زۆریان پێ خۆش بوو کە ڕۆمەکان سەرکەون و زاڵ ببن، چونکە موسوڵمانەکان و ڕۆمەکان خاوەنی کتێبی خوان، ئەمە باس کرا لای ئەبو بەکر، ئەویش چوو ڕایگەیاند بە پێغەمبەر ﷺ ، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أَمَا إِنَّهُم سَيَغْلِبُونَ)) واتە: لەمەودوا ڕۆمەکان زاڵ دەبن، کاتێ خوای گەورە سورەتی ڕومی دابەزاند دەنگ و باس لەو کاتەدا گەرم بوو سەبارەت بەوەی کێ سەردەکەوێت.

ئەبو بەکر ﷺ چوو بە کۆڵانەکانی شاری مەککەدا گەڕا و پێی ڕاگەیاندن، کە لە هەندێ ساڵی دواییدا ڕۆمەکان سەردەکەون بە سەر فارسەکاندا. ئەبو بەکر ئەمەی لای هەندێ لە بێ باوەڕەکانی قوڕەیش گێڕایەوە، و ئەوانیش هاتنە لای ئەبو بەکر وتیان: باشە ئەمە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بێت کە گوایە موحەمەد دەڵێ ڕۆمەکان زاڵ دەبن بەسەر فارسەکاندا لە هەندێ ساڵدا بۆ نایەیت ئەبو بەکر تا گرەو بکەین، ئەمە پێش ئەوەی کە گرە و حەرام بکرێت ئەویش وتی: باشە، دەفەرموێت وتیان: باشە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ماوەیەك دیاری بکە ئەگەر سەرکەوتن بە لای ئێمەدا

حبان (٦٥٧٣) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وأبو يعلى (٨٢٦)، وحسن إسناده الحافظ العراقي في (تخريج الأحياء) (٣٥٨/٢)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢١/٧): رواه الطبراني وأحمد ورجال أحمد رجال الصحيح غير (كردوس) وهو ثقة، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (٣٣٣٠) و(الصحيحة) (٣٢٩٧)، واللفظ للطبراني ومسلم وابن حبان.

بوو ئەوە ئێمە ئەوەندەمان لێتان دەوێت، وە ئەگەر سەرکەوتن بۆ ڕۆمەکان بوو ئەوە ئێمە ئەوەندەتان دەدەینێ، دەفەرموێت ماوەی پێنج ساڵ یان دانا ئەبو بەکر هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ تۆزێك بەرزترت نەکردەوە (سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرمووی واتای: (بِضْعِ ) لە خوار ژمارە دەوەیە) بێ باوەڕەکان بە ئەبوبەکریان وت: چەند ساڵ دابنێین لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ئەی ئەبو بەکر خۆت دەزانی (بِضْعِ ) لە سێ وە بۆ نۆیە نێوانێکمان بۆ دیاری بکە، ئەویش شەش ساڵی دیاری کرد، دوایی شەش ساڵەکەش تێپەڕی و بە هیچ جۆرێك ڕۆمەکان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا ئەبو بەکر ناچاربوو هەموو پارەی گرەوەکەیان بداتێ دەفەرموێت: ئینجا لە ساڵی حەوتەمدا ڕۆمەکان زاڵ بوون بە سەر فارسەکاندا و موسوڵمانەکانیش گلەیی ئەوەیان دەگەیاند بە ئەبو بەکر کە بۆچی ئەم شتەی والێکردووە، بۆچی وتویەتی (شەش ساڵ)؟ چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فِي بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ۝٤ ﴾ (الروم) بەڵام ئەوە بوو بە هەواڵی سەرکەوتنی ڕۆم بە سەر فارسدا هەندێکی تر لە خەڵکان خوای گەورە ڕێنمویی کردن بۆ ئیسلام)[١٤١].

**سیانزەهەم:** بێ باوەڕەکان جگە لەوانە سەبارەت بە ناو و سیفات (الاسماء والصفات)ەکانی خوای گەورە ئەهاتن و دەمەقاڵێیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و بەرپەرچیان دەدایەوە:

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (جارێکیان من لە ژێر پەردەی کەعبەدا بووم پیاوێکی ئەقەفی خەڵکی طائیف، لەگەڵ دوو زاواکەی خۆی کە خەڵکی مەککە و قوڕەیشی بوون لەوێدا دانیشتبوون، و کەوتبوونە قسەکردن، و ئەوان زۆر قەڵەو بوون لەگەڵ ئەوەشدا بێ عەقڵ بوون، یەکێکیان وتی: تۆ بڵێی خوای گەورە ئەم قسانەی ئێمە ببیستێت؟ ئەوی تریان وتی: ئەگەر دەنگ بەرزکەینەوە دەیبیستێت، بەڵام ئەگەر دەنگ بەرزنەکەینەوە نایبیستێت ، ئەوی تریان وتی: ئەگەر دەنگ

(١٤١) أخرجه: أحمد (٢٧٦/١)، (٢٤٩٥) وقال محققه الأناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، والبخاري في (خلق أفعال العباد) (ص:٢٤)، والترمذي (٣٢٤٥) وقال حديث حسن صحيح، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٣٧٧)، والحاكم (٤١٠/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصحح إسناده الحافظ في (الفتح) (٥١/١)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٥٢)، وصححه على شرطهما الشيخ مقبل من طريق أحمد في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦٣٩).

بەرزکەینەوە بیبیستێت ئەوا دەنگ نزمیش بکەینەوە هەر دەیبیستێت، وە ئەوی تریان وتی: بە خوا دەنگ بەرز بکەینەوە هەر دەیبیستێت وە نزمیشی بکەینەوە هەر دەیبیستێت، ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و ئەم هەواڵەم پێ ڕاگەیاند وە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾(فصلت)[142]. خوای گەورە ڕوونی کردەوە کە ئەوان گومانی خراپیان بردووە بەخوا، کەوایان زانیوە خوای گەورە لە زۆربەی ئیشەکانیاندا ئاگای لێیان نی یە وە وتەکانیان نابیستێت، بەڵام بەهەڵەدا چوون.

لەگەڵ ئەو هەموو دەمەقاڵە کردنە کە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیان دەدا لە ناخی دەروونیانەوە باش دەیان زانی کە پێغەمبەر ﷺ چی دەڵێت وە باش دەیان زانی کە درۆزن نی یە وەچاکتر دەیانزانی ئاینەکەی ئاینی خوایە و حەقە ﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ (النمل)، بەڵام بەهۆی فیز و خۆبەزل زانینیان پێیان خۆش نەبوو کەبچنە ڕیزی بیلال وصوهەیب و باقی هاوەڵانی تری پێغەمبەری خوا، لەگەڵ ئەوەشدا دەیان زانی ئەم قورئانە لای خواوە هاتووە و پێیان خۆش بوو گوێی بۆ بگرن. سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەفەرموێت: (لەنیوە شەودا سێ سەرکردەی ناوداری قوڕەیش کە بریتی بوون لە (ئەبو سوفیان، ئەخنەسی کوڕی شورەیق وە ئەبو جەهل) بەجیا بەدزی یەوە دەچوون بۆلای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەرسێکیان گوێیان دەگرت تابزانن موحەمەد لە شەو نوێژدا دەڵێت چی، یەکێکیان دەچووە پشتەوە و یەکێکی تریان دەچووە ئەو لاترەوە بێ ئەوەی کەسیان بەکەسیان بزانن، پێغەمبەر ﷺ شەو نوێژی تەواو دەکرد یاخود دەخەوت یان نوێژی بەیانی دەکرد پاشان هەڵدەستان و هێواش هێواش بۆ ئەوەی کەس پێیان نەزانێت دەگەڕانەوە، سەیر لەوە دابوو کە ئەمانە بەخەڵکانیشیان دەوت: گوێی بۆ مەگرن، بەڵام هەر خۆشیان دەهاتن بەدزی یەوە گوێیان بۆ دەگرت، وە خۆیان دەشاردەوە، وە لە گەڕانەوەدا لەڕێگە بەیەك دەگەیشتن و ئەو بەوی دەوت: تۆ لەکوێ بوویت ئەویش بەوی تری دەوت: ئەی تۆ لەکوێ بوویت، وە پەیمانیان دەدا

(١٤٢) أخرجه: أحمد (٤٠٨/١)، وعبدالرزاق في (المصنف) (٤٤٣/١)، والبخاري (٤٨١٧)، ومسلم (٢٧٧٥،٦٩٦٠)، والترمذي (٣٢٤٩)، وابن حبان (٣٩١،٣٩٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، واللفظ للبخاري وابن حبان.

جارێکی تر نەیەنەوە، دەفەرموێت: شەوی دووەمیش بەدزی یەوە هاتنەوە وەگوێیان گرت هەتا تەواو بوو بەقەدەری خوا هەرسێکیان لەیەك ئاشکرا بوونەوە و سەر لەنوێ پەیمانیان دایەوە بەیەکتری، جارێکی ترو شەوێکی تر نەیەن بۆ جاری سێیەم دیسان هاتنەوە و گوێیان گرتەوە هەریەکەی لە سوچێکەوە دیسان زیاتر ئامادە باشییان کرد بۆ ئەوەی ئاشکرانەبن لای یەکتری بەڵام هەر ئاشکرابوون بە یەکتری.

ئەخنەسی کوڕی شورەیق بە خۆی و گۆچانەکەیەوە کە پێی بوو چوو بۆ لای ئەبو سوفیان تاکو ڕای ئەویش بزانێت بەرامبەر بەو قورئانەی کە موحەممەد بۆی هاتووە چی یە؟ ئەبو سوفیان لە وەڵامدا وتی: هەندێ شتم گوێ لێ بووە باش تێی گەیشتووم چی یە و واتاکەشی چی یە؟ هەندێ شتیشم گوێ لێ بوو نازانم باسی چی دەکات وە مەبەستی لە چی یە؟ دوای ئەوە ئەبو سوفیان بە ئەخنەسی وت: تۆ چی دەڵێیت سەبارەت بەوەی کە گوێت لێ بوو؟ ئەویش وتی: من وا تێدەگەم ئەمە حەق و ڕاستی یە، پاشان لای ئەو ڕۆیشت و چوو بۆ ماڵی ئەبو جەهل و پێی وت: ئەی ئەبولحەکەم ڕاو بۆچوونی تۆ چی یە بەرامبەر ئەوەی بیستووتە؟ وتی: چیم بیستبێت ئێمە و کوڕانی عەبدول مەناف پێشبڕکێمان بوو لە هەموو چاکەیەکدا، نانیان دەبەخشی ئێمەش نانمان دەبەخشی هەتاوەکو وەك یەکمان لێهات و کەوتینە سەر ئەژنۆ وەکو دوو ئەسپ کە لە پێشبڕکێ دابن بەیەکەوە، ئەوان وتیان: ئێمە پێغەمبەرێکمان لە ناودا هەیە کەلە ئاسمانەوە هەواڵی بۆ دێت، ئێمە کەی دەگەین بەو شتەی ئەوان، نەخێر بە هیچ جۆرێك باوەڕی پێ ناهێنین ، و بە درۆی دەخەینەوە، ئەخنەس هەستاو بە جێی هێشت)[١٤٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ئەبو جەهل وتی: وەڵڵاهی من باش دەزانم ئەوەی کە موحەممەد دەیڵێت حەقە و ڕاستە، بەڵام یەك شت وام لێ دەکات باوەڕی پێ نەهێنم، ئەویش ئەوەیە کە کوڕانی بەنو قوصەی وتیان: پەردەی کەعبە (ئەو پەردەیە کە دەدرێت بە سەر کەعبە دا) ئەو ماف و سەروەری یە بۆ ئێمەیە؟ وتمان: باشە وتیان: سیقایەش (واتە: بە خشینی ئاو بە حەجاج لە بیری زەم زەم) بۆ ئێمەیە وتمان: باشە، وتیان: نەخێر ئەو دوو سەرکردایەتی یەی ئەنجومەنی

---

(١٤٣) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٣٩/١) وقال محققاه: إسناده مرسل، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٠٦/٢)، وقال الحافظ في: (الإصابة) (ص:٦١) ذكره الذُهلي في (الزهريات) بإسناد صحيح عن الزهري عن سعيد بن المسيب.

شورا (کە ئەوان نەدوەیان پێ دەوت) دەبێت هەر بۆ ئێمە بێت و ئەو پلە و پایانە بگرینە دەست و ئالاّ هەڵگرتنیش لە جەنگدا هەر دەبێت بە دەست ئێمەوە بێت؟ ئێمەش وتمان: باشە. چ چاکەیەکیان دەکرد ئێمەش دەمانکرد تا کەوتینە سەر ئەژنۆ لە پێشبڕکێدا بووین بۆ چاکەکردن. لە ناکاودا وتیان: ئێمە پێغەمبەرێکمان لە ناودایە، بەڵام نەخێر هەرگیزاو هەرگیز بە گوێتان ناکەین، چونکە بە گوێ کردنمان پێشکەوتنە بۆ ئەوان وەڵڵاهی هەرگیز بە قسەیان ناکەین)[١٤٤].

لە ڕیوایەتیکی تردا لە ئیمامی عەلییە ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو جەهل بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئێمە دەزانین کە تۆ پیاو چاکێکی و پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنیت، ئێمە ناڵێین: تۆ درۆ دەکەی وە بەدرۆشت ناخەینەوە، بەڵام ئەوشتەی کە تۆ هێناوتە ئەوە درۆیە و ئێمە ئەوە بە درۆ دەخەینەوە، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الأنعام)[١٤٥].

لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتی کردن و شەڕو قسانەیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەبویری و بێ شەرمانە داوای ئەو سزایانەی خوایان دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی پێ دەکرد دژ بەوان. ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەیان وت: ئەی موحەمەد کوا ئەو سزایەی کە تۆ ئێمەی پێ دەترسێنیت کوا بۆچی پەلە ناکەیت بۆ توشمان نابێت، تا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ (الشعراء)[١٤٦]. واتە: ئەو بێ عەقڵانە وا دەزانن سزای خوا وەکو سزای خەڵك وایە و پەلەی خۆگەیاندنی بۆ دەکەن.

## ئازاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن موشریکەکانەوە

قورەیش دەستی کرد بە دژایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ سەرەتا بەباوەڕ نەبوون پێی و نزیك نەبوونەوە لێی وە گوێ نەگرتن بۆی، ئینجا پڕوپاگەندەیان بۆ

(١٤٤) أخرجه: البيهقي في (دلائل النبوة) (٢/٢٠٧)، وحسن إسناده الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٦٢)

(١٤٥) أخرجه: الترمذي (٣٠٦٤)، والحاكم (٢/٣١٥) وقال: حديث صحيح على شرط الشيخين، وضعفه الذهبي و الشيخ الألباني في (ضعيف الترمذي) (٣٠٦٤). (ئەمەش تەنها لەبەر زانیاری هیناومە).

(١٤٦) انظر: السيوطي في (لباب النقول) (ص:١٨٣).

دروست دەکرد لەناو هۆزە عەرەبەکاندا بە تایبەتی یانزەلایەنەکەی شاری مەککە، هەر بەوەشەوە نەوەستان تا گەیشتنە ئازاردانی خودی خۆی ﷺ بە هەرجۆرێك لە دەستیان هاتبێت و لە توانایاندا بوو بێت درێغیان نەکردووە، ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێکی وانەبووە هەموو کەسێك بتوانێت لە شاری مەککە ئەوەی کە دەیەوێت بەرامبەری ئەنجامی بدات، چونکە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی بەنی هاشم و ئەبوطالیبیش سەرکردایەتی بەنو عەبدولمەناف و بەنی هاشم و بەنو قوصەی دەکرد بە هەرسێ هۆزەکەوە لە وتەی ئەبو طالیب دەرنەدەچوون، وە ئەبو طالیب بە هەموو توانایەکی یەوە لە پشتی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەگەر ئەم هۆکارانە خوای گەورە نەیخستایەتە گەڕ بۆ پارێزگاری کردنی لە سەرەتاوە دەیان کوشت، بەڵام خوای گەورە هەردەم پێغەمبەری خۆی پاراستووە.

شێوەکانی بە گژداچوونەوە و ئازاردانەی کە پێغەمبەر ﷺ دووچاری هاتووە لە سەر دەستی بێ باوەڕەکان و هاوبەش پەیداکەرانی قورەیش:

**یەکەم:** لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێ خوای گەورە ئایەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ (المسد)ی دابەزاند ئوم جەمیلی چاو خێلی کچی حەرب و خوشکی ئەبو سفیان وە ژنی ئەبو لەهەب کەناوی کەعبی کوڕی عوازیە و مامی پێغەمبەرە ﷺ، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: لەماڵەکەیانەوە هاتە دەرەوە بۆ لای کەعبەوە بەدوای پێغەمبەردا ﷺ دەگەڕاو هاواری لێ بەرز دەبووەوە، و بەردێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا دانیشتبوو لەگەڵ ئەبوبەکردا لەپەنای کەعبەدا، ئەبو بەکر ﷺ کەچاوی پێکەوت ئەم ئافرەتە بەم شێوەیە هاتووە فەرمووی: پێغەمبەری خوا ئەوە ئەو ئافرەتە بەرەو ئێرە دێت وە زۆر دەم پیسەو دەترسم ئازارت بدات بۆ هەڵناسیت بڕۆیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّها لنْ تراني)) واتە: ئەو من نابینێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی قورئانی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ۝٤٥ ﴾ (الإسراء). واتە: کاتێك کە قورئان دەخوێنیت ئێمە بەربەستێکی نادیارو شاراوە، دەخەینە نێوان تۆ و ئەوانەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناهێنن.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: هات و وەستا لای ئەبو بەکر، و پێغەمبەر ﷺ

لەپاڵیدابوو، بەڵام بەهیچ جۆرێك پێغەمبەری نەبینی و وتی: ئەی ئەبوبەکر هاوەڵەکەت جوێنی پێداوم، ئەبو بەکر ﷺ فەرمووی: نەخێر سوێند بێت بەخوای ئەم کەعبەیە هاوەڵەکەم جوێنی نەداوە بەتۆ و جوێن نادات وەفەت شیعریشی نەوتووە. وتی: تۆ ڕاست دەکەی ئەی ئەبوبەکر وتەی تۆ لای من باوەڕ پێکراوە، پاشان ڕۆیشت وتی: هەموو قوڕەیش باش دەزانن کە من کچی سەروەرو سەرۆکەکەیانم بەڵام وەڵاهی ئەگەر بیبینم ئەم بەردە دەکێشم بەدەمیدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من ئافرەتێکی شاعیرم دەڵێم: زەم کراوێکی لۆمە کراو سەرپێچیمان لێ کردووە، وە فەرمانەکەیمان پشت گوێ خستووە وە ئاینەکەیشمان نەویستووە، پاشان بەڕێکەوت و ڕۆیشت ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی نەدی پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا لَمْ يزَلْ مَلَكٌ يسترُنِي عنها بجَناحِه)) واتە: نەخێر، فریشتەیەك بەردەوام بەباڵی خۆی منی دادەپۆشی لەپێش چاویدا تا نەمبینێت))[١٤٧].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئایا سەرتان سوڕ نامێنێت چۆن خوای گەورە جوێندان و نەفرین کردنی قوڕەیشم لێ دوور دەخاتەوە، ئەوان جوێن بەمرۆڤێکی زەمکراو و لۆمەکراو دەدەن وە لەعنەتی لێ دەکەن بەڵام من مرۆڤێکم ناوم محمدە (واتە: سوپاس کراو) کەوابوو بەپێچەوانەی وتەکانی ئەوانەوەیە][١٤٨].

**دووەم:** هەر لەئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾ (الإسراء) . ئەم ئایەتە کاتێك هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ خۆی دەشاردەوە لە بێباوەڕانی قوڕەیش وە کاتێ کە پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی خۆی دەکرد، دەنگی بەرز دەکردەوە بەقورئان خوێندن بۆ ئەوەی هاوەڵانی تێ بگەن و گوێیان لێ بێت، کاتێ بێباوەڕان گوێیان لێ دەبوو جوێنیان بەقورئانەکە دەدا ، وە بەوەی کە لە ئاسمان هێناویەتی یە خوارەوەو بەو کەسەشی کە گەیاندوویەتی و هێناویەتی بۆ ئەوان، پاشان خوای گەورە ئەم

(١٤٧) أخرجه: أبو يعلى (٢٣٥٨)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٤١)، والبزار (٢٢٩٤) وقال هذا أحسن الإسناد، والحميدي (٣٢٣)، وابن حبان (٦٥١١) وقال محققه: حديث صحيح بشواهده، والحاكم (٣٦١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (١٩٥/٢)، وابن هشام في (سيرة) (٣٧٠/١)، و حسن إسناده الحافظ في (الفتح) (٧٣٨/١)، واللفظ لابن حبان والحاكم.

(١٤٨) أخرجه: أحمد (٢٤٤/٢)، والبخاري (٣٥٣٣)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٤٢)، والبيهقي في (الكبرى) (٢٥٢/٨).

ئایەتەی دابەزاند دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾ ﴾ (الإسراء) ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: واتە: ئەوەندە قورئانەکە بە دەنگی بەرز مەخوێنە تاکو بێ باوەڕان گوێیان لێ بێت و جوێنی پێ بدەن، وە ئەوەندەش بە دەنگی نزم مەیخوێنە تاکو هاوەڵەکانت گوێیان لێ نەبێت لەو نێوانەدا بیخوێنە)[١٤٩].

**سێ یەم:** لە جوندوبی کوڕی سوفیانەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت و نەیتوانی دوو شەو تا سێ شەو هەستێ بۆ شەونوێژ و جبریلیش ﷺ نەهات بۆلای، ئافرەتێك لەقوڕەیش هات وتی: ئەی موحەمەد من هیوام وایە ئەو شەیتانەی کە دەهات بۆلات وازی لێ هێنا بیت و دوور کەوتبێتەوە لێت، چونکە نابینم چەند شەوێکە لێت نزیك ببێتەوە خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند دەفەرموێت: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ (الضحى)[١٥٠]. واتە: خوای گەورە سوێند دەخوات بە چێشتەنگاو وە بە تاریکی شەو کاتێ باڵ دەکێشێت بەسەر دنیادا، گەر خوای گەورە دوو سێ شەوێك بە جبریلدا ﷺ قورئان بۆ پێغەمبەری ﷺ نەنێرێت ئەوا پشت گوێی نەخستووە.

**چوارەم:** لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هەستا بەوکارەی کە خوای گەورە پێی سپاردووە ئەویش گەیاندنی ئاینەکەیەتی بە بێ باوەڕانی قوڕەیش، پێغەمبەر ﷺ بە ئارام بوو وە چاوەڕێی پاداشتی دەکرد لە خوای گەورە، و ئامۆژگاریەکانی پەروەردگاری دەگەیاند بە خزمانی خۆی تاکو بەرە وڕووی هەموویان دەبووەوە و ئەوان ئازاریان دەدا و گاڵتەیان پێ دەکرد و بەدرۆیان دەخستەوە...

عوروە دەفەرموێت: ئەوانەی گاڵتەیان بەپێغەمبەر ﷺ دەکرد پێنج پیاوی سەرکردە و ناوداری کەسانی خۆیان بوون، لە کوڕانی بەنی ئەسەد: ئەبو زمعەی

(١٤٩) أخرجه: أحمد (٢٣/١، ١٥٥)، والبخاري (٤٧٢٢)، ومسلم (٤٤٦)، والترمذي (٣١٤٦)، والنسائي (١٧٧/٢)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٤٥٤)، والطبري (١٨٤/٥،٥٣٥)، وابن خزيمة (١٥٨٧)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (١٨٤/٢، ١٩٥)، وابن حبان (٦٥٦٣،١٧٩٦).

(١٥٠) أخرجه: أحمد (٣١٢/٤)، والبخاري (١١٢٥، ٤٩٥٠) واللفظ له، ومسلم (١٧٩٧)، والترمذي (٣٤٠٣)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٧٠٩)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٥٨/٧)، وابن حبان (٦٥٦٦) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٦٥).

کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەلیب، وە لە بەنی زوهرە ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوث، وەلە بەنی مەخزوم: وەلیدی کوڕی موغیرە، وەلە بەنی سەهم: عاصی کوڕی وائلی سەهمی، وەلە بەنی خوزاعە:حارثی کوڕی طەلاطل..

دەفەرموێت: کاتێ ئەوانە درێژەیان بەکاری خراپەی خۆیاندا، وە گاڵتە یان بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾(الحجر) پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خوای گەورەوە بەڵێنی پێ درابوو کە تۆڵەی بۆ بکاتەوە لەوانەی گاڵتەیان پێ دەکرد.

وە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لای کەعبە بوو جبریل عليه السلام هات بۆ لای و لەلایەوە وەستا پێغەمبەریش ﷺ گاڵتەجاڕی یەکەی ئەوانی بۆ گێڕایەوە، دەفەرموێت: ئەو پێنج کەسە کاتێك دەسوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، پێغەمبەر ﷺ وەستا بوو وە جبریل عليه السلام لەپەنایدا بوو لەو کاتەدا ئەسوەدی کوڕی مطلب بەلایدا تێپەڕی جبریل عليه السلام پەڕێکی سەوزی بۆ هەڵداو کوێر بوو.

ئینجا ئەسوەدی کوڕی عەبد یەغوث بەلایدا تێپەڕی و جبریل عليه السلام بە پەنجەی دەستی ئیشارەتی کردوو پاش ماوەیەك توشی سك چوونێکی زۆر سەخت بوو وەسکی بای کرد تامرد.

پاشان وەلیدی کوڕی موغیرە بەلایدا تێپەڕی و جبریل عليه السلام ئیشارەتی کرد بۆلای برینێك کەبەپاژنەی ڤاچیەوە بوو، وە چەند ساڵێك بوو کە تووشی بوو بوو بەشەلی دەڕۆیشت و عەباکەی دەخشاند بەزەویدا، وە ئەو برینە کولایەوە ودیسان کێم و جەراعەتی لێدەهاتە دەرەوە هەتاکو کوشتی.

وە عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بەلایدا تێپەڕی و جبریل عليه السلام ئیشارەتی کرد بۆ بنی پاژنەی پێی، ئەویش پاش ماوەیەك سواری گوێ درێژێکی خۆی بوو کە بچێت بۆلای باخەکانی لە طائیف لەوێ لای خەرمانێك ویستی دابەزێت ڤاچی چوو بە دڕکێکدا وە ئەو دڕکە بوو بەهۆی مردنی.

وە حارثی کوڕی طەلاطڵ بەلایدا تێپەڕی و جبریل عليه السلام ئیشارەتی بۆ کرد بۆ

لای سەری و پاش ماوەیەك سەری لەناوەوە توشی کێم و جەراعەتێکی زۆر بوو [لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئیشارەتی کرد بۆلای سکی و توش ئاوی زەردی بوو (دیارە نەخۆشی یەکی ئەو زەمانە بووە ئەوان وا ناویان لێ ناوە) تاوای لێهات پیساییەکەی لەدەم و لووتی یەوە دەهاتەدەرەوە تا دواجار کوشتی](١٥١).

ئا بەو جۆرە خوای گەورە بەڵێنی خۆی هێنایە دی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ (الحجر). واتە: ئێمە بەسین بۆ ئەوانەی گاڵتەت پێ دەکەن.

لەڕیوایەتێکی تردا: لە عەبدول ڕەحمان کوڕی ئەبو بەکرەوە ﵁ دەفەرموێت: (ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆیشتایە بەڕێگادا حەکەمی کوڕی عاص لاسایی ڕۆیشتنەکەی پێغەمبەری دەکردەوە ﷺ چۆن بڕۆیشتایە ئەویش وا دەڕۆیشت لەپێش چاوی خەڵکیدا و لاسایی دەکردەوە بۆ ئەوەی لەناو خەڵکدا گاڵتەی پێ بکات. کاتێ پێغەمبەر ﷺ بینی بەو شێوەیە لاسایی دەکاتەوە فەرمووی: (فَكَذلكَ كُن) واتە: هەتا هەیت هەروا بیت. بوو ئیتر هەتا لەژیاندا مابوو بەو جۆرە بوو کە پێی وابوو لاسایی پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوە)(١٥٢).

**پێنجەم:** حارثی کوڕی غامیدی ﵁ دەیگێڕێتەوە بۆمان: (کە کاتێ منداڵ بووە و باوکی بردوێتی بۆ شاری مەککە و لەوێ دیمەنێکی چاوپێکەوتووە، کە کۆمەڵێ خەڵك کۆبونەتەوە لە کابرایەك، حارث دەفەرموێت: بە باوکم وت: ئەو کۆمەڵە چین لەو کابرایە کۆبونەتەوە؟ وتی: ئەوانە لە کابرایەکی بێ دین کۆبونەتەوە، حارث دەڵێت منیش نزیك بوومەوە لێیان و سەیرم کرد پێغەمبەری خوایە ﷺ بانگەوازی ئەو خەڵکە ئەکات بۆ یەك خواپەرستی و باوەڕبوون پێی، ئەوانیش بەدرۆی دەخەنەوە و بەرپەرچی دەدەنەوە و ئازاری دەدەن، تا نیوەڕۆ بەم شێوەیە بەردەوام بوون، دوای نیوەڕۆ خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد و هەریەکە بۆ ماڵ و شوێنی خۆی گەڕایەوە.

---

(١٥١) انظر: سيرة ابن هشام (٢١/١، ٢٩٢) وقال محققا: إسناده صحيح إلى ابن زبير، وابن جرير (٥٥٠/٧) (٢١٤١٧)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٨/٩) وفي (الدلائل) (٣١٦/٢) وقال الذهبي في (السيرة) (ص:١٤٣): حديث صحيح، و حسن إسناده الشيخ الألباني عن طريق البيهقي: كما في: (صحيح السيرة) (ص:٢٢٢).

(١٥٢) أخرجه:الحاكم (٦٢١/٢) وصححه، البيهقي في (دلائل النبوة) (٣١٧/٢) و، وقال الحافظ العراقي في (تخريج الأحياء) (٣٨٨/٢): رواه البيهقي في الدلائل بإسناد جيد، وقال الحافظ في (الإصابة) (١٧٨١) في إسناده نظر.

ئینجا ئافرەتێك هات کە کەمێك سەرسنگی دەرکەوتبوو دەگریا و خاولی یەك و کەمێك ئاوی پێ بوو، هەتا نزیك بووەوە لە پێغەمبەر ﷺ وە ئاوەکەی دایە و ئەویش هەندێ لە ئاوەکەی خواردەوە و هەندێکی دەست نوێژی پێ شۆرد، و ئینجا سەری بەرز کردەوە بۆلای کچەکەی کەهاتەوە بۆ لای و پێی وت: ((يا بُنَيَّةُ خمِّري عليكِ نحرَكِ ولا تخافِي على أبيكِ غلبةً ولا ذُلًّا)) واتە: ئەی کچە بچوکەکەم سەر سینگت داپۆشە و بە هیچ جۆرێك مەترسە چونکە باوکت تووشی زەلیلی و شکست نابێت، وتم: ئەم ئافرەتە کێیە؟ وتیان: ئەوە زەینەبی کچیەتی)[١٥٣].

**شەشەم:** لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (گرۆی سەرکردایەتی قورەیش نزیك حیجری پەنای کەعبە کۆبوونەوە و پەیمانیان بەست و سوێندیان خوارد بە لات و عوزا و مەنات و نائیلە و ئیساف، ئەگەر موحەممەدیان بەرچاو بکەوێت هەر هەموویان بە یەکجار بەیەکەوە لێی بدەن و ئازاری بدەن وە بەجێی نەهێڵن تا دەیکوژن، ئەم هەواڵە بڵاوبووە وە تا گەیشتەوە گوێی فاطیمەی کچە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ فاطمەش بەگریانەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و هەواڵەکەی بە باوکی ڕاگەیاند و پێی وت: کۆمەڵانی سەرکردەی قورەیش پەیمانیان داوە دژ بە تۆ ئەگەر بتبینن هەڵسن و بتکوژن وە هەریەکەیان بەشی خۆی دیاری کردووە لە بژاردنەوەی خوێنی تۆ دوای کوشتنت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يا بُنَيَّة أرِنْي وضوءً)) واتە: ئەی کچی خۆشەویستم ئاوی دەست نوێژم بۆ بهێنە، دەفەرموێت: ئاوی بۆ هێنا و دەستنوێژی شۆرد، وە چوو بۆ کەعبە کاتێك بێ باوەڕەکان پێغەمبەر ﷺ یان بینی هەر لە دوورەوە وتیان: ئەوە هات وە سەریان کز کردوو ملیان شۆڕ کرد و لە جێی دانیشتنەکانیاندا بێ دەنگ بوون و هەرنەشیان وێرا تەماشای بکەن، وە هیچ پیاوێکیان نەیدەوێرا بۆی هەستێت، پێغەمبەر ﷺ بە ڕێکەوت تا گەیشتە لای سەریانەوە، ئینجا مشتێك خۆڵی هەڵگرت و فەرمووی ((شاهتِ الوجوهُ)) واتە: چاوانتان کوێر بێت، دەفەرموێت: خۆڵەکەی گرتە ئەو کۆمەڵە قورەیشی یەی کەلەوێ ئامادەبوون بەرهەرکەسێکیان کەوت بەبێ باوەڕی کوژرا لە جەنگی بەدردا)[١٥٤].

---

(١٥٣) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٣٣٧٣) وفي (١٠٥٧/٢)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢١/٦): رواه الطبراني ورجاله ثقات وقال في (٢١٦/٩): مرسل رجاله رجال الصحيح، وقال السيوطي في (الجامع الكبير) كما في (منتخب كنز العمال) (٢٩٠/٤): قال أبو زرعة الدمشقي: هذا حديث صحيح.

(١٥٤) أخرجه: أحمد (٣٠٣/١) (٢٧٦٢) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، و كذلك صححه الشيخ أحمد شاكر في

**حەوتەم:** لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەفەرموێت: (ئەبو جەهل وتی: ئایا موحەمەد ناوچەوانی دەخاتە سەر زەوی و سوجدە دەبات لەناو ئێوەدا و لە پێش چاوتاندا؟) (دیارە بە سەرکردەکانی قورەیشی وتووە کە کاتێ کۆبوونەتەوە لە (الملأ)ی نزیکی کەعبە) وتیان: بەڵێ، وتی: سوێند بە لات وعوزا ئەمجارە ئەگەر بینیم ئاوها دەکات قاچ دەنێمە سەر ملییان سەرسەری هەتا ڕووی تەخت دەکەم بە خۆڵەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو پێغەمبەر ﷺ هاتوو نوێژی کرد ئەویش لە پێش چاوی ئەوان ویستی ئەو قسەیەی کە وتویەتی و ئەو پەیمانەی کە داویەتی بیهێنێتەدی و مەرامی گڵاوی جێ بەجێ بکات، هەر نزیك بووەوە لە پێغەمبەر ﷺ پاشەوپاش هاتە دواوە و شتی بە دەستی لە خۆی دووردەخستەوە، ئینجا هاتن بۆلای و پێیان وت: (ئەوە چی ڕوویدا وە بۆ وات لێ هات؟) چیت لێ قەوماوە ئەی ئەبولحەکەم؟ وتی: وام زانی چاڵە ئاگرێك وا لە نێوان من و موحەممەددا یە وە دەنگە دەنگێك و باڵ و شتی تۆقێنەرم بینی، ئەمەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( لو دنا منِّي لاختطَفَتْه الملائكةُ عُضوًا عُضوًا))[155]. واتە: ئەگەر لێم نزیك بووایەتەوە فریشتەکان پارچە پارچەیان دەکرد). (لە ڕیوایەتێکی تردا [گەر وای بکردایە فریشتەکان لە پێش چاوی خەڵکاندا دەیان فڕاندو لەناویان دەبرد])[156].

**هەشتەم:** لە ئیبنو عەباسەوە ﵁ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد ئەبو جەهل هات و پێی وت: ئەرێ پێم نەوتی: ئەمە مەکە؟ (سێ جار لێی دووبارەکردەوە) پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی لێ کرد ئینجا ڕۆیشت. ئەمیش هاواری دەکرد و دەیوت: بەچی هەڕەشەم لێ دەکەیت ئەی محمد؟ والله پیاوێك شك نابەم لەم شارەدا لەمن بە دەسەڵات تر بێت و شوێن کەوتووانی زیاتر بێت، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ۝١٧ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ۝١٨ ﴾ (العلق).

(تحقيق المسند) (٢٦٩/٤)، أبو نعيم في (الدلائل) (ص:١٣٩)، والحاكم (١٦٣/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٢٤٠/٦)، وابن حبان (٦٥٠٢) وقال محققه حديث صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٢٨/٨): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٨٢٤): إسناده جيد، وقال الشيخ مقبل في الصحيح المسند (٦٥٧): حديث حسن.

(١٥٥) أخرجه: أحمد (٣٧٠/٢)، ومسلم (٦٩٩٦) واللفظ له، والنسائي في (السنن الكبرى) (١١٦٨٣)، والطبري في (التفسير) (٢٥٦/٣٠)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٥٨)، والبيهقي (٨٩/٢)، وابن حبان (٦٥٧١) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٥٦) أخرجه: البخاري (٤٩٥٨)، والترمذي (٣٣٤٨)، والنسائي في (التفسير) (٨١).

ئیبنو عەباس دەفەرموێت: ئەگەر ئەو کۆمەڵ و دەست و پێوەندی خۆی .بانگ بکردایە خوای گەورەش فریشتەی زەبانی یەی دۆزەخی بۆ دادەبەزاند...)[١٥٧].

**نۆیەم:** لە طاریقی کوڕی عەبدوڵڵای مەحاریبی یەوە ﷺ دەفەرموێت: (بەچاوی خۆم لە بازاڕی (ذي المجاز) چاوم بە پێغەمبەر ﷺ کەوت کە پۆشاکێکی خەت خەتی سووری لەبەردابوو بەناو ڕیزی خەڵکاندا دەڕۆیشت و دەیفەرموو: ((يا أيُّها النَّاسُ إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يأمُرُكم أنْ تعبُدوه ولا تُشرِكوا به شيئًا)) واتە: ئەی خەڵکینە خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات کە بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، کە ئەمەی دەفەرموو خەڵکانیش لێی کۆدەبوونەوە، و بەڵام کەس ڕووبەڕوو وتەیەکی پێ نەدەوت و وەڵامی نەدەدایەوە، وە پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ نەدەبوو بەردەوام دەیفەرموو ((يا أيُّها الناسُ، قُولوا: لا إلهَ إلا اللهُ، تُفلِحوا)). واتە: خەڵکینە بڵێن (لا إلهَ إلا اللهُ) سەرفراز و ڕزگار دەبن. بەڵام تەنها یەك پیاو نەبێت کە ڕووسپی یەکی چاوخێل بوو دوو پەلکەی هەبوو دەکەوتە دوای پێغەمبەر ﷺ و بەردی تێ دەگرت هەتا پاژنەی قاچی خوێناوی کرد بوو دەیوت: خەڵکینە گوێڕایەڵی ئەمە نەکەن، ئەمە درۆزنە ئەمە گومڕاتان دەکات و لەئاینی خۆتان و باوباپیرتان لاتان دەدات، وە پێغەمبەریش ﷺ خۆی لێ دەشاردەوە و ئەویش هەر بەردەبارانی دەکرد و ئێمەش منداڵبووین دەچووین تا بزانین ئەم کارە بەچی دەگات، دوایی پرسیارم کرد: ئەوە کێ یە دوای کەوتووە؟ وتیان: ئەوە مامی خۆیەتی عەبدولعزی واتە: (ئەبو لەهەب)......)[١٥٨].

لەگێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبازاڕی (ذي المجاز)دا بەناو ڕیزی خەڵکاندا هاتوچۆی دەکرد و دەیفەرموو: [((يا أيُّها الناسُ، قُولوا: لا إلهَ إلا اللهُ، تُفلِحوا))]

---

(١٥٧) أخرجه: أحمد (٢٥٦،٣٢٩/١) (٢٣٢١) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده قوي، والطبري في (التفسير) (١٦٤/٣)، والترمذي (٣٣٤٩)، والنسائي في (الكبرى) (٦٨٤/١) (١١٦٨٤) وفي (التفسير) (٧٠٤) وقال محققه: إسناده حسن، والحاكم (٤٨٨/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٣٩/٧) (١١٦٨٣): في الصحيح بعضه ورجاله رجال الصحيح، و صحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٦٨) وفي (السلسة الصحيحة) (٢٧٥).

(١٥٨) أخرجه: أحمد (٤٥٢/٣) و رقم (١٦٠٢٠) وقال محققه: إسناده صحيح، وبرقم (١٦٠٢٢) وقال محققه حديث صحيح و برقم (١٦٠٢٣) قال محققه: إسناده حسن، وأحمد (٣٤١/٤)، و حسن إسناده الأرناؤوط في تعليقه على (زاد المعاد) (٣٩/٣)، و أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٤٥٨٢،٤٥٩٠)، والنسائي(٥٥/٨)، والحاكم (١٥/١) وفي (٦١١،٦١٢/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن أبي شيبة (٣٠٠/١٤) مختصراً، و الدار قطني(٤٤/٣)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٨٠/٥) وفي (الدلائل) (٣٨١/٥)، وابن حبان (٦٥٦٢) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (دفاع عن الحديث و السيرة) (ص:٢٢)، واللفظ لابن حبان وأحمد.

واتە: ئەی خەڵکینە بڵێن (لا إله إلا الله) ڕزگار دەبن، دەفەرمویت: ئەبوجەهل بەمشت خۆڵی پیا دەپژاند و دەیوت: خەڵکینە ئەمە گومڕاتان دەکات و لە دینەکەتان لاتان دەدات و دەیەوێت واز لە خواکانتان بێنن، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی لێ نەدەدایەوە)[١٥٩].

**دەیەم:** لە ئیبنو مەسعودەوە ؓ دەفەرمویت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی دەکرد لای کەعبە ئەبوجەهل و هەندێك لە هاوەڵانی لەشوێنی دانیشتنەکانی خۆیاندا دانیشتبون یەکێك لە ناویاندا وتی: ئەرێ تەماشا ناکەن ئەم ڕیابازە چی دەکات لەناوتاندا ئەوە بۆ یەکێ لە ئێوە هەڵناسێت تا بچێت بۆلای وشترەکەی کوڕانی فلان کەس کەسەریان بڕیوە بچێت شیلاوگەکەی یان ڕیخۆڵەکەی هەمووی بهێنێت و چاوەڕێ بکات تاکو موحەمەد دەچێتە سوجدەوە ئینجا بیکاتە نێوان هەردوو شانیەوە، تاوان بارترین کەس کە ئەو کارەی ئەنجامدا عوقبەی کوڕی ئەبو موعیط بوو چی لێ داواکرابوو جێ بەجێی کرد و وەستا تاکو پێغەمبەر ﷺ چووە سوجدەوە، ئینجا ئەویش چوو شیلاوگ و ناوسکەکەی کرد بەسەر و شانی پێغەمبەردا ﷺ، لەو کاتەدا ئیبنو مەسعود ؓ دەفەرمویت: ئاخ گەر لەو ڕۆژەدا دەسەڵاتم دەبوو دەچووم لێم دوور دەخستەوە، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز نەکردەوە و ئەوانیش پێدەکەنین و لەسەر گازی پشت دەکەوتن و گاڵتەجاڕیان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ لە سوجدەدا سەری بەرز نەدەکردەوە تا یەکێ چوو بە فاطمەی کچی ڕاگەیاند ئەویش کە بیستی باوکی کارێکی وەهای بەرامبەرکراوە بەڕاکردن چوو بەرەو لای باوکی و چاوی کەوت بەو شتانە وا بە سەر و شانی پێغەمبەرەوە یە ﷺ هەمووی لێ دوور خستەوە و پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێ کردن، وە دوعای لەو کەسەش کرد کە ئەم کارەی ئەنجامداوە ئەوانیش هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە، پێغەمبەریش ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان ڕووی کردە قیبلەو دەنگی بەرز کردەوە و دەستی بەدوعاکردن کردو فەرمووی: ((اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ)) سێ جار ئەمەی دووبارەکردەوە، کاتێك گوێیان لەم نزایەی پێغەمبەر بوو پێکەنینیان نەماو ترسان لە دوعاکەی) دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە ئەبو جەهل لەناو بەریت خوایە عوتبە و شەیبە لەناو بەریت خوایە وەلید و عوقبە و ئومەیە لەناو بەریت)). ئیبنو مەسعود ؓ دەفەرمویت: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کردن

(١٥٩) أخرجه: أحمد (٤/٦٣) (١٦٦٠٣) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط: إسناده صحيح.

هەموویانم بەکوژراوی بەرچاو کەوت لە ڕۆژی بەدردا تەرمی پیسیان ڕادەکێشرا بەرە و قەلەیب واتە: (بیرە کۆنەکەی بەدر) و هەموو فڕێدرانە ناوی پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وأُتْبِعَ أَصْحَابُ القَلِيبِ لَعْنَةً.))[١٦٠] واتە: نەفرەت بەدوای خاوەنانی قەلیبدا چوو).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کەعبە دەرچوو ئەبولبوختری پێگەیشت کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی قوڕەیش گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ بینی ڕووی گرژبووە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خلِّ عنّي) واتە: لێم گەڕێ، ئینجا زانی کە پێغەمبەر ﷺ نارەحەتە پێی وت: نا لێت ناگەڕێم تا پێم نەڵێیت بۆچی وات لێ هاتووە و کێ وای لێ کردوویت؟ پێغەمبەر ﷺ زانی کە لێی دوور ناکەوێتەوە پێی فەرموو: ئەبوجەهل فەرمانی کردووە کە شیلاوگ و ڕیخۆڵەی وشتر بکرێت بە سەرمدا. ئەویش دەستی پێغەمبەری گرت ﷺ وتی: وەرە لەگەڵم هەتا چوو بۆ لای مەلەء (الملأ) لەوێدا ئەبو لبوختری چوو بۆ لای ئەبوجەهل و پێی وت: تۆ فەرمانت داوە ئاوا لە موحەممەد بکرێت؟ ئەبو جەهل وتی: بەڵێ، ئەویش گۆچانەکەی هەڵگرت و کێشای بە سەری ئەبوجەهلدا، دەفەرموێت: ئەو کەسانەی لەوێدا بوون هەندێکیان لایەنگری ئەبوجەهل بوون و هەندێکیشیان لایەنگری ئەبول بختور بوون، و پاشان بوو بەشەڕ لە نێوانیاندا، ئەبو جەهل لە ناویاندا هاواری کرد ئەوە چی دەکەن، موحەممەد دەیەوێت دوژمنایەتی بخاتە نێوانمانەوە، و خۆی و هاوەڵانیشی دەربازبن)[١٦١].

**یانزەهەم:** ئیبنو ئیسحاق دەفەرموێت: (کاتێ قوڕەیش کارە دوژمن کارەکانیان توندترکرد بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ، تاوای لێ هات نەفامان و منداڵانیان دەنارد بۆ ئازاردانی پێغەمبەرﷺ و پێیان دەوت: تۆ شاعیری تۆ سیحربازی، تۆ فاڵچیت، وە پێغەمبەر ﷺ بایەخی پێنەدان و هەستا بە کارەکەی لە پێناوی خوادا بۆ چەسپاندنی

(١٦٠) أخرجه: أحمد (٤١٧/١)، والبخاري (٢٥٠،٢٤٠) وفي (٣١٨٥،٣٩٦٠)، ومسلم (٤٦٢٥)، والنسائي(١٦١/١)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٧٤٥)، والبزار(٢٣٩٩)، وابن خزيمة (٧٨٥)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٧٨/٢)، وابن حبان (٦٥٧٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، واللفظ للبخاري ومسلم.

(١٦١) أخرجه: البزار (٢٣٩٨)، والطبراني في (المعجم الأوسط) (٧٦٦)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٨/٦) (٩٨١٨) رواه البزار والطبراني في المعجم الأوسط و فيه الأجلح الكندي وهو ثقة عند ابن معين و غيره وضعفه النسائي و غيره، و أوردته للأعتبار والعلم فقط.

ئاینی ڕاست. لەگەڵ ئەو هەموو گاڵتە پێکردنەشدا هەر قسەکانی خوای دەدا بە گوێیاندا.

ئیبنو ئیسحاق دەفەرموێت: یەحیای کوڕی عورۆە لە باوکیەوە کە عورۆەی کوڕی زوبەیرە بۆی گێڕامەوە کە بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصی وتووە: ئەی عەبدوڵڵا چ دیمەنێکی زۆر سەختت چاوپێکەوتووە لەو دوژمنکاریانەی کە بێ باوەڕانی قوڕەیش ئەنجامیان دەدا بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ؟ ئەویش فەرمووی: ڕۆژێك من لە ناویاندا بووم، سەرکردەکانی قوڕەیش کۆبوونەوە لای (حجر) باسی موحەمەدیان دەکرد دەیان وت: کەسمان نەدیوە سەیرتر لەم پیاوە کە بیروباوەڕمان پوچ دەکات و جوێن بە باو و باپیرانمان دەدات و ڕەخنە لە ئاینمان دەگرێت و کۆمەڵگاکەی پارچە پارچە کردووین و جوێن بە خواکانمان دەدات بە ڕاستی لەسەر شتێکی گەورە ئارامان گرتووە لێی. دەفەرموێت: لەم قسانەدا بوون پێغەمبەر ﷺ هات بەرەو کەعبە بۆ لای (حجر) و تێپەڕی بەلایاندا و تەوافی کرد بەدەوری کەعبەدا و هەرکاتێ کە دەگەیشتە لای ئەوان (بێ گومان (حجر) بەشێکە لە کەعبە ئەو قەوسەیە کە لەپەنای کەعبەدایە، وە بەبەشێك لە کەعبە دادەنرێت) و لە وێوە تێدەپەڕی هەندێ توانج و وتەی ناشرینیان پێ وت: زانیم پێی ناخۆش بوو، ڕۆیشت تەوافی کرد و لەوسەرەوە هاتەوە بۆ جاری دووەم تێپەڕی بەلایاندا هەمان جوێن و وتەی ناشرینیان پێووتەوە، پێغەمبەرﷺ دیار بوو بە ناوچەوانیەوە کە پێی ناخۆشە، بەم شێوەیە سێ یەم جاریش ئەم ڕەفتارەیان نواندەوە، پێغەمبەر ﷺ وەستا بەرە و ڕوویان و فەرمووی: ((أتسمَعونَ يا معشرَ قُريشٍ أمَا والَّذي نفسُ مُحمَّدٍ بيده لقد جِئْتُكم بالذِّبحِ)) واتە: گوێتان لێ بێت ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە من هاتووم بۆ ئەوەی هەر هەمووتان بەسەر بڕین ببەم. دەفەرموێت: ئەم وتەیە کاری لە هەر هەموویان کرد تاکو هەر هەموویان بێ دەنگ بوون و لە جێی خۆیان سست بوون...

هەتا یەکێکیان هات و پێغەمبەری ﷺ ئارام کردەوە و وتەی نەرمی لەگەڵدا بەکارهێنا و هەتا دەیوت: بڕۆ ئەی ئەبو قاسم ئەوا ئێمە نەفام و بێ ئەقڵین خۆ تۆ مرۆڤێکی ئاقڵی تۆ چۆن لەگەڵ ئێمەدا قسە دەکەیت، دەفەرموێت: پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتەوە و دیسان بەیانی لای (حجر) کۆبوونەوە و منیش لە ناویاندابووم و گوێم

لێ بوو هەندێکیان بە هەندێکیانی دەوت: ئەوە ئێوە ئاگاتان لێ نییە دوێنێ چیتان دەوت و چیتان دەکرد بە موحەمەد ئەویش چی وت: بەرامبەرتان هەتا هەڕەشەی لێ کردن و وەستا بەرامبەرتان ئێوە لە ترسا وازتان لێهێنا، دەفەرموێت: لەم قسانەدا بووین پێغەمبەر ﷺ هات بۆ کەعبە کە بینیان هەموویان لێی ڕاست بوونەوە و چواردەوریان گرت و پێیان وت: تۆ دەڵێی ئاوا و ئاوا...... پێغەمبەریش ﷺ بێ ترس و ئاشکرا فەرمووی: بەڵێ منم وا دەڵێم، دەفەرموێت پیاوێکم بینی یەخەی کراسەکەی پێغەمبەری ﷺ گرتبوو ئەبو بەکر ﷺ هات و دەستی گرت و دووری خستەوە و بەگریانەوە دەیفەرموو: ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێ پەروەردگارم (الله) یە ئینجا موشریکەکان بڵاوەیان لێکرد ئەوە دوژمن کارترین دیمەن بوو کە من چاوم پێکەوتووە ئەنجامیان دابێ بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ)[١٦٢].

**دوانزەهەم:** لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکروە ﷺ دەفەرموێت: (پرسیار کرا لە ئەسماء دوژمن کارترین کارێك کە کرابێت دژ بە پێغەمبەر ﷺ چی بووە؟ ئەویش فەرمووی: هاوبەش پەیداکەران جارێکیان دانیشتبوون لای کەعبە و باسی پێغەمبەر ﷺ یان دەکرد و دەیانگێڕایەوە کەچی دەڵێت بەرامبەر بەخواکانیان، ئەوانیش هەڵوێستیان چۆنە بەرامبەری؟ لەم قسانەدا بوون پێغەمبەر ﷺ هاتوو هەموویان وەك یەك پیاو لێی هەستان وبۆڵەو هاوار بەرز بۆوە هەواڵ گەیشتە لای ئەبو بەکر و وتیان: فریای هاوەڵەکەت بکەوە، ئەبوبەکر لای ئێمە بوو دەرچوو چوار (غەدیرەی) هەبوو (واتە وەك پەلکە قژی شۆڕ بوو بووەوە و قژی زۆر بوو) وە ڕۆیشت و خەڵکەکەی لێ دوور خستەوە و ئەی فەرموو:ماڵتان وێران بێت پیاوێك دەکوژن کە دەڵێ پەروەردگارم (الله) یە و ڕێنمایی لای خواوە بۆ هێناون؟ ئەوانیش هەر ئەمەیان بینی وازیان لە پێغەمبەر هێنا و بەربوونە ئەبوبەکر و ئازاریاندا هەتا دوایی بڵاوەیان لێکرد، کاتێ ئەبوبەکر گەڕایەوە بۆ لامان دەستت بدایە لە هەر شوێنێکی سەری قژت بەدەستەوە دەهات ئەوەندە لێیان دابوو، وە بە دەم ئەو هەموو ئازارەوە

(١٦٢) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢١٨/٢) وفي (فضائل الصحابة) (٦٣٩) وقال محققه: إسناده حسن، وابن أبي شيبة(٤٤١/٨)، وأبو يعلى (٧٣٣٩)، وأبونعيم في (دلائل النبوة) (١٥٩)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٧٤٠)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٧٥/٢)، و سيرة ابن هشام (٣٨٨/١) (٢٠٦) وقال محققاه: سناده قوي حسن واللفظ له، ابن حبان (٦٥٦٧)، وقال الهيثمي في (مجمع الوزوائد) (١٨/٦): رواه أحمد وقد صرح ابن إسحاق بالتحديث و بقية رجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٤٨): إسناده حسن.

دەیوت: ((تَبَارَكْتَ ذَا الجَلَالِ وَالإِكْرَامِ.)). واتە: (بەرز وشکۆمەند بیت ئەی خاوەنی شکۆ و رێز)(١٦٣).

**سیانزەهەم:** لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پرسیارم کرد لە عەبدوللای کوڕی عەمری کوڕی عاص و پێم وت: بۆم بگێڕەوە سەختترین دوژمن کاری قورەیش کە ئەنجامیاندا بێت بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ چی بووە؟ فەرمووی: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد لای (حجر)، عوقبەی کوڕی ئەبو موعیط هاتوو، پێغەمبەر ﷺ بوردەیەکی بەشانەوە بوو. دەفەرموێت: گرتی و ئالانی لە ملی پێغەمبەر ﷺ کە لە نوێژدا بوو وە بە هەموو هێزی دەیجەڕاند هەتا وەختەبوو بخنکێت، ئینجا ئەبوبەکر لە دوورەوە هات وشانی عوقبەی گرت و دووری خستەوە لە پێغەمبەر و فەرمووی: ئایا پیاوێك دەکوژن کەدەڵێت پەروەردگارم (الله) یە)(١٦٤).

**چواردەهەم:** لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (جارێکیان لە پێغەمبەریاندا هەتا لەهۆشی خۆی چوو وە بووراییەوە، ئەبوبەکر هاواری دەکردو دەیوت: ماڵتان وێران بێت پیاوێك دەکوژن کە دەڵێ پەروەردگارم (الله) یە؟ وتیان: ئەوە کێ یە؟ وتیان: ئەوە کوڕەکەی ئەبو قوحافەی شێتە ئینجا وازیان لە پێغەمبەر هێنا و بە هەموویانەوە بەربوونە ئەبوبەکر)(١٦٥).

**پانزەهەم:** هەر لەئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (جبریل ﷺ جارێکیان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا دانیشتبوو زۆر غەمبار بوو وە زۆر شوێنی خوێناوی بوو بوو، لەبەر ئەوەی کە هەندێك لەخەڵکی مەککە ئازاریان دابوو، جبریل ﷺ پێی

---

(١٦٣) أخرجه: الحميدي (٣٢٤)، وأبو يعلى (المسند) (٥٢)، وأبو نعيم في (حلية الاولياء) (٣١/١)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٧/٦): رواه أبو يعلى و فيه (قدروس) ولم اعرفه و بقيه رجاله ثقات،وقال الحافظ في (فتح الباري) (١٦٩/٧): رواه أبو يعلى بإسناد حسن،و أخرجه: الأصفهاني في (سير السلف الصالحين) (١١٨/١) وقال محققه: صحيح.

(١٦٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٦٧٨، ٣٨٥٦)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٥٩)، وأبو يعلى (المسند) (٣٤٣/١)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٢٩٧/١٤)، وابن حبان (الصحيح) (٦٥٦٩) وقال محققه: إسناده حسن.

(١٦٥) أخرجه: أبو يعلى (٣٦٩١)، والبزار (٢٣٩٦)، والحاكم (٦٧/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وأبو نعيم في (الدلائل) (٦٧/١)، وأحمد في (فضائل الصحابة) (٢١٨) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الحافظ العراقي في (تخريج الأحياء) (١٠٢/٤): إسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الحافظ في (الفتح) (١٦٩/٧) و رواه أبو يعلى والبزار و إسناده صحيح وفي (المطالب) (٣٨٨٣): رواه البزار و إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٨١٥): رواه أبو يعلى والبزار ورجاله رجال الصحيح.

**فەرمووو: ئەوە چیتە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوانە ئاوایان لێ کردووم، جبریل ﷺ پێی فەرموو: پێت خۆشە نیشانەیەکت نیشان بدەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: تەماشای ئەو دارە بکە، ئەویش تەماشای کرد لەو پەڕی شیوەکەوە بوو، جبریل ﷺ فەرمووی بانگی ئەو دارە بکە با بێت بۆ لات، پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردوو دارەکە هات بۆلای تا هاتە بەردەمی، پاشان وەستاو جبریل ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: پێی بڵێ بابگەڕێتەوە جێی خۆی، ئەویش پێی وت و دارەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی، و پێغەمبەر ﷺ بۆ دڵنەوایی خۆی فەرمووی: ئەمەم بەسە..)[١٦٦].**

**لە ڕیوایەتێکی تردا لە عومەری کوڕی خەطابەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەحجون بوو (واتە: شاخەکەی پشت مەککە) بێ باوەڕەکان بەرپەرچیان دایەوە و ئازاریان دا، ئینجا دوعای کردو فەرمووی: ((اللّهمَّ أرِني آيةً اليومَ لا أُبالِي مَن كذَّبني بعدَها)) واتە: خوای گەورە ئەمڕۆ نیشانەیەکم نیشان بدە هەر کەس بە درۆم بخاتەوە دوای ئەم نیشانەیە هیچ باکم نەبێت. ئینجا جبریل ﷺ هات بۆلای وپێی وت: ئەو دارە دوورەی ئەولا بانگ بکە؟ پێغەمبەریش ﷺ دارەکەی بانگکرد بەسەر زەویدا خشکە خشك هات، تا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ وە دارەکە وتی: (السلامُ عليك يا رسولَ اللهِ ) پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کە بچێتەوە جێی خۆی، دارەکەش چووە وە جێگەی خۆی، و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیتر باکم نی یە هەر کەس لە خزمانم گەر لەمەودوا بە درۆم بخەنەوە)[١٦٧].**

**ئابەم شێوەیە موشریکەکان لە هەموو ڕوویەکەوە، لەئابڕو چوونی و لەکەدارکردنی و تانەدان لێی و توهمەی سحربازیان دایە پاڵی، وەبەشێت وشاعیریان دادەنا وە بەوەشەوە نەوەستان تا بەرامبەر خودی پێغەمبەر ﷺ ئەو خراپەکاری و دوژمن کاریانەیان ئەنجام دا، بەوجۆرە پێغەمبەر ﷺ کە سەروەری هەموو کوڕانی ئادەمە**

---

(١٦٦) أخرجه: أحمد (المسند) (١١٣/٣) (١٢١١٢) وقال محققه إسناده قوي على شرط مسلم، والدارمي (السنن) (٢٣)، وابن ماجه (السنن) (٤٠٢٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (٣٢٥٤)، وصححه الشيخ الأرناؤوط على شرط مسلم في تعليقه على (صحيح ابن حبان) (٤٣٧/١٤).

(١٦٧) أخرجه: أبو يعلى (المسند) (٢١٥)، والبزار (المسند) (٢٤١٠)، و البيهقي في (دلائل النبوة) (١٥٤/٢)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٠/٩): رواه البزار وأبو يعلى و إسناد أبي يعلى حسن، و حسن إسناده السيوطي في (الجامع الكبير) كما في (منتخب كنز العمال) (٢٩٨/٤).

و پێغەمبەری گەورەی خوایە، ئابەو شێوەیە ئارام گرو لەسەر خۆ بووە، پێغەمبەر ﷺ ئازاردانێکی تووش بووە دەتوانرێ بوترێت هیچ کەس لە پێغەمبەران ﷺ ئەو ناڕەحەتیەیان نەهاتۆتە رێ وەکو پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((لقد أُوذيتُ في اللهِ وما يُؤْذَى أَحَدٌ ولقد أُخِفْتُ في اللهِ وما يُخافُ أَحَدٌ)) واتە: ئازار دراوم لە پێناو خوادا کەس ئاوەها ئازار نەدراوە، وە ترسێنراوم لە پێناوی خوادا هیچ کەسێك بەوێنەی من نەترسێنراوە)[١٦٨]، بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ بەتاقی تەنها ڕووبەڕووی سەرکردەکانی قوڕەیش وبیرباوەڕیان دەبووەوە و، ئەوانیش بەردەوام ئازاریان دەدا تا کارگەیشتە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوعایان لێ بکات.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی قوڕەیشی دەکرد هەموویان بەدرۆیان خستەوە و باوەڕیان پێ نەدەهێنا و دوژمنانە وە ناهەموارانە دەوەستان بەرامبەری، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهُمَّ أَعِنِّي عليهم بسَبْعٍ كسَبْعِ يُوسُفَ)) واتە: خوای گەورە یارمەتیم بدە و تووشی گرانیەکیان بکە وەك گرانی یەکەی یوسف ﷺ دەفەرموێت: گرانی یەکیان تووش بوو هیچ شتێکیان بە دەستەوە نەما تا کەوتنە ئێسك خواردن هەتا وایان لێ هات پیاوێکیان لێ هەڵدەستا دیمەنی ئاسمانی وەك دووکەڵ دەهاتە پێش چاو لە تاو هیلاکی و برسێتی هەتا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ (الدخان). واتە: ئەی پێغەمبەر ! چاوەڕوان بە بزانە ئەم بێباوەڕان چیان بەسەر دێت، ئەو رۆژەی ئاسمان بەدوکەڵێکی رون و ئاشکرا دێت! ﴿١٠﴾ کە هەموو خەڵکی و پێیان دەوترێت: ئەمە سزایەکی بە ئێش و ژانە.

دەفەرموێت: دوا بە دوای ئەوە ئەبو سوفیان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی موحەمەد خزمانت لە ناو چوون داوا لە خوا بکە ئەوەمان بەسەرەوە لابەرێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾(الدخان) واتە: ئەگەر

---

(١٦٨) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٨٦/٣)، والترمذي (السنن) (٢٤٧٢)، وابن ماجه (السنن) (١٥١)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٤٦٤/١١)، وأبو يعلى (المسند) (٣٤٢٣)، وأبو نعيم في (الحلية) (١٥٠/١)، وابن حبان (الصحيح) (٦٥٦٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٢٢) وفي (صحيح الجامع الصغير) (٥٠٠١) وفي (مشكاة المصابيح) (٥٢٥٣) وفي (صحيح الترمذي) (٢٠٢١) وفي (مختصر الشمائل) (١١٥)، وصححه الشيخ مقبل الوادعي في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين (٨٠).

ئێمە ئەو سزای گرانی یە یان بەسەرە وە لاببەین هەر دەگەڕێنەوە سەر کاری یەکەم جاریان، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردن و بارانیان بۆ باری، و خوای گەورە ئەو برسێتی و قات و قڕییەی لەسەر لابردن وە ئەو ئایەتەی دوایی بۆ دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا الْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَائِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾(الدخان) دەفەرموێت: کاتێ کە خۆشگوزەرانیان هاتەوە ناو چوونەوە سەر هەمان ڕەفتارو کردەوەی پێشوویان ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الدخان)[١٦٩]. واتە: تۆڵەی هەرە سەخت و گەورەیان ئەو تۆڵەیەیە کە لە شەڕی بەدردا چاوەڕێیان دەکات.

## ئازاردانی موسوڵمانە چەوساوەکانی شاری مەککە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (بێباوەڕەکان بە پەلاماردانی پێغەمبەرەوە ﷺ نەوەستان بەڵکو هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ کەوتنە بەر شاڵاوی ئازاردان و پەلاماردان، هەموو هۆزێك ئەو هاوەڵانەی کە لە ناویاندا بوون بەندیان دەکردن و برسی و تینوویان دەکردن، وە لەگەرمایی خۆردا دەیان بردن بۆ سەر بەردە گەرمەکانی ئەو بەری شاری مەککە و ڕایان دەگرتن بۆ ئەوەی دووربکەونەوە لە ئاینی خواو بگەڕێنەوە سەر ئاینی باو باپیرانیان......)[١٧٠].

قورەیش لەم ئاستەشدا نەدەوەستان بەڵکو دوژمنکاری خۆیان زۆر توند ئاراستەی ئەو موسوڵمانانە دەکرد کە هیچ کەس و هۆزێك لە پشتیانەوە نەبوو.

لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەس ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند حەوت کەس بوون: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عەممار دایکی عەممار کە ناوی سومەیە بوو سوهەیب و بیلال و مقداد پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە بە هۆی مامی یەوە ئەبو طالیب پشت و پەنای بۆ دابین کردبوو، ئەوان نەیان دەتوانی زۆرشت بکەن بەرامبەری، ئەبوبەکریش کەسان و خزمانی لە پشت بوو بەڵام ئەوانی تر بێ باوەڕەکان دەیانگرتن و پارچە ئاسنیان بە بەردا دەکردن و دەیانخستنە بەر خۆر و ڕایان دەگرتن و دەکوڵان هەتا دەیان بڕوکاندن لە گەرمادا، (تا ناچارانە وایان لێ

(١٦٩) أخرجه: أحمد (٤٤١/١)، والبخاري (٤٨٢١،٤٨٢٤) واللفظ له، ومسلم(٢٧٩٨)، والترمذي (٣٢٥٤)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٢٧/٢)، وابن حبان (٤٧٦٤).

(١٧٠) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٤١/١).

دەکردن هەندێك داواکاریان جێبەجێ بکەن) تەنها بیلال نەبێت بە هیچ جۆرێك بە گوێی نەدەکردن، جەستەی خۆی بەلاوە هیچ نەبوو لە پێناوی خوادا، موشریکەکان زۆر بە سووکیان دەزانی و دەیانگرت و دەیاندایە دەست منداڵان، ئەوانیش ڕایان دەکێشا بەناو شیو و دۆڵەکانی شاری مەککەدا بیلالیش بەردەوام دەیفەرموو: (أحـــد أحـــد))[١٧١].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئومەیەی کوڕی خەلەف خاوەنی بیلال کاتێ خۆر تینی دەسەند لە دوای نیوەڕۆدا بیلالی دەهێنا، و جلەکانی دادەکەند لەبەری و دەیخستە بەر تینی گەرما، ئینجا فەرمانی دەکرد بەردێکی زۆر گەورەی بۆ ئامادە بکرێت و بیخەنە سەر سکی، و پێی دەوت: دەبێت تا ئەو کاتەی دەمرێت ئاوابێت یان ئەوەتا بێ باوەڕ دەبیت بە موحەمەد و دەگەڕێیتەوە سەر ئاینی باو و باپیرانت بۆ پەرستنی لات و عوزا. بیلال لە ژێر ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەدا هەر دەی وت: (أحد أحد))[١٧٢]. تاخوای گەورە هەلی بۆ ڕەخساند و ئەبوبەکری نارد و ڕزگاری کرد لەو سزایە.

لە قەیسی کوڕی حازمەوە ﷺ دەفەرموێت: (ئەبوبەکر بیلالی کڕی بە پێنج ئۆقیە لە کاتێکدا کە هەموو گیانی داپۆشرابوو بە بەرد لەبەر گەرمای خۆری بیابان ئەوان بە گاڵتە جاڕییەوە بە ئەبوبەکر ﷺ یان دەوت: وەڵاهی ئۆقیەیەکیشت بە ئێمە بدایە هەرپێمان دەفرۆشتیت، ئەبوبەکریش دەیفەرمووی: وەڵڵاهی داوای سەد ئۆقیەشتان بکردایە هەر لێم دەکڕین)[١٧٣].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێك گەرما دادەهات بەنومخزوم (عەممارو یاسری باوکی و سومەیەی دایکی کە خێزانێکی هەژار و موسوڵمان بوون) دەیان

(١٧١) أخرجه: أحمد في (المسند) (٤٠٤/١) وفي (فضائل الصحابة) (١٩١) وقال محققه: إسناده حسن، وابن أبي شيبة (١٤٩/١٢)، وابن ماجه (١٥٠)، وأبو نعيم في الحلية (٤٩/١)، والحاكم (٢٨٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٨١/٢)، وابن حبان (٧٠٨٣) وقال محققه: إسناده حسن، وصحح إسناده الذهبي في (سير إعلام النبلاء) (٣٤٨/١)، وصححه الحافظ في (الإصابة) (٢٨٥)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٢٢)، (صحيح السيرة) (ص:١٥٥)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين (٨٦٣).

(١٧٢) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٤١/١).

(١٧٣) أخرجه: أبو نعيم في (حلية الأولياء) (١٥٠/١)، وابن أبي شيبة (٨٢٧٥)، وعبدالرزاق (٢٠٤١٢)، وقال الحافظ في (الفتح) (٩٩/٧) رواه ابن أبي شيبة بإسناد صحيح.

هێنان و سزایان دەدان، وە پێغەمبەریش ﷺ تێدەپەڕی بەلایانداو دەیفەرموو: ((اصبِروا آل ياسرٍ؛ فإنَّ موعدَكم الجنَّةُ)) واتە: ئارامگربن بنەماڵەی یاسر شوێنی بەیەك گەیشتنەوەتان لە بەهەشت دایە)[١٧٤].

لە ڕیوایەتێکی تردا جابر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تێدەپەڕی بە لای عەماری کوڕی یاسر و خێزانەکەیدا کاتێك کە ئەشکەنجە دەدران لە پێناوی خوادا، و بەوانی دەفەرموو: ((أبشِروا آل ياسرٍ موعِدُكم الجنَّةُ))[١٧٥]. واتە: مژدە بێت بنەماڵەی یاسر بەیەك گەشتنەوەتان لە بەهەشتدایە)، ئەوە بوو لەژێر ئەو ئەشکەنجەدانەدا سومەیەی دایکی عەمار شەهید بوو، بووە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا، وەکو موجاهد دەفەرموێت: (یەکەم شەهید لە ئیسلامدا سومەیە بوو دایکی عەمار، کە ئافرەتێکی پیری بە ساڵا چوو بوو)[١٧٦].

هەروەها ئیمامی موجاهید ﷺ دەفەرموێت: (سومەیە بەدەستی ئەبوجەهل کوژرا، حەربەیەکی کرد بە سکیدا و شەهید بوو)[١٧٧]، هەر سەبارەت بە ئەشکەنجەدانی عەمار ﷺ ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿.... إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ .... ﴿١٠٦﴾﴾ (النحل) ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە سەبارەت بە عەماری کوڕی یاسر دابەزی کاتێك کە موشریکەکان ئەشکەنجەیاندا تا ناچاریان کرد وشەی کوفر بەسەر زمانیدا بێت، ئینجا ڕزگاری بوو وە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وعوزری بۆ هێنایەوە و خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: واتە: (هەر کەسێك پاش بڕوا هێنانی بەخوا، کافرو بێ باوەڕ بێتەوە، بێگومان سزای توند دەدرێ و، دەکەوێتە بەر تووڕەیی خواوە مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێ و، لەوکاتەیشدا دڵنیابێ بەئیمان)[١٧٨].

(١٧٤) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٤٣/١).

(١٧٥) أخرجه: الطبراني في (الأوسط) (١٥٣١)، والحاكم (المستدرك) (٣٨٨/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٢٥٩٤)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٨٢/٢) وفي (الحلية) (١٤٠/١)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٢٠٧): حديث حسن صحيح.

(١٧٦) أخرجه: ابن سعد في (الطبقات) بسندٍ صحيح (٢٠٠/١)، و صحح إسناده الحافظ في (الإصابة) (٣٣٥/٤) (٥٨٥).

(١٧٧) أخرجه: البيهقي في (الدلائل) (٢٨٤/٢)، وقال الحافظ في (الإصابة) (٣٣٥/٤): أخرجه ابن أبي شيبة بإسناد صحيح مرسل.

(١٧٨) أخرجه: ابن جرير (١١٣/١٢)، وابن سعد (١٧٨/٣)، والحاكم (٣٥٧/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و البيهقي في (الكبرى) (٢٠٨/٨)، وقال الحافظ في: (الفتح) (٣٨٦/١٢)، أخرجه عبد بن حميد والبيهقي بإسناد مرسل

لەوانەی کە ئەشکەنجە دەدران لە پێناوی خوادا: زوبەیری کوڕی عوام بوو، ئەبو ئەسوەد ﷺ دەفەرموێت: (زوبەیر کاتێك موسوڵمان بوو تەمەنی هەشت ساڵان بوو وە مامێکی هەبوو زوبەیری دەهێنا و دەیپێچایەوە لەحەسیرێکەوە و هەڵی دەواسی ولە ژێریەوە ئاگرێکی دەکردەوە بۆ ئەوەی دوکەڵەکە بچێت بە ناو حەسیرە لوول کراوەکە و بەسەر زوبەیردا، و پێی دەوت: بگەڕێرەوە بۆ سەر ئاینی باو و باپیرت ئەویش دەیوت: هەرگیز ناگەڕێمەوە سەر کوفر)[١٧٩]. هەروەها خەباب ﷺ بێ باوەڕانی قوڕەیش سزایان دەدا و شوێنەواری ئەو سزایە بەپشتیەوە دیاربوو تا کاتێ وەفاتی کرد.

ئەبو لەیلای کەنەدی دەفەرموێت: (خەباب ﷺ هات بۆ لای ئیمامی عومەر، ئیمامی عومەر پێی وت: لێم نزیك بەرەوە هیچ کەسێك هەیە شایستە تر بێت، کوڕێکی ئاوها تەنها تۆ نەبێت؟ دەفەرموێت خەباب دوای ئەوە لێی نزیك بووە وە شوێنی ئەشکەنجەدانەکەی قوڕەیشی نیشانی ئیمامی عومەردا)[١٨٠].

هەروەها خەباب ﷺ مرۆڤێکی بێگانەو بێ دەسەڵات بوو، پیشەی ئاسنگەری بوو، جارێکیان شمشێرێکی دروست کرد بۆ عاصی کوڕی وائیل، کاتێك چوو بۆ لای بۆ ئەوەی پارەکەی لێ وەربگرێت، عاص پارەکەی نەدایەو گاڵتە جاڕی پێ کرد، خەباب ﷺ خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: من ئاسنگەر بووم لە مەککەدا، شمشێرێکم دروست کرد بۆ عاص، ((لە ڕیوایەتێکی تردا (هەندێ قەرزم لای هەبوو وە کاتی ئەوە هات کە قەرزەکەی لێ وەرگرمەوە چووم و داوام کرد) ئەویش وتی: نەخێر بە هیچ جۆرێك قەرزەکەت نادەمەوە تا بێباوەڕ نەبیت بە موحەمەد؟ منیش وتم: نەخێر وەڵلاهی هەرگیز بێباوەڕ نابم بە موحەمەد تا خوای گەورە تۆ دەمرێنێت، پاشان زیندووت دەکاتەوە، ئەویش وتی: بۆ چی من بمرم زیندوو دەبمەوە؟! وتم: بەڵێ، ئەویش وتی: لێم گەڕێ و وازم لێ بێنە تا دەمرم پاشان زیندو دەبمەوە ئەگەر زیندوو ببمەوە لەوێش ماڵ و سامانم دەبێت لەوێ قەرزەکەت دەدەمەوە،

---

رجاله ثقات، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٨): نزول الآية في عمار بن ياسر صحيح لمجيء ذلك من طرق ساقها ابن جرير.

(١٧٩) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٢٣٩)، وأبو نعيم في (الحلية) (٨٩/١)، والحاكم (المستدرك) (٣٦٠/٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٥١/٩)، و رواه الطبراني ورجاله ثقات الا أنه مرسل.

(١٨٠) أخرجه: ابن ماجه (السنن) (١٥٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٢٤).

خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴾(مریم)[١٨١]، واتە: (ئایا ئەو کەسانەت دیت کەئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان دەکرد وتیشی: بێگومانم کە لەدوارۆژیشدا من ماڵ و سامان و منداڵێکی زۆرم دەدرێتێ؟! ئاخۆ ئەو بەندە لاسارەیە لەکارە نادیارو نهێنییەکانی خوا بەئاگا و زانایە، یان لەلای خوای بەخشندەوە بەڵێن و پەیمانێکی وەرگرتووە، وا بەخۆڕایی ئەو قسانە دەکا و بەتەمای خێر وخۆشیی ئەو لایە؟!!). خوای گەورە ئەو گاڵتە جاڕیەی عاصی بە ڕوودا دانەوە و مژدەی ئەوەی پێدا کە سزایەکی یەکجار سەختی بۆ ئامادە کردووە لە ڕۆژی کۆتاییدا...

هەروەها لەوانەی کە سزا درا بوون لە پێناوی خوادا: (جارییەك بوو ناوی زنیرە بوو ئەشکەنجە درا بوو تا کوێر بوو، وە بە هیچ جۆرێك پاشگەز نەبووەوە لە ئیسلام، بێ باوەڕەکان وتیان: لات و عوزا چاویان کوێر کردووە چونکە باوەڕی پێ یان نەبوو، زەنیرەش دەیوت: نەخێر وەڵڵاهی هەرگیز وا نیە، تاکو خوای گەورە شیفایدا و هەردوو چاوی چاك کردەوە)[١٨٢].

وە لەو بەندانەی کە ئەبوبەکر ﷺ کڕییەوە و ئازادی کردن لە پێناوی خوادا حەوت کەس بوون، عورِوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (لەوانەی کە ئەشکەنجە درابوون لە پێناوی خوادا حەوت کەس بوون کە هەموویان ئەبو بەکر ئازادی کردن: عامری کوڕی فوهەیرە، بیلال، زنیرە، ئوم عەبیس، و نوهدیەو خوشکەکەی، وجاریەکەی بەنی عەمری کوڕی موئەمەل)[١٨٣].

ئەوانەی کە ئەبوبەکر ئازادی دەکردن لە پێناوی خوادا هەموویان کەسانێکی

(١٨١) أخرجه: أحمد (المسند) (١١١/٥)، والبخاري (الصحيح) (٢٤٢٥) (٤٧٣٥،٤٧٣٢) واللفظ له، ومسلم (الصحيح) (٢٧٩٥)، والترمذي (السنن) (٣١٦٢)، وابن حبان (الصحيح) (٤٨٨٦) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٢٩).

(١٨٢) أخرجه:البيهقي في (دلائل النبوة) (٢٨٣/٢)، وابن حجر العسقلاني الإصابة) (٣١١/٤)، و(الإستعاب) (٣٢٢/٤)، و(الحلية) (١٤٧/١)، و(السيرة الحلبية) (٤٨٢/١)، و(عيون الأثر) (١١٤/١).

(١٨٣) أخرجه: ابن أبي شيبة (المصنف) (١٠/١٢)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٣٣٨٦/١) (١٠٠٨)، والحاكم (المستدرك) (٢٨٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٥٠/٩): رواه الطبراني ورجاله إلى عروة رجال الصحيح.

چەوساوەی بێ دەسەڵات بوون، بۆیە ئەبوبەکر کاتێ باوکی پێی زانی، داوای لێ کرد کەسانێکی چوارشانەی کەڵەگەت و بەتوانا ئازاد بکات، بۆ ئەوەی پشت و پەنات بێت بۆ دوارۆژ.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ؓ دەفەرموێت: (ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکر بە ئەبوبەکری وت: من دەبینم تۆ کەسانێك ڕزگار دەکەیت کە زۆر لاوازو بێ دەسەڵاتن ئەگەر هەروا دەکەیت پیاوانێکی گەورە و بەتوانا و بەهێز ئازاد بکە، بۆ ئەوەی سبەینێ بەرگریت لێ بکەن و لەسەرت بکەنەوە، ئەبو بەکریش لە وەڵامدا وتی: باوکە خۆم دەزانم بۆچی ئازادیان دەکەم.... سەبارەت بە ئەبوبەکر ؓ خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ ﴾(اللیل)[١٨٤]
واتە: ئینجا ئەوەی ماڵ و سامانی خۆی لە بەر خوا بەخشیی و لە نافەرمانی خوا خۆی پاراست و بڕوای بە پاداشتی چاکتر کرد. لەم ئایەتەدا خوای گەورە مژدەیدا بە ئەبوبەکر کە خوای گەورە ڕازی دەکات وە خوای گەورەش لێی ڕازی یە. ئەوە بوو دوای ئەشکەنجەو ئازاردانێکی زۆر توند لەلایەن بێ باوەڕانەوە بۆ موسوڵمانانی چەوساوەی ناو شاری مەککە، هەندێ لەو موسوڵمانانە بۆ شکات کردنی حاڵی خۆیان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تا دوعایان بۆ بکات وخوای گەورە ڕزگاریان بکات وە بێ باوەڕەکان لەناو ببات...

خەباب ؓ دەفەرموێت: (چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بینیمان بوردەیەکی ڕاخستبوو لە ژێر سێبەری دیواری کەعبەدا پاڵ کەوتبوو، چووین تا شکاتی حاڵی خۆمان بکەین کە بێ باوەڕەکان زۆر ئازاریان داوین، چووینە خزمەتی و پێمان وت: ئەوە بۆ داواناکەیت لە خوای گەورە سەرمان بخات، پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو دەم و چاوی سوربوو وە لەو قسەیە توڕەبوو فەرمووی: ((قدْ كانَ مَن قَبْلَكُمْ، يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فيُحْفَرُ له في الأرْضِ، فيُجْعَلُ فيها، فيُجاءُ بالمِنْشارِ فيُوضَعُ علَى رَأْسِهِ فيُجْعَلُ نِصْفَيْنِ، ويُمْشَطُ بأَمْشاطِ الحَدِيدِ، ما دُونَ لَحْمِهِ وعَظْمِهِ، فَما يَصُدُّهُ ذلكَ عن دِينِهِ، واللَّهِ لَيَتِمَّنَّ هذا الأمْرُ، حتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِن صَنْعاءَ إلى حَضْرَمَوْتَ، لا يَخافُ إلَّا اللَّهَ، والذِّئْبَ علَى غَنَمِهِ، ولَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ))[١٨٥]. واتە:

(١٨٤) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٥٢٥/٢) وصححه على شرط مسلم و سكت عنهالذهبي، وحسن إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٥٦/١).

(١٨٥) أخرجه: أحمد (المسند) (١٠٩/٥) (١١١)، والبخاري (الصحيح) (٣٨٥٢،٦٩٤٣) واللفظ له، والحميدي (المسند)

لە پێش ئێوەدا خاوەن باوەڕانیان دەگرت و چاڵیان بۆ هەڵدەکەندن وە دەیانخستنە ناوی، ئینجا مشاریان دەهێنا لەسەر تەوقی سەری ڕایان دەگرت و لە ناوەڕاستدا دەیانکرد بە دوو کەرتەوە، وە شانەی ئاسنیان دەهێنا کە گۆشت و ئێسقانی تێکەڵ بکات ئەوانە هیچ وای لێ نەکردن لە ئاینەکەیان پاشگەز ببنەوە، وەڵلاهی خوای گەورە ئاینی خۆی تەواو دەکات و ئاینی خۆی سەر دەخات تاسوار لە سەنعاوە بەرەو حضرموت دەکەوێتەڕێ تەنها لە خوا نەبێ لە کەس ناترسێت، مەگەر لە گورگ بەرامبەر مەڕەکانی بەڵام ئێوە پەلە دەکەن......).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بینیم پاڵی دابووە وە لەژێر سێبەری دارێکدا وە دەستی خستبووە ژێر سەری وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ داوا ناکەیت لە خوای گەورە دژ بەو کەسانەی کە وایان لێکردین کە نزیکە پەشیمانمان بکەنەوە لە ئاینەکەمان و ئازارمان دەدەن تا خوا لە ناویان ببات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أيُّها النَّاسُ اتَّقوا اللهَ فواللهِ إنْ كان الرَّجُلُ مِن المُؤمِنينَ قبْلَكم لَيُوضَعُ المِنشارُ على رأسِه فيُشَقُّ باثنَيْنِ ما يرتَدُّ عن دِينِه اتَّقوا اللهَ فإنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ فاتِحٌ لكم وصانِعٌ))[١٨٦]. واتە: خەڵکینە لە خوا بترسن و ئارام بگرن وەڵاهی پیاوی باوەڕدار دەهێنرا لە پێش ئێوەدا و مشار دەخرایە سەر تەوقی سەری و دەکرا بە دووکەرتەوە بەڵام پاشگەز نەدەبووەوە لە ئاینەکەی، لەخوا بترسن خوای گەورە دەرووتان لێ دەکاتەوە و دەیهێنێتەدی)، پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری هاوەڵەکانی کرد کە دان بە خۆیاندا بگرن و ئارامبن وە پشت هەڵکەن لە بێ باوەڕان و بە هیچ جۆرێك ڕووبەڕوویان نەوەستنەوە، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (عەبدولڕەحمان و هاوەڵەکانی گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێیان ڕاگەیاند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە کاتێ بێ باوەڕبووین زۆر باڵادەست و سەربەرزبووین، بەڵام ئێستا کە موسوڵمان بووین زەلیل بووین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنِّي أُمِرتُ بالعفوِ فلا تُقاتِلوا القومَ))[١٨٧] واتە: من

(١٥٧)، والنسائي (السنن) (٢٠٤/٨)، وأبو داود (السنن) (٢٦٤٩)، وأبو يعلى (المسند) (٣٣٧/١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٣٦٣٨)، والحاكم (المستدرك) (٣٨٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٩٨٧) وقال محققه: حديث صحيح، و ابو نعيم في (الحلية) (١٤٤/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (٤٩١٣) وفي (صحيح أبي داود) (٢٣٠٧).

(١٨٦) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٣٨٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٨٧) أخرجه:النسائي في (السنن) (٣/٦) وفي (التفسير رقم) (١٣٢) وقال محققه: إسناده صحيح، والحاكم وفي (٦٦/٢)

فەرمانم پێکراوە کە لێیان ببورم و ئێوەش بەشەڕ نەیەن لەگەڵیاندا). بەم جۆرە موسوڵمانان بەشەڕ نەدەهاتن لەگەڵیاندا، بەڵام هەرچییەك لە توانایاندا بووایە پارێزگاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد وەك کوڕە پوورەکەی پێغەمبەر ﷺ زوبەێری کوڕی عەوام کە منداڵ بوو بەر گوێی کەوت کە پێغەمبەر ﷺ گیراوە ئەو دەستی دایە شمشێرو بەرەو ئەو جێگایە ڕۆیشت.

عوروە ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (یەکەم کەس کە شمشێری لە کێلان دەرهێنا لە پێناوی خوادا زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ بوو (واتە: باوکی) دەفەرموێت: هاوارێك لە شەیتان پەیدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ گیراوە ئەم هەواڵەش بەرگوێی زوبەیر کەوت کە ئەو کات کوڕێکی پانزە ساڵان بوو، ڕۆیشت شمشێرەکەی دەرکرد لە کێلان و بەڕیزی خەڵکاندا ڕای کرد تا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ لەوسەری شاری مەککە کە گەیشتە بەردەمی، پێغەمبەر ﷺ زوبەیری بینی شمشێرێکی بە دەستیەوەیەتی بە پەرۆشەوە فەرمووی: (چیتە زوبەیر؟)، زوبەیریش وتی: هەواڵم وا پێگەیشتووە و وام بەر گوێ کەوتووە کە تۆ گیراوی ویستومە بەم شمشێرە بدەم لەوکەسەی کە تۆی گرتووە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد...... لەڕیوایەتێکی تردا: [دوعای بۆ خۆی وشمشێرەکەی کرد.......][١٨٨].

بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان سەرەڕای ئەشکەنجەدان وئازاردان و ئابڕوبردن ولەکەدارکردن وە هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی تر، هەر بەرامبەر هاوبەش پەیداکەرانی قوڕەیش وەستانەوە لەکاتێکدا کەخەڵکی لەوپەڕی نەفامی ونەزانیدا بوون بە پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەرایەتی بۆیە هاوەڵانی تووشی ئەو هەموو ناڕەحەتییە بوون لەگەڵ خودی پێغەمبەردا ﷺ بەشێوەیەك تەنها دڵسۆزان و ڕاستگۆیان بتوانن خۆیان بگرن کەم کەس لەتوانایدا هەیە خۆی بۆ بگرێت.

---

و(٣٠٧/٢) صححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (السنن الكبرى) (١١/٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٢٨٩١) (٦٤٦/٢).

(١٨٨) أخرجه:عبدالرزاق (المصنف) (١٤١/١١) (٢٠٤٢٩)، وأحمد في (الفضائل) (١٢٦٦) وقال محققه: مرسل صحيح، والطبراني في (المعجم الكبير) (٢٣٦)، أبو نعيم و(الحلية) (٨٩/١)، والحاكم (المستدرك) (٣٦٠/٣)، والإصابة (٢٧٨٩)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٥٠/٩): رواه الطبراني ورجاله ثقات، و صحح إسناده عند أبي نعيم وعكاشة عبدالمنان في (هؤلاء في الجنة) (ص:١٣٥)، ابن أبي شيبة (١٥٠/٧)، وقال محقق: (سير السلف الصالحين) (٢٢٤/١): إسناده صحيح على شرط البخاري.

سەبارەت بە بارودۆخی شاری مەککە ئەوکاتەی کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا نێردراوە، زۆر بەوردی هاوەڵی پایە بەرز میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ بۆمان وەسف دەکات وە باسەکەش جوبەیری کوڕی نوفەیر لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ڕۆژێکیان لەخزمەت میقداددا دانیشتبووین، پیاوێك بەلایدا تێ پەڕی و بەمیقدادی وت: خۆزگەم بەم دوو چاوەی کە پێغەمبەری ﷺ پێ بینراوە، خۆزگە ئەوەی تۆ بینیوتە ئێمەش بمان بینیایە ، ئەوەی کە تۆ ئامادەی بوویت ئێمەش ئامادەی ببوینایە؟ میقداد لێی تورە بوو، منیش بەلامەوە زۆر سەیر بوو پیاوێك کە تەنها وتەی خێر نەبێت نەی گوتووە.

پاشان میقداد ڕووی کردە کابراکە و ڕای وەستاند و پێی فەرموو: چی وا دەکات یەکێك لە ئێوە ئاوات بخوازێت بە ئامادەبوونێك خوا لێی شاردۆتەوە، نازانێ گەر ئامادەبووایە حاڵی چۆن دەبوو تیایدا، وەڵڵاهی کەسانێك ئامادەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوون، خوا بەسەر لووتیاندا خستنیە ناو دۆزەخەوە لەبەرئەوەی پێغەمبەریان ﷺ بەدرۆ زانی و باوەڕیان پێ نەهێنا، بۆ سوپاسی خوا ناکەن کاتێ خوای گەورە ئێوەی دروست کردووە، تەنها خوای خۆتان نەبێ نایناسن وەتەنها پێغەمبەری خۆتان نەبێ بەڕاستی نازانن، خوای گەورە ئەو بەڵایەی لەسەر ئێوە لابردووە و داویەتی بەسەر کەسانێکی پێش ئێوەدا و لە ئێوەی دوور خستۆتەوە، وەڵڵاهی کاتێ پێغەمبەر ﷺ نێردرا ناهەموارترین و سەخت ترین کات وحاڵێك بوو کەپێغەمبەرێك لەپێغەمبەرانی خوای گەورە تیا نێردرا بێت، وە لەکاتێکی زۆر نەفامیدا بوو کەوایان دەزانی هیچ ئاینێك چاکتر نییە لەپەرستنی بتەکان.

پێغەمبەریش ﷺ پەیامێکی هێنا یەکلاکەرەوە بوو کە ڕاست وناڕاستی پێ یەکلاکردەوە تاوای لێ هات باوك و کوڕ دژایەتی کەوتە نێوانیان، هەتا پیاوی واهەبوو کوڕکەی یان باوکەکەی یان براکەی دەبینی بێ باوەڕە دوای ئەوەی کەخوا خۆی ڕێنمویی کردبوو وە دڵنیابووی لەوەی ئەگەر ئەو باوك وبرایەی بەو شێوەیە بڕۆن دەکەونە ناو دۆزەخەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی ناخۆش بوو کە ئەو خۆشەویستانەی خۆی خوای گەورە بیان خاتە ناو دۆزەخەوە وە ئەو دوعایەیان دەکرد کەخوای گەورە بۆ ئێمەی گێڕاوەتە وە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا

هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾(الفرقان: ٧٤)[١٨٩] واتە: ئاواتیان دەخواست کە خێزان و خزمانێکیان هەبێت وەك نوری چاو خۆشەویست و موسوڵمان بن و خوای گەورە ڕێنموونیان بکات....).

## ئیبنو مەسعود بۆ یەکەم جار قورئان بەئاشکرا دەدات بەگوێی بێ باوەڕەکاندا

هاوەڵی پایە بەرز عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ هەستا بەم کارە گران و قورسە... عورِوە دەگێڕێتەوە لە باوکی یەوە و دەفەرموێت: (یەکەم کەس کە بە ئاشکرا قورئانی خوێند دوای پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککەدا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بوو، ڕۆژێکیان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ناوخۆیاندا وتیان: وەڵڵاهی هەتا ئێستا قورەیش گوێی لەو قورئانە نەبووە کە بە ئاشکرا بەڕوویاندا بخوێنرێت، بۆ یەکێ لە ئێوە بە ئاشکرا ناچێت بەڕوویاندا بیخوێنێت؟ عەبدوڵلا وتی: من دەچم، ئەوانیش وتیان: دەترسین کە تووشی ئازار ببیت، ئێمە پیاوێکمان دەوێت عەشیرەتێکی لە پشت بێت و بەرگری لێ بکات لە ستەم و چەوسانەوە و دژایەتی ئەوان، ئیبنو مەسعود ﷺ وتی: وازم لێ بێنن خوای گەورە پشت و پەنامە، زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: لەکاتی چێشتەنگاو عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ ڕۆیشت، تاگەیشتە مەقامی ئیبراهیم وە قورەیشیش لە جێگەی دانیشتنەکانی خۆیاندا بوون لە نزیك کەعبەوە، ئیبنو مەسعودیش هاتو لای مەقامی ئیبراهیم وەستا.

ئینجا: (بسم الله الرحمن الرحيم)ی کرد و بە دەنگی بەرز ڕووی تێکردن و سورەتی ڕەحمانی بۆ خوێندن، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ ﴾ (الرحمن) ئەوانیش ووردبوونەوە لێی وتیان: ئەوە کوڕەکەی ئیبنو ئوم عەبد نییە ئەوە باسی چی دەکات؟ هەندێکیان وتیان: ئەوە هەندێ لەوانەی کە بۆ موحەممەد هاتووە دەیخوێنێتەوە، ئەوانیش هەستان بۆی و تاکو توانیان لە دەم و چاو ڕوویاندا، ئەویش هەر قورئانی دەخوێند تا گەیشتە ئەو جێگەیەی کە خوای گەورە ویستی لێبوو خوێندنەکە پێی بگات، ئینجا دوای ئەوە لێی دوورکەوتنەوە و ئەویش گەڕایەوە بۆ ناو هاوەڵانی و هەموو

---

(١٨٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٢/٦)، والبخاري في (الأدب المفرد) (٨٧)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٢٥٣،٢٠، ٦٠٠)، و ابو نعيم في(الحلية) (١٥٧/١)، وابن حبان (٦٥٥٢) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وقال ابن كثير في (التفسير) (٣٤٢/٣): رواه أحمد و إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٨٢٣) وفي (صحيح الأدب المفرد) (٦٤)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (١١٥٦).

دەم و چاوی خەڵتانی خوێن بوو بوو ئەوان پێیان وت: ئێمە ترساین کە تووشی ئەمە ببیت، ئەویش وتی: وەڵڵاهی دوژمنانی ئاینی خوا ئێستاش لای من سووك و ڕیسواترن ئەگەر پێشتان خۆشە بەیانی دەچمە وە بۆ گیانیان و قورئانیان بەسەردا دەخوێنم وتیان: ئەوەندە بەسە کە تۆ بە ڕوویاندا خوێندووتەتەوە)(١٩٠).

## زۆران گرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ڕوکانە

ڕوکانە یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی شاری مەککە کە زۆرانی لەگەڵ هەر کەس بگرتایە دەیدا بەزەویدا، جارێکیان بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت و داوای لێ کرد کە زۆرانی لەگەڵدا بگرێت، وە زۆرانیان گرت، و پێغەمبەر ﷺ دای بە زەویدا.

سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە بەطحاء بوو لە مەککە، ڕوکانە بەلایدا تێپەڕی هەندێ مەڕی پێ بوو وتی: ئەی موحەممەد بۆ نایەیت زۆرانم لەگەڵدا بگریت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیم بۆ دادەنێیت؟ وتی: مەڕێك، پێغەمبەر ﷺ زۆرانی لەگەڵ داگرت و دای بە زەویدا، دوای ئەوە ڕوکانە وتی: باجارێکی تر زۆران بگرین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیم بۆ دادەنێیت؟ وتی: مەڕێکی تر، چەند جار بەم شێوە پێغەمبەر ﷺ زۆرانی لەگەڵدا گرت و دەیدا بەزەویدا، دوایی وتی: وەڵڵاهی ئەی موحەممەد هەتا ئێستا کەس منی نەداوە بەزەویدا، دیارە تۆ پێغەمبەری خوایت ئینجا موسوڵمان بوو پێغەمبەریش ﷺ مەڕەکانی بۆ گێڕایەوە....)(١٩١).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیبنو عەباس ﷺ دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ڕوکانە زۆرانی گرت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ سێ جار هەر جارێك لەسەر مەڕێك دوایی شکستی هێنا، وتی: ئەی موحەممەد تا ئێستا کەس پشتی منی نەداوە لەزەوی تائێستا کەس نەبووە ڕقم لێی بێت بەوێنەی تۆ، بەڵام ئێستا شاهیدی دەدەم کە خوا تاك و تەنهایە وە تۆش پێغەمبەری خوایت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ مەڕەکانی بۆ گێڕایەوە و ڕۆیشت)(١٩٢).

---

(١٩٠) أنظر: سيرة ابن هشام (السيرة) (٣٣٩/١) رقم (٢١٧) وقال محققاه: إسناده صحيح، والطبري في (التأريخ) (٣٣٤/٢)، و(الإصابة) ابن حجر العسقلاني (١٩٩/٤)، وله شاهد عند الطبراني في (المعجم الكبير) (٨٩٦١).

(١٩١) أخرجه:أبو داود في (المراسيل) (ص:١١٢)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (١٨/١٠) (٢٠٣١٨،٢٠٣١٩) وقال: وهو مرسل جيد، وحسنه الشيخ الألباني في (الإرواء) (٣٢٩/٥) (١٥٠٣) من طريق أبي داود، وقال مرسل صحيح.

(١٩٢) رواه: أبوبكر الشافعي بإسناد جيد كما قال الحافظ ابن كثير في (البداية) (١٠٤/٣).

## ناشیرین کردن و شکاندنی بتەکانی قوڕەیش

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ دەرفەتێکیان بۆ هەڵکەوتایە و بیان توانیایە بتەکانیان ناشیرین دەکرد، و ئەگەر بۆشیان ڕێکەوتایە هەندێ لەوبتانەیان دەشکاند بەبێ ئاگای بێ باوەڕەکانەوە.

ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: (من و ئوسامە دەچووین بۆلای بتەکانی قوڕەیش کە لە چواردەوری کەعبە بوون دەچووین شتی پیسمان دەهێنا و شتێکمان دەگرت بەدەستمانەوە دەمان هێنا بەڕووی بتەکاندا و پیسمان دەکردن کە ڕۆژمان لێ دەبووەوە (دیارە بەشەو ئەنجامیان داوە و کەس لەو ناوە نەبوو) و بێ باوەڕەکان کە دەچوون سوجدە بەرن بۆ بتەکانیان تەماشایان دەکرد و دەیان بینی چیان لێکراوە و دەیان وت: ئەمە کێ وای لەخواکانمان کردووە، ئینجا دەچوون بە شیرو ئاو دەیان شت وپاکیان دەکردەوە و دەیان سڕییەوە....)[١٩٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ ئیمامی عەلی خستۆتە سەرشانی بۆ ئەوەی ئەو بتەی کە داکوتراوە بە قوڕقوشم بە سەر کەعبەدا فڕێی بداتە خوارەوە و پارچە پارچەی بکات. لە ئیمامی عەلییەوە ﷺ دەفەرموێت: (من و پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای کەعبە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دانیشە منیش دانیشتم و چووە سەرشانم و ویستم بەرزی بکەمەوە نەمتوانی، زانی کەنەمتوانی، ئینجا ئەو دانیشت و من چوومە سەرشانی موبارەکی و فەرمووی: سەرکەوە بۆ سەر هەردوو شانم، منیش سەرکەوتم کە بەرزی کردمەوە، وام دەزانی کە ئەگەر دەست بە ئاسمانیش بگرم دەستم دەیگاتێ تا بەرز بوومەوە بۆ سەر کەعبە، و بتێکی تیابوو کە بە قوڕقوشم یان بە مس داکوترابوو منیش بەلای ڕاست و بەلای چەپ و لای پێش و پاشی جووڵەم پێ کرد هەتا هەڵم کەند کە هەڵم کەند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فڕێی دە لەو بەرزاییە وە، منیش فڕێمدا وەك شووشە پارچە پارچە بوو، ئینجا دابەزیم من و پێغەمبەر ﷺ بەپەلە خۆمان شاردەوە و چووینە وە بەرەو ماڵ بۆ ئەوەی کەس نەمان بینێت وە لە ڕێگادا کەس پێمان نەزانێت)[١٩٤].

---

(١٩٣) أخرجه: إسحاق بن راهوية، و صحح إسناده الحافظان العسقلاني في (المطالب العالية) (٤٢٢٠)، والبوصيري في (مختصر الأتحاف) (٥١٦٨) وقال:إسناده صحيح، وصححه السيوطي كما في: (منتخب كنز العمال) (٣٤٦/٥).

(١٩٤) أخرجه:ابن أبي شيبة (المصنف) (٤٨٨/١٤)، والبزار (٧٦٩،٢٤٠١)، وأبو يعلى (المسند) (٢٩٢)، والطبري في (تهذيب

## قورەیش ناچار دەبێت کە ڕێکەوتن ئەنجام بدات لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

موشریکەکان دوای چەندین ساڵ لە دوژمنایەتی توندیان بۆ خودی پێغەمبەر ﷺ وە دوژمنایەتییەکی یەکجار گەورە بۆ هاوەڵانی بەڕێزی دوای ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازار و سوکایەتی و گاڵتە جاڕی و هەتا دوایی... بەناچارانە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد بۆ ئەوەی ڕێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجام بدات..

لەڕیوایەتێکدا کە ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە داوای لە ئەوان کرد کە ڕێگەی پێ بدەن وەکو نوێنەرێکی قورەیش بچێتە لای پێغەمبەر ﷺ تا ڕێکەوتن لەگەڵیدا ئەنجام بدات....) لەڕیوایەتێکی تردا کە جابری کوڕی عەبدوللا ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (قورەیش کۆبوونەوە سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەرێ نابینن یەکێك لە هەمووتان شارەزاتر بێت لە سیحر و فالگرەوە و شیعر تا بچێت بۆلای ئەو پیاوەی تاقم و کۆمەڵەکەی ئێمەی پارچە پارچە کردووە و دەسەڵاتی کزو لاواز کردووین و ڕەخنە لە ئاینمان دەگرێت، تاکو لەگەڵیدا بدوێت و بزانێت وتەی ئەو پیاوە چی دەبێت؟ وتیان: باشە بەڵام کەس شك نابەین بشێت بۆ ئەم کارە تەنها عوتبە نەبێت، ئینجا بە عوتبەیان وت: ئەی ئەبو وەلید تۆ نەبێت کەسی تر شك نابەین ئەم کارەی پێ بکرێت، ئەویش هەستا بەوکارە بە ڕێکەوت و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: تۆ چاکتری یان عەبدوڵلای باوکت؟ پێغەمبەریش ﷺ بێ دەنگ بوو، ئینجا وتی: تۆ چاکتری یان عەبدول موطەلیب؟ پێغەمبەر ﷺ هەر بێدەنگ بوو، ئینجا وەلید وتی: ئەگەر بڵێیت ئەوان چاکتر بوون لە تۆ ئەوە خۆت دەزانیت ئەوانیش ئەو بتانەیان پەرستووە کە تۆ ڕەخنەیان لێ دەگریت، وە ئەگەر خۆت بە چاکتر دەزانی لەوان وتەی خۆت بڵێ باگوێت لێ بگرین، بەڵام وەڵلاهی کەسێکمان نەدیوە شوومتر بێت بەرامبەر قەومەکەی وەك تۆ، پارچە پارچەت کردین و ئابڕووی ئاینەکەت بردین و لاوازت کردین و ئابڕوی ئێمەشت

---

الآثار) (ص: ٢٣٦،٢٣٨) وقال هذا خبر عندنا صحيح إسناده، وأحمد في (المسند) (رقم/٦٤٤) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف، والنسائي في (الكبرى) (٨٥٠٧) وقال محققه: ضعيف، ورواه عبدالله بن أحمد في (زيادات المسند) (١٣٠١)، والحاكم (٣٦٦/٢) وصححه وقال الذهبي إسناده نظيف و ألمتن منكر، وأورده الخطيب في (التاريخ) كما في (زوائد تأريخ بغداد) (٢٠٢٤) وقال محققه: إسناده ضعيف جيداً.

برد لەناو عەرەبدا تا دەنگ و باس بڵاوبووەوە کە لە قورەیشدا شاعیرێك هەیە سیحر باز هەیە و فاڵگرەوەیەك هەیە تا وامان لێ هاتووە هەر ئەوەندە فیژەیەك ببیستین، دەست بدەینە شمشێر تا یەکتر لەناو بەرین، ئەی پیاوەکە ئەگەر لەبەر هەژاری خۆت وادەکەیت و ئەم ئاشووبەت ناوەتەوە ئێمە هەموو سامانەکانی خۆمان کۆدەکەینەوە لای تۆ دای دەنێین تاببیت بە تاکە پیاوێکی دەوڵەمەندی قورەیش، وە ئەگەر ئافرەتت پێ خۆشە و ئەم بەزمەی لە پێناودا دەکەیت فەرموو کام ئافرەتی قورەیش خۆت بە دڵتە دەست نیشانی بکە بالێت مارە بکەین.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەواو بووی؟ وتی: بەڵێ، ئەویش ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندنەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ ﴾(فصلت) تا گەیشتە ﴿ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾(فصلت). ئینجا عوتبە وتی: بەسە ئیتر بەسە هەر ئەمەیە وەڵامەکەتە؟ فەرمووی: بەڵێ هەر ئەوەیە، ئینجا عوتبە گەڕایەوە بۆلای قورەیش وتیان: ها چی هەواڵێکت بۆ هێناوین؟ وتی: هەر شتێك کە بزانم ئێوە لە ڕوودا پێی دەڵێن منیش پێم وت: وتیان: ئەی وەڵامی دایتەوە؟ وتی: بەڵێ، سوێند بەوەی کە ئەم کەعبەیەی بە کەعبە داناوە هیچ وتەیەکی تێنەگەیشتم تەنها یەك وتەی نەبێت ئەویش ئەوەیە: ﴿ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾. وتیان: ماڵت وێران بێت کابرا ئەو بەعەرەبی لەگەڵت دەدوێت هێشتا تێی ناگەیت وتی چی؟ ئەویش وتی: نەوەڵا هیچ تێنەگەیشتم تەنها هەورە بروسکەکەی عاد و ثمود نەبێت)[١٩٥].

دوا بە دوای ئەوە قورەیش ناچاربوون دیسان لە ڕێگەی مامی یەوە گوشاری بخەنە سەر بۆ ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە شاری مەککەدا پەك بخەن....

لە عوقەیلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ﷺ دەفەرموێت: (قورەیش هاتنە لای ئەبو طالیب و پێیان وت: ئەی ئەبو طالیب برازاکەت لە کوچە و کۆڵان و شوێنە دانیشتنەکانی ئێمە وە لە مزگەوتەکەی کەعبەدا دێت بۆ لامان و بە وتەکانی ئازارمان دەدات، ڕێگری بکە باوا نەکات؟ ئەویش وتی: عوقەیل برۆ موحەمەدم بۆ

(١٩٥) أخرجه: عبد بن حميد في (المنتخب) (١١٢٣) واللفظ له، وابن أبي شيبة (المصنف) (١٨٤٠٩)، والحاكم (المستدرك) (٢٥٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٨٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٠٢/٢)، وأبو يعلى (مسند) (١٨١٨)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:١١٢): إسناده حسن.

بدۆزەرەوە و بیهێنە بۆ لام دەفەرموێت: منیش چووم لە ژوورێك لە ژوورەکانی ماڵی ئەبو طالیب موحەمەدم بانگ کرد و لەگەڵم هات لە ژێر سێبەری دیوارەکە وە بەرێکەوتین تا چووینە لای ئەبوطالیب، وە ئەبوطالیب پێی وت: ئەی برازاکەم ئەم ئامۆزایانەی خۆت پێیان ڕاگەیاندووم کە تۆ ئازاریان دەدەیت لە کوچەو کۆڵان و شوێنی دانیشتنەکانیاندا وازیان لێ بهێنە و ئازاریان مەدە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان ئینجا فەرمووی: (أترَونَ هذه الشمسَ ؟) واتە: ئایا ئەو ڕۆژە دەبینن؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((واللهِ ما أنا بأقدَرَ على أنْ أدَعَ ما بُعِثْتُ به مِن أنْ يشتعِلَ أحَدُكم مِن هذه الشَّمسِ شُعلةً مِن نارٍ)) واتە: سوێند بە خوا من ناتوانم دەست بەرداربم و وازبێنم لەم کارەم وەك چۆن ئێوە ناتوانن شاڵاوی ئاگرم بۆ لێ بکەنەوە لەو ڕۆژە. ئەبوطالیبیش وتی: وەڵڵاهی برازاکەم قەت درۆی نەکردووە ئێوەش بڕۆنەوە و ژێر بن)[١٩٦].

هەروەها بەوەشەوە نەوەستان تا گەیشتە ڕادەی مل کەچ بوونیان بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ وەك ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ڕۆژێکیان ئومەیە و ئەبوجەهل لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی قوڕەیشدا چوونەلای پێغەمبەر ﷺ و پێیان وت: ئەی موحەمەد وەرە تۆ دەست بهێنە بە بتەکانماندا ئێمە دێینە ناو ئاینەکەتەوە و موسوڵمان دەبین، پێغەمبەریش ﷺ زۆر موسوڵمان بوونی قەومەکەی پێ خۆش بوو بۆیە کەمێ دڵی نەرم بوو ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی لەسەر دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥۖ وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ ﴾ (الإسراء)[١٩٧] واتە: (بێگومان ئەوەندەی نەمابوو موشریك و بێ باوەڕەکان سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە بە وەحیی بۆمان ناردووی لەخشتەت بەرن و لەهەندێ فەرمانمان بترازێیت تا شێوازی بانگەوازەکەت بگۆڕیی و غەیری قورئانیان بۆ بخوێنیتەوەو، ئیتر کردبایتیان بە دۆست و خۆشەویستیان و، دەبوویتە پیاوی چاك) وە پێغەمبەری ئاگادار کردەوە ﷺ کە بە هیچ جۆرێك دڵی نەرم نەبێت بۆیان وە وتەشیان جێبەجێ نەکات).

---

(١٩٦) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٧٤/١٧)، وأبو يعلى (المسند) (٦٨٠٤)، والبخاري في (التأريخ) (٥٠/٤)، والحاكم (المستدرك) (٥٧٧/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (١٨٧/٢)، قال الهيثمي في (المجمع) (١٥/٦) (٩٨٠٩): رواه أبو يعلى ورجاله رجال الصحيح، قال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٩٢): إسناده حسن.

(١٩٧) أخرجه: ابن مردوية وابن أبي حاتم بسند جيد كما قال السيوطي في (لباب النقول) (ص:١٣٨).

## قورەیشییەکان داوای موعجیزە دەکەن

قورەیشیەکان دوای ئەو هەموو دژایەتی و رێگریەی کەئەنجامیاندا دژ بە پێغەمبەر ﷺ و ئاینی ئیسلام وە ئازاردانی شوێن کەوتووانی، تاکە رێگا یەکیان لە بەردەم مایەوە کە رووبەروبونەوەی پێغەمبەری ﷺ پێ بکەن ئەویش رێگەی داواکردنی موعجیزە بوو. ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (قورەیش بە پێغەمبەر ﷺ یان وت: داوامان بۆ بکە لای خوای خۆت تا تەپۆلکەی سەفامان بۆ بکات بە ئاڵتون ئەگەر راست دەکەیت، ئەگەر ببێت بە ئاڵتون ئێمەش بەیانی شوێنت دەکەوین و دەزانین کە تۆ راست دەکەیت ئەوەی کە خۆت وتوتە هەر ئەوەیە کە پێغەمبەریت و باوەرت پێ دەهێنین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وادەکەن؟ وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوای گەورە کرد، و جبریل ﷺ لە لایەن خواوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((إنَّ رَبَّكَ يُقْرِئُكَ السلامَ ويقولُ لكَ إنْ شئتَ أُصْبِحُ لهم الصفا ذهبًا فمن كفر منهم بعدَ ذلكَ عُذبتُهُ عذابًا لا أُعَذِّبُهُ أحدًا من العالمينَ وإنْ شِئْتَ فتحْتُ لهم بابَ التوبَةِ والرحمةِ)) واتە: پەروەردگارت سەلامت لێ دەکات و پێت رادەگەیەنێت و دەفەرموێت: ئەگەر ویستت لێیە بەیانی تەپۆلکەی سەفایان بۆ دەکەم بە ئاڵتون، بەڵام دوای بینینی ئەو موعجیزە یە هەر کەس پەشیمان بێتەوە سزایەکی دەدەم کە سزای هیچ کەس وا نەدرابێت وە ئەگەر ویستت لێ بێت دەرگای بەزەیی و تۆبەیان لەسەر دەکەمەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بَلْ بابَ التوبةِ والرحمةِ)) واتە: بەڵکو داوای کردنەوەی دەرگای تۆبەو بەزەییان بۆ دەکەم، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ۝٥٩﴾(الإسراء)[198]. واتە: (هیچ شتێك رێی لەئێمە نەگرتووە کە موعجیزەو نیشانەی گرنگ بنێرین و نیشانی قورەیشی بدەین لەسەر داوای خۆیان، ئەوە نەبێ کە بەر لەمان موعجیزەیەکی زۆرمان نیشانی پێشینانیاندا کەچی بروایان

---

(١٩٨) أخرجه: أحمد (المسند) (٢١٦٦،٢٣٣٢،٣٢٢٣) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح على شرط مسلم، و الحديث صحيح، وصححه أحمد شاكر أيضاً، والبزار (٢٢٢٥،٢٢٢٦)، والنسائي في (السنن الكبرى) (١١٢٩٠)، والطبري في (التفسير) (١٠٨/١٥)، والحاكم في (المستدرك) (٣٦٢/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٧٣٦)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٧١/٢)وفي (السنن الكبرى) (٨/٩)، وقال ابن كثير في (البداية) (٥٢/٣): إسناده جيد، وقال الهيثميفي (مجمع الزوائد) (١٩٦/١٠) رجاله رجال الصحيح، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٥٢) وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المستند مما ليس في الصحيحين) (٦٧٩): صحيح على شرطهما.

نەهێنا و بەدرۆیان خستنەوە و، ئەوجا بەر تورەی و سزامان کەوتن و لەناومان بردن، ئێستاش کە قورەیش داوای موعجیزە دەکەن و نایاندەینێ، هەر لەبەر ئەوەیە نەوەك ئەمانیش بروا نەهێنن، ئەوجا ئێمەیش بەپێی یاسای خۆمان لەناویان بەرین ئێمە وشترەکەمان بەئاشکراو بەرِوونی لەسەر داوای خۆیان بەهۆزەکەی (سەموود)دا، کەچی ستەمیان لێکرد و کوشتیان، ئەوجا ئێمەیش سزاماندان و لەناوچوون وە ئێمە هەر بۆ ترساندنیانە کە بەڵگەی جۆراوجۆر دەنێرین، وەك زەمین لەرزە و خۆرگیران و مانگگیران، بۆ ئەوەیە بیرێ بکەنەوە و دابچڵەکێن).

پێغەمبەر ﷺ لەوە دوودڵ نەبوو کە ئەگەر قورەیش ئەوەش ببینن هەر بێ باوەڕ دەبن و باوەڕ ناهێنن، و پاشان بەر سزای سەختی خوا دەکەون خۆشیان و نەوەی دوای خۆشیان، لەبەرئەوە بەباشی زانی کە خوای گەورە دەرگای بەزەیی یان لێ بکاتەوە و ڕێنموونیان بکات، وە ئەوەش بوو کە دوایی هەر ئەوان موسوڵمان بوون).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((سەرکردەکانی قورەیش کۆبوونەوە لە دوای ڕۆژئاوا بوون لە پەنای دیواری کەعبەدا و ناردیان بە دوای پێغەمبەردا ﷺ کە کاتێ پێغەمبەر ﷺ نێردراوی ئەوانی پێگەیشت کە کۆبوونەتەوە و نیازی قسەکردن و ڕێکەوتنیان هەیە لەگەڵی، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ خۆشحاڵ بوو بەرەو ئەوێ چوو لەوێ قورەیشیەکان باسی پەیوەندی و دژایەتی نێوان هەردوولایان کردو لە دواییدا وتیان: ئەگەر پێت خۆشە با پارەت بۆ کۆبکەینەوە یان سەرکردە و پاشامان بە؟

پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دانەوە و فەرمووی: من نەهاتووم بۆ ئەوەی کە دەوڵەمەندی ئێوە بم بەڵکو خوای گەورە تەنها ئاینێکی بەمندا ناردووە تەنها داواکاریم لە ئێوە ئەوەیە گوێڕایەڵی خوای خۆتان بکەن، و شوێنی ئاینی ئیسلام بکەون، ئەگەر ئەوە بکەن من هەر ئەوەم لە ئێوە دەوێت، قورەیشیەکان کە زانیان گفتوگۆ سوودی نییە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ تاوایان لێ هات وتیان: ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت با خوا ئەم شاخانە بە چوار دەورەی کەعبەدا نەهێڵێت، یان داوا بکە لە خوا با ئەو شاخانە بکات بە کانیاو تا ئاو هەڵقوڵێ وە بیکەین بە کشتوکاڵ و باخ و باخات وە یان بیکات بە شوێنێکی خۆشی دلگیر، نەخێر ئەگەر ڕاست دەکەیت با فریشتە بنێرێت لەگەڵتدا، ئەوەبوو داوایان لێ دەکرد و دەیان وت: ئەگەر ڕاست دەکەیت باخوا باخێکی گەورەت

پێ ببەخشێت و دەوڵەمەند بیت و ئاڵتون و زیوت هەبێت ئێمەش باوەڕت پێ دەکەین.

تا بەو شێوەیە وتیان: ئەگەر ڕاست دەکەیت فەرموو ئاسمانمان بەسەردا بڕوخێنە یا ئەگەر دەتوانیت پارچەیەك لە ئاسمانمان بەسەردا بڕوخێنە تاوای لێ هات کوڕی پوری خۆی عەبدوللای کوڕی ئەبو ئومەیە پێی وت: وەڵلاهی بە هیچ جۆرێك باوەڕت پێ ناهێنم تا پەیژەیەك نەهێنیت لە پێش چاوی خۆمدا پیایدا سەرکەویت بۆ ئاسمان، وە منیش سەیرت بکەم تا دەچیت بۆ ئاسمان و لەوێوە بێیتەوە و چوار فریشتە لەگەڵ تۆدا بێت و شایەتیت بۆ بدەن، کە پێغەمبەری خوایت ئەگەر واش بکەیت ناچێتە عەقڵمەوە کە تۆ پێغەمبەری خوا بیت و بڵێم تۆ ڕاست دەکەیت) سەبارەت بەم مشت و مڕە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾﴾(الإسراء)[١٩٩].

دوا بە دوای ئەوە قورەیشیەکان کۆڵیان نەدا تا بیریان لەوە کردەوە داوای موعجیزە بکەن کە لە دەسەڵات و توانای کەسدا نەبێت، وا بە باشیان زانی کە ئەو داواکاریانە لە دەرەوەی زەویدا بێت لەبەر ئەوە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کەمانگیان بۆ بکات بە دوو کەرتەوە..... لە ئەنەسەوە ﷺدەفەرموێت: (دانیشتوانی مەککە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە موعجیزەیەکیان نیشان بدات و مانگیان بۆ بکات بەدوو لەتەوە...)[٢٠٠]، لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (مانگی نیشان دان بەدوو کەرتی تا بە بەرچاوی خۆیانەوە کێوی حەڕائیان بینی کە لەنێوانی هەردوو کەرتەکەدا بوو)[٢٠١].

وە لەڕیوایەتێکی تردا (مانگ بوو بە دوو لەتەوە و لەتێکیان لە پشتی شاخەکەوە

(١٩٩) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٢٢/١)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١٩٠/٢).

(٢٠٠) أخرجه:أحمد (المسند) (٤٤٧/١)، والبخاري (الصحيح) (٣٦٣٧)، ومسلم (الصحيح) (٧٠٠٣،٧٠٠٧)، والحاكم (٣٧١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني في (المعجم الكبير) (٩٩٩٧).

(٢٠١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٦٨).

بینی و لەتەکەی تریان لەودیوی تری شاخەکەوە بینی و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إشهَدوا، إشهَدوا...))[٢٠٢]. واتە: شایەتی بدەن، شایەتی بدەن بەچاوی خۆشتان بینیتان، لەڕیوایەتێکی تردا (پێغەمبەر ﷺ داوای لەخوای گەورەکرد تامانگ بوو بە دوو کەرتەوە کەرتێکیان لەسەر شاخی ئەم بەر بووە کەرتەکەی تر لەسەر شاخی ئەوبەر بووە (واتە لەسەر شاخی (قوعەیقیعان) وە (ئەبوقوبەیس)ی شاری مەککە) دوای ئەوە وتیان: محمد سیحری لێ کردووین چۆن مانگ بووبە دووکەرتەوە، کەرتێکی چووە سەر ئەو شاخە و کەرتەکەی تری چووە سەر ئەو شاخەی تر؟ دوایی وتیان: ئەگەر محمد لەتوانایدا بوو بێت سیحر لەئێمە بکات بێ گومان ناتوانێت سیحر لەهەموو کەسێك بکات)[٢٠٣].

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (مانگ بووبە دووکەرتەوە لەشاری مەککە و بێ باوەڕانی قوڕەیش وتیان: ئەمە سیحرێکە موحەممەد لە ئێمەی کردووە ڕاوەستن باکاروان چیەکانی ڕێگەی یەمەن وشام بگەڕێنەوە ئەگەر موحەممەد سیحری لە ئێمە کرد بێت ناتوانێ سیحر لەسەرجەم خەڵکان بکات ئەگەر هاتنەوە و هەواڵیان پێ گەیاندین کەئەوان بینیویانە ئەوا دیارە موحەممەد ڕاستی کردووە ئەگەر واش نەبێت ئەوە تەنها سیحرێکە لەئێوەی کردووە و هیچی تر نییە، ئەوەندەی پێ نەچوو کاروان چییەکات گەڕانەوە لە هەموو لایەکەوە هەواڵ یان پێدان وتیان: بەڵێ ئێمەش هەمان شەو بینیمان کەمانگ دووکەرت بوو بوو)[٢٠٤].

---

(٢٠٢) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٨٦٣،٤٨٦٤).

(٢٠٣) أخرجه:الترمذي (٣٢٨٨)، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٢٢). وفي رواية عن ابن مسعود ﷺ قال انشق القمر ونحن مع رسول الله r بمِنى حتى حتى ذهبت فرقة منه خلف الجبل فقال رسول r:((اشهدوا)). أخرجه: الطبري (٥٩١/١١)، و نعيم حماد (الفتن) (١٦٨٥) وقال محققه: إسناده حسن.

(٢٠٤) أخرجه: أبو نعيم في (دلائل النبوة) (٢١٢،٢١١)، والطيالسي (المسند) (٢٤٤٧)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٦٦/٢).

# کۆچ کردنی یەکەم بۆ حەبەشە

ئیبنو قەیم ﷺ دەفەرمویێت: (کاتێ موسوڵمانان زۆر بوون وبێ باوەڕەکان دژایەتی یان دەکردن و دەیان ترساندن و زۆر بەتوندی دژایەتی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد وەداوایان لەخەڵك دەکرد کەپاشگەز ببنەوە لەئاینی خوا بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەیدا بەهاوەڵانی کە کۆچ بکەن بۆ وڵاتی حەبەشە وە پێی فەموون: لەو وڵاتە پاشایەکی تیایە کە کەس ستەمی لێ ناکرێت لای ئەو)، موسوڵمانان کۆچیان کرد دوانزە کەس بوون لەگەڵ چوار ئافرەت، لەنێوانیاندا عوسمان ﷺ بوو زاوای پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕوقیەدا ئەوانیش بەڕێکەوتن بۆحەبەشە)[٢٠٥].

ئوم سەلەمە ﷺ ئەم بەسەر هاتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە وە دەفەرمویێت: (کاتێ مەککەییەکان شاری مەککەیان لێ نارەحەتکردین وە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تووشی هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك هاتن و ئەو هەموو بەڵا و فیتنەیەیان لەپێناوی دیندا توش دەبوو، وەدەشیان زانی پێغەمبەر ﷺ ناتوانێت هیچیان لێ دووربخاتەوە یاخود هیچیان بۆ بکات، چونکە پێغەمبەری خواش ﷺ خوای گەورە پشت وپەنای بۆ دابین کردبوو ئەویش ئەبوطالبی مامی بوو، کە نەی دەهێشت هیچ شتێك بەرامبەری بکرێت، بەم شێوەیە کۆمەڵ کۆمەڵ بە ڕێکەوتن وە لە حەبەشە کۆبوونەوە بەڕاستی چاکترین جێگەبوو کە پێیگەیشتین، گەیشتینە لای چاکترین دراوسێ، لەوێ ئاینمان بەبێ ترسی دەبرد بەڕێوە و نەدەترساین لەهیچ ستەمێك کە لێمان بکرێت)[٢٠٦]، لەهەندێ لەو ڕۆژانەدا پێغەمبەر ﷺ تازە سورەتی (النجم)ی بۆ هاتبووە خوارەوە وخوێندیەوە بەسەر کافرانی قورەیشدا کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئایەتی (سوجدە) بردن سوجدەی برد، وە قورەیشیەکانیش سوجدەیان لەگەڵیدا برد، ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرمویێت: (پێغەمبەر ﷺ سورەتی (النجم)ی خوێند لەمەککە وسوجدەی تیا برد هەرچی کافریش هەبوو لە چواردەوری هەموویان سوجدەیان برد لەخۆیانەوە، تەنها پیاوێك نەبێت پیر بوو مشتێك زیخی هەڵگرتوو گرتی بە ناوچەوانیەوە وتی: ئەمەم بەسە دەفەرمویێت: ئیتر ئەوە بوو دوایی بینیم بەکافری خوا لەناوی برد)[٢٠٧].

---

(٢٠٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٤٥/١) (الزاد المعاد) لابن قيم الجوزية (٩٥/١).

(٢٠٦) أنظر: (سيرة) لابن هشام (٣٣٤/١)، و حسن إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٧٠/١).

(٢٠٧) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٤٨٦٣، ١٠٦٧).

ئیبنو قەیم ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کە کۆچکارانی حەبەشە ئەم هەواڵی سوجدە بردنەیان پێ گەیشت وایان زانی کە کافرانی قورەیش موسوڵمان بوون، وەنەیان زانی کەئەم هەواڵە درۆیە تا گەڕانەوە نزیك شاری مەککە و زانیان کە قورەیش زیاتر لەجاران سورترە لە دوژمنایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ ئینجا بۆیان دەرکەوت کەئەم هەواڵە درۆیە و هیچ بناغەیەکی نییە بۆیە هەندێ لەو موسوڵمانانە بە ناچارانە هاتنەوە ناو شاری مەککە بە تایبەت ئەوانەی کە لەتوانایاندا نەبوو بگەڕێنەوە بۆ حەبەشە وە ئەو بەڕێزانەی تریش ڕێگەی گەڕانەوەیان گرتەوەبەر، وە لەوانەی گەڕانەوە ناو شاری مەککە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بوو ﷺ)[٢٠٨].

هەروەها دەفەرموێت: ئا لەو جارەدا بوو عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ گەڕایەوە و سەلامی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە کاتێ نوێژی دەکرد لەماڵی خۆیاندا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە، ئیبنو مەسعود زۆری پێ ناخۆش بوو،[٢٠٩]، ئەم بەسەر هاتە، ئیبنو مەسعود ﷺ خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئێمە سەلامیمان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە لەنوێژدا بوو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دەدایەوە ئەمە پێش ئەوەی بچین بۆ حەبەشە، کە لەخاکی حەبەشە گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ بینیمان نوێژی دەکرد سەلامیمان کرد وەڵامی نەدایەوە، دەفەرموێت: منیش برینی کۆن ونوێم کولایەوە وماتەمینی باڵی بەسەردا کێشام دانیشتم تاکو لەنوێژەکەی بووەوە ئینجا، وتم: ئەی پێغەمبەرخوا ﷺ سەلامم لێ کردیت کاتێ نوێژت دەکرد وەڵامت نەدامەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قد أحدَثَ مِن أمْرِه ألَّا تكَلَّموا في الصَّلاةِ)). واتە: (یەکێ لەوشتانەی کەخوای گەورە تازە لەئاینەکەیدا دایناوە ئەوەیە بە هیچ جۆرێك لەناو نوێژدا قسە نەکەن. ئینجا وەڵامی سەلامەکەیدامەوە..)[٢١٠].

لە دوای ئەوەی سزادانی قورەیش لەمەککە پەرەی سەندەوە و سەخت تربوو لە بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و تەنگیان پێ هەڵچنرا بۆ جاری دووەمیش ناڕەحەت کران پێغەمبەر ﷺ بۆ دووەم جار ڕێگەی پێدان کە وڵات بەجێ بهێڵن، و

(٢٠٨) أنظر: زاد المعاد (٩٥/١).

(٢٠٩) أنظر:زاد المعاد (٢١/٣).

(٢١٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٧٧/١)، وابن أبي شيبة (المصنف) (٧٣/٢)، والحميدي (المسند) (٩٤)، و عبد الرزاق في (المصنف) (٣٥٩٤)، والنسائي (السنن) (١٩/٣)، وأبو داود(٩٢٣)، وابن حبان (الصحيح) (٢٤٤٤) وقال محققه: إسناده حسن واللفظ له، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٨١٦).

کۆچ بکەن بەرەو خاکی حەبەشە، وەئەم جارەش تاقمێك خۆیان پێچایەوە و بەڕێ کەوتن، یەکەم جار ئیمامی عومەر ﷺ کەهێشتا موسوڵمان نەبوو بوو پرسیاری لێکردن....، لە عەبدوللای کوڕی عامرەوە ﷺ لە لەیلای دایکیەوە ﷺ دەفەرموێت: عومەر یەکێك بوو لە هەرە دوژمنە سەر سەختەکانی ئێمە لە ئیسلامبوونماندا کە خۆمان ئامادەکرد بۆ دەرچوون بەرەو حەبەشە عومەر هات من بە سواری وشترەکەمەوە بووم بەڕێکەوتین بڕۆین پێی وتم: دایکی عەبدوللا بۆ کوێ دەچن؟ منیش وتم: ئازارتان داین ئەچین لە زەوی خوادا دەڕۆین تا ئازار نەدرێین لە سەر پەرستنی خوا، ئەویش وتی: خواتان لەگەڵ دوای ئەوەی ڕۆیشت مێردەکەم هاتەوە کەناوی عامری کوڕی رەبیعە بوو وە من هەواڵەکەم پێڕاگەیاند کە عومەر ئەوە یەکەم جارە دڵی نەرمە بەرانبەرمان، مێردەکەشم وتی: تۆ هیوات وابێ کە موسوڵمان بێت؟ وتی: وەڵاهی هەتا کەرەکەی باوکی موسوڵمان نەبێت عومەریش موسوڵمان نابێت)[٢١١].

## کۆچکردنی دووەم بۆ وڵاتی حەبەشە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ لە ئوم سلمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ بینی هاوەڵانی تووشی چۆن بەڵایەك بوون، وە خۆیشی خوای گەورە پەنای داوە و پاشان مامیشی بەرگری لێ دەکات، و کەس ناتوانێت هیچی بەرامبەر بکات، و زانیشی کە هیچی پێ ناکرێت بەرامبەر ئەو موسوڵمانانە ئینجا پێی فەرموون: ئەگەر بچوونایە بۆ خاکی حەبەشە چونکە پاشایەکی لێ یە کەس ستەمی لێ ناکرێت لای ئەو وە وڵاتی کەسانی ڕاستگۆیە، بڕۆن تاکو خوای گەورە دەرووی خێرتان لێ دەکاتەوە لەم بارەی کە ئێوە تیایدان، دەفەرموێت: ئیتر لەوکاتەوە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتن بەرەو خاکی حەبەشە لە ترسی هەڵگەڕانەوە و پاشگەزبوونەوە و دوور خستنەوە لە ئاینی ئیسلام)[٢١٢].

ئینجا بەڕێکەوتن بەرەو خاکی حەبەشە، ئەو موسوڵمانانەی کە کۆچیان کردبوو جگە لەو کوڕ و منالانەی پێیان بوو کە لەوێ لەدایك بوون، ژمارەیان تەنها

(٢١١) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (٢٩/٢٥)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٢١/٢)، و الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٤/٦) (٩٨٤٠): وقال: رواه الطبراني و قد صرح ابن إسحاق بالسماع فهو صحيح.

(٢١٢) أنظر:سيرة ابن هشام (٣٤٥/١)، وأخرجه:البيهقي (الكبرى) (٩/٩)، وفي (الدلائل) (٣٠١/٢) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣١٩٠).

هەشتاو سێ موسوڵمان بوو، گومان هەیە لەوەی عەمماری تیابوو بێت، وەیەکێك لە کۆچکردوان لە ڕێگە وەفاتی کرد. وەك زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەفەرموێت: (خالیدی کوڕی حزام کۆچی کرد بۆ خاکی حەبەشە لە ڕێگەدا مارێك گەستی و وەفاتی کرد خوای گەورەش سەبارەت بەو ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٠﴾ (النساء)[٢١٣].واتە: (هەر کەسێك لەبەردینی خوا لەزێدی خۆی کۆچ بکات لەو وڵاتەدا کەبۆی دەچێ گەلێك جێگا و شوێنی باشی حەوانەوەی بۆ دەبێ و دەکەوێتە فەرەحانییەوە و هەرکەسێك لەماڵی خۆی دەرچێ و کۆچ بکا بۆلای خوا و پەیامبەرەکەی، پاشان لەرێدا مردنی پێگەیشت، پێش ئەوەی بگاتە ئەو جێگایەی بۆی دەچێ ئەوە بێگومان پاداشی کەوتۆتە سەرخوا و مسۆگەر دەبێت و خوایش هەمیشە تاوان پۆشی میهرەبانە.).

بەدەرچوونی هەواڵی کۆمەڵێك کە گەیشتونەتە حەبەشە دەست بەجێ و بە پەلە قورەیش نوێنەری خۆیان ئاراستەی نەجاشی پادشای حەبەشە کرد. ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە بوو ترسا لە هاوەڵەکانی کە هاوبەش پەیداکەران ئازاریان بدەن، لەبەر ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوطالب و ئیبنو مەسعود لەگەڵ چەندین هاوەڵی خۆیدا ناردنی بۆ لای نەجاشی پاشای حەبەشە، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشت بە هاوبەش پەیداکەران ئەوانیش نوێنەری خۆیان کە عەمری کوڕی عاص بوو لەگەڵ تاقمێك لە قورەیشیەکان ناردیان و پێش موسوڵمانەکان خۆیان گەیاندە لای نەجاشی وە پێیان ڕاگەیاند و وتیان: پیاوێك لە قورەیش پەیدا بووە کە قورەیشیەکان بەبێ عەقڵ دەزانێت و ڕەخنە لە ئاینەکەیان دەگرێت و پروپاگەندەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرە، تاقمێکی لە هاوەڵانی خۆی ناردووە کە خەڵکانی لای ئێوەش تووشی ئەو ئاژاوەیە بکەن ئێمە پێمان خۆش بوو کە پێشوەخت بێینە لای تۆ و ئەم هەواڵەت پێ بگەیەنین بۆ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێت، ئینجا نەجاشی وتی: ئەگەر ئەوان هاتن منیش گوێ دەگرم بۆ قسەکانیان تا بزانم چییەو چی نییە و چی دەڵێن)[٢١٤]. گومان وایە کە قورەیش دووجار عەمری کوڕی عاصی

(٢١٣) أخرجه: ابن أبي حاتم (التفسير) (١٧٥/٢)، وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢١٨): إسناده حسن

(٢١٤) أخرجه: الطبري في (التفسير) (٩٦١٠)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٩٣)، و صحح إسناده العمري في (السيرةالصحيحة)

نارد بێت بۆ حەبەشە، جارێکیان لەگەڵ عەمماری کوڕی وەلید، وەجارێکیان لەگەڵ عەبدوللای کوڕی ڕەبیعە[٢١٥].

(دوای گەیشتنی هاوەڵە کۆچکارە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆلای نەجاشی، ئینجا قورەیش بۆ دواجار دەستبەجێ عەمری کوڕی عاص و عەمماری کوڕی وەلید لەگەڵ چەندین خەڵات و دیاری گران بەهایان ئامادە کرد بۆ ئەوەی نەجاشی و وەزیرەکانی پێ قایلکەن تا ئەو کۆمەڵەیان پێ بسپێرنەوە).

ئوم سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: (کاتێ دابەزین لە خاکی حەبەشە چوینەلای چاکترین دراوسێ کە ئەویش نەجاشی بوو لای ئەو ئەمین بووین لە ئایین و باوەڕی خۆمان، وە خوای خۆمان دەپەرست و تووشی ئازار نەدەبووین، وە کەس ئازاری نە دەداین و گوێمان لە هیچ شتێك نە دەبوو کە پێمان ناخۆش بێت، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشت، بە قورەیش کۆبوونەوە لەناو خۆیاندا پیلانی ئەوەیان کێشا کە نوێنەرێ بنێرن بۆ لای نەجاشی، ئینجا دوو پیاوی پایە بەرز و زمان زانیان نارد لەگەڵ چەند خەڵاتێکی گران بەها کە ئامادەیان کرد بوو بۆ نەجاشی لەو شتانەی کە زۆر لای خۆشەویست بوو لە شاری مەککە، وە چاکترین دیاری لای نەجاشی پێستەی نایاب بوو، بۆیە پێستەیەکی یەکجار زۆری نایابیان بۆ کۆکردەوە، وە بۆ هەموو بەتریقێك (واتە: زانا گاورەکان) لە بەتریقەکانی چوار دەوری نەجاشی خەڵاتی باشیان بۆ ئامادەکردن، ئینجا ئەم خەڵاتانەیان لەگەڵ عەبدوللای کوڕی ئەبو ڕەبیعە کوڕی مەخرەمەی مەخزومی و عەمری کوڕی عاصی کوڕی وائلی سەهمیدا نارد، وە فەرمانیان پێ کردن وە پێ یان وتن: ئەگەر چوون لە پێشدا بچن بۆلای بەتریقەکان و هەر بەتریقێك خەڵاتی گرانی خۆی پێشکەش بکەن پێش ئەوەی قسە لەگەڵ نەجاشیدا بکەن، ئینجا کە خەڵاتەکانیان پێ دان دوایی قسە لەگەڵ نەجاشیدا بکەن وە داوای لێ بکەن کە ئەو کۆمەڵەتان پێ بسپێرنەوە تا بیگێڕنەوە بۆ ئێمە...

ئوم سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: بەڕێکەوتین تا گەیشتینە لای نەجاشی ئێمە لەوێ لە چاکترین جێگەو لای چاکترین دراوسێ بووین وە (دەفەرموێت) هیچ بەتریقێك لە

(١٧٤/١): و كل هذه الروايات عمن لايدفع عن صدق فهم فهذا يدل على أن قريشاً بعث عمر بن العاص دفعتين، مرة مع عمارة بن الوليد و مرة مع عبدالله بن أبي ربيعة.

(٢١٥) أنظر: ابو نعيم الاصفهاني في (الدلائل) (١٩٦).

بەتریقەکان نەمان کە خەڵاتی خۆی وەرنەگرێت پێش ئەوەی قسە لەگەڵ نەجاشیدا بکەن، ئینجا هەردووکیان بە بەتریقەکانیان وت: کەسانێك لە ئێمە هاتوون بۆ وڵاتی پاشای ئێوە کە هەرزە و نەفامن و لە ئایینی قەوم و هۆزی خۆیان لایان داوە، وەنەش هاتوونەتە ناو ئایینی ئێوەوە، بە ئاینێکی داهێنراو هاتوون کە ئێمە نازانین چییە؟ وە ئێوەش ئەو ئاینە ناناسن، وە ئێمەش بۆلای پاشای بەڕێزی ئێوە نێرراوین لەلایەن سەرکردایەتی خەڵکی خۆمان کە ئێمەیان ناردووە بۆ ئەوەی پێمان بسپێرنەوە تابیانگێڕینەوە، چونکە خزم و عەشرەتی خۆیان باشیان دەناسن و دەزانن عەقڵیان چۆنە و تا چ ڕادەیەك نەزان و هەرزەن، ئەمانە ئاین و باوەڕی ڕاستیان نیە، بەتریقەکان هەموویان بەم قسانە ڕازی بوون و پاشان خەڵاتەکانی خۆیانیان نزیك بە نەجاشی کردوەو نەجاشی لێی وەرگرتن و چوونە ژوورەوە وسجدەیان بۆ نەجاشی برد....، یەکێکیان لای دەستی ڕاستی نەجاشییەوە دانیشت ئەویش عەمری کوڕی عاص بوو وە ئەوی تریشیان لای دەستی چەپی یەوە دانیشت، ئینجا قسەیان لەگەڵ نەجاشیدا کرد و پێ یان وت: ئەی پاشا کەسانێك لە ئێمە هاتوون بۆ وڵاتی ئێوە، منداڵانێکی هەرزە و نەفامن لەئاینی کەسانی خۆیان لایان داوە و نەهاتونەتە ناو ئایینی ئێوەش، ئاینێکی دروستکراوی تازەیان داهێناوە کە ئێمە نایناسین و نایزانین و ئێمەش پیاو ماقوڵان و سەرکردەکانی خەڵکی خۆمان ئێمەیان ناردووە بۆ لای جەنابتان بۆ ئەوەی پێمان بسپێرنەوە، چونکە ئێمە شارەزاترین کە ئەوانە چین و چ کارەن و ئاینیان چییەو چی نییە، پێمان بسپێرەوە با بیانگێڕینەوە بۆ وڵات و ناو خزمانی خۆیان و لێتان دووربخەینەوە.

نەجاشی توڕە بوو وتی: وەڵاهی کاری واناکەم بانگیان دەکەم و پرسیاریان لێ دەکەم تا بزانم ئەوەی ئێوە دەیڵێن ئەوان وەڵامیان چییە؟ ئەگەر وەکو ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاست بێت، ئەوا پێتان دەسپێرمەوە و بیانگێڕنەوە بۆ ناو قەومی خۆیان، بەڵام ئەگەر وانەبوو بە هیچ جۆرێك ئەوانتان پێ نادەمەوەو پشتگیریشیان لێ دەکەم و بە چاکترین شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەم تا لە لای من بمێننەوە. ئینجا نوێنەر نێردرا بۆلای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وە بانگکران کاتێك نوێنەرەکان هاتن، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە لە ناو خۆیاندا هەندێکیان بە هەندێکیان وت: باشە چی

**بڵێین بەم پاشایە؟ وتیان: وەڵاهی ئەوەی دەیــزانین پێی دەڵێین ئیــتر چی دەبێت یا ببێت)[٢١٦].**

**لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کە نەجاشی نوێنەری نارد بۆ لامان جەعفەری کوڕی ئەبوطالب پێی وتین: کەس قسە نەکات من ئەمڕۆ وتار بێژی ئێوە دەبم، (دەفەرموێت) ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چووین تا گەیشتینە دەرگای نەجاشی لەوێ وتمان: ئایا ڕێگە دەدەیت بە پیاوانی خوا بێنە ژوورەوە؟ نەجاشی وتی: ڕێگەیان پێبدەن پێشوازی و مەرحەبا لە پیاوانی خوا، دەفەرموێت: کاتێ هاوەڵان هاتنە ژوورەوە سەلامیان کرد (واتە: سوجدەیان نەبرد) و ڕۆیشتنە ژوورەوە چوونە بەردەم نەجاشی لە جێگەی دانیشتنەکەیدا بوو، عەمری کوڕی عاص لای ڕاستی یەوە بوو، وە عەمماریش لای چەپیەوە بوو، وە (قەسیس و ڕاهبەکان) بە دوو ڕیز دانیشتبوون وە عەمرو عەممایش پێیان وتبوون: ئەمانە سوجدە نابەن بۆ پاشا، تەنها بۆ خوای خۆیان نەبێت، ئینجا عەمرو عەممایش وتیان: نابینن ئەی پاشا ئێمە ڕاستمان کرد لەگەڵتدا بەو سڵاوەی کە پێویستە ڕێزت لێ بگیرێت ئەوان ئەنجامیان نەدا. نەجاشی وتی: بۆ ئەو سڵاوەی کە شایستەی منە نەتان کرد لەگەڵ مندا؟ (واتە: سوجدە بردن)؟ موسوڵمانەکانیش وتیان: ئێمە سڵاومان لێ کردیت بە سڵاوی ئەهلی بەهەشت بەسڵاوی فریشتەکان. ئینجا نەجاشی، ئوسقوفەکانی خۆی بانگ کرد و ئینجیلەکانیان کردەوە، پاشان پرسیاری لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: ئەم ئاینە چی یە کە ئێوە لە سەری جیابوونەتەوە لە کەسانی خۆتان و نەهاتوونەتە ناو ئاینەکەی من و نەچوونەتە ناو ئاینی هیچ کەسێك لە گەلانی سەر زەوی؟**

**جەعفەر لەوەڵامدا فەرمووی: (ئەی پاشا ئێمە کەسانێکی نەفام بووین، بتمان دەپەرست و مردارەوە بوومان دەخواردو ئیشی خراپەمان دەکردو و پەیوەندی**

---

(٢١٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٠٢/١) (١٧٤٠) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن واللفظ له، وسيرة ابن هشام (٣٦٠/١) (٢٢٨) وقال محققاه:إسناده حسن، وأبو نعيم في (الحلية) (١١٥/١)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٩/٩) وفي (الدلائل) (٣٠١/٢)، والطبري في (التأريخ) (٢٣٠/٢)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٤٧٩)، وقال الحافظ العراقي في (تخريج الأحياء) (٢٢٥/٢): سنده جيد، وقال الحافظ ابن حجر في (فتح الباري) (١٨٩/٧): أخرجه أحمد و إسناده صحيح، و كذا قال في (الإصابة) (١١٦٦)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:١٢١): إسناده صحيح، وصححه ايضا في (الصحيحة) (٣١٩٠) وفي (مختصر الطحاوية) (ص:١٥٣)، وصحح إسناده محققا (زاد المعاد) (٢٩/٣)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (١٦٧٢): حديث حسن.

خزمایەتیمان دەپچڕاندو لەگەڵ دراوسێدا خراپ بووین، بەهێزمان لاوازی دەچەوساندەوە، تا خوای گەورە، پێغەمبەرێکی ﷺ لە ناوماندا نارد ئەو پێغەمبەرەی کە عیسا ﷺ مژدەی پێداوە دێت وە ناوی ئەحمەدە بە باشی نەژادو خوڕەوشت و داوێن پاکیمان ناسیوە، بانگی کردین بۆ لای خوا کە بەتەنها بیپەرستین و واز لە ئاینی ئەفسانە بهێنین کە باوك و با پیرانمان لە سەری بوون کە بت و دار پەرستن بووە[٢١٧]، وە فرمانی پێکردین کە ڕاستگۆ بین و دەستپاك بین و خزمایەتی ئەنجام بدەین و لەگەڵ دراوسێدا چاك بین و دوور بکەوینەوە لە خوێن ڕشتن و دووبەرەکایەتی و قسەی درۆ و ئاژاوە نانەوە و بوختان کردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك، و خواردنی ماڵی هەتیوو، وە فەرمانی پێکردین کە خوای گەورە بە تەنها بپەرستین و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەین، وە فەرمانی پێکردین کە نوێژ بکەین و ڕۆژوو بگرین.

نەجاشی زۆر سەری سوڕما بەم قسانە، وە جەعفەریش بەردەوام بوو لە قسەکانیدا و کارە گرنگەکانی ئیسلامی بۆ ڕوون کردەوە، پاشان فەرمووی: ئێمە ئەو پێغەمبەرەمان بەڕاست زانی و باوەڕمان پێهێنا و شوێنی کەوتین بەم جۆرە خوای گەورەمان پەرست و هاوتامان بۆ بڕیار نەدا و ئەوەی لێی حەرام کردبووین بە حەراممان زانی وە ئەوەی بۆی حەڵاڵ کردبووین بە حەڵاڵمان زانی، بەڵام خزمانمان هەڵیانکوتایە سەرمان و ئازار و ئەشکەنجەیان داین و وایان لێکردین کە لە دین وەرگەڕێین و ویستیان لە خواپەرستی یەوە بمان گەڕێننەوە بۆ بتپەرستی، وە ئەوەی ئێمە بە خراپمان دەزانی دەبوو بە چاکی بزانین لەمەودوا، کاتێ زاڵبوون بەسەرماندا و ڕێگەیان لە چوونە ناو ئەو ئاینە لێگرتین، ئێمەش بەرەو وڵاتی تۆ کەوتینە ڕێ و لەناو هەموو وڵاتاندا تەنها تۆمان هەڵبژارد و پێمان خۆش بوو کە ببینە دراوسێی تۆ و هیوامان وابوو کە بە هیچ جۆرێك ستەممان لێ نەکرێت لەلای تۆ ئەی پاشا.

پاشان نەجاشی بە جەعفەری وت: ئایا لەو ئاینەی خوا ناردوویەتی لە وتەی خوا هیچت پێیە بۆمان بخوێنیتەوە؟ جەعفەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: نەجاشی وتی: هەندێك لەو قورئانەم بەسەردا بخوێنەرەوە، جەعفەریش دەستی کرد بە خوێندنەوەی سەرەتای سورەتی مریم (کهیعص) کە سورەتێ بوو لە سەرەتاوە باسی پێغەمبەرە بەڕێزەکانی بەنی ئیسرائیل دەکات بەتایبەتی شێوەی لەدایك بوونی عیسای کوڕی

(٢١٧) أخرجه: الحاكم والبيهقي في (الدلائل) و أبونعيم.

مەریەم ﵂ (دەفەرموێت): کە خوێندی وەڵاهی نەجاشی گریا فرمێسک لە چاوی ڕژا هەتا ڕیشی تەواو تەڕکرد، هەروەها ئوسقوفەکانیش ئەوەندە گریان تا کتێبەکانی بەردەمیان تەڕکرد، دوای ئەوە نەجاشی وتی: وەڵاهی ئا ئەمە و ئەوەی عیسا ﵇ پێی هاتووە هەردووکیان لەیەك جێگاوە دەرچوون، بڕۆن وەڵاهی بە هیچ جۆرێك تەسلیمی هیچ کەسێکتان ناکەم....

ئوم سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: کاتێك عەمرو عەممار لەوێ دەرچوون و ئەو کۆڕە کۆتایی پێهات، عەمر وتی: وەڵاهی دەبێ بەیانی بێمەوە و هەواڵێکی دڵتەزێن بەدڵی نەجاشی بگەیەنم، کە ئەمان بە پێغەمبەرەکەی ئەوان دەڵێن چی؟ وای لێ دەکەم کەلە ناویان بەرێت (دەفەرموێت): عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ڕەبیعە کە ئەو زیاتر خزم ونزیك تر بوو وتی: واز بێنە خۆ ئەوانە خزمانمانن هەرچەندە جیاوازیش بن لە ئێمە.

عەمری کوڕی عاص وتی: نەخێر وەڵاهی دەبێ پێی ڕابگەیەنم کە پێغەمبەر عیسا ﵇ بە ئادەمیزاد دەزانن، کە بەیانی بەسەردا هات خۆی گەیاندە نەجاشی وتی: (ئەی پاشا سەبارەت بە عیسای کوڕی مریم قسەیەکی یەکجار مەترسیدار و گران دەڵێن بنێرە بۆلایان ئەوان وەك تۆ نین لە باوەڕبوون بە عیسا بنێرە با بێن بۆلات و پرسیاریان لێ بکە، دەفەرموێت: ناردی بە دوامانداا ئێمەیش چووین و تا ئەو کات شتی وا ناڕەحەت نەهاتبووە ڕێمان کۆبووینەوە هەندێکمان بە هەندێکمان وت: چی بڵێین سەبارەت بە عیسا ﵇ ئەگەر پرسیارمان لێ بکات؟ هەندێکی ترمان وتمان: وەڵاهی ئەوەی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی ڕوونی کردۆتەوە و پێی ڕاگەیاندووە هەر ئەوەی پێدەڵێین چی دەبێت با ببێت، دەفەرموێت: کاتێ چووینە ژوورەوە نەجاشی پێی وتین: چی دەڵێن سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم و دایکی؟

جەعفەریش ﵁ وتی: ئەوەی لە بارەوە دەڵێین کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندووین، عیسا عەبدی خوایە و پێغەمبەری خوایە، بە وشەی فەرمانی خوای گەورە بووە کە ناردویەتی بۆلای مەریەمی داوێن پاك کە هیچ کەسێك دەستی پێ نەگەیاندووە و مناڵیشی نەبووە لەوەو پێشتر، ئینجا نەجاشی دانەویەوە و چیلکەیەکی هەڵگرت و وتی: وەڵاهی ئەو قسەیەی تۆ کردت سەبارەت بە عیسا هەر ئەوەندەیە).

لەڕوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (نەجاشی فەرمووی: ئەی کۆمەڵانی زانایان و خواناسان، وەڵاهی ئەوەی کە ئێمە دەیڵێین سەبارەت بەعیسا ئەوانیش هەر ئەوە دەڵێن، پێشوازی بێت لەئێوە و لەو کەسەی ئێوەی ناردووە بۆ ئێرە[٢١٨]، وەمنیش شایەتی ئەدەم کە پێغەمبەرەکەتان پێغەمبەری خوایە ئەو پێغەمبەرەیە کەئێمە دۆزیومانەتەوە لە ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرەی کەعیسای کوڕی مەریەم مژدەی هاتنی داوە، لەبەر ئەوە نەبێت کە من سەرقاڵی پاشایەتی و بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتەم ئەگینا دەچووم هەر دوو نەعلەکەیم ماچ دەکرد، وە هەردوو نەعلەکەیم بۆ هەڵ دەگرت و ئاوی دەست نوێژم بۆ دەهێنایە بەردەست. ئێوەش بمێننەوە لەلام هەتا پێتان خۆشە.

دەفەرموێت: بەتریك و وەزیرەکان کەوتنە دەنگە دەنگ و ورتە ورت نەجاشیش وتی: وەڵاهی ئەگەر دەنگەدەنگیش بکەن هەروایە، ئینجا بەجەعفەر و هاوەڵانی وت: ئێوە ئازادن لەخاکی مندا هەر کەس جوێنتان پێبدات غەرامە دەکرێت، پێم خۆش نییە وەڵاهی کێوێك ئاڵتونم بدەنێ، بەرامبەر بەوەی کە ئازاری یەکێ لە ئێوە بدەم.

ئوموسەلەمەش ﵂ دەفەرموێت: دوای ئەوە فەرمانی کرد هەر دوو نوێنەرەکەی قورەیش عەمر هاوەڵەکەی دیارییەکانیان پێ بدرێتەوە و بگەڕێنەوە، لە پاشاندا نەجاشی وتی: وەڵاهی خوای گەورە ڕەشوەتی لەمن وەرنەگرتووە کاتێ پاشایەتی بۆ من گێڕاوەتەوە تا منیش ڕیشوەت وەرگرم، وە خوای گەورە خەڵکی بۆ من مل کەچ کردووە تا منیش مل کەچی ئەو بم. ئوم و سەلەمەش ﵂ دەفەرموێت: دوای ئەوە هەندێ خواردن ودیاری پێبەخشین)[٢١٩].

سەبارەت بەڕوونکردنەی ڕیشوەت وەرنەگرتن کەنەجاشی باسی دەکات عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (مانای ئەومیە پاشای حەبەشەی کۆن واتە باوکی نەجاشی تەنها هەر

---

(٢١٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٤٤٠٠)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٤٧٩)،وأبو نعيم في (الدلائل) (١٩٦)، والبيهقي(الدلائل) (٣٠١/٢)، والطبري في (التفسير) (٩٦١٠)، وصحح إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٧٤/١)، وأخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٣٠٩/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال البيهقي في (الدلائل) (٣٠٢،٣٠١/٢): إسناده صحيح، وقال ابن كثير في (البداية) (٦٩/٣): إسناده جيد قوي، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٨٤٧): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، وقال الحافظ في (الفتح) (١٣٠/٧): إسناده حسن، و حسن إسناده ايضا الشيخ الألباني رحمه الله في (صحيح السيرة) (١٨٠)، وفي (الصحيحة) (٣٠١).

(٢١٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٤٠٠)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٠٢/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣١٩٠).

ئەوی هەبوو واتە: (ئەصحەمە) بەڵام نەجاشی مامێکی هەبوو کە دوانزە کوڕی هەبوو حەبەشەییەکان لەناو خۆیاندا وتیان: ئێمە ئەگەر ئەم سەرۆکەی خۆمان نەکوژین کە تەنها کوڕێکی هەیە، کوڕەکەی ناتوانێت هەموو حەبەشە ببات بەڕێوە، ئەو جار حەبەشە نامێنێتەوە لەڕووی وڵاتانی تردا بەڵام بائێمە هەستین ئەومیان بکوژین کە تەنها کوڕێکی هەیە، وە ئەوەی تریان بکەین بەپاشا کە دوانزە کوڕەکەی هەیە خۆ ئەگەر بشمرێت دوابە دوای خۆی دوانزە کوڕەکەی دەیبەن بەڕێوە، وە موڵکی حەبەشە هەربەردەوام دەبێت، ئینجا حەبەشەییەکان پەیوەندیان کرد بەبراکەیەوە کە ناوی (مینجا) بوو بە هەر دوولایان باوکی (ئەصحەمە)ی نجاشی یان کوشت و براکەیان خستە جێگەی وە کردیان بەپاشای حەبەشە، نەجاشیش واتە: ئەصحەمە کوڕێکی دانا و وریا بوو هەموو کاری دەوڵەت ئەو دەیبرد بەڕێوە، وەپایەیەکی بەرزی هەبوو لای مامی.

حەبەشییەکان لەناو خۆیاندا مقۆمقۆیان تێکەوت و وتیان: ئەگەر ئەم کوڕە دوای مامی خۆی ببێت بەسەرۆکی حەبەشە و بزانێت کەباوکی ئەو حەبەشەییەکان کوشتوویانە بێگومان لەتۆڵەیدا دەیان کوژێتەوە، بۆیە هاتنەلای مامی وتیان: خۆت باش دەزانیت کەباوکیمان چۆن کوشتووە، ئەگەر ئەم گەنجە بەم شێوەیە ئاوا گەورە بێت زاڵ دەبێت بەسەر موڵکی حەبەشەدا، وە سبەی ڕۆژ تۆڵەمان لێ دەکاتەوە وەیان ئەوەتا دەبێت ئەم کوڕە بکوژین یان لەم وڵاتە دووری بخەینەوە؟ مامەکەشی وتی: ماڵتان وێران بێت هەر دوێنێ بوو براکەی منتان کە (باوکی ئەوە) بەدەستی خۆم کوشت دەتانەوێت ئەمڕۆش ئەو بکوژنەوە نەخێر هەرگیز واناکەم بەڵام دووری دەخەمەوە لەوڵات، ئەوە بوو مامی ئەصحەمەی فرۆشت بەکابرایەکی بازرگان بەشەش سەت درهەم وەکابرای بازرگان خستی یە ناو کەشتی و بردی بۆ شوێنێك هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە کە نەجاشی تیا فرۆشرا پەڵە هەورێك لەهەورەکانی پایز هەڵهات، وەمامی نەجاشی کەپاشای حەبەشە بوو چوو بۆ ئەوەی کەخۆی بداتە بەرباران وە تکەی بارانی بەرکەوێت لەناکاو بروسکەیەکی بەرکەوت و مرد حەبەشەییەکان مقۆمقۆی ئەوەیان بوو کە کێ ببێت بەسەرۆکی حەبەشە ئەوە بوو چوون بۆلای کوڕەکانی سەیریان کرد هیچ کام لە دوانزە کوڕەکەی عەقڵیان تەواو نییە، ئینجا ترسان لەوەی کێ ببێت بە پاشای حەبەشە. وتیان: تەنها ئەو کوڕەی کە فرۆشتوومانە ئەتوانێت

حەبەشە ببات بەڕێوە ئەگەر دەتانەوێت ئەم وڵاتە بەئارامی بژی و موڵکی پایەدار بێت دەبێت بچن ئەو کوڕە بدۆزنەوە و بیکەن بەپاشای حەبەشە: لەدواییدا ڕۆیشتن تا کابرای بازرگانیان دۆزیەوە و نەجاشی یان لەدەست سەندەوە و کردیانەوە بەپاشا و تەخت و تاجیان بۆ داناو کردیان بەسەروەری هەموویان وەمل کەچی فەرمانی بوون.

پاشان کابرای بازرگان هات و کەوتە سکاڵا کردنەوە و وتی: ئێوە کوڕەکەتان لێ سەندمەوە و پارەکەشتان لێ زەوت کردم وەڵاهی دەچم بۆلای سەرۆکەتان یان ئەوەتا پارەکەم دەداتەوە یان ئەوەتا کوڕەکەم پێ دەداتەوە وتیان: بڕۆ ئێمە پارەکەت نادەینەوە بچۆ بۆلای پاشا، ئەویش چوو بۆلای نەجاشی (واتە ئەصحەمە) وتی: ئەی پاشا من چەند ڕۆژێك لەمەو پێش کوڕێکم لێکڕین بەڵام هەر کوڕەکەم برد دوامکەوتن وکوڕەکەیان لێ سەندمەوە و کوڕەکەشیان نەدامەوە نەجاشی بەحەبەشەییەکانی وت: وەڵاهی یان ئەوەتا شەش سەد درهەمەکەی بۆ دەگێڕنەوە یان ئەوەتا کوڕەکەی کە کڕیویەتی دەست دەخاتە ناو دەستی و لەگەڵ خاوەنەکەیدا دەڕوات بۆ هەر شوێنێك کەپێی خۆشبێت، ئەوکاتە حەبەشییەکان ڕازی بوون پارەکە بگێڕنەوە بۆخاوەنەکەی.

ئابەو شێوەیە بووە نەجاشی دەڵێت: خوای گەورە پاشایەتیەکی کە ئەوان لە منیان سەندبوو هێنایەوە ژێر دەستم وەخوای گەورە ڕیشوەتی لێ وەرنەگرتم کاتێ منی کرد بەسەرۆکی حەبەشە وەدوژمنانی منی کرد بە دۆست وەل کەچی من ، ئەوەش شایستەی ئەوەیە کە من لەپێناوی خوادا مل کەچی فەرمانییم و ڕیشوەتی ئەو دوو بەرتیلچیە وەرنەگرم بەوەی خراپە بکەم بەرامبەر بەم موسوڵمانانە).

ئوم سەلەمە ﵂ لەدرێژەی باسەکەیدا دەیگێڕێتەوە و دەیگەیەنێتە ئەم شوێنەو دەفەرموێت: (ئینجا بەڕیسوایی هەردووکیان گەڕانەوە بە بەرتیلەکانیانەوە کەهێنابوویان لەگەڵ خۆیاندا بۆ نەجاشی و بەتریقەکان، ئێمەش لەوێ ماینەوە لەچاکترین جێگەو لای چاکترین دراوسێ وەڵاهی ئێمە لەخۆشیدا بووین ئەوندەی نەبرد کابرایەك لەنەجاشی پەیدا بوو ململانێی دەکرد وەچەکی لێ هەڵگرتبوو وکۆمەڵێکی زۆری لەگەڵ دابوو وەڵاهی ئێمە هیچ غەمباریەك و دڵ تەنگیەك ڕووی تێ نەکردبووین لەوکاتەدا کە لەوە گەورەتربوو بێت، دەترساین لەوەی کەنەجاشی

لەوکاتەدا تیا بچێت و سەرۆکێکی تربێت بۆ حەبەشە و ئێمە نەناسێ وپلە و پایەمان نەزانێت...

(لەریوایەتێکدا لەزوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ ئەو کابرایە هەڵیکوتایە سەرنەجاشی بەخۆی و سوپاکەیەوە کۆمەڵێ لەکۆچ کاران (واتە: جەعفەرو هاوەڵانی) چوونە بەردەم نەجاشی و پێیان وت: ئێمەپێمان خۆشە لەم شەڕەدا بەشداری بکەین دژ بەدوژمنەکەت و لەڕیزی تۆدا بجەنگێین، تا بزانیت ئازایەتی ئێمە تا چ ڕادەیەکە، وە بۆ ئەوەی پاداشتی هەندێ لەو چاکەیەت بدەینەوە کە لەگەڵ ئێمەدا کردووتە؟ نەجاشیش وتی: سەرکەوتنی خوای گەورە گەلێ چاکترە لە سەرکەوتنی خەڵکی، زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: سەبارەت بەمە بوو خوای گەورە ئەو ئایەتەی هێنایە خوارەوە کەدەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ ..... ﴿١٩٩﴾ ﴾ (آل عمران)[٢٢٠]. واتە: بەراستی لە خاوەننامەکاندا وا هەیە، باوەڕی بەخودا و بە و بەقورئانە بۆ ئێوە نێردراوە و، بە و کتێبانەیش بۆ خۆیان رەوانەکراون، هەیە، بۆ نموونە: (نەجاشی) و شوێنکەوتووەکانی باوەڕیان بەوانە هەبوو لێیدەترسن و ملکەچی فەرمانەکانی ئەون و هەرگیز ئایەتەکانی خودا، بە بەهایەکی کەم نافرۆشن و ناگۆڕنەوە، هەرچی لە تەورات و ئینجیلیشدا هاتووە نایشارنەوە ئا ئەوانە لای پەروەردگاریان پاداشیان بۆ هەیە ، بێگومان خوا زۆر زوو بەکارو حیسابدا دەگات.

ئوم سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: (ئەوەندەی پێ نەچوو نەجاشی بەخۆی وسوپاکەیەوە بەرێ کەوت بەرەو شوێنی دوژمن وەڕووباری نیلیان لەنێواندا بوو، هاوەڵانیش ﷺ لەنێوان خۆیاندا وتیان: ئایا پیاوێك دەتوانێت بڕوات نزیك بێتەوە لەشوێنی شەڕەکە تاهەواڵی شەڕەکەمان پێ بگەیەنێت؟ زوبەیر ﷺ وتی: من ئەڕۆم (زوبەیر منداڵ تربوو لەتەمەندا) ئێمەش مەشکەیەکمان بۆ هێنا و پڕمان کرد لە هەوا و بەستمان بەسەر سنگی یەوە بۆ ئەوەی مەلەی لەسەر بکات لە ناو ڕووبارەکەدا ئەویش بەمەلە ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەراغی نیل و گەیشتە جێی شەڕەکە دەفەرموێت: ئێمەش لەو کاتەدا دوعامان دەکرد کە خوای گەورە نەجاشی سەربخات ئەوەندەی پێنە چوو، خوای گەورە نەجاشی لەو شەڕەدا سەر خست و سەربەرزو شکۆمەندی کرد، وە دوژمنەکەی

(٢٢٠) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٣٠٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

تێکشکاند و سەر تاسەری موڵکی حەبەشە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی نەجاشی، ئێمەش لەوێ بووین لە چاکترین جێگەدا تا گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ)[٢٢١].

سەبارەت بە کۆچکارانی ئەشعەری یەمەن کاتێك بەرگوێیان کەوتبوو کە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ لە شاری مەککەیە، ئەوان بە کەشتی ڕێکەوتبوون تا بگەنە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵام خوای گەورە ڕێگای بەرەو لای حەبەشە بردبوون لەگەڵ کۆچکارانی تردا لە دوای ڕزگارکردنی شاری خەیبەر هەموو پێکەوە گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (هەواڵەکەمان پێگەیشت کە خوای گەورە پێغەمبەرێکی ناردووە ﷺ لە شاری مەککە، وە ئێمەش لە یەمەن بووین ویستی کۆچکردنمان هەبوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە دوو برای بچوکم لەگەڵدا بوو یەکێکیان ناوی ئەبو بوردە بوو، ئەوی تریان ناوی ئەبو ڕەهم بوو، لەگەڵ پەنجاو دوو یان پەنجاو سێ لە ئەشعەرییەکانی یەمەن (لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت (پەنجا کەس لەئەشعەریەکان بووین لەگەڵ شەش کەس لە هۆزی عوکی یەمەن)[٢٢٢].

(دەفەرموێت): سواری کەشتیەکە بووین بەڵام بەرەو نەجاشی حەبەشە گەیاندینی لەوێ چووین پەیوەندیمان بەجەعفەرو هاوەڵەکانیەوە کرد، جەعفەر پێی ڕاگەیاندین و وتی: پێغەمبەر ﷺ خۆی ئێمەی ناردووە بۆ ئەم جێگەیە وە فەرمانی پێکردووین لێرە بمێنینەوە. ئێوەش لەگەڵماندا بمێننەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ ئیزنمان دەدات. ئێمەش لەگەڵیاندا ماینەوە تا هەموومان سەرجەم وەکو دوا کۆمەڵی کۆچکاران گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەرﷺ لە شاری مەدینە کاتێ قەڵای خەیبەر ڕزگارکرا بوو)[٢٢٣].

---

(٢٢١) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٨٥/١) (٢٨٨)، وقال محققاه: إسناده حسن، و حسن إسناده ايضا الشيخ الألباني رحمه الله في (صحيح السيرة) (١٨١).

(٢٢٢) أخرجه: ابن حبان (الصحيح) (٧١٩٤) وقال محققه: إسناده على شرط مسلم.

(٢٢٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٢٣٠)، ومسلم (الصحيح) (٢٥٠٢).

## پاداشتی کۆچکردنی هاوەڵانی حەبەشە

سەبارەت بەو هەموو دوورە وڵاتی و ناڕەحەتی و ناهەمواریەی کە کۆچکاران، (جەعفەرو هاوەڵانی) تووش هاتبوون بێ گومان پاداشتی کۆچکردنیان دووجار بۆ دەنووسرێت بەرامبەر کۆچکارانی شاری مەککە بۆ شاری مەدینە، ئەمەش بە جوانی دەردەکەوێت لەبەسەر هاتی ئەسمائی کچی عومەیر ﵂ کە کاتێ ئیمامی عومەر ئەوی بینی وتی: ئێوە کەسانی ئەهلی کەشتیەکەن کە گەڕاونەتەوە لە حەبەشە؟ ئەویش وتی: بەڵێ، ئیمامی عومەر ﵁ وتی: ئێمە پێش ئێوە لای پێغەمبەر ﷺ بووین لەبەر ئەوە ئێمە شایستە تر و نزیکترین لەپێغەمبەر ﷺ، ئەسمائیش دڵی پڕبوو وتی: ئێوە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا بوون، یارمەتی دەدان و بەسەری دەکردنەوە و نەزانەکانتانی فێردەکرد، بەڵام ئێمە لە وڵاتێکی دوور لە پێغەمبەر ﷺ بووین وە نەزان و داماو بووین، وەڵاهی دەچم شکاتی خۆم دەگەیەنمە پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو چوو بۆی گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا بۆ ڕوونکردنەوەی پلەوپایەی کۆچکارانی بەڕێزی ئەشعەری و حەبەشە پێی ڕاگەیاندو فەرمووی: ((لَيسَ بأَحَقَّ بِي مِنكُمْ، وله ولِأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ واحِدَةٌ، ولَكُمْ أنتُمْ - أَهْلَ السَّفِينَةِ - هِجْرَتَانِ، (هاجَرْتُم إلى حَبَشَة وَهَاجَرْتُم إليَّ)) واتە: عومەر لەئێوە شایستەتر نییە وە نزیکتر نییە لە من، عومەرو هاوەڵانی تەنها یەك کۆچیان بۆ هەیە، بەڵام ئێوە کە لە کەشتیەکەدا هاتوون دوو کۆچتان بۆ هەیە کۆچتان کردووە بۆ حەبەشەو لەوێشەوە کۆچتان کردووە بۆلای من)[٢٢٤].

## موسوڵمان بوونی حـەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب ﵁

هیچ گێڕانەوەیەکی (صحیح) یان (حسن) نەهاتووە سەبارەت بە ڕوون کردنەوەی چۆنێتی موسوڵمان بوونی حمزە ﵁ تەنها گێڕانەوەیەکی (ضعیف) هەیە کە(مرسل)ە ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (جارێکیان ئەبو جەهل تێپەڕی بەلای پێغەمبەردا ﷺ لای (صفا) و ئازاریدا و جوێنیشی پێدا و زۆر ڕەخنەی لە خۆی و ئاینەکەی گرت، پێغەمبەر ﷺ بەهیچ جۆرێك وەڵامی نەدایەوە، بەڵام یەکێك لەخزمانی خۆی گوێی لەم باسە بوو دواجار ئەبو جەهل ئەو جێگەیەی بەجێ هێشت و چوو بۆ کەعبە

(٢٢٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٧٦،٤٢٣٠)، ومسلم (الصحيح) (٢٥٠٢).

بۆ لای یەکێك لەکۆڕی دانیشتنەکانی ئەشراف و مەلەئی قورەیش لەوێ دانیشت و کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا، ئینجا حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب ئەوەندەی پێ نەچوو لەڕاو گەڕایەوە و کەوانەکەی بەسەر شانەوە بوو، وە هەرکاتێکیش بگەڕایەتەوە عادەتی وابوو ئەچوو تەوافی بەچوار دەوری کەعبەدا دەکرد، پاشان دەچوو بۆ لای کۆڕی دانیشتنەکانی قورەیش، قسەی لەگەڵ دەکردن و دەگەڕایەوە بۆ ماڵ (وەحەمزەش ﷺ یەکێك بوو لە هەرە ئازا و قارەمانەکانی پیاوانی عەبدل مەناف وە مامی پێغەمبەر ﷺ بوو).

بەم شێوەیە ئەو ڕۆژە گەڕایەوە و کەوانەکەی لەسەر شان بوو وە تێپەڕی بەلای هەندێك لە خزمەکانیدا و یەکێك لەخزمانی پێی وت: ئەوە بۆ کوێ دەچێت ئەبو عەممار؟ وەڵاهی ئەگەر ئەبو جەهلت دەبینی ئێستا چی وت وچی کرد بە موحەممەدی برازات و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، حەمزەش تووڕەبوو وە بەپەلە ڕۆیشت و لای هیچ کەسێك نەوەستا تاچوو بۆلای کەعبە و تەماشای کرد تابزانێت ئەبو جەهل لەکوێدا دانیشتووە و چووە لای نزیکی سەریەوە وەستا تاهێزی تیا بوو کەوانەکەی کێشا بەسەریدا پاشان فەرمووی: تۆ چۆن ئەتوانیت جوێن بدەیت بەموحەممەد کاتێ کەمن لەسەر ئاینی ئەوم، ئەوەی ئەو دەیڵێت منیش هەر ئەوە دەڵێم، ئەگەر دەتوانیت هەستە تۆڵەی خۆت بسێنە (دەفەرموێت): هەندێ لەپیاوانی بەنی مەخزوم کە خزمی ئەبو جەهل بوون هەستان بۆ ئەوەی پشگیری لەئەبو جەهل بکەن و دژایەتی حەمزە بکەن، ئەبو جەهل وتی: واز لە ئەبو عەممار بهێنن وەڵاهی ڕاست دەکات ئەمڕۆ جوێنێکی یەکجار زۆرم داوە بەبرازاکەی بەم شێوەیە حەمزە لەسەر موسوڵمانێتی خۆی بەردەوام بوو).

ئینجا قورەیش زانیان کەحەمزەش چۆتە ڕیزی پێغەمبەر ﷺ ئەمڕۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی چەند پیاوانێکی وریاو بەهێزو بەتوانایان لەگەڵدایە[٢٢٥].

---

(٢٢٥) أنظر: سيرة ابن هشام (السيرة) (٣٢٠/١) (٢٠٨) وقال محققاه: إسناده ضعيف، والطبراني في (المعجم الكبير) (٢٩٣٦)،والطبري في (التأريخ) (٣٣٣/٢)، والحاكم (المستدرك) (١٩٢/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٢١٣/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٧٠/٩):رواه الطبراني مرسلاً ورجاله ثقات، (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

## موسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئیمامی عومەر موسوڵمان بوو لەدوای کۆچی دووەم بۆ حەبەشە) سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ سی و سێ پیاو لەگەڵ شەش ئافرەت لەخزمەت پێغەمبەر ﷺدا موسوڵمان بوون جگە لەوانەی کەکۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە، ئینجا خوای گەورە ئیمامی عومەری ﷺ هیدایەت دا)[٢٢٦]. ئیمامی عومەر لەهەرە دوژمنە سەر سەختەکانی ئیسلام بوو بەتایبەتی خودی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە زاوای بەڕێزی خۆی سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەفەرموێت: (وەڵاهی گەر چاوت لێ دەبوو چۆن عومەر منی دەبەستەوە لەسەر ئیسلام بوونم پێش ئەوەی موسوڵمان ببێت)[٢٢٧].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (عومەر من و خوشکەکەی دەبەستەوە لەسەر موسوڵمان بوونمان و ئازاری دەداین پێش ئەوەی موسوڵمان بێت)، پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەموسوڵمان بوونی ئیمامی عومەر ﷺ داوای کرد لەخوای گەورە کە یەك لەو دوو عومەرە هیدایەت بدات: ئەبو جەهل (کەناوی عومەری کوڕی هیشامە) یان عومەری کوڕی خەطاب. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوا دەکرد و دەی فەرموو: ((اللهمَّ أعِزَّ الإسلامَ بأحبِّ هذين الرجُلين إليك بأبي جهلٍ أو بعمرَ بنِ الخطابِ)) واتە: خوایە ئیسلام سەر بەرز بکەیت بەیەکێك لەم دوانە لای تۆ یان بە ئەبو جەهل یان بە عومەر. ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: خۆشەویسترینیان لای خوا عومەر بوو کە خوا ڕێنمویی کرد)[٢٢٨].

پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی داوای بۆ خودی عومەر کردووە کەخوای گەورە ڕێنمویی بکات وموسوڵمان ببێت و ئیسلامی پێ شکۆمەند ببێت، لە عائیشەوە ﷺ دەفەرموێت:

---

(٢٢٦) أخرجه: ابن أبي حاتم بسندٍ صحيح كما قال السيوطي في (لباب النقول) (ص:١١٣).

(٢٢٧) أخرجه: البخاري (٣٨٦٧).

(٢٢٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٩٥/٢) وفي (الفضائل) (٣١٢) وقال محققه: إسناده حسن، والترمذي (٣٦٨٤،٣٦٨٢) وقال: حسن صحيح غريب، وابن ماجه (السنن) (١٠٥)، والطبراني في (الكبير) (١١٦٥٧)، وابن سعد في (الطبقات) (٢٦٧/٣)، والحاكم (المستدرك) (٨٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٢١٥/٢)، وابن حبان (الصحيح) (١٦٨٨)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٦١/٩) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٩٠٧) و (المشكاة) (٦٠٣٦).

پێغەمبەرﷺ لەدوعاکەیدا دەیفەرموو: ((اللَّهمَّ أعِزَّ الإسلامَ بعمرَ بنِ الخطَّابِ)) واتە: (خوایە ئیسلام سەر بەرز بکەیت بەموسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەطاب)[٢٢٩] لەڕیوایەتێکی تردا ئیمامی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێش ئەوەی خوای گەورە ڕێنماییم بکات و موسوڵمان ببم چوم بۆ ئەوەی ڕێ بگرم بە موحەممەد بینیم پێش من چۆتە لای کەعبە منیش لەپشتییە وە وەستام، ئینجا دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی (الحاقة) لەناو نوێژەکەیدا منیش سەیرم لێهات یەکەم جارە کە قورئان دەبیستم ئەم قسانە چەندە جوانن! چۆن ڕیز کراون، کە گوێم لێ گرت وتم: وەڵاهی ئەمە ئەو شاعیرەیە کەقورەیش باسی دەکات دەفەرموێت ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾﴾(الحاقة) واتە: وتەی نێراوێکی بەڕێزە لەلایەن خواوە ئەمە قسەی شاعیر نییە، تا ئێوە کەمتان باوەڕی پێدەهێنن دەفەرموێت: قورئانی دەخوێند تاگەیشتە ئەوەی کە من وتم وەڵاهی ئەمە فاڵ چییە ئینجا ئەویش ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾﴾(الحاقة) دەفەرموێت: (تا کۆتاییەکەی تەواو کرد ئیسلام چووە دڵمەوە و جێگیر بوو لەدڵمدا)[٢٣٠].

لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمان بوونی عومەر وەك پێم گەیشتووە ئەوە بوو کەفاتمەی کچی خەطاب لای سەعیدی کوڕی زەید بوو هەردووکیان پێکەوە موسوڵمان بوو بوون بەنهێنی ئیسلامەتی خۆیان ئەنجام دەدا بۆ ئەوەی کەس پێیان نەزانێت، نوعەیمی کوڕی عەبدوللا پیاوێك بوو لەخزمانی ئیمامی عومەر موسوڵمان بوو بوو بەپەنهانی، وە ئیسلامەتی خۆی جێبەجێ دەکرد، (دەفەرموێت) خەباب هاتووچۆی سەعید و فاتیمەی دەکرد و قورئانی بۆ دەخوێندنەوە، ئەو ڕۆژە ئیمامی عومەر شمشێرەکەی لەخۆی بەست و دەیویست هەڵکوتێتە سەر پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی کە کۆبووبوونەوە لای سەفا، وە پێی گەیشت بوو کەژمارەیان لەدەوری چەند کەسێکدایە، لەژن و لە پیاو لەگەڵ ئەوەشدا باش دەیزانی کە حەمزە موسوڵمان بووە لەگەڵ ئەبو بەکرو ئیمامی

(٢٢٩) أخرجه: الحاكم (٨٣/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

(٢٣٠) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٠٧) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف لإنقطاعه، وأحمد في (الفضائل) (٣٧٤) وقال محققه: إسناده فيه إنقطاع و تدليس، وابن أبي شيبة (١٠٣/١٤)، وابن هشام في (السيرة) (٣٦٥/١)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٦٢/٩) (١٤٤٠٧): رواه أحمد ورجاله ثقات إلاّ ان شريح لم يدرك عمر، واللفظ لإمام أحمد في المسند (ئەمەش تەنها بۆ زانياريتان هێناومە).

علی وە چەند پیاوێکی تر لەموسوڵمانان لەوانەی کە کۆچیان نەکردبوو بۆ حەبەشە دەفەرموێت: کە عومەر ڕۆیشت بەرەو بازاڕ بۆ ئەو شوێنە بچێت نەعیمی پێ گەیشت وتی: ئەوە دەتەوێ بۆ کوێ بچیت؟

ئیمامی عومەر ﷺ وتی: دەمەوێت بچم بۆ لای ئەو بێ دینە کە قوڕەیشی پارچە پارچە کردووە، وە ڕەخنەی لە ئاینمان گرتووە و جوێنی بەخواکان داوە بۆ ئەوەی بیکوژم، نەعیم وتی: وەڵاهی عومەر لە خۆت بایی بوویت بۆ تۆ وا دەزانیت کوڕانی عەبدل مەناف وازت لێ دەهێنن تۆ بەسەر زەویدا بڕۆیت دوای کوشتنی موحەمەد؟ نەخێر هەرگیزاو هەرگیز ئەوە بە تۆ ناکرێت، ئەی تۆ بۆ ناچیتەوە بۆلای هەندێ لە خزمانت بڕۆ خزمانی خۆت چاك بکە پێش ئەوەی بچیت ئەوان چاك بکەیت؟ وتی: کێ لەخزمانم چاك بکەم؟ وتی: بچۆ بۆ لای زاواکەت و خوشکەکەت ئەوانە موسوڵمان بوون لەسەر ئاینی موحەمەدن، ئەگەر ئازایت بچۆ بۆ لای ئەوان، دەفەرموێ: عومەر گەڕایەوە بۆ ماڵی خوشکەکەی لەوکاتەدا خەباب پارچە سەحیفەیەکی پێ بوو قورئانی تیابوو دەیخوێندەوە بۆ یان کاتێ گوێیان لەتەقەی دەرگا بوو زانیان کەعومەر هاتووە ئەوانیش خەببابیان شاردەوە لە هەیوانێکدا، ئینجا فاتیمەی کچی خەطابیش ئەو پەڕە قورئانەی خستە ژێر ڕانییەوە، وە عومەر گوێی لێبوو کەنزیکی ماڵەکە بووە وە یەکێك لەماڵەوە قورئان دەخوێنێت، گوێی لەقورئان خوێندنەکە بوو کە کاتێ هاتە ژوورەوە وتی: ئەو دەنگە دەنگە چی بوو گوێم لێ بوو؟ ئەوانیش وتیان: گوێت لەهیچ نەبووە، وتی: نەخێر وەڵاهی پێم دەڵێن و پێشم وتراوە کە ئێوە چونەتە سەر ئاینی موحەمەد.

ئینجا عومەر یەك زلەیدا لەمێردەکەی کەناوی سەعیدی کوڕی زەید بوو ئامۆزای خۆی بوو، ئینجا خوشکەکەی هەستا دەستی بگرێت، عومەر زلەیەکی تری لەخوشکەکەیدا دەم و لێوی پڕ کرد لەخوێن، هەر دووکیان وتیان: بەڵێ موسوڵمان بووین ئەی عومەر باوەڕمان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، چیشت لەدەست دێت درێغی مەکە، عومەر کە خوێنی بینی بە ڕووی خوشکەکەیەوە پەشیمان بووەوە و بە خوشکەکەی وت: ئەو پارچە قورئانەم بدەرێ تا بزانم ئەوە چی بوو کە گوێم لێ بوو دەخوێندرایەوە تا منیش بیخوێنم (دەفەرموێ: عومەریش خوێندەوار بوو) ئینجا خوشکەکەی پێی وت: ئێمە دەترسین کە ئەو صەحیفەیەمان نەدەیتەوە؟ وتی: نەخێر

و سوێندی خوارد بە بتەکانی خۆی کەدوای خوێندنەوەی پەڕەکەی دەیگێڕێتەوە بۆ خوشکەکەی، خوشکەکەشی هیوای وابوو کە موسوڵمان ببێت وپێی وت: براکەم تۆ پیسی چونکە موشریکی نابێت دەست لەم قورئانە بدەیت تا پاك نەبیت بچۆ خۆت بشۆرە عومەریش چوو خۆی شت، دوایی هاتەوەو پارچە صەحیفەکەی بە دەستەوە گرت سورەتی (طه)ی تیا بوو سەرەتاکەی خوێندەوە فەرمووی: ئەم وتەیە چەندە جوانە.

خەباب کە گوێی لەمە بوو هاتە دەرەوە بۆلای و وتی: ئەی عومەر من هیوام وایە کە خوا تایبەتی کردبێت بەدوعای پێغەمبەرەکەی، من گوێم لێبوو دوێنێ پێغەمبەری خوا دوعای بۆ دەکردیت و دەیفەرموو (خوایە پشتگیری ئیسلام بکەیت بەموسوڵمان بوونی ئەبو جەهل یان عومەر)، ئەی عومەر لەکیسی خۆتی مەدە لەوکاتەدا عومەر فەرمووی: ئەی موحەمەد لەکوێ یە تا بچم موسوڵمان ببم؟ خەبابیش شوێنەکەی پێ وت: عومەریش بەرێکەوت بۆ ئەو جێگەیە و تەقەی لە دەرگا دا، موسوڵمانان گوێیان لە تەقەی دەرگاکە بوو پاشان پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەستاو لە کونی دەرگاکەوە سەیری کرد ئەوە عومەرە بە شمشێرەکەیەوە هەڵی کوتاوەتە سەرمان، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئەوە عومەرە و شمشێرەکەی بە دەستەوەیە هاتووە بۆ ئێرە، حەمزە ﷺ فەرمووی: ڕێگەی پێ بدە بابێتە ژوورەوە ئەگەر بۆ چاکەیەك هاتبێت ئەوا یارمەتی دەدەین وە ئەگەر بۆ کاری خراپەش هاتبێت بە شمشێرەکەی خۆی سەری دەبڕین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕێگەی بێدەن تا بێتە ژوورێ پاشان هاتە ژوورەوە و پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەو شوێنەی کە عومەر لێی هاتە ژوورەوە وە عومەری بەرچاوکەوت هەر دوویەخەی گرت بە توندی و هەژاندی و پێی فەرموو: ((ما جاءَ بِكَ يا ابن الخَطَّاب فَوَ اللهِ ما أرى أنْ تَنْتَهي حَتى يُنزِلَ اللهُ بِكَ قارِعَةً)) واتە: چی وای لێکردیت بێیت بۆ ئێرە ئەی کوڕەکەی خەطاب وەڵاهی وابزانم واز ناهێنیت تا خوا غەزەبی خۆیت پێ نەگەیەنێت.

عومەریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنم بە خواو بە پێغەمبەرەکەی وە بەوەی کەلەلایەن خواوە هاتووە بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەریش ﷺ وتی: (الله أكبر) و هەموو هاوەڵەکانی ناو ماڵەکە گوێیان لێ بوو وە پێیان گەیشت کە عومەر موسوڵمان بووە وە دوا بەدوای موسوڵمان بوونی عومەر سەربەرزتر بوون

لەناو کۆمەڵانی قورەیش دا، قورەیشیش چاك دەیانزانی دوو پاڵەوانی زۆر ئازا کە عومەرو حەمزەیە چوونەتە ڕیزی موسوڵمانان لەمەودوا دەبێت حسابێکی تایبەتیان بۆ بکرێت)[٢٣١].

دوا بە دوای موسوڵمان بوونی ئیمامی عومەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد کە خوا ئیسلام جێگیر بکات لە دڵیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بەسەر سنگی عومەردا و سێ جار فەرمووی: ((اللهمَّ أخرجْ ما في صدرِ عمرَ من غِلٍّ وأبدِلْه إيمانًا))[٢٣٢] واتە: خوایە ئەوەی لە سنگی عومەردا هەیە لە ڕق و کینە دەری بهێنە و شوێنەکەی پڕبکە لە باوەڕ).

لەڕیوایەتێکی تردا ڕوونکراوەتەوە کەوا عومەر چۆن ئیسلام بوونی خۆی ئاشکرا کردوە لای هەموو کافرانی قورەیش وە سەرەتا لای خزمی خۆی ئەبوجەهل (بەڵام ئەم ڕیوایەتەش لاوازە لە ئیمامی عومەرەوە خۆی دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (کاتێ ئەو شەوەی موسوڵمان بووم بیرم کردەوە کێ لە هەموو کەسانی دانیشتووی شاری مەککە دوژمن ترە بۆ پێغەمبەر ﷺ تابچم هەواڵی ئیسلام بوونی خۆمی پێ ڕابگەیەنم بیرم کردەوە وتم: کەسی دوژمن تری تیا نییە لە ئەبوجەهل (کە دایکی ناوی حەنتەمەی کوڕی هیشامە) واتە: بە خزمایەتی دەگەنەوە بەیەك).

دەفەرموێت: بەرەبەیان کەوتمەڕێ تا گەیشتمە لای دەرگاکەی ماڵی ئەبوجەهل و لەدەرگاکەم دا و ئەبو جەهل دەرگاکەی کردەوە و وتی: مەرحەبا ئەی برازای بەڕێز بەم سەر لە بەیانییە چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ وتم: هاتووم تا پێت بڵێم کە باوەڕم بەخوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە و بەڕاستم خستۆتەوە ئەو ئاینەی کە بۆی هاتووە، ئەبوجەهلیش دەرگاکەی بەڕوومدا داخست و وتی: خوا ماڵت وێران بکات و ماڵی

---

(٢٣١) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٦٢/١)، و له شواهد عند ابن سعد (٢٠٢/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٢١٩/٢)، والبزار (٢٤٩٣)، والطبراني في (معجم الأوسط) (١٨٨١)، وأحمد في (الفضائل) (٣٧١) وقال محققه: إسناده منقطع، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٩٤) و فيه متروك، وقال الدار قطني (١٢٣/١): فيه (القاسم) ليس بقوي، وقال القرطبي في (الإستيعاب) (٢/٢): خبر حسن، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٦٦/٩): رواه البزار و فيه أسامة بن زيد بن أسلم، وهو ضعيف، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (١٨٠/١): رواه ابن سعد والبيهقي بإسناد فيه ضعف و متنه منكر ورواه أحمد في الفضائل بإسناد فيه ضعيفان، (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

(٢٣٢) أخرجه: الطبراني في (المعجم الكبير) (١٣١٩١) وفي (الأوسط) (١١٠٠)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (١٤٤١٧): رواه الطبراني في المعجم الأوسط ورجاله ثقات

ئەوەش وێران بێت کەپێی هاتوویت..)[٢٣٣].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمویێت: (دوای موسوڵمان بوونی عومەر ﷺ به پێغەمبەری ﷺ فەرمووو: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا هەر کۆڕ و هەر کۆمەڵێك کافرێتی خۆمم تیا ئاشکرا کرد بێت دەبێت ئیسلام بوونی خۆمی تیا ئاشکرا بکەم)[٢٣٤].

ئەوە بوو ئیمامی عومەر ﷺ ڕاستی ئەم گفتەی خۆی بە چاکی و ئازایانە هێنایە دی بێ ترس و موسوڵمان بوونی خۆی ئاشکراکرد، و ئەم بەسەرهاتە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوە دەفەرمویێت: (کاتێ باوکم موسوڵمان بوو وتی: دەبێ کێ لە هەموو قوڕەیش زیاتر دەم نەوەستا و تربێت و قسە بگێڕێتەوە لای خەڵك گەڕا بەدوای ئەو کەسەکەدا و پێیان وت: تا کە کەسێك ئەم ئیشە بکات ناوی جمیلە، عومەریش بەیانی کەوتەڕێ بۆلای جەمیل بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە، عەبدوڵلا ﷺ دەفەرمویێت: منیش بەدوای باوکمدا چووم وە منیش منداڵێکی عاقڵ و زیتەڵ بووم هەرچیەکم ببینیایە لەبەرم دەکرد وتێدەگەیشتم (دەفەرمویێت) بەدوایدا چووم تا جەمیلی دۆزیەوە و پێی وت: ئەی جەمیل دەزانیت موسوڵمان بووم و چوومەتە سەر دینی محمد، (دەفەرمویێت) وەڵاهی کە ئەمەی وت: جەمیل یەکسەر وەڵامی نەدایەوە هەستاو ڕای کرد و هاواری دەکرد بە دەنگی بەرز بەجۆرێك کە، (هەموو دانیشتووەکان ئاگایان لێ بوو سەیریان دەکرد) ئەویش دەیوت: هۆ کۆمەڵی قوڕەیش ئاگاداربن عومەر بێ دین بووە لە دینی لات و عوزا لای داوە)، وە عومەریش لە پشتییەوە بوو پێی دەوت:

درۆت کرد نەخێر وەڵاهی من موسوڵمان بووم و شایەتیم داوە کە تەنها هەر (الله) خوایە، وە موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، هەر ئەمەی وت: هەرچی لەوێدا بوون لە قوڕەیش هەستان بۆ عومەر وە عومەریش چوو بۆیان و بوو بە شەڕ ئەم لێی ئەدان و ئەوانیش لێ یان ئەدا، تاکو نزیکی نیوەڕۆ ئەمە بەردەوام بوو، عومەر هەر خۆی بوو تاقەتی نەمابوو لە لێدان ئەوەندەی لێ دابوون و لێیان دابوو کەوتبوو، ئەوانیش لەقەیان پیادەکێشا و بۆکسیان پیادەکێشا، ئەویش لە ژێرەوە دەیوت: چی

(٢٣٣) أنظر: سيرة ابن هشام (السيرة) (٣٦٦/١) (٢٣٧) وقال محققاه: إسناده ضعيف، وأحمد في (الفضائل) (٣٧٥) وقال محققه: منقطع ورجاله ثقات. (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

(٢٣٤) أخرجه: الطبراني في (المعجم الأوسط) (١٣١٥)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٤٤١٥): رجاله ثقات.

دەکەن بیکەن سوێند دەخۆم بە خوا، ئەگەر سێ سەد کەسمان لەگەڵ دابووایە پێمان چۆڵ دەکردن، یان بۆمان چۆڵ دەکردن، ئەوانیش ئەوەندەیان لێدا تاکو پیاوێکی پیر لە قورەیش کە جلێکی خەتخەتی لەبەردابوو، لەگەڵ کراسێکی خەت خەتاوی لەلای سەریانەوە وەستا، وتی: ئەوەچی دەکەن؟ وتیان: عومەر بێ دین بووە، ئەویش وتی: وازی لێ بێنن پیاوێکە دینێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە چیتان لێی دەوێت، وادەزانن کوڕانی بەنی عەدی کوڕی کەعب ئەمە تەسلیم بە ئێوە دەکەن بیکوژن و تۆڵەتان لێ ناکەنەوە؟ دەفەرموێت: وەڵاهی وەکو جلێك درابێت بەسەر عومەردا هەمووی لێی دوورکەوتەوە، دوای ئەوەی کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە وتم: باوکە ئەو ڕۆژەی کە تۆ موسوڵمان بوونی خۆتت ڕاگەیاند و شەڕت لەگەڵ کافراندا کرد لە لای کەعبە پیاوێك هات و هەمووی لێ دوورخستیتەوە ئەو پیاوە کێ بوو؟ فەرمووی: کوڕم ئەوە عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بوو)[٢٣٥].

بەم شێوەیە ئیمامی عومەر ﷺ موسوڵمان بوونی خۆی بەبێ ترس بەهەموو کافرانی قورەیش ڕاگەیاند... ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەس کە ئیسلام بوونی خۆی بەئاشکرا ڕاگەیاند عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بوو)[٢٣٦].

بەم شێوەیە خوای گەورە ئیسلامی شکۆمەندتر کرد بەموسوڵمان بوونی ئیمامی عومەر ﷺ، ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (وەڵاهی شکۆمەند و سەربەرز بووین لەو کاتەی کە خوای گەورە ڕێنمویی ئیمامی عومەری کرد بۆ ئیسلام)[٢٣٧].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وەڵاهی هیچمان نەمان دەوێرا نوێژ بکەین لای کەعبە هەتا ئەوکاتەی عومەر موسوڵمان بوو، کاتێ عومەر موسوڵمان بوو دژایەتی

(٢٣٥) أنظر: سيرة ابن هشام (السيرة) (٣٦٦/١) (٢٣٩) وقال محققاه: إسناده حسن، وأحمد في (الفضائل) (٣٧٢) وقال محققه: إسناده حسن، والبزار (٢٤٩٤)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٨٣)، والحاكم (المستدرك) (٨٥/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٦٨٧٩) وقال محققه: إسناده قوي رجاله ثقات، وقال الحافظ ابن كثير في (البداية) (٨٢/٣): إسناده جيد قوي، وقال الهيثمي في (المجمع) (٦٥/٩): رجاله ثقات إلاّ أن ابن إسحاق مدلس، وحسنه العدوي في (الصحيح المسند من فضائل الصحابة) (٨٢).

(٢٣٦) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٠٨٩٠)، وقال الهيثمي في (المجمع رقم) (١٤٤١٢): رواه الطبراني و إسناده حسن، و حسن إسناده الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٩٣).

(٢٣٧) أخرجه: البخاري (٣٨٦٣،٣٨٦٤)، وأحمد في (الفضائل) (٣٦٨) وقال محققه: إسناده صحيح، والطبراني في (الكبير) (٨٨٢١)، وأبو نعيم في (الحلية) (٢١١/٨)، والحاكم (المستدرك) (٨٤/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٢١٥/٢)، وابن حبان (الصحيح) (٦٨٨) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري.

کردن تا وازیان لێ هێنایین ئازادانە نوێژی خۆمان لەپێش چاوی ئەوان لای کەعبە ئەنجام دەدا)[٢٣٨]، هەروەها دەفەرموێت: (موسوڵمان بوونی عومەر سەرکەوتن بوو، وە سەرۆکایەتی و خەلیفایەتیەکەشی بەزەیی بوو وەڵاهی نەمان دەتوانی نوێژ بکەین لای کەعبە تاکو خوای گەورە ڕێنمونی عومەری کرد...)[٢٣٩].

سەبارەت بەموسوڵمان بوونی ئیمامی عومەر ﵁، سەعیدی کوڕی جوبەیر ﵁ دەفەرموێت: (کاتێ سی و سێ پیاو و شەش ئافرەت هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وموسوڵمان بوون ئینجا عومەر موسوڵمان بوو وە ئەم ئایەتەش دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ ﴾(الأنفال) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا پشت و پەنات هەر خوایە پاشان ئەو بڕوادارانەی کە شوێنت کەوتوون.

## چوونە ناو ئیسلام سەرەڕای دژایەتی کردن و ئازاردان

سەرەڕای ئەو هەموو ڕێگرتن و هێرشانە دژ بە موسوڵمانان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ خەڵکی دەرەوەی شاری مەککە هاتن و موسوڵمان بوون، قورەیشیەکانیش دوای ئەو هەموو ئەشکەنجەدان و ئازار و پڕوپاگەندە و ناشرینکردن و ئابڕووبردن و بوختان کردنە دژ بە موسوڵمانان و هەموو ئەو شتانە، بەڵام خەڵك پێیان هەڵ نەئەخەڵەتان و هەندێکی تر موسوڵمان بوون و خوای گەورە ڕێنمویی کردن بۆ ئیسلام لەوانەش:

## (١) موسوڵمان بوونی ئەبو زەڕی غەفاری ﵁:

ئەبوزەڕ یەکێکە لە هاوەڵە دێرین و بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ کەپیاوێکی خێڵەکی بوو لەبەنی غەفار ناوی جوندوبی کوڕی جەنادەیە کە بەناو بانگە بە ئەبو زەڕ، پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت: ((ما أَظَلَّتِ الخَضراءُ، ولا أَقَلَّتِ الغَبراءُ، مِن ذي لَهجةٍ أَصدَقَ مِن أبي ذَرٍّ))[٢٤٠] واتە: (تا ئێستا زەوی نەیگرتووەتە خۆ وە درەخت سێبەری

---

(٢٣٨) أخرجه: ابن سعد في (الطبقات) (٢٧٠/٣)، و صحح إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٧٨/١)، وأخرجه: الحاكم (المستدرك) (٨٢/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني في (المعجم الكبير) (٨٨٠٦).

(٢٣٩) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٨٨٢٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٤٤١١): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح إلّا أن القاسم لم يدرك جده ابن مسعود، وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:١٨٨): إسناده حسن وهو منقطع.

(٢٤٠) أنظر: صحيح الجامع (٥٥٣٧).

نەکردووە بەسەر ڕاستگۆتر لە ئەبو زەڕ). بەنو غەیفار چەتە و دزبوون ڕێگەیان بە حاجیەکان دەگرت و ڕووتیان دەکردنەوە وە ناوبانگیان بە دز و چەتە دەرکردبوو، سەبارەت بە موسوڵمان بوونی ئەبو زەڕ ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

**ڕیوایەتی یەکەم:** (من پیاوێك بووم لە بەنی غەففار پێمان گەیشتبوو کە پێغەمبەرێك خوای گەورە ناردوویەتی لە شاری مەککە، پیاوێکە پێغەمبەرایەتی خۆی ڕادەگەیەنێت منیش بە براکەمم وت: (وەرە سواربە بچۆ بۆ ئەو شیوە (واتە: شاری مەککە) هەواڵی ئەو کابرایەم بۆ بهێنەرەوە کە پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرە وە هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت بچۆ و گوێ بۆ قسەکانی بگرە و پاشان هەواڵەکەم بۆ بهێنەرەوە)[٢٤١].

خێرا براکەم کەوتە ڕێ تا گەیشتە ئەو پێغەمبەرە، کە گەڕایەوە لێم پرسی و وتم: چی بوو؟ وتی: وەڵاهی پیاوێکم بینی فەرمانی بە چاکە دەکرد و ڕێگەی دەگرت لە خراپە وە خوڕەوشت جوانی بڵاودەکردەوە قسەکانی هیچی لە شیعر ناچێت، منیش پێم وت: هەر ئەمەیە وەڵامەکەت؟ وەڵاهی وەڵامی چاکت بۆ نەهێناومەتەوە، منیش گۆچانێکم هەڵگرت لەگەڵ چارۆکەیەك و مەشکۆڵەیەك ئاو بەرەو شاری مەککە چووم بەڵام پێغەمبەرم ﷺ نەدەناسی وە نەشم دەوێرا لەکەس پرسیار بکەم، لەوێ لای بیری زەم زەم لامدا و ئاوم خواردەوە و لای کەعبە مامەوە تاکو شەوم بەسەردا هات.

ئیمامی عەلی ﷺ بەلامدا تێپەڕی و پێی وتم: ئەڵێی پیاوێکی غەریبی؟ منیش وتم: بەڵێ، وتی: دەبا بچینەوەماڵەوە، منیش لەگەڵیدا چوومەوە نە ئەو هیچ پرسیارێکی لێکردم و نەمنیش دەموێرا هیچ پرسیارێکی لێبکەم و هیچی بۆ بگێڕمەوە، کە ڕۆژم لێ بووەوە ماڵئاواییم لێ کرد و چوومە وە بۆ لای کەعبە بۆ ئەوەی یەکێکم دەست کەوێت پرسیاری لێبکەم کەسیش پێی نەدەوتم چییەو لە کوێیە؟ تاکو شەوی دووەم بەو شێوەیە بەسەردا هاتەوە دیسان ئیمامی عەلی هاتەوەو میوانداری کردمەوە وە ڕۆژی سێیەمیش هاتەوە سەیری کردم من هەر لە جێی خۆمم پێی وتم: ئەوە چییە؟ ئەڵێی هەر غەریبیت؟ وتم: بەڵێ، کە تێپەڕی بەلامدا وتی: باشە

---

(٢٤١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٥٢٢) والحاكم (المستدرك) (٣٨٨/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

ئەم پیاوە نازانێ جێگەی خۆی کوێیە و بۆچی هاتووە؟ منیش وتم نەخێر، وتی: وەرە لەگەڵمدا منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم وچوومەماڵەوە، ئینجا لەماڵەوە پێی وتم: ئەرێ باشە تۆ چیت و بۆچی هاتوویت و چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ منیش وتم: ئەگەر لای کەس باسی نەکەیت من بۆت دەگێڕمەوە بۆچی هاتووم...

(لەڕیوایەتیکی تردا) ئەگەر تۆ پەیمانم بدەیتێ ئەوەی من دەمەوێت بۆم بدۆزیتەوە ئینجا منیش پێت دەڵێم بۆچی هاتووم وتی: باشە چیت دەوێت منیش ئەومت بۆ دەکەم. منیش وتم: بیستوومە کە پیاوێك بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات ئا لێرەدا پەیدابووە، ومنیش براکەم نارد بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات گەڕایەوە هەواڵێکی بۆ نەهێنام وە منیش پێم خۆش بوو خۆم بیناسم و بزانم کێیە؟

ئیمامی عەلی ﷛ فەرمووی: باش هاتوویت ڕاست دەکەیت بەڵێ ئەوە پێغەمبەری خوایە وە منیش (إن شاء الله) دەچم بۆلای ئەو) پاشان کە بەیانیمان لێ بووەوە وتی: دوامکەوە بەهەر شوێنێکدا ڕۆیشتم دوور بەدوور وەرە بەدوامدا، ئەگەر من یەکێك لە کافرانم بینی کە بترسم یەخەت پێ بگرێت و بڵێت ئەوە چی دەکەیت لێرە، من یەکسەر دەچمە لای دیوارەکەوە نەعلەکانم دادەنێم بۆ ئەوەی بزانێت کە من خەریکی چاککردنی نەعلەکەمم تۆش بزانە ئەوە یەکێکە لە کافرەکان و لێی دوور بکەوەرەوە (واتە: خۆت بشارەوە)، دەفەرموێت: بەم شێوەیە ڕۆیشتم بەدوایدا هەتا لەگەڵیدا چوومە ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری ﷺ تیابوو ئینجا چوومە خزمەتی و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامم پێ ڕابگەیەنە، پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی پێ ڕاگەیاندم وە هەر لەوێدا دەست بەجێ موسوڵمان بووم، دوای موسوڵمان بوونم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەبو زەڕ موسوڵمان بوونی خۆت ئاشکرا مەکە و بگەڕێرەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت کە پێت گەیشت ئێمە خوای گەورە شکۆمەندی کردووین و بە دەسەڵاتین ئەوکاتە بگەڕێرەوە لامان)).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: فەرموی ((بگەڕێرەوە بۆ ناو کەس و خزمانت و هەواڵی منیان پێ بگەیەنە هەتا من هەواڵت بۆ دەگێڕمەوە)) منیش وتم: سوێند بەوەی کە تۆی بەحەق ناردووە تا هێزم هەبێ بەئاشکرا بە گوێیاندا دەدەم کەمن موسوڵمان بووم، هەر ئەو ڕۆژە هاتم بۆلای کەعبە و قورەیش هەموویان لەوێ

دانیشتبوون، منیش ڕووم کردە هەموو سەرکردەکان کە لەلای (دار الندوة) (مەلەء)ی بەرامبەر کەعبە دانیشتبوون وتم: هۆ کۆمەڵانی قوڕەیش من شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ:

هەموویان بۆم هەستان وتیان: هەستن بۆ ئەم بێ دینە ئینجا هەموویان ئەوەندەیان لێدام تا وایان لێ کردم کە خەریك بوو بمرم؟ دەفەرموێت: ئەمەندەیان لێدام تاکو عەباس گەیشتە سەرم و خۆیدا بە سەرمدا و ڕووی کردە ئەوان و وتی: ماڵتان وێران بێت ئەمە پیاوێکە لە بەنی غەفار (چۆن دەتوانن وای لێبکەن ئێوە ڕێگەی بازرگانی یەکەتان لەلای بەنی غیفارە ئەمەش پیاوێکە لە غەیفار بۆ وای لێ دەکەن؟) دەفەرموێت: یەکسەر لێم دوورکەوتنەوە بۆ بەیانی دیسان چوومەوە بەردەمیان وە بەهەمان شێوەم پێ وتنەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوە بۆم ڕاپەڕین و لێیان دامەوە و بەهەمان شێوەش عەباس لەولاوە بووهاتەوە و خۆی دایەوە بەسەرمدا و ئەوانی لێ دوورخستمەوە وتی: ماڵتان نەشێوێت ئەمە لەبەنی غەفارە کاروانەکانتان بەلای ئەماندا تێدەپەڕێت بۆ وای لێ دەکەن دەفەرموێت: ئیتر لێم دوورکەوتنەوە...)[٢٤٢].

**ڕیوایەتی دووەم:** (ئەبو زەر ﷺ دەفەرموێت: یەکەم شتێك کەوای لێکردم موسوڵمان ببم ئەوە بوو ئێمە قەومێك بووین عەرەب بووین (واتە: خێڵەکی بووین) قات و قڕیەکمان بەسەردا هاتبوو ئێمە، و هەندێ لە کەسانی قەومی غەفاری خۆمان کەلە (الشهر الحرم)دا دادەبەزین و کۆچمان دەکرد من و براکەم کە ناوی ئونەیس بوو لەگەڵ دایکمدا بەڕێکەوتین و چووین بۆلای خاڵێکمان لە ناوچەی نەجد، چووین بۆلای و یارمەتی داین بەڵام خزمانی ئەو خاڵەمان ڕقیان لە ئێمە هەڵگرت و حەسوودیان پێ بردین)[٢٤٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پیاوێك لە پیاوانی خزمی خۆی ئەمەی زانی کەوتە فیتنە گێڕان و چوو بۆلای خاڵۆکەم وە پێی ڕاگەیاند و وتی: کاتێ تۆ دەچیت بۆ لەوەڕاندنی وشترەکەت ئونەیس دەچێت لەگەڵ خێزانەکەتدا زینا دەکات

(٢٤٢) أخرجه: البخاري (٣٨٦١)، ومسلم (٦٣١٢).

(٢٤٣) أخرجه: أحمد(١٧٤/٥)، ومسلم (٢٤٧٣)، و الطيالسي(٤٥٨)، وابن حبان (٧١٣٣) وقال محققه:صحيح على شرط مسلم(٦٣٠٩)، وأبو نعيم في (الحلية) (١٥٩/١) وفي (دلائل) (١٩٧).

دەفەرمویێت: کە خاڵۆم ئەم هەواڵەی پێ گەیشت دڵی تەزاند و نارەحەتی کرد و منیش چووم بۆلای خاڵۆم بینیم وشترەکانی من و براکەم و دایکمی بەرەڵاکرد وە پێم وت: چییە چیبووە، ئەویش ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندم کەچی پێ وتراوە منیش پێم وت: خوا ئێمە دوور دەخاتەوە لەوە، ئێمە کەسانێکین خۆمان لە کاری خراپە دەپارێزین، هەرچەندە برسێتی و قات و قڕی ڕووی تێکردووین، بەڵام ئەو چاکەیەی تۆ کردت لەگەڵمان لەم دواییەدا لێڵت کردن هەرگیز لەگەڵ تۆدا دانانیشین، ئیتر ڕانە وشترەکەمان دایە پێش خۆمان و هەرچیەکمان هەبوو پێچامانەوە و کەوتینە ڕێ و خاڵەکەشمان دەستی کردە گریان و نارەحەت بوو، ئێمەش بە جێمان هێشت تاگەیشتینە نزیك شاری مەککە، کە گەیشتینە ئەوێ براکەم وتی: من کابرایەکی شاعیرم و ئەچم بۆلای کابرایەکی شاعیر تا گرە و بکەم لە سەر شیعر (واتە: گرەو بکەن لەسەر ئەوەی کامیان شاعیرێکی باشترە) گرەوەکەش بەم جۆرەبوو ئەم چەند وشترێك دادەنێت و ئەویش چەند وشترێك دادەنێت وە کامیان شیعرەکەی باشتر بوو شایەتی پێدرا ئەوە وشترەکانی ئەو دەبات، چونکە ئەم شاعیرترە لە ئەو، ئینجا وتی: من دەچم و ڕێگرم لە کابرایەکی شاعیر؟ منیش وتم: واز بێنە مەڕۆ وتی: هەر دەڕۆم وای لێهات هەتا تووشی بو بە تووشی (دوریدی کوڕی صومە) کەوتە گرەو لەگەڵیدا براکەم وتی: گرەو لەسەر هەموو وشترەکان ئەکەم کە شیعرەکەی من چاکترە لە هی تۆ؟ ئەویش وتی: ئەوا منیش ئەوەندە وشتر دادەنێم کە شیعری من بەهێزترە.

پاشان دەفەرمویێت: سوێند بە خوا دورەید یەکێ بوو لەشاعیرە گەورەکان براکەم لەچاو ئەودا هەر شیعری نەدەزانی ئینجا هەردووکیان وتیان: باشە با بچین ئەوە بوو هەردووکیان چوون بۆ لای خەنساء کەیەکێك بوو لە شاعیرە بەرزەکان خەنساء گوێی لەشیعری هەردووکیان گرت ئەوەی ڕاگەیاند کە شیعری براکەم چاکترە لەشیعری دورەید دەفەرمویێت: براکەم شیعرەکەی باشتر نەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی دورەید پیاوێکی پیربوو چوو بوو بۆ داوای خەنساء لای باوکی لەوکاتەوە خەنساء ڕقی لێهەڵگرتبوو وتی: نەخێر تۆ شاعیر نیت ئونەیس شاعیرە وشیعرەکەی باشترە دەفەرمویێت: چی وشتر هەبوو هەمووی دەست ئونەیس کەوت و وەگەڕایەوە وشترەکانی هێنا بۆیە وشترەکانمان زۆر بوون.

ئونەیس وتی: وەڵاهی من ئیشێکم بەمەککە هەیە با بڕۆم بەڵام تۆ ئاگات لە وشترەکان بێت دەفەرموێت: ئونەیس گەیشتە کەعبە و درەنگ هاتەوە دوای ئەوە وتم: ئەوە چیت کرد لەمەککە؟ ئونەیس وتی: وەڵاهی گەیشتم بەپیاوێك لەمەککە لەسەر ئاینی تۆیە (واتە: بت پەرستی نییە) وا ڕادەگەنێت کەپێغەمبەرە، منیش وتم: ئەی خەڵك چی پێ دەڵێن؟ وتی: یەکێ دەڵێ شاعیرە و یەکێ دەڵێ فاڵچی یە و یەکێکی تر دەڵێ سیحربازە، ئونەیس وتی: خۆ من شتێك دەزانم قسەکانی ئەو پێغەمبەرە نەلەقسەی فاڵچی دەچێت و نەلەقسەی شاعیر وەڵاهی قسەی هەر بۆ شیعر ڕێك ناکەوێت وەڵاهی ئەو پیاوە ڕاست دەکات و ئەوان درۆ دەکەن.

ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: کە ئونەیس ئەمەی وت منیش پێم وت: تۆ ئاگات لە وشترەکان بێت با بڕۆم بزانم ئەم باسە چۆنە، ئەویش وتی: باشە منیش چووم بۆ مەککە و بەلای تەپۆڵکەی صەفا تێ پەڕیم پیاوماقوڵانی قوڕەیش لەوێ بوون وە زووتر بیستبووم کە ئەوان پێی دەڵێن: فاڵچیەو شاعیرە وسیحربازە منیش نەم دەوێرا لەکەس پرسیار بکەم وتم با لەیەکێکی زۆر بێ دەستەڵات پرسیار بکەم کە هیچی پێنەکرێت پیاوێکی وام دۆزییەوەو پێم وت: ئەو کابرایەی کەئێوە پێی دەڵێن بێ دینە لەکوێیە؟ ئەویش ئیشارەتی کرد بۆلای من (واتە: خەڵکی لێ ئاگادار کردمەوە) ئینجا بەمنی گوت: ئا ئەوە بێ دینەکەیە دەی بینن کەلەو بەرەوەیە (واتە: دەستی ڕاکێشا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ منیش هەنگاوم هەڵهێنا بۆ ئەوەی بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ بڕۆم وەماوەی بەرد هەڵدانێك دورکەوتمەوە ئینجا چی پیاوی گەورە و ماقوڵانی قوڕەیش هەیە لەگەڵ سەرجەم خەڵکی دۆڵ وشیوی مەککە هەیە بەبەرد و بەدار و بەئێسقان بەربوونە من و خەڵتانی خوێنیان کردم، هەتا لەهۆش خۆم چووم کاتێ هاتمەوە هۆشی خۆم تەماشا دەکەم من وەك پەیکەرێکی سوورم هەموو گیانم خوێناوی بوو. وە هاتم بۆلای بیری زمزم و خوێنەکانم شت وە لەئاوەکەیم خواردەوە و چوومە پەنای کەعبە و لەنێوان پەردەی کەعبەدا ماوەی سی شەو و سی ڕۆژ لەوێ مامەوە هیچ خواردنێکم نەبوو تەنها ئاوی زمزم نەبێت خواردمەوە تا قەڵەوبووم ورگیشم گەورە بوو بەهیچ جۆرێك لەماوەی ئەو مانگەدا برسێتیم بەخۆوە نەدیبوو وەلە شەوێکی مانگە شەودا دانیشتوانی مەککە سەرجەم خەویان لێ کەوتبوو منیش لای کەعبە بووم لەوکاتەدا دوو ئافرەت لەخوزاعە تەوافیان دەکرد وەهاواریان لە

ئیساف و نائیله دەکرد)[٢٤٤].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (یەکێکیان دەیوت: ئەی ئیساف کوڕێکم پێ ببەخشە ئەوی تریشیان دەیوت: ئەی نائیله ئەوە و ئەوەم پێ ببەخشە لەکاتی تەواف کردنیاندا بەدەوری کەعبەدا هاتن بەلای مندا تێ پەڕین منیش سەرم دەرهێنا لەژێر پەردەی کەعبەوە و پێم وتن: یەکێکیان سواری ئەوی تریان بکەن ئەوانیش وازیان نەدەهێنا لەپاڕانەوەیان لە ئیساف و نائیله و تەوافیان دەکرد بۆ دووەم جار گەڕانەوە بۆلای من پێم وتن: ئایا کونێك وەك بەردبێت هاواری لێ دەکەن، دەفەرموێت: کونیەکەشم بەکارنەهێنا ئەوانیش زۆر توڕەبوون وتیان: وەڵاهی ئەگەر پیاوانمان لێرە دەبوون ئێستا تۆ لێرە بە هیچ جۆرێك توانای ئەو قسانەت نەدەبوو بیڵێیت ئینجا ڕۆیشتن وە منیش لەپەردەکانی کەعبە هاتمە دەرێ بەدوایاندا چووم ئەوان ڕۆیشتن بەهاوارو واوەیلا دەیان وت: ئەگەر یەکێك لەخزمانی خۆمان ئامادە دەبوو، ڕۆیشتن تاکو گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا ﷺ لە کێوی حەڕا هاتبوونە خوارەوە و ئەوانیش گەیشتن بەو دوو ئافرەتە، پێغەمبەر ﷺ لەهەردووکیانی پرسی فەرمووی: چیتانە؟

وتیان: بێ دینێك لای کەعبەیە لەژێر پەردەی کەعبەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی پێ وتن؟ وتیان: قسەیەکی وتوە دەم پڕەکات قسەیەکی گەورەیە، پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەیەك گرتی و ئەوان ڕۆیشتن، وە پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای کەعبەو دەستی هێنا بە بەردەڕەشەکەدا و تەوافی کرد بە چوار دەوری کەعبەدا خۆی و هاوەڵی بەڕێزی ئەبوبەکر ﷺ و نوێژی کرد کە تەواو بوو ئینجا من یەکەم کەس بووم کە یەکەمجار بەسەلامی ئیسلامیانە سڵاوم لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتم: (السلامُ عليك يا رسولَ اللهِ) دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەڵامیدامەوە فەرمووی: (و عَلَيْكَ السلامُ وَرَحمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ) فەرمووی: تۆ کێی؟ وتم: من لە غیفارم، دەفەرموێت: غیفاریش چەتە بوون حاجی یان ڕووت دەکردەوە هەر ئەمەم وت: پێغەمبەر ﷺ ئاوا دەستی گرت بە ناوچەوانییەوە و لە دڵما وتم پێی ناخۆش بوو کە من لە غیفارم وە ویستم دەستی لە ناوچەوانی بکەمەوە، ئەبوبەکر وای لێ کردم کە وازی لێ بهێنم، چونکە ئەو شارەزاتربوو بە پێغەمبەر ﷺ لەمن. ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی بەناو

(٢٤٤) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٧٧٣) وفي (٢٥/١٨٠)، والحاكم (٣/٣٣٩، ٣٤١) وقال الذهبي إسناده صحيح.

چەوانیەوە لابردوو فەرمووی: لەکەیەوە لێرەی؟ وتم: سی شەو و سی ڕۆژی ڕەبەقە لێرەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ نانی پێداویت؟ وتم هیچ نانێکم نەبوو تەنها ئاوی زمزم نەبێت دەم خواردەوە تا پێی قەڵەو بووم و هەتا ورگیشم گەورە بوو، وە هیچ برسیشم نەبووە فەرمووی: (إنَّها مُبارَكةٌ إنَّها طَعامُ طُعْمٍ). واتە: ئاوی زمزم موبارەکە خواردنە بۆ ئەو کەسەی کە پێویستی بە خواردن بێت.

ئەبو بەکر ﷺوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەم بدە با میوانداری بکەم و خواردنی پێ ببەخشم پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو، ئینجا ڕۆیشت و ئەبوبەکریش دەستی گرتم هەرسێکمان بەرەو ماڵی ئەبوبەکر کەوتینە ڕێ و چووینە ژوورەوە و ئەبوبەکر هەندێ مێوژی بۆ هێناین لە مێوژی (طائیف) مشت مشت ئەیخستە بەردەممان و لێمان دەخوارد، ئەوەش یەکەم خواردنم بوو لەکاتی چوونم بۆ شاری مەککە دەستم کەوتبوو ئینجا هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی وتم: ئەی ئەبو زەڕ؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (إنَّه قدْ وُجِّهَتْ لي أَرْضٌ ذَاتُ نَخْلٍ، لا أُرَاهَا إلَّا يَثْرِبَ، فَهلْ أَنْتَ مُبَلِّغٌ عَنِّي قَوْمَكَ؟) واتە: من نێرراوم بەرەو خاکێکی دار خورماوی وا تێدەگەم تەنها یثریب بێت ئایا تۆ لە جیاتی من پەیامی من دەگەیەنیت بە قەومەکەت، بەڵکو خوای گەورە لەڕێی تۆوە سوودیان پێ ببەخشێت ومبێتە پاداشت بۆت. لە ڕوایەتێکی تردا دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ((الحَقْ بقومِكَ فإذا بلَغكَ ظُهوري فَأْتِني)) واتە: بچۆ بگەڕێرەوە بۆلای خزمانی خۆت و ئەگەر بیستت کە خوا منی سەر خستووە ئینجا بگەڕێرەوە بۆلام.

ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: ئینجا منیش گەڕامەوە بۆ لای دایکم و ئونەیسی برام ماوەیەکی زۆرم پێ چوو بوو نەگەڕابوومەوە بۆلایان، ئونەیس هەر لە دوورەوە منی بینی گریا و وتی: ئەی براکەم وام دەزانی کوژراوی، چونکە زۆر زۆرت پێ چوو تا گەڕایتەوە، ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: منیش وتم: چووم موسوڵمان بووم و موحەممەدم بەڕاست خستەوە و شایەتیم داوە کە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت، وە موحەممەد بەندەی خوایە و پێغەمبەری خوایە، ئونەیس دوای ئەوە پێی وتم: من هیچ ڕایەکم نییە لەو ڕایەی کە تۆ هەڵت بژاردووە جیاوازتر بێت سەبارەت بەو ئاینە، وە منیش موسوڵمان دەبم و بەڕاستی دەزانم، ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: ئونەیسی براشم لەگەڵمدا موسوڵمان بوو، ئینجا چووین بۆلای دایکمان، و کە چاوی

کەوت بەمن، دەستی کرد بە گریان و وتی: کوڕەکەم وام دەزانی کە کوژراوی ماوەیەکی زۆرە نەهاتویتەوە چیت بەسەر هات؟ منیش وتم: گەیشتم بە هاوەڵەکەم و شایەتیمدا کە تەنها (الله) خوایە و موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە ﷺ ، دایکم وتی: ئەی ئونەیسی برات چیکرد؟ پێم وت: ئونەیس موسوڵمانبووە، دایکیشم وتی: من هیچ ڕایەکم نییە لەوەی کە ئێوە هەڵتان بژاردووە جیاوازتر بێت، ئەوا منیش موسوڵمان دەبم و بەڕاستی دەخەمەوە، ئینجا کۆچ و باری وشترەکانمان پێچایەوە و کەوتینە ڕێ بەرەو عەشیرەتی خۆمان (واتە: بەنی غەیفار) کە گەڕاینەوە ناو خزمانمان هەموو هۆزەکەم ئاگادارکردەوە لە پەیامی ئیسلام و نیوەیان موسوڵمان بوون، پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە. وە لەو ماوەیەشدا (ئیمائی کوڕی ڕوخسە) سەرکردەی بەنی غیفار پێش نوێژی بۆ دەکردن وە نیوەکەی تریان وتیان: وەڵاهی جارێ موسوڵمان نابین تا پێغەمبەر ﷺ کۆچ نەکات بۆ مەدینە، دوا بەدوای کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە نیوەکەی تریشیان موسوڵمان بوون....)[٢٤٥].

## (٢) موسوڵمان بوونی حوصەینی کوڕی عوبەیدی خوزاعی رضي الله عنه

حوصەین کە (باوکی عیمران کوڕی حصین)ە یەکێك بوو لە هەرە پیاوماقوڵ و ناوداری هۆزی خۆی، پیاوێکی گەورە و زانا و دانا بوو، ناردیان بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ سەبارەت بەو ئاینەی پێی هاتووە، تا ئەوە بووە هۆی موسوڵمان بوونی، هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ عمرانی کوڕی حصین رضي الله عنه دەفەرموێت: قوڕەیش هاتنە لای حوصەین و بەگەورەیان دەزانی و پێیان وت: بڕۆ گفتوگۆمان بۆبکە لای ئەو پیاوە کە بەخراپە باسی خواکانی ئێمە دەکات عیمران دەڵێت: لەگەڵیدا هاتم تا نزیکیان کردەوە لە ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای و فەرمووی: (أوسِعوا للشَّيخِ) واتە: (جێگەی ئەم پیاوە بەتەمەن و ناودارە بکەنەوە)، عمران و هاوەڵانی تر کە موسوڵمان بوو بوون هەموویان لەوێ بوون، حوصەین سەرەتا وتی: ئەمە چییە بیستوومانە لەلایەن تۆوە کە بە خراپە باسی خواکانمان دەکەیت ئەی موحەمەد؟ عەبدول موطەلیب چاکتر بوو لە تۆ بۆ خزم و هۆزەکەی خۆی، عەبدول موطەلیب جگەرو پیوی دەرخوارد دەدان، بەڵام تۆ سەریان دەبڕیت؟

(٢٤٥) أخرجه: الطبراني في (المعجم الأوسط) (٦٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٥٨١٥): فيه أبو طاهر يروي عن أبا يزيد المديني و لم أعرف أبا طاهر و بقية رجالها رجال الصحيح.

**پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((يا حُصَين: كم تعبُدُ مِن إلهٍ؟)) واتە: ئەی حوصەین چەند خوا دەپەرستیت؟ وتی: حەوت، شەشیان لە زەوی و یەك لە ئاسمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فإذا أصابَكَ الضُّرُّ مَن تَدْعو؟)) واتە: ئەگەر تووشی زیانێك هاتیت هاوار لە کامیان دەکەیت؟ وتی: هاوار لەوەیان دەکەم کە لە ئاسماندایە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فإذا هلك المالُ مَنْ تَدْعو؟)) واتە: ئەگەر پارەت نەما هاوار لە کامیان دەکەیت؟ وتی: هاوار لەوەیان دەکەم کە لە ئاسماندایە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: تەنها ئەوەی ئاسمان هەموو شتێکت بۆ جێبەجێ دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی زەویش هاوبەش دەکەیت لەگەڵیدا؟ ئایا ڕازی دەبیت کە سوپاسیان بکەیت یان لەوە دەترسیت کە ئەو خوایانەی زەوی زاڵ ببن بەسەرتدا. حوصەین وتی: ئەوانە هیچیان نییە.**

**حوصەین دەڵێت: زانیم کە ئەم پیاوە وەکو هیچ پیاوێکی تر نییە کەمن قسەم لەگەڵدا کرد بێت دوای ئەوە پێی وتم: ئەی حوصەین موسوڵمان ببە سەلامەت دەبیت؟ وتم: من کەس وهۆزێکم هەیە، حوصەین دەڵێت: دوای ئەوە ویستم بڕۆم وتم: چی بڵێم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((للَّهمَّ قِنِي شرَّ نفسي واعزِمْ لي على أرشَدِ أمري)) واتە: بڵێ خوایە پەنام بدەی لە شەڕی نەفسی خۆم وە جێگیرم بکەیت لە سەر چاکترین ڕەفتاری خۆم، حوصەین ڕۆیشت و هێشتا موسوڵمان نەبووبوو، دوای ماوەیەك موسوڵمان بوو، پاشان گەڕایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هاتم بۆلات و پێم وتیت: فێرم کە، تۆش ئەو وتەیەی پێشووت: فێرکردم، ئێستا موسوڵمان بووم چی بڵێم؟ فەرمووی بڵێ: خوایە پەنام بدەی لە شەڕی نەفسی خۆم و جێگیرم بکەیت لە سەر چاکترین ڕەفتاری خۆم، وە لەو گوناهانەشم خۆش بە کە پەنامەکی و بە ئاشکرا وبە هەڵە و ئەنقەست و بە زانین وبە نەزانین ئەنجامم داوە)[٢٤٦].**

---

(٢٤٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٤٤/٤) (١٩٩٩٢) وقال محققه: إسناده على شرطهما، والنسائي في (السنن الكبرى) (١٨٣٠،١٨٣٢)، وابن أبي شيبة في (المصنف) (٢٦٧/١٠)، وابن حبان (٨٩٩) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري، وابن خزيمة (١٦٨٩) الحاكم (المستدرك) (٥١٠/١) وصححه ووافقه الذهب، والطبراني في (الكبير) (٣٥٥١) وفي (١٥١/١٨)، و القضاعي في (مسند الشهاب) (١٤٨٠)، وقال الحافظ في (الإصابة) (٣٣٧/١) وفي (١٧٣٥): رواه أحمد والنسائي بإسناد صحيح، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٧٤١٣): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، واللفظ لابن خزيمة و الزيادات للنسائي.

## (٣) موسوڵمان بوونی ضمادی ئەزدی ﷺ

ضماد یەکێك بوو لە پیاوە شارەزاکانی یەمەن لە بواری چارەسەرکردنی باداری و فێداری و دەست لێوەشاندنی جنۆکە، ئەوەبوو هاتە شاری مەککە و بەرگوێی کەوت کە کەسێکی لێیە ناوی موحەممەدە چووە لای تا چارەسەری بۆ بکات و چاکی بکاتەوە.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ضماد هاتە شاری مەککە و لە هۆزەکانی یەمەن بوو دەرمان و ڕوقیەی هەبوو بۆ فێداری و شێتی و باداری و گوێی لە نەفامەکانی شاری مەککە بوو دەیان وت: موحەممەد شێت بووە، ئەویش دەیوت: خۆزگە من ئەو پیاوەم دەبینی بەڵکو خوای گەورە شیفای بۆ بناردایە لە سەر دەستی مندا، ئەوەندەی پێ نەچوو گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: ئەی موحەممەد من دەرمانم لا هەیە بۆ شێتی و فێداری و باداری بەڵکو خوای گەورە شیفات بۆ بنێرێت لەسەر دەستی مندا ئایا بۆت بەکار بهێنم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((أنَّ الحمدَ للَّهِ ، نحمدُهُ ، ونستعينُهُ ، ونستغفرُهُ ، من يَهدِهِ اللَّهُ فلاَ مضلَّ لَهُ ، ومن يضلل فلاَ هاديَ لَهُ....)).

واتە: سوپاس تەنها شایستەی خوایە سوپاسی دەکەین و داوای کۆمەکی لێ دەکەین هەر کەسێك خوا ڕێنمونی بکات گومڕاکاری نییە وە هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات ڕێنمونی کاری نییە شاهیدی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت تاك وتەنهایە و هیچ هاوتایەکی نییە وە موحەممەد بەندەی خوایە و پێغەمبەری خوایە) لەپاش ئەمە ضماد وتی: ئادەی بۆم دووبارە کەرەوە ئەوەی ئێستا وتت، پێغەمبەر ﷺ سێ جاری بۆی وتەوە، ئینجا وتی: گوێم لە وتەی فاڵچی و سیحربازەکان و وتەی شاعیرەکان بووە، بەڵام تا ئێستا گوێم لەم وشانەی تۆ نەبووە بە ڕاستی وشەکانت گەیشتوونەتە ئەو پەڕی فەرهەنگی دەریا دەستت بێنە با پەیمانت بدەمێ لەسەر ئیسلام، دەفەرموێت پەیمانیدا بە پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دەبێ پەیمانیش بدەی لە جیاتی کەسەکانت کە هەوڵ بدەیت لەگەڵیاندا تا موسوڵمان ببن) ضماد پەیمانی لەسەر ئەوەش دا)[٢٤٧].

---

(٢٤٧) أخرجه: مسلم (٢٠٠٥)، والطبراني في (الكبير) (٨١٤٧)، وابن حبان (٦٥٦٨) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، والبيهقي في (الكبرى) (٢١٤/٣) وفي (الدلائل) (٢٢٣/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٨٧)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٧٠/٩): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

## (٤) موسوڵمان بوونی عەمری کوڕی عەبسەی سولەمی رضي الله عنه

ئەبو ئومامە رضي الله عنه دەفەرمویت: عەمری کوڕی عەبسی سولەمی خۆی دەگێڕێتەوە و دەفەرمویت: (لە نەفامیدا وامدەزانی کە خەڵکی سەرجەم گومڕان و لەسەر هیچ بیرو باوەڕێك نین ئەوان بتیان دەپەرست، گوێم لێبوو کە پیاوێك لەشاری مەککە هەندێ هەواڵ دەگێڕێتەوە، منیش سواری وشترەکەم بووم و چووم بۆ لای و خۆمم پێگەیاند و بینیم بە پەنامەکی کارەگەی دەکات وە بینیم کە قوڕەیش زۆر بە جورئەت بوون بەرامبەری، منیش نەرم و نیانانە چوومە پێشەوە و دۆزیمەوە و پرسیارم لێکرد و پێم وت: تۆ چیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من پێغەمبەرم)) وتم: پێغەمبەر چییە؟ فەرمووی: خوا منی ناردووە وتم: بە چ شتێك خوا تۆی ناردووە؟ فەرمووی ((أَرْسَلَنِي بِصِلَةِ الأَرْحَامِ، وَكَسْرِ الأَوْثَانِ، وَأَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ لا يُشْرَكُ به شيءٌ)) واتە: (خوا منی ناردووە تا فەرمانتان پێ بکەم پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنن و بتەکان بشکێنن و تەنها خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن)، پێم وت: کێت لەگەڵ دایە لەسەر ئەم بیرو باوەڕە؟ فەرمووی: ئازاد و کۆیلە دەفەرمویت: ئەبوبەکرو بیلال یەکێك بوون لەوانە کە باوەڕیان پێ هێنابوو، پێم وت: من شوێنت دەکەوم، فەرمووی: تۆ ئێستا ناتوانیت ئەی نابینیت حاڵی من و قوڕەیش چۆنە، بگەڕێرەوە بۆلای خزمانت گەر هەواڵی سەرکەوتنت پێ گەیەنرا ئینجا وەرە وە بۆلام)[٢٤٨].

## دابڕان و گەمارۆدانی بەنی هاشم لە دۆڵی ئەبوطالبدا لەلایەن قوڕەیشەوە

قوڕەیش دوای ئەوەی شکستی هێنا لە هەموو مەیدانی بەگژداچوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ و ئاینەکەی لەگەڵ دژایەتی کردنی توندی هاوەڵەکانی، دوای شکست خواردنەکەی لە حەبەشە و بوونی حەبەشە بە پێگەو پەنای پێغەمبەر ﷺ و نیشتەجێ بوونی هەندێك لە یارانی، وە بەرگری لێکردنی نەجاشیش لەوان، ئا لەم کاتەدا قوڕەیشیەکان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی کۆنە قین و زوخاوی خۆیان بڕێژن بە پێغەمبەر ﷺ و بیکوژن، بەڵام کوڕانی بەنی هاشم و بەنی مطلب (تەنها بەنی

(٢٤٨) أخرجه: أحمد (١١٢/٩)، ومسلم (١٩٢٧)، والطبراني في (الأحاديث الطوال) (١١)، وأبو نعيم في (الدلائل) (١٩٨).

نەوفەل نەبێت) کە خزمانی پێغەمبەر ﷺ بوون وە تەنها هەر ئەو لایەنانە بەرگریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد، بۆیە قورەیش گوشارو گەمارۆی توندی خستنە سەریان تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم بکرێت و لەسێدارە بدرێت، لە شوێنێکدا کۆبوونەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێکرد.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بۆ سبەینێ کە ڕۆژی نەحر بوو لە مینا فەرمووی: (ئێمە بەیانی لادەدەینە خێڵی کوڕانی بەنو کینانە کە هەموویان کۆبوون لەسەر کوفر) ئەمەش دەست نیشان کردنی ئەو شوێنەیە کە ئەوان کۆبوونەوە و بڕیاری گەمارۆی ئابووری و جەنگی دەروونی دابڕان و گۆشەگیرکردنی پێغەمبەر ﷺ و خزمانی لەبەنی هاشم و یاوەرەکانیاندا تا پێغەمبەریان ڕادەست بکرێت)[٢٤٩].

ئەم بەسەر هاتەش زانای پایە بەرز ئیبنو ئیسحاق ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (قورەیش کاتێ بینی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چوونەتە وڵاتێ کە بەرگریان لێدەکات، ئیمامی عومەریش ﷺ موسوڵمان بووە لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە ئاینی ئیسلامیش بەرەبەرە بڵاوبۆتەوە بە هەموو هۆزو لایەنەکانی قورەیشدا ئینجا کۆبوونەوە و پیلانیان گێڕاو ڕێکەوتنامەیەکیان ئەنجامدا و لە کاغەزێکدا نووسیان، ئەوان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە دژ بەبەنی هاشم وبەنی مطلب بن و ژنیان لێ نەخوازن و ژنیان پێ نەدەن وە بە هیچ جۆرێك شتیان پێ نەفرۆشن وە هیچیان لێ نەکڕن. کاتێ لەسەر ئەم بڕیارە کۆبوونەوە نووسیان و بڕیارنامەکەیان لە ناو کەعبەدا هەڵواسی و پەیمانیان لەیەکتر وەرگرت کە هەموویان بڕگەکانی ئەو پەیمانە بە وردی جێ بەجێ بکەن، پاشان بەنی هاشم و بەنی مطلب کۆبوونەوە لای ئەبو طالب مامی پێغەمبەر ﷺ وە هەموویان پشتگیریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد وە هەموو چونە ناو دۆڵەکەوە کە بە دۆڵی ئەبو طالب بەناوبانگە وە کۆبوونەوە لەوێ تەنها ئەبو لەهەبی خیانەتکار نەبێت ئەو دژ بە پێغەمبەر ﷺ بوو وە بووە لایەنگری قورەیش دژ بە پێغەمبەر ﷺ و خزمانی)[٢٥٠].

---

(٢٤٩) أخرجه: البخاري (١٥٩٠).

(٢٥٠) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٦٧/١)، و(البداية) لابن كثير (١١٩/٣).

سەرەتای چوونە ناو شیوەکە لەمانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتی پێغەمبەرایەتی بوو، وە لە ساڵی (دە)ی پێغەمبەرایەتیدا کۆتایی بەم گەمارۆیە هات. موسای کوڕی عوقبە ؓ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: موشریکەکان زۆر سەخت گیرانە دەوەستان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، تاکو فشاریان خستنە سەر و نارەحەتیان کردن، و بەڵایان لەسەر گەورە کردن، و قورەیش لە پیلانەکەیاندا کۆبوونەوە لە سەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا بکوژن. کاتێ ئەبو طالب بینی کە قورەیش نیازو مەرامی چییە کوڕانی بەنی مطلبی کۆکردەوە و فەرمانی پێکردن کە پێغەمبەر ﷺ بگرنە خۆیان و لە دۆڵەکەی خۆیان پارێزگاری بکەن، لەولایەنانەی کە بەگژیدا دەچن ودەیانەوێت بیکوژن. بەو شێوەیە سەرجەم کوڕانی بەنی هاشم و بەنی مطلب بە موسوڵمان و کافریانەوە پشتگیریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بێ بڕواکانیان لە غیرەت و دەمارگیری عەشایری، وە موسوڵمانەکانیان لە باوەڕ و ئیمانی خۆیانەوە، قورەیش زانی کە ئەو دوولایەنە هەرگیز خۆیان تەسلیم ناکەن کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە بە هیچ جۆرێك دانەنیشن لەگەڵیاندا و هیچیان پێ نەفرۆشن وە سەردانیشیان نەکەن لە ماڵەکانیان دا، تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم دەکەن بۆ کوشتن. سەبارەت بەو پیلانەشیان ڕێکەوتنێکیان ئەنجامدا و نوسیانەوە لە کاغەزێکدا، پەیمانیان وەرگرتبوو لە یەکتر، کە بە هیچ جۆرێك هیچ ڕێکەوتنێك لەگەڵ بەنی هاشمدا نەکەن و پێی ڕازی نەبن، وە بە هیچ جۆرێك نەرم و نیان نەبن بەرامبەریان تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم دەکەن و ڕازی دەبن بەکوشتنی، بەنی هاشم وە بەنی موطلیب لە دۆڵەکەیاندا سێ ساڵ مانەوە، بەڵام نارەحەتی و برسێتییەکی زۆر سەخت و ناهەموار دووچاریان بوو.

ئەوە بوو کاتێك بە بازاڕدا دەگەڕان، وە دەیان بینی هیچ خواردنێك نەماوە کە ئەوان بیکڕن، وە هەر شتێك بهاتایەتە ناو مەککە قورەیش دەست پێشخەرییان دەکرد بۆ کڕینی بۆ ئەوەی دەست ئەوان نەکەوێت، ئەم هەموو هەوڵەشیان تەنها لەبەر ئەوە بوو کە خوێنی پێغەمبەر ﷺ بڕێژن، ئەبو طالب کاتێ کە خەڵك دەچوونە سەر جێگا و و دەنوستن فەرمانی دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ بچێتە سەر جێگاکەی خۆی بخەوێت بۆ ئەوەی ئەوانەی کە دەیانەوێت زەفەری پێ بێنن، بزانن پێغەمبەر ﷺ لە جێگەی خۆی خەوتووە، وە دواجار فەرمانی دەکرد یەکێك بچێتە سەر جێگاکەی پێغەمبەر

ﷺ بخەوێت، وە پێغەمبەریش ﷺ بچێتە جێگەیەك لە جێگاکانی خزمانی خۆی و لەوێ بخەوێت بۆ ئەوەی کە سەلامەت بێت.

کاتێ سەری ساڵی سێیەم هات هەندێ لە پیاوانی بەنی عەبدول مەناف کە خزمایەتیان وەکو خزمایەتی بەنی موطەلیبە بۆ بەنی هاشم کەوتنە لۆمەکردنی یەکتر، ئەوان و کوڕانی بەنی قوسەی و هەندێ لە پیاوانی قوڕەیش کە دایکانیان لە بەنی هاشم بوو بۆیان ڕوون بووەوە سێ ساڵە ئەم ڕەفتارەیان زۆر نامەردانە و نا جوامێرانەیە، کە دەیکەن بەرامبەر بەنی هاشمی خزمانی خۆیان، و پەیوەندی خزمایەتیان دەپچڕێنن و سوکایەتیان درەهەق دەکەن، بۆیە کۆبوونەوە لە شەوێکدا و بڕیاریاندا لە ناو خۆیاندا کە ئەو ڕێکەوتنامەیە هەڵوەشێننەوە، کە غەدرو خراپە کاری تیایە بەرامبەر ئەو دوو لایەنە وە بێ بەریبوونی خۆیانی لێ ئاشکرا بکەن، ئەوە بوو خوای گەورە مۆرانەی ناردە سەر ئەو کاغەزە و هەرچی ناوی خوا هەبوو بە کاغەزەکەوە نەیهێشت و سڕییەوە تەنها زوڵم و غەدر نەبێت.

(لەڕیوایەتێکی تردا: تەنها ناوی خوا مابوەوە ئەوی تری سڕابووەوە) بەڵام ڕیوایەتەکەی (موسای کوڕی عوقبە ﷺ ڕاسترە (کە تەنها ناوی خوا سڕابووەوە ئەوانی تر مابووەوە) دەفەرموێت: هەمووی سڕابووەوە تەنها ئەو ستەم کاریانە و پەیوەندی خزمایەتی پچڕان نەبێت کە تیایدا مابووەوە، خوای گەورە ئەم هەواڵەی گەیاند بە پێغەمبەر ﷺ کە چی کردووە لە ڕێکەوتنامەکەیان، پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی گێڕایەوە بۆ ئەبو طالب. ئەبو طالبیش وتی: سوێند بە ئەستێرە کونتێکراوەکان موحەمەد قەت درۆی نەکردووە لەگەڵمدا، ئینجا لەگەڵ کۆمەڵێکدا ڕۆیشتن تا چوونەلای کەعبە و ئەو ڕۆژە زۆرێك لەقوڕەیشیەکانی لێ بوو کە بینیان ئەبوطالب هاتووە ئەوانیش بە لووت بەرزیەکەوە تەماشایان کرد وایانزانی هاتووە بۆ ئەوەی پێغەمبەریان ﷺ تەسلیم بکات، وایان زانی ئەمانە نارەحەتی گوشاری گەمارۆکە وای لێکردوون کە ناچاربن بە تەسلیم کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ.

ئەبوطالب هات وتی: چەند شتێك ڕووی داوە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا پێویست ناکات باس بکرێت، بەڵام ئێوە ئەو بڕیارەی کە نووسیوتانە و پەیمانتان لەسەری داوە بیهێنن، بەڵکو لەسەر ئەو پەیمانە ڕێکەوتنامەیەك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا

ببێت، ئەمەش بۆ ئەوە بوو نەوەك کاغەزەکە بکەنەوە تا بزانن چی تیا کراوە و چی تیا نەکراوە، بۆیە داوای لێکردن نامەکەی بۆ بێنن لە نێوان ئەمان و ئەواندا، وە ئەوان هیچ گومانێکیان لەوەدا نەبوو کە پێغەمبەر ﷺ تەسلیمیان دەکرێتەوە، وە قورەیشیەکان نامەکەیان هێنا لە نێوان خۆیان و ئەبوطالبدا دایان ناو بە ئەبو طالبیان وت: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ڕازی بن و بگەڕێنەوە بۆلای خزمان و هۆزانی خۆتان و ببنەوە بەیەك و پێك بێن، خۆتان دەزانن تەنها یەك پیاو بووەتە هۆی پچڕاندنی خزمایەتی نێوان ئێمە و ئێوە کەوە بووە بەهۆی لەناوچوون و ئەو هەموو زیانەی گەیشتووە بە ئێوەی بەنی طالب و بەنی هاشم، ئەبو طالب لە وەڵامدا وتی: من هاتووم بۆ لای ئێوە تا شتێکتان پێ بدەم کە دادپەروەرتر بێت لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، برازاکەم هەرگیز درۆی لەگەڵ نەکردووم پێی ڕاگەیاندم کەخوای گەورە بەری یەو دوورە لەوەی لەناو ئەو ڕێکەوتنامەیەی ئێوەدا هاتووە و لە ژێر دەستاندایە، بۆیە هەرناوێك لە ناوەکانی خوای تێدا هەبوو بێت سڕراوەتەوە تەنها غەدرو خزمایەتی پچڕاندن و دژایەتی کردن و ستەم کردنی ئێوە نەبێت هیچیتیادا نەهێشتۆتەوە، ئەگەر ئەو هەواڵەی کە برازاکەم پێی وتم ڕاست بێت ئێوە هۆشتان بەخۆتانا بێتەوە، وەڵاهی تەسلیمتان ناکەین ئەگەر هەموومان لەناو چووبین، وە ئەگەر ئەوەی وتویەتی ڕاست نەبێت مەرج بێت تەسلیمتان دەکەینەوە یان بیکوژن یان بیهێڵنەوە.

قورەیشیەکان وتیان: ڕازین بەوەی کە دەیڵێیت، ئینجا لە پێش چاوی هەموویاندا کردیانە وە بینیان هەواڵەکە بەو شێوەیە یە کە پێغەمبەر ﷺ ڕای گەیاندبوو، کە قورەیش ئەوەیان بینی و هەڵوێستی ئەبوطالبیان تەماشاکرد وتیان: وەڵاهی ئا ئەمە سیحرە و لە لایەن موحەممەدەکەی ئێوە، ئەوە کراوە، بەرامبەر ئەو کاغەزە و هیچ شتێکی تر نییە و کینەیان ئەستورتر بوو سەبارەت بە دژایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ و دژایەتی کردنی هاوەڵانی، لەوکاتەدا هەندێ لە کوڕانی بەنی طالیب وتیان: درۆزنی و سیحر بازی شایستەی ئێمە نییە بەڵکو پیشەی ئێوەیە کە کۆبوونەتەوە دژ بەئێمە و کۆبوونەوەتان دژ بەئێمە نزیکترە لە سیحر و جادووگەری، ئەگەر سیحر نەبێت ئێوە چۆن ماوەیەکی زۆر دژ بەئێمە دەبن، هەتا خوای گەورە ناوی خۆی سڕیەوە لەو ڕێکەوتنامەیەدا تەنها مل هوڕیەکەی ئێوە نەبێت هیجی تری تیادا نەماوەتەوە، ئایا

ئێمە سیحر بازین یان ئێوە؟ ئا لەو کاتەدا هەندێ لە کوڕانی بەنی عەبدمەناف و هەندێ لە کوڕانی بەنی قوسەی و هەندێ لە قوڕەیشیەکان کە دایکیان لە بەنی هاشم بوو، لەوانە: ئەبولبوختەری و موطعیم ی کوڕی عەدی و زوهەیری کوڕی ئومەیە و زەمعەی کوڕی ئەسود وە هشامی کوڕی عەمر. کە نامەکەی لابوو لە پێش چاوی قوڕەیشیەکان وتیان: ئێمە بەرین لەوەی لەم ڕێکەوتن نامەیەدا هاتووە و بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە ئێمەوە نەماوە، ئەبو جەهل وتی: ئا ئەمە پیلانێکە بەشەو نەخشەی بۆ دانراوە و ڕێکەوتوون لەسەری.

ئەوە بوو هەڵوێستی ئەم پیاوانە بوو بەهۆی شکاندنی گەمارۆکە، ئینجا ئەبوطالبیش دەستی کرد بە هۆنینەوەی شیعرەکانی سەبارەت بە وەصفی پێغەمبەر ﷺ و باسکردنی ئەو زوڵم و ستەمانەی کراوە بەرامبەر بەنی هاشم و بەنی مطلب بۆ ماوەی سێ ساڵ وە ستایشی ئەو کەسانەی دەکرد کەهەوڵیانداوە بۆ شکاندن وپووچ کردنەوەی ئەو ڕێکەوتننامەیە)[٢٥١].

(وە هەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەر ﷺ پێزانینی خۆی دەربڕی بۆ کوڕانی بەنی هاشم و بەنی موطلب وە بەیەك چاو سەیری دەکردن جگە لە: بەنی نەوفەل و بەنی عەبدمەنافی کوڕی بەنی نەوفەل (ئەوەبوو کاتێ دەستکەوتەکانی خەیبەری هاتە دەست بەشی خۆی دابەش کرد بەسەر کوڕانی بەنی هاشم و بەنی موطلبدا کاتێك بەنی نەوفەل بەمەیان زانی وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەشی بەنی مطلبت داوە و بەشی ئێمەت نەداوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((إنَّما بَنو هاشمٍ وَ بَنو عبد المطلبِ شيٌّ واحدٌ إنَّهُمْ لَمْ يُفارِقُوني في جاهِلِيةٍ و لا في إسلامٍ)) واتە: بەنوهاشم و بەنو موطلب یەکشتن ئەوانە لێمان جیانەبوونەتەوە نەلەکاتی جاهلیدا وە نەلەکاتی ئیسلامیشدا (واتە: لە هەر دوو کاتەکەدا پشتی پێغەمبەر ﷺ یان گرتووە و پارێزگاریان لێ کردووە))[٢٥٢].

---

(٢٥١) أخرجه: البيهقي في (الدلائل) (٣١١،٣١٢/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٣٥٧/١)، وابن كثير في (البداية) (٨٢/١)، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (١٨١/١): إسناده حسن إلى الزهري.

(٢٥٢) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣١٤٠)، والبيهقي (٣٤١/٦).

## ئیبنو دوغنە ئەبوبەکر ﷺ داڵدە دەدات

لە کاتی گوشارە توندەکەی قورەیشدا بۆ سەر کوڕانی بەنی هاشم و بەنی موطلبدا لێرەدا ئەبو بەکر دوای ئەو ئازاردانە ناچاربوو بە بەجێ هێشتنی شاری مەککە و کۆچ کردن بەرەو حەبەشە. عائیشە ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ موسوڵمانان تووشی بەڵای سەخت هاتن، ئەبو بەکر دەرچوو بۆ کۆچ کردن بەرە و حەبەشە تا گەیشتە (برك الغماد) کە شەوێك یان دوو شەو دوورە لە مەککەوە، لەوێ ئەبو دوغنەی پێگەیشت، کە سەرۆکی ئەحابیشیەکانە و پێی وت: دەتەوێ بۆ کوێ بچیت؟ ئەبو بەکریش وتی: لە مەککە دەریان کردم و ئازاریاندام و گوشاریان خستۆتە سەرم و دەمەوێت بگەڕێم بە زەویدا و خوا بپەرستم. ئەبو دوغنە وتی: یەکێکی وەکو تۆ ئەی ئەبو بەکر! هەرگیز دەرناچیت و دەریش ناکرێیت، وەڵاهی تۆ هۆزەکەت دەڕازێنیتەوە، تۆ یارمەتی نەبوونیان دەدەیت، سەردانی خزمانت دەکەیت و لا دەکەیتەوە لە بێ نەوایان، و خزمەتی میوان دەکەیت، و لە هەموو کارێکی چاکەدا دەستی یارمەتی پێش دەخەیت بگەڕێرەوە من داڵدەت دەدەم هیچیان ناتوانن هیچت لێبکەن بگەڕێرەوە لە شاری خۆتدا خوای خۆت بپەرستە، ئینجا ئەبو دوغنە خۆی ئامادەکرد و لەگەڵ ئەبوبەکردا هەردووکیان گەڕانەوە بۆ مەککە.

کاتێ ئێوارە داهات ئەبو دوغنە بەناو پیاو ماقوڵانی قورەیشدا گەڕاو پێی وتن: هۆ کۆمەڵانی قورەیش من کوڕی ئەبو قوحافە ئەبوبەکرم داڵدەداوە هیچ کەسێك بۆی نییە هیچ بکات بەرامبەری، تەنها چاکە نەبێت ئەبوبەکر پیاوێکە هەرگیز نابێت دەربکرێت و دەریش ناکرێت، ئایا پیاوێك دەردەکەن کە دەستی یارمەتی درێژ دەکات بۆ بێ نەوایان و پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنێت و ڕێز لە میوان دەگرێت، و لە هەموو کارێکی چاکەدا دەستپێشخەری دەکات، قورەیشیەکان پەنادانی ئەبوبەکر یان لە لایەن ئەبودوغنەوە قبوڵکرد وە هیچیان نەکرد بەرامبەر ئەبوبەکر، بەڵام بە ئەبو دوغنەیان وت: بە ئەبوبەکر بڵێ با خواکەی خۆی بپەرستێت لە خانووەکەی خۆیدا وە بە ئارەزووی خۆی نوێژی تیا بکات و قورئانی تیا بخوێنێتەوە بەڵام ئازارمان نەدات و بە ئاشکرا ئەمانە ئەنجام نەدات ئێمە لە وە دەترسین کە ئافرەتەکانمان و کوڕەکانمان لە خشتە بەرێت.

ئەبو دوغنەش ئەمانەی بە ئەبو بەکر وت، ئیتر لەو کاتەوە ئەبوبەکر ﷺ لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند ئەوەندەی پێ نەچوو ئەبوبەکر خۆی نەگرت لەپەنا خانوەکەیدا لە (حَجون) لە بەنی جومەح لەو لای شاری مەککە مزگەوتێکی دروست کرد و بە ئاشکرا قورئانی تیا دەخوێند و هەموو ئافرەتانی قورەیش و کوڕانیان کۆدەبوونەوە لێی و تەماشایان دەکرد وە ئەبوبەکر ﷺ پیاوێکی دڵ نەرمی دڵناسك بوو فرمێسکی چاوی پێنەدەگیرا، هەموو منداڵان و کۆیلەکان دەهاتن سەیریان دەکرد و سەریان دەسوڕما لە هەڵسوکەوتی، ئەمەش کافرانی قورەیشی ترساند تاوایان لێهات نوێنەریان نارد بۆ لای ئەبو دوغنە و بانگیان کرد کە بێت بۆ مەککە و وتیان: ئەبو بەکرمان پەنادا بە پەنادانی تۆ بەمەرجێك کە خوای خۆی بپەرستێت لە خانووەکەی خۆیدا، ئێمە پەنامان نەداوە بە ئاشکرا قسەمان پێ بڵێت و ئازارمان بدات بەو قسانەی کە موحەمەد بۆی هاتووە بەڵکو لەوەش زیاتری کردووە و مزگەوتێکی لە پشت ماڵەکەی خۆیدا کردۆتەوە، و بە ئاشکرا نوێژی تیا دەکات و قورئانی تیا دەخوێنێت، ئەو پیاوێکە گەر قورئان بخوێنێت و نوێژ بکات دڵی نەرم دەبێت و دەست دەکات بە گریان، بەو گریانە دەبێتە جێی سەرنج ڕاکێشان، لەوە دەترسین کە ژنان و منداڵان لە خشتە بەرێت ئەگەر پێی خۆشە لە ماڵی خۆیدا چی دەکات بابیکات، ئەگەر پێی خۆش نییە و دەیەوێت بە ئاشکرا بیکات ئەوا داوای لێ بکە با پەنادانەکەت بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ڕازی نابین ئەبوبەکر بە ئاشکرا ئەوکارانە ئەنجام بدات.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: ئیبنو دوغنە هات بۆلای ئەبوبەکر وتی: بیرتە ئەوەی لەسەری ڕێکەوتین چی بوو؟ یان ئەوەتا لەسەر ئەوە بەردەوام ببە یان ئەوەتانێ پەنادانەکەم بۆ بگێڕەرەوە، من پێم خۆش نییە عەرەب ببیستێ یەکێکم پەنادابێت و پەنادانەکەمیان شکاندبێت، من پەنام نەداویت بۆ ئەوەی ئازاری قەومەکەت بدەیت، ئەوان حەزیان لەو جێگە و کارە نیەکە تۆ ئەنجامی دەدەیت، بچۆرەوە ماڵی خۆت چی تیا دەکەیت بیکە. ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: پەنادانەکەت بۆ دەگێڕمەوە و ڕازی دەبم بە پەنادانی خوا وتی: دەباشە پەنادانەکەم بۆ بگێڕەرەوە، ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: پەنادانەکەی تۆم بۆلات گێڕایەوە و ڕازیم بە پەنای خوا، ئیبنو دوغنە چوو بۆلای کۆمەڵانی قورەیش و وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش ئەبوبەکر پەنادانەکەی

بۆ گێڕامەوە، ئیتر ئارەزووی خۆتانە چی دەکەن بیکەن هێشتا پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا هەر لەمەککە بوو)[٢٥٣].

## هاتنی پیاو ماقوڵانی قوڕەیش بۆلای ئەبو طالب لەسەرەمەرگ دا

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ ئەبو طالب نەخۆش کەوت قوڕەیش پێیان گەیشت کە نەخۆشی یەکەی سەختە هەندێکیان لە ناو خۆیاندا بە هەندێکیان وت: حەمزە و عومەر موسوڵمان بوون، وە ئاینەکەی موحەمەد بڵاوبۆتەوە بە هۆزەکانی قوڕەیش دا، با هەمووومان بچین بۆلای ئەبو طالب بۆ ئەوەی شتێکمان بۆ وەربگرێت لەو برازایەی یان شتێکی بدەینێ وەڵاهی دەترسین سبەینێ سەروەریمان لە دەست بچێت)[٢٥٤]، بەم شێوەیە چوون بۆلای ئەبو طالب بۆ ئەوەی پەیمانێك وەرگرن لە پێغەمبەر ﷺ وە ڕێکەوتن نامەیەکی لەگەڵ ئەنجام بدەن بە ئامادەبوونی ئەبو طالب کەلەسەرەمەرگدا.

بەسەرهاتەکەش هاوەڵی پایەبەرز ئیبنو عەباس ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (هەندێك پیاو ماقوڵانی قوڕەیش چوونە لای ئەبوطالب: لەوانە: عوقبەی کوڕی ڕەبیعە، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، ئومەیەی کوڕی خەلەف، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، لەگەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی تردا وتیان: ئەی ئەبو طالب: خۆت باش دەزانیت کە چەندە ڕێزی تۆمان لەلا گەورەیە تۆش وا نەخۆش کەوتوویت و لەسەر جێگەدای و ئێمە ترساوین لەوەی کە لەو نەخۆشیەدا تیابچیت وە دەزانیت چی هەیە لە نێوان ئێمەو برازاکەت دا، بانگی بکەو شتێکمان بۆی لێ وەرگرە، وە شتێکیش لە ئێمە وەرگرە بۆ ئەو، با وازمان لێبێنێت وئێمەش وازی لێبێنین، و ئەو دووركەوێتەوە لە خۆمان و ئاینمان، تا ئێمەش دووركەوینەوە لە خۆی و ئاینەکەی، ئەبو طالب ناردی بە شوێن پێغەمبەر ﷺدا و پێغەمبەریش ﷺ هات و پێی وت: ئەی برازا ئەمانە سەرکردەکانی هۆز و خزمانی خۆتن کۆبوونەتەوە

(٢٥٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٠٥،٥٨٠٧)، وأحمد (المسند) (١٩٨/٦)، وعبدالرزاق(٩٧٤٣)، وأبو نعيم في (الحلية) (٢٩/١)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٧١/٢)، وابن حبان (٦٢٧٧) قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وابن هشام في (السيرة) (٣٨٣/١) (٢٥٦) وقال محققاه إسناده جيد، و و حسن إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٧١/١).

(٢٥٤) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٧/٢).

بۆ ئەوەی شتێکت بدەنێ (واتە: داواکاریت چییە؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی مامە تەنها یەك شتم بدەنێ دەبن بە سەرکردەی عەرەب و عەجەمیش سەرانەیان پێ دەدەن ئەگەر ئەو وشە یە بڵێن؟ ئەبو جەهلیش بە خۆشحاڵانە وتی: ئەوە دە وشەش بۆ تۆ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڵێن (لا إله إلا اللهُ) و واز بهێنن لەو بتانەی کە دەیپەرستن. موشریکەکان دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و وتیان: ئەی موحەمەد دەتەوێت، خواکان بکەیت بە یەك خوا ئەمە شتێکی زۆر سەیرە ئیتر هەندێکیان بە هەندێکیان دەوت: وەڵاهی ئەم پیاوە هیچ شتێکتان پێ نادات لەوەی کە ئێوە دەتانەوێت بڕۆن وازی لێ بهێنن لەسەر ئاینی باوك و باپیرانتان بەردەوام بن، هەتا خوای گەورە یەکلایی دەکاتەوە لە نێوان ئێوە و موحەمەددا ئینجا ڕۆیشتن....)[٢٥٥].

هەروەها ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت سورەتی:﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ ﴾(ص) سەبارەت بەو کۆڕو کۆمەڵە لە کاتی سەرەمەرگی ئەبوطالبدا هاتە خوارەوە کە ئەبو جەهل و کۆمەڵەکەی بەرپەرچی پێغەمبەر ﷺ یان دایەوە...)[٢٥٦].

## مردنی ئەبو طالیب

ئەبو طالب یەکێك بوو لە هەرە دڵسۆزانی پێغەمبەر ﷺ ، وە بەردەوام پەنای پێغەمبەری ﷺ دەدا و پارێزگاری لێ دەکرد ، و بە هەموو جۆرێك پشت و پەنای دەگرت، بەڵام ئەبو طالب سەرەڕای ئەم هەموو، وە باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەر ﷺ نەبوو وە بە هیچ جۆرێك دژایەتی پێغەمبەریشی ﷺ نەدەکرد و بە درۆشی نەدەخستەوە، بەڵکو لە هەموو جێگەیەك، باسی خۆی و هاوەڵانی وە ئاینەکەشی بە چاکە دەکرد بەڵام بێ باوەڕ بوو....

(٢٥٥) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٧٧/١) وفي (٣٦٢/٢) رقم (٢٠٠٨، ٣٤١٩) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف، والطبري في (التفسير) (٧٩/٢٣)، وأبو يعلى (٢٥٨٣)، والترمذي (السنن) (٣٢٣٢) وقال حديث حسن صحيح، والنسائي في (الكبرى) (١١٤٣٧،١١٤٣٦،٨٧٦٩) وفي (التفسير) (٤٥٦) وقال محققه: حسن، وابن أبي شيبة (المصنف) (٣٥٩/٣) وفي (٢٩٩/١٤)، وابن حبان في (موارد) (١٧٥٧) وقال محققه الأرناؤوط: ضعيف، والبيهقي في (الكبرى) (١٨٨/٩)، والحاكم (٤٣٢/٢) وصححه ووافقه الذهبي وقال أحمد شاكر في المسند (٢٠٠٨): إسناده صحيح، وابن هشام (٢٧/١) (٢٩٧) عن ابن إسحاق وقال محققاه: إسناده فيه مبهم)، و المبهم من إسناد ابن هشام عن ابن عباس بن عبدالله بن معبد عن أبيه عن ابن عباس كما في رواية الحاكم الذي سيأتي قريباً مع رواية النسائي في (التفسير) (٤٥٧) واللفظ لابن هشام.

(٢٥٦) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٤٣٢/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٣٤٦/٢) وقال محقق (تفسير النسائي) (٤٥٦): إسناده حسن، وقال محققا (سيرة ابن هشام) (٢٩٧): إسناده جيد.

لە حەبەی عەرنیەوە ﷺ دەفەرمویێت: عەلیم ﷺ بینی لەسەر مینبەر پێدەکەنی جارێکیان ئەوەندە پێکەنی کە قەت نەمدیووە ئەوەندە پێ بکەنێت ئەوەندە پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوت، فەرمووی: قسەیەکی ئەبو طالیبم بیرکەوتەوە جارێك من و پێغەمبەر ﷺ لە (بطن النخلة) نوێژمان دەکرد هات بەڕووماندا وبینی چۆن نوێژ دەکەین و چی دەڵێین دوای تەواو بوونی نوێژەکەمان پرسیاری لێکردین وتی: ئەوە چی دەکەیت ئەی برازاکەم؟ پێغەمبەریش ﷺ بانگی کرد، وە ئیسلامی پێ ڕاگەیاند و بۆی ڕوون کردەوە، ئەبو طالب وتی: ئەمەی ئێوە دەیکەن خراپ نییە ئەوەیشی دەیڵێین هەر خراپ نییە، بەڵام وەڵاهی هەرگیزاو هەرگیز دوامەوە بەرز نابێتەوە بەسەر سەرمدا، دەفەرموێت: بە ئەو قسەیەی ئەبوطالب زۆر پێکەنیم هات سەیرم لێ دەهات کە ئەو قسەیەی کرد)[٢٥٧].

پێغەمبەر ﷺ لە سەرەمەرگی ئەبو طالیبدا زۆر بەدڵسۆزانە داوای لێکرد بۆ ئەوەی شایەتمان بهێنێت، و بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت و بە بەهەشت شاد بێت، بەڵام هەر باوەڕی نەهێنا...

ئەم بەسەرهاتەش موسەیەبی کوڕی حەزن ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((لەکاتی سەرەمەرگی ئەبو طالبدا پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای و بینی ئەبو جەهلی لایە لەگەڵ عەبدوللای کوڕی موغیرە، پێغەمبەر ﷺپێی فەرموو: ((يا عمٍّ إنَّكَ أعظَمهم علي حقاً و أحسَنُهُم عِنْدِي يداً و لأَنْتَ أعْظَمُ حَقاً على مِنْ والدي قُلْ : لا إلهَ إلَّا اللهُ أشهَدْ لكَ بها عندَ اللهِ (في رواية) فَقُلْ كَلِمَة تجِبُ لكَ علي بِها الشَفاعة يَومَ القيامة قُلْ: لا إله إلاّ الله)). واته: ئەی مامە تۆ لە هەموو کەس زیاتر مافت بەسەر منەوە هەیە، لە هەموویان چاکتر بووی بۆم، تۆ زیاتر لە دایك و باوکم مافت هەیە بە سەرمەوە، بڵێ (لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ) بەو وشەیە تا تکاکردن بۆت لە سەرم پێویست بێت، لەڕوایەتێکدا وشەیەك بڵێ کە بتوانم بەهۆیەوە لەقیامەتدا تکات بۆ بکەم، بڵێ (لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ). ئەبو جەهل و عەبدوللا ڕوویان کردە ئەبو طالب و پێیان وت: ئەی ئەبو طالب ئایا دەتەوێت واز لە ئاینی عەبدولموطلب بێنیت، پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام ئەم وشەیەی دەدا بە گوێیدا، و ئەوانیش بەردەوام ئەو وشەیەی خۆیان دەدایەوە بەگوێیدا، تا دوا وشەی ئەبو طالب

---

(٢٥٧) أخرجه: أحمد (٩٩/١) (٧٧٦) وقال محققه: إسناده ضعيف، وأبو يعلى(٤٤٧)، والبزار (٧٥١)، والطيالسي (١٨٨)، قال الهيثمي في (المجمع) (١٠٢/٩): رواه الطبراني في الأوسط و إسناده حسن.

ئەوە بوو کە وشەکەی ئەوانی دووبارە کردەوە)[٢٥٨].

لەڕیوایەتێکی تردا: (ئەبو طالب وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە قورەیش بیکەن بە عەیبە بۆم و بڵێن: لەترسی مردن ئەو وشەیەی وتووە ئەگینا لەبەر دڵی تۆ دەم وت: بەڵام (أنا على مِلَةِ عَبْد المُطَلِب) واتە: من لەسەر ئاینی عەبدول موطەلیبم ئەوە بوو مردوو ڕازی نەبوو کە بڵێ (لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ) و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((أما واللَّهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لكَ ما لَمْ أُنْهَ عَنْكَ)) واتە: بەڵام وەڵاهی داوای لێخوش بوونت بۆ دەکەم، تا خوا ئەو کارەم لێ قەدەغە دەکات و ڕێگەم پێ نادات).

لەڕیوایەتێکدا دەفەرموێت: (پێی وت: خوا لێت خۆشبێت بەردەوام داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەم لای خوا تاخوا ڕێگرم لێ دەکات. موسوڵمانانیش کەوتنە داوای لێ خۆش بوون بۆ مردووانیان کە بەموشریکی مردبوون)[٢٥٩]. ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کەدەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾(التوبة) خوای گەورە ڕونی کردەوە کە هەرگیزاو هەرگیز بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ خاوەن باوەڕان نییە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ هاوبەش پەیدا کاران، ئەگەر خزمانیشیان بن دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە دۆزەخین وە دەفەرموێت: ئایەتەکەش سەبارەت بە ئەبو طالیب دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾(القصص). ئەبو طالب بەم شێوەیە مرد و شایەتمانیشی نەهێنا بەتاك و تەنهایی خوا، ئەبو طالب دەبێت دوای مردنی کێ بیشارێتەوە، چونکە تەنها ئیمامی عەلی لێرەیە و جەعفەری برای لە حەبەشەیە[٢٦٠].

ئیمامی عەلی ﷺ خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ ئەبو طالب مرد هاتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ وپێم وت: مامە پیرەکەت مرد کێ بیشارێتەوە؟ پێغەمبەر

(٢٥٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٨٤،٤٧٧٢،٣١٦٠،١٣١٠)، ومسلم (الصحيح) (٢٤)، والنسائي (السنن) (٩٠/٤) (٢٠٣٤)، وأحمد (المسند) (٤٣٣/٥)، والحاكم (المستدرك) (٣٣٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٤٣٢/٢)، والطبراني في (الكبير) (٢٨٨/٢٠).

(٢٥٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٤٢/٢) (٩٦١٠) وقال محققه:إسناده صحيح على شرط مسلم، والترمذي (٣١٨٨)، وابن حبان (٦٢٧٠) وقال محققه: صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٤٨).

(٢٦٠) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٣٣٥/٢) وَصَحَحَهُ ووافقه الذهبي.

ﷺ فەرمووی (بڕۆ بیشارەوە و هیچ مەکە تا دێیتەوە بۆلام. منیش وتم: لەسەر هاوتا بڕیاردان مردووە؟ فەرمووی: بڕۆ بیشارەوە، ئینجا ڕۆیشتم شاردمەوە و هاتمەوە بۆ لای و پێی وتم: بڕۆ خۆت بشۆرە و هیچ نەکەیت تا دێیتەوە لام، منیش چووم خۆم شت و هیچم نەکرد تا هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، ئینجا هەندێ دوعای بۆ کردم کەلەلام شیرین تر بوو لە وشترە سوور و ڕەشە قەڵەوەکان)[٢٦١].

لە پاداشتی ئەو هەموو چاکەیەی ئەبو طالب کردی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ لە بەرگری و بەگژدا چوونەوەی کافرانی قوڕەیش و دوژمنکاریەکانیان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ، وە سەرەڕای شیعرە جوانەکەی کە بەناوبانگە بە (القصيدة اللامية) کە لە مەدحی پێغەمبەر ﷺدا دایناوە، و لە شیعرەکاندا بەخراپە باسی هاوبەش پەیداکارەکان دەکات وە لایەنی چاکەی موسوڵمانان باس دەکات، وە دووپاتی دەکاتەوە کە موحەمەد ڕاستگۆیە و هەرگیز درۆی نەکردووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ تکای بۆ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کە سزاکەی لەسەر سووک بکرێت: (عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب برای ئەبو طالب بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئایا هیچ سودێکت بە ئەبو طالب گەیاندووە، چونکە ئەو پارمەتی دەدایت و تووڕە دەبوو لە پێناوی تۆدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نَعَمْ، وجَدْتُهُ في غَمَرَاتٍ مِنَ النَّارِ، فأخْرَجْتُهُ إلى ضَحْضاحٍ))[٢٦٢] واتە: بەڵێ دۆزیمەوە لە ناوەڕاستی دۆزەخدا بوو من دەرم هێنا بۆلای تەنکاییی و قەراغی ئاگری دۆزەخ....).

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ([لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتي يَومَ القِيَامَةِ، فيُجْعَلُ في ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ، يَغْلِي منه دِمَاغُهُ[٢٦٣] (من النارِ، ولولا أنا لكان في الدركِ الأسفلِ من النارِ)][٢٦٤] واتە: بەڵکو تکاکردنی من لەڕۆژی قیامەتدا سودی پێ بگەیەنێت و بکرێتە پارچەیەك

---

(٢٦١) أخرجه: النسائي (السنن) (١١٠/١) (٧٩/٤)، وأبو داود (السنن) (٣٢١٤)، وعبدالرزاق (المصنف) (٩٩٣٦)، وأحمد (المسند) (١٣٠/١) (١٠٧٤،٨٠٧،٧٥٩) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف، والطيالسي (١٢٠)، وابن أبي شيبة (٣٤٧/٣)، والبيهقي (السنن) (٣٠٤،٣٠٥/١) وضعفه في (الدلائل) (٣٤٨/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (١٨٤،١٨٩٥) وفي (السلسلة الصحيحة) (١٦٠) وفي (أحكام الجنائز) (١٦٩) مسألة الدفن و توابعه.

(٢٦٢) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٥١٠).

(٢٦٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٨٥)، ومسلم (الصحيح) (٥١١)، وأحمد (المسند) (٩/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٣٤٧/٢)، وابن حبان (٦٢٧١) وقال محققه: صحيح.

(٢٦٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٨٥)، ومسلم (الصحيح) (٥١١)، والحميدي (٤٦٠)، وأحمد في (المسند) (٩/٣) والبيهقي (الدلائل) (٣٤٧/٢) في (الصحيح) (٦٢٧١) وصحح محققه.

ئاگر کەتا قولەپێ دەگرێتەوە ودەماغی دەکوڵێنێت، وە ئەگەر من نەبوومایە لەقوڵایی دۆزەخدا دەبوو، لە پاداشتی ئەو هەموو چاکەیەی کە کردی بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ. سوکترین سزا دەدرێت لە ناو خەڵکانی دۆزەخدا، هەر لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذابًا أبو طالِبٍ، وهو مُنْتَعِلٌ بنَعْلَيْنِ يَغْلِي منهما دِماغُهُ))[٢٦٥] واتە: (سوکترین سزا دراوی ناو دۆزەخ ئەبو طالیبە کە دوو نەعلی ئاگرینی بە قاچدا کراوە و دەماغی دەکوڵێنێت....).

## مردنی خەدیجەی کچی خوەیلد ﷺ

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (خەدیجە و ئەبوطالب لەیەك ساڵدا مردن. بەمردنی خەدیجە ناخۆشیەکان لەسەر پێغەمبەر ﷺ زیادی کرد، چونکە یاریدەدەرێکی ڕاستگۆ بوو بۆ ئیسلام و بۆ پێغەمبەر ﷺ)[٢٦٦].

ئیمامی حاکم ﷺ دەفەرموێت: (مردنی خەدیجە دوای ئەبوطالب بوو بەسێ ڕۆژ)[٢٦٧]. بەڵام ئیبنو جەوزی ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو طالب و خەدیجە مردن ماوەی نێوانیان تەنها مانگێك و پێنج ڕۆژ بوو نارەحەتی و بەڵایەکی زۆر سەخت بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ تا ناچار بوو تەنها لەماڵەوە بێت و نەیەتە دەرێ وە قورەیش ئەوەی کە نەیان دەوێرا پێشتر بیکەن بەرامبەری لەوە بەدواوە ئەنجامیان دا))[٢٦٨]، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((ما زالت قريشٌ كاعَّةً عنِّي حتَّى تُوفِّيَ أبو طالِبٍ))[٢٦٩] واتە: قورەیش هەموویان ترسنۆك بوون بەرامبەرم تاکو ئەبوطالب مرد.

خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ماوەیەکی زۆر ژیانی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بردۆتە سەر و هیچ ژنێکی بەسەردا نەهێناوە، وە هەموو منداڵەکانی تەنها لەوئافرەتە بەڕێزەیە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ زۆر بەچاکە باسی دەکرد، وە لە چاکێتیدا خوای

---

(٢٦٥) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٥١٥).

(٢٦٦) أنظر: سيرة ابن هشام (٢٦/٢)، والطبري في (التأريخ) (٣٤٣/٢).

(٢٦٧) أنظر: ابن سعد في (الطبقات) (١٨/٨).

(٢٦٨) أنظر: المنتظم لابن الجوزي (١١/٣).

(٢٦٩) أخرجه: الحاكم (٦٢٢/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (٣١): إسناده جيد.

گەورە پلەی تایبەتی بۆ داناوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: جبریل ﷺ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ، وە فەرمووی ئەی محمد ئەوە خەدیجەیە دێت بۆ ئێرە قاپێکی پێ یە خواردنی تێدایە (یان ئاو) ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پێبگەیەنە لەلایەن خواوە وەلایەن منیشەوە (واتە: خوا سەلام لەخەدیجە دەکات وسەلامی منیشی پێبگەیەنە) وە مژدەشی بەرێ بەکۆشکێك لەبەهەشتدا کەنارەحەتی و غەلبە غەڵبی تیانی یە)[٢٧٠]، خەدیجەش لەوەڵامدا فەرمووی: (خوای گەورە سەلامە و سەلامیش لەجبریل بێت وسەلام و ڕەحمەت وبەرەکەت لە تۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ)[٢٧١]، هەروەها خەدیجە ﷺ یەکێکە لە ئافرەتە هەرە بەڕێزەکانی ئەهلی بەهەشت لەدونیادا.

لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چوار هێڵی کێشا لەزەویداو ئینجا فەرمووی دەزانن ئەم چوار هێڵە چین؟ وتمان: خوا و پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن. فەرمووی: ((أفضلُ نِساءِ أهلِ الجنةِ خديجةُ بنتُ خُوَيْلِدٍ ، و فاطمةُ بنتُ محمدٍ ، و مريمُ بنتُ عِمْرَانَ ، و آسِيَةُ بنتُ مُزَاحِمٍ امرأةُ فِرْعَوْنَ)) واتە: (چاکترین ئافرەتانی ئەهلی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلد، و فاتیمەی کچی محمد و مەریەمی کچی عمران، و ئاسیای کچی مزاحمی ژنی فرعەونە)[٢٧٢].

بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەرگیز باسی خەدیجەی فەرامۆش نەکردووە و لەیادی نەچووە و زۆر جاریش لای عائیشە گێڕاویەتی یەوە، عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ باسی خەدیجەی بکردایە زۆر بەچاکی باسی دەکرد، منیش ڕۆژێك تووڕە بووم لەو قسەیە وتم: ئەوە ئەوەندە بۆ باسی دەکەیت ئافرەتێکی لێو سووری پیر بوو خوای گەورە لەوە چاکتری پێبەخشیوێت، پێغەمبەریش ﷺ

(٢٧٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٢٠)، ومسلم (الصحيح) (٦٢٢٣)، وأحمد في (المسند) (٢٣١/٢) وفي (الفضائل) (١٥٨٨) وقال محققه: إسناده صحيح، وابن أبي شيبة(١٣٣/١٢)، والحاكم (المستدرك) (١٨٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني في (الكبير) (١٠/٢٣)، وابن حبان (الصحيح) (٧٠٠٩) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢٧١) أخرجه: النسائي في (السنن الكبرى) (٨٣٥٩)، وقال الشيخ مقبل الوادعي في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) رقم (١١٦) حديث حسن.

(٢٧٢) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢٩٣/١) (٢٦٦٨) وقال محققه: إسناده صحيح،وفي (الفضائل) (٢٥٠)، والنسائي في (الكبرى) (٨٣٦٤)، و الطحاوي في (مشكل الآثار) (١٤٨)، وأبو يعلى (المسند) (٢٧٢٢)، والطبراني في (الكبير) (١١٩٢٨)، وابن حبان (٧٠١٠) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الحافظ في (الفتح) (٥٨٣/٦): إسناده صحيح.

فەرمووی: ((أبدَلَني اللهُ خيراً منها! قد آمنَتْ بِي إذ كفَر بِي النَّاسُ وصدَّقَتْني إذ كذَّبَني النَّاسُ وواسَتْني بمالِها إذ حرَمَني النَّاسُ ورزَقَني اللهُ أولادَها وحرَّمَني أولادَ النَّاسِ))[٢٧٣] واته: خوای گەورە لەوە چاکتری پێ بەخشیوم؟ باوەڕی پێهێنام کاتێ هەموو خەڵکی باوەڕیان پێ نەهێنام و بەڕاستی خستمەوە کاتێ هەموو خەڵکی بەدرۆیان خستمەوە، بەماڵ و بەنەفسی خۆی پشگیری کردم کاتێ خەڵکی دژم وەستان، وە خوای گەورە لەو منداڵی پێبەخشیم وە لەهیچ ژنێکی تر منداڵی پێنەبەخشیم).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ وەك ڕێزگرتنێك لە خەدیجە ﷺ ڕێزی لەخزم و دۆستەکانیشی دەگرت لەدوای مردنی. عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (غیرەم نەبوو بەرامبەر بەیەکێ لەخێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی کە غیرەم بوو بەرامبەر بە خەدیجە هەرچەندە نەشم دیبوو لەژیانمدا، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زۆر جار باسی دەکرد وە هەندێ جار ئەگەر مەڕی سەر بڕیایە پارچە پارچەی دەکرد و دەینارد بۆ هاوڕێکانی خەدیجە، وەهەندێ جاریش پێم دەوت: دەڵێی ئافرەت نییە لەسەر دنیادا تەنها خەدیجە نەبێت؟ پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو ((خەدیجە ئاوهابوو ئاوهابوو وە منداڵیشم لێی هەبوو))[٢٧٤].

## بەسەرهاتی خوازبێنی کردنی خاتوو عائیشە و سەودە بۆ پێغەمبەر ﷺ

دوای مردنی خەدیجە پێغەمبەر ﷺ عائیشەی کچی ئەبو بەکری مارە کرد وە نەیگواستەوە، بەڵام سەودەی کچی زەمعەی مارە کردو لەوێ گواستیەوە پێش ئەوەی عائیشە بهێنێت، وە خوای گەورە سێ جار عائیشەی نیشانی پێغەمبەر ﷺدا وە لەخەودا لە پێش مارە کردنیدا فریشتەیەك لەپارچەیەك ئاوریشمدا هێناویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ.

---

(٢٧٣) أخرجه: أحمد (المسند) (١١٧/٦) (٢٤٨٦٤) وقال محققه: إسناده صحيح، والطبراني في (الكبير) (٢٢/٢٣)، وقال ابن كثير في (البداية) (١٢٩/٣): إسناده لابأس به، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٢٤/٩): إسناده حسن.

(٢٧٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨١٨)، ومسلم (الصحيح) (٦٢٢٩)، وأحمد في (المسند) (٥٨/٦) وفي (الفضائل) (١٥٨٩) وقال محققه: إسناده صحيح، والترمذي (السنن) (٢٠١٧)، والحاكم (المستدرك) (٥٨٩/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٦٤١).

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: ((أُرِيتُكِ فِي المَنَامِ ثَلَاثَ لَيَالٍ، جَاءَنِي بِكِ المَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِن حَرِيرٍ، فَيَقُولُ: هذِهِ امْرَأَتُكَ، فأَكْشِفُ عن وَجْهِكِ ((الثوب)) فَإِذَا أَنْتِ هي، فأقُولُ: إنْ يَكُ هذا مِن عِندِ اللهِ، يُمْضِهِ)) واتە: تۆم بینی لە خەودا سێ شەو فریشتەیەك تۆی دەهێنا بۆ لام لە ناو پارچە ئاوریشمێکدا و دەیوت: ئا ئەمە خێزانەکەتە، منیش ئاوریشمەکەم بە سەر دەم و چاوتەوە لا دەبرد و تەماشام دەکرد تۆ بوویت، منیش دەموت: ئەگەر ئا ئەمە لای خواوە بێت دەیهێنێتەدی)[٢٧٥].

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (کاتێ خەدیجە وەفاتی کرد، خەولەی کچی حەکەمی کوڕی ئەوقەس خێزانی عثمانی کوڕی مضعون ﵁ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، لە مەککە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ژن ناهێنیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ؟ ئەویش وتی: ئەگەر ویستت لێیە کچ هەیە، وە ئەگەر ویستت لێ هەبێت ژنیش هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کچەکەیان کێیە؟ وتی: کچی خۆشەویستترین کەس لای تۆ، عائیشەی کچی ئەبوبەکرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی ژنەکە کێیە؟ وتی: سەودەیە کە باوەڕی پێت هێناوە و شوێنت کەوتووە لەسەر ئەو باوەڕەی کە تۆ لەسەریت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڕۆ خوازبێنی هەردووکیانم بۆ بکە. دەفەرموێت: چووم بۆ ماڵی ئەبوبەکر، ئوم ڕومانی ﵂ دایکی عائیشە لە ماڵ بوو پێم وت: ئەی ئوم ڕومان ئای لەو دەرگا خێرو بەرەکەتەی کە بە ڕووی ئێوەدا کراوەتەوە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ منی ناردووە بۆلاتان تا خوازبێنی عائیشە بکەم، ئوم ڕومانیش ﵂ وتی: خۆزگە دەخوازم بەڵام چاوەڕێکە تا ئەبوبەکر دەگەڕێتەوە، ئەوە بوو ئەبوبەکر گەڕایەوە و خەولە ﵂ پێی وت: ئەی ئەبوبەکر خوای گەورە چ دەرگایەکی خێرو بەرەکەتی بەڕوودا کردوویتەتەوە، پێغەمبەر ﷺ ناردوومی تا خوازبێنی عائیشە بکەم، ئەبوبەکر ﵁ وتی: ئایا بۆی دەشێت چونکە عائیشە کچی براکەیەتی؟ دەفەرموێت: ئەویش گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ وە قسەکەی ئەبوبەکری بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (بڕۆرەوە بۆلای و پێی بڵێ تۆ برامی لە ئیسلامدا ئەویش دەشێ بۆ من) دەفەرموێت: چوومەوە بۆلای ئەبوبەکر و پێی ڕاگەیاند، وە ئەبوبەکریش ﵁ وتی: با پێغەمبەر ﷺ تەشریف بهێنێت).

(لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: کە پێغەمبەر ﷺ هات ئەبوبەکر پێی فەرموو:

---

(٢٧٥) أخرجه: البخاري (٥١٢٥)، ومسلم (٦٢٣٣)، واللفظ له وأحمد (١٢٨/٦)، وابن حبان (٧٠٩٤).

من برای تۆم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَنْتَ أَخي في دينِ اللهِ وَ كِتابِه، وَ هَيَ لِيَ حَلال))[٢٧٦] واتە: تۆ برای منی لە ئاینەکەی خواو کتێبەکەی خوادا و ئەویش حەڵاڵە بۆ من، وە پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد....)[٢٧٧].

لە ڕیوایەتێکی تردا: (دوای ئەوە خەولە خێزانی عثمانی کوڕی مضعون ڕۆیشت بۆلای سەودەو پێی وت: ئای سەودە خوای گەورە چ خێرو بەرەکەتێکی بەڕوودا کردوونەتەوە؟ وتی: چی بووە؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ ناردوومی بۆلای تۆ خوازبێنیت بکەم؟ ئەویش وتی: خۆزگە دەخوازم بەڵام بچۆ بۆلای باوکم و ئەوەی بۆی هاتوویت پێی ڕابگەیەنە؟ دەفەرموێت: باوکی پیاوێکی بە ساڵاچووی پیربوو نەیدەتوانی هەتا بچێت بۆ حەج خەولە ﷺ دەفەرموێت: چوومە ژوورەوە بۆ لای و سڵاوم لێکرد بە سڵاوی جاهیلانەی خۆی ئەویش وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: خەولەی کچی حەکیمە وتی: ها چیت دەوێت؟ وتم: محمدی کوڕی عەبدوللا ناردوومی بۆلای تۆ تا سەودەی بۆ خوازبێنی بکەم، ئەویش وتی: هاوشانێکی بەڕێزە هاوڕێکەت دەڵێ چی؟ خەولەش وتی: پێخۆشە، باوکی سەودەش وتی: دەبچۆ بۆم بانگ بکە، منیش چووم بۆم بانگ کرد و پێی وت: کچەکەم محمدی کوڕی عەبدوللای کوڕی عەبدول موطەلیب دەیەوێت خوازبێنیت بکات محمدیش پیاوێکی هاوشانی بەڕێزە پێت خۆشە مارەت بکەم بۆ محمد؟ ئەویش وتی: بەڵێ، باوکی سەودەش وتی: دەبچۆ محمدم بۆ بانگ بکە، پێغەمبەر ﷺ هات و باوکی ڕازی بوو، پێغەمبەر ﷺ سەودەی مارەکرد و گوێزایەوە)[٢٧٨].

---

(٢٧٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٢١١/٦، ٢١٠) (٢٥٧٦٩) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني في (الكبير) (٢٣/٢٣)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٢٥/٧): إسناده حسن،والبيهقي (الدلائل) (٤١١/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٢٥/٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير محمد بن عمرو بن علقمة و هو حسن الحديث.

(٢٧٧) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٥٠٨١).

(٢٧٨) أخرجه: أحمد (٢٣٨٨٤) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الذهبـي في (سير إعلام النبلاء) (١٩١/١): إسناده حسن، وقال الحافظ في (الفتح) (١٧٦/٧): إسناده حسن.

## چوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری طائیف

ئیبنو ئیسحاق ؒ دەفەرموێت: (قورەیش نەیان دەوێرا بە ئاشکرا ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن بەڵام کاتێ ئەبو طالب وەفاتی کرد ئیتر قورەیش زیاتر ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا بە شێوەیەك کە هەرگیز نەیان دەوێرا لە ژیانی ئەودا بەو جۆرە ئازاری بدەن.

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما زالت قريشٌ كاعَّةً عنّي حتّى تُوفِّيَ أبو طالِبٍ))[٢٧٩] واتە: قورەیش ترسنۆك بوون بەرامبەرم تا ئەبو طالب وەفاتی کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا دەرچێت بەرەو تائیف، پێغەمبەر ﷺ بەتەنها بەڕێکەوت بەرەو شاری طائیف بۆ ئەوەی خەڵکانی سەقیف پشتگیری لە خۆی و لە ئاینەکەی بکەن وە بۆ ئەوەی پەیامی خوای گەورەیان پێ بگەیەنێت[٢٨٠].

دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بەرەو طائیف لەهەموو سەرچاوەکانی سیرەدا تەنها ڕیوایەتەکەی محمدی کوڕی کەعبە ؓ کە دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە طائیف چووە لای هەندێ کەسایەتی سەقیف کە لەو ڕۆژەدا کەسانێکی ناودارو سەرکردەی سەرجەم طائیف بوون کە سێ برابوون (عەبدیالیل کوڕی عمرو کوڕی عومەیر)، (مەسعودی کوڕی عەمری کوڕی عومەیر)، (حەبیبی کوڕی عمرو کوڕی عومەیر) یەك لەوانە ئافرەتێکی قورەیشی لابوو کە مارەی کرد بوو، پێغەمبەر ﷺ دانیشت لەگەڵیاندا و بانگەوازی کردن بۆلای خواو پێی ڕاگەیاندن، کە بۆچی ڕووی کردۆتە ئەو شارە، یەك لەوانە لە وەڵامدا وتی: من بەرگی کەعبە پارچە پارچە دەکەم ئەگەر خوا تۆی ناردبیت بە پێغەمبەر!، ئەوی تریشیان وتی: ئایا خوا کەسی تری نەدۆزیوەتەوە تەنها تۆ نەبێت، سێیەمیشیان وتی: بڕۆ بە هیچ جۆرێك قسەت لەگەڵدا ناکەم، ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوا بیت وەکو خۆت دەڵێیت ئەوە زۆر سامناکە بۆ من کەوەڵامت بدەمەوە، ئەگەر تۆ درۆ بکەیت بەناوی خواوە بە هیچ جۆرێك شیاو نییە کە من قسەت لەگەڵدا بکەم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بێ هیوا بوو لە سەقیف

---

(٢٧٩) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٦٢٢/٢) وصححه، وقال الشيخ الالباني في (صحيح السيرة النبوية) (ص:٣١): إسناده جيد.

(٢٨٠) أنظر: (السيرة) ابن هشام (٢٩/٢).

کە ڕێنمونی بکرێن و پشتگیری لە ئیسلام بکەن....)[٢٨١].

محمدی کوڕی کەعبی قورەضی ؓ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بوو کە ئەم هەواڵە بگاتەوە بە خزم و کەسانی قەومی خۆی، بەڵام خەڵکی ئەو شارە وازیان نەهێنا نەفام و کۆیلەکانیان خستە دوای پێغەمبەر ﷺ و جوێنیان پێ دەدا و هاواریان لێ دەکرد هەتا خەڵکانێکی زۆریان لێ خڕکردەوە و دوایدەکەوتن، تا پێغەمبەر ﷺ بەناچارانە ڕووی کردە باخەکەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە (واتە: دوو دوژمنی سەر سەختی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە) کە پێغەمبەر ﷺ چووە ناو ترێکەیانەوە ئیتر نەفامەکانی سەقیف کە دوای کەوتبوون گەڕانەوە، پێغەمبەر ﷺ چووە ژێر سێبەری مێوێکیانەوە وە هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە تەماشای پێغەمبەریان ﷺ دەکرد کە کۆیلەکانی سەقیف چی دەکەن بەرامبەری کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە ژێر سێبەری مێوەکەدا ئارام بوو کەمێك حەوایەوە.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە ئەم دوعایەی کرد و فەرمووی: (ئەی پەروەردگار شکاتی لاوازی و بێ دەسەڵاتی و فێڵ نەزانی و سووکیم، لەلای خەڵکی، تەنها لای تۆ دەکەم کە بە بەزەیی ترین خاوەن بە بەزەییەکانی، تۆ خاوەنی چەوساوەکانی و خاوەنی منی بۆلای کێم دەنێریت، بۆلای دوژمنێك کە ڕووم لێ گرژ دەکات، یان دوژمنێك کە کاری منت خستۆتە ژێر فەرمانی ئەو، ئەگەر تۆ هیچ تووڕە نەبیت لەمن ئەوا من هیچ باکم نییە، بەڵام سەلامەتی تۆ فراوانترە بۆ من. پەنا دەگرم بەو نوری ڕوومت کە هەموو تاریکاییەکی لە ڕوودا ڕووناك کردۆتەوە، و دونیا و کۆتایی لەسەر چاکراوەکە لەوەی تووڕەبوونی خۆتم پێ بگەیەنیت یان ڕقی خۆتم پێ بگەیەنیت» جێی خۆیەتی گلەییت هەبێت تا ڕازی دەبیت، وە هیچ توانا و دەسەڵاتم نییە تەنها بە پشتیوانی تۆ نەبێت...)[٢٨٢].

---

(٢٨١) أنظر: سيرة ابن هشام رقم (٢٩٩) وقال محققاه: إسناده صحيح و لكنه مرسل، والطبري في (التأريخ) (٣٤٤/٢)، البيهقي في (الدلائل) (٤١٥/٢)، قال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٣٢): إسناده صحيح لكنه مرسل. (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

(٢٨٢) أخرجه: أحمد: (٣٣٥/٤)، والطبراني في (الكبير) (٤٣٥/٢)، والطبري في (التأريخ) (٨٠/١)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٢١)، وقال الحافظ العراقي: في (تخريج أحاديث الأحياء) (١٣١/٤) مرسل، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٥/٦): رجاله ثقات إلاّ أن فيه تدليس ابن إسحاق، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (٢٩٣٣) وفي (ضعيف الجامع) (١١٨٢) وفي (فقه السيرة) (١٣٢): حديث ضعيف. (خوێنەری بەڕێز ئەم فەرموودەیە لاوازە).

دوای ئەوەی دوو کوڕەکەی ڕەبیعە واتە: عوتبە و شەیبە بینیان پێغەمبەر ﷺ چی بەسەر هاتووە بەزەییان بۆی بزوا، ئینجا خزمەتکارێکی گاوری خۆیان بانگ کرد کە ناوی عەداس بوو پێیان وت: ئەو هێشووە ترێیە بخەرە سەر ئەو دوو گەڵایە و بیبە بۆ ئەو پیاوە کە لەوێدا دانیشتووە بابیخوات، عەداس چوو لە بەردەمی پێغەمبەر ﷺدا دایناو پێی وت: بیخۆ؟ پێغەمبەر ﷺ دەستی بۆ بردوو فەرمووی: (بِسمِ اللهِ) ئینجا، خواردی، عەداس تەماشای پێغەمبەری ﷺ کردو پێی وت: وەڵاهی ئەم وشەیە هیچ کەسێك لە خەڵکەکانی ئەم وڵاتانە نایڵێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ خەڵکی کام وڵاتی؟ ئەی عەداس، ئاینت چییە؟ وتی: من گاورم و خەڵکی نەینەوام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دێیەکەی پیاو چاکەکە (یونسی کوڕی مەتا)؟ عەداس وتی: تۆ چۆن دەزانیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە برامە پێغەمبەر بووە منیش پێغەمبەرم، عەداس کەوتە ماچ کردنی دەم و چاوی پێغەمبەر ﷺ و هەردوو دەستی و هەردوو قاچی ماچ کرد، وە دوو کوڕەکەی ڕەبیعە لە دوورەوە چاویان لێ بوو کە عەداس چی دەکات، یەکێکیان بەوی تریانی وت: ئەوە خزمەتکارەکەمانی تێك دا، کاتێ عەداس گەڕایەوە بۆ لایان پێیان وت: ماڵت وێران بێت عەداس ئەوە چی بوو دەستی ئەو پیاوەت ماچ کرد؟ وتی: گەورەم لەسەر زەویدا پیاوی وا چاکتر نییە، شتێکی بۆ گێڕامەوە کە تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێت نایزانێت؟ وتیان: عەداس ماڵت وێران بێت دوورت نەخاتەوە لە ئاینی خۆت چونکە ئاینی تۆ لە دینی ئەو چاکترە)[٢٨٣].

ئەمە سەرجەم بەسەرهاتی طائیفە کە ئەویش فەرمودەیەکی (مرسل)ە کە بەشێکە لە بەشەکانی (ضعیف) وە ناشێت بکرێت بە بەڵگە، بەڵام وەك زانیاری پێویستە لێی ئاگاداربین. بەڵام بە دوو بەڵگەوە دەسەلمێنرێت کە چوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ طائیف ڕاستە:

**یەکەم:** لە خالیدی عدوانییەوە دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: (بینیم پێغەمبەر ﷺ خۆیدا بوو بەسەر گۆچانێکدا یان کەوانێکدا لە ڕۆژهەڵاتی سەقیف کاتێ کە هاتبوو بۆ لایان بۆ ئەوەی پشتگیری لێ بکەن، گوێم لێ بوو لەوکاتەدا سورەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١﴾(الطارق)ی دەخوێند وە تەواوی کرد.

ئینجا خالد دەفەرموێت: من لە زەمانی نەفامیمدا ئەم سورەتەم لەبەر کرد

(٢٨٣) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (رقم/٢٩٩) وقال محققاه: إسناده صحيح لكنه مرسل،

کە موشرك بووم، وە لە ئیسلامیشدا خوێندم دوای ئەوەی کە ئەمەم گوێ لێ بوو کەسانی سەقیف هاتن بۆلام وتیان: چیت گوێ لێ بووە لەو پیاوە منیش وتم: گوێم لێ بوو کەئەوەی خوێند و منیش هەموویم بەسەر ئەواندا خوێندەوە، و یەکێك لەوێدا کە خەڵکی مەککە بوو وتی: ئێمە چاکتر دەزانین کە ئەم هاوەڵەمان چی یە و چی نییە، ئەگەر بمانزانیایە ئەو کارە ڕاستە شوێنی دەکەوتین)(٢٨٤).

**دووەم:** لە عائیشەوە ﵂ دەفەرموێت: (بە پێغەمبەرم ﷺ وت: ئایا هیچ ڕۆژێك هاتووە بە سەردا سەخت تربوو بێت لە ڕۆژی ئوحود؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَقَدْ لَقِيتُ مِن قَوْمِكِ ما لَقِيتُ، وكانَ أشَدَّ ما لَقِيتُ منهمْ يَومَ العَقَبَةِ، إذْ عَرَضْتُ نَفْسِي علَى ابْنِ عبدِ يالِيلَ بنِ عبدِ كُلالٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إلى ما أرَدْتُ، فانْطَلَقْتُ وأنا مَهْمُومٌ علَى وجْهِي، فَلَمْ أسْتَفِقْ إلَّا وأنا بقَرْنِ الثَّعالِبِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فإذا أنا بسَحابَةٍ قدْ أظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فإذا فيها جِبْرِيلُ، فَنادانِي فقالَ: إنَّ اللَّهَ قدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وما رَدُّوا عَلَيْكَ، وقدْ بَعَثَ إلَيْكَ مَلَكَ الجِبالِ لِتَأْمُرَهُ بما شِئْتَ فيهم، فَنادانِي مَلَكُ الجِبالِ فَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قالَ: يا مُحَمَّدُ، فقالَ، ذلكَ فِيما شِئْتَ، إنْ شِئْتَ أنْ أُطْبِقَ عليهمُ الأخْشَبَيْنِ؟ فقالَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: بَلْ أرْجُو أنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِن أصْلابِهِمْ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ وحْدَهُ، لا يُشْرِكُ به شيئًا))(٢٨٥).

واتە: ئەوەی تووشم بوو لە خزمانی خۆت ئەوەبوو کە توشم بوو، بەڵام سەخت ترینیان لای من ڕۆژی عەقەبە بوو کاتێ چووم بۆلای کوڕەکەی (عەبدیالیل) بۆ ئەوەی خۆمی پێ بناسێنم، بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و منیش بە خەفەت باریەوە گەڕامەوە و ئاگام لە خۆم نەبوو تاکو گەیشتمە لوتکەی (الثَّعالِبِ) کە سەرم بەرز کردەوە پەڵە هەورێکم بینی بە سەرمەوە بوو سێبەرەکەی بەسەرمدا هات، تەماشام کرد جبریلی تیایە، بانگی لێ کردم و وتی: خوای گەورە قسەی خزمەکانتی بیست کەچیان وت بەرمبەر بە تۆ، وە خوای گەورە فریشتەی شاخەکانی بۆ لای تۆ ناردووە

---

والطبري في (التأريخ) (٣٣٤/٢)،والبيهقي في(الدلائل) (٤١٥/٢)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:١٣٢): إسناده صحيح مرسل.

(٢٨٤) أخرجه: أحمد: ٤(/٣٣٥) (١٨٩٥٨) وقال محققه: إسناده ضعيف، والطبراني في (الكبير) (١٧٩/٤) (٤١٢٦)،وابن أبي عصم (١٢٧٤)، وابن خزيمة (١٧٧٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٣٦/٧): رواه أحمد والطبراني و عبدالرحمن ذكره ابن أبي حاتم و لم يجرحه أحد و بقية رجاله ثقات. (ئەمەش تەنها بۆ زانیاریتان هێناومە).

(٢٨٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٢٣١)، ومسلم (الصحيح) (١٧٩٥)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢١٣)،وابن حبان (الصحيح) (٦٥٦١)، وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

بۆ ئەوەی کە بەویستی خۆت چی فەرمانێکی پێ دەکەیت بەرامبەر خزمانی خۆت تا بۆت جێ بەجێ بکات، ئینجا فریشتەی شاخەکان بانگی لێکردم و سەلامی لێکردم و وتی: ئەی محمد ئەمە لە ویستی خۆتایە ئەگەر ویستت وایە باهەردوو شاخەکە بێنمەوە یەك و لەناویان بەرم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [نەخێر هیوام وایە کە خوای گەورە کەسانێك دروست بکات لە نەوەی ئەوان، کە خوا بپەرستن و بە هیچ جۆرێك هاوەڵی بۆ بڕیارنەدەن].

لەم ڕیوایەتەدا بە ڕاشکاوانە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ چووە بۆ طائیف وە سەخت ترین ڕۆژی ژیانی ئەو ڕۆژە بووە کە لە طائیف دەرچووە ئەوان بەرپەرچیان داوەتەوە، ئیبنو سەعد دەفەرموێت: (سەفەرەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ طائیف مانگی شەوالی ساڵی دەیبوو واتە: دەی پێغەمبەرایەتی بوو وە، دە ڕۆژ لەناو طائیفدا مایەوە و کەس باوەڕی پێ نەهێنا) کەواتە: سەلمێنرا پێغەمبەر ﷺ چووە بۆ طائیف وەك پێشتر لە ڕیواتەکەی محمدی کوڕی کەعبدا هاتبوو.

## گوێ گرتنی کۆمەڵێك جنۆکە بۆ قورئان

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی طائیفی بەجێ هێشت گەڕایەوە بەرەو شاری مەککە و بێ هیوا بوو، کە خەڵکی سەقیف پشتگیری لێ بکەن، کاتێ لە ڕێگە لایدایە دۆڵی نەخلە لە نیوە شەودا کە نوێژی دەکرد تاقمێك لە جنۆکەکان بەلایدا تێپەڕین، ئەو جنۆکانە بوون کە خوای گەورە باسی کردوون لەسورەتی (الأحقاف)دا[٢٨٦] ئەوە بوو هەتا زەمانی پێغەمبەر ﷺ جنۆکەکان دەیانتوانی بچنە ئاسمانەکان و بە تایبەت ئاسمانی یەکەم و لەوێ گوێ بگرن لە گفتوگۆی فریشتەکان، تا بزانن خوای گەورە بڕیاری چی داوە بۆ سەر زەوی، وە تا کێ دزی کردوەو کێ چی کردووە وە چی بووە و چی نەبووە بۆ ئەوەی ئەو قسانە بدزن و تا بیچرپێنن بە گوێی فاڵچییەکاندا، بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕێگەیەیان لێ گیرا شاڵاوی ئاگریان کرایە سەر و بە هیچ جۆرێك لەوێوە نەیان دەتوانی بەرز ببنەوە.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (جنۆکەکان بەرز دەبوونەوە بۆ ئاسمان و گوێیان

(٢٨٦) انظر:سيرة ابن هشام (٣٢/٢) (٢٩٩)،و ابونعيم في(حلية الاولياء) (٢٥٩) بدون إسناد،،و اسنده ابن مردوية عن ابن عباس في (الفتح) (٣٠٠/١٠).

لە وەحی دەگرت گەر وشەیەکیان بەر گوێ بکەوتایە نۆ قسەیان پێوە دەنا و درۆیان تێکەڵاو دەکرد، ئەوە بوو قسە ڕاستەکە ڕاست دەردەچوو، بەڵام ئەوانەی تر کە بۆیان زیاد کردبوو درۆ دەردەچوون، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نێررا جنۆکەکان شوێن دانیشتنەکانیان لێ قەدەغە کرا ئەومیان گێڕایەوە بۆ ئیبلیس، چونکە لە پێشتر شاڵاوی ئەستێرە و شاڵاوە ئاگرییەکان نەدەگیرایە هیچ کەس، ئیبلیس پێی وتن: ئەمەی کە بووە تەنها لەبەر شتێکە کە لە زەویدا ڕووی داوە ئینجا سەربازەکانی بڵاوە پێکرد تا جنۆکەکان بینیان پێغەمبەر ﷺ نوێژ دەکات لە نێوان دوو شاخدا و گەڕانەوە بۆلای ئیبلیس و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند، ئینجا ئیبلیس وتی: ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە ڕووی داوە)[287].

هەروەها لە ئیبنو عەباسەوە رضي الله عنه دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەندین کەس لە هاوەڵانی هاتن بەرەو بازاڕی (عکاظ) واتە: (بازاڕەکەی دۆڵیی نەخلە) لەو کاتەدا شەیتانەکان ڕێگەی ئاسمانەکانیان لێ گیرا بوو، وە پریسکە و شاڵاوی ئاگریان تێدەگیرا، ئەوان گەڕانەوە بۆ لای کەسانی خۆیان و وتیان: وامان لێکراوە کە نەتوانین بەرز ببینەوە و هەواڵی ئاسمانەکانمان پێ بگات و شاڵاوی ئاگرمان تێ دەگیرێت، ئەوانیش وتیان: ئەوەی وای لە ئێوە کردووە کە نەتوانن بچن بۆ ئاسمان و گوێ بگرن، دیارە شتێك ڕووی داوە بڕۆن بگەڕێن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا و بڕوانن و بزانن ئەم شتە چییە وای لێکردوون هەواڵی ئاسمانتان لێ قەدەغە بکرێت؟ ئەوانیش ڕۆیشتن بە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی زەویدا تا بزانن ئەوەی کە ڕێگرە بۆیان لە زانینی هەواڵی ئاسمان چییە؟ ئەو تاقمە بەڕێکەوتن بەرەو دۆڵی توهامە و بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ وەلای دۆڵی (نەخلة) پێ یگەیشتن کاتێك بەرە و بازاڕی (عکاظ) دەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ لەوێ نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵانی دەکرد، جنۆکەکان کە قورئانەکەیان بەر گوێ کەوت وەستان و گوێیان بۆ گرت و وتیان: وەڵاهی ئا ئەمەیە کەوای لێ کردووین نەتوانین گوێ بگرین لە هەواڵی ئاسمان، ئالەو کاتەدا گەڕانەوە بۆلای خزمانیان و هەواڵی ئەومیان پێ گەیاندن وتیان: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ

---

(٢٨٧) أخرجه: أحمد (١٧٤/١) (٢٩٧٧)، وقال محققه: إسناده حسن،والنسائي في (التفسير) (٦٤٦)، وقال محققه: صحيح،والترمذي (السنن) (٣٣٢٤)، وقال حديث صحيح،والطبراني في(الكبير) (١٢٤٣١)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٢/٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٤٨).

**يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾﴾ (الجن)[٢٨٨] خزمینە ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بوو کە خەڵکی ڕێنموویی دەکات بۆ ڕاستی و ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە و بەهیچ جۆرێ هاوتا بۆ خوای خۆمان بڕیار نادەین، ئینجا خوای گەورە سورەتی (جن)ی هێنایە خوارەوە: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾﴾ (الجن)[٢٨٩] ئەوانەی کە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وەکو تاقمی جنۆکە حەوت کەس یان نۆ کەس بوون لەهەرە پاڵەوان و بەتوانا وزیرەکانی (جن) کە بوونە نوێنەری قەومەکانیان تا ئاگاداریان بکەنەوە.**

**ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (جنۆکەکان دابەزینە سەر پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە قورئانی دەخوێند). لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای دەکرد لە دۆڵی نەخلە)[٢٩٠] جنۆکەکان کە قورئانیان بەر گوێ کەوت وتیان: بێدەنگ بن وە هەموویان نۆ جنۆکە بوون یەکێکیان ناوی (زوبەع) بوو، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەیدابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا ۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ (الأحقاف)[٢٩١].**

**لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەوانە حەوت کەس بوون لە جنۆکەکانی (نصیبین) (کە شارێکە لە سوریا) پێغەمبەر ﷺ ئەو حەوت جنۆکەیەی کرد بە نێرراوی خۆی بۆ گەیاندنی ئیسلام بە جنۆکەکانی خزمانی خۆیان)[٢٩٢]، وە هەر لەو شەوەوە بەشدار بوون، دیارە ئەو کۆمەڵە جنۆکەیە کە هاتوونەتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و گوێیان لێ گرتووە یەکەم جار نەیبینیون وە هەستیشی پێ نەکردووە کە ئەوان هاتوون و لە نزیکییەوە وەستاون و گوێیان لە قورئانەکەی گرتووە، بۆیە**

---

(٢٨٨) أخرجه: أحمد (٢٧٠/١) وصححه إسناده الشيخ الألباني في تحريم آلات الطرب (ص:١٣٩)

(٢٨٩) أخرجه:البخاري (٤٩٢١،٧٧٣)، ومسلم (١٠٠٥)،و النسائي في (التفسير) (٦٤٥)، الترمذي (٣٣٢٣)، أحمد (٢٧٤/١)، الطبراني في (الكبير) (١٢٤/٤٩)، ابن حبان (٦٥٢٦)، وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم،والبيهقي في (الدلائل) (٢٢٧/٢)، والحاكم(٥٠٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني ف ي(صحيح الترمذي) (٢٦٤٦).

(٢٩٠) أخرجه: الطبراني في(الكبير) (١٢٤٣١)، والحاكم (المستدرك) (٤٥٦/٢)وصححه ووافقه الذهبي، و ابو نعيم في (الدلائل) (٣٠٤)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٢/٢).

(٢٩١) أخرجه: احمد (١٦٧/١) (١٤٣٥) وقال محققه: حسن لغيره، وابن جرير (٢٢/٢٦)، والبزار (٥٥٢٢) وقال الحافظ في (الإصابة) (٨٤٧): سنده جيد، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٣٢/٧): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح.

(٢٩٢) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٦٦٠) وابن جرير (٤٢٢٦) الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٩٦/١): إسناده حسن.

مەسروق قوتابی ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (پرسیارم کرد لە ئیبنو مەسعود وتم: کێ پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردەوە لە جنۆکەکان لەوشەوەدا کە ئەوان هاتن و گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی گرت؟ ئیبنو مەسعود ﷺ فەرمووی: دارێکی (السمر) پێغەمبەری ﷺ لێ ئاگادارکردنەوە)[٢٩٣] و هاتنی نوێنەرانی جنۆکە بۆلای پێغەمبەر ﷺ هەر ئەم جارە نەبووە بەڵکو چەندین جار بووە و ژمارەیان جیا جیا بووە بۆ ئەوەی پەیامی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت تا ئەوانیش بیگەیەننە جنۆکە و کەسانی خۆیان.

عەلقەمە ﷺ دەفەرموێت: (پرسیارم لە ئیبنو مەسعود کرد وتم: کێ لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بوو لە شەوی جنۆکەکەدا؟ فەرمووی: کەس لە ئێمە لەو شەوەدا لەگەڵی نەبووین، بەڵکو ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووین شەوێکیان نەمان بینیەوە و بەدوایدا گەڕاین لە دۆڵ و شیوەکاندا وتمان کوژراوە و فڕێنراوە و شتی بەرامبەر کراوە، خراپترین شەوێکمان بەسەر برد کاتێ بەیانیمان بەسەردا هات بینیمان لای (حراء)ەوە پێغەمبەر ﷺ دەگەڕایەوە پێمان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاین بە دواتا و نەمان دۆزیتەوە خراپترین شەومان بەسەربرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نوێنەری جنۆکەکان ئەمشەو هات بۆ لام ڕۆیشتم قورئانم بەسەردا خوێندنەوە) لەڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: ((بِتُّ اللَّيلةَ أقرأُ على الجِنِّ رُفقاءَ بالحَجُونِ))[٢٩٤] واتە: ئەم شەوم بەسەربرد لە هاوڕێیەتی (الجن)دا لە (حجون) قورئانم بەسەردا خوێندن.

وە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی برد و شوێنی دانیشتن و جێی ئاگر کردنەوە کەیانی نیشان داین وە ئەوانیش لەو کاتەدا داوای خواردنیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد بوو پێغەمبەریش ﷺ بەوانی فەرموو: هەموو ئێسکێك کە ناوی خوای لەسەر هێنرابێت دەبێت بە پارچە گۆشتێکی قەڵەو و دەکەوێتە دەستی ئێوە، وە هەموو تەپاڵەیەکی ئاژەڵی موسوڵمانان دەبێت بە لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانتان بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [بە پاشەڕۆی ئاژەڵ و ئێسقان خۆتان پاك مەکەنەوە چونکە ئەوانە

(٢٩٣) أخرجه: الحميدى (١٢٣)، البخاري (٣٨٥٩)، ومسلم (١٠٠١)، و ابو نعيم في(الدلائل) (٢٥٤).

(٢٩٤) أخرجه: ابن حبان (٦٣١٩)، وأحمد(٤١٦)، وأبويعلى (٤٧٤/٨) وقال محققه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٠٩): إسناده: صحيح.

خواردنی برا جنۆکەکانتانە....][٢٩٥].

پێ دەچێت کە پێغەمبەر ﷺ لەو شەوەدا سورەتی (الرحمن)ی بەسەر ئەو جنۆکاندا خوێندبێتەوە: لە جابیرەوە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاتەدەرێ بۆلای هاوەڵانی و سورەتی (الرحمن)ی بەسەریاندا خوێند لەسەرەتاوە تا کۆتایی و ئەوان هەر بێ دەنگ بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قد قرأتُها على الجنِّ ليلةَ الجنِّ، فكانوا أحسنَ مَرْدُودًا منكم؛ كنتُ كُلَّما أَتَيْتُ على قوله: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ قالوا: لا بشيءٍ مِن نعمِك ربَّنا، نُكَذِّبُ فلك الحمدُ))[٢٩٦] واتە: ئەم سورەتەم خوێندەوە بەسەر جنۆکەکاندا، و جنۆکەکان لە ئێوە چاکتر وەڵامیان دایەوە ومن هەر کاتێ بگەیشتمایەتە ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾(الرحمن) (دەیان وت: ئێمە هیچ شتێك لە نیعمەتەکانی تۆی پەروەردگار بە درۆ ناخەینەوە و سوپاس بۆ تۆ).

نوێنەرانی جنۆکە تاقم تاقم وەکو وترا دوای ئەم بەسەرهاتانە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئاینی خوا کە بۆ جنۆکە و مرۆڤە پێیان بگەیەنێت وە جیێ خۆشیەتی، کە پێغەمبەر ﷺ پێیان بگیەنێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾(الفرقان). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾(الأنبياء) واتە: بۆ هەموو جیهانەکانی مرۆڤ و جنۆکە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾(سبا)، وە ئەمەش تایبەتمەندیەکە لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ کە خوای گەورە پیێ بەخشیوە و نەی بەخشیوە بە هیچ کەس لە پێغەمبەرانی پێش خۆی.

لە جابیر و ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي، كانَ كُلُّ نَبِيٍّ يُبْعَثُ إلى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وأُرْسِلْتُ إلى الخَلْقِ كافَّةً،.... وخُتِمَ

---

(٢٩٥) أخرجه: مسلم (١٠٠٦)، ابن ابي شيبة (١٥٥/١)، الطيالسي (٤٧/١)، وابن خزيمة (٨٢)، النسائي في (التفسير) (٦٤٣)، ابوداود (٨٥)، الترمذي (٣٢٨٥)،ابوعوانة (٢١٩/١)، البيهقي في (الدلائل) (١٠٨/١) وفي (السنن الصغرى) (٣٩)،ابن حبان (١٤٣٢)،وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وضعفه الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (١٠٣٨) من طريق البيهقي وابن خزيمة ومسلم، وصححه من طريق ابي داود والترمذي: انظر (صحيح ابي داود) (٧٧)و (صحيح الترمذي) (٢٥٩٦).

(٢٩٦) أخرجه: الترمذي (السنن) (٣٢٩١)، الحاكم (المستدرك) (٤٧٣/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، البيهقي في (الدلائل) (٢٣٢/٢)، وحسنه الشيخ الألبانيفي (السلسلة الصحيحة) (٢١٥٠) و(صحيح الترمذي) (٢٦٢٤).

بِيَ النَّبِيُّونَ))[٢٩٧]. واتە: پێنج شتم پێ بەخشراوە کە نەبەخشراوە بە هیچ کەسێك لە پێغەمبەرانی پێش خۆم ئەوان بۆ لای کەسانی تایبەتی خۆیان دەنێرران بەڵام من نێرراوم بۆلای هەموو دروست کراوەکانی خوا.... وە پێغەمبەرایەتیشم پێ کۆتایی هاتووە).

بەم شێوەیە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە طائیف، ئەوە بوو خوای گەورە کەسی ڕێنمویی نەکرد لە خەڵکی طائیف لەو کاتەدا، بەڵام چاکترین نوێنەرانی جنۆکەی ڕێنموییکرد و سەفەرەکەی پێغەمبەر ﷺ بووە مایەی ڕێنمویی کردنی جنۆکە و گەیاندنی ئیسلام پێیان. پێویستە بزانین گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەککە لە ژێر پەنادانی یەکێك لە سەرکردەکانی قوڕەیشدابوو بۆ ناو مەککە چونکە کەس بۆی نەبوو ڕێگە بە پێغەمبەر ﷺ بدات بێتەوە ناو مەککە لەبەر ئەوە داوای پەنادانی لە (مطعم کوڕی عەدی) کرد تا پەنای بدات لە قوڕەیش بۆ ئەوەی بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ مەککە...

ئیمامی ئەمەوی ﷺ لە مەغازییەکەیدا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئورەیقیطی نارد بۆلای ئەخنەسی کوڕی شورەیق و داوای لێ کرد بۆ ئەوەی پەنای بدات) ئەخنەس وتی: من هاوپەیمانی قوڕەیشم، هاوپەیمان ناتوانێت پەنای کەس بدات بەرامبەر قوڕەیش، پاشان پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای سوهەیل بۆ ئەوەی پەنای بدات، ئەویش وتی ئێمەی کوڕانی بەنی عامر ناتوانین پەنای کەس بدەین، بەرامبەر کوڕانی کەعبی کوڕی لوئەی، پاشان پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای مطعمی کوڕی عەدی بۆ ئەوەی پەنای بدات

ئەویش وتی: بەڵێ بچۆ بە محمد ﷺ بڵێ: با بێت، ئەویش چوو پێی ڕاگەیاند وپێغەمبەر ﷺ هات و ئەو شەوە لە ماڵی ئەوان مایەوە، کە ڕۆژ بووە وە خۆی و شەش یان حەوت کوڕەکەی مطعم چواردەوری پێغەمبەریان ﷺ گردت تا چووە لای کەعبە و تەوافی کرد، ئەوان پارێزگاریان لێ کرد و ئاگاداری قوڕەیشیان کردەوە، کە کەس بۆی نییە هیچ لە پێغەمبەر ﷺ بکات یان دەست بهێنێتە ڕێی، ئەبو سوفیان توڕە بوو چووە لای مطعم وتی: تۆ باوەڕت پێ هێناوە یان پەنات داوە، مطعم وتی:

---

(٢٩٧) أخرجه: البخاري (٣٣٥٠)، ومسلم (١١٦٣، ١١٦٧)، والترمذي (١٥٥٣)، والنسائي (٤٣٠)، وابن ماجه (٥٦٧).

پەنام داوە، وتی: حەقمان نییە بەسەریەوە، بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ تەوافی کرد و گەڕایەوە بەرەو ماڵەوە)[٢٩٨].

مطعم دوای ئەوە مرد، پێغەمبەر ﷺ چاکەیەی ئەو پیاوەی، قەت لە یاد نەچوو ئەوەبوو کاتێ باسی حەفتا دەست بەسەرەکەی جەنگی بەدر هاتە پێش ئالەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لو كانَ المُطْعِمُ بنُ عَدِيٍّ حَيًّا، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلَاءِ النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَه))[٢٩٩] واتە: (گەر موطعیم زیندوو بوایە وقسەی لەگەڵم بکردایە و تکای ئازادکردنی بۆ ئەم دەست بەسەرە بۆ گەنانە بکردایە، هەر هەموویانم بۆ ئازاد دەکرد)، کەواتە پێویستە موسوڵمانیش ئاوا بێت هەتا بەرامبەر موشریکیش کەچاکەیەکی کردبێت بەرامبەری دەبێ بە وەفا بێت وەکو پێغەمبەر ﷺ.

## ئیـسـرا و میعـراج

دوای ئەو هەموو دژواری و ناڕەحەتیەی هاتە پێش پێغەمبەر ﷺ لە پێناوی گەیاندنی ئیسلام بە خزمان و کەسانی خۆی لە قوڕەیش وە دوای ئەو هەموو ئازار و ڕێگریەی هاتە ڕێی لەلایەن دانیشتووانی مەککەوە و دوای سەفەرە دڵ تەزێن و پڕ زەحمەتەکەی بۆ طائیف، و هەڵوێستی دانشتوانی بەرامبەری دوای ئەو هەموو ڕووداوانە خوای گەورە ڕێزی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ گرت، میوانداری کرد و ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، وە برا پێغەمبەرەکانی پێش خۆی نیشاندا و بەهەشت و دۆزەخ... هتد، وە تا جبریل ﷺ بە شێوەی خۆی ببینێت، وە نوێژی لەسەر فەرز بکرێت تاکو ئەمانە ببێتە هۆی پاك کردنەوەی جەستەیی و دەروونی و ڕەواندنەوەی خەمەکانی، بەسەرهاتی ئیسرا و میعراج لە چەندین فەرموودەدا هاتووە، کە صحیحن هەندێکیان بە درێژی و هەندێکیان بەکورتی، بەڵام لێرەدا هەوڵ دراوە سەرجەم ڕیوایەتەکانی ئیسراو و میعراج کۆبکرێتەوە، لەگەڵ هەوڵدانی ڕێکخستنی فەرموودەکان، وە ڕووداوەکەش بەم جۆرە بووە:

ئەبو شیهابی زوهری ﷺ دەفەرموێت: (أسرى رَسُولُ اللهِ ﷺ إلى البيتِ المَقْدِسِ قَبْلَ

---

(٢٩٨) انظر: (البداية) لابن كثير (١٣٧/٣)، وقال الحافظ في الفتح (٣٢٤/٧): اورده الفاكهي (اخبار مكة) بإسناد حسن مرسل.

(٢٩٩) أخرجه: أحمد (٨٠/٤)، البخاري (الصحيح) (٤٠٢٤)، الحميدى (٥٥٨)، وابوداوود (السنن) (٢٨٨٩)، والطبراني في (الكبير) (١١٧/٢)، ابو يعلي (المسند) (٣٤٩/٢).

الهِجرَةِ بِسَنَة)[٣٠٠] واتە: شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ پێش کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینە بە ساڵێك، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ لە (مسجد الحرام)ەوە بۆ (مسجد الأقصی) (واتە: شاری بیت المقدس یان ئیلیاء) ئەمە کاتێك بوو کە پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی ڕاگەیاند بوو بەشاری مەککە وە بڵاوبووبووە وە لەسەرجەم هۆزەکانی تردا)[٣٠١].

ئیبنو حەجەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ خەووتبوو لە ماڵی ئوم هانی، کە ماڵیان لای دۆلی ئەبو طالب بوو لەو کاتەدا لە سەقفەکەوە فریشتە دابەزین و پێغەمبەریان ﷺ لە ماڵ هێنایە دەرەوە بۆ مزگەوت و لەوێ پێغەمبەر ﷺ پاڵی دایەوە، و وەنەوزی پێوە دیار بوو، پاشان فریشتەکان هێنایانە دەرەوە بۆ دەرگای مزگەوت (واتە: لە نێوان خەوتن و نەخەوتندا بوو)[٣٠٢].

## سەرجەم ڕیوایەتەکانی ئیسراو میعراج بەم شێوەیەن:

ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عن سَقْفِ بَيْتي وأَنَا بِمَكَّةَ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ ﷺ)[٣٠٣] واتە: کاتێ لە مەککە بووم لە سەقفی ژوورەکەمەوە جبریل ﷺ دابەزی.. لە ڕیوایەتێکی تردا (جاءَهُ ثلاثةُ نفرٍ)[٣٠٤] واتە: سێ کەس بوون، یەکێکیان جبریل بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا (إِذْ سَمِعْتُ قائِلًا يقولُ: أَحَدُ الثَّلاثَةِ بيْنَ الرَّجُلَيْنِ، فَأُتِيتُ)[٣٠٥] واتە: گوێم لێبوو یەکێکیان دەیوت: ئەو پیاوەیانە کە لە نێوان ئەو سێ پیاوەدا خەوتووە (واتە: پێغەمبەر ﷺ)، لە ڕیوایەتێکی تردا (لَمْ يُكَلِّمُوهُ حتَّى احْتَمَلُوهُ، فَوَضَعُوهُ عِنْدَ بئْرِ زَمْزَمَ، فَتَوَلَّاهُ منهمْ جِبْرِيلُ)[٣٠٦] واتە: قسەیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نەکرد وە هەڵیان گرت و بردیان هەتاکو لای بیری زەمزم لەوێ دایاننا و ئینجا ئەوان گەڕانەوە

---

(٣٠٠) أخرجه: الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (١٦٤/١) و (تاريخ الإسلام) (٢٤١).

(٣٠١) أخرجه: سيرة ابن هشام (٦/٢)، و (البداية) (١٣٦/٣).

(٣٠٢) انظر: ابن حجر في (فتح الباري) (٢٠٤/٧).

(٣٠٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٤٩)، ومسلم (الصحيح) (٤١٣)،وابن ماجه (السنن) (١٣٤٩).

(٣٠٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٥٧)،ومسلم (الصحيح) (٤١٢).

(٣٠٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٥٧).

(٣٠٦) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٧٥١٧).

**و جبریل ؑ لەوانی وەرگرت و مایەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، لە ڕیوایەتێکی تردا (بينَما أنا عندَ البيتِ ..)[٣٠٧] واتە: من کاتێك لای حیجری کەعبە بووم...، لە ڕیوایەتێکی تردا (فِي الحَطِيمِ، - ورُبَّما قَالَ: فِي الحِجْرِ - مُضْطَجِعًا[٣٠٨] بَيْنَ النائِمِ واليقْظَانِ)[٣٠٩] واتە: پاڵم دابووە وە لە نێوان حاڵەتێکی خەوتن و نەخەوتندا بووم. لە ڕیوایەتێکی تردا (فَنَزَلَ جِبْرِيلُ فَفَرَجَ صَدْرِي)[٣١٠] واتە: جبریل ؑ دابەزی و سنگی لەت کردم، لە ڕیوایەتێکی تردا (مِنَ النَّحْرِ إلى مَراقِّ البَطْنِ...)[٣١١] واتە: لە قوڕقوڕاگەوە هەتا کۆتایی سکم، ئینجا تەشتێکی ئاڵتونی هێنا پڕ لە ئاوی زەمزەم بوو دڵی دەرهێنام و بە ئاوی زەمزەم شۆردیەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا (فاسْتُخْرِجَ قَلْبِي، فَغُسِلَ بِماءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ أُعِيدَ مَكانَهُ)[٣١٢] واتە: دڵی دەرهێنام و شۆردیەوە بە ئاوی زەمزەم، پاشان هەموو هەناومی پاککردەوە، ئینجا خستییەوە شوێنی خۆی، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ثُم جاءَ بطَسْتٍ مِنْ ذهَبٍ مُمتَلِئٍ حِكْمةً وإِيمانًا، فأفرَغَها فِي صَدْر..)[٣١٣] پاشان تەشتێکی ئاڵتوونی پڕ لە حیکمەت و ئیمانی هێناو هەڵیرێژایە ناو سنگمەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا (فَحَشَا به صَدْرَهُ ولَغَادِيدَهُ - يَعْنِي عُرُوقَ حَلْقِهِ - ثُمَّ أطْبَقَهُ ..)[٣١٤]. واتە: سنگم و هەموو دەمارەکانمی پڕکرد و پاشان سنگی لکاندمەوە بەیەکەوە.**

**لە ئەنەسەوە ؓ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أُتِيتُ بالبُراقِ، وهو دابَّةٌ أبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الحِمارِ، ودُونَ البَغْلِ، يَضَعُ حافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ..)[٣١٥] واتە: بوراقم بۆ هێنرا کە وڵاخێکی سپی و بەرز بوو، لە گوێدرێژ بەرز تر بوو وە لە ئێستر نزمتر بوو، قاچی دادەنا لەو جێگەیەی تا چاوی بەدی دەکرد (واتە: هەنگاوی هەڵناوەتەوە بۆ ئەوسەر نێوان هەموو هەنگاوێکی مەودای بینینی چاو بووە).**

---

(٣٠٧) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٤١٥).

(٣٠٨) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٨٨٧).

(٣٠٩) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٤٩) ومسلم في (الصحيح) (٤١٣).

(٣١٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٤٩)، ومسلم (الصحيح) (٤١٣).

(٣١١) أخرجه: المسلم في (الصحيح) (٤١٥).

(٣١٢) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٤١٦).

(٣١٣) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٤٩)، ومسلم في (الصحيح) (٤١٣).

(٣١٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٤٩)، ومسلم (الصحيح) (٤١٣).

(٣١٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٧٥١٧).

**لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئەنەسەوە ﷺ:** ((أنَّ النَّبيَّ ﷺ أُتِي بالبُراقِ ليلةَ أُسري به مُسرَجًا مُلجَمًا ليركَبَه فاستَصعَب عليه فقال له جبريلُ: [أبِمحمد تفعل هذا] ما يحمِلُك على هذا فواللهِ ما ركِبك أحدٌ أكرمُ على اللهِ منه قال: فارفَضَّ عرَقًا))[٣١٦] **واتە: لەو شەوەدا کە خوای گەورە شەوڕەویی بە پێغەمبەر ﷺ کرد بوراقیان بۆ هێنا زین و لغاوکرابوو، وە ئامادەکرا بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ تا سواری بێت و سواربوونی بەلایەوە ناڕەحەت بوو، جبریل بە بوراقی وت: ئاوا دەکەیت بە پێغەمبەر ﷺ ، چی وات لێ دەکات وا بکەیت وەڵاهی هیچ کەسێك بەڕێزتر لای خوا لەم پیاوە سواری پشتت نەبووە، ئینجا بوراق لە شەرمدا ئارەقی دەرکرد. لە ڕیوایەتێکی تردا:** [فَحَمَلَنِي عَلَيْهِ وَ مَعِي صاحِبِي لايُفارِقُنِي][٣١٧] **پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: سواری پشتی کردم و هاوەڵەکەم کە جبریلە لەگەڵمدا بوو لێم جیا نەبووەوە... لە ڕیوایەتێکی تردا:** (فَحمَله عليها جبريلُ أحدُهما رديفُ صاحبِه (فَرَكِبْتُهُ حتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ المَقْدِسِ))[٣١٨] **واتە: جبریل سواری کردم و هەردووکمان سواری پشتی بووین تا بیت المقدس، لە ڕیوایەتێکی تردا:** (لَيلةَ أُسريَ بِي وضَعتُ قَدَمي حيث توضَعُ أقدامُ الأنبياءِ مِن بَيتِ المَقدِسِ..)[٣١٩] **لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا لەو جێگایەدا قاچم دانا کە پێغەمبەران ﷺ قاچیان دادەنا لە** (بيت المقدس)، **لە ڕیوایەتێکی تردا:** (لمَّا انتَهينا إلى بيتِ المقدسِ ، قالَ جبريلُ : بإصبعِهِ فخرقَ بِهِ الحجرَ وشدَّ بِهِ البراقَ..)[٣٢٠] **واتە: کاتێ کە گەیشتینە** (بيت المقدس) **جبریل وای لە بەردەکە کرد کونی کرد و بوراقەکەی پێ بەستەوە... لە ڕیوایەتێکی تردا:** (في بابِ المسجدِ)[٣٢١]. الَّتي يَرْبِطُ

(٣١٦) أخرجه: عبد الرزاق في (المصنف) (٣٧٢/٢)، وأحمد في (المسند) (١٦٤/٣) رقم (٢٢٠٢٧)، والترمذي في (السنن) (٣١٣١)، وإبن حبان في (الصحيح) (٤٦) وقال محققه: إسناده صحيح، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٦٢/٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٥٠٣).

(٣١٧) أخرجه: أحمد (٢٠٨/٤)، والترمذي (٣٣٤٦)، وابن خزيمة (٣٠١)،والبيهقي في (الدلائل) (١٣٧٣/٢)، وصححه الشيخ الألبانيفي (صحيح الترمذي) (٢٦٦٦).

(٣١٨) أخرجه: الطيالسي في (المسند) (٤١١)، وإبن أبي شيبة في (المصنف) (٤٠٦/١١)، وأحمد في (المسند) (٣٩٢/٥)، والترمذي في (السنن) (٣١٤٧)، والنسائي في (التفسير) (٣٠٠) وقال محققه حديث حسن، والطبري (١٥/١٥)، والحاكم في (المستدرك) (٣٩٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٦٤/٢)، وإبن حبان في (الصحيح) (٤٥) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٥١٥): إسناده حسن.

(٣١٩) أخرجه: أحمد (١٠٨٣٠)، وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٣٢٠) أخرجه: الترمذي (٣١٣٢)، وقال الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٠٤):صحيح الإسناد.

(٣٢١) أخرجه: ابن عساكر في تهذيب تاريخ دمشق (٣٨٥/١)، وقال الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (١٨٢/١) و (تاريخ الاسلام) (٣٦٩): حديث حسن غريب.

به الأنْبِياءُ، قالَ ثُمَّ دَخَلْتُ المَسْجِدَ، فَصَلَّيْتُ فيه رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجْتُ فَجاءَنِي جِبْرِيلُ عليه السَّلامُ بإناءٍ مِن خَمْرٍ، وإناءٍ مِن لَبَنٍ...) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بوراقی بەستەوە بەو ئەڵقەیەی بە دەرگای مزگەوتەکەوە بوو، کە پێغەمبەران ﷺ پێشتر پێیان دەبەستەوە، پاشان چوومە ناو مزگەوتەکەوە و دوو ڕکات نوێژم کرد، پاشان چوومە دەرەوە و جبریل دوو قاپی بۆ هێنام یەکێکیان شەرابی تیا بوو ئەوی تریان شیر بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا (و قَدَحٌ مِنْ عَسَل)[٣٢٢] واتە: قاپێکیان هەنگوینی تیا بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا [فَقِيلَ لِي خُذْ أيُّهُما شِئْتَ][٣٢٣]، فاخْتَرْتُ اللَّبَنَ...) واتە: پێم وترا بەئارەزووی خۆت کامەیانت حەز لێ یە هەڵی گرە منیش شیرەکەم هەڵبژارد...، لە ڕیوایەتێکی تردا [فشربته][٣٢٤] فقالَ جِبْرِيلُ ﷺ: اخْتَرْتَ الفِطْرَةَ...) پاشان خواردمەوە و جبریل ﷺ فەرمووی: پاکیت هەڵبژارد.. لە ڕیوایەتێکی تردا [(أما إنَّكَ لو أخَذْتَ الخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ) ثُمَّ عُرِجَ بِنَا إلَى السَّمَاءِ الدنيا][٣٢٥] واتە: پێی وتم: ئەگەر تۆ ئارەقەکەت هەڵبژاردایە ئەوا ئومەتەکەت دوای تۆ گومڕا دەبوون، پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی دونیا.

لە ڕیوایەتێکی تردا [ثُم أخَذَ بيَدي، فعرَجَ بِي[٣٢٦]][٣٢٧] واتە: دەستی گرتم و بەرزی کردمەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا [بيْنَا أنَا قاعدٌ إذ جاءَنِي جبريلُ فوكَزَ بيْن كَتِفَيَّ ، فقُمْتُ إلَى شجرةٍ فيها كَوكْرَيِ الطَّيْرِ ، فقَعَدَ فِي أحدِهِمَا ، وقعدتُ فِي الآخَرِ ، فسَمَتْ وارتَفَعَتْ حتَّى سدَّتِ الخافقَيْنِ وأنا أقَلِّبُ طَرْفِي ، ولَوْ شِئْتُ أنْ أمَسَّ السماءَ لمسسْتُ ، فالْتفَتَ إليَّ جبريلُ كأنَّه حِلْسٌ لاطِئٌ..][٣٢٨] واتە: کاتێ من دانیشتبووم جبریل هات بۆلام و دەستێکیدا بەسەر هەردوو شانمدا و هەستام چوومە لای درەختێک کە وەک هێلانەی باڵندەی پێوەبوو، من دانیشتم لە یەکێکیاندا

(٣٢٢) أخرجه: الطبراني في (المعجم الصغير) (٧٥٨)، و صحح إسنادة الشيخ الالباني في (الاسرا والمعراج) (٣٨).

(٣٢٣) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤٢٣).

(٣٢٤) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٣).

(٣٢٥) أخرجه: مسلم (٤٢٣).

(٣٢٦) هنا عرجا إلى السماء بالمعراج (والله تعالى اعلم).

(٣٢٧) أخرجه: مسلم (٤٢٣).

(٣٢٨) أخرجه: ابو نعيم في الحلية (٣١٦/٢),والطبراني (الأوسط) (٦٢١١) ابن سعد (١١١/١),وابن عساكر في (تهذيب تاريخ دمشق) (٣٨٥/١),والبزار (٥٨) والبيهقي في (الشعب) (١٥٥), وقال الحافظ في (الفتح) (١٩٨/٧) رجاله لابأس بهم الا انه مرسل، قال الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (١٧١/١): إسناده جيد حسن, وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢٣٨): رواه البزار والطبراني في الأوسط ورجاله رجال الصحيح, و أخرجه أيضاً: البغوي في (شرح السنة) (٣٦٨٢) وقال محققه: مرسل، و إبن المبارك في (الزهد) (٢٠٧) وقال محققه: مرسل و إسناده حسن.

و ئەویش دانیشت لەوی تریاندا، ئینجا بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە تا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوامان لەبەرچاو نەما منیش هەر سەیرم دەکرد و دەمڕوانی و ئەگەر بمویستایە دەست لە ئاسمان بدەم دەستم لێ ئەدا، ئاوڕم دایەوە بەلای جبریلدا و بینیم وەك پۆشاکێکی کۆن وابوو...، لە ڕیوایەتێکی تردا: [(وهو كالحِلْسِ البالِي من خشْيَةِ اللهِ) فعرَفتُ فضلَ علمِهِ باللَّهِ عليّ](٣٢٩) فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ قيلَ: وقدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: قدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، (فافتح)..) واتە: جبریلم بینی وەك پۆشاکێکی کۆن وابوو لە ترسی خوا و زانیم چەندە شارەزاترە بەخوای گەورە لەمن، جبریل داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمانی کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا: ئایا پێغەمبەرایەتی پێ سپێرراوە؟ وتی: بەڵێ، پەیامی پێغەمبەرایەتی پێ سپێردراوە، بیکەرەوە...لە ڕیوایەتێکی تردا: [قال: (أي: خازن باب السماء) مَرْحَبًا به، ولنِعْمَ المَجِيءُ جَاءَ فَفُتِحَ لنا...)(٣٣٠). واتە: دوای ئەوە لێپرسراوی دەرگای ئاسمانی دونیا وتی: مەرحەبای لێ بێت چاکترین جێگە ئەو جێگەیەیە ئەو بۆی دەچێت، ئینجا دەرگاکەی بۆ کردینەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا: (فَلَمَّا عَلَوْنا السَّماءَ الدُّنْيا، فإذا رَجُلٌ عن يَمِينِهِ أَسْوِدَةٌ، وعَنْ يَسارِهِ أَسْوِدَةٌ، قالَ: فإذا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ، وإذا نَظَرَ قِبَلَ شِمالِهِ بَكَى،...)(٣٣١) واتە: کاتێ بەرز بووینەوە بە ئاسمانی دونیادا بینیم پیاوێك دانیشتبوو و هەندێك ڕەشایی هەبوو لەلای ڕاستیەوە وە لەلای چەپیشیەوە هەندێك ڕەشایی هەبوو کە تەماشای لای ڕاستی دەکرد پێدەکەنی و وە کە تەماشای لای چەپی دەکرد دەگریا.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [قال: (أي جبريل) هذا أَبُوكَ آدَمُ فَسَلِّمْ عليه، فَسَلَّمْتُ عليه، فَرَدَّ السَّلَامَ، ثُمَّ قَالَ: مَرْحَبًا بالِابْنِ الصَّالِحِ، والنبيِّ الصَّالِحِ فرحَّب بي ، ودعا لي بخيرٍ](٣٣٢) جبریل ﷺ وتی: ئەوە ئادەمی باوکتە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە کوڕی چاك وە پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم...

(٣٢٩) أخرجه: البزار (١١٦/٢)، وقال الحافظ في (الكافي الشاف) (١١٢/٣): إسناده قوي، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٤٦): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح،وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٨٩).

(٣٣٠) أخرجه: مسلم (٤١٥).

(٣٣١) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٣).

(٣٣٢) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٨٨٧).

له ڕیوایەتێکی تردا: (قُلتُ: يا جِبْرِيلُ، مَن هذا؟ قالَ: هذا آدَمُ ﵇، وهذِه الأسْوِدَةُ عن يَمِينِه، وعَنْ شِمالِهِ نَسَمُ بَنِيهِ، فأهْلُ اليَمِينِ أهْلُ الجَنَّةِ، والأسْوِدَةُ الَّتي عن شِمالِهِ أهْلُ النَّارِ، فإذا نَظَرَ قِبَلَ يَمِينِهِ ضَحِكَ، وإذا نَظَرَ قِبَلَ شِمالِهِ بَكَى، قالَ: ثُمَّ عَرَجَ بنا ثُمَّ عُرِجَ بنا إلى السَّماءِ، فاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فقِيلَ: مَنَ أنْتَ؟ قالَ: جِبْرِيلُ، فقيلَ: ومَن معكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قيلَ: وقدْ بُعِثَ إلَيْهِ؟ (نعم))[٣٣٣] وتم: ئەی جبریل: ئەوە کێیە؟ وتی: ئەوە ئادەمە ﵇ و ڕەشاییەکانی لای ڕاست و چەپیەوە ڕۆحی نەوەکانی خۆیەتی، ڕەشاییەکەی لای ڕاستییەوە ئەهلی بەهەشتن و ڕەشاییەکەی لای چەپی یەوە ئەهلی دۆزەخن کە تەماشای لای ڕاستی دەکات پێدەکەنێت و کە تەماشای لای چەپی دەکات دەگری. پاشان بەرز کراینەوە بۆ ئاسمانی دووەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ. (فَقِيْلَ: مَرْحَبًا به، فنِعْمَ المَجِيءُ جَاءَ فَفُتِحَ لنا..)[٣٣٤] وتی: بەڵێ، وترا: پێشوازی و مەرحەبای لێ بێ بۆ چاکترین جێگا دەچێت و دەرگاکەمان بۆ کرایەوە.

(فلَمَّا خَلَصْتُ) فإِذَا ابني الخالة عيسى ابنَ مريمَ و يحيي بنَ زكريا، [قَالَ هذا يحيى و عيسى، فسَلِم عَلَيْهما و، فَسَلَّمْتُ عليهمَا فَرَدَّا، ثُمَّ قَالَا: مَرْحَبًا بالأخِ الصَّالِحِ]، فَرَحَّبا بِي ودَعَوا لِي بخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِي إلى السَّماءِ الثَّالِثَةِ، فاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فقِيلَ: مَنَ أنْتَ؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قيلَ: ومَن معكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ، قيلَ: وقدْ بُعِثَ إلَيْهِ؟ قالَ: قدْ بُعِثَ إلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنا فلَمَّا خَلَصْتُ فإذا أنا بيُوسُفَ ﵇، إذا هو قدْ أُعْطِيَ شَطْرَ الحُسْنِ) واتە: کاتێ چوومە ناو ئاسمانی دووەمەوە بینیم دوو خاڵۆزاکە یەحیا و عیسا ﷺ لێ بوو، جبریل ﵇ وتی: ئەوە یەحیایە و ئەوە عیسایە سەلامیان لێ بکە، منیش سەلامم لێ کردن و ئەوانیش وەڵامیان دامەوە و وتیان: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێشوازیان لێ کردم و دوعای خێریان بۆ کردم پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی سێهەم، و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵ دایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ. کاتێ چوومە ئاسمانی سێهەم یوسفم بینی کە نیوەی جوانی پێ بەخشرابوو..

له ڕیوایەتێکی تردا: ((هذا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عليه، فَسَلَّمْتُ عليه، فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ: مَرْحَبًا بالأخِ

(٣٣٣) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٤١٣).

(٣٣٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٨٧)، ومسلم (الصحيح) (٤١٥).

الصَّالحِ والنبيِّ الصَّالحِ، فَرَحَّبا بِي ودَعَا لِي بخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِي إلى السَّماءِ الرَّابِعَةَ، فَاسْتَفْتَحَ جبريل عليه السلام، فقيلَ: مَن أَنْت؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قيلَ: ومَن معكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قيلَ: وقدْ بُعِثَ إلَيْهِ؟ قالَ: قدْ بُعِثَ إلَيْهِ، قَالَ: (نعم) فَفُتِحَ لَنا، فإذَا (بـإدْرِيسَ، قَالَ: هذا إدْرِيسُ فَسَلِّمْ عليه فَسَلَّمْتُ عليه، فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ: مَرْحَبًا بالأخِ الصَّالِحِ والنبيِّ الصَّالِحِ، فَرَحَّبا بِي ودَعَا لِي بخَيْرٍ، قال الله عزوجل:[﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ ﴾] ثُمَّ عَرَجَ بِي إلى السَّماءِ الخَامِسَةَ، فَاسْتَفْتَحَ، قيلَ: مَن هذا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قيلَ: ومَن معكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قيلَ: وقدْ أُرْسِلَ إلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قيلَ: مَرْحَبًا به، فَنِعْمَ المَجِيءُ جَاءَ، ، قال الله عزوجل: [﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ ﴾] ثم عرج بنا إلى السماء الخامسة، فَاسْتَفْتَحَ جبريل عليه السلام، فقيلَ: مَن أَنْت؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قيلَ: ومَن معكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قيلَ: وقدْ بُعِثَ إلَيْهِ؟ قالَ: قدْ بُعِثَ إلَيْهِ، قَالَ: (نعم) فَفُتِحَ لَنا....).

جبريل عليه السلام وتی: ئەوە یوسفە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی چوارەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، چووم تەماشام کرد ئیدریسم بینی عليه السلام، جبریل عليه السلام وتی: ئەوە ئیدریسە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم، خوای گەورە فەرموویەتی: (وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾) واتە: بەرزمان کردەوە بۆ جێگەیەکی بەرز، پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ. دەرگاکەمان بۆ کرایەوە.

پاشان (فَإذَا أنا هَارُونُ، [قَالَ: هذا هَارُونُ فَسَلِّمْ عليه، فَسَلَّمْتُ عليه، فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ: مَرْحَبًا بالأخِ الصَّالحِ والنبيِّ الصَّالِحِ، فَرَحَّبا بِي ودَعَا لِي بخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِي إلى السَّماءِ السَّادِسَةَ، فاستفتح جبريل عليه السلام فقيلَ: مَن أَنْت؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قيلَ: ومَن معكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قيلَ: وقدْ بُعِثَ إلَيْهِ؟ قالَ: قدْ بُعِثَ إلَيْهِ، قَالَ: (نعم) فَفُتِحَ لَنا، فَإذَا مُوسَى، قَالَ: هذا مُوسَى فَسَلِّمْ عليه، فَسَلَّمْتُ عليه، فَرَدَّ ثُمَّ

قَالَ: مَرْحَبًا بالأخِ الصَّالِحِ والنبيِّ الصَّالِحِ، فَرَحَّبا بِي ودَعَا لِي بخَيْرٍ...)[٣٣٥] واتە: پاشان دەرگای بۆ کردینەوە و هارونم ﵇ بینی جبریل وتی: ئەوە هارونە ﵇ بچۆ سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و هارونیش وەڵامی دامەوە و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم.

پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی شەشەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، چووم تەماشام کرد موسا ﵇ لەوێیە، جبریل ﵇ وتی: ئەوە موسایە، سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە، و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: [فَلَمَّا جاوَزْتُهُ بَكَى، فَنُودِيَ: ما يُبْكِيكَ؟ قالَ: يا رَبِّ، هذا غُلامٌ بَعَثْتَهُ بَعْدِي يَدْخُلُ مِن أُمَّتِهِ الجَنَّةَ أكْثَرُ ممَّا يَدْخُلُ مِن أُمَّتِي]. واتە: کاتێ ویستم بەجێی بێهڵم و کەمێك لێی دوور کەوتمەوە دەستی کرد بە گریان، بانگی لێ کرا، چی خستیتیە گریان؟ وتی: ئەی پەروەردگار کوڕێکت ناردووە دوای من، ئومەتەکەی ئەو زیاتر دەچێتە بەهەشتەوە لەچاو ئومەتەکەی مندا....

پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: محمد، وترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ وتی: بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، تەماشا دەکەین ئیبراهیمە و پاڵی داوە بە (بيتُ المَعمور)ەوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا: [قُلْتُ: جبريلُ ! ما هذا ؟ قال : هذا البيتُ المعمُورُ ، يَدخُلُهُ كُلَّ يومٍ سبعُونَ ألْفَ ملَكٍ ، إذا خَرجُوا مِنهُ لمْ يُعودُوا إليه آخِرَ ما عليْهِمْ][٣٣٦] وتم ئەی جبریل: ئەوە چییە؟ وتی: ئەوە (بيت المعمور)ە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار مەلائیکە دەچنە ناویەوە و کە هاتنە دەرەوە هەتا کۆتایی دونیا ناگەڕێنەوە ناوی.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: (ثُمَّ لايَعُودُونَ إليهِ حَتى تَقوُمُ السَّاعَةَ)[٣٣٧] واتە: ئەو حەفتا

(٣٣٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٨٧).

(٣٣٦) أخرجه: ومسلم (الصحيح) (٤١٥).

(٣٣٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٥٣/٣)(٨٥٥٢١)، وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي في

**هەزار مەلائیکەیە دەچنە ناوی و پاشان ناگەڕێنەوە ناوی تا قیامەت بەرپادەبێ.**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا: (قَالَ: [قُلْتُ مَنْ هذا؟] هذا أَبُوكَ إبراهيمُ فسلِّمْ عليه ، فسلَّمْتُ عليه ، فرَدَّ السَّلامَ ، فقال : مرْحبًا بالابْنِ الصَّالِحِ والنبيِّ الصَّالِحِ) واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە کێیە پاڵی داوەتەوە؟ جبریل ﵇ وتی: ئەوە ئیبراهیمی باوکتە بچۆ سەلامی لێ بکە منش سەلامم لێ کرد ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی: مەرحەبا و پێشوازی لە کوڕی چاك و پێغەمبەری چاك.**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا: (ليلة أسرى بِي مَرَرْتُ بِابراهيم ﵇ فَقَالَ: يا جبريل مَنْ هَذا مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَد، فَسلم عليَ ورحّب بِي وقالَ: يا محمدُ أقريءْ أُمَّتَك مني السلامَ، و أَخْبِرْهُمْ أنَّ الجنةَ طيبةُ التربةِ، عذبةُ الماءِ، (وأَرْضُها واسِعَة) وأنَّها قيعانٌ وأنَّ غِراسَها سبحانَ اللهِ والحمدُ للهِ ولا إلهَ إلَّا اللهُ واللهُ أكبرُ[٣٣٨]). واتە: ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا تێپەریم بەلای ئیبراهیمدا ﵇ و وتی: ئەی جبریل ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟ وتی: ئەوە محمدە، ئیبراهیمیش سەلامی لێ کردم و پێشوازی لێ کردم و وتی: ئەی محمد سەلامی من بگەیەنە بە ئومەتەکەت وە هەواڵیان پێ بگەیەنە کە بەهەشت خاکەکەی بەپیتە و ئاوەکەشی سازگارە و خاکەکەشی زۆر فراوانە و چێنراوەکانی: (سبحانَ اللهِ والحمدُ للهِ ولا إلهَ إلَّا اللهُ واللهُ أكبرُ (لاحَوْلَ ولا قُوةَ إلا باللهِ) یە (واتە: ئەگەر بتەوێت ڕووەکت بۆ بڕوێت بەوتنی ئەم یادانە دەڕوێت) (سدرة المنتهى)[٣٣٩]، (إلَيْها يَنْتَهِي ما يُعْرَجُ به مِنَ الأَرْضِ فيُقْبَضُ مِنْها، وإلَيْها يَنْتَهِي ما يُهْبَطُ به مِن فَوْقِها فيُقْبَضُ مِنْها...)[٣٤٠] واتە: پاشان برام بۆلای (سدرة المنتهى)یە ئەوەیە هەر شتێك لە زەویەوە بەرز بێتەوە تا ئەوێ دەگات و پاشان لەوێ وەردەگیرێت و بەرز دەکرێتەوە، هەر شتێکیش لە سەرەوە بێت هەتا ئەوێ دێتە خوارەوە و لەوێ وەردەگیرێت، دەفەرموێت: فەرمانێك لە فەرمانەکانی خوای گەورە**

---

(السنن الكبرى) (١١٥٣٠)، وأبو يعلى في (المسند) (١٣٤٤٧)، والحاكم في (المستدرك) (٤٦٨/٢) وصححه الشيخ الألباني في (سلسلة الأحاديث الصحيحة) (٤٧٧)، وفي (صحيح الجامع) (٢٨٩٣).

(٣٣٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٤١٨/٥)، والترمذي في (السنن) (٣٦٠١)، والطبراني في (المعجم الكبير) (٣٨٩٨)، وإبن حبان في (الصحيح) (٨٢١)، وقال محققه صحيح بشواهده عن أبي أيوب مرفوعاً، وحسنه المنذري في (الترغيب والترهيب) (٤٤٥/٢)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٧/١٠)، ورجال أحمد رجال الصحيح وحسنّه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٧٥٠)، وفي (سلسلة الأحاديث الصحيحة) (١٠٥)، وفي (صحيح الكلم الطيب) (١٥) وفي (صحيح الجامع) (٣٤٦٠) واللفظ لإمام أحمد.

(٣٣٩) أخرجه: البخاري (٣٨٨٧)، ومسلم (٤١٣).

(٣٤٠) أخرجه: أحمد (٨٢٨/٣) إسناده صحيح (صحيح الاسراء) (ص:٤٨).

گرتیەوە و ڕواڵەتی (سدرة المنتهى) گۆڕرا هەتا هیچ کەس لە دروست کراوەکانی خوا ناتوانێت وەسفی بدات لە جوانیدا...

(فإذا نَبَقُها مِثْلُ قِلالِ هَجَرَ ، وإذا ورَقُها مِثْلُ آذانِ الفِيَلَةِ) و قَالَ: (أي: جبريل) : هذه سِدرةُ المنْتَهَى....)[٣٤١] واتە: بەری داری (النبق) کە وەکو گۆزە گەورەکانی هەجەر وابوو وە گەڵاکانی وەکو گوێچکەی فیل گەورە بوو، جبریل ﷺ وتی: ئەوە (سدرة المنتهى) یە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (تەماشام کرد (لە بنەکەیدا) چوار ڕووبار هەبوو دووانیان داپۆشرابوون و دووانیان ئاشکرا بوون، وتم: ئەی جبریل ئەوە چییە؟ وتی: ئەو دوو ڕووبارە کە داپۆشراوە دوو ڕووبارن لە بەهەشتدا وە دوو ڕووبارە ئاشکراکەش نیل و فوراتە، ئینجا پەرداخێ شەراب وپەرداخێ شیر و پەرداخێ هەنگوینیان هێنا و منیش شیرەکەم هەڵبژارد و جبریل وتی: ئەوە فیطرەتی پاکت هەڵبژارد کە ئومەتەکەت لەسەر ئەو فیطرەتە پاکە دەمێنێتەوە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا: (رأى (النبي ﷺ) جبريل ﷺ في حُلةٍ من رفرفٍ قد ملأ ما بينَ السماءِ والأرضِ)[٣٤٢]. واتە: پێغەمبەر ﷺ جبریلی ﷺ بینی لە بەرگێکی ڕەفرەفدا لە نێوان زەوی و ئاسماندا (واتە نێوانی زەوی و ئاسمانی گرتبوو).. لە گێڕانەوەیەکی تردا: (قد سد الأفق)[٣٤٣] واتە: ئاسۆی ئاسمانی داپۆشیبوو لە گەورەییدا، و لە گێڕانەوەیەکی تردا: (لَمَا أسري برسول الله ﷺ انْتُهي به إلى سِدْرَةِ المُنْتَهَى، أُعْطِيَ... وخَواتيمَ سورةِ البَقَرةِ، وغُفِرَ لِمَن لا يُشرِكُ باللهِ شَيئًا مِن أُمَّتِه المُقحِماتِ)[٣٤٤]. واتە: کاتێك شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ بەرزکرایەوە تا گەیشتە ناوچەی (سِدْرَةِ المُنْتَهَى) و لەوێ کۆتایی سورەتی ئەلبەقەرەی پێدرا، لێخۆش بوونی بەخشرایە ئەوانەی گوناهێکیان ئەنجام داوە و خۆیان دوورگرتووە لە هاوبەشی بۆ خوادانان لەتێکرایی ئومەتەکەی.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئیبنو مەسعود ﷺ ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە

(٣٤١) أخرجه: البخاري (٣٨٨٧).

(٣٤٢) أخرجه: الترمذي (٣٢٨٣)، والنسائي في (التفسير) (٥٥١)، قال محققه: إسناده صحيح، وأحمد (٣٩٤/١)، والطيالسي (٣٢٣)،وابو يعلى(٥٠١٨)، والطبراني في (الكبير) (٩٠٥٠)،والحاكم (٤٦٨/٢) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦١٧).

(٣٤٣) أخرجه: النسائي في (التفسير) (٥٦٠) وقال محققه: صحيح.

(٣٤٤) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤٣٠)، والترمذي في (السنن) (٣٢٧٦)، وإبن حبان في (الصحيح) (٦٤٢٨).

فەرموویەتی: (رأَيْتُ جبريل ﷺ عِنْدَ السِّدرةِ لهُ سِتُّمائةِ جَناحٍ تَنهالُ منها (من ريشة) تَهاوِيلُ الدُّرِّ والياقوتِ)(٣٤٥). واتە: جیبریلم بینی لای سیدرە کە شەش سەد باڵی هەبوو کە دەیجوڵاندن جۆراوجۆر دوڕو یاقووت لە باڵەکانی دەباری....

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەر ﷺ شەوڕەوی پێ کراو گەیشتە (سدرة المنتهى) لەوێ خوای گەورە کۆتایی سورەتی (البقرة)ی پێ بەخشی و خۆشبوو لە تاوانە گەورەکانی ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەداوە لە ئومەتەکەی.

لەڕیوایەتێکی تردا: (ثُمَّ أُدْخِلْتُ الجَنَّةَ، فَإِذَا فِيهَا جَنَابِذُ اللُّؤْلُؤِ، وإِذَا تُرَابُهَا المِسْكُ)(٣٤٦) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پاشان چوومە ناو بەهەشتەوە، بینیم تەپۆڵکەی مرواری تیدا بوو وە دەستم لە خاکەکەیەوەدا میسك بوو دەفەرموێت: (رَأيتُ نَهرًا في الجَنَّةِ حافَّتاه قِبابُ اللُّؤْلُؤِ، فقُلْتُ: ما هذا يا جِبريلُ؟ قال: هذا الكَوْثَرُ الذي أعْطاكَه اللهُ)(٣٤٧) واتە: ڕووبارێکم بینی لە بەهەشتدا هەردوولای مرواری بوو، وتم: ئەوە چییە ئەی جبریل؟ وتی: ئەوە ئەو کەوثەرەیە خوای گەورە پێی بەخشیویت، لەگێرانەوەیەکی تردا: (ثُمَّ عُرِجَ بِي حتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوًى أَسْمَعُ فيه صَرِيفَ الأقْلَامِ)(٣٤٨). پاشان بەرز کرامەوە (دیارە لە بەهەشتەوە (واللهُ أَعلم)) تا گەیشتمە ئاستێك کە گوێم لە دەنگی قەڵەمەکان بوو (واتە: نەقڵ کردنی زانیاریەکان لە (لوح المَحْفوظ) ەوە لەلایەن مەلائیکەوە) (والله أعلم).

((وفُتِحَ لِي بابٌ من أبوابِ السَّماءِ ورأيتُ النُّورَ الأعظَمَ وإذا دونَ الحجابِ رفرفةُ الدُّرِّ والياقوتِ) فأوحى للَّهُ إِلَيَّ ما أوْحَى)، فَفَرَضَ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلاةً في كُلِّ يَومٍ ولَيْلَةٍ، فَنَزَلْتُ إلى مُوسَى ﷺ فقالَ: ما فَرَضَ رَبُّكَ علَى أُمَّتِكَ؟ قلتُ)(٣٤٩) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: گەیشتمە ئەوێ دەرگایەکم

---

(٣٤٥) أخرجه: أحمد (٤١٢/١)، والطبري (٣٩/٢٧)،والنسائي في (التفسير) (٥٥١) وقال محققه: إسناده حسن،وقال ابن كثير في (التفسير) (٢٣/٦): إسناده جيد قوي والتفسير ايضا قال في (٢٤/٦):إسناده حسن، وابن حبان (٥٤،٦٤٢٨)، وقال محققه: سنده حسن،والطبراني في(الكبير) (٩٠٥٤)،وانظر (الإسراء و المعراج) للشيخ الألباني (١٠٢).

(٣٤٦) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٤).

(٣٤٧) أخرجه: الترمذي في (السنن) (٣٣٥٩)، النسائي في (التفسير) (٥٥٣)، وقال محققه إسناده صحيح، على شرط الشيخين وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٦٥٧).

(٣٤٨) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٤٨)، ومسلم في (الصحيح) (٤١٤).

(٣٤٩) أخرجه: أبونعيم في (الحلية) (٣١٦/٢)، وإبن سعد في (الطبقات) (١١٢/١)، وإبن عساكر في (تهذيب تأريخ

بۆ کرایەوە لە دەرگاکانی ئاسمان، نوری هەرە گەورەم بینی کە پەردەیەکی شەکاوەی دوڕ و یاقووتی هەبوو لە نزیك (الحجاب)، وە پاشان خوای گەورە ئەو وەحیەی خۆی ویستی لێ بوو بۆی ناردم لەوێ ئینجا پەنجا نوێژی لەسەرم فەرزکرد لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا، پاشان گەڕامەوە و دابەزیم تا گەیشتمە لای موسی ﷺ و پێی وتم: خوا چی فەرزکرد لەسەر ئوممەتەکەت؟ منیش وتم: ((فرض عليهم)) خَمْسِينَ صَلاةً، قالَ: ارْجِعْ إلى رَبِّكَ فاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فإنَّ أُمَّتَكَ...))[٣٥٠] پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم، موسا وتی: بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای سوك کردنی لێ بکە بۆ ئوممەتەکەت، لەگێڕانەوەیەکی تردا: (... لا تستطيعُ خمسينَ صلاةً كلَّ يومٍ) واتە: چونکە ئوممەتەکەت ناتوانن پەنجا نوێژ بکەن، (وإنِّي واللَّهِ قدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ، وعَالَجْتُ بَنِي إسْرَائِيلَ أشَدَّ المُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إلى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ...)[٣٥١] واتە: وەڵاهی من خەڵکانم پێش تۆ تاقی کردۆتەوە و زۆر کۆششم کرد لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای سوك کردنی لێ بکە بۆ ئوممەتەکەت، (دوای ئەوە موسا ﷺ پێی وتەوە).

لەگێڕانەوەیەکی تردا: (يا مُحَمَّدُ واللَّهِ لقَدْ رَاوَدْتُ بَنِي إسْرَائِيلَ قَوْمِي علَى أدْنَى مِن هذا فَضَعُفُوا فَتَرَكُوهُ، فَأُمَّتُكَ أضْعَفُ أجْسَادًا وقُلُوبًا وأَبْدَانًا وأَبْصَارًا وأَسْمَاعًا). واتە: ئەی محمد وەڵاهی لەوە کەمتر لە بەنی ئیسرائیلی خزمانی خۆم داواکرد کەچی بێ هێز بوون بەرامبەری و ئەنجامیان نەدا، ئوممەتەکەی تۆ جەستە و دڵ وچاو و گوێیان زۆر لاوازترە لە ئوممەتی من، پێغەمبەر ﷺ دوای پێشنیارەکەی موسا ﷺ: ئاوڕێکی دایەوە بەلای جبریلدا وەك ئەوەی ڕاوێژی پێ بکات، جبریل ئاماژەی بۆ کرد وتی: بەڵێ ئەگەر پێت خۆشە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆلای پەروەردگارت، دەفەرموێت: بەرزی کردمەوە بۆلای خوای گەورە هەتا وتم: ((يا رَبِّ خَفِّفْ عَنَّا فإنَّ أُمَّتي لا تَسْتَطِيعُ هذا،))[٣٥٢] واتە: ئەی پەروەردگار سوکی بکە لەسەرمان ئێمە ئەوە ناتوانین... (فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا، فَرَجَعْتُ إلى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا، فَرَجَعْتُ إلى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ،

---

دمشق) (٣٨٥/١) وقال الذهبي في (سير أعلام النبلاء) (١٧١/١) إسناده جيد حسن وقال الهيثمي في (المجمع الزوائد) (٢٣٨) رواه البزار والطبراني في (المعجم الأوسط) ورجاله رجال الصحيح.

(٣٥٠) أخرجه: مسلم (٤١٤).

(٣٥١) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٨٨٧).

(٣٥٢) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٧٥١٧).

فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا، فَرَجَعْتُ إلى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ فَأُمِرْتُ بعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَومٍ، فَرَجَعْتُ فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ فَأُمِرْتُ بخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَومٍ، فَرَجَعْتُ إلى مُوسَى، فَقَالَ: بمَ أُمِرْتَ؟ قُلتُ: أُمِرْتُ بخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَومٍ، قَالَ: إنَّ أُمَّتَكَ لا تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَومٍ، وإنِّي قدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وعَالَجْتُ بَنِي إسْرَائِيلَ أشَدَّ المُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إلى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ، قَالَ: سَأَلْتُ رَبِّي حتَّى اسْتَحْيَيْتُ)[٣٥٣]. واتە: خوای گەورە (دە) نوێژی لەسەر لابردم و گەڕامەوە بۆلای موسا، و هەمان قسەی یەکەم جاری پێ وتمەوە، و منیش گەڕامەوە بۆلای پەروەردگار تا دە نوێژی تری لەسەر لابردم، پاشان گەڕامەوە بۆلای موسا و هەمان قسەی یەکەم جاری پێ وتم، منیش گەڕامەوە بۆلای پەروەردگار و (دە) نوێژی تری لەسەر لابردم و پاشان فەرمانم بە دە نوێژ پێ کرا لە هەموو ڕۆژێکدا و گەڕامەوە و موسا هەمان قسەی یەکەم جاری پێ وتمەوە، و گەڕامەوە و پێنج نوێژم لەسەر فەرز کرا .

پاشان گەڕامەوە بۆلای موسا وتی: فەرمانت بە چی پێ کراوە؟ وتم: بە پێنج نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا، موسا ﷺ وتی: ئومەتەکەت ناتوانن پێنج نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا بکەن ، و من خەڵکانم لە پێش تۆدا تاقی کردۆتەوە» و کۆششێکی زۆرم لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا کردووە، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت و داوای لێ بکە تا سووکی بکات لەسەر ئومەتەکەت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: منیش وتم: ئەوەندە داوام کردووە شەرم دەکەم ([من رَبِّي مِمَّا اختلف إليه] و لكن أرضَ و أُسلِم قَالَ: فَلَمَّا جَاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ: أمْضَيْتُ فَرِيضَتِي، وخَفَّفْتُ عن عِبَادِي ، [وإنَّ لكَ بهذهِ الخَمْسُ خمسين][٣٥٤] يا مُحَمَّدُ، إنَّهُنَّ خَمْسُ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَومٍ ولَيْلَةٍ، لِكُلِّ صَلاةٍ عَشْرٌ، فَذلكَ خَمْسُونَ صَلاةً.)[٣٥٥].

واتە: شەرم دەکەم لە پەروەردگارم ئەوەندە گەڕاومەتەوە بۆ لای، بەڵام ڕازی دەبم بەو پێنج فەرزە و دەفەرموێت: کە موسام بەجێ هێشت و لێی دوور کەوتمەو بانگم لێ کرا پێم وترا: ئەوا وتەی خۆمم بردە سەر و ئەرکم لەسەر بەندەکانم سوك کرد، ئەی محمد ئەوانە پێنج نوێژە لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا و هەموو

---

(٣٥٣) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٨٨٧).

(٣٥٤) أخرجه: أحمد (١٦١/٣) وإسنادهُ صحيح على شرطهما:الشيخ الألباني (صحيح الإسراء والمعراج) (ص:٤٩).

(٣٥٥) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٧٥١٧).

نوێژێك دەیە و ئەوە پەنجا نوێژ دەکات (لا يُبَدَّلُ القَوْلُ لَدَيَّ)[٣٥٦]، ومَن هَمَّ بحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْها كُتِبَتْ له حَسَنَةً، فإنْ عَمِلَها كُتِبَتْ له عَشْرًا، ومَن هَمَّ بسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْها لَمْ تُكْتَبْ شيئًا، فإنْ عَمِلَها كُتِبَتْ سَيِّئَةً واحِدَةً)[٣٥٧] فەرمووی: وتە لای من ناگۆڕێت و هەر کەسێك نیازی کردنی چاکەیەکی هەبێت و نەیکات چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، گەر ئەنجامی بدات دە چاکەی بۆ دەنوسرێت، و هەر کەسێك نیازی تاوانێکی هەبێت و نەیکات هیچی لەسەر نانوسرێت، و گەر ئەنجامی بدات ئەوا یەك تاوانی لەسەر دەنوسرێت، وە دوایی خوای گەورە فەرمووی: (قالَ: فَاهْبِطْ باسْمِ اللَّهِ)[٣٥٨] واتە: دابەزە بەناوی خواوە.

ئیبنو کثیر ﷺ دەفەرموێت: (پاشان دابەزی بۆ بیت المقدس و پێغەمبەرانیش ﷺ دابەزین لەگەڵیدا و کاتی نوێژ هات و (پێ دەچێت نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژە بوو بێت) پێغەمبەر ﷺ پێش کەوت و پێش نوێژی بۆ کردن.....)[٣٥٩]

سەبارەت بە پێش نوێژی کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە ﷺ ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وقدْ رَأَيْتُنِي في جَماعَةٍ مِنَ الأنْبِياءِ، فإذا مُوسَى قائِمٌ يُصَلِّي، فإذا رَجُلٌ ضَرْبٌ، جَعْدٌ))[٣٦٠]. واتە: ئەتبینیم لەناو کۆمەڵێك پێغەمبەراندا بووم و موسا لە نێوانیاندا بوو بەرچاوم کەوت نوێژی دەکرد بە پێوە پیاوێکی چوار شانەی بەخۆوە بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا [آدم طوال][٣٦١] واتە: بالابەرز بوو [رَجِلُ الرأسِ] واتە: پێست سپییەکی قژلولی قژ داهێنراو بوو (كَأنَّهُ مِن رِجالِ شَنُوءَةَ، وإذا عِيسَى ابنُ مَرْيَمَ عليه السَّلامُ قائِمٌ يُصَلِّي...)[٣٦٢] واتە: دەتوت یەکێکە لە پیاوانی شنوئەی عومانە وە عیسای کوڕی مەریەمم بەرچاو کەوت بە پێوە نوێژی دەکرد لە ڕیوایەتێکی تردا [حَدِيدَ البَصَرِ][٣٦٣] واتە: پیاوێکی چاو تیژ بوو.

(٣٥٦) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٤).

(٣٥٧) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٤).

(٣٥٨) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٧٥١٧).

(٣٥٩) انظر: تفسير القرآن العظيم (٤٩١/٣).

(٣٦٠) أخرجه: مسلم(٤٢٩).

(٣٦١) أخرجه: مسلم (٤١٨).

(٣٦٢) أخرجه:مسلم (٤٢٣).

(٣٦٣) أخرجه: أحمد (٣٥٤٦) وصحح إسنادة كل من:احمد شاكر وشعيب الأرنؤوط، وحسنة الشيخ الالباني في (الاسراء والمعراج) (ص:٧٦).

**لە ڕیوایەتێکی تردا: [مَرْبُوعَ الخَلْقِ إلى الحُمْرَةِ والْبَياضِ، سَبْطَ الرَّأْسِ][٣٦٤] واتە: چوار شانەیەکی سوروسپی قژ خاو بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا: [كأنه خرج من دیماس] أَقْرَبُ النَّاسِ به شَبَهًا عُرْوَةُ بنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ، وإذا إبْراهِيمُ عليه السَّلامُ قائِمٌ يُصَلِّي، أشْبَهُ النَّاسِ به صاحِبُكُمْ، يَعْنِي نَفْسَهُ، فَحانَتِ الصَّلاةُ فأمَمْتُهُمْ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلاةِ قالَ قائِلٌ: يا مُحَمَّدُ، هذا مالِكٌ صاحِبُ النَّارِ، فَسَلِّمْ عليه، فالْتَفَتُّ إلَيْهِ، فَبَدَأَنِي بالسَّلامِ)[٣٦٥]. واتە: دەتوت لە حەمام هاتۆتە دەر و نزیکترین کەس کەلەو بچێت عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفییە، وە ئیبراهیمم بینی بە پێوە نوێژی دەکرد، نزیکترین کەس بە ئەو هاوەڵەکەی خۆتانە (واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتی نوێژ هات پێش نوێژیم بۆ کردن کە نوێژەکە تەواو بوو یەکێ پێی وتم: ئەوە مالیکی دەرگاوانی دۆزەخە سەلامی لێ بکە؟ کە ئاوڕم دایەوە ئەو لە پێش مندا سەلامی لێ کردم. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ثمَّ أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فأَمَمتُهُمْ ، ثمَّ انصَرفنا فأقبَلنا)[٣٦٦]. واتە: پاشان قامەت کرا و پێش نوێژیم بۆ کردن و لەوێ هاتینە دەرەوە و گەڕاینەوە.**

**لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (أُسرِيَ بِالنبيِّ ﷺ إلى بَيتِ المَقْدِسِ ... ورأى الدَّجَّالَ في صُورَتِه رُؤْيا عينٍ ليس برُؤْيا مَنامٍ ، وعِيسَى ومُوسَى وإبراهيمَ ، فسُئِلَ النبيُّ ﷺ عَنِ الدَّجَّالِ ، فقال: رأيْتُهُ فَيْلَمانِيًّا أَقْمَرَ هِجَانًا ، إحْدَى عينيه قائمةٌ كأنها كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ ، كأنَّ شَعْرَ رأسِهِ أَغْصانُ شجرةٍ)[٣٦٧] واتە: شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ بۆ بیت المقدس و لەوێ دەجالی بینی لە شێوەی خۆیدا و بە چاوی خۆی بێ ئەوەی خەوتبێت، عیسا و موسا و ئیبراهیمیشی بینی و پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەجال؟ فەرمووی: پیاوێکی بەخۆی چوار شانەی زۆر سپیکەلە بوو یەکێ لەچاوەکانی زەق و دەرپۆقیو**

---

(٣٦٤) أخرجه: مسلم(٤١٨).

(٣٦٥) أخرجه: مسلم(٤٢٣).

(٣٦٦) أخرجه: ابن عساكر في (تهذيب تأريخ دمشق) (٣٨٦/١)، وقال الذهبي في (سير أعلام النبلاء) (١٨٢/١) وفي (تأريخ الإسلام) (٢٦٩/١): حديث حسن غريب.

(٣٦٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٧٤/١) رقم (٣٥٤٦) وصححه الشيخان أحمد شاكر وشعيب الأرناؤوط والنسائي في (التفسير) (٣٠٣) وقال محققه إسناده حسن صحيح، وأبو يعلى (٢٧٢٠)، والطبري في (تهذيب الآثار) (٤٠٨/١) وقال الحافظ ابن كثير (٤٨٠/٣) إسناده صحيح. وأما حديث مذاكرة الأنبياء حول الدجال وردّ أمرهم إلى عيسى ثم بيان كيفية قتله وذلك كله في ليلة الإسراء فهذا حديث ضعيف: أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٧٥/١)، وإبن ماجة (٤٠٨١)، وإبن أبي شيبة (١٥٨/١٥)، والطبري في (التفسير) (٩١/١٧)، والحاكم في (المستدرك) (٤٨٨/٤) ووافقه الذهبي، وابو عمر والداني في (السنن الواردة في الفتن) (٥٢٩) وضعفهُ محققه، وضَعَفَهُ أيضاً الشيخ الألباني في ضعيف سنن ابن ماجه.

بوو وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار وابوو، وە مووەکانی قژی وەك پەلەکانی درەخت وابوو. بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە لەو شەوەدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پێغەمبەر عیساو موسادا ﷺ کەوتوونەتە باسکردنی دەجال و چۆنێتی هاتنی و کوشتنی لەلایەن پێغەمبەر عیساوە کە چۆن دادەبەزێت و دەیکوژێت ئەو ڕیوایەتە (ضعیف)ە[٣٦٨].

ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (..... ثم انصرف بِي فمرَرنا بِعيرٍ لقريش بِمَكانِ كذا وَكذا قد ضلُّوا بعيراً لَهم قد جمعَهُ فلانٌ فسلَّمتُ عليْهم فقالَ بعضُهم هذا صوتُ محمَّدٍ. ثمَّ أتيتُ أصحابي قبلَ الصُّبحِ بِمَكَّةَ..)[٣٦٩]. واتە: پاشان گەڕامەوە وتێپەڕیم بەلای کاروانێکی قورەیشدا لە فلان و فلان شوێندا بوون وشترێکیان لێ ون بوو بوو وەفلانە کەس گرتبوویەوە بۆیان و منیش سەلامم لێ کردن و هەندێکیان وتیان: ئەوە دەنگی محمدە، ئینجا گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکانم پێش بەرەبەیان لە شاری مەککە.

## گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە ئیسرا و میعراج

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرە شکۆدارەکەی لای خوای گەورە و میهرەبان، ئەوەبوو نیشانە گەورەکانی دەسەڵاتی خوای گەورەی بینی، لەگەڵ بیبینی ئاسمانەکان و فریشتەکانی خوای گەورە و جبریل...، پێغەمبەر ﷺ باش دەیزانی کە بگەڕێتەوە لای کافرەکانی قورەیش ئەوان دەمەقاڵە دەکەن و باوەڕ پێناهێنن و بە درۆشی دەخەنەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەو بەرەبەیانەدا کە گەڕایەوە بە کزۆڵەیی و دوور لە خەڵکی دانیشتبوو.

ئیبنو عەباس ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لَمَّا كان لَيلةَ أُسريَ بِي، وأصبَحتُ بِمكةَ، فَظِعتُ بأمري، وعرَفتُ أنَّ النَّاسَ مُكذِّبِيَّ...)) واتە: (کاتێ خوای گەورە شەوڕەوی پێ کردم و گەڕامەوە و بەیانیم بەسەردا هات لەمەککە زۆر دەترسام لەم کارەم و دەمزانی کە خەڵکی بە درۆم دەخەنەوە، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ دوور لە خەڵکان دانیشتبوو بە غەم و پەژارەوە، و دوژمنی خوا

---

(٣٦٨) أخرجه: أحمد (٣٧٥/١)، وابن ماجه(٤٠٨١)، وابن أبي شيبة (١٥٨/١٥)، والطبري في (التفسير) (٩١/١٧)، والحاكم (٤٨٨/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وأبو عمر الداني في (السنن الواردة في الفتن) (٥٢٩) وضعفه محققه، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف سنن ابن ماجه) (٨٠٠).

(٣٦٩) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٧١٤٢)، والبزار(٣٥/١)،والبيهقي في (الدلائل) (٣٥٥/٢) وقال إسناده صحيح.

ئەبو جەهل بەلایدا تێپەری و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وەکو گاڵتە پێ کردنێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: چییە هیچ بووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەم شەو شەوڕەویم پێ کراوە، وتی: بۆ کوێ؟ فەرمووی: بۆ (بیت المقدس)، وتی: هەر ئەم شەو چویتە ئەوێ و گەڕایتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیبنو عباس ﷺ دەفەرمویێت: ئەبو جەهل پێی باش نەبوو، کە پێغەمبەر ﷺ بەدرۆ بخاتەوە نەوەك گوایە پێغەمبەر ﷺ قسەکەی بگۆڕێت کاتێ کە خزمانی لێی کۆببنەوە و بەوانی ڕانەگەیەنێت، لەبەر ئەوە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئایا ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ خزمانتی دەگێڕیتەوە ئەگەر کۆیان کەمەوە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەبو جەهل هاواری کرد: هۆ کوڕانی کەعبی کوڕی لوئەی وەرن بۆ ئێرە، هەموو کۆڕ و کۆمەڵی چوار دەوری کەعبە و شوێنە گرنگەکان هەموو چۆڵ بوون و هەموویان هاتن بۆلای ئەبو جەهل و کۆبونەوە و دوای ئەوە ئەبوجەهل بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ ئەوانیشی بگێڕەرەوە، پێغەمبەر ﷺ بەوانی فەرموو: ((من ئەمشەو شەوڕەویم پێ کراوە))، وتیان: بۆ کوێ؟ فەرمووی: بۆ (بیت المقدس)، وتیان: هەر ئەم شەو لەناوماندا ڕۆیشتیت و بەیانییەکەی گەڕایتەوە ناومان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ)).

ئینجا بێباوەڕان هەندێك دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هەندێکیشیان دەستیاندا بەسەریاندا (گوایە وتیان: ئەم درۆیە چەند گەورەیە بەلایانەوە)، ئینجا پیاوە ناودارەکانیان وتیان: باشە ئەتوانی تۆ باسی شێوەی مزگەوتەکەمان بۆ بکەیت؟ چونکە هەندێك لە بێباوەڕان کە لەوێ بوون سەفەریان کردبوو بۆ ئەو وڵاتە و مزگەوتەکەیان واتە: (بیت المقدس) یان بەرچاوکەوتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((فذهَبتُ أنعَتُ، فما زلت أَنعَتُ حتى التبَسَ عليَّ بَعضُ النَّعتِ ..)) واتە: ئینجا کەوتمە وەصف کردنی مزگەوتەکە بۆیان، بەردەوام بووم ئەوندەم وەصف کرد هەتا هەندێ وەصفم لێ تێك چوو، خوای گەورە مزگەوتەکەی وەك شێوەی خۆی هێنایە بەردەمم تا لەوبەری خانووەکەی عەقیلەوە لە پێش چاوم بوو وە سەیرم دەکرد و وەصفم دەکرد بۆیان، پاشان ئەوان وتیان: بەڕاستی وەصف کردنەکەی تەواو بوو پێکای...)[٣٧٠].

---

(٣٧٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٠٩/١) (٢٨١٩) وقال محققة الارناؤوط: إسنادة صحيح على شرط الشيخين، وأخرجه ايضا برقم (٢٨٢٠) وقال الشيخ أحمد شاكر: إسنادة صحيح، والبزار (٥٦)، وابن أبي شيبة (٤٦١/١١)، والنساني في (التفسير) (٣٠٥) وقال محققه إسناده صحيح، والطبراني في (الكبير) (١٢٧٨٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٣٦٤/٢) وقال محققة:

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ بە موشریکەکانی فەرموو: (نیشانەی ڕاستی وتەکانم ئەوەیە من تێپەڕیم بەلای کاروانێکی ئێوەدا لە فلاَن جێگە و وشترێکیان لێ ون بوو بوو، وە فلاَنە کەس گرتبوویەوە بۆیان، وە ئەوان ئێستا لە ڕێ ڕۆیشتنەکەیاندا گەیشتوونەتە فلاَن جێگە، و لە فلاَن جێگە لایان داوە و لە ڕۆژی ئەوندە و ئەوندەدا دەگەڕێنەوە، وشترێکی سپی کە کۆپانێکی ڕەشی بەسەر پشتەوەیە لەگەڵ دوو مەشکەی ڕەشدا لە پێش کاروانەکەوە دەگەڕێتەوە لاتان بۆ ناو شاری مەککە لە فلاَن ڕۆژ و فلاَن ڕۆژدا.

شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەفەرموێت: کاتێ ئەو ڕۆژە هات کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردبوو بۆ گەڕانەوەی قافڵەکە خەڵکی لەسەر بان و شوێنە گشتییەکان تەماشایان دەکرد تا نزیکی نیوەڕۆ کاروانەکە لە دوورەوە دیار بوو کە گەڕایەوە یەکەم وشتریش لە پێشیانەوە ئەو وشترە بوو کە پێغەمبەر ﷺ وەصفیدا بوو)[٣٧١] ئالێرەدا وەك تاقیکردنەوەیەکی خوایی بۆ موسوڵمانەکان وە لە ناویاندا هاوەڵی بەڕێز ئەبوبەکر ﷺ کە یەکەم کەس بوو پێغەمبەری ﷺ بەڕاست خستەوە، بەلاَم بە بیستنی ئەم هەواڵە هەندێ لە موسوڵمانە باوەڕ لاوازەکان پاشگەز بوونەوە لە ئاینی ئیسلام).

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ بۆ مزگەوتی ئەقصا کە ڕۆژ بووەوە بۆ خەڵکی گێڕایەوە کەچی هەندێ لەوانەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ هێنا بوو وە بەڕاستیان زانیبوو، پاشگەز بووەنەوە و کافر بوون و چوون بۆلای ئەبوبەکر و پێیان وت: نابینی هاوەڵەکەت وا ڕادەگەیەنێت کە ئەمشەو شەوڕەوی پێکراوە بۆ (بیت المقدس)، ئەبوبەکر فەرمووی: وای فەرمووە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەگەر وای فەرمووبێت ڕاست دەکات، وتیان: چۆن تۆ بەڕاستی دەخەیتەوە کە بەیەك شەو چووبێتە ئەوێ و گەڕابێتەوە پێش ئەوەی بەیانی بەسەردا هاتبێت؟ وتی: من لەوە دوورتریش بەڕاستی دەخەمەوە کە هەواڵی ئاسمانی بۆ دێت لەبەرەبەیانێکدا یان لە ئێوارەیەکدا، دەفەرموێت: هەر لەو ڕۆژەوە ئەبوبەکر نازناوی (الصدیق)ی لێنرا)[٣٧٢].

---

رواة أحمد و ابو نعيم بسند صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (٦٥/١): ورجال أحمد رجال الصحيح، وقال السيوطي في (الدر المنثور) (١٥٥/٤): إسنادة صحيح، وقال الشيخ مقبل بن هادي الوادعي رحمة الله في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦٨٦): حديث صحيح على شرط الشيخين.

(٣٧١) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٧١٤٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٣٥٥/٢) وقال: إسناده صحيح.

(٣٧٢) أخرجه: الحاكم (٦٢/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٣٦١/٢،٣٦٠)، والنسائي في (الكبرى)

لەگەڵ ئەو هەموو وەصفەی کە پێغەمبەر ﷺ کردی سەبارەت بە مزگەوتەکەی ئەقصا و وەصف کردنی کاروانەکەیان کە هەموو ئەوانە نیشانەی ڕاستگۆیی پێغەمبەر ﷺ دەردەخەن کە نێرراوە لەلایەن خوای گەورەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو بۆ هەندێ لە باوەڕ لاوازەکان و کەم هۆشە ئەو موسوڵمانە کە تازە موسوڵمان بوو بوون، تێنەگەیشتبوون لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ باسی شەوڕەوی بۆ کردن بۆ (بیت المقدس) و کاروانەکەی بۆ ڕوون کردنەوە، بەڵام هەندێ لە خەڵکی وتیان: هەرگیز ئێمە محمد بەڕاست نازانین لەم وتانەدا و پاشگەز بوونەوە و کافر بوون و خوا لە گەردنی دان لەگەڵ ئەبو جەهلدا)[٣٧٣].

## ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوڕەو یەکەیدا بینی

### یەکەم: خوای گەورەی بینی بە دڵ

ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (قَدْ رأى النَبـي ﷺ رَبَّهُ)[٣٧٤] واتە: پێغەمبەر ﷺ خوای گەورەی بینی بەڵام ڕاستتر وایە کە بەدڵ بووە وەکو ئیبنو عەباس ﷺ دیسان دەفەرموێت: (رآه بِقَلْبِهِ)[٣٧٥] واتە: پێغەمبەر ﷺ لەو شەوەدا خوای خۆی بینی بە دڵ، وە ئەبو زەریش ﷺ دەفەرموێت: (رآى النـبي ﷺ رَبّه تَبارَكَ وَ تَعالى بِقَلبِهِ وَ لَمْ يَرَهُ بِبَصَرِهِ)[٣٧٦] واتە: پێغەمبەر ﷺ خوای خۆی بینی بەدڵی نەك بە چاوی.

---

(١١٢٨٣)، (الأجري الشريعة) (١٠٣٠) وقال محققه: أخرجه: الحاكم والبيهقي بإسناد صحيح) وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٣٠٦).

(٣٧٣) أخرجه: أحمد (٣٧٤/١) (٣٥٤٦) وقال الشيخ أحمد شاكر و شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن صحيح،وابو يعلى (٢٧٢٠)،والنسائي في (التفسير) (٣٠٣) وقال محققه: إسناده حسن صحيح،والطبري في (تهذيب الآثار) (١٧)، واللالكائي (١٤٣٠)،وقال الحافظ ابن كثير في (تفسير القرآن العظيم) (١٥٠/١): إسناده صحيح،وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٤٦): إسناده حسن.

(٣٧٤) أخرجه: الترمذي (السنن) (٣٢٧٨)، والطبراني في (الكبير) (١٠٧٢٨)، والحاكم (المستدرك) (٤٦٩/٢)، وابن حبان (٥٧)، وقال محققه: إسناده حسن،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦١٤).

(٣٧٥) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٤٣٥)، والترمذي (السنن) (٣٢٧٩)،وصححه الشيخ اللألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦١٥).

(٣٧٦) أخرجه: النسائي في (التفسير) (٥٥٦) وقال محققه: صحيح.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ خوای خۆی بینیوە لە خەودا لە جوانترین شێوەدا، موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ دەفەرموێت: (بەیانیەکیان پێغەمبەر ﷺ دواکەوت و نەهات پێش نوێژیمان بۆ بکات تا زۆر دوا کەوتین و وەخت بوو ڕۆژ هەڵبێت، پاشان بەپەلە هات، و قامەت کرا و پێش نوێژی بۆ کردین و بەپەلە نوێژەکەی بۆ تەواو کردین، کە سەلاممان دایەوە هەستا و فەرمووی: (على مَصافِّكم، كما أنتم) واتە: لە جێگای خۆتان بمێننەوە تا بۆتان بگێڕمەوە ئینجا فەرمووی: ((أما إني سأحدِّثُكم ما حبسني عنكم الغداةَ أني قمتُ من الليلِ فتوضأتُ فصلَّيتُ ما قُدِّرَ لي فنعستُ في صلاتي فاستثقلتُ فإذا أنا بربِّي تبارَك وتعالَى في أحسنِ صورةٍ[٣٧٧] وفي رواية (رأَيْتُ رَبِّي عَزَّوَجَل) فقال: يا محمدُ. قلتُ: ربِّ لبَّيكَ. قال: فيمَ يختصمُ الملأُ الأعلَى...))[٣٧٨] واتە: ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە چی وای لێکردم کە دوا بکەوم، ئەمشەو من شەونوێژم کرد ئەوەندەی لە توانامدا بوو تاوەنەوز بردمیەوە و خەوم لێکەوت و پەروەردگارم بینی (تَبَارَكَ وَ تَعَالى) لە جوانترین شێوەدا) وە (فەرموی: ئەی محمد، وتم: پەروەردگارم (لبَّيكَ)، فەرمووی: کۆمەڵی هەرە سەروو (الملأ الأعلى) لە چیدا دەمەقاڵیان دەبێت....).

## دووەم: کۆمەڵێکی بینی کە لێو و زمانیان لێ دەکرایەوە

ئەنەس ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رأيتُ ليلةَ أُسْرِي بي رجالًا تُقْرَضُ شِفاهُهُمْ بمقاريضَ من نارٍ ، فقلتُ : من هؤلاءِ يا جبريلُ ؟ فقال : الخُطباءُ من أُمَّتِك ، يأمرون الناسَ بالبِرِّ و ينسوْنَ أنفُسَهم ، و هم يتلونَ الكتابَ ، أفلا يعقلونَ)[٣٧٩] واتە: لەو شەوەی کە

---

(٣٧٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٦٨/١)، (٢٤٢/٥)، والترمذي (٣٢٣٥)، وقال حسن صحيح، سألت محمد بن إسماعيل فقال صحيح، الدارمي (٢٠٧٣)، والحاكم في (المستدرك) (٥٢١/١)، والطبراني في (معجم الكبير) (٩١/٢٠)، وإبن أبي عاصم في (السنة) (٤٦٩)، وأبو يعلى (٢٦٠٨)، وإبن خزيمة (٣١٩) عبد بن حميد (٦٨٢)، وقال ابن كثير في (التفسير) (٢٢/٦) رواه أحمد إسناده على شرط الصحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن التر مذي) (٢٥٨٢،٢٥٨١،٢٥٨٠)، (صحيح الجامع) (٣٤٦٦) (٥٩)، (صحيح الترغيب) (٤٠٥)، (الإرواء) (٦٨٤) وقال الشيخان عبد القادر وشعيب الأرناؤوط في تحقيقهما لـ(زاد المعاد) (٣٧/٣): حديث صحيح.

(٣٧٨) أخرجه: ابن أبي عاصم في (السنة) (٤٣٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٣٤٦٦).

(٣٧٩) أخرجه: أحمد (المسند) (١٠٨/٣) وقال محققه: حديث صحيح ابن أبي شيبة (٣٠٨/١٤)، وابو نعيم في (الحلية) (١٧٢/٨)، وابو يعلى (٣٩٩٢، ٤٠٦٩، ٤١٦٠)، والبزار (٣٣٢١،٣٣٢٢)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٤٩٦٦، ١٧٧٣، ٤٩٦٥)، وابن حبان (٥٣)، وقال محققه: حديث صحيح بمتابعاته، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٩١)، (صحيح الجامع) (١٢٩)، (صحيح الترغيب) (١٢١)، وصححه الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين (٨٤).

شەوڕەویم پێ کرا تێپەڕیم بەلای پیاوانێکدا بینیم لێویان بە مەقەستی ئاگرین پارچە گۆشتی لێ دەکرایەوە، وتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ فەرمووی: ئەمانە وتار بێژەکانی ئومەتی تۆن فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە چاکە، بەڵام خۆیان لە بیر دەکەن و ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە و ئەقڵیان پێ ناشکێت...

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (بینیم زمانیان پارچە پارچە گۆشتی لێ دەکرایەوە بە مقەستی ئاگرین یان ئاسنین)[٣٨٠]، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (أتيتُ ليلَةَ أُسْرِيَ بِي علَى رِجالٍ تُقْرَضُ شِفَاهُهُم بِمقاريضَ من نارٍ قلْتُ مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جبريلُ قال هؤلاءِ خطباءُ أمتِكَ)[٣٨١] واتە: لەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا گەیشتینە ئاسمانی دونیا بینیم پیاوانێك زمان و لێویان دەبڕرا بە چەند مقەستێکی ئاگرین، وتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ وتی: ئەوانە وتاربێژەکانی ئومەتی تۆن.

## سێهەم: هەروەها پێغەمبەر ﷺ سزای غەیبەت کارانی ئومەتەکەی بینی:

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لمَّا عُرِجَ بِي مررتُ بقومٍ لهم أظفارٌ من نحاسٍ، يَخمُشُونَ وجوهَهم و صدورَهم، فقلتُ : منْ هؤلاءِ يا جبريلُ؟ قال : هؤلاءِ الذين يأكلونَ لحومَ الناسِ، و يقعونَ في أعراضِهم)[٣٨٢] واتە: کاتێ بەرز کرامەوە تێپەڕیم بەلای کەسانێکدا کە نینۆکی مسیان هەبوو دەم و چاو و سنگی خۆیانیان پێ دەڕنیەوە (واتە: خەڵتانی خوێنیان دەکرد) وتم ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ وتی: ئەوانە کەسانێکن گۆشتی خەڵکی دەخۆن و نامووسیان لەکەدار دەکەن.

## چوارەم: پێغەمبەر ﷺ تێپەری بەلای بۆنێکی خۆشدا کە بۆنی قژ داهێنەرەکەی کچی فیرعەون بوو:

لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەو شەوەی

---

(٣٨٠) أخرجه: ابو يعلى(٤٠٦٩)، وقال محقق مجمع الزوائد (١٢١٨١): إسناده صحيح.

(٣٨١) أخرجه: ابو يعلى (٤١٦٠)، والبيهقي في (الشعب الإيمان) (٤٩٦٥)، وصححه الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند..) (٨٤).

(٣٨٢) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٢٤/٣)، وابى داود (السنن) (٤٨٧٨)،والبيهقي (الشعب الايمان) (٦٧١٦)، وقال الحافظ العراقي في (الإحياء) (١٣٩/٣): صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٥٣٢)، (صحيح ابي داود) (٤٠٨٢)، (فقه السيرة) (١٤٤)، وصحح إسناده الشيخ الأرناؤوط في (رياض الصالحين) (٥٧٤)، والشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٣١).

شەورەویم پێکرا تیایدا بۆنێکی خۆش بەرووومدا هات و وتم: ئەی جبریل ئەو بۆنە خۆشە چییە؟ وتی: ئەوە بۆنی قژ داهێنەرەکەی کچەکەی فیرعەونە و منداڵەکانیەتی، وتم: چۆن بوو حاڵیان؟ وتی: رۆژێکیان قژی کچەکەی فیرعەونی دادەهێنا شانەکەی لەدەستکەوتە خوارەوە وتی: (بِسمِ اللهِ) کچەکەی فیرعەون وتی: مەبەستت لە باوکمە؟ وتی: نەخێر پەروەردگاری من و باوکت (الله) یە، وتی: بۆی دەگێڕمەوە؟ وتی: بۆی بگێڕەرەوە، ئەویش بۆی گێڕایەوە و فیرعەون بانگی کرد و وتی: فلاَنە ئافرەت هیچ خوایەکی ترت هەیە جگە لە من؟ وتی: بەڵێ: پەروەردگاری من و تۆ (الله) یە، فیرعەون فەرمانیدا یەك مەنجەڵی گەورە پڕ بکەن لە مس و بیکوڵێنن کە ئامادە بوو منداڵەکانی ئافرەتەکەی بانگ کرد، بۆ ئەوەی دانە دانە بیانخاتە ناویەوە، ئافرەتەکە، وتی: من تەنها داواکاریەکم هەیە لە تۆ؟ فیرعەون وتی: چییە؟ وتی: ئەوەیە کە دوای مردنمان ئیسك و پروسکی خۆم و منداڵەکانم بکەیتە یەك بەرگ و بمانخەیتە ژێر خۆڵ بەیەکەوە؟ وتی: باشە داواکاریەکەت لەسەر من، پاشان دانە دانە منداڵەکانی لە پێش چاوی خۆی فڕێ دەدایە ئەو مەنجەڵە گەورەیەی کە مسی تیا بوو، تا سەرە گەیشتە خۆی و منداڵێکی شیرە خۆرەی ئینجا دوو دڵی رووی تێکرد، کە خۆی فڕێدات یان نا لەبەر منداڵەکەی تا خوای گەورە منداڵەکەی هێنایە زمان و بەدایکی وت: خۆڕاگر بە تۆ لەسەرحەقیت خۆت بخەرە ناوی سزای دونیا سوکترە لە سزای قیامەت ئینجا خۆی و منداڵەکەی فڕێدایە ناوی....)[٣٨٣].

## پێنجەم: پێغەمبەر ﷺ بەلای گۆڕەکەی پێغەمبەر موسادا ﵇ تێپەڕی کە نوێژی دەکرد:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مَرَرْتُ بِموسى ليلةَ أُسري بِي وهو قائمٌ يُصَلِّي في قبرِهِ عندَ الكَثيبِ الأحمرِ....)[٣٨٤] واتە: لەو شەوەی کە شەورەویم پێکرا رۆیشتم بەلای موسادا ﵇ لە نزیك تەپۆڵکە سوورەکە موسا ﵇ بە پێوە لە گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد.

(٣٨٣) أخرجه: أحمد (المسند) (١٣٠/١) (٢٨٢١،٢٨٢٤) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، والطبراني في (الكبير) (١٢٢٨٠)،والبزار (٥٤)كشف، وابو يعلى (٢٥١٧)،والحاكم (المستدرك) (٤٩٦/٢)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٩٠٤)، وقال محققه: إسناده قوي،وقال الحافظ ابن كثير في (التفسير) (٤٨٠/٣): إسناده لابأس به،وقال الذهبي في (سير إعلام النبلاء) (١٨٤/١): حديث حسن،وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع الصغير) (٤٧٧٢)، (السلسلة الضعيفة) (٨٨٠)، فاوردته للأعتبار و العلم فقط.

(٣٨٤) أخرجه: مسلم (٦١٠٨،٦١٠٧)،والنسائي (السنن) (٢٤/٣)، وأحمد (المسند) (١٤٨/٣)، وابن حبان (٥٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم وابن أبي شيبة (٣٠٧/١٤)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (٢١٥/٣)، (السلسلة الصحيحة) (٢٦٢٧).

**شەشەم: فریشتەکان پێغەمبەریان ﷺ ئاگادارکردەوە کە (کەڵە شاخ) بەکاربهێنێت:**

**لە ئیبنو مەسعود ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ما مررتُ ليلةَ أُسري بي بملإٍ من الملائكةِ إلا كلُّهم يقولُ لي عليك يا محمدُ بالحجامةِ...)[٣٨٥] واتە: لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا بەلای هەر پۆلێ لە پۆلەکانی فریشتەدا دەڕۆیشتم پێیان دەوتم: ئەی محمد کەڵە شاخ بگرە، وە لەڕیوایەتیکیی تردا (ما مَرَرْتُ ليلةَ أُسْرِيَ بي بمَلأٍ إلَّا قالوا: يا مُحمَّدُ، مُرْ أُمَّتَكَ بالحِجَامةِ)[٣٨٦]. واتە: لەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا، بەلای هەر کۆمەڵێ لە کۆمەڵەکانی فریشتە دادەڕۆیشتم پێیان دەوتم: ئەی محمد فەرمان بکە بە ئومەتەکەت کەڵە شاخ بگرن و بەکاری بهێنن.**

**حەوتەم: پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەکی گەورەی بەرچاوکەوت کە بەرز کرایەوە و لە شام داکوترا:**

**لە عەبدوڵلا کوڕی حەوالەوە ﷺ دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رأيتُ ليلةَ أُسرِي بي عمودًا أبيضَ كأنَّه لؤلؤةٌ تحمِلُه الملائكةُ . قلتُ ما تحمِلون ؟ فقالوا : عمودَ الكتابِ أُمِرنا أن نضعَه بالشَّامِ...)[٣٨٧]. واتە: لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا کۆڵەکەیەکی سپیم بینی وەك مرواری فریشتە هەڵیان گرتبوو وتم: ئەوە چییە؟ وتیان: ئەوە عەموودی کتێبە فەرمانمان پێ کراوە لە شام دایبنێین و جێگیری بکەین.**

**لە ڕیوایەتێکی تردا: (بينا أنا نائمٌ رأيتُ عمودَ الكتابِ احتُمِلَ من تحتِ رأسي ؛ فظنَنتُ أنَّه مَذهوبٌ بهِ ، فأتْبعتُه بصرِي ، فعُمِدَ بهِ إلى الشَّامِ ، ألا وإنَّ الإيمانَ حينَ تقعُ الفتنُ بالشَّامِ)[٣٨٨].**

---

(٣٨٥) أخرجه: أحمد (٣٥٤/١)، وابن أبي شيبة (٤٤٢/٧)، والترمذي (٢٠٥٣)، وابن ماجه (٣٤٤٧)، والطيالسي (٢٦٦٦)، والحاكم (المستدرك) (٢٠٩/٤)، وصححه، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٦٣) و (صحيح ابن ماجه) (٢٨٠١) و (المشكاة) (٤٥٤٤).

(٣٨٦) أخرجه: ابن ماجه (السنن) (٣٤٧٩)،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجه) (٢٨٠٢)، و(صحيح الجامع) (٥٦٧١).

(٣٨٧) أخرجه: الطبراني في (الكبير)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٦٦٤٤):رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير (صالح بن رستم) و هو ثقة، وقال الحافظ في (فتح الباريء) (٤٩٨/١٢): إسناده صحيح.

(٣٨٨) أخرجه: أحمد (المسند) (١٩٨/٥) (٢١٧٣٣) وقال محققه: إسناده صحيح، والطبراني (الشامين) (١١٩٨)، وابن عساكر (٤٩/١)، والبزار (٣٣٣٢) والبيهقي (الدلائل) (٤٤٤٧/٦)، وأبو نعيم (الحلية) (٩٨/٦)، قال الهيثمي في (المجمع)

واتە: لەو شەوەدا کۆڵەکەی کتێبم بینی وەك ئالآیەك هەڵگیرا لە ژێر سەری منەوە، وامزانی لەسەر زەوی ناهێڵرێت و دەبرێتە سەرەوە، چاوم بە دوایدا دەڕوانی هەتا بینیم بردیان بەرەو شام، ئاگاداربن کاتێ کە فیتنە هەستێ تەنها باوەڕ و ئیمان لە شام دەبێت.

ئیبنو کثیر ﷺ دەفەرموێت: (هەر ئەو بەیانییە کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لە شەوڕەوییەکەیدا جبریل دابەزی بۆلای لە کاتی نزیك نیوەڕۆدا وکاتەکانی نوێژی بۆ ڕوون کردەوە کە لەکەیدا دەکرێت، وچۆن ئەنجام دەدرێت پاشان فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی خۆی کۆبکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ کۆی کردنەوە و جبریل عليه السلام پێش نوێژی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد و ئەویش پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد)[٣٨٩]، لە ڕیوایەتێکی تردا: (أمَّني جبريلُ مرَّتَيْن [بمكة] عند البيت)[٣٩٠]. واتە: جبریل عليه السلام دووجار پێش نوێژی بۆ کردم لە مەککە لای کەعبە.

هەر لەو کاتەوە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ فێری نوێژ و دەست نوێژ و کاتەکانی نوێژ کردووە بۆیە دەفەرموێت: (صلُّوا كما رأيتموني أصلِّي)[٣٩١] واتە: نوێژ بکەن وەك چۆن دەبینن من نوێژ دەکەم.

## خۆ ناساندن بە هۆزەکانی عەرەب و داوای پەنادان

دوای دژایەتی توندی چەندین ساڵە دژ بە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیەوە، دوای ئەو هەموو ناڕەحەتییەی هاتە ڕێی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی زۆربەیان ناچار کران کە وڵاتیان بەجێ بهێڵن بۆ دەرەوە و بەرەو حەبەشە بکەونە ڕێ، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ کۆڵنەدەرانە و بێ ترس و ورە بەرزانە ئاینی خوای بەرقەرار دەکرد ، و بە ئاشکرا دەیگەیاند بەتایبەتی لەو کاتەدا کە نوێنەری هۆزەکانی عەرەب هاتبوون بۆ حەج کردن بۆ کەعبە.

---

(١٦٦٤٠): رواه لحمد والطبراني و رجال أحمد رجال الصحيح، وقال الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند) (١٠٥٦): حديث صحيح.

(٣٨٩) أنـــظر: (البداية) (١١٧/٣).

(٣٩٠) أخرجه:الدار قطني (السنن) (٢٥٨/١)، برقم (١٠٠٣،١٠٠١) وقال محققه: إسناده حسن، أخرجه: أحمد (٣٣٣/١)، و ابوداود (٣٩٣)، والترمذي (١٤٩)، والحاكم (١٩٦/١،١٩٣)، البيهقي (الكبرى) (٣٦٨/١).

(٣٩١) أخرجه: البخاري (٦٣١).

جابر ﷺ دەفەرموێت: (كانَ رسولُ ﷺ يعرِضُ نفسَه على النَّاسِ في الموسِمِ فيقولُ ألا رجُلٌ يحمِلُني إلى قومِهِ فإنَّ قُريشًا قد منعوني أن أبلِّغَ كلامَ ربِّي)[٣٩٢]. واتە: پێغەمبەر ﷺ خۆی نیشانی هۆزەكانی عەرەب دەدا لە كاتی حەج كردن و پێی دەوتن: ئایا كەسێك هەیە من ببات بۆ لای خزمان و كەسانی خۆی، چونكە قوڕەیش ڕێگرم لێ دەكەن لە گەیاندنی وتەكانی خوا بە خەڵكی.

سەبارەت بە چۆنیەتی گەیاندنی بانگەوازی خوا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ سەرجەم هۆزەكانی ئامادە بووی عەرەب لە مەككە وە چۆنیەتی هەڵوێستیان وە هەڵوێستی قوڕەیش بە تایبەت مامی خۆی ئەبولەهەب ئەم ڕیوایەتەی خوارەوە ئەمەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە:

طاریقی كوڕی عەبدوڵڵای محاریبی ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن پێغەمبەر ﷺ گەڕاوە بەسەر هۆزەكاندا و چۆن بانگەوازی كردووە و چی بە گوێی ئەواندا داوە دەفەرموێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینی لە بازاڕی (ذی المجاز) جلێكی خەت خەتی سووری لەبەردا بوو بە ناو ڕیزی خەڵكیدا دەهات و دەچوو وە دەیفەرموو: ئەی خەڵكینە بڵێن (لا إلهَ إلاّ الله) سەرفراز دەبن، ئەی خەڵكینە خوای گەورە فەرمانتان پی دەكات، كە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، دەفەرموێت: بە ناو ئەو بازاڕەدا دەگەڕا و خەڵكیش لێی كۆدەبوونەوە و كەسم نەبینی وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بداتەوە، پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ نەدەبوو هەر دەی فەرموو: بڵێن (لا إلهَ إلاّ الله) سەرفراز دەبن، بەڵام پیاوێكی پێست سپی خێلی دووپەلكەدار بە دوای كەوتبوو بەهەر شوێنێكدا دەڕۆیشت، بەردی تێدەگرت و هەر دوو پاژنەی قاچی بریندار وخوێناوی كردبوو، لەدواوە هاواری لێ دەكرد و دەیوت: ئەی خەڵكینە بەگوێی نەكەن ئەوە درۆزنە، ئەوە گومڕا بووە و لە ئاینی خۆتان و باو باپیرانتان گومڕاتان دەكات، پێغەمبەریش ﷺ خۆی لێ دوور دەخستەوە، ئێمەش بە دوایدا دەڕۆیشتین و ڕامان

---

(٣٩٢) أخرجه: البخاري في (خلق أفعال العباد) (٤١)، وابو داود (٤٧٣٤)، والترمذي (٢٩٢٥)، وابن ماجه (٢٠١)، والحاكم (٦١١/٢)، وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الشعب) (١٦٨)، وصححه الذهبي على شرط البخاري، أنظر (سير إعلام النبلاء) (١٩٢/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٩٦٠)، (صحيح الترمذي) (٢٣٣٥)، (صحيح ابن ماجه) (١٦٦)، (السلسلة الصحيحة) (١٩٤٧)، وصححه الشيخ مقبل على شرط البخاري في (الصحيح المسند) (٢٢٤).

دەکرد، وتم: ئەمە کێیە شوێنی کەوتووە و وازی لێ ناهێنێت و بەردی تێ دەگرێت؟ وتیان: ئەوە مامەکەیەتی (عبدالعزی واتە: ئەبو لەهەب)[٣٩٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا: پیاوێکی (بەنی کینانە) دەفەرموێت: (پێغەمبەرم ﷺ بینی لە ناو خەڵکیدا دەهات و دەچوو لە بازاڕی (ذي مجاز) دەیفەرموو: ((يا أيُّها الناسُ، قُولوا: لا إلهَ إلا اللهُ، تُفلِحوا.)) ئەبو جەهلیش شوێنی کەوتبوو وە خۆڵی دەپرژاند و دەیوت: (ئەی خەڵکینە ئەمە هەڵتان نەخەڵەتێنێت دەست بگرن بە ئاینی خۆتانەوە، ئەمە دەیەوێت دوورتان خاتەوە لە خواکانتان و لە (لات و عوزا)، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی لێ نەدەدایەوە[٣٩٤].

وە لەو هۆزانەی تر کە پێغەمبەر ﷺ خۆی پێناساندوون و داوای سەرخستنی لێ کردوون بۆ ئاینی خوا، هۆزی کیندە بوو، ئەبو شیهابی زوهری ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چووە لای نوێنەرانی هۆزی کیندە لە جێگەی دانیشتنی خۆیاندا و لایدایە لای گەورەکەیان کە ناوی (ملیح) بوو، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد بۆلای خوای گەورە، خۆی پێناساندن و داوای لێ کردن کە بیگرنە خۆ، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و نەیان گرتەخۆ...)[٣٩٥].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ داوای پەنادانی لە (کوڕانی بەنی شەیبان) کرد: لە علی کوڕی ئەبو طالیبەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کە ئاینی خوا بگەیەنێت بە هۆزەکانی عەرەب ئێمە چووین و ئەبو بەکریشمان لەگەڵ دابوو، تا گەیشتینە لای مینا کە جێگەیەکە لە ڕێی عەرەفات، چووینە لای کۆمەڵێ دانیشتووی ئەوێ و چووینە پێشەوە لێیان، ئەبوبەکر سەلامی لێ کردن

(٣٩٣) أخرجه: أحمد (٤٩٢/٣) (١٦٠٢٠) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح، (١٦٠٢٣)، وقال محققه: إسناده حسن، وأحمد (٣٤١/٤)، وصحح إسناده الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٣/ ٣٩)، والطبراني في (الكبير) (٤٥٨٢،٤٥٩٠)، والنسائي (٥٥/٨)، وابن أبي شيبة (١٠٠/١٤)، وصحح إسناده البوصيري في (مختصر الإتحاف) (٤٧٨٨)، وابن خزيمة (٨٢/١)، والحاكم (١٥/١) (٦١١،٦١٢/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٣٨٠/٥)، وابن حبان (٦٥٦٢)، وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (دفاع عن الحديث و السيرة) (٢٢)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٥١٦) اللفظ لابن حسان وأحمد.

(٣٩٤) أخرجه: أحمد (١٦٦٠٣) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢١/٦): رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح.

(٣٩٥) انــظر: سيرة ابن هشام (٣٤/٢) وقال محققاه: مرسل صحيح، والطبري في (التأريخ) (٣٤٩/٢).

چونکە ئەو شارەزاتر بوو بەسەرجەم هۆزەکانی عەرەب، دوای ئەو کۆمەڵە چووینە لای کۆمەڵێکی تر ڕێز و هێمنی و ئارامییان پێوە دیار بوو، هەندێ لە پیاوە بەرزەکانیان دانیشتبوون ڕێزو سەروەریان پێوە دیاربوو، ئەبوبەکریش پێشکەوت و سڵاوی کرد و دوای ئەوە پێی وتن: ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە کوڕانی بەنی شەیبانی کوڕی سەعلەبەین، ئەبو بەکر ئاوڕی دایەوە بەلای پێغەمبەردا ﷺ و وتی: دایك و باوکم فیدات بێ لەمانە بەهێزتر و سەربەرزتر نین لە کەسانی خۆیان، لەو ڕۆژەدا ئەم سەرکردانەیان ئامادە بوون: مەفروقی کوڕی عومەر و هانیئی کوڕی قوبەیضە و موثەنای کوڕی حاریثە و نوعمانی کوڕی شورەیك، وە نزیکترین کەسیان لای ئەبوبەکرەوە لە کۆبونەوەکەدا مەفروق بوو کە بە پێغەمبەری ﷺ وت: لەوە دەچێ تۆ برا قوڕەیشیەکە بیت؟ ئەبوبەکریش وتی: ئەگەر پێتان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوایە بەڵێ ئەوە، مەفروق وتی: پێمان نەگەیشتووە کە ئەو وا دەڵێت، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: بانگەواز بۆلای چی دەکەیت ئەی برای قوڕەیشی؟ پێغەمبەریش ﷺ چوو لەلایان دانیشت و ئەبوبەکر هەستا و چوو لە پشتەوە سێبەری بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: بانگتان دەکەم بۆ ئەوەی شایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نییە شایانی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، وە داواتان لێدەکەم کە بمگرنەخۆ و پارێزگاریم لێ بکەن و سەرم بخەن تا ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم بیگەیەنم ، چونکە قوڕەیش دژ بە فەرمانی خوا وەستاون و پێغەمبەرەکەیان ﷺ بە درۆ خستۆتەوە و وازیان لە حەق هێناوە، خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندە و سوپاس گوزارە.

پاشان مەفروق وتی: باشە دوای ئەوە چی تر داوا دەکەیت و بانگەواز بۆ چیتر دەکەیت ئەی برا قوڕەیشیەکە؟ پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾﴾(الأنعام). واتە: (بەو کافرو بێ باوەڕانە بڵێ: وەرن بائەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان: یەکەم: نابێ هیچ شتێك

بکەنە شەریك و هاوبەشی خوا، دووەم: لەگەڵ باوك و دایکدا هەمیشە ئاکار چاکبن. سێیەم: لە ترسی برسێتیی و هەژاریی، منداڵەکانتان مەکوژن، چونکە هەر ئێمەین رزق و رۆزی بە ئێوەو، بەوانیش دەدەین. چوارەم: بە ئاشکراو بە نهێنی توخنی تاوان وکارە دزێوەکان - ئاشکراو نهێنییان - مەکەون، پێنجەم: کەسێکیش مەکوژن، خوا کوشتنی بەهەق نەبێ یاساغ نەکردووە، خوای گەورە بۆ خۆی ئەمانەی بە ئێوە راسپاردووە بە شکوم بیر بکەنەوەو وریا و ژیربن، چاك و خراپ، هەق و ناهەق لەیەك بکەنەوە.).

دوای ئەو مەفروق وتی: بۆچی تر بانگمان دەکەیت؟ وەڵاهی ئەم قسانەی تۆ لە قسەی کەسانی سەرزەوی ناچێت، ئەگەر قسەی کەسانی سەر زەوی بووایە دەماننا‌سییەوە؟ پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآىِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾(النحل) واتە: (بێگومان خوا فەرمان بەدادگەریی و چاکەکردن لەگەڵ تەواوی دروستکراوەکانیدا دەدا، و فەرمان بە صیلەی رەحم و بەخشش و پیاوەتیی و چاکە لەگەڵ خزم و نزیکانیشدا دەدا، وە لە هەموو کارێکی دزێوو خراپەو ستەم و لەسنوور دەرچوون رێ دەگرێ، خوا بەو شێوەیە ئامۆژگاریتان دەکات، تا بەشکو بیر بکەنەوەو پەند بگرن). کە مەفروق گوێی لەمە بوو وتی: وەڵاهی برا قورەیشییەکە بانگەشەت کردووە بۆلای هەرە خورەوشتی جوان و کاری هەرە چاك، بەراستی بوختان چین ئەو کەسانەی کە تۆیان بەدرۆ خستۆتەوە و دژت وەستاون بەڵام ئەوەش: هانیئی کوری قوبەیضە یە گەورەمانە و خاوەنی ئاینی ئێمەیە، هانیئ بە پێغەمبەری ﷺ وت: گوێم لە قسەکانت بوو ئەی برا قورەیشییەکە، قسەکانت بەراست دەزانم، من وا دەزانم وازهێنانمان لە ئاینمان و شوێن کەوتنمان بۆ تۆ لە سەر یەك دانیشتن کەسەرەتا و کۆتایی نییە بێ ئەوەی ئێمە بیری لێ بکەینەوە بێگومان ئەمە هەڵەیە و بیروبۆچوونێکی جیاوازە و ئەقڵێکی لاوازە و هەڵەش تەنها لەگەڵ پەلەدا دەبێت، بەڵام ئێمە کەسان و خزمانێکمان هەن لە پشتمانن ناتوانین هیچ وتەیەك بکەین بێ ئەوان، تۆ بگەرێرەوە و ئێمەش دەگەرێینەوە بۆلای خزمانمان و تۆ بیربکەرەوە و ئێمەش بیری لێ دەکەینەوە و دوایی (واتە: بۆ ئەوەی باسەکە لە خۆی دوور بخاتەوە) وتی: ئەمەش (موثەنا) یە گەورەمانە و خاوەنی جەنگمانە.

موثەننا وتی: گوێم لە قسەکانت بوو ئەی برا قورەیشی یەکە، قسەکانت بەڕاست دەزانم، وە سەرم سوڕ دەمێنێ لەو قسە چاکانەی تۆ، وەڵامی منیش وەڵامی هانئی کوڕی قوبەیضە یە، ئێمەش لامان داوەتە دوو قەراخ، قەراخی یەمامە و قەراخی سەماوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دوو قەراخە چین؟ وتی: قەراخێکیان لایەکی وشکانییە و لایەکەی تریان ڕووبارە و خاکەکانی کیسرایە کە گفتی لێ وەرگرتووین هیچ ئاژاوەیەك دروست نەکەین و هیچ ئاژاوەچییەك نەگرینە خۆمان و ئەم کارەی تۆش پێ دەچێت کە پاشایان ڕقیان لێی بێت و دژی بوەستن، ئەگەر ڕوو بەعەرەب و وشکانی دەڵێیت ئێمە لە خزمەتداین و سەرت دەخەین هەر کەسێك هەر تاوانێك بکات لەوێ تاوانەکەی لێ دەبوورین و عوزرەکەشی وەردەگیرێت بەڵام هەر کەسێك تاوانێك لەڕووی کیسرادا بکات (واتە: خاکەکانی کیسرا) ئەوا لە تاوانەکەی نابورێت و عوزرەکەشی وەرناگرێت، ئەگەر پێت خۆشە سەرت بخەین لە ڕووی نزیك عەرەبەوە ئەوا سەرت دەخەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خراپتان، وەڵام نەداوەتەوە کاتێ ڕاست گۆیانە قسەتان کرد، بەڵام یەکێ هەڵدەستێ بە ئاینی خوا و بەرقەرار کردنی کە لە هەموو لایەکەوە گرتبێتی وکردەوەی پێ بکات، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستا و بەجێی هێشتن)[٣٩٦].

پێغەمبەر ﷺ خۆی ناساند بە بەنی حەنیفە بەڵام خزمانی موسەیلەمە بە ناشیرین ترین شێوە بەرپەرچی پێغەمبەر ﷺ یان دایەوە، وە خۆی ناساند بەکوڕانی بەنی عامر ئەوانیش بەهەمان شێوەیان کرد.

لە جابیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ خۆی ناساند بەخەڵکی لە شوێنی وەستانیان لە حەج و پێی دەفەرموون: ئایا پیاوێك نیە بمگرێتەخۆ و بمبات بۆلای خزمانی خۆی، چونکە قورەیش قەدەغەیان کردووە لەمن کە وشەکانی خوای خۆم بگەیەنم، پیاوێك لە هۆزی هەمدان هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا قەومەکەت ئەو هێزەیان هەیە کە بتوانن بمگرنە خۆ؟ وتی: بەڵێ، دوایی

(٣٩٦) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٦٢/٦) مختصرا، والبيهقي في (الدلائل) (٤٢٢/٢)،وابو نعيم في (الدلائل) (٢١٤)،وقال الهيثمي في (المجمع) (٢١١/٦): رجاله رجال الصحيح غير (خلاد) وهو ثقة، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٢٠/٧): أخرجه: الحاكم والبيهقي في الدلائل و ابو نعيم بإسناد حسن.

پیاوەکە پەشیمان بووەوە و ترسا لەوەی بیگرێتە خۆ، بەڵام هۆزەکەی نەیگرنەخۆ بۆیە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەچمەوە بۆلایان و قسەی تۆیان بۆ دەگێڕمەوە و پاشان وەڵامەکەت بۆ دەهێنمەوە، ئینجا ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە بڕۆ). لە مانگی ڕەجەبی هەر ئەوساڵەدا وەفدی پایەبەرزانی ئەنصار بۆ یەکەم جار گەیشتنە ناو شاری مەککە[٣٩٧].

ئەم وەفدەش کۆمەڵێك بوون لە کوڕانی ئەوس کە ژمارەیان کەم بووە دژایەتییەکی سەخت هەبوو لە نێوان ئەوان و خەزرەجی ژمارە زۆر و خزمانی بەنو قەینوقاع وبەنونەضیر و بەنو قوڕەیضە، بەڵام هۆزی ئەوس هاوپەیمانیان نەبوو ئەوانیش بە ناچارانە ڕوویان کردە مەککە بۆ ئەوەی داوای پەیمان بەستن بکەن لەگەڵ قوڕەیش کە یاریدەدەری ئەوس بێت دژ بە خەزرەج، بەڵام خوای گەورە لەو هاوپەیمانیتییە چاکتری بە نسیب کردن ئەویش موسوڵمان بوونیان و ڕێنمویی بوونیان بوو وە ناسینی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بوو.

ئەم بەسەرهاتەش محمدی کوڕی لوبەید ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: کاتێ ئەبو حەسیر ئەنەسی کوڕی ڕافع گەیشتە مەککە لەگەڵ هەندێ لە کوڕانی بەنی عەبدولئەشهەل کە ئەیاسی کوڕی مەعاذیان تیا بوو بۆ ئەوەی پەیمان ببەستن لەگەڵ قوڕەیشدا دژ بە هۆزی خەزرەجی خۆیان، پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشت کە ئەو کۆمەڵە لە مەدینەوە گەیشتوونەتە مەککە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ خێرا خۆی گەیاندە ئەو کۆمەڵە ولەگەڵیاندا دانیشت و پێی فەرموون: ئایا شتێکی چاکترتان دەوێت لەوەی کە بۆی هاتوون؟ وتیان: بەڵێ چییە؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: (أنا رسولُ اللهِ، بَعَثَني إلى العِبادِ أدْعوهُم إلى أنْ يَعبُدوا اللهَ لا يُشرِكوا به شَيئًا، وأُنزِلَ عليَّ كِتابٌ) واتە: من پێغەمبەری خوام و خوای گەورە ناردوومی بۆلای سەرجەم بەندەکانی خۆی کە تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن و کتێبی بۆ هێناومەتە خوارەوە.

---

(٣٩٧) أخرجه: أحمد (٣٩٠/٣) (١٥١٩٢) وقال محققه: إسناده الصحيح على شرط البخاري، وابن أبي شيبة (٣١٠/١٤)، والدرامي (٣٣٥٤)، وأبو داود (٤٧٣٤)، والترمذي (٢٩٢٥)، وابن ماجه (٢٠١)، والنسائي (الكبرى) (٧٧٢٧)، والحاكم (٦١٢/٢)، والبيهقي (الشعب) (١٦٨)، وصححه الشيخ الألباني (الصحيحة) (١٩٤٧)،و(صحيح ابن ماجه) (١٦٦)،وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٥/٦): رواه أحمد ورجاله رجال ثقات،وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٢٦٤) حديث صحيح، وصحح إسناده العمري في (السيرة الصحيحة) (١٩٤/١).

پاشان دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی بۆ ڕوون کردنەوە و قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، ئەیاسی کوڕی مەعاذ کە لە هەموویان منداڵ تر بوو وتی: ئەی خزمان وەڵاهی ئەمە چاکترە لەوەی بۆی هاتووین، ئەبو حەسیریش چنگێك لە خۆڵی هەڵ گرتوو پرژاندی بە ڕوویدا و وتی: وازمان لێ بهێنە ئەی ئەیاس ئێمە بۆ ئەمە نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بۆ کارێکی تر، پاشان ئەیاس بێدەنگ بوو، پێغەمبەر ﷺ هەستا و بەجێی هێشتن و ئەوان گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و تووشی شەڕی قورسی (بعاث) هاتن، محمودی کوڕی لبید وتی: ئەو خزمانەی موعاذ کە لە کاتی سەرەمەرگدا گوێیان لێ بوو کە موعاذ ﷺ هەر (سبحانَ اللهِ و الحمدُ للهِ ، و لا إلهَ إلَّا اللهُ )ی دەوت تا وەفاتی کرد و خزمانیان گومانیان نەبوو لەوەی کە بە موسوڵمانی مردووە و وتیان: ئێمە هەر لە گوێ گرتنەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ موسوڵمان بوونمان پێوە بینیوە)[٣٩٨]. ئا بەو شێوەیە جەنگی بوعاثی نێوان ئەوس و خەزرەج چاکترین خێر و بەرەکەت بوو بەسەر ئەنصارەوە.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (شەڕی بوعاث ڕۆژێك بوو خوای گەورە پێشکەشی پێغەمبەری ﷺ کردبووی کاتێك شیرازەی هەموویان تێکچوو بوو، سەر گەورە و پیاوە گەورەکانیان هەندێکیان کوژرا و ئەوانی تریان بریندار بووبوون و شاری مەدینەش خوای گەورە بەخشی بوو بە پێغەمبەر ﷺ ، چونکە بێ سەرۆك بوو بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو شارە پێغەمبەر ﷺ بگرنەخۆ و دواجار ببێتە هۆی موسوڵمان بوونی هەموویان)[٣٩٩].

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك دەنگ وباس هەبوو سەبارەت بە هاتنی پێغەمبەرێك وە ئەو هەواڵەش لە شاری مەدینە بڵاوبووەوە: جابری کوڕی عەبدوللا ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم هەواڵێکی هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا بڵاوبۆوە، ئەوە بوو ئافرەتێك لە شاری مەدینە جنۆکەیەکی هەبوو کە هەواڵی پێ ڕادەگەیاند، جارێکیان

(٣٩٨) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٢٧/٥) (٢٣٦١٩) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني في (الكبير) (١٨٠٥)، والحاكم (المستدرك) (٣ /١٨٠) وصححه على شرط مسلم، والطبري (التأريخ) (٣٥٢/٢)، والبخاري في (التاريخ الكبير) (٤٤٢/١)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٢٠/٢)، وسيرة ابن هشام (٣٧/٢)، قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٦/٣): رواه أحمد والطبراني ورجاله رجال ثقات،وقال الحافظ في (الإصابة) (٩١/١): صحيح، وقال الأرناؤوط في تحقيق (زاد المعاد) (٤٠/٣): سنده حسن رجاله ثقات.

(٣٩٩) أخرجه: البخاري (٣٧٧٧)،وأحمد (٦١/٦).

بە شێوەی کۆترێکی سپی هات و نیشتەوە لە سەر دیواریماڵیان، ئافرەتەکە پێی وت: ئەوە دانابەزیت بۆلامان تا قسەت لەگەڵدا بکەین و قسەمان لەگەڵدا بکەیت و هەواڵمان بدەیتێ و هەواڵت بدەینێ، ئەویش بە ئافرەتەکەی وت: پێغەمبەرێك نێردراوە لە شاری مەککە داوێن پیسی حەرام کردووە و ئارامی لەبەر بڕیوین)[٤٠٠].

## گفتی عەقەبەی یەکەم

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە ویستی خێری هەبوو کە ئاینەکەی شکۆدار بکات و پێغەمبەرەکەی ﷺ سەربەرز بکات وە پەیمانی خۆی بهێنێتەدی، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە کاتی حەجدا ڕۆیشتە لای هەندێ لە کوڕانی ئەنصار لەگەڵ هۆزەکانی عەرەبی تردا و خۆی پێ ناساندن، ئەوەبوو خوای گەورە کارەکەی گەیاندە ئەوەی کە بگات بە هەندێ لە (کوڕانی ئەنصار لای دۆڵی عەقەبە) و عاصمی کوڕی عەمر لە هەندێ لە پیاوە بەرزەکانی قەومی خۆی بۆی گێڕامەوەکە پێغەمبەر ﷺ گەیشت بەوان و پێی فەرموون: ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە کەسانێکین لە خەزرەج (واتە: خەڵکی مەدینە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێوە هاوپەیمانی جولەکەکانن؟ وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دادەنیشن تا قسەتان لەگەڵدا بکەم؟ وتیان: فەرموو.

ئینجا دانیشتن و هەموویانی بانگ کرد بۆلای پەرستنی خوای گەورە و ئیسلامی پێ ڕاگەیاندن و قورئانی بۆ خوێندنەوە دەفەرموێت: یەکێ لە چاکەکانی ئەم باسە ئەوەبوو خوای گەورە وای کردبوو کە کوڕانی ئەوس و خەزرەج نزیکی جولەکە بوون، وە جولەکەش خاوەنی کتێب و زانست بوون و ئەوانیش لەسەر بتپەرستی خۆیان بوون بتیان دەپەرست و زاڵ بووبوون بەسەریاندا و هەر کاتێك شەڕێك لە نێوانیاندا بەرپا ببووایە جولەکەکان هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکردن و دەیان وت: پێغەمبەرێك دەنێردرێت و هاتنەکەی نزیك بووەتەوە و شوێنی دەکەوین و بەو کوشتنەی کە قەومی ئیرەم و عادی پێ کوژرا دەتان کوژین، دەفەرموێت: کە ئەو کۆمەڵە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کرد، پێغەمبەریش ﷺ بانگەوازی کردن بۆلای خوای گەورە ئەوە بوو هەندێکیان بە هەندێکیان وت: دەزانن خەڵکینە ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە

(٤٠٠) أخرجه: ابو نعيم في (الدلائل) (٢٩)،وحسن إسناده الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (٨٣).

کە جولەکەکان هەڕەشەیان بەو لێدەکردین هەتا ئەوان پێی نەگەیشتوون بائێمە موسوڵمان ببین، دەفەرموێت: ئەوان گوێ بیستی پێغەمبەر ﷺ بوون لەوێدا و بەڕاستیان خستەوە و ئاینی ئیسلامیان وەرگرت و وتیان: ئێمە خزمانێکی زۆرمان بەجێ هێشتووە و شەڕ و ئاشوب لە نێوانیاندا هەیە، بەڵکو خوای گەورە بە هۆی تۆوە یەکیان بخات، ئێمە دەگەڕێینەوە بۆلایان و ئەوەی بە ئێمەت گەیاند ئێمە پێیان دەگەیەنین و بانگەوازیان دەکەین و تێیان دەگەیەنین کە ئێمە چۆن باوەڕمان پێ هێناویت گەر خوای گەورە ئەوان کۆکاتەوە لەژێر سەرپەرشتی تۆدا ئەوا هیچ پیاوێك بەهێز تر و سەربەرز تر نابێت لە تۆ.

پاشان پێغەمبەریان ﷺ بەجێ هێشت و گەڕانەوە بۆ مەدینە و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو پێغەمبەریان ﷺ بەڕاست خستبووە، شەش کەس بوون لە خەزرەج: لە کوڕانی بەنی نەجاڕ: ئەبو ئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراڕە لەگەڵ عەوف و موعاذ و کوڕەکەی حاریسی کوڕی رەفاعە، وە لە کوڕانی بەنی زورەیق: ڕافعی کوڕی مالیکی کوڕی عەجلان بوو، وە لە کوڕانی بەنی سەلەمەی کوڕی سەعددا: قوتبەی کوڕی عامر، لە کوڕانی بەنی حەرامی کەعبدا: عوقبەی کوڕی عامری کوڕی نابی، وە لەکوڕانی بەنی عوبەیدەی کوڕی عەدی: جابری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی رەیئابی کوڕی نوعمان، دەفەرموێت: کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە و بانگەشەی خزمانی خۆمان کرد بۆ ئەو ئاینی ئیسلامەی پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی بۆ کردین، ئەوە بوو ئاینی ئیسلام بڵاوبووەوە لە ناویاندا تاوای لێ هات ماڵێك لە ماڵەکانی ئەنصار نەمابوو کە باسی پێغەمبەری ﷺ تیا نەکرێت تا ساڵی ئایندە هات دوانزە پیاویان گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و لە دۆڵی عەقەبە ڕێکەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەنجامدا لەشوینی شەیتان رەجم کردن، لەوێدا پەیمانیاندا بەپێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی جیهاد فەرز ببێت لەسەر موسوڵمانان، وە پیاوانی ئامادە بووی پەیمانی عەقەبەی یەکەم: ئەسعەدی کوڕی زوراره و دوو کوڕەکەی حارثی کوڕی ڕەفاعەی: وە ڕافعی کوڕی مالیکی کوڕی عەجلان، زەکوانی کوڕی عەبد قەیس، عوبادەی کوڕی صامت، یەزیدی کوڕی سەعلەبە وە عەباسی کوڕی عبادە، وە عوقبەی کوڕی عامری کوڕی حەدیدە، ئەوانە هەمووله خەزرەج بوون و دوو پیاویش لە ئەوس ئامادە بوون، ئەبو

هەیثەمی کوڕی تەیهان و عومیمەی کوڕی ساعیدە) [٤٠١].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (یەزیدی کوڕی حەبیبە بۆی گێڕامەوە لە ئەبو مەرسەدی کوڕی عەبدل ڕەحمان ی کوڕی عوسەیلە و لە عوبادەی کوڕی صامتەوە کە فەرموویەتی: من یەکێك بووم لەوانەی ئامادەی پەیمانی عەقەبە بووم و دوانزە پیاو بووین و پەیمانماندا بەپێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەرن پەیمانم بدەنێ، وتمان بەچی؟ فەرمووی: (تَعَالَوْا بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شيئًا، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعروفٍ، فمَن وفَى مِنكُم فأجْرُهُ علَى اللَّهِ، ومَن أصَابَ مِن ذلكَ شيئًا فسَتَرَهُ اللهُ فأمْرُه إلى اللهِ ، إنْ شاءَ عاقَبَهُ ، وإنْ شاءَ عَفَا عنْهُ)[٤٠٢]. واتە: بەوەی هیچ هاوبەشێك بۆخوا بڕیار نەدەن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و منداڵتان نەکوژن و بوختان بۆ پێش و پاشتان نەکەن و هەر کەس ئەوانە ئەنجام بدات پاداشتی لای خوایە و هەر کەسێکیش شتێك لەو خراپانەی ئەنجام بدات و خوا بۆی بپۆشێت ئەوە لای خوایە، گەر ویستی لێ بێت لێی خۆش دەبێت وە گەر ویستی لێ بێت سزای دەدات، دەفەرموێت: ئێمە پەیمانمان دایە لەسەر ئەو شتانە وپاشان گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە).

دوای موسوڵمان بوونی ئەو بەڕێزانە و گەڕانەوەیان بۆ شاری مەدینە بەباشیان زانی یەکێ لە هاوەڵە بەڕێزەکانی کە موصعەبی کوڕی عومەیر بوو ﷺ کەچەندین ساڵە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دایە و ئیسلام باش حاڵییە، بەرەو شاری مەدینە بکەوێتە ڕێ تا نوێنەری پێغەمبەر ﷺ بێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام و خوێندنەوەی قورئان بەسەر خەڵکی مەدینەدا تاکو خەڵکی شاری مەدینە چاکتر شارەزابن لە دینی خوا و پێغەمبەر ﷺ باشتر بناسن.

---

(٤٠١) أنظر: سيرة ابن هشام (٣٨/٢) (٣٠٧)، وأخرجه: البيهقي في (الدلائل) (٤٣٣/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٣)، والطبري في (التأريخ) (٣٥٣/٢)، والطبراني في (الكبير) (١٧٦٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٤٢/٦): رجاله ثقات، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٥٤): إسناده حسن،وحسن إسناده محققا (زاد المعاد) (٤٠/٣).

(٤٠٢) أنظر: (سيرة) لابن هشام (٤١/٢٨) (٣٠٩)، والبخاري (٣٨٩٣)، ومسلم (١٧٠٩)، وأحمد (٣٢١/٥)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٣٦/٢)، والدارمي (٢٣٦٢)، والنسائي (١٤٨/٧)، والحميدي (٣٨٧).

# ڕۆڵی موصعەبی کوڕی عومەیر ﷺ لە مەدینەدا

عورووەی کوڕی زوبێر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ خەڵکی شاری مەدینە و خاوەنەکانی گفتی عەقەبەی یەکەم گەڕانەوە، بۆلای خزمانی خۆیان بە نهێنی بانگەوازی ئیسلامیان پێ دەگەیاندن، و هەواڵی پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەگێڕانەوە لەگەڵ باسی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە خوای گەورە بە پێغەمبەردا ﷺ ناردوویەتی ئەوان بانگەوازی قەومەکەی خۆیان کرد، هەتا وای لێ هات هەموو ماڵێك لە ماڵەکانی ئەنصار موسوڵمانێکی تیا بوو، پاشان ناردیان بۆلای پێغەمبەر ﷺ و داوایان لێ کرد و وتیان: پیاوێك لای خۆتەوە بنێرە بۆلامان تا خەڵکی بانگەواز بکات بۆ کتێبەکەی خوا چونکە ئەوە نزیکترە و بەئاگاو شارەزاترن بۆ شوێن کەوتنیان بۆ ئیسلام، ئینجا پێغەمبەر ﷺ موصعەبی بۆ ناردین لەکوڕانی بەنی عەبدل دار بوو....).

لە ڕیوایەتێکی تری ئیبنو ئیسحاق ﷺدا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە موصعەب کرد کە قورئانیان بەسەردا بخوێنێت و ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنێت و لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام شارەزایان بکات، موصعەبیش هەر لە شاری مەدینەدا نازناوی قورئان خوێنی لێ نرا بوو، ئەویش یەکەم جار چووە لای کوڕانی بەنی غەنەم بۆلای پیاوی پایەبەرز ئەسعەدی کوڕی زورارە لە ماڵی ئەوانەوە بە نهێنی خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام، تا بانگەوازەکەی بڵاوبووەوە و شوێن کەوتوانی زۆر بوون ئەوانیش هەر بە نهێنی بەردەوام بوون تا ڕۆژێك ئەسعەد لەگەڵ موصعەبدا هاتنە لای بیری (مەرق) نزیك بەو شوێنە لە نزیك دارخورماکاندا دانیشتن و هەندی لە خاوەن زەوی موسوڵمانی ئەو شوێنەیان بانگ کرد بە نهێنی وکۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ کردن لەو کاتەدا موصعەب قسەی بۆ دەکردن و بەسەرهاتی بۆ دەگێڕانەوە، هەواڵی ئەم کۆبونەوەیە گەیشت بە پیاوی پایەبەرز سەعدی کوڕی موعاذ)[٤٠٣].

(ئەو ڕۆژە سەعد و ئوسەید دوو گەورەی هۆزی خۆیان بوون لە کوڕانی بەنی عەبدولئەشهەل کە هێشتا هەر هاوبەش پەیداکار بوون و لەسەر ئاینی خزمانی خۆیان بوون کاتێ کە گوێیان لێ بوو کە یەکێ لە مەککەوە هاتووە و بانگەواز بڵاودەکاتەوە لەو شارەدا، سەعد بە ئوسەیدی وت: باوکت لەدەست نەچێت بچۆ بۆلای ئەو دوو

(٤٠٣) أخرجه: أبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٧)، والطبراني في (الكبير) (٣٦٢/٢٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٤٢/٦): رواه الطبراني مرسلا و فيه ابن لهيعة و فيه ضعف وهو حسن الحديث و بقية رجاله ثقات.

پیاوه کە هاتوونەتە ناو ئەو ماڵانە بۆ ئەوەی لاوازەکانمان بێ ئەقڵ بکەن، بچۆ لێیان توڕەببە و داوایان لێ بکە دەست لەو کارە هەڵگرن و نزیکمان نەکەونەوە چونکە تۆ دەزانی کە ئەسعەد چەند خزمایەتییەکی نزیکی هەیە لەگەڵمدا ،و هەروەها دەزانێت کە کوڕی پورمە و من ناتوانم بچم و هەڵکوتمە سەری گەر وانەبووایە خۆم دەچووم و پێویستی نەدەکرد کە تۆ بچیت.

ئوسەیدیش ڕمەکەی هەڵگرت و بەرەولای ئەوان چوو کاتێ کە ئەسعەد لای موصعەب دانیشتبوو بینی ئوسەید وا بەرەو ئەوێ هات بە موصعەبی وت: ئەوە سەرکردەی هۆزەکەی خۆیەتی کە دێت بۆلات بە ڕاستی ئیسلامی پێ بگەیەنە، (واتە: زۆر سووربە لەسەر ئەوەی کە ئەم پیاوە لە ئیسلام حاڵی بێت) موصعەبیش وتی: گەر دانیشت لامان قسەی لەگەڵ دەکەین، ئوسەید هات و لایان وەستا و بە توڕەییەوە پێی وتن: چی وای لێ کردوون بێن بۆلای ئێمە تا لاوازەکانمان بێ ئەقڵ بکەن و فریویان بدەن، دوور کەونەوە لێمان گەر خۆتان لاخۆشەویستە، موصعەبیش ﷺ وتی: ئەی بۆ دانانیشیت گوێ بگریت گەر ڕازی بوویت بەشتێك وەریگرە، ئەگەر پێت ناخۆشە لێت دوور دەخەینەوە، ئەویش وتی: بە ڕاستی قسەکەت دادپەروەرانەیە، ئینجا ڕمەکەی چەقاند و دانیشت لایان و موصعەب ئیسلامی تێگەیاند و بۆی ڕوون کردەوە و قورئانی بەسەردا خوێندەوە، دوایی موصعەب و ئەسعەد وتیان: وەڵاهی پێش ئەوەی ئوسەید قسە بکات ئێمە ئیسلامەتیمان دەبینی لە ڕوویدا دیار بوو پێش ئەوەی شایەتمان بهێنێت، چونکە ڕووی زۆر گەش بوو، جوان حاڵی ئەبوو، بەباشی گوێی گرتبوو بۆ بانگەوازەکە، کە بۆمان ڕوون کردەوە لە کۆتاییدا وتی: ئەم قسەیەی کە تۆ دەیڵێیت جوانە و زۆر چاکە، ئەوە چی دەکەن کە بتانەوێت بچنە ناو ئەم ئاینەوە؟ هەردووکیان پێیان وت: دەبێت خۆت بشۆیت و هەردوو جلەکەت پاك و خاوێن بکەیت و پاشان شایەتی بە حەق بدەیت و دوو ڕکات نوێژ بکەیت، ئینجا ئەویش هەستا و ئەوانەی جی بەجێ کرد و وتی: پیاوێکم بەجێ هێشتووە لە دوامەوەیە، گەر ئەو موسوڵمان ببێت هیچ کەسێکی ئێرە دواناکەوێت لە موسوڵمان بوون و منیش ئێستا دەچم دەیهێنمە لاتان و ئەویش (سەعدی کوڕی موعاذە).

ئینجا ڕمەکەی هەڵ گرت و چوو بەرەو لای سەعد، سەعدیش لەگەڵ خزمانی خۆی دانیشتبوو لە جێگە دانیشتنی خۆیدا، کە کاتێ سەعد ئوسەیدی بینی بە

ڕمەکەیەوە گەڕایەوە بۆ ئەوێ بە هاوشانەکانی دانیشتوی گۆرەکەی خۆی وت: سوێند دەخۆم بە خوا ئوسەید هاتەوە لامان و بەو دەم و چاوەی یەکەم جاری کە ڕۆیشت نەهاتەوە لامان، ئوسەید کاتێ هاتە لایان و وەستا، سەعد پێی وت: چیت کرد؟ وتی: قسەم لەگەڵ ئەو دوو پیاوە کرد و شتێکی وا خراپم لێ نەبینین و داوام لێ کردن کە دەست لەو کارەیان هەڵگرن، ئەوانیش وتیان: ئەوەی تۆ پێت خۆشە ئەوە دەکەین بەڵام هەواڵم پێگەیشتووە کە کوڕانی بەنی حاریثە هەموو چوون بۆ ئەسعەدی کوڕی زوراره بۆ ئەوەی ڕقی تۆی پێ هەڵسێنن و پەنای تۆی پێ بشکێنن، پاشان سەعد بە توڕە بوونیکەوە هەستا نەوەك كوڕانی بەنی حاریث ئەسعەد بکوژن و ڕمەکەی لەدەست ئوسەید سەند و وتی: وەڵاهی وابزانم هیچ سودێکت نەبوو.

کاتێ چوو بۆلایان و نزیك بووەوە و ئەسعەدی کوڕی زوراڕەی کوڕە پوری خۆی بینی لەگەڵیاندا دانیشتبوو وە هیچ ترس و باکیان نەبوو، وە هیچ شەڕێك لە ئارادا نەبوو ئینجا بە توڕەییەوە لای هەردووکیان وەستا و بە ئەسعەدی خزمی خۆی وت: ئەبو ئومامە وەڵاهی خۆت باش دەزانیت ئەو خزمایەتیەی کە هەیە لە نێوان من و تۆدا گەر ئەوە نەبوایە تۆ وات نەدەکرد بەرامبەر بەمن، ئەوە بۆچی ئەم تاکە کەسە دەرکراوە و بێ هاوتا و غەریبەت گرتۆتە لای خۆت بۆ ئەوەی کەم هۆش و نەزانەکانمان تێك بدات و بەشتی پڕوپوچ فریویان بدات، وە دواجار ئێوەش تێك دەدات، من وای بەباش دەزانم کە لێی نزیك نەبینەوە، ئینجا بە موصعەبی وت: بۆچی دێیتە ناو ماڵەکانمان و شتی ناڕەحەتمان بەرامبەر دەکەیت؟ (پێش ئەوەی سەعد بچێت ئەسعەد بە موصعەبی وت: ئەی موصعەب وەڵاهی سەرکردەی قەومێك واهات بۆلات ئەگەر شوێنت کەوێت هیچ کەس لە قەومەکەی دواناکەویت لە شوێن کەوتنی بۆ ئاینی ئیسلام)، موصعەبیش بە سەعدی وتبوو: گوێ بگرە گەر شتێك پێ ڕازی بوو ئەوا وەری گرە و ئەگەر شتێ پێ ناخۆش بوو ئەوا لێتی دوور دەخەینەوە، سەعد وتی: قسەکەت زۆر دادپەروەرانە بوو، ئینجا ڕمەکەی چەقاند و دانیشت لەلایان و موصعەبیش ﷺ ئیسلامی تێ گەیاند، ئەسعەد هەندێ نەرم و نیانی بینی لەلایەن سەعدەوە و پێی وت: ئەی پورزام گوێ گرە لە قسەکەی ئەگەر شتێکی خراپت گوێ لێ بوو تۆ شتێکی چاکترمان بۆ بێنە لە قسەکەی ئەو، ئەگەر گوێشت لە شتێکی ڕاست بوو ئەوا ملکەچ و گوێڕایەڵی ببە.

سەعد بە ئەسعەدی وت: موصعەب چی دەڵێی؟ موصعەبیش سەرەتای سورەتی (زخرف)ی بۆ خوێندەوەکە دەفەرموێت: ﴿حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٣﴾﴾(الزخرف) هەردووکیان وتیان: وەڵاهی ئیسلامەتیمان دەبینی لە ڕووی گەشی سەعدی کوڕی موعاذ پێش ئەوەی قسە بکات، دوای ئەوەی موصعەب قسەکانی تەواو بوو سەعد بە هەردووکیانی وت: چی دەکەن گەر بتانەوێت موسوڵمان ببن و بچنە ناو ئەم ئاینەوە؟ وتیان: هەستە و خۆت بشۆ و هەردوو بەرگەکەت خاوێن بکە و شایەتی بەحەق بدە و دوو ڕکات نوێژ بکە، ئەویش ئەوانەی جێبەجێ کرد و پاشان ڕمەکەی هەڵگرت و بەپەلە گەڕایەوە بۆلای قەوم وهۆزەکەی خۆی، ئەسعەد دەفەرموێت: کە قەومەکەی خۆی بینی سەعد و ئوسەید گەڕانەوە بۆلایان هەر لەوێ پێش گەیشتنی ئەو دووانە بۆلایان وتیان: سوێند بە خوا سەعد بە ڕوویەکەوە گەڕاوەتەوە بۆلامان لەڕووی جارانی جیاواز تر بوو کە لێرەوە ڕۆیشت، ئینجا سەعد هات و وەستا لەلایان و پێی وتن: کوڕانی بەنی عبد الاشهل قسەی من چۆنە لەناوتانا؟ ئەوانیش وتیان: تۆ گەورەمانی و بۆچوونت لە بۆ چوونی هەموومان چاکترە و تۆ لە هەموومان گەورەتر و بەرزتری، سەعد ﷺ وتی: گوێ بگرن قسەکردنی ئافرەت و پیاوانتان لەسەرم حەرام بێت تا باوەڕ نەهێنن بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە هەر کەسێك گومانی هەیە لەم ئاینەدا لەبچوك و گەورەتان وە لە پیاوان و ئافرەتانتان با شتێکی چاکترمان بۆ بهێنێت لەم ئاینەی کە پێی هاتووە وەڵاهی فەرمان و ئاینێك هاتۆتە پێشەوە سبەی ڕۆژ ملەکانی لەسەر هەڵدەکەنرێن.

عوروە دەفەرموێت: وەڵاهی ئێوارەی پێ نەچوو تا ماڵێك لە ماڵەکانی بەنو عبدالاشهل نەما چ پیاو و چ ئافرەت تا هەموویان سەرجەم لەڕێی سەعدەوە موسوڵمان بوون، وە ئەسعەد و موصعەب گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان (واتە: بۆ ماڵی ئەسعەدی کوڕی زورارە) پاشان بە ئاشکرا ئیسلامیان دەگەیاند بە خەڵکی تا خوای گەورە کەسانێکی زۆری لە سەردەستیدا ڕێنموویی کرد تا ماڵێك نەمابوو لە ماڵەکانی ئەنصاردا کە کەسانێکی لێ موسوڵمان نەبوو بێت بە سەرکردەکانیانەوە وەك: عەمری کوڕی جەموح، وە ئەو موسوڵمانانەش کەوتنە شکاندنی بتەکان، وە کەسانێکی خاوەن دەسەڵات بوون و ژمارەیان زۆر بوو لە شاری مەدینەدا......)[٤٠٤].

(٤٠٤) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٤٣/٢) (٣١٣) وقال محققه: سناده صحيح مرسل،والطبري في (التأريخ) (٣٥٧/٢)، والبيهقي في (الدلائل) ( ٤٣٧/٢،٤٣٠).

لە ڕیوایەتێکی ئیبنو عباسدا ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە ڕێی دابوو بە پێغەمبەر ﷺ کە کۆبوونەوەی جومعە ئەنجام بدات پێش ئەوەی کۆچ بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیتوانی جومعە بکات لە شاری مەککە، بۆیە هەواڵی بۆ موصعەب ﷺ نارد کە لە مەدینە بوو پێی فەرموو: تەماشا بکە ئەو ڕۆژەی کە جولەکەکان بە ئاشکرا زەبووری تیادا دەخوێنن، ئافرەتان و کوڕانتان لەو ڕۆژەدا کۆبکەنەوە کاتێك کە گەیشتنە نیوەڕۆ و خۆرلایدا ئالەو کاتەدا دوو ڕکات نوێژ بکەن، تا نزیك بنەوە لە خوای گەورە، دەفەرموێت: یەکەم کەسێك کە نوێژی جومعەی کرد بێت بۆ خەڵکی پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە موصعەب ﷺ بوو، تا دواجار پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە و خەڵکی ناو شاری مەدینەی کۆکردەوە و بە ئاشکرا ئەنجامیدا....)[٤٠٥].

لەو کاتەشدا ژمارەی موسوڵمانانی ناو شاری مەدینە دەگەیشتە چل کەس: (کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەس کە کۆی کردینەوە بۆ نوێژی جومعە ئەسعەدی کوڕی زوراڕە بوو لە ناوچەی (هزم النبیت) لای حەڕەی بەنی بەیازە، کوڕەکەی پێی وت: ئەو ڕۆژە ژمارەتان گەیشتبووە چەند موسوڵمان؟ کەعب وتی: چل کەس دەبووین)[٤٠٦].

---

(٤٠٥) أخرجه: الدار قطني بإسناد حسن كما قال الشيخ الألباني في (إرواء الغليل) (٦٨/٣)، برقم (٦٠٨).

(٤٠٦) أخرجه: أبو داود (السنن) (١٠٦٩)، وابن ماجه (السنن) (١٠٨٢)، والطبري في (الكبير) (٩٠٠)، والدار قطني (٥/٢)، وابن خزيمة (١٧٢٤)، وابن حبان (٧٠١٣)، وقال محققه: إسناده قوي، والحاكم (٢٨١/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (١٧٦/٣) وقال: حسن الإسناد، و(في الصغرى) (٥٤٣)، وحسنه الشيخ الألباني في (الإرواء) (٦٠٠) و(صحيح أبي داود) (٩٤٤) و(صحيح ابن ماجه) (٨٨٦)، وحسن إسناده الشيخ الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٤٢/٣).

# پەیمانی عەقەبـەی دووەم

هاتنی موسوڵمانانی ئەنصار بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئەوە بوو موسوڵمانان لە کاتی وەرزی حەجدا گەیشتنە مەککە. حاجییەکانی قەومی خۆیان زۆربەیان هێشتا موشریك بوون و لەگەڵیاندا بەڕێ کەوتبوون و موصعەب لەگەڵیاندا گەڕایەوە بۆمەککە، و کاتێ خوای گەورە ویستی وابوو کە بەئاینی ئیسلام شکۆداریان بکات و پێغەمبەرەکەشی ﷺ بەوان سەر بخات، هاوبەشپەیداکاران و کافران سەرشۆڕ بکات، ئەوە بوو کاتێ گەیشتنە مەککە لە شەوێك ناوەڕاستی (أيام التشريق)دا هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە دۆڵی عەقەبە و گفتیاندا بە پێغەمبەر ﷺ [٤٠٧].

بەم شێوەیە پێغەمبەری پایەبەرز ﷺ دیارە پێش هاتنی ئەم نوێنەرانە بەردەوام و کۆڵنەدەرانە ئاینی خوای دەگەیاند بە هەموو کەسانی ئامادە بووی هۆزەکانی عەرەب لە کاتی حەج کردنیان لە شاری مەککەدا، بەڵام ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ڕەحمەت و بەرەکەتەی ڕووکردە پیاوانی مەدینە لەناو هەموو پیاوانی خەڵکی دوورگەی عەرەبدا کە هیچیان بانگەوازی ئیسلامیان پێ قبوڵ نەبوو وە پێغەمبەریان ﷺ نەگرتە خۆ و سەریان نەخست و یارمەتیان نەدا.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە مەککە مایەوە بۆ ماوەی دە ساڵ لە شوێنی دابەزینی خەڵکی لە کاتی وەرزی حەجدا و لە بازاڕەکانی (مجنة و عكاظ) دەوەستا و پێی دەیفەرموون: ((مَن يؤويني؟ مَن ينصُرُني حتى أبلِّغَ رسالاتِ ربِّي وله الجنَّةُ؟)) واتە: کێ دەمگرێتە خۆ و کێ یارمەتیم دەدات و سەرم دەخات تا پەیامی خوای خۆم بگەیەنم بەهەشت پاداشتی دەبێت، بەڵام کەسی دەست نەدەکەوت سەری بخات و بیگرێتە خۆ، هەتا پیاوێك لە (مضر)یان لە یەمەن دەرچوو کە دەیویست بەرەو مەککە بێت خزمانی لێی کۆدەبوونەوە و پێیان دەوت: خۆت بپارێزە لە کوڕەکەی قوڕەیش تووشی وڕێنەت نەکات و گومڕات نەکات، وە پێغەمبەر ﷺ بەناو شوێن دابەزینەکانی ئەو خێڵانەدا دەگەڕا و بانگەوازی دەکرد بۆ خوای گەورە و پەنجەیان بۆ ڕادەکێشا و دەیان وت: ئەوە محمدە تا خوای گەورە ئێمەی خەڵکی شاری یەثریبی بۆ نارد و پیاوێك لە ئێمە دەڕۆیشت و باوەڕی پێ دەهێنا و

(٤٠٧) أنظر: سيرة ابن هشام (٤٦/٢)، والطبراني في (الكبير) (٣٦٠/٢).

پێغەمبەر ﷺ قورئانی بەسەردا دەخوێندەوە، پاشان دەگەڕایەوە لای خزمانی خۆی و بە موسوڵمان بوونی ئەو پیاوە سەرجەم خزمانی موسوڵمان دەبوون، تا ماڵێك نەمابوو لە ماڵەکانی ئەنصاردا تاقمێك موسوڵمانی تیا نەبێت و هەموویان موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا دەکرد، ئەوە بوو خوای گەورە ئێمەی نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی گەیشتین و لێی کۆبووینەوە و لەناو خۆماندا پێش ئەوەی بڕۆین وتمان: هەتا کەی واز بهێنین لە پێغەمبەر ﷺ ڕاوبنرێت لە چیاکانی مەککەدا و ئازار بدرێت یان بترسێنرێت، ئەوە بوو ئێمەش لە کاتی حەجدا چووینە خزمەتی و شوێنی پەیمانمان دۆڵی عەقەبە بوو....)(٤٠٨).

لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (ساڵی ئاینده (واتە: ساڵی پەیمانی عەقەبەی دووەم)، حەفتا پیاو لە پیاوانی ئەنصار هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و چل کەسیان لە هەرە سەرکردە و پیاوە ڕیش سپیەکان و گەورە پیاوەکانیان بوون و سی کەسیشیان لە گەنجە خوێن گەرمەکانی ئەنصار بوون و بچوکترینیان عوقبەی کوڕی عامر، و ئەبو مەسعود و جابیر بوو)(٤٠٩).

وردە کاری و چۆنیەتی بەستنی گفتی عەقەبەی دووەم و کۆبونەوەی پێغەمبەر ﷺ بەم موسوڵمانە بەڕێزانەی کە لە شاری (یثرب)ەوە بۆ یەکەم جارە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ تا سەری بخەن و پشتگیری بکەن و دینی خوا بە ئاشکرا بگەیەنن، بەم جۆرە گێڕراوەتەوە:

کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ حاجییەکانی خزمانی خۆماندا دەرچووین و ئێمە هاوبەشمان بۆ خوا بڕیار نەدەدا و نوێژمان دەکرد و تێگەیشتبووین

---

(٤٠٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٢٢/٣) وفي الفضائل (١٧٦٧) وقال محققه: إسناده صحيح، والبزار (١٧٦٥)، والطبراني في (الكبير) (١٧٤/١٩)، والحاكم (المستدرك) (٦٢٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٩/٩)، وفي (الدلائل) (٤٤٤/٢)، وابن حبان (٧٠١٢،٦٢٧٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٣٧)، وقال الحافظ ابن كثير في (البداية) (١٥٩/٣): إسناده جيد على شرط مسلم، وقال الحافظ ابن حجر في (فتح الباريء) (٢٢٢/٧): إسناده حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (٤٦/٦) رواه أحمد و البزار ورجال أحمد رجال الصحيح، وقال الحافظ العراقي في تخريج : رواه أحمد بإسناد جيد، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٣): إسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٢٢٢): حديث حسن.

(٤٠٩) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٣٦٢/٢)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٧)، وقال الهيثمي في: (المجمع) (٤٢١٢) رواه الطبراني مرسلا و فيه ابن لهيعة و فيه ضعف وهو حسن الحديث.

لە ئاینی ئیسلام، ئەو ڕۆژە بەرائی کوڕی مەعروری سەرکردە و گەورە و ناودارمان لەگەڵدا بوو کاتێ ڕوومان کردە سەفەرەکەمان، لە شاری مەدینە دەرچووین و گەیشتینە دۆڵی (بطحاء) لەوێ بەراء بە ئێمەی وت: ئەی کۆمەڵان من بۆچونێکم هەیە و نازانم ئێوە لەگەڵمدان یان نا؟ وتمان: ئەو بۆچوونەت چیە؟ وتی: من وا دەزانم کە هەرگیز پشت نەکەمە ئەم کەعبەیە بەڵکو لە نوێژەکانمدا ڕووی تێ بکەم، ئێمەش پێمان وت: نەخێر وەڵاهی ئێمە وەکو تۆ ناکەین پێمان نەگەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردبێتە کەعبە بەڵکو ڕووی کردووەتە شام (واتە: بيت المقدس) ئێمەش پێمان خۆش نییە سەرپێچی پێغەمبەر ﷺ بکەین، بەراء وتی: وەڵاهی من بەردەوام ڕوو دەکەمە کەعبە و نوێژ دەکەم، پێمان وت: ئێمەش بە هیچ جۆرێ ئەوە ناکەین و قیبلەی خۆمان ناگۆڕین، ئێمە لە کاتی نوێژدا ڕووە و (بيت المقدس) دەوەستاین و ڕوومان تێدە کرد و ئەویش ڕووەو کەعبە نوێژی دەکرد تا گەیشتینە مەککە، بەراء بە منی وت: (واتە: بە کەعب) وتی: برازا برۆ بمگەیەنەرە پێغەمبەر ﷺ تا پرسیاری لێ بکەم سەبارەت بەو کارەی کە کردوومە لە سەفەرەکەمدا وەڵاهی کاتێ کە ئێوە لەگەڵمدا نەبوون شتێك کەوتۆتە دڵمەوە کە بینیومە ئێوە بە پێچەوانەی منەوە نوێژ دەکەن و ڕوو دەکەنە شوێنێکی تر.

ئینجا هەردووکمان چووین پرسیارمان کرد سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ کە لە کوێیە، چونکە ئێمە نەمان دەناسی وپێشتر نەمان بینی بوو تا پیاوێکی شاری مەککە لە (ئەبتەح) پێمان گەیشت و پرسیارمان لەو کرد وتمان: ئایا پێمان دەڵێیت محمدی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەبدول موطەلیب لە کوێ یە؟ ئەویش وتی: ئەگەر بینیتان دەیناسنەوە؟ وتمان: نەخێر نایناسینەوە و کەسیشمان محمدمان نەبینیوە، قورەیشییەکە پێ‌ی وتین: عەباسی مامی دەناسن ئەگەر بیبینن؟ وتمان: بەڵێ، چونکە عەباسمان پێشتر ناسیبوو بەردەوام لە مامەڵە وکڕین و فرۆشتندا دەهات بۆ مەدینە، ئینجا قورەیشییەکە پێ‌ی وتین: ئەگەر چوونە (کەعبە) بزانن ئەوەی ئێوە بە شوێنیدا دەگەڕێن ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ عەباسدایە.

دەفەرموێت: چوینە کەعبە و بینیمان عەباس لەوێیە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتووە لە سوچێکی مزگەوتەکەدا ئێمە لێیان نزیك بووینەوە و سڵاومان لێکردن پاشان دانیشتین لایان و پێغەمبەر ﷺ بە عەباسی فەرموو: ئایا ئەم دوو پیاوە

دەناسیت ئەی باوکی (فضل)؟ ئەویش وتی: بەڵێ ئەم دوو پیاوە خەزرەجین (خەڵکی مەدینەن)، ئەوەیان بەڕائی کوڕی مەعرورە و سەرکردەی قەومی خۆیەتی و ئەوەشیان کەعبی کوڕی مالیکە، کەعب دەفەرموێت: وەڵاهی ئێستاش لە بیرم ناچێتەوە کە کاتێ عەباس ئەوەی وت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە شاعیرەکەیە؟ عەباسیش وتی: بەڵێ.

بەراء بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەم سەفەردا بۆچونێکم هەبوو پێم خۆش بوو سەبارەت بەوە پرسیارت لێ بکەم بۆ ئەوەی پێم ڕابگەیەنیت سەبارەت بەو کارەی کە ئەنجامم داوە لە سەفەرەکەمدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پرسیارەکەت چییە؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لەم سەفەرەمدا کە ویستم بەرەو ئێرە بێم خوای گەورە ڕێنمویی کردبووم بۆ ئیسلام و پێم باش بوو کە پشت نەکەمە کەعبە، بەڵام هاوەڵانم هەموو لە ڕێدا بە پێچەوانەی منەوە نوێژیان ڕوەو (بيت المقدس) دەکرد هەتا شتێك کەوتە دڵمەوە سەبارەت بەم کارەی خۆم، تۆ چی دەفەرموێت ئەی پێغەمبەرە خودا ﷺ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تۆ قیبلەت (واتە: ڕووگە)ت هەبوو (واتە: قیبلەی یەکەم) و ئارامت بگرتایە لەسەری)).

بەم شێوەیە بەراء گەڕایەوە بۆ قیبلەکەی پێغەمبەر ﷺ وە لەگەڵ ئێمەدا ڕووی کردە (بيت المقدس) لە کاتی نوێژدا پاشان چوین بۆ حەج کردن بەرەو (مینا) لەوێ پەیمانماندا بە پێغەمبەر ﷺ لە ناوەڕاستی ڕۆژانی تەشریقدا لە عەقەبە کە شەو بەیەك بگەین، کە کاتێ حەج تەواو بوو ئەو شەوەش هاتە پێش کە پەیمانم دابوو بە پێغەمبەر ﷺ، وە لەو سەفەرەماندا عەبدوڵڵای کوڕی حەرامان لەگەڵدا بوو کەیەکێك بوو لە سەرکردەکانمان و پیاو ماقوڵێك بوو لە پیاو ماقوڵەکانمان وە ئێمە، موسوڵمان بوونی خۆمان لە هەموو حاجییە موشریکەکانی خزمان دەشاردەوە و قسەمان لەگەڵ حەرامدا کرد و پێمان وت: تۆ گەورەیەکیت لە گەورەکانمان و پێمان خۆش نییە لەسەر ئەم بیرو باوەڕەت بمریت و سبەینێ ببیت بە سوتەمەنی دۆزەخ بزانە کەخوای گەورە پێغەمبەری ﷺ ناردووە و فەرمانی داوە بەیەکتاپەرستی و کەسانی خزمی خۆشت موسوڵمان بوون و پەیمانیشمان داوە بە پێغەمبەر ﷺ کە پەیمانی بدەینێ (البيعة)، ئینجا حەرامیش موسوڵمان بوو وە خۆی شۆرد و جلەکانی

خاوێن کردەوە. لە پەیمانەکەشدا بەشدار بوو وە یەکێك بوو لە هەڵبژاردەی خزمانی خۆی لەو شەوەدا.

کەعب ﷺ دەفەرمویێت: ئەو شەوە هاتە پێش کە پەیمانمان دابوو بە پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ حاجییەکانی کەسانی خۆماندا سەرەتای شەو لە جێگەکانی خۆماندا خەوتین کە سێیەکی شەو تێپەڕی و خەڵکی لە شیرینەی خەودا بوون و کەوتبوونە خەوێکی قورسەوە ئینجا ئێمەش زۆر بە هێواشی و بێ دەنگی هاتینە دەرەوە وەکو کۆتری بچکۆلە کە دەردەچێت، هێلانەکە لە ژێر پێخەفەکانمان بە دزییەوە بۆ ئەوەی حاجییە موشریکەکانی قەومی خۆمان پێمان نەزانن کە بەم نیوەی شەوە بەرەو کوێ دەچین، دانە بە دانە بەملاولادا بەڕێکەوتین بەرەو دۆڵی عەقەبە، تا لەوێ کۆبینەوە و ژمارەمان گەیشتە حەفتاوسێ پیاو و دوو ئافرەتیش لە ئافرەتانی خۆمان لەگەڵماندا بوون یەکێکیان ناوی نوسەیبەی کچی کەعب بوو کە نازناوی ئوم عەممارە بوو کەیەکێك بوو لە ئافرەتەکانی کوڕانی بەنی مازنی کوڕی نەجار وە ئافرەتی دووەمیشیان ناوی ئەسمائی کچی عومەر بوو کە یەکێك بوو لە ئافرەتانی بەنی سەلەمە و نازناوی دایکی (مەنیع) بوو، ئێمە کۆبووینەوە لەو دۆڵەدا و هەموومان وەستاین و چاوەڕێی پێغەمبەرمان ﷺ دەکرد کە بە نهێنی بگاتە ئەو دۆڵە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆلامان و عەباسی مامی لەگەڵدا بوو، وە عەباس هێشتا موسوڵمان نەبووبوو لەسەر ئاینی قەوم و خزمانی خۆی بوو بەڵام پێی خۆش بوو بزانێت کە ئەم برازایەی پەیمانی چۆن دەدرێتێ تا پەیمانەکەی بۆ یەکلا بکاتەوە لەگەڵ کەسانی خەڵکی مەدینەدا.....)[٤١٠].

هەر بۆیە عەباس بە پێغەمبەری ﷺ وت: برازا ئەمانە نازانم کێن هاتوون، من خەڵکی مەدینە لێیان دەناسم، وە دانە دانە لێی کۆبووینەوە عەباسیش ڕووی تێ دەکردین و دەیوت: ئەمانە کەسانێکن نایان ناسین ئەمانە کەسانێکی گەنجن، ئێمە

(٤١٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٦٠/٣) (١٥٧٩٨) وقال محققه الأرناؤوط: حديث قوي إسناده حسن، والطيالسي (٩٣/٢) (٢٣٣٣)، والطبري في (التأريخ) (٣٦٠/٢)،والطبراني في (الكبير) (١٧٥/١٩)، والحاكم (٤٤١/٣)، وابن خزيمة (٤٢٩) وقال محققه: إسناده حسن، والبيهقي في (الدلائل) (٤٤٤/٢)، وابن حبان (٧٠١١) وقال محققه: إسناده قوي، وابن هشام في (السيرة) (٤٧/٢) (٣١٥) واللفظ له، وقال الهيثمي في (المجمع) (٤٢/٦): ورجال أحمد رجال الصحيح غير ابن إسحاق و قد صرح بالتحديث، وقال الحافظ في (الإصابة) (٢٣٠/٤): إسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٥٩): حديث صحيح،وصحح إسناده الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٤٤/٣).

کاتێ کە دانیشتین یەکەم کەس کە قسەی کرد عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب بوو هەستا و بە ئێمەی وت: ئەی کۆمەڵانی خەزرەج، (عەرەب بە گشتی بە دانیشتوانی شاری مەدینەیان دەوت کۆمەڵانی خەزرەج) پێغەمبەر ﷺ باش دەزانن کەچی ئێمەیە و چ پلەو پایەیەکی هەیە لەناوماندا، و پشت گیریمان لێ کردووە دژ بە کەسانی خزمانی خۆشمان، کە بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕەفتار دەکەن، محمد سەربەرزە لەناو شارەکەی خۆیدا بەڵام ئەو هەر پێی خۆشە بگاتە لای ئێوە گەر ئێوە وا دەزانن سبەینێ تەسلیمی دەکەن وپشتی لێ دەکەن دوای ئەوە کە دەگاتە لاتان ئەوە هەر لە ئێستاوە وازی لێ بهێنن، چونکە خزمانی خۆی زۆر سەربەزانە بەرگری لێ دەکەن لە وڵاتی خۆیدا، ئێمەش وتمان: گوێمان لە قسەکانت بوو ئەی عەباس تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرموو ئەو پەیمانەمان لێوەربگرە کە پێت خۆشە بۆ خۆت و خوای خۆت!)[٤١١].

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە ئێمەی فەرموو: وتە بێژەکەتان با هەستێ بەکورتی و قسە بکات و چونکە سیخوڕانی چواردەورن نەوەك پێمان بزانن گەر پێتان بزانن ئابڕووتان دەبەن)[٤١٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ئەو شەوە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای قسەکانیدا فەرمووی: ئەی مامە پەیمانم بۆ وەرگرە لە خاڵوانی خۆت (واتە: کوڕانی بەنی نەجاری نیشتەجێی شاری مەدینە کە خاڵوانی پێغەمبەرن ﷺ) ئێمەش هەر حەفتا کەسەکە وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی داوا دەکەیت بۆ خۆت و بۆ خوای خۆت و بۆ هاوەڵانی خۆت بفەرموو)[٤١٣].

---

(٤١١) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٢٢/٣) وفي (الفضائل) (١٧٦٧) وقال محققه: إسناده صحيح، والحاكم (٦٢٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار(١٧٥٦)، والبيهقي في (الكبرى) (٩/٩) وفي (الدلائل) (٤٤٤/٢)، وابن حبان (٧٠١٢،٦٢٧٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وأبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٧)،وقال ابن كثير في (البداية) (١٥٩/٣): إسناده جيد على شرط مسلم، وقال الحافظ في(الفتح) (٢٢٢/٧): إسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٣): إسناد صحيح شرط مسلم، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٢٢٢): حديث حسن.

(٤١٢) أخرجه: أحمد (١١٩/٤) (١٧٠٧٨) وقال محققه: مرسل صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٤٥٠/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٤٩/٦): رواه أحمد مرسلا ورجاله رجال الصحيح.

(٤١٣) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٧٥٧)،والحاكم (٣٢٢/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٨١/٧): رواه ابن عساكر بإسناد حسن.

(پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی داواتان لێ دەکەم بۆ خوای خۆم ئەوەیە کە بیپەرستن و بە هیچ جۆرێك هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن)[٤١٤].

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (ئەوەی کە داواتان لێ دەکەم بۆ خۆم ئەوەیە کە گوێڕایەڵیم بکەن، و لە ڕێگەی ڕاست نەترازێن و داوا دەکەم بۆ خۆم و هاوەڵانم کە بمانگرنەخۆ وە سەرمان بخەن لەوەی کە لەدەستاندا هەیە و پشتگیریمان بکەن لەوەی کە خۆتان پشتگیری خۆتانی پێ دەکەن، دەفەرموێت: ئێمەش وتمان: جا گەر وا بکەین ئێمە چیمان لە پاداشتدا دەست دەکەوێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەهەشت، ئێمەش وتمان: ئەوەش بۆ تۆ...)[٤١٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وتمان لەسەر چی پەیمانت بدەینێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پەیمانم بدەنێ لەسەر ئەوەی کە گوێڕایەڵیم بکەن لە چالاکیتان و تەمەڵیتاندا، ویارمەتیم بدەن لە بوون و نەبوونتاندا، و فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن، و لە پێناوی بەرقەرار کردنی ئاینی خوادا لەلۆمەی لۆمەکاران نەترسن هیچ کارتان تێ نەکات و سەرم بخەن کاتێ کە دەگەمە لای ئێوە و بمپارێزن لەوەی کە خۆتان و ژن و منالآنتانی لێ دەپارێزن، بەهەشت بۆ ئێوە یە.

کە پێغەمبەر ﷺ ئەم قسەیەی خۆی فەرموو، بەراء ﷺ هەستاو دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت و وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ سوێند بەوەی کە تۆی ناردووە بەحەق دەتپارێزین لەوەی پارێزگاری خۆمانی لێ دەکەین پەیمانمان لێوەرگرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە وەڵاهی پیاوانی جەنگین و پیاوانی چەکین بە میراتی پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە)[٤١٦]، (دوای ئەوە بەراء ﷺ وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی لە پێغەمبەر ﷺ گرتووە و ئەوی هێناوە بۆلای ئێمە و ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی خوای خۆمان دەکەین گوێمان لێیە و گوێڕایەڵی دەکەین، ئەی کۆمەڵانی ئەوس و

---

(٤١٤) أخرجه: أحمد (١١٩/٤) (١٧٠٧٨) وقال محققه: مرسل صحيح.

(٤١٥) أخرجه: أحمد (١١٩/٤) (١٧٠٧٨) وقال محققه: مرسل صحيح، والطبراني في (الكبير) (٢٥٦/١٧)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٨٨٦): رواه الطبراني و فيه مجالد و حديثه حسن و فيه ضعف.

(٤١٦) أخرجه: أحمد (٣/ ٣٢٢) وفي (الفضائل) (١٧٦٧) وقال محققه: إسناده صحيح، والحاكم (٦٢٥/٢،٦٢٤) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٩/٩)، وابن حبان (٧٠١٢) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٣).

خەزرەج خوای گەورە ڕێزی لێ گرتووین بە ئاینەکەی گوێ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن و پێغەمبەر ﷺ سەربخەن و سوپاسی بکەن، (کەعب ﷺ دەفەرموێت: بەراء ﷺ لەم قسانەدا بوو (ئەبو هەیسەمی کوڕی تەیهان) هەستا و قسەکەی پێ بڕی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئێمە و جولەکەکانی مەدینەدا هەندێ پەیمان هەیە کە لەمەودوا دەیپچڕێنن، بەڵام پێ دەچێت گەر ئێمە ئەوەمان کردووەو دوای ئەوەی خوای گەورە تۆی سەرخست بگەڕێیتەوە بۆلای خزمانی خۆت؟.

پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنە گرتی و فەرمووی: ((بل الدم الدم و الهدم الهدم)) واتە: نەخێر خوێن هەر خوێنە و ڕوخانیش هەر ڕوخانە، من لە ئێوەم و ئێوە لە منن دەجەنگم بەرامبەر ئەوەی کە ئێوە لەگەڵی دەجەنگن و ئاشتی دەکەم لەگەڵ ئەوانەی کە ئێوە ئاشتیان لەگەڵ دەکەن، [بەراء ﷺ وتی: دەستت بێنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو پەیمانت بدەمێ][٤١٧].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [هەستاین پەیمانی بدەینێ یەکسەر (ئەسعەدی کوڕی زورارە) کە لەحەفتا کەسەکە تەمەنی لە هەمووان بچوکتربوو وتی: ڕاوەستن لەسەر خۆبن و پەلە مەکەن، ئەی کۆمەڵانی یەثریب ئێمە کە لە پشتی وڵاخمان داوە و هاتووین بۆ ئێرە باشمان زانیوە کە ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ و ئێمە ئەگەر لەم شارە دەری بکەین و بیبەین بۆلای خۆمان لە سەرجەم عەرەبەکان جیا دەبینەوە، کوشتنی پیاوە گەورەکانی ئێمەی تێدایە، و ئەم پەیمانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە شمشێرەکان لە هەموو ڕوویەکەوە پەلامارمان بدەن، ئەگەر ئێوە ئارام دەگرن لەسەر ئەوە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ بگرنە خۆ و پەیمانی بدەنێ، پاداشتتان لای خوایە، ئەگەر دەترسن سبەینێ وازی لێ بهێنن ئەوا لە ئێستاوە وازی لێ بهێنن، ئەوە باشترە بۆ ئێوە لای خوای خۆتان، وتیان: ئەی ئەسعەد دەستت دوور بخەرەوە لێمان وەڵاهی بە هیچ جۆرێك واز لەم پەیمانە ناهێنین و بەکەمیشی نازانین].

دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لێ وەرگرتن و فەرمووی: (( أخرِجُوا إِلَيَّ منكم اثنَيْ عشَرَ نَقِيبًا يكونون على قَوْمِهم بم فِيْهم)). واتە: دوانزە لە نوێنەرانی خۆتان (نقباء) هەڵبژێرن و بیهێنن بۆلام تا ئەوان سەرکردەی قەومی خۆیان بن، دوانزە کەسەکەیان

---

(٤١٧) أخرجه: الحاكم (١٨١/١) وصححه ووافقه الذهبي.

بۆ هەڵبژارد کە نۆ کەسیان خەزرەجی بوون و سێ کەسیان ئەوسی بوون، (نوێنەری بەنی نەجار: ئەسعەدی کوڕی زوراره بوو) وە (نوێنەری کوڕانی بەنی سەلەمە: بەرائی کوڕی عەبدی کوڕی حەڕان بوو) وە (نوێنەری کوڕانی بەنی ساعیدە: سەعدی کوڕی عوبادە و مونذری کوڕی عومەر بوون) وە (نوێنەری کوڕانی بەنی زوڕەیق: (ڕافعی کوڕی مالیك بوو) وە (نوێنەری کوڕانی) بەنی حارثی خەزرەج: (عەبدوڵلا کوڕی ڕەواحە و سەعدی کوڕی ڕەبیع بوون) وە (نوێنەری کوڕانی بەنی عەوفی خەزرەج: عوبادەی کوڕی صامت بوو). وە (نوێنەری بەنی ئەشهەل: ئوسەیدی کوڕی حەضیر و ئەبو هەیثەم بوو) وە (نوێنەری کوڕانی بەنی عەمری کوڕی عەوف: سەعدی کوڕی خەیسمە بوو) وە یەکەم کەسیش (بەرائی کوڕی مەعرو) بوو کە دەستی خستە ناودەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەیعەت و یەکەم کەسیش بوو لەسەرجەم ئامادە بووانی موسوڵمانانی ئەوێ کە پەیمانیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هەموویان سەرجەم پەیمانیاندا بە پێغەمبەر ﷺ.

بەراء ﷺ دەڵێت: لەوێدا بووین شەیتان لەسەر تەپۆڵکەی (سەفای عەقەبە) (کە ئێمە لە دۆڵەکەیدا پەیمانەکەمان دا) بە گەورەترین دەنگێ کە گوێم لێ بوو هاواری کرد: هۆ کۆمەڵانی دابەزیوی ئەم شوێنە ئەوە بۆ ناچن بۆلای زەم کراوەکە ئەوەتا بێ ئاینەکان لەگەڵیدا کۆبوونەتەوە دژ بە ئێوە دەجەنگێن)[٤١٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (شەیتان لەو کاتەدا وتی: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش ئا ئەوە ئەوس و خەزرەجە پەیمان دەدەن بە محمد لەسەر شەڕکردن لەگەڵ ئێوەدا، کە ئەوەی وت موسوڵمانانی ئەوێ ترسان و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەو دەنگە نەتان ترسێنێت ئەوە (ئیبلیس)ی دوژمنی خوایە و.. هیچ کەسێك لەوانەی کە ئێوە لێی دەترسێن دەنگی ئەو نەگەیشتۆتە ئەوان)) و ئەوە شەیتانی عەقەبەیە، ئینجا (ئیزبی کوڕی ئوزەیبە) فەرمووی: گوێ بگرە ئەی دوژمنی خوا ڕۆژێك دەبێت دەستم واڵا بێت بۆت) دەفەرموێت: دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە ئێمەی فەرموو: ((بڵاوەی لێ بکەن و بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆتان))، هەر لەو کاتەدا (عوبادەی کوڕی صامت) وتی: سوێند بە وەی تۆی بەحەق ناردووە ئەگەر ویستت لێ بێت بە

---

(٤١٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٢٢/٣) وفي (الفضائل) (١٧٦٧) وقال محققه: إسناده صحيح، والحاكم (٦٢٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٥١٩/٩)، وابن حبان (٧٠١٢) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦٣).

شمشێرەکانمان هەڵدەکوتینە سەر کافرانی خەڵکی مینا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فەرمانم پێ نەکراوە بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆتان))، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ جێگاکانی خۆمان و تا بەیانی خەوتین کە بەیانیمان لێ بووەوە کۆمەڵانی قورەیش زۆر بوون هەڵیان کوتایە سەرمان و لێمان کۆبوونەوە و وتیان: ئەی کۆمەڵانی خەزرەج پێمان گەیشتووە کە ئێوە هاتوون بۆلای ئەم هاوەڵەمان، هەتاکو دەری بکەن لەناوماندا و پەیمانی بدەنێ سەبارەت بەوەی کە بجەنگن دژ بە ئێمە و باش بزانن، وەڵاهی هیچ کۆمەڵێك لە کۆمەڵانی عەرەب نییە کە ئێمە زیاتر ڕقمان لەی بێ کە شەڕ ڕووبدات لە نێوان ئێمە و ئەواندا لە ئێوە زیاتر (واتە: ئێمە لە هەموو کەس زیاتر ڕقمان لە ئێوەیە گەر ئەمەش بکەن، دیارە ڕقەکەمان زیاتر ئەستور تر دەبێت بەرامبەرتان) کە ئەو قسانەیان وت: هەندێ لە هاوبەش پەیداکارانی قەومی خۆمان کە ئاگایان لە بەیعەتەکە نەبوو هەستان. دەستیان کرد بە سوێند خواردن کە شتی وا هەر نەبووە و نەمان زانیوە.

کەعب ﷺ دەفەرموێت: ڕاستیشیان دەکرد ئەوان نە ئاگایان لێ بوو وە نەزانیشیان کە ئێمە چیمان کردووە و ئێمەی موسوڵمانانی ئامادە بووی عەقەبە هەندێکمان سەیری هەندێکمان دەکرد و پاشان کە پیاوانی قورەیش ویستیان هەستن و ئەوێ بەجێ بهێڵن، لەوێدا حەرثی کوڕی هیشامیان لە ناودا بوو کە دوو نەعلی تازەی لە پێدا بوو، منیش هەستام قسە بکەم و بابەتەکە بگۆڕم بە عەبدوڵلای کوڕی عەمرم وت: ئەرێ باوکی جابر لای خۆی تۆ یەکێکی لە پیاوە گەورەکانمان و ڕیش سپییەکیت لە ڕیش سپییەکانمان ناتوانێت دوو نەعلی تازە وەکو نەعلی ئەو گەنجە قورەیشییە بکڕیت و لەپێی بکەیت، کە حەرث گوێی لێ بوو هەردوو نەعلەکەی لەپێی خۆی داکەند و هەردووکی بۆ من فڕێدا و وتی: وەڵاهی دەبێت لەپێی بکەیت بەڵکو ئەمە گەشبینی بێت بۆمان، ئینجا باوکی جابر بە منی وت: ئەو گەنجەت بۆ تووڕە کرد نەعلەکانی بۆ بگێڕەرەوە، منیش وتم: وەڵاهی بە هیچ جۆرێك بۆی ناگێڕمەوە (گەشبینییە إن شاء الله) وتی: وەڵاهی گەشبینییەکەی ڕاست بێت ڕۆژێك دەبێت کە دەستکەوتی خۆم بێت (واتە: دەسکەوتەکەی بۆ من بێت لە شەڕدا ئەگەر بیکوژم)[٤١٩].

(٤١٩) أخرجه: أبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٧)،والطبراني في (الكبير) (١٩/٢٥٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٨٨٥): رواه الطبراني مرسلا وفيه إبتن لهيعة و حديثه حسن و فيه ضعف.

عورووەی کوڕی زوبێر ﷺ دەفەرموێت: (ئەم کۆمەڵە (واتە: سەرکردەکانی پەیمانی عەقەبە) سەرجەم کۆبوون لەسەر ئەوەی کە خوا ڕازی بکەن و هەموو ئەو مەرجانەی کە داویانە بە پێغەمبەر ﷺ جێ بەجێی بکەن و پێغەمبەر ﷺ سەربخەن، پاشان شکۆدارانە و سەرکەوتووانە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و خوای گەورە دوای ئەوە پەناگەیەکی بەدی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی)[٤٢٠].

## کۆچ کردن بۆ شاری مەدینە

پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە خوای گەورە شاری مەدینەی لەخەودا نیشان دابوو کە ئەوێ جێی کۆچ کردنی دەبێت.

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی خۆی وت: ((رَأَيْتُ فِي المَنَامِ أَنِّي أُهاجِرُ مِن مَكَّةَ إلى أَرْضٍ بها نَخْلٌ، فَذَهَبَ وهْلِي إلى أنَّها اليَمامَةُ، أوْ هَجَرُ، فإذا هي يَثْرِبُ))[٤٢١] واتە: لە خەومدا بینیم کۆچ دەکەم لە مەککەوە بەرەو خاکێك خورمای تێدایە خەیاڵم وا ڕۆیشت کە یەمامە یان هەجەر بێت، بەڵام (یثرب) بوو...).

وە لە عائیشەوە ﷺ دەفەرموێت: (ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ بە موسوڵمانانی فەرموو: ((جێگەی کۆچکردنی ئێوەم نیشان دراوە خاکێکی پڕ دارخورمایە لە نێوان دوو بەرزاییدایە))، ئینجا ئەوانەی لەوێ بوون و ئەم قسەیەیان بیست لە پێغەمبەر ﷺ کۆچیان کرد بەرەو شاری مەدینە لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەو وەصفەی بۆکردبوون و هەندێك لە پیاوە کۆچ کارەکانی حەبەشە گەڕانەوە و کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە...)[٤٢٢].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پیاوەکانی ئەنصار شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتن وئاینی ئیسلامیان قبوڵ کرد و موسوڵمان بوون وە پێغەمبەریان ﷺ سەرخست و پەیمانی سەرکەوتنی ئاینەکە و شوێن کەوتوانی ئەو ئاینەیان گرتە ئەستۆ هەندێ

(٤٢٠) أخرجه: أبو نعيم في (الدلائل) (٢٢٧)، والطبراني في (الكبير) (٢٥٠/١٩).

(٤٢١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٠٨١)، ومسلم (الصحيح) (٢٢٧٢)، والبغوي (٣٢٩٦)، والدارمي (١٢٩/٢)، وابن ماجه (٣٩٢٦)، وابن حبان (٦٢٧٦) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٤٢٢) أخرجه:عبدالرزاق (٩٧٤٣)، وأحمد (المسند) (١٩٨/٦)، والبخاري (٤٧٦،٥٨٠٧)، والحاكم (٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٦٢٧٧) قال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين، واللفظ له.

لە موسوڵمانەکان گەیشتنە ئەوێ (واتە: کۆچیان کرد بۆ مەدینە) دوای ئەو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانیدا، و ئەوانەی کە شوێن کەوتەی بوون لە موسوڵمانانی مەککە تا بڕۆن بەرەو شاری مەدینە کۆچ بکەن و بگەن بە برا تازەکانیان لە ئەنصار وە پێی وتن: (خوای گەورە برایانێکی تازە و جێگەیەکی تازەی بۆ دیاری کردوون لەوێ بەبێ ترس ئاینی خۆتان بەرقەرار بکەن) ئینجا کۆمەڵ کۆمەڵ بەرێکەوتن، وە پێغەمبەریش ﷺ لە شاری مەککە مایەوە و چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە لەلایەن خواوە ڕێگەی پێ بدرێت تا کۆچ بکات بەرەو شاری مەدینە)[٤٢٣].

## سەرەتایی کۆچکردن

یەکەم: ئەبو سەلەمەی مەخزومی ﷺ یەکەم کەس بوو کە کۆچی کرد لە شاری مەککەوە بۆ مەدینە: ئیبن و ئیسحاق دەفەرموێت: (یەکەم کەس کۆچی کرد لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە لە قورەیش بوو لەبەنی مەخزووم ئەبو سەلەمە کوڕی عەبدولئەسەد بوو کە ناوی عەبدوڵلا بوو کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە پێش ئەوەی پەیمانی عەقەبە بدرێت بە ساڵێك، ئەبو سەلەمە یەکێك بوو لەوانەی کە پێشتر کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە بەڵام کاتێ گەڕایەوە قوریش دیسان ئازاریاندا تا ئەمجارە بەناچاری هەوڵیدا کۆچ بکات بەرەو مەدینە)[(٤٢٤)].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو ئیسحاقی کوڕی یەسار بۆی گێڕامەوە لە ئوم سەلەمەوە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: کاتێ ئەبو سەلەمەی مێردم ویستی لە شاری مەککە دەرمان بکات و بمانبات بەرەو شاری مەدینە وشترەکەی بۆ ئامادە کردین و منی سوار پشتی کرد و سەلەمەی کوڕمی سوار کرد لەگەڵمدا و گرتمە باوەشم ڕەشمەی وشترەکەی گرتم تا کۆچ بکەین بەرەو مەدینە کاتێ پیاوەکانی کوڕانی بەنی موغیرەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەخزووم (واتە: خزمانی ئوم سەلەمە) بەمەیان زانی هەستان بۆی وتیان: ئەوە تۆ هیچ دەسەڵاتمان نییە بەسەرتا بەڵام چۆن دەهێڵین ئەم ئافرەتەی قەومی خۆمان وڵاتەو وڵاتی پێ بکەیت، ئینجا ڕەشمەی وشترەکەیان لەدەست سەند و منداڵەکەیان گێڕایەوە بۆ ئوم سەلەمە

(٤٢٣) أنظر: سيرة ابن هشام (٦٦/٢).

(٤٢٤) انظر: سيرة ابن هشام (٦٧/٢).

لەلایەکی ترەوە کوڕانی بەنی ئەسەدی خزمانی ئەبو سەلەمە ئەمەیان بینی وتیان: نەخێر وەڵاهی بەهیچ جۆرێك نایەڵین کوڕەکەمان لای ئەو ژنە بێت، دوای ئەوەی لە مێردەکەیتان سەندەوە، ئینجا کوڕانی بەنی سەلەمە لەگەڵ خزمانی هەردوولامان کەوتنە ڕاکێشانی منداڵەکە، تا دەستیشی دەرچوو ئەوە بوو کوڕانی بەنی ئەسەد بەو شێوەیە دەستی مناڵەکەیان لە جێ برد وەلێیان سەندمەوە و بردیانەوە بۆ خۆیان وە کوڕانی بەنی موغیرەش منیان لای خۆیان بەند کرد و ئەبوسەلەمەی مێردم کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، بەم شێوەیە منداڵیان لێ کردم و دووریان خستینەوە لەیەکتری و منیش هەموو ڕۆژێك لەبەرە بەیاندا لە (ئەبطحی) ئەوپەڕی شاری مەککە دادەنیشتم و بەردەوام دەگریام و بەوشێوەیەش ماوەی ساڵێك تێپەڕی، تا پیاوێك لە ئامۆزایانی خۆم کەلەپیاوانی بەنی موغیرە بوو بەلامدا تێپەڕی و بینی چەندە حاڵم پەریشانە و بەزەیی پیامدا هاتەوە و بەکوڕانی موغیرەی وت: ئایا ئەم داماوە بۆ ئازاد ناکەن لەناوتاندا منداڵەکەی و مێردەکەیتان لێدوور خستۆتەوە پاشان ئەوان وتیان: بڕۆرەوە بۆلای مێردەکەت گەر پێت خۆشە.

پاشان دەفەرموێت کوڕانی عەبدولئەسد کەئەمەیان بینی کوڕەکەیان گێڕایەوە بۆلام و منیش وشترەکەم ئامادە کردو کوڕەکەشم خستە باوەشمەوە و سواری بووم بەرەو شاری مەدینە بچم بۆلای مێردەکەم و هیچ کەسێك لە دروست کراوانی خوام لەگەڵدا نەبوو لەو سەفەرەدا بەڵام دەموت هەرکەسم پێگەیشت لە ڕێگادا هەتا ئەو ماوەیەی لەگەڵمدایە لەگەڵیاندا دەبم، هەتا گەیشتمە ئەوپەڕی شاری مەککە لەوێ عوسمانی کوڕی ئەبو طەلحەم پێگەیشت، لە کوڕانی عەبددار بوو پێی وتم ئەوە بۆ کوێ دەچیت ئەی کچەکەی ئەبوئومەیە؟ منیش وتم: ئەمەوێ بچم بۆلای مێردەکەم بۆ مەدینە، وتی: کەست لەگەڵدایە؟ وتم نەوەڵا تەنها کوڕەکەم نەبێت، ئەویش وتی: وەڵاهی وازت لێناهێنم ئینجا ڕەشمەی وشترەکەی گرت و لەگەڵمدا هات و بەڕێکەوتین دەفەرموێت وەڵاهی لەژیانمدا هاوەڵدارێتی پیاوێکم نەکردووە لە ئەبو طەڵحە بەڕێزتر بێت، کە دەگەیشتینە شوێنی حەوانەوەمان وشترەکەمی یەخ دەداو لێم دووردەکەوتەوە، پاشان دادەبەزیم دەڕۆیشتمە شوێنێك و پشووم دەدا ئەویش دوای ئەوەی کەمن دەڕۆیشتم وشترەکەمی دەهێنا و دەیبرد ئاوی دەدا و ئاڵفی پێ دەدا، و دەچوو لە شوێنێکی دوورەوە لای دارێك پشووی دەدا و کاتێ وەختی بەجێ

هێشتنی ئەو شوێنە بهاتایە دەهات وشترەکەی هەڵدەستاندم وە کۆپان و شتەکانی لێدەبەست و ئامادەی دەکرد و پەخی لێدەدا و دووردەکەوتەوە لێم تاکو سوار دەبووم، پاشان دەهات و ڕەشمەی وشترەکەی دەگرت و بەو شێوەیە تا گەیشتینە شاری مەدینە لای کوڕانی بەنی عەمری کوڕی بەنی عەوف لە قوبا کە گەیشتینە قوبا عوسمان بەمنی وت: مێردەکەت لەم دێیەیە، چونکە ئەبو سەلەمەش هەر لەوێ دابەزی بوو، یەکەمجار ئینجا لەوێ خواحافیزی لێ کردم و ئەو گەڕایەوە بەرەو شاری مەککە و (ئوم سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: وەڵاهی بەردەوام ئەمەم دەگێڕایەوەو دەم وت ئەوەی خوای گەورە تووشی خێزانی ئەبو سەلەمەی کردووە لە پێناوی ئیسلامدا تووشی هیچ خێزانێکی تری نەکردووە و هیچ هاوەڵێکی بەڕێزترمان نەدیوە لە عوسمانی کوڕی ئەبو طەڵحە)[٤٢٥].

دووەم: کۆچ کردنی عومەری کوڕی خەطاب لەگەڵ عەیاشی کوڕی ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاص:

بەسەرهاتی کۆچ کردنی ئیمامی عومەر ﵁ خۆی بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: کاتێ ویستمان کۆچ بکەین بۆ مەدینە من و عەیاش و هیشام جێگەیەکمان دانا ناوی (التناصب) بوو لای جۆگەکەی کوڕانی بەنی غیفار لای (غدیر) ەوە وتمان دەبێ هەمووومان بگەینە ئەوێ ئەو کەسەش بەرەبەیان نەگەیشتە ئەوێ دیارە بەندکراوە و ماوەی نەدراوە کۆچ بکات و ئەوانی تریش لەسەر ئەوان نەوەستن و بڕۆن، دەفەرموێت من و عەیاش گەیشتینە ئەوێ و هیشام نەهات و زانیمان گیراوە و بواری پێنەدراوە ئێمەش بەڕێکەوتین بەرەو مەدینە.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: بیست کەسێکیان لەگەڵدا بوو. گەیشتینە لای کوڕانی بەنی عەمری کوڕی بەنی عەوف لە قوبا لە نزیك شاری مەدینە لاماندا و، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە هێشتا مابووەوە و کۆچی نەکردبوو کاتێ ئەبو جەهل بەمەی زانی لەگەڵ حەرثی برایدا ئەوان لە شاری مەککە هەستان هاتن بۆ شاری مەدینە تا عیاش بگێڕنەوە، چونکە عیاش ئامۆزای هەردووکیان بوو وە زڕبرای هەردووکیان بوو، کاتێ هاتنە شاری مەدینە قسەیان لەگەڵدا کرد و وتیان:

---

(٤٢٥) أخرجه: ابن اسحاق (٦٧/٢) وقال الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٥٠/٣)رجاله ثقات، وقال العمري في (السيره الصحيحة) (٢٠٤/١) إسناده صالح للاعتبار.

دایکت نەزری کردووە کە قژی داناهێنێت بە هیچ جۆرێك، وە ناچێتە ژێر هیچ سێبەرێکەوە و خۆی ناپارێزێت لە ڕۆژ تا تۆ نەبینێت، ئەویش دڵی نەرم بوو بۆی و ئیمامی عومەر ﷺ وتی: ئەی عیاش وەڵاهی ئەمانە دەیانەوێت تۆ بەرنەوە و بە فیتنەت بەرن لە ئاینەکەتدا، خۆت بپارێزە لێیان وەڵاهی ئەگەر دایکت ئەسپێ زۆری بۆ بهێنێت ناچار دەبێت کە قژی دابهێنێت وە ئەگەر خۆر تینی بۆ بهێنێت ناچار دەبێت کە بچێتە ژێر سێبەرەوە.

عیاش ﷺ وتی: دەچمەوە بۆ ئەوەی سوێندەکەی دایکم نەخەم وە هەندێ پارەشم هەیە لەوێ کۆی دەکەمەوە، عومەر ﷺ وتی: خۆت دەزانی من یەکێکم لە وانەی کە پارەم زۆرە لە قورەیشدا ئەوە نیوەی ماڵەکەم بۆ تۆ و مەگەڕێرەوە لە گەڵیاندا. دەفەرموێت بەگوێی نەکردم هەر بەلایەوە باش بوو لەگەڵ ئەو دووانە بگەڕێتەوە، دوای ئەوە من پێم وت: بەڵام ئەگەر وا دەکەیت ئەم وشترەی من ببە لەگەڵ خۆت چونکە وشترێکی چالاك و وریایە و خێرایە و لەسەر پشتی دانەبەزیت، ئەگەر شتێکت بینی لەم دووانە یەکسەر لەسەری خۆت ڕزگار بکە و بگەڕێرەوە، دەفەرموێت لەگەڵیاندا دەرچوو تا لە نیوەی ڕێگا ئەبوجەهل پێی وت: وەڵاهی براکەم واتە: (چونکە زڕ برایەتی) وشترەکەم پەکی کەوتووە و ناتوانێت بڕوات ئەوە بۆ سواری پشتی وشترەکەی خۆتم ناکەیت؟

ئەویش وتی: باشە کاتێ وشترەکەی یخ لێدا و دابەزی و هەردووکیان وشترەکە یان یخ لێدا بۆ ئەوەی ئەبو جەهل سوار بێت بەڵام یەکسەر هەڵیان کوتایە سەری و گرتیان و بەستیانەوە، پاشان پێش خۆیاندا و بردیانەوە بەرەو مەککە، دەفەرموێت خوای گەورە لەو کەسانەی کەبەدەستی خۆیان وایان کرد لە خۆیان بە هیچ جۆرێك تۆبە و کاری چاکەیان لێوەرناگرێت، چونکە ئەوانە کەسانێکن خوای خۆیان ناسیوە و بەڵام گەڕاونەتەوە بۆ کوفر لە سەر بەڵایەکی کەم، دەفەرموێت ئەمانەمان بەوان وخۆشمان دەوت بەڵام کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە و لەوێ دابەزی ئەوەمان بۆ گێڕایەوە و خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾(الزمر) واتە: (ئەی پێغەمبەر بەو بەندانە بڵێ کە لەگوناه و تاوان ڕۆچوون، لەو گوناهانەی نەفسیان داوایان لێکردوون، لەبەزیی و میهرەبانی خودا نا ئومێد نەبن، خودا لەهەموو گوناهەکانیان خۆش

دەبێت، کە پەشمان بن لێ، بەراستی خودا زۆر لێبوردە و میهرەبانە بۆیان). ئیمامی عومەریش ﷺ دەفەرمویێت: منیش ئەم ئایەتەم بەدەستی خۆم لە پارچە کاغەزێکدا نووسی و ناردم لای هیشامی کوڕی عاص، هیشام دەفەرموێت: کاتێ کە ئەو پارچە کاغەزەی عومەرم پێگەیشت دەمخوێندەوە لە (ذی طوا) لە دۆڵەکەی ئەو پەڕی شاری مەککە دۆڵ بە دۆڵ هەر دەرۆیشتم دەم خوێندەوە و دەمویست بزانم ئەوە چییە و هەر لێی تێنەدەگەیشتم وتم: خوایە تێم بگەیەنە ئەم ئایەتە باسی چی دەکات ئەوە بوو خوای گەورە خستییە دڵمەوە کە ئەم ئایەتە باسی تاوانەکەی من دەکات، چونکە من لێرە ماوم و کۆچم نەکردووە دوای ئەوە منیش وشترەکەم ئامادە کرد و لە سەری دانیشتم و گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ وە کۆچم کرد بۆ شاری مەدینە)[٤٢٦].

هەروەها ئیبنو ئەسیر ﷺ دەیگێڕێتەوە بە سەنەدێکی (لاواز) کە ناکرێت بە بەڵگە سەبارەت بە چۆنیەتی کۆچکردنی ئیمامی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (عومەری کوڕی خەطاب چەکی لەخۆی بەستووە و تەوافی کردووە بە چوار دەوری کەعبەدا، وە هەڕەشەی کردووە لە قوریش و وتوویەتی: هەر کەسێك پێی خۆشە دایکی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات یان ژنەکەی بێوە ژن بکەوێت و منداڵەکانی هەتیو بکەون، ئەگەر ئازایە با بێت بۆ ئەو دۆڵەو با دوام بکەوێت [٤٢٧]، لەو کاتەدا هەندێ لە موسوڵمانە چەوساوەکان شوێنی دەکەون و کەسیش ناوێرێت شوێنیان بکەوێت) بەم شێوەیە هاوەڵە کۆچکارە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەوە پەیتا پەیتا و تاقم تاقم و دانە دانە دەگەیشتنە شاری مەدینە.

بەرائی کوڕی عازب ﷺ سەبارەت بە هاتنی یەکەم کۆچکاران دەفەرموێت: (یەکەم کەس کە هات بۆ لامان لە کۆچکاران (المهاجرين) بۆ شاری مەدینە موصعەب بوو پێمان وت پێغەمبەر ﷺ چی دەکات؟ وتی: هەر لە جێی خۆیەتی و هاوەڵانیشی بەردەوام دێن بەرە و مەدینە، بەراء ﷺ دەفەرموێت: دوای ئەوە عەمری کوڕی ئوم

(٤٢٦) أخرجه: ابن جرير في (جامع البيان) (٣٠١٨٢) و (الحاكم ٤٣٥/٢) وصححه على شرط مسلم، والبيهقي (الدلائل) (٤٦١،٤٦٢/٢)، والبزار (١٧٤٦)، وابن هشام (السيرة) (٧١/٢) برقم (٣٣٢،٣٣٤) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في المجمع (٦٤/٦): رواه البزار ورجاله ثقات، وقال الحافظ في (الأصابة) (٦٠٤/٣) (٨٩٦٥): أخرجه: ابن السكن بإسناد صحيح، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٩٩٢) حديث حسن.

(٤٢٧) أخرجه: ابن الأثير في (اسد الغابة) (٥٢/٤)، وقال الشيخ الألباني في:(دفاع عن الحديث و السيرة) (ص:٤٣) في سنده ثلاثة مجاهيل، (ئەم ڕیوایەتە تەنها بۆ زانیاریت هێناومە).

مەکتومی نابینا هات و پێمان وت: هەواڵ چییە؟ وە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی چی دەکەن؟ وتی: ئەوان بەردەوام دێن، دەفەرموێت: دوای ئەوە عەماری کوڕی یاسر و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و بیلال هاتن بۆ لامان، پاشان عومەر هات لەگەڵ بیست سوار گەیشتنەلامان، پاشان دوای هەرهەموویان (پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویستمان ﷺ هات لەگەڵ ئەبو بەکر)[٤٢٨].

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (دوا بە دوای ئەو هەموو هاوەڵانە هاوەڵی پایە بەرز ئەبو بەکری صدیق ﵁ هات داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە مۆڵەتی بدات تا ئەویش کۆچ بکات بۆ مەدینە، و خۆشی ئامادە کردبوو بەڵام پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد کە کۆچ نەکات و بمێنێتەوە فەرمووی: ((عَلَى رِسْلِكَ، فإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُؤْذَنَ لِي))[٤٢٩] واتە: چاوەڕێ بکە هیوام وایە کە ڕێگەم پێ بدرێت تا کۆچ بکەم).

## پیلانی (دار الندوة)

ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: (کاتێ قوڕەیش زانیان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لایەنگریان بۆ دروست بووە لە شارێکی تردا جگە لە شاری مەککە و دەرچوونی هاوەڵانیان بینی و کۆچ کردنیان بۆ مەدینە)، ئینجا ئەوان زانییان کە ئەوانە دابەزیونەتە جێگەیەك و هێزو توانەیەکیان بۆخۆیان دروست کردووە، ئەوان ترسان لەوەی کە پێغەمبەریش ﷺ بەرەو ئەوێ بکەوێتە ڕێ هەر بۆیە لە خانوەکەی قوصەی کوڕی کیلابدا کۆبوونەوە، قوڕەیش هیچ کارێکی گرنگیان ئەنجام نەدەدا تەنها لەو خانووەدا نەبێت، لەوێ ڕاوێژیان دەکرد کە چی بکەن سەبارەت بەکاردانەوەیان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ، وە دەترسان کە پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکات، بۆیە ئەوان کۆبوونەوە بۆ ئەو مەسەلەیە لەوڕۆژەی کە خۆیان دیارییان کردبوو کە پێیان دەوت: (ڕۆژی زەحمەت) ئیبلیس ئەو ڕۆژەدا لە شێوەی پیاوێکی بەساڵا چوو کە پاڵتۆیەکی لەبەردا بوو وەستابوو لەبەردەم دەرگای (دار الندوة)دا کە کاتێ ئەوان هاتن و بینییان ئەو پیاوە ڕیش سپییە لەبەردەم دەرگاکەدا وەستاوە پێیان وت: ئەم پیاوە ڕیش سپییە کێیە؟. ئەویش لە وەڵامدا وتی: ڕیش سپییەکی خەڵکی (نەجدە)م گوێم لەو

(٤٢٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٤٣٩/٣٦)، ومسلم (الصحيح) (٢٠٠٩)، وأحمد (المسند) (٢/١)، وابن أبي شيبة (٣٢٧/١٤)، والبيهقي (الدلائل) (٤٨٤/٢)، وابن حبان (٦٢٨١).

(٤٢٩) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٠٥).

بڕیارە بوو کە دەتانەوێت بیدەن لەو کۆبوونەوەیەدا و ئامادەم لەگەڵتاندا بەڵکو ئامۆژگارییەکی بەسودتان پێ بگەیەنم، وتیان: بەڵێ فەرموو وەرە ژوورەوە ئینجا چوونە ژوورەوە.

(سەرکردە و ناودارانی هەموو لایەنەکانی قورەیشی تیادا کۆبووبوەوە و نوێنەرانی کوڕانی عەبدول شەمس: عوتبە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بوون، لەبەنی نەوفەل: عەبد مەناف و طعمە کوڕی عودەی و جوبیری کوڕی موطعیم و حارثی کوڕی عامری کوڕی نەوفەل بوو، لە کوڕانی بەنی عەبدل داری قوصەی: نضری کوڕی حارثی کوڕی کلدە، و لە کوڕانی بەنی ئەسەدی کوڕی عبدالعزی: ئەبو بوختەری کوڕی هیشام و زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موطەلب و حکیم کوڕی حوزام، لەبەنی مەخزوم: ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، لە بەنی سەهم مونەبە و نەبیهی کوڕانی حەجاج، لەبەنی جومەح: ئومەیەی کوڕی خەلەف) و لەگەڵ هەندێك کەسانی تر کە بەقورەیشی نەدەژمێردران هەندێکیان بە هەندێکیان وت: وەڵاهی ئێمە متمانە بەوە ناکەین هاوپەیمانانی ئەو شوێنە هەڵنەکوتنە سەرمان با کۆبوونەوەیەك بکەین و ڕایەك دەربڕین و ڕاوێژ بکەین یەکێکیان وتی: با بەندی بکەین بە ئاسن و دەرگای لەسەر دابخەین و چاوەڕێی مردنی بکەین ئەو مردنەی کە هاوشێوەی شاعیرانی پێشتر چاوەڕێیان دەکرد وەك نابیغە و زوهەیر و ئەوانەی پێش خۆیان کە بەو دەردە ڕۆیشتوون ئێمە با بەندی بکەین هەتا ئەوەی دەمانەوێت بەرامبەری ئەنجامی بدەین.

ڕیش سپییە نەجدییەکە وتی: نەخێر وەڵاهی ئەمە ڕاو بۆچوون نییە، وەڵاهی ئەگەر ئێوە بەندی بکەن هەواڵەکەی لە پشتی دەرگاکەوە دەردەچێت کە ئێوە لە سەرتان داخستووە و دەگات بە هاوەڵانی و ئەوەندەی پێناچێت هاوەڵانی هەڵدەکوتنە سەرتان و دەری دێنن لە ژێر چنگتاندا، و پاشان ژمارەیان زۆر دەبن و زاڵ دەبن بەسەرتاندا ئەمە ڕاو بۆچوون نییە، بیر لە ڕایەکی تر بکەنەوە.

ڕاوێژیان کرد و یەکێکی تریان وتی: دەری دەکەین لە ناوماندا و دووری دەخەینەوە لە وڵاتماندا، کە دوور کەوتەوە بەلامانەوە گرنگ نییە بۆ هەر جێیەك بچێت و کێ بیگرێتە خۆی ئەوجا دوور دەبێت لێمان و لە ناڕەحەتی ئەو بە دوور

دەبین ئینجا بە خۆماندا دەچینەوە و سەر قاڵ دەبین بە ئیش و کاری خۆمانەوە، ڕیش سپییە نەجدییەکە وتی: نەخێر وەڵاهی ئەمە ڕاو بۆچوون نییە نابینن جوانی قسەکانی و شیرینی وتەکانی زاڵ دەبێت بەسەر دڵی پیاواندا بەو شتەی پێی هاتووە کە قورئانە، وەڵاهی ئەگەر ئێوە ئەوە بکەن من لەوە ئەمین نیم کە بچێتە لای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب و زاڵبێت بەسەریاندا بەوقسە و وتانەی تا هەمووان شوێنی دەکەون و ئینجا هەڵدەکوتنە سەرتان و فەرمانڕەوایتان لەژێر چنگ دەردەکەن وە زاڵ دەبن بەسەرتاندا و ئەوەی خۆیان پێیان خۆشە دەیکەن بەرامبەرتان، نەخێر ڕایەکی تر بدۆزنەوە.

پاشان ئەبو جەهل وتی: من ئێستا ڕایەکم هەیە بەرامبەری باوەڕناکەم تا ئێستا کەس ئەو ڕایەی هەبوو بێت وتیان: چییە ئەی ئەبوحەکەم؟ وتی: من وای بەباش دەزانم لەهەر هۆزێك گەنجێکی ناوداری ئازا هەڵبژێرن و هەر یەکێ لەو گەنجانە شمشێرێکی تیژی بدەنە دەست وە بەیەکجار بە هەمووتانەوە ڕووی تێ بکەن بیکوژن، و ئەو کات خوێنەکەی بڵاودەبێتەوە بەناو هەموو عەشیرەتەکاندا ئەوجا ڕزگارمان دەبێت، ئەگەر خوێنەکەشی بڵاوبوویەوە کوڕانی بەنو عەبدل مەناف ناتوانن بجەنگن دژ بە سەرجەم خزمانیان ناچارانە ڕازی دەبن بە خوێنەکەی و ئێمەش خوێنەکەی دەدەین و کۆتایی پێ دێت.

ڕیش سپییەکە وتی: قسەی تەواو ئەم قسەیەیە کە ئەم پیاوە کردی ئەمە ڕاو بۆچوونە لە هەموو ڕاو بۆچوونەکانی تر چاکترە، ئینجا بڵاوەیان لێ کرد و سوربوون لەسەر ئەنجامدانی ئەو ڕاو بۆچوونە و ئەو پێشنیارەی کە ئەبوجەهل کردی هەموویان کۆبوون کە ئەنجامی بدەن، هەر ئەو ڕۆژە جبریل عليه السلام هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وەپێی ڕاگەیاند و فەرمووی: ئەو جێگەیەی ئەمشەو تێیدا دەخەوێت تیایدا مەمێنەرەوە بەجێی بهێڵە و کۆچ بکە)[٤٣٠].

---

(٤٣٠) أخرجه: ابونعيم في (الدلائل) (١٥٤)، وابن جرير في (التاريخ) (٣٧/٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٦٨/٢)، وابن هشام في (السيرة) (٧٩/٢) (٣٤٠) وقال محققه:إسناده جيّد، وقال محقق الارناؤوط (زاد المعاد) (٥٠/٣): رجاله ثقات، وأخرجه مختصراً: عبد الرزاق (٣٨٩/٥) (٩٧٤٣)، والطبراني في (الكبير) (١٢١٥٥)، وأحمد (المسند) (٣٤٨/١) (٣٢٥١) وقال الأرناؤوط في تحقيقه:إسناده ضعيف، وحسن إسناده الحافظ ابن كثير في (البداية) (١٨١/٣)،والحافظ ابن حجر في (الفتح) (٣٠٠/٧)واللفظ لابن هشام و أبي نعيم.

## کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە

(دوای سیانزە ساڵ مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککە[(٤٣١)] دواجار خوای گەورە ڕێگەیدا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە کۆچ بکات) دوای ئەو هەموو ناڕەحەتی و تەنگ پێهەڵچنینەی کافرەکان ئەنجامیان دەدا بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ، ئینجا خوای گەورە ڕێگەیدا کە کۆچ بکات بەرەو شاری مەدینە و مەککە بەجێ بهێڵێت، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدرا کە کۆچ بکات وە ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی:﴿ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾ ﴾ (الإسراء)[(٤٣٢)]. واتە: (ئەی موحەممەد! بڵێ: پەروەردگاری من! لە هەر جێگایە هەم و، هەر کارێکم بەدەستەوە بێ، هاوکاریی و یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی، تا بەڕاست و ڕاستانە بتوانم ئەنجامی بدەم، بەڕاست و سەرفرازانەش لەوجێگایەدا بەرێم بکە. هێزێکی پشتیوان و یارمەتی دەریشم بۆ دیاری بکە).

ئەم کۆچ کردنەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕاوێژی جبریل ﷺ وە لەسەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار هاوەڵی بەرێزی ئەبوبەکری صدیقی ﷺ لەگەڵ خۆیدا برد.

ئیمامی عەلی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بە جیبریلم وت کێ لەگەڵمدا بێت لە کۆچکردنەکەمدا؟ جبریل ﷺ فەرمووی: ئەبوبەکر[(٤٣٣)].

ئەبوبەکر ﷺ پێش چوار مانگ بەر لە کۆچ کردن دوو وشتری چاکی ئامادە کردبوو بۆ ئەو ڕێگە دوورەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەیبڕێت وە بەوردی خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەم سەفەرە درێژە.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو بەکر خۆی ئامادە کرد تا کۆچ بکات بەرە و مەدینە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: لەسەر خۆبە من هیوام وایە کە ڕێگەش بە من بدرێت، ئەبو بەکر ﷺ وتی: هیوات بەو شێوەیە دایك و باوکم بەفیدات بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەبو بەکر خۆی هێشتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ

(٤٣١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٨٥١).

(٤٣٢) أخرجه: الترمذي (السنن) (٣١٣٩)، والحاكم (المستدرك) (٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، و ضعف إسناده الشيخ الألباني في (ضعيف سنن الترمذي) (٣١٣٩)، (لاوازە تەنها بۆ زانیاریت هێناومە).

(٤٣٣) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٥/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

لە کۆچەکەیدا وە دوو وشتری هەبوو کە چوار مانگ گەڵای درەختی سوممەری پێ دەدا و دابەستەی کردبوون)[٤٣٤].

هەر لە عائیشەوە ﷺ دەفەرمویێت: (هیچ ڕۆژێك نەبووە پێغەمبەر ﷺسەردانمان نەکات لە بەیانیاندا یان لە ئێواراندا، ڕۆژێکیان ئێمە لە ماڵەوە دانیشتبووین لە گەرمایی خۆردا (دوای نیوەڕۆ)[٤٣٥] یەکێ بە ئەبوبەکری وت: ئەوە پێغەمبەر ﷺ وا بەرەو ئێرە دێت و دەم و چاوی داپۆشیوە، لە سەعاتێکدا هات بۆ لامان کە هەرگیز عادەتی وا نەبوو لەو کاتەدا بێت و سەردانمان بکات، ئەبوبەکر ﷺ وتی: دایك و باوکم بە فیدای بێت وەڵاهی کارێکی زۆر گرنگ وای لێکردووە لەم سەعاتەدا سەردانمان بکات، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئیزنی وەرگرت و هاتە ژوورەوە و بە ئەبوبەکری فەرموو: (أَخرِجْ مَن عندَك) واتە: ئەوانەی لەلاتن بیانکە دەرەوە، ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەوانە خێزانی خۆتن (واتە: عایشەی تیایە کە خێزانی خۆتە)[٤٣٦] دایك و باوکم بە فیدات بێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أشَعَرْتَ أنِّي قدْ أُذِنَ لِي الخُرُوجِ)) واتە: ئایا زانیوتە کە ڕێگەم پێ دراوە بۆ دەرچوون، ئەبو بەکر فەرمووی: منت لەگەڵدام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ)[٤٣٧].

لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو هیشامدا ﷺ (عائیشە ﷺ دەفەرمویێت: وەڵاهی هەرگیز نەمزانیوە پێش ئەو ڕۆژە کە مرۆڤ هەیە لە خۆشیدا بگری، دوای ئەوە کە بینیم فرمێسك لە چاوی ئەبوبەکر هاتە خوارەوە لە خۆشی هاوەڵدارێتی پێغەمبەر ﷺ)[٤٣٨]، پاشان ئەبوبەکر لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو وشترم هەیە هەر لەمەو پێش ئامادەم کردووە بۆ دەرچوون] باوکم بە فیدات بێت یەکێ لەو وشترانە بۆ تۆ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی[٤٣٩]: ((قَدْ أخَذْتُهَا بِالثَّمَن))[٤٤٠]

---

(٤٣٤) أخرجه: البخاري (٣٩٠٥).

(٤٣٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٦٠٧٩).

(٤٣٦) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٥٨٠٧).

(٤٣٧) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٠٩٣).

(٤٣٨) انظر: سيرة ابن هشام (٨٢/٢) (٣٤٤)، والطبراني في (التاريخ) (٣٧٧/٢).

(٤٣٩) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٠٩٣).

(٤٤٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٠٣٨).

واتە: بەنرخەکەی خۆیان وەری دەگرم) (واتە: تا ببێت بە موڵکی من) عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ئینجا ئەبو بەکر [یەکێك لە دوو وشترەکەی کە (جدعاء) بوو دایە دەستی پێغەمبەر ﷺ] وە ئێمە ئامادەمان کرد بە ئامادەکردنێکی یەکجار خێرا و سفرەیەکمان بۆ دروست کردن بۆ ئەوەی کە خواردنەکەی تێ بکەن)(٤٤١).

ئەسماء ﵂ دەفەرموێت: (کە پێچامانەوە هیچ شتێکمان بەدی نەکرد بۆ بەستنی سفرەکە و مەشکە ئاوەکە، ئینجا من بە ئەبوبەکرم وت: وەڵاهی هیچ شتێك شك نابەم تەنها ئەو پشتێنە نەبێت لە پشتمدایە، ئەویش وتی: پشتێنەکەت بکە بە دوو کرتەوە و یەکێکیان دەمی مەشکەکەی پێ ببەستەو ئەوی تریان سفرەکەی پێ ببەستە، منیش بەو شێوەیەم لێکرد، عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ئەسماء پارچەیەك لە پشتێنەکەی دەمی مەشکەکەی پێ بەست و ئەوی تریان سفرەکەی پێ‌بەست بۆیە ناوی لێنرا خاوەنی دوو پشتێنەکە (ذات النطاقين)، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکردا هەر لەو کاتەوە لەگەڵ پیاوێکی (بەنی دەیل) دابوون کە کابرایەکی زۆر چالاك بوو ڕێگەناس بوو، وە لەسەر ئاینی کافرانی قورەیش بوو، بەڵام ئەمین بوو وە کردیان بە ڕێنیشاندەری ڕێگەکەیان وە هەردوو وشترەکەیان پێ سپارد و بە کرێیان گرت و کاتیان بۆ دانا کە دوای سێ ڕۆژی تر لە نزیك ئەشکەوتی (ثور) بەدوو وشترەکەوە ئامادە بێت بۆ بردنی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر بۆ کۆچ کردنەکە)(٤٤٢).

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی کە لە جێگاکەیدا بخەوێت تا ئەو شتانەی کەلەلای پێغەمبەر ﷺ بوو بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی)(٤٤٣)، کاتێ پێغەمبەر ﷺ جێگەکانی بینین و هەستی پێکردن بە ئیمامی عەلی ﵁ فەرموو: ((نَمْ عَلَى فِرَاشِي وَتَسَجَّ بِبُرْدِي هَذَا الْحَضْرَمِيِّ الْأَخْضَرِ، فَنَمْ فِيهِ، فَإِنَّهُ لَنْ يَخْلُصَ إِلَيْكَ شَيْءٌ تَكْرَهُهُ مِنْهُمْ)). واتە: (لە جێگەکەی مندا بخەوەو عەبا سەوزەکەشم بدە بەسەر خۆتدا و مەترسە هیچ شتێك لەوانەوە ناگات بەتۆ کە تۆ پێت ناخۆش بێت). دەفەرموێت: پێشتر کە پێغەمبەر ﷺ دەخەوت ئەو عەبا سەوزەی دەدا بە خۆیدا)(٤٤٤).

(٤٤١) أخرجه: البخاري (٤٠٩٣).

(٤٤٢) أخرجه: البخاري (٢٩٧٩)، وقال الحافظ في الاصابة (٢٣٠/٤)، وأخرجه: ابن سعد بسند صحيح.

(٤٤٣) أخرجه: البيهقي في (الكبرى) (١٢٩٦٥).

(٤٤٤) أخرجه: ابو نعيم في (الدلائل) (١٥٤)، والطبري في (التاريخ) (٣٧/٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٨٦/٢)، وابن هشام في (السيرة) (٧٩/٢) رقم (٣٤٠) وقال محققاه: (إسناده جيد من طريق البيهقي).

بەم شێوەیە پێغەمبەرﷺ ئیمامی عەلی ﷺ لەجێی خۆی دانا بەمەبەستی ئەوەی کە کافرەکان ئاگادار نەبن لە دەرچوونی هەروەها بەمەبەستی گێڕانەوەی ڕاسپاردەکان (الامانات) بۆ خاوەنەکانیان.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کە تاریکایی شەو داهات ئەو نوێنەرانەی قوڕەیش هەڵیان بژاردبوون بۆ پیلانەکەیان دژ بە پێغەمبەر ﷺ هەر هەموویان هەڵیان کوتایە نزیك ماڵی پێغەمبەر ﷺ و لە دەرگاکەوە چاودێری ماڵەکەیان دەکرد، تا بزانن چی دەکات وەکەی دەخەوێت بۆ ئەوەی بچنە سەری و بیکوژن.

عەبدل ڕەحمانی کوڕی عەویمی کوڕی ساعیدە دەفەرموێت: (هەندێ لە خزمانم لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە بۆیان گێڕامەوەکە، پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە دەرچووە و عەلی لەجیاتی خۆی دانا بۆ ئەوەی کە چی ئەمانەتی لایە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی، ئەویش بە سێ ڕۆژ هەمووی گەڕاندنەوە بۆ خاوەنەکانیان دوای ئەوە کە تەواو بوو بەڕێکەوت بە دوای پێغەمبەردا ﷺ وە کۆچی کرد بەرەو شاری مەدینە)[٤٤٥].

بەم شێوەیە کافرەکان ئابڵوقەی ماڵی پێغەمبەریاندا ﷺ وە پێغەمبەر ﷺ ئیمامی عەلی لە جێی خۆی دانا ئینجا کەوتە ڕێ بەرەو ئەشکەوتی (ثور).

محمدی کوڕی کەعب ﷺ دەفەرموێت: (کە کۆبوونەوە بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ماڵەکەیدا ئەبو جەهل بە هاوەڵەکانی تری وت: محمد گومانی وایە گەر ئێوە شوێنی ئاینەکەی بکەون کە پێی هاتووە پاشەڕۆژ دەبن بە پاشای عەرەب و عەجەم، پاشان زیندو دەکرێنەوە دوای مردنتان دەخرێنە بەهەشتێکەوە، وەك بەهەشتەکانی ئەردەن گەر واش نەکەن، ئەوا بەسەر بڕینتان دەبات، زیندو دەکرێنەوە دوای مردنتان و دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ و دەسوتێنرێن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە دوای وتنی ئەو قسەیە لەلایەن ئەبوجەهلەوە کە خۆی ئامادە کردبوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا و پێغەمبەر ﷺ مشتێ خۆڵی بەدەستەوە بوو فەرمووی: ((نَعْم أنا أَقُولُ ذلك وأَنْتَ أَحدهم)) واتە: بەڵێ من وا دەڵێم وە تۆش یەکێکی لەوانە و خوا دەتخاتە دۆزەخەوە، لەوێدا خوای گەورە چاوی ئەوانی کوێر کرد و بەهیچ جۆرێك پێغەمبەریان ﷺ نەدی، وە پێغەمبەریش ﷺ خۆڵەکەی پژاند بەسەری هەموویاندا

(٤٤٥) أخرجه: البيهقي في (الكبرى) (٢٨٩/٦) (١٢٩٦٦)، وقال الشيخ الالباني (الارواء) (١٥٤٦): إسناده حسن.

و ئەو ئایەتەی خوێند:﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾...... وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿٩﴾﴾(يس) کە پێغەمبەر ﷺ تەواو بوو لە خوێندنی ئایەتەکە هیچ پیاوێك نەمابوو کە خۆڵ نەکرابێتە سەری و پاشان چوو بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆی ویستی لێ بوو)[٤٤٦].

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (کە پێغەمبەر ﷺ ویستی دەرچوونی هەبوو بەرەو شاخەکە هات بۆ ماڵی ئەبوبەکر و لە دەرگایەکی پشت ماڵی ئەبوبەکرەوە بەرێکەوتن، و دەرچوون بەرەو ئەشکەوتی (ثور) لە شاخەکەی خوار شاری مەککەوە، بەم شێوەیە ئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەرێکەوت بەرەو شاخەکە کە سەعاتێك دوورە لە پشت شاری مەککەوە[٤٤٧].

ئیمامی عومەر رضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە لە هەڵسوکەوتی ئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەو شەوەدا لە ڕێ ڕۆیشتنەکەیاندا بۆ ئەشکەوتەکە چۆن بووە، بەڵام ئیسنادی باسەکە (ضعیف)ە. دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە لەگەڵ ئەبو بەکردا بەرەو ئەشکەوتی (ثور) بەرێکەوتن و ئەبو بەکر ماوەیەك لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ دەرۆیشت تا پێغەمبەر ﷺ پێی زانی و پرسیاری لێ کرد، و ئەویش لە وەڵامدا وتی: بیر دەکەمەوە کەسانێك بەدواماندا بێن و دەترسم تووشی تۆ ببن بۆیە لە پشتەوە دەڕۆم و بیریش دەکەمەوە لەوە دەچێت کەسانێکیش لە پێشەوە بێن بۆیە لە پێشتەوە دەڕۆم.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر ئەگەر شتێك هەبێت پێت خۆشە تووشی تۆ ببێت و تووشی من نەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ سوێند بەو خوایەی کەتۆی بە حەق ناردووە، ئەوە بوو بەرێ کەوتن بەرەو ئەشکەوتەکە و کە گەیشتە بەردەمەکەی ئەبوبەکر فەرمووی: لەجێی خۆت بوەستە تا بەردەمی ئەشتەوکەت بۆ پاك دەکەمەوە تا بزانم هیچی تیایە ئینجا فەرمووی: وەرە ژوورەوە بەڵام مەچۆرە ناوەوە هێشتا پاکم نەکردۆتەوە، ئینجا چووە ناوەوە)[٤٤٨].

(٤٤٦) أخرجه: ابو نعيم في (الدلائل) (١٥٤)،والبيهقي (الدلائل) (٤٩٦/٢)، والطبري في (التاريخ) (٣٧٢/٢)، وابن هشام في (السيرة) (٨١/٢) (٣٤١) وقال محققاه: (إسناده صحيح مرسل).

(٤٤٧) انظر: سيرة ابن هشام (٨٣/٢).

(٤٤٨) أخرجه: أحمد في (الفضائل) (٣٢) وقال محققه: ضعيف مرسل ورجاله ثقات، والحاكم (٦/٣) وصححه وقال الذهبي:

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (هیچ کونێکی تیا نەمابوو لە کونەکانی ناو ئەشکەوتەکە هەمووی ئەبوبەکر پەنجەی پیادەکرد نەوەك جڕو جانەوەرێکی زیان بەخشی تیا بێت و ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات، ئینجا بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو وەرە ژوورەوە)[٤٤٩]، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (چەند کاژەمارێك فڕێ درابوو لە ناو ئەشکەوتەکەدا ئەبوبەکر ترسا مارێك یان شتێکی تیا بێت و ئازاری پێغەمبەر ﷺبدات بۆیە یەکێ لەو کونانە ئەبوبەکر قاچی پێوە نابوو تا مارێك پێوەیدا و فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە)[٤٥٠] بەم شێوەیە ئەبوبەکر لەگەڵ هاوەڵی بەڕێزی چوونە ناو ئەشکەوتەکە.

لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لە مەککە و گەیشتە بەردەم ئەشکەوتە ویستی بچێتە ناوە ئاوڕیدایەوە بەشاری مەککەی فەرموو: (( وأنتِ أحبُّ البلادِ إليَّ ، ولولا المشركونَ أهلَكِ أخرجوني لمَاَ خرجتُ منكِ))[٤٥١] واتە: تۆ خۆشەویسترین وڵاتی لەلای من گەر هاوبەش پەیداکاران منیان دەرنەکردایە لێت هەرگیز دەرنەدەچووم).

ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ و یاری بەڕێزی لە ئەشکەوتەکەی چیای (ثور) خۆیان قایم کرد و خۆیان شاردەوە، عائیشە ﷺ شێوەی خۆ شاردنەوە و خۆ پەنادانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە بۆمان و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئەشکەوتی (ثور) و سێ ڕۆژ لەو ئەشکەوتەدا مانەوە، بەشەو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر کە گەنجێکی زیتەڵ و وریا و دانا بوو لایان دەمایەوە، وە لەکاتی پارشێودا پێش کاتی بەیانی بە پەلە دەگەڕایەوە ناو شاری مەککە، بێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات، و لە ناو شاری

---

صحيح مرسل، والبيهقي في (الدلائل) (٤٧٦/٢)، و اللاكلائي (٢٤٢٦) بسنده، و الأصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٤٥) وقال محققه: ضعيف، وقال ابن كثير في (البداية) (١٨٠/٣) رواه البغوي وهو مرسل، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٣٧/٧) مرسل. (لاوازە تەنها بۆ زانیاریت هێناومە).

(٤٤٩) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٨٥/٢٤) (٢٨٤)، وقال الهيثمي في: (المجمع) (٥٤/٦) فيه يعقوب بن حميد و ثقة ابن حبان و غيره، وضعفه ابو حاتم و غيره، و بقية رجاله رجال الصحيح، وانظر لزاما حاشية رقم (٤١٣).

(٤٥٠) أخرجه: اللاكلائي (١٣٥٤/٤) (٢٤٢٦).

(٤٥١) أخرجه: ابو يعلى (٢٦٦٢) وابن ابي حاتم وابن جرير (٣١/٢٦) واللفظ له، والترمذي (٣٩٣٥) والحاكم (٤٨٦/١) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الشعب) (٤٠١٣) و انظر (تفسير ابن كثير) (٣٢٩/٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٣٠٨٣) و (المشكاة) (٢٧٢٤).

مەککەدا دەخەوت و بەیانی لەگەڵ خەڵکی شاری مەککەدا هەڵدەستا، خەڵکی مەککە وایان دەزانی ئەمشەو لەوێ خەوتووە، پاشان دەگەڕا بەناو شوێنەکانی ناو شاردا و گوێی دەگرت بۆ ئەوەی هەر هەواڵێکی بەرگوێ بکەوتایە سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ و پیلان گێڕانی قوڕەیش چاك گوێی لێ دەگرت و دەگەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، کاتێ کە تاریکایی شەو دادەهات بەسەریدا، هەواڵەکانی هەموو پێ ڕادەگەیاندن و عامریش کە هەندێ مەڕی لابوو ئەو مەڕانەش شەو دەیهێنایە نزیك ئەشکەوتەکەوە و لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر شیریان دەدۆشی و هەرچییەکیان بویستایە لێیان دروست دەکرد و دەیان خوارد)[٤٥٢].

(پێش خۆر هەڵاتن (واتە: لە بەرەبەیانییەکی زوو) عامری کوڕی فوهەیرە ڕانە مەڕەکەی بڵاودەکردەوە بەناو شاخەکانی مەککەدا بۆ ئەوەی هیچ کەسێك لە شوانەکانی مەککە هەستی پێ نەکەن تا بەم شێوەیە هەردووکیان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر و عامری کوڕی فوهەیرە کاریان بەو جۆرە بوو لەهەموو شەوێك لە سێ شەوەکەی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەو ئەشکەوتەدا، )[٤٥٣].

بێ باوەڕە خەوتوەکانی بەردەم ماڵی پێغەمبەری ﷺ کە بەهەموویانەوە هاتبوونە سەر ماڵی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لە ناوی بەرن، ئالەو کاتەدا خەویان لێ کەوت تا هۆشیان هاتەوە بە خۆیاندا و تەماشای جێگەکەی پێغەمبەریان ﷺ کرد وایان زانی هەر لەوێ خەوتووە.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: عەلی ئەو شەوە خۆی فرۆشتبوو بەخوای گەورە وە بوردەکەی پێغەمبەر ﷺ پۆشی بوو کە تیایدا دەخەوت، بەڵام تلاوتلی دەکرد و هاوبەش پەیداکەرانیش تەماشایان دەکرد وایان دەزانی ئەوە پێغەمبەرە ﷺ خەوتووە، بەڵام کاتێ هەڵیان کوتایە سەری بینییان ئەوە عەلییە وتیان: هەی پیاو خراپ تۆ تلاوتلت دەکرد بەڵام هاوەڵەکەت کە دەخەوت تلاوتلی نەدەکرد (واتە: ئێمە بە گومان بووین لەوەی کە بڵێین ئەو بێت یان نا چونکە ئەو تلاوتلی نەدەکرد وە کاتێ

---

(٤٥٢) أخرجه: البخاري (٣٩٠٥).

(٤٥٣) أخرجه: البخاري (٤٠٩٣).

پێغەمبەر ﷺ دەخەوت نەدەجوڵایەوە)[٤٥٤].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کە ڕۆژ بووەوە هەڵیان کوتایە سەری و سەیریان کرد عەلییە و خوای گەورە پیلانەکەیانی پوچەڵ کردەوە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ، ئەوە بوو لە عەلییان ﷺ پرسی: هاوەڵکەت لە کوێیە؟ وتی: نازانم، پاشان بە شوێن پێیەکەیدا ڕۆیشتن کە شەو لەوێوە ڕۆشتبوون)[٤٥٥]، ئەسماء ﷺ ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (قوڕەیش کاتێ پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکریان لێ وون بوو گەڕان بە شوێنیدا و سەد وشتریان کرد بە خەڵات بۆ ئەو کەسەی یەکێکیان دەست بەسەر بکات یان بکوژێت، گەڕان بە دوایاندا و سوڕانەوە بە چیاکانی مەککەدا تا گەیشتنە ئەو چیایەی کە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکری تێدا بوون وە ئەبوبەکر لەناو ئەشکەوتەکەدا بە پێغەمبەری ﷺ وت (لە کاتێکدا کە یەکێك لە کافرەکان کە بەرەو ئەشکەوتەکە دەهات): ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێستا ئەو پیاوە دەمان بینێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كلا إنَّ ملائكةً تسترُنا بأجنحتِها)) واتە: نەخێر مەلائیکەیەك دامان دەپۆشێت بە باڵەکانی تا نەمان بینن، ئەو پیاوە ئەوەندەی پێ نەچوو بەرەو ڕووی ئەشکەوتەکە دانیشت و پاشەڕۆی کرد و پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو: (لو كانَ يَرانا ما فَعَلَ هذا)[٤٥٦] واتە: ئەگەر ئەو ئێمەی ببینیایە ئاوا بەرەو ڕووی ئێمە دانەدەنیشت)، بەڵام (بەسەرهاتی جاڵجاڵۆکە و دوو کۆترەکە کە گوایە لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا بووە ئەو ڕیوایەتە (ضعیف)ە ناکرێت بە بەڵگە)[٤٥٧].

(٤٥٤) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٦/٥)و و صحح إسناده الشيخ أحمد شاكر (٣٠٦١)، وضعف إسناده الأرناؤوط، و أخرجه: الحاكم (٤/٣)، وأحمد في (الفضائل) (٢٢) وقال محققه: ضعيف مرسل ورجاله ثقات، والطبراني في (معجم الأوسط) (٣٤٣).(لاوازە تەنها بۆ زانیاریت هێناومە).

(٤٥٥) أخرجه: أحمد (٣٢٥١)وضعف إسناده الأناؤوط وصححه أحمد شاكر. و اوردته للأعتبار و العلم فقط.

(٤٥٦) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٨٥/٢٤) (٢٨٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٥٤/٦): فيه يعقوب بن حميد و وثقه ابن حبان وغيره، وضعفه ابو حاتم و غيره و بقية رجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الألباني في (فتاوى الألباني) (١١٢/١) رواية قوية، وقال محقق (المجمع) (٩٩٠٥) حديث حسن.

(٤٥٧) أخرجه: أحمد (٣٢٥١) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف، و(عبد الرزاق) (٩٧٤٣)، و ابو نعيم في (الدلائل) (١٥٤)، والطبراني في (الكبير) (٤٤٣/٢٠)، وابن سعد (٢٢٨/١)، و (البزار)(١٧٤١)، والعقيلي في (الكامل) (٣٤٦)، والبيهقي في (الدلائل) (٤٨١/٢)، و(المروزي) (٧٣)، واورده القاضي عياض في (الشفا) وقال محققه: إسناده ضعيف، وضعفه ابن كثير في (السيرة) (٢٤٠/٢)، وضعفه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٧٣) و (السلسلة الضعيفة) (١١٢٨،١١٢٩)، و(المشكاة) (٥٩٣٤) وقال في (سلسلة الضعيفة) (٣٣٩/٤): و اعلم انه لا يصح حديث في عنكبوت الغارو الحمامتين.

# هەڵوێستی کافرانی قورەیش و ئامادەکارییەکانی سەرەتای کۆچ

هەڵوێستی کافرانی قورەیش بەرامبەر بەپێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی چۆن بوو کە دەرچوون لە شاری مەککە؟ عورِوەی کوڕی زوبێر ﷺ دەفەرمویێت: (کافرەکان سواری ئەسپەکانیان بوون و بەهەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە، و نوێنەرانی خۆیان نارد بۆلادێکان و ئاگاداریان کردنەوە کە خەڵاتی گەورەیان داناوە بۆ هەر کەسێك کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی بگرێت یان بکوژێت، کاتێك کافرەکان هاتنە چیای (ثور) کە ئەشکەوتەکەی تێدا بوو و چوونە سەر ئەشکەوتەکە، ئەوەندە ئەوان نزیك بوونەوە تا پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگیان بوو، ئەبوبەکر لەو کاتەدا ترس و بیمێکی زۆر ڕووی تێکردبوو)[٤٥٨]، ئەبوبەکر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمویێت: (لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم لە ئەشکەوتەکەدا)[٤٥٩] لە ڕیواتیەتێکی تردا دەفەرمویێت: (سەرم بەرز کردەوە قاچی هاوبەش پەیداکەرەکانم بینی و وتم (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر یەکێك لەوانە[٤٦٠] سەیری ژێر قاچی خۆی بکات دەمان بینێت؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ما ظَنُّكَ يا أَبَا بَكْرٍ باثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا))[٤٦١] واتە: ئەی ئەبابەکر گومانت چییە بەرامبەر بە دوو کەس کە خودا سێیەمیان بێت).

بەم شێوەیە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر ﷺ سێ ڕۆژ مانەوە لە ئەشکەوتی (ثور)دا، ئینجا ڕێگە ناسەکەیان گەیشتە شوێنی مەبەست و دیاری کراو لەوێوە کۆچەکە دەستی پێکرد، عائیشە ﷺ دەفەرمویێت: (لەبەرە بەیانی شەوی سێیەمدا ڕێگە ناسەکە هەردوو وشترەکەی هێناو لە جێگەی دیاری کراودا ئامادە بوو)[٤٦٢]، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((هەر لەو ڕۆژەدا عامر لەگەڵ ئەبوبەکر و پێغەمبەر

(٤٥٨) أخرجه: (الطبراني) وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٠٢): رواه الطبراني مرسلا و فيه ابن لهيعة فيه كلام و حديثه حسن.

(٤٥٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٤/١) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرطهما) و (أحمد في الفضائل) (٥١٠) وقال محققه إسناده صحيح، وابن ابي شيبة (٧/١٢)، والبخاري (الصحيح) (٤٦٦٣)، ومسلم (الصحيح) (٢٣٨١)، و(الترمذي) (٣٠٩٦) و ابو يعلى (٦٦، ٩٧) وابن حبان (٦٢٧٨)،والبيهقي في (الدلائل) (٤٨٠/٢).

(٤٦٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٢٢).

(٤٦١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٦٥٣).

(٤٦٢) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٢٦٣).

ﷺ وە لەگەڵ ڕێگە ناسەکەدا بەڕێ کەوتن[٤٦٣] و [ڕێگەی خوار مەککەیان گرتە بەر]))[٤٦٤] کە ڕێگەی کەناری دەریای سورە لەم سەفەرەشدا وەکو دوور بینییەك بۆ مەسەلەی نارەحەتی سەفەر و ناهەمواریەکەی ئەوە بوو پایەبەرز ئەبوبەکر ﷺ هەموو ماڵ و سامانەکەی لەگەڵ خۆیدا برد بوو، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکردا ﷺ دەرچوون ئەبوبەکر ﷺ هەموو سامانەکەی لەگەڵ خۆیدا برد کە پێنج هەزار یان شەش هەزار درهەم بوو ئەو ڕۆژە باپیرەم ئەبوقوحافە کە کوێر بوو، هاتە ژوورەوە بۆلامان دوای ڕۆیشتنی ئەبوبەکر ﷺ پێی وتین: وەڵاهی وابزانم چۆن خۆی لە ئێوە دوور خستۆتەوە پارەشی بۆ بەجێ نەهێشتوون؟ منیش وتم: نەخێر باوە گەورە پارەیەکی زۆری بۆ بەجێ هێشتووین، دەفەرموێت هەندێ وردە بەردم هەڵگرت و خستمە ناو دەلاقەکەی ناو ماڵەکە کە لەوێدا باوکم پارەی دادەنا و بەرگێکمدا بەسەریدا، پاشان دەستی باوە گەورەم گرت وتم: باوەگەورە دەستت بدە بەسەر ئەمانەدا ئەوە پارەیە بۆ ئێمەی بەجێ هێشتووە، ئەویش دەستی لەسەری دانا و وتی: خراپ نییە گەر ئەمەی بۆ جێ هێشتبن و چاکی کردووە ئەم پارەیە زۆرە و بەشتان دەکات، دەفەرموێت وەڵاهی پارەش نەبوو بەرد بوو لەوێدا دامنا بۆ ئەوەی باپیرەمی پێ بێدەنگ بکەم...)[٤٦٥].

## دەرچوون بەرەو شاری مەدینە

یەکەم کاردانەوەیەك کافرانی قورەیش پێی هەستان دوای دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بەرەو چیای (ثور) بۆ ناو ئەشکەوتەکە، لەوێشەوە بەرەو کەناری دەریا، لەوێشەوە بەرەو مەدینە، ئەوە بوو کافرەکان کەوتنە پشکنینی ماڵی ئەبوبەکر پاشان گەڕان بەناو شاردا و بەرێگە سەرەکیەکانی کە بەرەو شاری مەدینە دەڕوات، پاشان هەستان بە ئاگادار کردنەوەی سەرجەم هۆزەکانی ئەو جێگایانە، دانانی دیاری کە سەد وشتر

(٤٦٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٠٥).

(٤٦٤) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٢٦٣).

(٤٦٥) أخرجه: أحمد (٣٥٠/٦) (٢٦٩٥٧) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني في (الكبير) (٨٨/٢٤) (٢٣٥،٢٣٦)، والحاكم (المستدرك) (٥/٣)، وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في المجمع: (٥٩/٦) رجال أحمد رجال صحيح غير ابن اسحاق و قد صرح بالتحديث)، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (١٥٤٥): حديث حسن.

بوو بۆ هەر کەسێ کە بیان کوژێت یان دەستگیریان بکات، سوراقەی کوڕی مالیك ﷺ ئەو ڕاستییەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (نوێنەرانی کافرەکانی قوڕەیش هاتن بۆلامان و هەروەها نوێنەری تایبەتیان نارد بۆلای هەموو هۆزێك لە هۆزەکانی عەرەب و نوێنەرانی قوڕەیش گەیشتە لامان و خەڵاتی گەورەیان دادەنا)[٤٦٦] بۆ ئەو کەسەی کە پێغەمبەر ﷺ یان ئەبوبەکر ﷺ دەست بەسەر بکات یان بیان کوژێت وە خەڵاتەکەش لە ڕیوایەتێکی تردا: (سەد وشتر بوو بۆ هەر یەکێ لەو دووانە)[٤٦٧].

پێغەمبەر ﷺ لەکاتی تاریکایی شەودا لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە و بەڕێ کەوتن لە سەرەتای شەو تا کاتی نیوەڕۆ وە نەحەوانەوە بۆ ئەوەی بەیەکجاری دوور بکەونەوە لە شاری مەککە، بەڕێکەوتن تا ئەندازەیەکی زۆر دوور کەوتنەوە و پاشان پشوویەکیان دا، هاوەڵی بەڕێز ئەبوبەکر ﷺ ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کەمینەکانی قوڕەیش تەنگیان پێ هەڵچنی بووین لە هەموو لایەکەوە بۆیە ناچارانە بەڕێ کەوتین تا گەرمای نیوەڕۆ لەوێ چاوم گێڕا تاچاوم بە سێبەرێك بکەوێت لەم بیابانە چۆڵەدا بۆ ئەوەی بچینە ژێری و پشویەك بدەین، چاوم بە بەردێك کەوت و لێی نزیك بووینەوە و شوێن سێبەرەکەیم تەخت کرد و فەروەیەکم لەگەڵ خۆمدا هێنا بوو دامخست، پاشان بە پێغەمبەرم ﷺ وت پشوو بدە لێرەدا، پێغەمبەر ﷺ پاڵ کەوت و پشوویدا و خەوت.

پاشان منیش ڕۆیشتم بۆ ئەو ناوە تا بزانم کەس دەبینم کەبە دواماندا هات بێت لە کەمینەکانی قوڕەیش تەماشام کرد شوانێك مەڕەکانی لێ دەخوڕێت بەرەو ئەو بەردەی کە ئێمە لامان دابووە لای، ئەویش دەیویست بێت بەرەو ئەو بەردە و لەژێریدا بحەوێتەوە، و منیش لێی نزیك بوومەوە و پێم وت تۆ شوانی کێیت؟ وتی: شوانی پیاوێکی قوڕەیشم کەناوی فلانە کەسە، منیش یەکسەر ئەو پیاوەم ناسییەوە کە کێیە، وتم: ئایا مەڕەکانت شیری تیایە؟ وتی: بەڵێ، وتم: تۆزێك شیرم بۆ ئەدۆشیت؟ ئینجا شوانەکە مەڕێك لە مەڕەکانی گرت و منیش پێم وت: گوانەکانی جوان پاك بکەرەوە تا تەپوو تۆزی پێوە نەبێت، پاشان پێم وت: کە دەستی بدات بەیەکدا بۆ ئەوەی تەپ و تۆزەکە بە دەستییەوە نەمێنێت تاوەکو شیرەکە پاك بێت

(٤٦٦) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٠٦).

(٤٦٧) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢/٨٨) (٣٥١): بإسناد صحيح.

بۆ پێغەمبەر ﷺ، شوانەکە هەندێ شیری بۆ دۆشیم لە قاپێکدا و منیش هەندێك ئاوم پێ بوو قاپە شیرەکەم هێنا و کردمە ئاوەکەوە کە لە قاپێکدا بوو پارچەیەك پەڕۆم بەسەرەوە بەست تا ئاوەکە خۆڵاوی نەبێت ماوەیەك تیایدا مایەوە، تا کەمێك شیرەکە فێنك بووەوە، ئینجا بۆ پێغەمبەرم ﷺ هێنا و تەماشام کرد خەبەری بۆتەوە لە خەوەکەی، و منیش شیرەکەم پێدا زۆری تینوو بوو زۆربەی خواردەوە و بەشی منی هێشتەوە پاشان وتم: ئایا کاتی ڕۆیشتن هاتووە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ، خۆمان پێچایەوە و کەمینەکانی قوڕەیش هەر بە دوامانەوە بوون و هیچیان بە ئێمە نەگەیشتن تەنها سوراقە نەبێت بە سواری ئەسپەکەیەوە)[٤٦٨].

## بەسەرهاتی بەدواکەوتنی سوراقە

سوڕاقە لەدوای بیستنی ئەو هەواڵەی کە قوڕەیش خەڵاتێکی گەورەیان دانا بۆ هەر یەکێ لەو دووانە ئەبو بەکر ﷺ و پێغەمبەر شوێن پێیانی هەڵگرتن، ئەم بەسەرهاتە خۆی دەیگێڕێتەوە کە چۆن دوای پێغەمبەر ﷺ کەوتووە و چی کردووە و چۆن خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکری هاوەڵی پاراستووە، سوراقە دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (نوێنەری کافرەکانی قوڕەیش خەڵاتی گەورەیان دانا کە سەد وشتر بوو بۆ هەر یەکێ لەو دووانە ئەبو بەکر ﷺ و پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کەسەی کە دەست بەسەریان بکات یان بیان کوژێت.

من کاتێ دانیشت بووم لە کۆڕێك لە دانیشتووانی خزمانی خۆم لە کوڕانی بەنی (مودلیج) پیاوێك لە ئێمە نزیك بووەوە لێمان لە دانیشتنەکەدا)[٤٦٩] وتی: وەڵاهی من ڕەشاییەکم بینی لە قەراغی دەریا سێ زەلامم بینی لە دوورەوە دەڕۆیشتن من وا تێدەگەم کە محمد و هاوەڵەکانی بێت، منیش زانیم کە ئەوە محمد ﷺ و هاوەڵانیەتی بەڵام بەچاو ئاماژەم بۆ کرد کە بێ دەنگ بێت دوایی وتم: نەخێر ئەوانە ئەوان نین تۆ ئەوەی کە بینیوتە فلان وفلانە کەسە کە بە بەرچاوی خۆمدا ڕۆیشتن و وشترێکیان لێ ون بوو بوو بەدوایدا دەگەڕان، ئەویش وتی: لەوە دەچێ ئەوان

---

(٤٦٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩١٧،٣٦٥٢).

(٤٦٩)أخرجه: البخاري في (صحيح) (٣٩٠٦)، وعبد الرزاق في (المصنف) (٩٧٤٣)، وأحمد في (المسند) (١٧٥/٤)، وابن هشام في (السيرة) (٨٨/٢) واللفظ للبخاري.

بن، کەمێك دانیشتم، پاشان هەستام وبەرێ کەوتم بۆ ماڵی خۆمان و جارییەکەم ئاگادار کردەوە کە ئەسپەکەم لە پشتی تەپۆڵکەکەوە ببات بۆ ئەودیو شیوەکە لە چاڵاییەکەدا بیوەستێنێت تا خۆم دێم، ڕمەکەم هەڵگرت و نزمم کردەوە و دەمخشان بە زەویدا بۆ ئەوەی کەس نەزانێت من بەم ڕمەوە بەرە و کوێ دەچم وە کیفی ئەزلامەکەم لەگەڵ خۆمدا برد (أزلام: چەند تیرێك بوو کە نووکی نەبووو لەسەر هەندێکی نووسرا بوو ئەمە بکە و لەسەر هەندێکی نووسرا بوو ئەمە مەکە، یا زیانت پێ دەگەیەنێت یا نەء، چاکە یان خراپە وەکو (یانسیب)) تاوەکو بزانم ئەم سەفەرەم باش دەبێ یان خراپ وەکو خەڵکی دەڵێن، جل و پۆشاکی سەربازیم کۆکردەوە لە چەك و تفاقی پێویست کە هەبوو لە خۆمم بەست پاشان ئەزلامەکانم تەماشا کرد تا بزانم ئەم سەفەرەم چاك دەبێت یان خراپ، ئەو تیرە دەرچوو کەپێی ڕاگەیاندم کە هیچم پێ ناکرێت بەرامبەریان، منیش هیوام وابوو کە بیان گێڕمەوە و دەست بەسەریان بکەم و بیان بەم بۆلای قوڕەیش و دووسەد وشترەکەی خۆم وەرگرم.

ئنیجا سوار بووم و بەرێی ڕۆیشتنەکەی ئەواندا ئەسپەکەم تاودا، لە ڕێگەدا قاچی ئەسپەکەم هەڵکەوت و فڕێی دامە خوارەوە، وتم: ئەمە چییە؟ هەستامەوە و ئەزلامەکانم بادایەوە و هەر ئەو تیرە دەرچوو کە پێم ناخۆش بوو، بە گوێی ئەزلامەکانم نەکرد، دیسانەوە سواری ئەسپەکەم بوومەوە و دوایان کەوتم، دیسان ئەسپەکەم فڕێی دامە خوارەوە و منیش دیسان کیفەکەم بادایەوە و هەر ئەوە دەرچوو، کە کە گوایە زەرەریان پێ ناگەیەنم وە هیچم پێ ناکرێت بەرامبەریان، پێم ناخۆش بوو وتم: هەر دەبێ دوایان بکەوم، دیسان سوار بووم و دوایان کەوتم تا ئەوانم بەرچاو کەوت و لێیان نزیك بوومەوە دیسان ئەسپەکەم سەرسمێکی پێدام و کەوتم و دەستم دایەوە کیفەکەم وە ئەزلامەکەم بادایەوە و هەر هەمان تیری پێشوو دەرچوو دیسان سوار بوومەوە و بە دوایاندا چووم تا لێیان نزیك بوومەوە و گوێم لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ بوو کە بە هیچ جۆرێك ئاوڕی نەدەدایەوە، بەڵام ئەبوبەکر ﷺ بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە بەلای ڕاست و چەپ و دواوە و پێشەوەدا)[٤٧٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: (سوراقە ئەوەندە لێمان نزیك بووە تا ماوەی ڕم هەڵدانێك یان دوان لە نێوان ئێمە و سوراقەدا مابوو، وتم: ئەی

(٤٧٠) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٨٨/٢) بإسناد البخاري.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە کەمینە بەدوای ئێمەدا هاتووە)[٤٧١] (ئەسپ سوارێکە وا گەیشت پێمان...)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لاتَحْزَنْ إنَّ اللهَ مَعَنا))[٤٧٢] واتە: خەفەت مەخۆ خوامان لەگەڵە، ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: گریام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بۆ دەگریت؟ وتم: وەڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەفسی خۆم ناگریم بۆ تۆ دەگریم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دۆعای لێ کرد و فەرموی: (اللَّهمَّ اكفِنيناه بما شِئتَ)[٤٧٣] واتە: خوایە لێمان دوورخەیتەوە بەهەر شتێك کە دەتەوێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی دایەوە بەلای سوراقەدا و فەرمووی: (اللَّهُمَّ اصْرَعْهُ) واتە: خوایە بیخەیتە خوارەوە، ئەسپەکەی خستییە خوارەوە و هەردوو پێی ئەسپەکەی بەناخی زەویدا چووە خوارەوە تا هەردوو ئەژنۆی)[٤٧٤] لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [ئەسپەکە هەتا ناوکی بەزەویدا چووە خوارەوە ئەویش لە زەوییەکی تەختی ڕەقانیدا]، سوراقە دەفەرموێت: (خۆم فڕێ دایە خوارەوە و هەرچەندە لە ئەسپەکەمدا تا هەستێتەوە، کە ئەسپەکە ویستی دەستەکانی دەربکات تەپ و تۆزێك بەرز بووەوە دەت وت دووکەڵە و بەئاسماندا دەچێت.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: دەت وت گەردەلوولە بەئاسماندا دەچێت کە ئەمەم بینی زانیم کە محمد لە من پارێزراوە و هیچم پێ ناکرێت بەرامبەری، و کەوتە دڵیشمەوە کە ئەوەم بینی زانیم کە ئاینی محمد سەردەکەوێت هاوارم لێ کردن و وتم: من سوراقەم ڕاوەستن با قسەتان لەگەڵ بکەم وەڵاهی هیچ شتێك لەلای منەوە توشتان نابێت کە پێتان ناخۆش بێت، لێیان نزیك بوومەوە و پێم وت: (واتە: بە پێغەمبەر ﷺ): خزمانت خەڵاتی گەورەیان بۆ کوشتنی تۆ داناوە، وە چی هەواڵ و زانیاری ئەو ناوچەیە هەبوو هەموویم گەیاند بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی، لەوێش چی خواردن وکەل و پەلم پێ بوو هەموویم بردوو چوومە بەردەمیان بۆ ئەوەی لێم وەرگرن، پێغەمبەر ﷺ هیچی لێ وەرنەگرتم وە داوای هیچ شتێکی لێ نەکردم).

---

(٤٧١) أخرجه: أحمد (٣) وقال محققه إسناده صحيح على شرط مسلم، و(البزار) (٥٠)،وابن ابي شيبة (٣٢٧/١٤) وابو يعلى(١١٦)وابن حبان (٦٢٨١)، وقال محققه: حديث صحيح، والبيهقي في (الدلائل) (٤٨٣/٢).

(٤٧٢) أخرجه: البخاري (٣٦٥٢).

(٤٧٣) أخرجه: أحمد (٣) وقال محققوه :إسناده صحيح.

(٤٧٤) أخرجه: البخاري (٣٩١١).

لە ڕیوایەتێکی تردا سوراقە دەفەرموێت: (وتم ئەی محمد زانیومە ئەمە کردەوەی تۆیە داوا بکە لە خوا ڕزگارم بکات لەوەی کە تیایدام، وەڵاهی نایەڵم هیچ کەس دوات بکەوێت و ڕێگەیان لێ هەڵە دەکەم وە ئەمە کیفی تیرەکانمە چەندت ئەوێ لێی هەلگرە بۆ ڕێگە ڕۆیشتنەکەت وە لەڕێگەدا تێدەپەڕی بەلای کۆمەڵێ مەڕی مندا لەفلان جێگە وچیت پێویستە لەوێ بیبە)[٤٧٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [لا حاجَةَ لي في إِبِلِكَ وَ غَنَمِكَ] واتە: هیچ پێویستیم بە وشتر و مەڕی تۆ نییە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد و هەردوو دەستی ئەسپەکەی سوراقە خوای گەورە هێنایە دەرەوە وئەسپەکە توانای ڕۆشتنی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((فقِفْ مَكانَكَ، لا تَتْرُكَنَّ أحَدًا يَلْحَقُ بنا)) واتە: لە جێی خۆت ڕاوەستە و نەیەڵێت هیچ کەسێك لێرەوە دوامان بکەوێت، سوراقە دەڵێت داوام لێ کرد نوسراوێکی ئەمانەتم بۆ بنوسێت.

پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکری فەرموو: (قُلْ لَهُ وَ مَا تَبْتَغِي مِنا) واتە: بە سوراقە بڵێ چیت ئەوێ لێمان، سوراقە دەڵێت منیش وتم: ئەمەوێ نوسراوێکم بدەیتی کە بەڵگە بێ لە نێوان من وتۆدا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ئەبوبەکر بۆی بنووسە، ئەبوبەکر لە سەر پارچە (ئێسقانێك یان پێستێك یان قوماشێك) بۆی نوسیم و بۆی هەڵدام منیش خستمە ناو کیفی تیرەکانمەوە پاشان هاتمەوە و ئەم بەسەرهاتەم بۆ کەس نەگێڕایەوە)[٤٧٦]، ئەمە بەسەرهاتی سوراقەیە ﷺ دوای ئەوەی کە بەیانی دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەر ﷺ بوو خوای گەورە بۆ ئێوارە کردی بە پارێزگاری پێغەمبەر ﷺ.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (سوراقە سەرەتای ئەو بەیانییە زۆر سوور بوو بۆ گرتنی یان کوشتنی پێغەمبەر ﷺ بەڵام کۆتایی ئەو ڕۆژە بووە پارێزگاری پێغەمبەر ﷺ)[٤٧٧].

پێغەمبەر ﷺ ئەم چاکەیەی سوراقەی لە یاد نەچوو وە پابەندی خۆی دووپات کردەوە بەو نوسراوەی کە دابووی بە سوراقە، سوراقە ﷺ دەفەرموێت: (وەستام تا

(٤٧٥) أخرجه: أحمد: (٣) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٤٧٦) أخرجه: ابن حبان (٦٢٨١).

(٤٧٧) أخرجه: البخاري (٣٩١١،٣٦٥٢).

کاتی گرتنی شاری مەککە، پێغەمبەر ﷺ دەست بەتاڵ بوو لە جەنگی (حونێن و طائف) منیش چووم بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ و نوسراوەکەم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ ئەوەی پێبگەم ، ئەوە بوو لە (جُعرانة) پێی گەیشتم، لەوێ چوومە لای و کۆمەڵێ لە تیپی ئەسپ سوارەکانی ئەنصارییەکان ڕمەکانیان ئاراستەی من کرد و وتیان بچۆرە دواوە چیت دەوێ: سوراقە ﷺ دەفەرمویێت: تا نزیك بوومەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە بەسواری وشترەکەیەوە بوو، دەڵێت: وەڵاهی ئێستاش لەبەرچاومە کاتێ تەماشای سپایی قاچیم کرد لەناو شوێن قاچی کۆپانی وشترەکەوە لە سپایدا دەت وت جومارەیە: (واتە: سپیایی ناوەڕۆکی دارخورما).

دەڵێت نوسراوەکەم بەرز کردەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە نوسراوەکەی تۆیە بۆ من، وە من سوراقەی کوڕی جەعشمم، پێغەمبەر ﷺ منی ناسییەوە و فەرمووی: (يَوم وَفاء وَ برّ أدنه) واتە: ڕۆژی وەفا و چاکەکردنە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نزیك بەرەوە لێم، و منیش لێی نزیك بومەوە و موسوڵمان بووم و لەوێدا بیرم کردەوە تا پرسیارێك لە پێغەمبەر ﷺ بکەم بەڵام هیچم بیر نەکەوتەوە، و هەر ئەوەندە نەبێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ وشتری بەرەڵای بێ خاوەن هەیە لەو بیابانە نزیك ئەو حەوزانە دەبنەوە کەمن پڕم کردووە لە ئاو بۆ وشترەکانم تا ئاوی لێ بخۆنەوە ئەوانیش دێن ئاوی لێ دەخۆنەوە، ئایا من هیچ پاداشتم هەیە لەوەی کە ئەو وشترانە ئاوی لێ دەخۆنەوە؟ فەرمووی: (نَعمْ في كُلِّ ذاتِ كَبَدٍ حرّى أجْرٌ) واتە: بەڵێ لە هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ (واتە: هەر گیانلەبەرێك) تۆ چاکەی لەگەڵدا بکەیت پاداشتت بۆ دەنوسرێت لەلای خوا. سوراقە دەفەرمویێت منیش گەڕامەوە بۆلای قەومەکەم لە بەنی مودلیج ئەوە بوو موسوڵمان بوون و زەکاتمان کۆکردەوە و ناردم بۆ پێغەمبەر ﷺ)[٤٧٨].

## تێپەڕبوون بەلای خێمەکەی ئوم مەعبەددا

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوڕێکەیدا لە ڕێی ڕۆیشتنەکەیاندا بەردەوام بوون لە مەککەوە و بۆ شاری مەدینە لە ڕێگادا ڕێیان کەوتە لای دوو دەوارەکەی ئوم مەعبدی خوزاعی و بە چاکی پێشوازی لێ کردن، ئەبو مەعبەدی خوزاعی دەیگێڕێتەوە و

(٤٧٨) أخرجه: الحميدي (٩٠٢)، و عبد الرزاق (٩٧٤٣)، وأحمد (٤/ ١٧٥)، وابن هشام في السيرة (٢/٨٨) بإسناد البخاري.

دەفەرموێت: (ئەو شەوەی کە دەرچوون لەگەڵ ئەبوبەکر و عامری کوڕی فوهیرە و ڕێگەناسەکەیان کە ناوی عەبدوڵڵا کوڕی ئورەیقیط بوو تێپەڕین بەلای دوو دەوارەکەی ئوم مەعبەددا، کە ئافرەتێکی بەساڵاچوو بوو وە تێکەڵ بە خەڵك دەبوو، وە دادەنیشت لەلای دەوارەکەیی و هەر کەس بەلایدا تێپەڕ بووایە خواردن و ئاو و شیری پێ دەبەخشی، ئەوانیش بەلای ئەو دوو دەوارەدا ڕۆیشتن بەڵکو گۆشت یان شیریان لابێت بۆ ئەوەی لێی بکڕن، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی هیچیان چاو پێ نەکەوت لای ئوم مەعبەد، چونکە ئەو ساڵە ساڵێکی قات و قڕی و وشکە ساڵی بوو، هیچیان بە دەستەوە نەبوو.

ئوم مەعبەد پێی وتن: ئەگەر هیچم لابوایە وام لێ نەدەکردن تا ناچاربم کە بچم بۆلای کەسانی تر شتتان بۆ بهێنم؟ پێغەمبەر ﷺ لایدایە دەوارەکەیان و دانیشت و تەماشای لایەکی دەوارەکەی کرد بینی لەوێ مەڕە لاتێکی لێبوو فەرمووی: (ئەو مەڕە چییە ئەی ئوم مەعبەد؟) ئەویش وتی: ئەو مەڕە لاوازی وای لێ کردووە کە ناتوانێت بچێت بلەوەڕێت لەگەڵ مەڕەکانی تردا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شیری تێدایە؟ وتی: لەوە بێ دەسەڵات ترە کە شیری تێدا بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕێگەم بدە تا بیدۆشم، ئەویش وتی: ئەگەر شیری تیا بێت فەرموو بیدۆشە، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد ئەو مەڕە بهێنرێتە بەر دەستی، مەڕەکەیان هێنا و پێغەمبەر ﷺ دەستی بەسەر مەڕەکەدا هێنا و ناوی خوای لێ هێنا، پاشان دەستی بە گوانیدا هێنا و مەنجەڵێکی گەورەی داوا کرد کە سێ یان چوار کەس ئاوی تیا بخواتە وە ئەوەندە گەورە بوو مەنجەڵەکەیان هێنایە بەردەم مەڕە لاتە سیسەکە و مەڕەکەش هەردوو قاچی کردەوە بۆ ئەوەی شیر بێتە خوارەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستی بە گوانی مەڕەکەدا هێنا و دۆشی شیر هاتە خوارەوە و مەنجەڵەکە پڕ بوو تا لەسەری دەڕژا، پێغەمبەر ﷺ ئەو شیرەیدا بە ئوم مەعبەد تا تێری لێ خواردەوە، پاشان هێنای و دای بە هاوەڵانی و دوای تینوێتی و برسێتیەکی زۆر بەویستی خۆیان تێریان لێ خواردەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ساقي القومِ آخِرَهم)) واتە: ئەوەی ئاو بگێڕێت دەبێت خۆی دواهەمین کەس بیخواتەوە، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ دواهەمین کەس بوو ئەو شیرەی مابووەوە خواردییەوە.

ئینجا دووەم جار مەنجەڵەکەی خستەوە ژێر مەڕە لاتەکە و دۆشی و مەنجەڵەکەی لێ پڕ کردەوە و بۆی بەجێ هێشت، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێکەوتن و ڕۆیشتن ئەویان بەجێ هێشت، ئەوەندەی پێ نەچوو مێردی ئوم مەعبەد هاتەوە بەرەو ماڵ و هەندێ مەڕەلاتی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە کە ئەملاولایان دەکرد لەلاوازیدا و پێشی خۆی دابوو وە دەگەڕایەوە بۆلای دەوارەکەی، کە کاتێ شیر و دۆی بینی کە پێشتر لە دەوارەکەیاندا نەبوو سەیری لی هات وتی: ئەی ئوم مەعبەد ئەم دۆیە چییە، هیچ شیرێکیش نییە لە ماڵەکەدا و مەڕەکەش شیری تیا نییە؟ وتی: نەوەڵا پیاوێکی پیرۆز بەلاماندا تێ پەری و بەسەرهاتەکەشی ئاوها و ئاوها بوو، ئەویش وتی: ئادەی بۆم وەصف بکە وەڵاهی من وا دەزانم ئەوە هاوەڵەکەی قوڕەیشە کە بەدوایدا دەگەڕێن، پیاوێکی چۆن بوو؟ ئوم مەعبەد وتی: بینیم پیاوێکی ڕووخسار سپی و ڕەوشت جوان و دەم و چاو جوان و چاو کراوە بوو نەلاواز و نەقەڵەو، کەشخە و جوان چاك بوو، ڕەشایی چاوی زۆر ڕەش بوو و برژانی چاوەکانی زۆر درێژ بوو، دەنگی زوڵاڵ بوو وە گەردن بەرز بوو وە ڕیش پڕ بوو، چاوەکانی گەورە و ڕێژراو بوو هەردوو برۆکانی کەوانەیی بوون، وەخت بوو لەیەك بدەن و ئەگەر بێدەنگ بووایە ویقاری لێ دەردەکەوت، ئەگەر قسەیشی بکردایە گەورە دەبوو وە بەهای لێ دەباری بەرامبەر ئەوەی قسەی بۆ دەکرد، جوانترین خەڵك و بەڕێزترینیانە لە دوورەوە کە بەرچاو دەکەوت ئاشکرا ترینیان و چاکترینیانە لە نزیکەوە، قسەخۆش بوو، قسەکانی نەزۆر بوو نەکەم (واتە: مام ناوەندی بوو) قسەکانی دەتوت ڕیزە موورویەك بوو وە دانە دانە بەدوای یەکدا دەهاتن، چوار شانەیەك بوو باڵای زۆر بەرز نەبوو وە زۆر نزمییش نەبوو پەلێکی نێوان دوو پەل بوو (واتە: مام ناوەندی بوو لەناو هەرسێ هاوەڵانی خۆی کە لەگەڵیدا بوون) لەهەر هەموویشیان جوانتر و بەڕێز تر بوو، هاوەڵانێکی لەگەڵدا بوو گەر ئەو قسەی بکردایە ئەوان بێ دەنگ دەبوون، وە گەر فەرمانێکی بدایە دەست بەجێ ئەنجامیان ئەدا، ئەو کۆمەڵە زۆر ڕێزیان دەگرت و لەخزمەتیدا بوون، ئەو پیاوە ڕووخۆش بوو ڕووگرژ نەبوو قسەکانیشی دوور بوون لە قسەی پڕوپوچ، ئەبو مەعبەد وتی: وەڵاهی ئەوە هاوەڵەکەی قوڕەیشە کە بە دوایدا دەگەڕێن کە ئاینەکەی وەکو باسکراوە و پێمان گەیشتووە ئاوها و ئاوهایەو وەصفی وایە، بەڵام وەڵاهی گەر پێی بگەم هەوڵ دەدەم شوێنی بکەوم وەڵاهی زۆر

بەپەرۆشەوە دوای دەکەوم بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنم، دەڵێت: هەر ئەو بەیانییە لە شاری مەککە دەنگێك بەرز بووەوە لە نێوان زەوی و ئاسماندا خەڵکی دەنگەکەیان دەبیست و کەسیان نەدەبینی قسەی دەکرد و هەندێك لە خەڵکی شاری مەککە شوێنی دەکەوتن ئەویش لە چەند پارچە شیعرێکدا کە سەرەتاکەی بەمە دەستی پێ دەکرد دەی وت:

خــوای گــەورە پـــاداشتی بــداتەوە بە چاکترین پاداشت
ئەو دوو هاوەڵەی کە لایان دایە دوو دەوارەکەی ئوم مەعبەد
ئــەوانــە لــەوێ بەچــاکە دابەزین و بەچــاکــەش هەستان
ســـەرفــرازە ئــەو کــەسەی کە هاوەڵی محمد ﷺ بێت (٤٧٩).

دەفەرموێت کە ئەمەی وت دانیشتوانی شاری مەککە زانیان کە بەرەو مەدینە بەڕێکەوتوون) وە هەر لەڕێ ڕۆیشتنەکەی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکردا بەرە و شاری مەدینە. قەیسی کوڕی نوعمان ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵی بەڕێزیدا ئەبوبەکر ﷺ کە لە کافرانی قوڕەیش هەڵهاتبوون تێپەڕین بەلای شوانێکدا هەندێ مەڕی دەلەوەڕاند و داوای شیریان لێ کرد و شوانەکەش وتی: وەڵاهی مەڕێکی وام لانییە کە شیری تیابێت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((هلْ من شاةٍ ضربَها الفحلُ)) واتە: ئایا مەڕێکی وات لایە بەران لێی پەڕی بێت؟ شوانەکەش وتی: نەخێر بەڵام لێرەدا مەڕە لاتێکی سیسەڵە هەیە کە نەیتوانیوە بەپێی خۆی هەستێ و بچێت بۆ لەوەڕگا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆم بهێنە، ئەویش بۆی هێنا وە پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بە گوانیدا و دوعای کرد تا خوای گەورە بەرەکەتی تێ بکات، و ئەبوبەکر ﷺ قاپێکی بۆ هێنا، و پێغەمبەر ﷺ شیرەکەی تیا دۆشی، وە پاشان دای بە ئەبوبەکر ﷺ وە ئەبوبەکر ﷺ شیری خواردەوە، و دوایی پێغەمبەر ﷺ قاپێکی تری دۆشی و دای بە شوانەکە ئەویش تێری خواردەوە، و پاشان پێغەمبەر دواهەمین کەس خۆی خواردییەوە، پاشان شوانەکە بە پێغەمبەری ﷺ وت: تووخوا

(٤٧٩) أخرجه: ابو نعيم في (الدلائل) (٢٣٨)، والطبراني في (الكبير) (٣٦٠٥) و (في الأحاديث الطوال(٣٠)، والحاكم (٩/٣) وصححه، والبيهقي في (الدلائل) (٢٧٦/١) وقال محققه: إسناده صحيح واللفظ له، وابن سعد (٢٣٠/١)، والبغوي في (شرح السنة) (٣٧٠٤)، وقال ابن كثير في (البداية) (٣ /١٩٠): قصة ام معبد مشهورة مروية من طرق يشد بعضها بعضا، وقال (الشيخ الألباني) في (فقه السيرة) (١٧٩): الحديث لا ينزل عن رتبة الحسن، وقال في (المشكاة) (٥٩٤٣) صحيح بطرقه، وقال الشيخان عبدالقادر الأرناؤوط و شعيب الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٥١/٣): حديث حسن.

تۆ کێیت؟ وەڵاهی بەوێنەی تۆ کەسم نەدیوە، تۆ کێیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنْ أخبرْتُكَ تَكْتُمُ عَليَّ)) واتە: گەر هەواڵت بدەمێ لای کەس باسی ناکەیت؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من محمدم نێراوی خوام))، وتی: تۆی ئەو کەسەی کە قورەیش پێت دەڵێن کە بێ دینیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوان وا دەڵێن))، ئەویش وتی: من شایەتی دەدەم کە تۆ نێرراوی خوایت، [وە شاهێدی دەدەم کە ئەوەی پێی هاتوویت حەققە و ڕاستە]، وە هیچ کەسێك ناتوانێت ئەوەی کە تۆ کردت ئەنجامی بدات تەنها پێغەمبەرێك نەبێت، ئینجا وتی: شوێنت دەکەوم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: [ئێستا تۆ ناتوانیت ئەوە ئەنجام بدەیت لە ڕۆژی ئەمڕۆتدا] بەڵام گەر بیستت ئێمە سەرکەوتووین ئەوجا بگەرە لامان)، ئەو پیاوەش گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا)[٤٨٠].

## تێپەڕبوون بەلای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب

پێغەمبەر ﷺ لەڕێ ڕۆیشتنەکەیدا لای دایە لای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب بۆ ئەوەی میوانداریتی بکەن و لایان کەمێك بحەوێتەوە، بەسەرهاتی لادانی پێغەمبەر ﷺ بۆلای ئەو خێڵە، ئەبوبەکر ﷺ دەی گێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین لە شاری مەککەوە گەیشتینە خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب، ڕووی لە خانویەکی کەمێك دوور لە خێڵەکە کرد و بەرەو ئەوێ چوو لەوێدا دابەزین و لاماندا و تەماشامان کرد، تەنها ئافرەتێکی لێ بوو وتی: ئەی بەندەی خوا من ئافرەتێکم بەتەنها و کەسم لەگەڵدا نییە، گەر پێتان خۆشە میوانداریتان بکرێت و شتێکتان پێ ببەخشرێت بچن بۆلای گەورەی ئەم خێلە، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە و ئەو کاتەش نیوە شەو بوو ئەوەندەی پێ نەچوو کوڕەکەی هەندێ بزنی لاتی پێ بوو ئەی هێنایەوە بۆ ماڵ کە گەیشتەوە ماڵەوە دایکەکەی پێی وت: ئەم بزنە و ئەو چەقۆیە ببە بۆلای ئەو پیاوانە و پێیان بڵێ: دایکم پێتان دەڵێ ئەم بزنە سەرببڕن و بیخۆن و بەشی ئێمەشی لێ بدەن، کوڕە هاتە لای پێغەمبەر

(٤٨٠) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٢٨٨/١٨)، والبزار (١٧٤٣)، والحاكم (المستدرك) (٨/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٤٩٧/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣١٣/٨) رواه ابزار ورجاله رجال الصحيح، وقال الحافظ ابن حجر في (الأصابة) (٧٢٤٣): رواة الطبراني بإسناد صحيح واللفظ له و للحاكم.

ﷺ و قسەی دایکی پێ ڕاگەیاند، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((إذهَبْ بِالشَّفْرَةِ و أْتِنِي بَالقدحِ)) واتە: چەقۆکە ببەرەوە و قاپێکم بۆ بهێنە، کوڕەکە وتی: ئەو بزنە لە شیر چۆتەوە (واتە: وشکی کردووە و شیری تیانییە)، پێغەمبەر ﷺ دیسان پێی فەرموو: ((بچۆ قاپێکم بۆ بهێنە))، کوڕەکە چوو قاپەکەی هێنا و پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بە گوانی بزنەکەدا، بزنەکە هاتە شیر، پێغەمبەر ﷺ شیرەکەی دۆشی و قاپەکەی پڕ کردوو فەرمووی: ئەمەیان ببە بۆ دایکت، ئەویش بردی بۆلای دایکی و تێری لێ خواردەوە، پێغەمبەر ﷺ دیسان تیایدا دۆشییەوە و پاشان فەرمووی: ئەمەیان ببە بۆلای خۆتان دای بنێ و قاپێکی ترم بۆ بهێنە، کوڕەکە ڕۆیشت و قاپێکی تری هێنا و پێغەمبەر ﷺ تیایدا دۆشی و دای بە ئەبوبەکر تا تێری لێ خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ قاپێکی تری دۆشی و خۆی و هاوەڵانی تێریان لێ خواردەوە، ئەبوبەکر ﷺ دەفەرموێت: ئەو شەوە لەوێ لاماندا و بۆ بەیانی بەڕێ کەوتین و ئەو ئافرەتە ناوی لە پێغەمبەر ﷺ نابوو (المبارك) واتە: پیاوە پیرۆزەکە.

ئەو ئافرەتەش پاش دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەدینە ماوەیەکی بەسەردا تێپەری و مەڕەکانی زیادی کرد و جەڵبێ مەڕی بەرەو شاری مەدینە هێنا بەنیازی فرۆشتنی، ئەبوبەکر بەلایاندا تێپەری و کوڕی ئافرەتەکە ناسییەوە بە دایکی وت: ئەوە ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ پیاوە پیرۆزەکەدا بوو ئەویش هەستا بۆلای ئەبوبەکر و پێی وت: ئەی بەندەی خوا ئەو پیاوەی کە لەگەڵت دابوو ئەو جارەی کە لاتان دایە لای ئێمە کێ بوو؟ ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: ئایا دەزانیت کێیە؟ ئەویش وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئافرەتەکە وتی: گەر دەتوانیت هەر ئێستا بم گەیەنەرە لای، ئەبوبەکر لەگەڵ ئافرەتەکەدا بەڕێ کەوتن تا بردییە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو ئافرەتە هەندێ (پەنیر و کەرەی) وەك دیاری هێنابوو لەگەڵ خۆیدا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ هەندێ جل و بەرگی دیاری بۆ ڕێك خست تاوەکو گەر ڕۆیشتەوە لەگەڵ خۆیدا بیبات، وە ئافرەتەکەش موسوڵمان بوو...) [٤٨١].

وە هەر لە ڕێ ڕۆیشتنەکەیدا بەرەو شاری مەدینە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵی بەڕێزی زۆر ووردبینانە هەڵوێستیان دەنواند بەرامبەر ئەو کەسانەی دەهاتنە ڕێگایان سەبارەت بەو پرسیارانەی کە ئاراستەیان دەکرا:

---

(٤٨١) أخرجه:البيهقي في (الدلائل) (٢/٢٢٢)، وقال ابن كثير في (البداية) (٣ /١٩١): إسناده حسن، وقال الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (١/٢٣٢): إسناده نظيف لكنه منقطع.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ سواری وشترەکەی بوو ئەبوبەکریش هەر لەسەر هەمان وشتر لە دواوە سوار بوو بوو، بەڕێ کەوتن بەرەو شاری مەدینە، ئەبوبەکریش ﷺ پیاوێك بوو پیر دیار بوو بەڕواڵەت، و پێغەمبەریش ﷺ گەنج دیار بوو بەڕواڵەت، بەڵام ئەبوبەکر ﷺ چونکە بەکاروان چێتی چوو بوو بۆ شام خەڵکی مەدینە و ئەو دەورو بەرە دەیان ناسی، لە ڕێگەدا پیاوی وا هەبوو دەگەیشت بە ئەبوبەکر ﷺ پێی دەوت: ئەی ئەبو بەکر ئەم پیاوە کێیە سوار بووە لەگەڵتدا لەسەر وشترکە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەیوت: ئەم پیاوە ڕێگەم نیشان دەدات، کابراش لەو وەڵامەدا وا تێدەگەیشت کە ئەم پیاوە ڕێگە ناسە (واتە: دلیل)ە وڕێی هاتووچۆی نیشان دەدات نەیدەزانی کە ئەبوبەکر ڕێی چاکە و خێری مەبەستە (واتە: ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺ و ڕێنموویی خەڵك دەکات)[٤٨٢].

(عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقطی لەیثی) شارەزا و ڕێگەناس و وریا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو بەڵام لەسەر ئاینی باو و باپیرانی بوو وە پیاوێکی متمانە پێکراو بوو خیانەتی نەدەکرد ئەویش هەر لە ڕێگە چۆڵەکانەوە پێغەمبەری ﷺ دەبرد بەرەو مەدینە.

## ئەو ڕێگەیەی پێغەمبەر ﷺ بەرەو شاری مەدینە پیایدا ڕۆیشت

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لە ئەشکەوتەکەوە لەگەڵ ئەبوبەکردا ﷺ بە مەبەستی کۆچ کردن بۆ شاری مەدینە ڕێگەی خوارووی مەککەی گرتەبەر، تا لایدایە کەناری خۆرئاوای دەریای سوور لە خوارووی (عوثفان) پاشان لەسەر بەرزاییەکانی (مەج)ەوە تێپەڕین تا گەیشتنە ڕێگاکەی نزیکی قەدید، لەو ڕێگەیەوە لایاندا بەرەو ڕێگە بەرزەکانی (هیرار)، ئەوێشیان بەجێ هێشت و بەرزایی حەفییائیشیان بڕی پاشان لای (مودلەجە)ەکەی سەقیفەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە شیوەکەی (مودلجە)ی (صحاح) ئینجا لەوێشەوە بەڕێکەوتن بەلای شیوی (مذجج)ی (ذی الغضن) کە شیوەکەی بەنو سولەیمەیەوە لە شیوی (ذی کشد)ەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە بەرزاییەکانی (ذی سلم) بۆلای ئەوپەڕی شیوەکەی (مودلیج)ەوە، ئینجا بەڕێکەوتن لە

(٤٨٢) أخرجه: البخاري (٣٩١١).

ڕێگەی (قاحە)وە بەرەو عەرج، و لەوێشەوە بەرەو پەنیەی غائیری لای دەستە ڕاستی (ڕکوبە) ئینجا بەرەو خواربووەوە بۆناو دۆڵی ڕیم و لەوێوە ڕۆیشتن بەرەو قوبائی نزیک شاری مەدینە)[٤٨٣].

وە پێش ئەوەی بگاتە قوبائی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگەکەیدا گەیشت بە کاروانێك کە لە شامەوە دەگەڕانەوە، عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ (دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بە هەندێ لە کاروان چییە موسوڵمانەکان گەیشت کە لە شامەوە دەگەڕانەوە (دیارە ڕێگەکەیان چوون یەك بووە) ئەوان بازرگان بوون تازە لە شامەوە گەڕابوونەوە زوبەیر ﷺ دوو پۆشاکی سپی بەخشی یە ئەبوبەکر و پێغەمبەر ﷺ کە بۆ سەفەرەکەیان بەکاری بهێنن)[٤٨٤].

## گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناو شاری مەدینە

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوەیمی کوڕی ساعیدە ﷺ دەفەرموێت: (هەندێ لە خزمانی خۆم کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوون بۆیان گێڕامەوە وتیان: کاتێ بیستمان پێغەمبەر ﷺ دەرچووە لە شاری مەککە بۆ شاری مەدینە وا هەستمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ نزیکە بگاتە شاری مەدینە، ئێمە هەموو ڕۆژێك کاتێ کە نوێژی بەیانیمان دەکرد دەچووین چاوەڕوانی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەکرد و ئەو جێگەیەمان جێ نەدەهێشت تا تینی خۆر ناچاری دەکردین بگەڕێینەوە ناو بەرەو ماڵ دەبووینەوە. چونکە ئەوکاتە کاتێکی گەرم بوو. دەفەرموێت: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکی شاری مەدینە بووەوە لەو کاتەدا ئێمە گەڕابووینەوە بۆ ماڵەکانمان)[٤٨٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کاتێك خەڵکی مەدینە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان پیاوێکی جولەکە چووە سەر قەڵایەك لە قەڵاکانی ناو شاری مەدینە (بەدوای چەند

---

(٤٨٣) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٦١١)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٠٨): فيه جماعة لم اعرفهم، وقال القرطبي في (الأستيعاب) (٨٢/١): حديث حسن، و عزاه السيوطي إلى البغوي وابن السكن وابن مندة، و ابو نعيم.

(٤٨٤) أخرجه: البخاري (٣٩٠٦)، والحاكم (٣ /١١)، وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٤٩٨/٢).

(٤٨٥) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٩١/٢) (٣٥٧) وقال محققاه: إسناده صحيح، والطبراني (التاريخ) (٣٨١/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٠٢/٢).

وشترێکدا دەگەڕا) لە سەر ئەو بەرزاییەوە چاوی کەوت بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کە پۆشاکی سپیان لەبەردا بوو لەدوورەوە دیار بوون. کاتێك جولەکەکە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بینی بەهەموو هێزی هاواری کرد: هۆ کۆمەڵانی عەرەب، هۆ کۆمەڵانی کوڕانی بەنی قیلە (واتە: دانیشتوانی ئەنصاری شاری مەدینە) [ئەوەی ئێوە چاوەڕێی دەکەن وا گەیشتە ئێرە]. دەفەرموێت: موسوڵمانان دەستیان دایە چەك و ڕۆیشتن بەرەو (حەڕڕە) بۆ پێشوازی کردن لە پێغەمبەری ئازیز ﷺ و نزیکیان بوونەوە، و گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ.

وە پێغەمبەر ﷺ بەلای دەستە ڕاستدا لایدایە لای کوڕانی بەنی عەمری کوڕی عەوف لە قوبائدا پێش شاری مەدینە، لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی (ربیع الاول)دا، ئەبوبەکر ناسراو بوو لای هەندێ کەس لە خەڵکی شاری مەدینە ئەوان پێشوازیان لێ دەکردن. ئەبوبەکریش سەلامی لێ دەکردن و ئەحواڵی دەپرسین، وە پێغەمبەریش ﷺ دانیشتبوو بەبێ دەنگ لەوێدا، چونکە ئەمە یەکەم جارە دێتە ئەم شارەوە زۆربەی دانیشتووانی مەدینە پێغەمبەریان ﷺ نەدەناسی و چاویان پێ نەکەوتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم جار لە ژێر سێبەری دار خورمایەکدا دانیشتبوو ئەبوبەکریشی لەگەڵدا بوو، ئەبوبەکر و پێغەمبەر ﷺ لە یەك تەمەندا بوون، دەفەرموێت: زۆربەشمان پێغەمبەرمان ﷺ نەدیبوو وە خەڵکی ئێجگار قەرەباڵغیان لێکرد و لێی کۆبوونەوە [ئەوانەشی کەلە ئەنصاریەکان هاتبوون بۆلای پێغەمبەر ﷺ سڵاویان لە ئەبوبەکر دەکرد بە بۆنەی هاتنیەوە وایان دەزانی کە پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەریش ﷺ بێ دەنگ دانیشتبوو و سەیری خەڵکی دەکرد]، تاوای لێ هات خۆرەکە هات بەسەر پێغەمبەردا ﷺ، پاشان ئەبوبەکر هەستا و عەباکەی کرد بە سێبەر بۆی و لەوێدا خەڵکی زانیان ئەوی سێبەری بەسەرەوە کراوە پێغەمبەری خوایە ﷺ [٤٨٦]، لەلای کوڕانی بەنی عەمری کوڕی عەوف لە قوباء چەند شەوێك پێغەمبەر ﷺ لەوێ مایەوە....).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ چواردە شەو لەوێ مایەوە لە قوباء و هەر لەوێش ئەو مزگەوتەی دروست کرد کە یەکەم جار بوو مزگەوت دروست بکرێت، پێغەمبەریش ﷺ خۆی بەشداری لەگەڵدا کردن)[٤٨٧]،

---

(٤٨٦) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٠٦).

(٤٨٧) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٢٨)، ومسلم (الصحيح) (٥٢٤)، ابوداود (السنن) (٤٥٣)، والنسائي (السنن) (٣٩/٢)،

شێوەی بەشداری کردنی پێغەمبەر ﷺ لە دروست کردنی مزگەوتی قوبائدا ،کە بەیەکەم مزگەوت دادەنرێت لەسەر خاکی مەدینەدا، سەبارەت بەم باسە شموسی کچی نوعمان بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەشداری لە دروست کردنی مزگەوتەکەدا، دابەزییە لای ئێمە، ئەم بینی بەردی وا گەورەی هەڵدەگرت وەخت بوو بەلادا بکەوێت، تەپ و تۆزی ئیش کردنەکە دیار بوو بە هەندێ سکی پێغەمبەرەوە ﷺ. پیاوێك لە هاوەڵانی خۆی دەهات و دەیوت: دایك و باوکم بە فیدات بێ لێم گەڕێ با ئەو بەردەت لێ وەرگرم، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: نەخێر تۆش بچۆ بەردێکی وەك ئەمە بهێنە و هەڵی بگرە، بەم شێوەیە تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ مزگەوتەکەی دروست کرد)[٤٨٨].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئیمامی عەلی ﷺ دوای دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بەرەو شاری مەدینە سێ ڕۆژ لەمەککە مایەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕاسپاردە و ئەمانەتانەی کە لای پێغەمبەر ﷺ بوو بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەوە بوو دوای گێڕانەوەی سپاردەکان، ئەویش گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ لە قوباء لەو کاتەشدا کاتی جومعە هاتە پێش، پێغەمبەریش ﷺ لای کوڕانی بەنی سالمی کوڕی عەوف لایدابوو لەو مزگەوتەی ناو شیوەکەی ڕانوناء لەوێدا پێغەمبەر ﷺ یەکەم نوێژی هەینی بۆ کردن)[٤٨٩].

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی لە قوبائەوە بچێت بەرەو مەدینە یەکەم جار ناردی بۆلای چەند کەسانێك لە کوڕانی بەنی نەجاڕی خزمانی خۆی کە دانیشتووی شاری مەدینە بوون، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ نوێنەری نارد بۆلای پیاو ماقوڵانی بەنی نەجاڕ ئەوانیش شمشێریان لە خۆیان بەست و هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئێستاش لەبەر چاومە کە چۆن پێغەمبەر ﷺ سواری وشترکەی بوو بوو وە ئەبوبەکریش لە دوایەوە و کوڕانی بەنی نەجاڕیش بەچەکەوە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە نیوەی ڕێگای نێوان قوباء و مەدینە)[٤٩٠].

---

وابن ماجه (السنن) (٧٤٢).

(٤٨٨) أخرجه:الطبراني في (الكبير) (٨٠٢/٢٤)، قال الهيثمي في(المجمع) (٤ /١١) (٥٨٩٨):رواه الطبراني في (الكبير) رجاله ثقات.

(٤٨٩) أخرجه:الطبراني في (الكبير) (٢٠٢/١٨)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٦٢/٦): رجاله ثقات.

(٤٩٠) أخرجه: البخاري (٣٩٣٢).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (من ڕام کرد لەناو منداڵەکانی شاری مەدینەدا (چونکە ئەنەس ئەو کاتە منداڵ بوو) وە منالان دەیان وت موحەممەد ﷺ هات و منیش ڕام دەکرد و هیچم نەدەبینی و ڕام دەکرد تا گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ و چاوم پێی کەوت کە لەگەڵ هاوەڵی بەڕێزی خۆی ئەبوبەکردا ﷺ بوو، ئاگام لێ بوو لای هەندێ لە باخە خورماکانی نێوان قوباء و مەدینە لایدا، پێغەمبەر ﷺ و کوڕانی بەنی نەجاڕ لەوێ پیاوێکی خەڵکی لادێیان نارد بۆ ئەوەی پیاوانی ئەنصاری شاری مەدینە ئاگادار بکەنەوە بە نزیك بوونەوەی پێغەمبەر ﷺ لەشاری مەدینە، بەگەیشتنی ئەو هەواڵە پێنج سەد کەس لە ئەنصاریەکان بەچەکەوە چوون بۆ پێشوازیکردن تا گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ و پێشوازیان لێ کرد)[٤٩١].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کە ئەنصاریەکان گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ سەلامیان لێ کرد و بە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکریان ﷺ وت: هەردووکتان سواری وشترەکەتان بن، پێغەمبەر ﷺ سواری وشترەکەی بوو ئەبوبەکریش ﷺ لەدواوە سوار بوو، پاشان هەر پێنج سەد چەکدارەکە بەدەوری پێغەمبەردا ﷺ بوون تاکو کەژاوەکەی گەیشتە ناو شاری مەدینە، ئینجا دەنگ بڵاوبووەوە بەناو هەموو کوچە و کۆڵانەکانی ناو شاری مەدینەدا و دەیان وت: ئەوا محمد هات ئەوا محمد هات، و هەموویان دەچوونە شوێنە بەرزەکان و دەیان وت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، کە هاتنە ناو شاری مەدینە دانیشتوانەکەی هەموویان سەیریان دەکرد و هەر هەموو خەڵکی مەدینە هاتبوونەدەر هەتا کچەکانیشیان لەسەر ماڵەکانیانەوە دەیان وت: دەبێ پێغەمبەر ﷺ کامەیان بێت؟)[٤٩٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (هەموو خەڵکی شاری مەدینە تەنانەت منداڵان و خزمەتکارانیشیان پێشوازیان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ، بە هەموو کوچە و کۆڵان و ڕێگاکاندا بڵاو بووبوونەوە، و دەگەڕان و دەیان وت: الله أکبر پێغەمبەری خوا ﷺ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هات ئەو ڕۆژە دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشم بینی!)[٤٩٣].

---

(٤٩١) أخرجه: أحمد (٢٢٢/٣) (١٣٣١٨) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، و ابو نعيم في (الدلائل) (١١٤/٢)، وابن ابي شيبة (٣٣٧/١٤)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٠٧/٢)، وقال الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (٢٣٤/١) صحيح، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (١٣٣) صحيح.

(٤٩٢) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩١١).

(٤٩٣) أخرجه: أحمد (٣)،وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، والبزار(٥٠)، وابن ابي شيبة.(٣٢٧/١٤)،

له ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷛ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە عەبدە حەبەشیەکانی ناو شاری مەدینە یاریان دەکرد وەك پێشوازی و خۆش حاڵیان بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ)(٤٩٤).

له ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە عەبدە حەبەشیە ڕەشەکانی ناو شاری مەدینە هەڵدەقونان و یارییان دەکرد بە حەربەکانیان و دەیان وت: محمد هات ﷺ محمد ﷺ پیاوێکی چاکە بە زمانی خۆیان، ئەنەسیش دەفەرموێت هیچ دیمەنێکم نەدی هاوشێوە بێت لەگەڵ پێشوازی کردنی خەڵکی مەدینە بۆ پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەیشتە ناو شاری مەدینە)(٤٩٥).

وە هەر ئەنەس ﷛ له ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە هەموو شتێك ڕووناك بووەوە و هیچ ڕۆژێکم نەدیوە چاك تر بێت و ڕووناك تر بێت لەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا گەیشتە ناو شاری مەدینە...)(٤٩٦)، بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو قوناغی یەکەم پێی خۆش بوو کە یەکەم جار لابداتە لای خزمانی لە بەنی نەجار کە خاڵوانی خۆی بوون.

## یەکەم ماڵێك کە پێغەمبەر ﷺ لایدایە لایان لە مەدینە

ئەبوبەکر ﷛ دەفەرموێت: (پیاوانی ئەنصار هەموویان بەیەکەوە کەوتبوونە دەمەقاڵێ سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لای کامیان لابدات تا ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ( أَنْزِلُ الليلةَ على بنِي النجارِ أخوالِ عبدِ المطَّلِبِ لِأُكْرِمَهُم بذلك) واتە: من ئەمشەو لادەدەمە لای کوڕانی بەنی نەجارِ خاڵوانی عبد المطلب بۆ ئەوەی

---

و ابو يعلى (١١٦)، وابن حبان (٦٢٨١) وقال محققه: صحيح.

(٤٩٤) أخرجه: أحمد (المسند) (١٦١/٣)، وابو داود (٤٩٢٣)، وصحيح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابي داود) (٤١١٥).

(٤٩٥) أخرجه: البيهقي في (السنن الكبرى) (٤٢٥٠).

(٤٩٦) أخرجه: أحمد (١٢٢/٣)، والدارمي (١/ ٤١)، والترمذي (٣٦١٨)، وفي الشمائل (٢٧٤)، وابن ماجه (١٦٣١)، والبغوي (٣٨٣٤)، وابن حبان (٦٦٣٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٦٨١) و (مختصر الشمائل) (٣٢٩) و (صحيح ابن ماجه) (١٣٢٢).

ڕێزیان لێ بگرم بە چوونم بۆلایان)[٤٩٧]، چونکە بەنی نەجار ئافرەتێکیان دابوو بە عەبدول موطەلیب کە باپیری پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاڵوانی خۆی دەژماردن.

لە ڕیوایەتێکی تردا شێوەی هاتنی پێغەمبەر ﷺ و لادانی بۆ ئەو ماڵەی کە تیایدا نیشتە جێ بوو لە شاری مەدینە بەوردی ڕوون دەبێتەوە:

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە وشترەکەی لەوێ یەخ درا و حەوایەوە کە لە نێوان خانووەکەی جەعفەری کوڕی محمد و حەسەنی کوڕی زەیددا بوو وە خەڵکی شاری مەدینە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا جێگە و شوێنت لێرە دەبێت؟ دیسان وشترەکە هەستایەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لێی گەڕێن ئەوە فەرمان پێ کراوە)، (ئینجا وشترەکە ڕۆیشت تا گەیشتە جێگا شوێنی مینبەری مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا وشترەکە یەخی لێدا و ئیتر لەوێ هەڵنەستایەوە)[٤٩٨] لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [وشترەکەی بە ڕێکەوت دوای ئەوەی لەو جێگەیە هەستا تا گەیشتە لای خانووەکەی ئەبو ئەیوب] لەوێ یەخی لێدا و وەستا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ماڵی کام خزمانم لێرەوە نزیکە؟) ئەبو ئەیوب هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نزیکترین ماڵم بەتۆ ئایا کۆپان و کەل و پەلەکان ببەمە ماڵەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

لە ڕیوایەتەکەی بوخاریدا دەفەرموێت: (ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو ئەیوب ﷺ فەرموو: جێگەی حەوانەوەیەکمان بۆ ئامادە بکە (واتە: بۆ پشوودان لە ناڕەحەتی سەفەر) ئەبو ئەیوبیش ڕۆیشت وە شوێنێکی بۆ ئامادە کرد و بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند کە بێت جێگەی بۆ ئامادە کراوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکر و هاوەڵانی فەرموو: (لە سایەی بەرەکەتی خواوە با بچین پشوو بدەین)، ئا لەو کاتەدا پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێ لادەدەیت و کوێ دەبێت بە ماڵت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پیاو لەگەڵ کەل و

---

(٤٩٧) أخرجه: أحمد (٣) وقال محققه إسناده صحيح إلى شرط مسلم، وابو يعلى (١١٦)، والبزار (٥٠)، وابن حبان (٦٢٨١).

(٤٩٨) أخرجه: سعيد بن منصور في (السنن) (٢٩٧٨)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٠٩/٢)، وقال العمرى في (السيرة الصحيحة) (٢١٩/١): حسن لغيره.

پەلەکەی خۆیەتی))[٤٩٩] (واتە کەل و پەلەکەم ئەبو ئەیوب بردویەتیەوە ماڵی خۆیان منیش لەگەڵ کەل وپەلەکەم دەبم). ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژ دەهاتە کەپرێك کە لەبەردەم ماڵەکەی ئەبوئەیوبدا بوو گسکیان لێ دەدا و ئاوڕشێنیان دەکرد بۆ ئەوەی کەمێك فێنك بێت و پێغەمبەر ﷺ دوانزە شەو لەوێ مایەوە و پاشان فەرمانی کرد بە دروست کردنی مزگەوت)[٥٠٠].

ئا بەو شێوەیە خەڵکی شاری مەدینە پێشوازییان لە خۆشەویستی خۆیان پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، وە ئەم ڕیوایەتانە دەیسەلمێنێت کە ئافرەت بەشداری لە پێشوازی کردنی پێغەمبەری خوادا ﷺ نەکردووە بە دەف و گۆرانی، بەڵام ئەو ڕیوایەتەی (وا دەگەیەنێت کە سەرتاسەری شاری مەدینە بە ژن و پیاو و گەورە و بچوکەوە لە قوبائەوە هەموویان سەر تاسەر بە دەف و ئاواز و بە سروودی (طلع البدر علینا) پێشوازیان لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، پێویستە ئەوە بزانین کە ئەو ڕیوایەتە ڕیوایەتێکی لاوازە)[٥٠١] وە ئەو ڕیوایەتەی لەو بارەوە هاتووە بە هیچ جۆرێ باسی ئەوەی تیا نییە کە دەف بەکار هاتبێت یان ئاواز یان سروود ئیمامی بەیهەقی دەیسەلمێنێت کە (طلع البدر علینا) لەوێ نەبووە بەڵکو لە گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بووە بە سی هەزار چەکدارەوە لە غەزای تەبوکەوە بەرەو شاری مەدینە، کاتێ کە خەڵکی مەدینە پێشوازییان لێ کردووە زۆر بەشیان منداڵانی مەدینە بوون، هەروەها ئیبنو قەیم ﷺ لە (زاد المعاد)دا دووپاتی دەکاتەوە و دەی سەلمێنێت (ثنیات الوداع) کە لە سرودەکەدا هاتووە لە ڕێگەی شامە نەك لە ڕێگەی مەدینە، چونکە ڕەێ تێ ناچێت کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگەی مەککەوە نەگەیشتبێتە شاری مەدینە و چووبێت لە ڕێگەی شامەوە هاتبێتە ناو شاری مەدینەوە.

---

(٤٩٩) أخرجه: البيهقي في (الدلائل) (٥٠١/٢)، و الأصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٦٦/١) وقال محققه: إسناده صحيح مرسل.

(٥٠٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩١١).

(٥٠١) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) بدون إسناد، و موسى ابن عقبة في (المغازي) (١٨٣/١) بدون إسناد ايضاً، وقال الحافظ العراقي في(تخريج الأحياء) (٢٧٥/٢): رواه البيهقي في (الدلائل معضلا و ليس فيه ذكر الدفّ و الألحان)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٢٦٢/٧): سنده معضل و قد ورد منقطعاً، و اشار ابن القيم رحمه الله في (زاد المعاد) (١٠١/١) إلى ان ذلك وقع حين قدومه من غزوة تبوك، و إلى ذلك اشار ايضاً البيهقي في(الدلائل) كما في(البداية) (١٩٧/٣)، وضعفه صاحب (الكشف اللالهي) (٧٣٤)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (٦٣/٢) (٥٩٨) ضعيف.

## مانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی ئەبو ئەیوب ﷺ دا

پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئەبو ئەیوب ﷺدا مایەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە سازاندی کە مزگەوت دروست بکرێت. وە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ئەبو ئەیوب ﷺ بە جوانترین شێوە ڕێزی لە پێغەمبەر ﷺ دەگرت کاتێك لە ماڵەکەیدا بوو وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ لایدایە لای ماڵەکەمان و هاتە ژوورەوە، چووە نهۆمی خوارەوە و من و دایکی ئەیوب چووینە نهۆمی سەرەوە)[٥٠٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ئەبو ئەیوب ﷺ شەوێکیان هەر لە خۆیەوە خەبەری بۆوە و پێی وتم: باشە خۆ ئێمە ئێستا بەسەر سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووچۆ دەکەین چۆن شتی وا دەبێت؟ هەر ئەو شەوە چووینە پەنا دیوارەکەوە بۆ ئەوەی لەناو ژوورەکەدا نەخەوین)[٥٠٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [ئەو شەوە سەرتاسەر ئەبو ئەیوب خەوی لێ نەکەوت نەوەك پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەری بێتەوە و تەپ و تۆز لە سەقفەکەوە بکەوێتە سەر ئازاری پێ بگات کاتێ بەیانیمان لێ بووەوە ئەبو ئەیوب خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمشەو نەمن و نەئوم ئەیوب خەو نەچۆتە چاومان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (چیی وای لێ کردیت ئەی ئەبو ئەیوب؟)، ئەویش وتی: بیرم کردەوە ئێمە لەناو خانوویەکداین تۆ لە نهۆمی خوارووی ئێمەیت، گەر ئێمە هاتوو چۆ بکەین تەپ و تۆز لە سەقفەکەوە دێتە خوارەوە بەسەرتدا و ئازارت دەدا یاخود تەقە تەقی پێڵاوەکانمان کە دێین ودەچین ئازارت دەدات و بیرم کردەوە کە من لە نێوان تۆ و خوادام (واتە: وەحی لە سەرەوە دێت بۆ لات من لەنێوانتاندام][٥٠٤].

---

(٥٠٢) أخرجه:أحمد (١٠٣/٥) (٤١٥،١٠٦)،ومسلم (٢٠٥٣)، والترمذي (١٨٠٦)، والطبراني في (الكبير) (٣٨٥٥،٣٩٨٦)، والحاكم (المستدرك) (٤٦١/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٥١٠/٢)، وابن هشام (السيرة) (٩٨/٢) واللفظ له، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الترمذي) (١٤٧٦) و (الأرواء) (٢٥١١)، وقال الشيخ مقبل بن هادى الوادعيفي (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٢٠٣): حديث حسن.

(٥٠٣) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٢٠٥٣).

(٥٠٤) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٣٩٨٦).

[پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنِّي أَرْفَقُ بِي أَنْ أَكُونَ فِي السُّفْلَى لِمَا يَغْشَانَا مِنَ النَّاسِ))] واتە: (چاکترە بۆ من و بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆلام کە من لە نهۆمی خوارەوە بم)، ئەبو ئەیوب ﷺ دەفەرموێت: گۆزەیەکمان هەبوو جارێکیان ئاوەکەی ڕژا و من و ئوم ئەیوب پارچە لبایەکمان هەبوو وە هیچ لێفە وپەتۆیەکمان نەبوو بیدەین بە خۆماندا تەنها ئەوەندە نەبێت ئێمە بەو پارچە لبایەوە کەوتینە سڕینەوەی ئاوەکە نەوەك دڵۆپە ئاوێك دابەزێتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ)[٥٠٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [ئەبو ئەیوب ﷺ دیسان هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ، و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بە هیچ جۆرێ ناچمە ناو خانویەکەوە کە تۆ لە نهۆمی خوارەوەیدا بیت؟ پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەبو ئەیوب چووە نهۆمی سەرەوە وە ئەوانیش هاتنە نهۆمی خوارەوە] ئەبو ئەیوب هەموو جار خواردنی ئامادە دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆی دەنارد وەك دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئێمە چاوەڕێمان دەکرد من و ئوم ئەیوب هەتا خواردنەکە دەگەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ ئینجا ئێمەش لە جێگە پەنجەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەمان خوارد کە ئەو لێی خوارد بوو، دەمان ویست بەرەکەتمان بەر بکەوێت تا ئەوە بوو شەوێکیان، خواردنەکەمان بۆ پێغەمبەر ﷺ ئامادەکرد، بەڵام هەندێ پیاز و سیری تیا بوو وە چاوەڕێمان کرد تا پێغەمبەر ﷺ بیخوات پاش ماوەیەك پێغەمبەر ﷺ خواردنەکەی گەڕاندەوە بۆلامان وە سەیرمان کرد شوێن دەستی پێغەمبەری ﷺ پێوە دیار نەبووکە لە خواردنەکەی خواردبێت، منیش ترسام و چوومە خزمەتی و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایك و باوکم فیدات بێ خواردنەکەت گەڕانەوە لامان و نەمان بینی شوێن دەست و پەنجەکانی تۆی تیا بێت، پێشتر تۆ دەتگێڕایەوە لامان ئێمە بەشوێن پەنجەی تۆدا دەگەڕاین و لەو جێگەیەوە دەمان خوارد تا بەرەکەتمان دەست بکەوێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بۆنی ئەو سیرەم کرد و منیش پیاوێکم چپەم لەگەڵدا دەکرێت)[٥٠٦].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (من پیاوێکم فریشتە دێت بۆلام و بە چپە قسەم لەگەڵ دەکات منیش پێم خۆش نییە کەهات بۆلام ئەو بۆنە ناخۆشەم

---

(٥٠٥) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٤٦١/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(٥٠٦) أخرجه: مسلم (٢٠٥٣).

لە دەمەوە بێت بەڵام ئێوە بیخۆن)[٥٠٧]، وەك چۆن لە فەرموودەیەكی صەحیحدا هاتووە كە فریشتەكان نارەحەت دەبن بەبۆنی ناخۆش وە بۆنی خۆشیان پێ خۆشە، لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سیر و پیازەكە حەرامە؟. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر)[٥٠٨] (بەڵام بەلامەوە چاك نییە لەبەر بۆنەكەی، ئەبو ئەیوبیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئارەزووت لێی نەبێت منیش ئارەزوم لێی نیە)[٥٠٩] بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ لەوێ مایەوە.

## موسوڵمان بوونی عەبدوڵلای كوڕی سەلام

عەبدوڵلای كوڕی سەلام یەكێك بوو لە پیاوە ناودار و زانا جولەكەكانی ناو شاری مەدینە، هەر بە بیستنی هەواڵی گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە یەكسەر دەستی لە كارەكەی هەڵگرت و خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بە چاو و گوێی خۆی بۆی دەركەوێت كە ئەو پێغەمبەرە یان نا، ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەدینە لای ماڵی ئەبو ئەیوب لایدا و لەوێ دانیشتبوو قسەی دەكرد لەگەڵ خەڵكی ئەو دەوروبەرە، ئەو هەواڵە گەیشتە عەبدوڵلای كوڕی سەلام كە لەناو باخە خورماكەی خزمانی خۆیدا بە داسێكەوە لقە خورماكانی دەبڕی كە ئەو هەواڵەی بیست پەلەی كرد و وازی لە كارەكەی هێنا ودەستی لێ هەڵگرت و بەپەلە هات تا خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ گرت و پاشان گەڕایەوە ماڵەوە)[٥١٠]. چۆنێتی گەیشتنی بە پێغەمبەر ﷺ و پرسیارەكانی ئەم باسە خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە خەڵكی لێی كۆبوونەوە و فەرەباڵغیان لێ كرد و منیش چووم لەگەڵ خەڵكیدا بۆ ئەوەی چاوم پێی بكەوێت كاتێ ڕوویم لێ دەركەوت بەتەواوەتی زانیم كە ئەو دەم وچاوە لە دەم وچاوی درۆزن ناچێت، وەكو عەبدوڵلای كوڕی سەلام ﷺ دەفەرموێت: یەكەم قسە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دانیشتوانی شاری مەدینەی كرد ئەوە بوو كە فەرمووی: ((یا أَیُّها الناسُ أَفْشُوا السلامَ ، و أَطْعِمُوا الطَّعَامَ ، و

---

(٥٠٧) أخرجه:أحمد (١٠٣/٥).

(٥٠٨) أخرجه: مسلم (٢٠٥٣).

(٥٠٩) أخرجه: الترمذي (٨٠٦).

(٥١٠) أخرجه: البخاري (٩٣١١).

صلُّوا الأرحامَ ، و صلُّوا بِالليلِ والناسُ نِيامٌ ، تَدْخُلوا الجنةَ بِسَلامٍ)) واتە: ئەی خەڵكینە سەلام بەرپابكەن لە نێوانتاندا ، خواردن ببەخشن و سەردانی خزمانتان بكەن ، كاتێ خەڵكی نوستوون شەو نوێژ بكەن، بەسەلامەتی دەچنە بەهەشتەوە](٥١١).

عەبدوڵڵا چەند پرسیارێكی لێ كرد دوای گوێ بیست بوونی وەڵامەكەی لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ عەبدوڵڵای كوڕی سەلام موسوڵمان بوو، ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ ئەم ڕیوایەتە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (كاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتبووە ناو شاری مەدینە، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام لەم هەواڵە بە ئاگابوو و هات و پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی هەندێ شت وە پێی وت: پرسیارت لێ دەكەم سەبارەت بە سێ شت تەنها پێغەمبەر نەبێت كەس نایزانێت: یەكەم: نیشانەی كۆتایی زەمان چییە؟ وە یەكەم خواردنی خەڵكانی بەهەشت چییە؟ وە بۆچی هەندێ جار پیاو لە باوكی خۆی دەچێت یان شێوەی لە دایكی خۆی دەچێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێستا پێش تۆزێك جبریل ﷺ ئەم سێ شتەی پێ ڕاگەیاندم، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام وتی: جبریل ئەوە جولەكەكان بە دوژمنی خۆیانی دەزانن لەناو مەلائیكەكاندا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أمَّا أوَّلُ أشْرَاطِ السَّاعَةِ: فَنَارٌ تَحْشُرُهُمْ مِنَ المَشْرِقِ إلى المَغْرِبِ، وأَمَّا أوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أهْلُ الجَنَّةِ فَزِيَادَةُ كَبِدِ الحُوتِ، وأَمَّا الوَلَدُ فَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ المَرْأَةِ نَزَعَ الوَلَدَ، وإذَا سَبَقَ مَاءُ المَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ نَزَعَتِ الوَلَدَ إلى أَبِيهِ، و إذَا سَبَقَ مَاءُ المَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ نَزَعَ الوَلَدَ إلى أُمِهِ)) واتە: (یەكەم نیشانەی ئاخر زەمان ئاگرێكە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دێت و خەڵكی كۆدەكاتەوە، وە یەكەم خواردنێك كە خەڵكی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری حووتە، وە سەبارەت بە منداڵ گەر ئاوی پیاو پێش ئاوی ژن كەوت ئەوا منداڵەكە لە باوكی دەچێت، وە گەر ئاوی ژن پێش ئاوی پیاو كەوت ئەوا منداڵەكە لە دایكی دەچێت) پاشان عەبدوڵڵا وتی: (من شایەتی دەدەم كە هیچ خوایەك نییە تەنها (الله) نەبێت و تۆش پێغەمبەری خوایت ﷺ، وە ئەوەی كە پێی هاتوویت لەلایەن خواوە هاتووە كە ئاینی ئیسلامە).

دواتر عەبدوڵڵا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جولەكەكان كەسانێكی بوختان

---

(٥١١) أخرجه: الدارمي (١٤٣٢)،والترمذي (٢٤٨٥)، وابن ماجه (٣٢٥١،١٣٣٤)، والحاكم (المستدرك) (١٣/٣)، وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٠١٩) و(صحيح ابن ماجه) (١٠٩٧،٢٦٣٠) و(صحيح الترغيب) (٦١٢) و (صحيح الجامع) (١٠٨٥).

چین وەباش دەزانن کە من گەورەیانم و کوڕی زانایانم تۆ بانگیان بکە و پرسیاریان لێ بکە پێش ئەوەی بزانن کە من موسوڵمان بووم، چونکە گەر ئەوان بزانن من موسوڵمان بووم شتی وا دەڵێن کە لەمندا نییە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە دوایاندا و جولەکەکان کۆبونەوە (دیارە تاقمی سەرکردەکانیان) و هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و کە چوونە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ((يا مَعْشَرَ اليَهُودِ، ويْلَكُمْ، اتَّقُوا اللَّهَ، فَواللَّهِ الذي لا إلَهَ إلَّا هُوَ، إنَّكُمْ لَتَعْلَمُونَ أنِّي رَسولُ اللَّهِ حَقًّا، وأنِّي جِئْتُكُمْ بحَقٍّ، فأسْلِمُوا)) واتە: (ئەی کۆمەڵانی جولەکە ئاگاتان لە خۆتان بێت و لەخوا بترسن، سوێند بەو خوایەی هیچ خوایەك نییە تەنها ئەو نەبێت، ئێوە باش دەزانن کە من پێغەمبەری خوام ﷺ بەڕاستی وە ئەوەی کە پێی هاتووم حەق و ڕاستەو ئێوەش موسوڵمان ببن) ئەوانیش وتیان: شتی وا نازانین، پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك ئەو وتەیەی دووبارە کردەوە لێیان.

پاشان دوایی پرسیاری لێکردن و فەرمووی: ((عەبدوڵلای کوڕی سەلام چۆن پیاوێکە لەناوتاندا؟)) ئەوانیش وتیان: سەروەرمانە و زانامانە، چاکترینمانە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەگەر موسوڵمان بوو؟)) وتیان: حاشا بۆ خوا ئەوە قەت موسوڵمان نابێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەگەر موسوڵمان بوو؟)) وتیان: حاشا بۆ خوا ئەو قەت موسوڵمان نابێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەگەر موسوڵمان بوو؟)) وتیان: حاشا بۆ خوا ئەوە قەت موسوڵمان نابێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((عەبدوڵلای کوڕی سەلام وەرە دەرەوە بۆلایان))، (دیارە: لە ژوورێکی پشتەوە بووە)، عەبدوڵڵا هاتە دەرەوە بۆلایان و پێی وتن: شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە تەنهای (الله) نەبێت، وە محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە ئەی کۆمەڵانی جولەکە لە خوا بترسن سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نییە تەنها ئەو نەبێت ئێوە باش دەزانن کە ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ و بە پەیامی حەق و ڕاستی هاتووە، جولەکەکانیش وتیان: عەبدوڵڵا خراپمانە و کوڕی پیاو خراپمانە وبوختانیان بۆ کرد و وتیان: درۆ دەکەیت، ئەوە بوو عەبدوڵڵا وتی: ئالەوە دەترسام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئاوا وەڵامت بدەنەوە، [دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کردن کە بچنە دەرەوە][٥١٢].

---

(٥١٢) أخرجه: البخاري (٣٩٣٨،٣٩١١).

## دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ

سەبارەت بە دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ئەم بەسەرهاتە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە لە هەر جێگەیەکدا کاتی نوێژ بهاتایە لەو جێگەیە نوێژی دەکرد هەتا لەناو پشتیری مەڕیشدا بوایە، ئینجا فەرمانی کرد بە دروست کردنی مزگەوت، و ناردی بەدوای کوڕانی بەنی نەجاڕدا ئەوانیش سەرکردەکانیان هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموون: ئەی کوڕانی بەنی نەجاڕ ئەم باخەتان کە لێرەدا هەیە بۆم بخەملێنن (واتە: نرخی چەندە با پارەکەیتان بدەمێ و لێتان بکڕمەوە) ئەوانیش وتیان: نەخێر وەڵاهی داوای نرخەکەی ناکەین تەنها پاداشتی خوا نەبێت، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ئەو ڕۆژە لەو باخە خورمایەدا کە هی بەنی نەجاڕ بوو خەرمانێکی تیا بوو کە خاوەنەکەی دوو هەتیوو بوون ناویان سەهل و سوهەیل بوو وە لای سەعدی کوڕی زوراڕە بوون، وە هەندێ لە موسوڵمانان سەرەتا نوێژیان لە ناو ئەو باخەدا دەکرد وە ئەو شوێنەش ئەو جێگەیە بوو کە پێغەمبەر ﷺ وشترەکەی گەیشتبووە لای و لەوێ یەخی لێدا بوو یەکەمجار، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەمە ماڵەکەمانە ئەگەر خوا ویستی لی بێت)).

ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەردوو منداڵەکەی بانگ کرد بۆ ئەوەی شوێن خەرمانەکە و چواردەورەکەیان لێ بکڕێتەوە و بیکات بە مزگەوت، دوو منداڵەکە وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە بە دیاری ئەی بەخشین بە تۆ، پێغەمبەریش ﷺ هەرگیز ڕازی نەبوو کە بە دیاری وەری بگرێت، تا پێغەمبەر ﷺ لە کۆتاییدا لێی کڕینەوە بە پارە، ئینجا ئەو شوێنەی کرد بە مزگەوت، و ئەو شوێنەش سێ شتی تیا بوو هەندێ گۆڕی موشریك و کەلاوە وەهەندێ دار خورماشی تیا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە گۆڕی موشریکەکان هەڵکەندرێن و ئێسك و پروسکەکانیان بگوێزرێتەوە، فەرمانیشی کرد ئەو کەلاوانە تەخت بکرێن، وە ئەو دارخورمایانەش ببڕدرێن، دارخورماکان بڕان و کرانە پێشی مزگەوت، پاشان دەست کرا بە دروست کردنی مزگەوت سەرەتا هەردوولای بە بەرد دروست کرا تەنها ئەملاو ئەولای دەرگاکانی نەبێت، وە هاوەڵە بەڕێزەکان هەر هەموو بەشداری یان لە دروست کردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺدا کرد، وە پێغەمبەر ﷺ خۆی خشتە قوڕەکانی هەڵدەگرت

و لەبەر خۆیەوە دەی فەرموو:

(هذا الحِمالُ لا حِمالَ خَيْبَرْ     هــذا أبــرُّ رَبَّنا وأَطْهَــرْ
للَّهُمَّ إنَّ الأجْرَ أَجْرُ الآخِرَهْ     فارْحَمِ الأنْصارَ، والمُهاجِرَهْ)[٥١٣]

واتە: ئا ئەمە حەماڵی یە نەك حەماڵەکانی خەیبەر ئا ئەمە پاکتر و چاکترە لای خوای خۆمان، خوایە تەنها پاداشتی کۆتایی نەبێت نامانەوێت، خوایە خۆش ببە، لە ڕیوایەتێکی تردا (خوایە ڕەحم بکە) بە کۆچکاران و پشتیوانەکان).

بەم شێوەیە سەرجەم هاوەڵەکان بە سەرکردەکانیانەوە بەشداری یان کرد لە دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، سەفینەی ؓ خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ بناغەی مزگەوتەکەی دانا یەکەمجار ئەبوبەکر ؓ بەردێکی گەورەی هێنا و دوای ئەو عومەر ؓ بەردێکی هێنا، ودوای ئەویش عوسمان بەردێکی هێنا، و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هؤلاء وُلاةُ الأمرِ مِن بعدِي))[٥١٤] واتە: ئەوانە سەرکردەکانی دوای منن).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (عەمماری کوڕی یاسر کە دایك و باوکی پێشتر شەهید کرابوون بە دەستی کافرەکان و خۆی بەتەنها کۆچی کردبوو بۆ مەدینە، لەوێدا چست و چالاکانە هەڵدەسووڕا بۆ دروست کردنی مزگەوتەکە، لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ هەواڵێك دەدات بە گوێیدا و بەسەرهاتەکەش، ئەبو سەعیدی خودری ؓ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئێمە یەك خشت یەك خشتمان هەڵدەگرت، بەڵام عەممار دوو خشتی بەیەکەوە هەڵدەگرت لە کاتی دروست کردنی مزگەوتەکەدا، پێغەمبەر ﷺ عەمماری بینی کە تەپ و تۆزێکی زۆر بە جلەکانییەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆی تەکاند وپێی فەرموو: ((وَيْحَ عمَّارٍ تقتُلُه الفئةُ الباغيةُ يدعوهم إلى الجنَّةِ ويدعونَه إلى النَّارِ)) واتە: (هاوار بۆ عەمار کۆمەڵێکی سەرکەش دەی کوژن ئەم بانگیان

---

(٥١٣) أخرجه: البخاري (٣٩٣٢،٣٩٠٦).

(٥١٤) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي وابن ابي عاصم في (السنة) (١١٩١) وقال محققه: إسناده حسن، والبيهقي في (شعب الأيمان) (٥٥٣/٢)، ونعيم بن حماد في (الفتن) (٢٥٦) وقال محققه: إسناده حسن، و الأصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٢٩/١) وقال محققه: إسناده ضعيف. (تەنها ئەم ڕیوایەتەم بۆ زانیاریت هێناوە).

دەکات بۆ بەهەشت و ئەوانیش بانگی دەکەن بۆ دۆزخ) عەماریش وتی: پەنا بە خوای گەورە دەگرم لە فیتنە)[٥١٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو سەعید ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە یەك خشتمان هەڵدەگرت بەڵام عەممار دوو خشت دوو خشتی هەڵ دەگرت، خشتێك بۆ خۆیی و خشتێك لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ کە عەمماری بینی بەو جۆرە دەستی هێنا بە قژی عەمماردا، چونکە قژێکی بژی هەبوو، تەپ و تۆزەکەی قژی بۆ دەتەکاند وە پێی فەرموو: (يا عمَّارُ ألا تحمِلُ ما يحمِلُ أصحابُكَ) واتە: (ئەی عەممار تۆ بۆ وەك هاوڕێیانت یەك خشت هەڵناگریت) عەمماریش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پاداشتم دەوێت لای خوای گەورە، پێغەمبەر ﷺ دەستی بە پشتیدا هێنا و فەرمووی: (ابنُ سُمَيَّةَ للناسِ أجرٌ ولك أجرانِ وآخرُ زادك شربةٌ من لبنٍ وَيْحَ عمَّارٍ تقتُلُه الفئةُ الباغيةُ يدعوهم إلى الجنَّةِ ويدعونَه إلى النَّارِ) واتە: کوڕەکەی سومەییە خەڵکی یەك پاداشتیان دەست دەکەوێت بەڵام تۆ دوو پاداشتت دەست دەکەوێت و دوا ڕزقی تۆ لەژیاندا قومە شیرێك دەبێت، هاوار بۆ عەمار کۆمەڵێکی سەرکەش دەی کوژن، ئەم بانگیان دەکات بۆ بەهەشت ئەوان بانگی دەکەن بۆ دۆزەخ) عەماریش لە کۆتایی قسەکەی پێغەمبەردا ﷺ وتی: پەنا بە خوا دەگرم لە فیتنە)[٥١٦].

پێغەمبەر ﷺ بە هیچ جۆرێك نەیدەویست مزگەوتەکەی هیچ جۆرە ڕیاء وفیز و شانازی و شاکارانەی پێوە دیار بێت، بەڵکو دەیویست کە سادە و ساکار بێت وەك نیمچە هۆڵێك بێت، سەبارەت بە دروست کردنی مزگەوتەکە حەسەنی بەصری ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ مزگەوتەکەی خۆی، دروست کرد هاوەڵانی یارمەتییاندا بۆ دروست کردنی، پێغەمبەریش ﷺ خشتی لەگەڵ هەڵدەگرتن تا سەر سنگی هەموو خۆڵاوی بووبوو، هاوەڵانیشی پێیان دەوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا سەقفێکی باش بۆ مزگەوتەکە نەکەین لە وەڵامدا فەرمووی: (ابنوه عَريشًا كعَريشِ موسَى) واتە: (نەخێر بە شێوەی کەپرێك دروستی

(٥١٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٨١٢،٤٤٧)، ومسلم (الصحيح) (٢٩١٥) وأحمد (٥/٣).

(٥١٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٩٠/٣)، والطيالسي (٢١٦٨)، و عبد الرزاق (٧٨٦٢٠)، والحاكم (المستدرك) (١٩٤/٢) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٠٧٩) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وقال ابن كثير في (البداية) (٣/ ٢١٧): رواه عبد الرزاق (المصنف) و إسناده على شرط الصحيح، وقال الشيخ شعيب الأرناؤط في تحقيق (المسند) (١١٠١١): إسناده صحيح على شرط مسلم.

بکەن وەك کەپرەکەی موسا ﷺ)، دوایی بە حەسەنی بەصرییان وت: کەپرەکەی موسا چەندە بەرز بوو، ئەویش وتی: ئەوەندە بەرز بووە دەستی بەرز بکردایەتەوە دەگەیشتە سەقفەکەی)[٥١٧].

طەلقی کوڕی عەلی حەنفی دەڵێت: هاتمە خزمت پێغەمبەر ﷺ تەماشام کرد خۆی و هاوەڵانی مزگەوت دروست دەکەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ کارکردنی هاوەڵانی بە دڵ نەبوو، منیش خاکەنازەکەم گرت بەدەستەوە و خۆڵ و ئاوەکەم تێکەڵ کرد و قوڕێکی چاکم گرتەوە، پێغەمبەر ﷺ وەك کارەکەی منی زۆر بەلاوە باش بوو بێت فەرمووی: ((رَبِ الْيَمَامِيَّ مِنْ الطِّينِ، فَإِنَّهُ أَحْسَنُكُمْ [فإنَّه أضبطُكم للطِّينِ] لَهُ مَسًّا وَأَشَدُّكُمْ مَنْكِبًا))[٥١٨] واتە: ئەو پیاوەی یەمامە نزیك بکەنەوە لە قوڕەکە ئەو شان و قوڵی لە ئێوە بەهێزترە و جوانتر کارەکە دەکات و باشتر ڕێکی دەخات.

ئیبنو قەیم ﷺ سەبارەت بە دروست کردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەلای ڕاستی مزگەوتەکەوە ماڵەکانی خۆی دروست کرد کە ژوور ژوور بوون وە هەموو ماڵی خێزانەکانی خۆی بوو سەقفەکانیشی هەر هەموو لە قەدی دار خورما بوو لەگەڵ هەندێ پەلە خورمادا کە خۆڵیان بەسەرەوە بوو)[٥١٩].

لە ڕیوایەتێکدا ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ دروست کرا بە خشتی قوڕ، وە سەقفەکەشی پەلی دار خورما بوو، وە کۆڵەکەکان و دارە ڕاکەشی لە قەدی دارخورما بوو)[٥٢٠] مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە بوو تاکو خۆی لە ناویدا بوو بە هیچ جۆرێ دەستکاری نەکرا تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد ئینجا ئەبوبەکر تا سەردەمی خۆی دەستکاری مزگەوتەکەی نەکرد بەڵام لە سەردەمی

(٥١٧) أخرجه: ابن سعد في (الطبقات) (٥/٢)، والبيهقي في (الدلائل) (٥١٠/٢)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٦١٦): حسنٌ بطرقه.

(٥١٨) أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٩/ ٢٧،٣١) وقال محققه: حديث حسن، وابن حبان (١١٢٢) والطبراني(٨٢٤٢).

(٥١٩) انظر: (زاد المعاد) لابن القيم (٣/ ٥٦).

(٥٢٠) ابن القيم رحمه الله دەفەرموێت: ((دیارە هۆڵێکی چوار گۆشە بووە و چوار دەرگای تیا بووە (والله أعلم) بووە وە سەقفەکەشی وەکو باسکرا پەلکی دارخورما و قەدەکانی بووە و خۆڵیان کردۆتە سەری کە باران باریوە قوراوەکەی هاتۆتە خوارەوە و تێکەڵا بە لمەکە بووە وموسوڵمانان و پێغەمبەر ﷺ لەو قوڕاوەی ناو مزگەوت سوجدەیان بردووە و هەتا هەندێ جار دەم و چاوییشیان قوڕاوی بووە)).

ئیمامی عومەردا مزگەوتەکە هەندێ لای کۆن بوو بوو بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستیان کردەوە و (واتە: بە خشتە قوڕ و پەل و قەدی دار خورما) بەڵام ئیمامی عوثمان ؓ لەکاتی خەلافەتی خۆیدا خەڵکی زۆر بوون و مزگەوت قەرە باڵغ بوو بەناچاری مزگەوتەکەی هەندێ گەورە کرد، ئینجا دیوارەکانی بەبەردی نەقاڕی نەخش کراو لەگەڵ قسلاودا دروست کرد لە جیاتی قوڕ بۆ ئەوەی زیاتر بەرگە بگرێت، وە کۆڵەکەکانی بە داری ساج دروست کردووە کە هەندێ نەخشی تیادا کرا بوو)[٥٢١].

بەم شێوەیە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ مینبەری تیا نەبووە لەکاتی وتاردانندا دەچووە سەر قەدی دار خورمایەك کە لە پێشی قیبلەی مزگەوتەکەدا بوو، دوای ئەوە بۆ یەکەم جار مینبەری بۆ دروست کرا، سەبارەت بە دروست کردنی مینبەر بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەنەس ؓ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا لە ڕۆژی جومعەدا لەسەر قەدی دار خورمایەك [لەڕیوایەتێکی تردا: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ؓ دەفەرموێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مینبەرێکت بۆ دروست بکەین لە ڕۆژی جومعەدا بچیتە سەری تا خەڵکی بتبینن وە تۆش دەنگت بگاتە خەڵکی و وتارەکەت ببیستن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئێمەش مینبەرێکمان بۆ دروست کرد کە سێ پلیکانە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی وتارداندا دەچووە سەری] یەکەمجار کە مینبەرەکە دروست کرا و خرایە جێگەی خۆی، کاتێ پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەرەکە بۆ ئەوەی وتار بدات، دارە کۆنەکە کە پێش تر هەمووجار دەچووە سەری و وتاری لەسەر دەدا نوزە نوزێکی لێهات و سەرجەم موسوڵمانانی ناو مزگەوت گوێیان لێ بوو)[٥٢٢].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ؓ دەفەرموێت: (منیش گوێم لێ بوو کاتێك کە لە مزگەوتەکەدا بووم، ئەو دارە نوزە نوزی دەکرد وەکو یەکێك خۆشەویستێکی لی دوور کەوتبێتەوە بەردەوام نوزەی دەکرد، تا پێغەمبەر ﷺ دابەزی و باوەشی پیا کرد و

---

(٥٢١) أخرجه: أحمد (المسند) (١٣٠/٢)، والبخاري (الصحيح) (٤٤٦)، وأبو داود (السنن) (٤٥١)، وابن خزيمة (١٣٢٤).

(٥٢٢) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٢٦/٣)، وابن خزيمة (١٧٧٦)، و الدارمي (السنن) (١٥٢٥)، و ابو يعلى (٣٣٨٤) وقال محققه: صحيح،وابن ماجه (السنن) (١٤١٥)، والترمذي (السنن) (٣٦٣١)، والبيهقي في الدلائل (٥٥٩/٢)، وصححه، لشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١١٦٢) و(السلسلة الصحيحة) (٢١٧٤).

دەستی پیا هێنا و بێدەنگ بوو)[٥٢٣]. (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لو لم أَحْتَضِنْه لحَنَّ إلى يومِ القيامةِ) واتە: گەر باوەشم پیا نەکردایە ئەو نوزە نوزەی دەکرد تا ڕۆژی قیامەت)، حەسەنی بەصری ﷺ هەموو جارێك ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە بەهاوەڵانی دەوت: ئەی بەندەکانی خوا دارەکە بێتاقەتی خۆی دەنوێنێت بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوە شایستەترن کە بێتاقەتی خۆتان بنوێنن بۆ بینینی ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ)[٥٢٤].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ سەبارەت بە یەکەم جومعە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانیدا ئەنجامی داوە لەناو شاری مەدینەدا بۆمان ڕوون دەکاتەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لایدایە قوباء وە لەوێش چووە ماڵی کەلثومی کوڕی هەدم، وە فەرمانی نوێژی جومعەی پێ گەیشت لە شوێنی ماڵەکانی سالمی کوڕی عەوف، لەوێ جومعەی گەورەی پێ کردن لەناو شیوەکەی ماڵەکانی کوڕانی سالمی کوڕی عەوف دا)[٥٢٥]. وە ئەم مزگەوتە یەکەم مزگەوتێکە سەرەتا لەسەر تەقوا و خواپەرستی دروست کراوە لە سەر زەویدا.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (دوو پیاو لەبەردەم پێغەمبەر ﷺدا بوو بەدەمە قاڵەیان سەبارەت بەو مزگەوتە کە لەیەکەم ڕۆژەوە لە پێناوی خوادا دروست کراوە کام مزگەوتە؟ یەکێکیان وتی: قوبائە کە لەوپەڕی شاری مەدینەیە، ئەوی تریان وتی: نەخێر مزگەوتەکەی پێغەمبەرە ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی ئێوە باسی دەکەن ئەم مزگەوتەی ئێوەیە) (واتە: مزگەوتی پێغەمبەرە ﷺ) [٥٢٦] ئەو مزگەوتەی پێغەمبەر ﷺ دروستی کردووە سێهەم مزگەوتێکی پیرۆزە، چونکە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی خوا ﷺ دروستی کردووە و ئاوەدانی کردۆتەوە بۆ زیکری خوا و نوێژ کردن، بۆیە تەنها ئەو مزگەوتە و مزگەوتی حەرام کە پێغەمبەر ابراهیم ﷺ بۆ خوای گەورە دروستیکرد لە شاری مەککە، و هەروەها

---

(٥٢٣) أخرجه: ابن ماجه (السنن) (١٤١٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١١٦٤).

(٥٢٤) أخرجه: ابن ماجه (السنن) (١٤١٥)

(٥٢٥) أخرجه: ابن هشام (٩٤/٢)،والطبراني في الكبير (٥٤١٤)، وقال الهيثميفي (المجمع) (٩٩٢٢): ورجاله ثقات.

(٥٢٦) أخرجه: مسلم (١٣٩٨)، والترمذي (٣٠٩٩)، والنسائي في (السنن) (٣٦/٢) واللفظ له.

مزگەوتەکەی پێغەمبەر یعقوب ﷺ [٥٢٧]. کە دروستی کرد لە (بیت المقدس) تەنها ئەو سێ جێگەیە پیرۆز و شایستەییە، وە دروستە کە کۆچ و باری بۆ ئامادە بکرێت و سەردانی بکرێت، ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا تُشَدُّ الرِّحالُ إلَّا إلى ثلاثةِ مساجِدَ: المسجدِ الحرامِ، ومسجدي ، و المسجدِ الأقصى))[٥٢٨] واتە: کۆچ و بار ئامادە ناکرێت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت، ئەویش مزگەوتی (حرام) لەناو شاری مەککە و مزگەوتەکەی (خۆم) وە مزگەوتی (الأقصى) واتە: مزگەوتەکەی (بیت المقدس) مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ پیرۆزە، لەبەر ئەوەی مزگەوتی سەروەری کوڕانی ئادەمە وە مزگەوتی (سيد المرسلين) لەبەر ئەوەیە دیارە بە پلەی دووەم دێت دوای مزگەوتەکەی خوای گەورە کە بە دەستی ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ دروست کراوە.

جابر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((صلاةٌ في مسجدِي أفضلُ مِنْ ألفِ صلاةٍ فيما سواهُ إلاّ المسجدَ الحرامَ، و صلاةٌ في المسجدِ الحرامِ أفضلُ مِنْ مائةِ ألفِ صلاةٍ فيما سواهُ))[٥٢٩] واتە: ((نوێژێك لە مزگەوتەکەمدا چاکترە لە هەزار نوێژ لەجێگاکانی تردا تەنها (مسجد الحرام) نەبێت کە یەك نوێژ تیایدا چاکترە لە سەدهەزار نوێژ کە لە شوێنانی تردا بکرێت (واتە: لە مزگەوتەکانی تردا).

هەروەها ئەبو دەرداء ﷺ دەیگێریتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((الصَّلاةُ في المسجدِ الحرامِ بِمِائةِ ألفِ صلاةٍ والصَّلاةُ في مسجدي بألفِ صلاةٍ والصَّلاةُ في بيتِ المقدسِ بخمسِمائةِ صلاةٍ))[٥٣٠] واتە ((نوێژێك لە (مسجد الحرام)دا وەکو سەد هەزار نوێژ وایە، وە نوێژێك لە (مزگەوتەکەی من)دا وەکو هەزار نوێژ وایە، وە نوێژێك لە (بيت المقدس) دا وەکو پێنج سەد نوێژ وایە)) واتە: مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ بە پلەی دووەم

---

(٥٢٧) قال ابن القيم ﷺ (والذي اسس (المسجد الأقصى) هو يعقوب بن اسحاق (عليهما الصلاة و السلام.. و جدده النبي سليمان عليه الصلاة و السلام) انظر: (زاد المعاد) (٥٠/١).

(٥٢٨) أخرجه: أحمد في (المسند) (٧٨/٣)، والبخاري في (الصحيح) (١١٨٩،١١٩٠) والنسائي في (السنن) (٣٢،٣٨/٢)، وأبو داود (السنن) (٢٠٣٣)، وابن ماجه (السنن) (١٤٠٩)، والترمذي (٣٢٦٢)، والدارمي (١٣٩٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١١٥٥،١١٥٧)، وفي (صحيح الترمذي) (٢٦٩)، و في(صحيح ابي داود) (١٧٨٨).

(٥٢٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣٤٣/٣)، والطبراني في (معجم الكبير) (٣١٠/٢) والبيهقي في (السنن الكبرى) (٢٤٤/٥) وابن حبان (١٦١٩) وقال محققه صحيح، ابن ماجه (السنن) (١٤٠٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١١٥٥) و وصححه المنذري في (صحيح الترغيب والترهيب) (١٧٦٩)، والأرناؤوط في (زاد المعاد) (٤٨/١) وقال:إسناده صحيح.

(٥٣٠) أخرجه: الطبراني والبزار (٤٢٢)، وقال إسناده حسن الهيثمي في المجمع (٧/٤): حديث حسن.

دێت، چونکە هەر کەسێك ڕکاتێ نوێژی تیا بکات بە دڵنیایی وەك هەزار ڕکات نوێژی کردبێت وایە، وە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی مزگەوتەکەی خۆی ڕوونی کردۆتەوە کە تەنها لە مزگەوتەکەی خۆیدا یەکێك لە باخچەکانی بەهەشتی لە ناودایە کە ئەویش تەنها تایبەتە بە مزگەوتی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما بينَ بيتِي ومنبِري روضةٌ مِنْ رياضِ الجنَّةِ))[٥٣١] واتە: ((نێوان مینبەر و ماڵەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت، چونکە دیواری ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ بە مزگەوتەوە بوو) ئەم نێوانە باخێکە لە باخەکانی بەهەشت وە ئەو مینبەرەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر بەرزاییەکی بەهەشتە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((مِنبَري على تُرْعةٍ مِن تُرَعِ الجَنَّةِ))[٥٣٢] واتە: [مینبەرەکەم لەسەر بەرزاییەکە لە بەرزاییەکانی بەهەشت]. بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەر موسوڵمانێك سوێندێکی ناهەق بخوات بۆ زەوت کردنی ماڵی موسوڵمانێك لای مینبەرەکەی من جێی خۆیەتی خوای گەورە بیخاتە دۆزەخەوە)[٥٣٣].

## سەرەتایی بانگدان

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئارام و جێگیر بوو لە شاری مەدینە وە برایانی کۆچکار لە دەوری کۆبوونەوە لەگەڵ پشتیوانان (الأنصار) دا هەموویان ملکەچی پێغەمبەر ﷺ بوون، وە ئاینی ئیسلام جێگیر بوو لەو شارەدا و بەئاشکرا بە کۆمەڵ نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدا، زەکات و ڕۆژوو و سنورەکانی خوا لەوێ فەرز کرا وەهەر لەوێشدا حەڵاڵ و حەرام جیا کرایەوە، ئیسلامیش بۆ یەکەمجار جێگیر بوو لەو شوێنەدا وە پشتیوانانی بەڕێز ئەوانە بوون کە سەروەری یەکەمجاری چەسپاندنی ئیسلامیان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد، کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە خەڵکی خۆیان کۆدەبوونەوە بەبێ

(٥٣١) أخرجه: أحمد في (المسند) (٤٣٨/٢)، والبخاري (٦٥٨٨)، ومسلم(١٣٩١)، و مالك في (الموطأ) (١٩٧/١)، والترمذي (٣٩١٥)، والنسائي في (السنن) (٣٥/٢)،وابن حبان (٣٧٥٠)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٣٠٧٤).

(٥٣٢) أخرجه: أحمد (٣٦٠/٣)، وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٣٦٣): صحيح.

(٥٣٣) أخرجه: أحمد (٣،٧٣،٣٧٥)، والنسائي (٢١٣/٢)، وأبو داود (٣٢٤٦)، وابن ماجه (٢٣٢٥)، والحاكم (٢٩٦/٤) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٣٩٨/٧) و هو حديث صحيح.

دەنگ لە کاتی نوێژەکاندا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژیان بۆ بکات بە بێ هیچ بانگدانێك)[٥٣٤]، سەبارەت بە پەرۆشی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانانی کۆچکاران و لایەنگرانی ناو شاری مەدینە بۆ ئەوەی کە نیشانە و هێمایەك دابنرێت بۆ ئاگادار کردنەوەی موسوڵمانانی ناو شار لەکاتی نوێژەکانیاندا ئەم باسەش بەم شێوەیە بوو کە ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك موسوڵمانان گەیشتنە ناو شاری مەدینە و کۆبوونەوە، چاوەڕوانی کاتەکانی نوێژیان دەکرد و کەس کەسی ئاگادار نەدەکردەوە بۆ هاتنی کاتی نوێژەکان، ڕۆژێك لەناو خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ و قسەکردن وتیان: بۆچی ئێمە زەنگۆڵەیەك وەکو زەنگۆڵەکانی گاورەکان ئامادە نەکەین بۆ کاتی نوێژ، هەندێکی تریان وتیان: ئەی بۆ زوڕنایەك ئامادە نەکەین وەکو زوڕناکانی جولەکەکان کە لە بیەعەکانی خۆیاندا بەکاریان دەهێنا بۆ دیاری کردنی کاتی نوێژەکانیان)[٥٣٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵگران بوو، وە زۆر خەفەتی هەبوو بۆ مەسەلەی نوێژ کە چۆن خەڵکی کۆبکاتەوە، پێ ی وترا: ئاڵایەك هەڵکە لەکاتی ئامادەبوونی نوێژەکاندا تا موسوڵمانان لە دوورەوە ئەو ئاڵایەیان ببینن ویەکتری ئاگادار بکەنەوە لە چوونیان بۆ مزگەوت بۆ نوێژ، پێغەمبەر ﷺ ئەو پێشنیارەی لا پەسند نەبوو ئینجا پێیان وت: ئەی بۆ زوڕنایەکە وەك زوڕناکانی جولەکە ئامادە نەکەین تا بیکەیت بە ئاگادار کەرەوەیەك بۆ کاتی نوێژەکان، پێغەمبەر ﷺ ئەو پێشنیارەشی بەباش نەزانی و پەسەندی نەکرد و فەرمووی: ((ئەوە تایبەتە بە جولەکەکانەوە))، پاشان باسی ئەوە کرا بۆچی زەنگۆڵەیەك لە زەنگۆڵەکانی گاورەکان ئامادە نەکەین و خەڵکی پێ ئاگادار بکەینەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەوەشی لاپەسەند نەبوو فەرمووی: ((ئەوە تایبەتە بە گاورەکانەوە)) ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لقَد أعجبَني أن تَكونَ صلاةُ المسلمينَ أوقالَ المؤمنينَ واحدةً حتَّى لقد هَممتُ أن أبثَّ رجالًا في الدُّورِ يُنادونَ النَّاسَ بحينِ الصَّلاةِ وحتَّى هَممتُ أن آمرَ رجالًا يقومونَ على الآطامِ يُنادونَ المسلِمينَ بحينِ الصَّلاةِ حتَّى نقَسوا أو كادوا أن ينقُسوا)) [٥٣٦]. (واتە: بەڕاستی زۆر بەلامەوە باش و پەسەندە کە نوێژی موسوڵمانان بەیەکەوە بێت و

(٥٣٤) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١٠٧/٢).

(٥٣٥) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٦٠٤)، ومسلم (الصحيح) (٨٣٥)، والنسائي في(السنن) (٣/٢).

(٥٣٦) أخرجه: ابو داود (٤٩٨)، وقال الحافظ في (الفتح) (٨١/٢): إسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (صحيح ابی داود) (٤٦٨): صحيح.

هەمووانی لێ ئاگادار کەینەوە نیازم وایە کە پیاوانێك لە کاتی نوێژدا بنێرم بە کۆڵانەکاندا بانگی خەڵکی بکەن بۆ ئامادە بوونیان بۆ نوێژەکانیان هەتا نیازم وابوو کە هەندێ لە پیاوان دابنێم لەسەر بەرزاییەکانی ناو شاری مەدینە بۆ ئەوی موسوڵمانان ئاگادار بکەنەوە لە کاتی نوێژەکانیان) پێغەمبەر ﷺ نیگەران بوو بەوەی کە چارەسەرێکی گونجاوی لانییە بۆ ئەم مەسەلەیە، عەبدوڵلا دەفەرموێت: تەماشام کرد کە پێغەمبەر ﷺ چۆن غەمبار و پەرۆشە بۆ ئەم مەسەلەیە منیش یەکجار بەپەرۆش بووم تا خوای گەورە خەوێکی ڕاستەقینەی نیشان دام (سەبارەت بەوەی کە چۆن موسوڵمانان ئاگادار ببنەوە بۆ کاتی نوێژەکانیان). وە هەمان خەو ئیمامی عومەر ﷛ بینیویەتی پێش خەوەکەی عەبدوڵلا بە بیست ڕۆژ بەڵام ئیمامی عومەر ﷛ خەوەکەی خۆی نەدرکاند و پێی باش نەبوو باسی بکات و بیگێڕێتەوە.

عەبدوڵلای کوڕی زەید خەوەکەی خۆی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە وتووێژی ئەو مەسەلەیەدا بوو، من خەوم بینی و لەخەومدا پیاوێك هات بۆ لام دوو پۆشاکی سەوزی لەبەردا بوو زەنگۆڵەیەکی بەدەستەوە بوو هەڵی گرتبوو، منیش وتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگۆڵەیەم پێ نافرۆشێت؟ ئەویش وتی: چ کارێکت پێیەتی؟ وتم: بەکاری دەهێنین بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ئاگادار بکەینەوە بۆ کاتی نوێژ، ئەویش پێی وتم: ئەی شتێکت پێ بڵێم لەوە چاکتر بێت؟ منیش وتم: [ئەوە چیە]، فەرمووی بڵێ: (لله أكبر الله أكبر الله أكبر الله أكبر أشهد أن لا إله إلا الله أشهد أن لا إله إلا الله أشهد أن محمدا رسول اللهِ أشهد أن محمدا رسول اللهِ حي على الصلاة حي على الصلاة حي على الفلاح حي على الفلاح الله أكبر الله أكبر لا إله إلا الله) دەفەرموێت: پاشان چووە دواوە و پێی وتم: ئەگەر ویستت قامەت بکەیت بۆ نوێژەکانت بڵێ: (الله أكبرُ الله أكبرُ الله أكبرُ أشهد أن لا إله إلا اللهُ أشهد أن لا إله إلا اللهُ أشهد أن محمدًا رسولُ اللهِ أشهد أن محمدًا رسولُ اللهِ حيّ على الصلاة حي على الصلاة حيَّ على الفلاح حي على الفلاح قد قامتِ الصلاة قد قامتِ الصلاةُ الله أكبرُ الله أكبرُ لا إله إلا اللهُ) دەفەرموێت: کە بەیانی خەبەرم بووەوە چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، خەوەکەم بۆ گێڕایەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّها لرُؤيا حقٌّ إن شاءَ اللَّهُ، فقُمْ مع بلالٍ فألْقِ عليهِ ما رأيتَ فليُؤَذِّنْ بِهِ فإنَّهُ أنْدَى صوتًا منكَ)) واتە: ((ئەوە خەوێکی ڕاستە ان شاء الله هەستە لەگەڵ بیلالدا ئەو دەنگی بەرزترە لە تۆ بۆی بڵێ ئەوەی کە بینیوتە با ئەویش بیکات بە بانگ و بانگی پێ بدات) دەفەرموێت: لەگەڵ بیلالدا ڕۆیشتم و بە بیلالم دەوت وشە بە

وشە وە بیلالیش بانگی دەدا و عومەریش لەو کاتەدا لە ماڵەکەی خۆیدا بوو کە گوێی لە دەنگی بیلال بوو بەپەلە هات بۆ مزگەوت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی کە تۆی ناردووە بە ڕاستی هەر بەو شێوەیە منیش ئەو خەوم بینیوە! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فللَّهِ الحمدُ فذلِكَ أثبَتُ)) واتە: (سوپاس بۆ خوا ئەوە زیاتر دەبێت بەمایەی جێگیر کردنی)[٥٣٧]. واتە: بەڕاستی خەوەکە جێگیر دەبێت کە دوو هاوەڵی بەڕێز وەکو یەك بینیویانە.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (بەیانیەکیان بیلال هات و بانگیدا بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە خەو هەڵ نەستابوو. بیلال بەدەنگی بەرز وتی: (الصَّلاةُ خيرٌ منَ النَّومِ) سەعیدی کوڕی موسەیب ﷺ دەڵێت: ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو وشەیەش زیادکرا لە بانگی بەیانیاندا)[٥٣٨].

## نەخۆشی ناو شاری مەدینە

بێگومان کۆچکاران و ئاوارەکان واتە: (المهاجرين) پێشتر نیشتەجێی ناوچەیەکی شاخاوی بوون کە ئاو وهەواکەی جیاواز بوو لەشاری مەدینە، کە ئەویش شاری مەککە بوو، هەرچۆنێك بێت ئاو و هەواکەی باشتر بووە لە ئاو هەوای شاری مەدینە کە شارێکی تەخت بووکە کۆچیان بۆ کردبوو، ئەوان ڕانەهاتبوون بە تیینی خۆری زۆر گەرمی ناو شاری مەدینە، چونکە مەدینە شوێنێك بوو کە چەند نەخۆشییەکی تیادا بڵاوببووەوە بۆیە هاوەڵە کۆچکارەکان بۆ یەکەمجار تووشی نەخۆشی سەخت بوون بە گەیشتنیان بۆ ناو شاری مەدینە، و نیشتەجێ بوونیان تیایدا، سەبارەت بەو نەخۆشییە و نەخۆش کەوتنی (ئەبوبەکر و عامری کوڕی فوهەیرە و بیلال ﷺ وە لەرز وتا گرتنیان عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە شاری مەدینە یەکێك بوو لە زەوییەکانی خوای گەورە کە لە هەموو جێگەیەك زیاتر لەرزوتای تیابوو، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تووشی نەخۆشی و ناڕەحەتی سەخت

---

(٥٣٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢٣٢/٥)، وأبو داود (السنن) (٤٩٩)، و االترمذي (السنن) (١٩٥)، وابن ماجه (السنن) (٧٠٦)، والدارمي (١١٧)، و الدارقطني (٣٤١/١)، وابن حبان (١٦٧٩)، وقال محققه إسناده قوى، والبيهقي في (السنن) (٣٩٠/١)وفي الصغرى (٢٢١)، وابن خزيمة (٣٧١)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابى داود) (٤٦٩)، وفي (صحيح ابن ماجه) (٥٨٠) وفي (صحيح الترمذى) (١٥٩) وفي (فقه السيرة) (٢٠٢).

(٥٣٨) أخرجه: أحمد (٤٢/٤)، وقال الشيخ الألباني في (الثمرالمستطاب) (١١٥/١): إسناده جيّد.

هاتن بەڵام خوای گەورە ئەو نەخۆشی و ناڕەحەتییەی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ لادابوو، ئەبوبەکر و عامر و بیلال لەیەك ماڵدا بوون، هەرسێکیان تووشی لەرزوتا هاتبوون چوومە ژوورەوە بۆلایان، تا سەردانیان بکەم پێش ئەوەی کە حیجاب فەرز بکرێت لەسەرمان بینیم کە خوا نەبێت کەس نازانێت حاڵیان چەندە پەرێشان و بە ئازار و ناڕەحەت بوون، نزیك بوومەوە لە ئەبو بەبکری باوکم و پێم وت: حاڵت چۆنە ئەی باوکە؟ ئەویش وتی: هەموو یەکێك لە ئێمە ڕۆژ دەکاتەوە لە ناو خێزانیدا و مردن لێی نزیکترە لە تاڵی نەعلەکانی (واتە: من پرسیاری حاڵی خۆی لێ دەکەم و ئەو شتێکی ترم بۆ باس دەکات) دەفەرموێت: وەڵاهی زانیم کە ئاگای لە خۆی نی یە چی دەڵێت: پاشان نزیك بوومەوە لە عامر وتم: تۆ حاڵت چۆنە؟ وتی: مردنم بینیوە پێش ئەوەی بیچێژم و ترسنۆك لەسەری خۆیەوە تووشی دەبێت و هەموو کەسێك چوار دەوریگیراوە بەو تەوقەی کە کراوەتە ملی وەکو چۆن گایەك کە خۆی دەپارێزێ لە پێستەکەی، وتم: وەڵاهی ئەمیش ئاگای لە خۆی نییە چی دەڵێت، ئینجا چووم بۆلای بیلال وەبیلال کەمێك تاکەی سوکتر بوو قژی بەردەدایەوە و لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئاوات دەخوازم داخەکەم تۆ بڵێی شەوێك بێت بمێنینەوە لە شیوەکەی ئەوبەری مەککەدا و گیا سەوز و بۆن خۆشەکانی خەلیلەم لەدەور بێت، تۆ بڵێی ڕۆژێك من بگەمەوە سەر کانیاوی (میجنە)، تۆ بڵێی ڕۆژێك بێت دوو بەرزایی (شامە و طوفەیل)[٥٣٩]م پێش چاو بکەوێتەوە، ئینجا وتی: خوایە نەفرین کەیت لە شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ئوممەیەی کوڕی خەڵەف کە چۆن لە خاکی خۆمان دەریان کردین بۆ خاکێکی پڕ لە نەخۆشی و مەینەتی.

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ئەمانەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە کە لەوانم بیستبوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە وڕێنە دەکەن و ئاگاو هۆشیان لای خۆیان نییە لە سەختی لەرزوتاکەیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنا المَدِينَةَ كما حَبَّبْتَ إِلَيْنا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بارِكْ لنا في مُدِّنا وصاعِنا، وانقُلْ وباءَها إلى مَهْيَعةَ))[٥٤٠]، واتە: خوای گەورە شاری مەدینەمان لا خۆشەویست بکە وەکو چۆن شاری مەککەت

---

(٥٣٩) أخرجه: البخاري (الصحيح) (١٨٨٩،٣٩٢٦)، ومسلم (الصحيح) (١٣٧٦)، و مالك في (الموطأ) (٨٩٠/٢)، وأحمد في (المسند) (٥٦/٦)، والنسائي في (الكبرى) (٧٥١٩)، والبيهقي في (الكبرى) (٣٨٢/٣)، وابن حبان (٣٧٢٤)، والحميدي (٢٢٣)، وابن هشام (١٨٠/٢) (٤٦٦)واللفظ له.

(٥٤٠) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (١٨٨٩).

لا خۆشەویست کردووین یان زیاتر، خوایە بەرەکەت بکەیتە کێشانە و پێوانەی شاری مەدینە وە مەینەتی و نەخۆشییەکانیشی بگوێزەرەوە بۆ شیوی (مهیعة)) لە ڕیوایەتێکی تردا عائیشە ﵂ دەفەرمویێت: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهمَّ حبِّب إلَينا المدينةَ ، كَما حَبَبتَ إلينا مَكةَ أو أشدَّ و صحِّحْها ، و بارِك لَنا في صاعِها ومُدِّها ، وَحَول حِمّاها إلى الجُحفَةِ))[٥٤١] واتە: خوای پەروەردگار شاری مەدینەمان لاخۆشەویست بکە وەك چۆن شاری مەککەت لاخۆشەویست کردووین مەدینەمان زیاتر لاخۆشەویست کە و ئاو و هەواکەی سازگار بکە و لە نەخۆشی دووری بخەرەوە، و خوایە بەرەکەتمان بۆ بخەیتە کێشانە و پێوانەکەیەوە، وە لەرزوتا و ناڕەحەتیەکەی بگوێزەرەوە بۆ (جحفة) (کە شوێنێکی زۆر دوورە لە شاری مەدینە)[٥٤٢].

لەوانەش کە تووشی لەرزوتا و ناڕەحەتی هاتبوون، خاتوو عائیشە ﵂ بوو، وەکو بەڕائی کوڕی عازب ﵁ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (لەگەڵ ئەبوبەکردا ﵁ بووم و چووم لەگەڵیدا بۆلای ماڵ و خێزانی سەیرم کرد عائیشەی کچی کەوتووە لە جێدا و لەرزوتایەکی زۆر توندی گرتووە و دەم بینی کە باوکی یەکجار بەزەیی پیایدا دەهاتەوە و ڕوومەتی ماچ دەکرد و دەی وت: حاڵت چۆنە کچەکەم)[٥٤٣].

بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ دوعای کرد و پاڕایەوە لە خوای گەورە تا ئەو مەینەتی و ناڕەحەتی و نەخۆشی یە دوور بخاتەوە لە شاری مەدینە بۆ ئەوەی موسوڵمانان تیایدا بحەوێنەوە، ئەوە بوو خوای گەورە ئەو دوعایەی لێ قبوڵ کرد و هێنایەدی.

عەبدوللای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ، خَرَجَتْ مِنَ المَدِينَةِ، حتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ - وهي الجُحْفَةُ - فأوَّلْتُ أنَّ وبَاءَ المَدِينَةِ نُقِلَ إلَيْهَا))[٥٤٤] واتە: لە خەومدا بینیم ئافرەتێکی ڕەش پێستی قژبژ چووەدەر لەشاری مەدینەوە تا گەیشتە ئەو بەری (جحفة)وە، وە ئەو خەوەم وا لێکدایەوە کە هەموو ئەو نەخۆشیانەی شاری مەدینە خوای گەورە گواستوویەتیەوە بۆ شیو و دۆڵی (جحفة)).

---

(٥٤١) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٩٢٦).

(٥٤٢) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٩٢٦).

(٥٤٣) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٩١٨).

(٥٤٤) أخرجه: البخاري (٧٠٣٨)، الترمذي (٢٣٩٢)، وابن ماجه (٣٩٢٤).

بەم شێوەیە سەرجەم کۆچکارانی شاری مەککە تووشی ئەو نەخۆشییە بوون چونکە ڕانەهاتبوون، لە شوێنێکی ئاوادا بتوانن ژیان ببەنەسەر، ئەوان خاوەنی بازرگانی بوون لە مەککە، وە مەککە شارێکی شاخاوی و هەوای سازگار بوو، بەڵام شاری مەدینەش دەشتێکی تەختی کشتوکاڵی پڕمێش و مەگەز و هەندێ نەخۆشی تیادا بڵاوبووەوە، لەبەر ئەوە موسوڵمانە کۆچکارە بەڕێزەکان ئەوەندە ناڕەحەت بوو بوون کە نەیان دەتوانی بە پێوە نوێژ بکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە شاری مەدینە تووشی لەرزوتا و نەخۆشی شاری مەدینە بوون، هەتا تەواو نەخۆشییەکە هەراسانی کردبوون و ناڕەحەت بوو بوون، بەڵام خوای گەورە ئەو هەموو نەخۆشی و ناڕەحەتیەی لە پێغەمبەر ﷺ دوور خستبووەوە، ئەو موسوڵمانانە ئەوەندە ناڕەحەت بوون کە نەیان دەتوانی بەپێوە نوێژ بکەن تەنها بە دانیشتنەوە نەبێت، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك هات بۆ لایان بینی ئەوان بە دانیشتنەوە نوێژیان دەکرد لە مزگەوت پێی فەرموون: (( اعْلَمُوا إنَّ صلاةَ القاعِدِ على النِّصفِ مِن صلاةِ القائِمِ)) واتە: بزانن نوێژ کردن بە دانیشتنەوە وەك نیوەی نوێژکردنە بە پێوە (واتە: نیوەی پاداشتەکەی بۆ دەنوسرێت)، موسوڵمانان تەنها خوا دەزانێت چەندە ناڕەحەت بوون، بەڵام لەبەر بەرەکەتی نوێژەکە بۆ ئەوەی ئەو سەروەری و پلە بەرزییە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن هەموویان گورج هەستان بە ناڕەحەتی هەوڵیاندا کە نوێژەکانیان بە پێوە بکەن)[٥٤٥].

پاش ئەو ناڕەحەتی و نەخۆشیانە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دوعای دەکرد و لە خوای گەورە دەپاڕایەوە کە هەموو جۆرێکی حەوانەوە دابین بکات بۆ هاوەڵانی بەڕیزی لە شاری مەدینە، تا پێغەمبەر ﷺ دوعای کرد و فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ في المَدِينَةِ ضِعْفَيْ ما جَعَلْتَ بِمَكَّةَ مِنَ البَرَكَةِ))[٥٤٦]، واتە: (خوای پەروەردگار بەرەکەت بکەیتە ناو شاری مەدینەوە دوو ئەوەندەی ئەو بەرەکەتەی کە خستوتەتە ناو شاری مەککەوە)،

---

(٥٤٥) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٦٣/٣)، ومسلم (الصحيح) (٧٣٥)، ابو داود(٩٥٠)، النسائي في (السنن) (٢٢٣/٣)، ابن ماجه (السنن) (١٢٢٩)، عبد الرزاق في (المصنف) (٤١٢٢)، ابن خزيمة (١٢٣٧)، البيهقي في (السنن الكبرى) (٤٩١/٢)، ابن هشام (السيرة) (٨١/٢) (٤٦٧)، واللفظ له، وقال الحافظ في (الفتح) (٥٨٥/٢): رواه أحمد ورجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٠١٥) وفي (صحيح ابي داود) (٨٧٦).

(٥٤٦) أخرجه: أحمد (١٤٢/٢) مسلم (١٣٦٩).

پێغەمبەر ﷺ مژدەیدا بەو موسوڵمانە کۆچکارانە کە ئارام گربوون لەسەر ئەو نارەحەتیانەی ناو شاری مەدینە کە خاوەنی پاداشتێکی گەورەن لە قیامەتدا ئەویش بەهۆی داواکردنی پێغەمبەر ﷺ لە خوای گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆگربوون لەسەر نارەحەتی ژیان و گوزەرانی ناو شاری مەدینە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لَا يَصْبِرُ علَى لَأْوَاءِ المَدِينَةِ وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ مِن أُمَّتِي، إلَّا كُنْتُ له شَفِيعًا يَومَ القِيَامَةِ))[٥٤٧] واتە: هەر کەسێك ئارامگر بێت لەسەر نارەحەتییەکانی ناو شاری مەدینە من تکاکار دەبم بۆی لە قیامەتدا لای خوای گەورە).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوای گەورە کرد کە هەمان پیرۆزی شاری مەککە ببەخشێت بە شاری مەدینە وە ببێت بە جێگەیەکی ئارام وبێ ترسی وەك شاری مەککە.

ئیمامی عەلی ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((المَدِينَةُ حَرَمٌ ما بيْنَ عَيْرٍ إلى ثَوْرٍ، فمَن أحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعليه لَعْنَةُ اللَّهِ والمَلَائِكَةِ والنَّاسِ أجْمَعِينَ ))[٥٤٨] (واتە: شاری مەدینە حەرام کراوە لە نێوان بەرزایەکەی (عیر) تاکو بەرزایەکەی (ثور) هەر کەسێك ئاشووبێك بنێتەوە لەناو شاری مەدینەدا یان ئاژاوە چییەك داڵدە بدات نەفرینی خوا و فریشتەکان و خەڵکی لێ بێت، خوای گەورەش تەوبەیان لێ قبوڵ ناکات کە ببێتە هۆی پاککردنەوەی گوناهەکانیان).

دیارە ئەمەش بۆ ئەوەی بارودۆخی شاری مەدینە وردە وردە هێور بێتەوە و دوور بێت لە پیلانی جولەکەکان، کە لە چوار دەوری شاری مەدینەن وە چینی دووڕووەکان و هاوبەش پەیداکاران کە هێشتا موسوڵمان نەبووبوون، وە هۆزەکانی چوار دەوری مەدینە، پیلانی دوژمنانی سەرسەختی موسوڵمانانی دوور لە شاری مەککەن، پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ ڕێنموییدا بۆ موسوڵمانان لە ناو شاری مەدینەدا، ڕوونی کردەوە سەبارەت بە چەك هەڵگرتن و بڕینی دار و درەخت، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... وإنِّي حَرَّمْتُ المَدِينَةَ حَرَامًا ما بيْنَ مَأْزِمَيْهَا، أَنْ لا يُهْرَاقَ فِيهَا دَمٌ، وَلَا يُحْمَلَ فِيهَا سِلَاحٌ لِقِتَالٍ، وَلَا تُخْبَطَ فِيهَا شَجَرَةٌ إلَّا لِعَلْفٍ))[٥٤٩]

---

(٥٤٧) أخرجه: مسلم (الصحيح) (١٣٧٨)، الترمذي (السنن) (٢٩٢٤)

(٥٤٨) أخرجه: البخاري (١٨٧٠،٣١٧٩)، ومسلم(٤٦٧).

(٥٤٩) أخرجه: مسلم (٤٧٥).

(واتە: من حەرامم کردووە لە شاری مەدینەدا لە نێوان هەردوو بەرزایەکەیدا، هیچ کەسێك بۆی نییە خوێنی تیا بڕژێت یاخود چەکی تیا هەڵبگرێت بۆ کوشتار و کەس بۆی نیە دارێکی لێ بشکێنێت مەگەر بۆ ئاژەڵەکەی بێت...)[٥٥٠]، ئەم شارە ئەوەندە بەرێزە کە خوای گەورە خۆی نازناوی (طاب)ی لێناوە واتە: [پاك وچاك] لە ناو شارەکانی دنیادا تەنها ئەو شارە بەرێزترین شارە دوای مەککە، وەکو جابر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى سَمَّى المَدِينَةَ طَابَةَ))[٥٥١] واتە: خوای گەورە ناوی مەدینەی ناوناوە (طاب))،

شاری مەدینە ئەوەندە شارێکی بەرێزە چی خراپەکارێك یان فاسقێك لە ناویدا هەبێت لە خۆی دووری دەخاتەوە و دەری دەکات:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتَّى تَنْفِيَ المَدِينَةُ شِرَارَهَا، كما يَنْفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ))[٥٥٢] واتە: ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت تا مەدینە خراپکارەکانی لە خۆی دوور دەخاتەوە وەك کوورەیەکە وایە هەرچی ژەنگە هەیە لە ئاسنی دوور دەخاتەوە)، ئەم شارە بەرێزە هەرگیز درم و نەخۆشییە خراپەکانی وەك طاعون ڕووی تێ ناکات، بەڵکو دەجالی ئاخر زەمانیش ناتوانێت بچێتە ناو ئەو شارەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((عَلَى أَنْقابِ المَدِينَةِ مَلائِكَةٌ، لا يَدْخُلُها الطَّاعُونُ، ولا الدَّجَّالُ))[٥٥٣] واتە: (لەسەر هەموو بەرزایی یەك لە بەرزاییەکانی شاری مەدینە فریشتەیەك هەیە بۆ پاراستنی لە نەخۆشی طاعون (کولێرا) و دەجال ناچێتە ناو شاری مەدینە).

ئەو موسوڵمانانەی کە لەناو شاری مەککە مابوونەوە و کۆچیان نەکردبوو یاخود دەست بەسەربوون لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاری کافرانی قورەیشدا یان ڕێگەیان پێ نەدەدرا، کە کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، یان ئەو کەسانەی کە کەسیان دەست نەدەکەوت تا ماوەی چوارسەد و پەنجا کیلۆمەتر ببڕێت لەگەڵیاندا وەکو هاوڕێیەك و ڕێگە ناسێك بەرەو شاری مەدینە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەمانە

(٥٥٠) أخرجه: مسلم (٤٧٥).

(٥٥١) أخرجه: مسلم (٤٩١).

(٥٥٢) أخرجه: مسلم (٤٨٧).

(٥٥٣) أخرجه: البخاري (١٨٨٠)، ومسلم (٤٨٥).

سەربەخۆ و بە تەنها نەیان دەتوانی کۆچ بکەن، یەکێك لەو کەسانە سەودەی کچی زەمعە کە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، هەروەها کچە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ فاطمە و ئوم کلثوم، خێزانی ئەبوبەکر و دایەنگاکەی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی ئوم ئەیمەن بوو وە ئەسمائی کچی زەید، هێشتا مابوون لە مەککە وە دەرفەتی کۆچ کردنیان نەبوو.

## کۆچکاران یەك بەدوای یەکدا دەگەنە ناو شاری مەدینە

سەبارەت بە کۆچ کردن و گەیشتنی ئەم بەڕێزانە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، عائیشە ﵂ دایکی ئیمانداران بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك ئەبوبەکر کۆچی کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە ئێمەی بەجێ هێشت کاتێ گەیشتنە ناو شاری مەدینە زەید و ئەبو ڕافعی خزمەتکاری ناردەوە بۆ مەککە و پێنج سەد درهەمیشی پێدان تاوەکو چییان پێویست بێت لە ئاژەڵ و شتومەکی تر پێی بکڕن، باوکم ڕێگەناسەکەی خۆی و پێغەمبەری ﷺ گەڕاندەوە بەسێ وشترەوە کە ناوی عەبدوڵلای کوڕی ئورەیقیط بوو، وە هێشتا موسوڵمان نەبووبوو نامەیەکی ئاراستەی عەبدوڵلای کوڕی کرد و فەرمانی پێ کرد کە دایکم (واتە: خێزانی ئەبوبەکر کە ناوی ئوم ڕۆمان) بوو لەگەڵ من و ئەسمائی خوشکم هەڵگرێت و ڕەوانەی شاری مەدینەمان بکات، عەبدوڵلا و ئەبو رافع و زەید هەرسێکیان بەیەکەوە کەوتنە ڕێ تاگەیشتنە قەدید، لەوێدا زەید بە پێنج سەد درهەمەکە سێ وشتری کڕی و ئینجا هەموویان پێکەوە چوونە ناو شاری مەککەوە و بینیان کە طلحە دەیەوێت کۆچ بکات لەگەڵ خێزانی ئەبو بەکردا، ئینجا هەمووان پێکەوە (زەید و ئەبو رافع و فاطمە و ئوم کلثوم و سەودە و ئوم ئەیمەن و ئوسامە) بەڕێکەوتن[٥٥٤].

(هەروەها لە گێڕانەوەکەی عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (لە ڕێگادا بە هەورازێکی سەختدا ڕۆیشتین و منیش سواری وشترێکی بەهێز بووبووم و سەڵەمییەوە و وەخت بوو بکەومە خوارەوە، کەدایکم منی بینی لە دوورەوە بەپەرۆشەوە بوو، وەڵاهی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە کە دەیوت: ئەی بووکەکە ئەی بووکەکە!! کە دەستگیرانی پێغەمبەر ﷺ بووم، منیش لغاوەکەیم گرت یەکێك وتی: وەڵاهی نابینم لغاوەکەی گرتبێت، ئەوەندەم زانی وشترەکە وەکو یەکێك وەستا بێت لە ژێریدا و بیگرێت وەستا

(٥٥٤) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٤/٤).

و منیش لێی نەکەوتمە خوارەوە)، ئینجا بەیەکەوە هاتین تاگەیشتینە ناو شاری مەدینە و لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ مزگەوتەکەی خۆی دروست دەکرد و هەندێك حوجرە و ژووری لە پەنا مزگەوتەکەیدا دروست دەکرد بۆ خۆی و خێزانەکانی)[٥٥٥].

وە یەکێك لەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە دەرفەتی نەبووە بۆ کۆچ کردن بەرەو شاری مەدینە. ئەویش هاوەڵی بەڕێز صوهەیبە ﷺ کەتوانی ڕێگە بۆ خۆی خۆش بکات و بکەوێتە ڕێ، صوهەیب خۆی بەسەرهاتەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ شاری مەدینە بە هاوڕێیەتی ئەبوبەکر، منیش ویستم کە بچم لەگەڵ یاندا ئەوەبوو گەنجانی قورەیش ڕێگەیان پێ گرتم، ئەو شەوە هەر خەوم لێ نەکەوت و بۆ هەلێك دەگەڕام کە ئەوان خەویان لێ بکەوێت یان لاچن لەسەر ڕێگاکە تا منیش بتوانم دەرچم، ئەوان منیان دەبینی و لە نێوان خۆیاندا دەیان وت: خوای گەورە سەرقاڵی کردووە بە سکی خۆیەوە (واتە: تووشی ژانە سك وسك چوون بووە بۆیە خەوی لێ ناکەوێت و لە ڕاستیدا من تووشی ئەوە نەهاتبووم، وەستام تا ئەوان خەویان لێ کەوت ئینجا منیش دەرچووم و هەندی لەوانەم پێگەیشتەوە کە دەیانویست بمگێڕنەوە و بەدوامدا دەهاتن و منیش پێم وتن: ئایا هەندێ ئۆقیە ئاڵتونتان بدەمێ لەگەڵ هەندێ جلی ئاوریشمی سەیرانی چاك ڕێگەم بۆ چۆڵ دەکەن تا بچم بۆ شاری مەدینە ئایا پەیمانم دەدەنێ کە کەس نەیەت بە دوامدا و ڕێگەم پێ نەگرێت؟ وتیان: وەرە لەگەڵماندا بابزانین ئۆقیە ئاڵتونەکەت لە کوێیە؟ منیش شوێنیان کەوتم بۆ ناو شاری مەککە و وتم لە ژێر کۆڵەکەی ئەم دارەدایە، ئادەی هەڵی بکەنن، کاتێ کە هەڵیانکەند ئۆقیە ئاڵتونەکەیان دۆزییەوە پێم وتن: بچن بۆلای فلان ئافرەت بە فلان ناونیشان و بڵێن دوو جلە چاکەکەی صوهەیب کەلای تۆیە بماندەرێ، ئینجا ڕێگەیان پێ نەگرتم و منیش بەڕێکەوتم تا گەیشتمە لای پێغەمبەری  کە هێشتا لە قوباء بوو پێش ئەوەی قوباء بەجێ بهێلێت و بچێتە ناو شاری مەدینە و کاتێ هەر لە دوورەوە پێغەمبەر ﷺ منی بینی فەرمووی: ((یا أبا یَحیی رَبِحَ البَیْعُ..)) واتە: ئەی باوکی یەحیا قازانجت کرد (سێ جار) (واتە: قازانجت کرد کاتێ سامانەکەت فرۆشت بەوان و بەهەشتی خوات بۆ خۆت مسۆگەر کرد بە کۆچ کردنت بۆ شاری مەدینە) منیش وتم: وەڵاهی بڕواناکەم کەس ئەم هەواڵەی بە تۆ

---

(٥٥٥) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٥٤/٢٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٢٩/٩): إسناده حسن.

ڕاگەیاند بێت، چونکە من یەکەم کەسم کە دەگەمە لای تۆ. تەنها جبریل عليه السلام ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندوویت)[٥٥٦].

لە ڕیوایەتێکی تردا لە عیکریمەوە رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێ کە صوهەیب ویستی کۆچ بکات بەرەو شاری مەدینە هەندێك لە مەککەییەکان شوێنی کەوتن و ئەویش تیرەکانی لە کیفەکەی دەرهێنا و ڕیزی کردن ژمارەیان چل تیر بوو، ڕووی تێکردن و پێی وتن: هیچ یەکێ لە ئێوە ناگاتەوە بەمن تا ئەو تیرانە نەخەمە ناو لاشەیەوە، ئینجا کە تیرەکانم تەواو بوو دەست دەدەمە شمشێرەکەم و ئێوەش دەزانن کەمن پیاوی ئەو کارەم، بەڵام من دوو دووکانی ئاسنگەریم بەجێ هێشتووە لە دوای خۆم ئەگەر ئێوە ڕێگەم بدەن بچم بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەوا هەردووکی بۆ ئێوە، ئیتر لەوکاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾(البقرة).

ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەندی لە باوەڕداران خۆیان کڕیوەتەوە لە خوا بەوەی کە ماڵ و گیانی خۆیان بەخشیوە بە خوا و خوای گەورە ڕەزامەندی خۆی و بەهەشتیان بە نسیب دەکات، صوهەیب دەفەرموێت: گەیشتمە لای پێغەمبەر ﷺ و لە دوورەوە کە منی بینی فەرمووی: بە ڕاستی کڕینەکەت قازانجێکی گەورەت لێ کردووە و سێ جار ئەمەی دوو بارەکردەوە)[٥٥٧].

لە قنوت و دوعاکانیدا پێغەمبەر ﷺ دەپاڕایەوە بۆ ئەو موسوڵمانە چەوساوە و ژێر دەستانەی کە ناتوانن ڕزگاریان ببێت وەکو ئەو بەرێزانەی کە خۆیان سەرفراز کردووە و کۆچیان کردووە بۆ شاری مەدینە.

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکاتی کۆتایی نوێژەکانیدا دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بنَ أَبِي رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الوَلِيدَ بنَ الوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ المُسْتَضْعَفِينَ مِنَ المُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وطْأَتَكَ على

(٥٥٦) أخرجة: الطبراني في (الكبير) (٧٢٦٩)، والحاكم في (المستدرك) (٣/ ٤٠٠)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن سعد (الطبقات) (١٧١/٣)، وأبو نعيم في (الحلية) (١٥٢/١)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٢٢/٢)، وابن هشام (٧٥/٢) (٣٣٧)، و الأصفهاني في (سير السلف) (٤٥٥/٢) وقال محققه: حديث صحيح، صححه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٦٦).

(٥٥٧) أخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٣٩٨/٣)وقال إسناده صحيح على شرط مسلم، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (١٦٦): إسناده صحيح على شرط مسلم.

مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ))[٥٥٨] واتە: خوای پەروەردگار عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکە و خوای گەورە سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەوە خوای گەورە وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکە و خوای گەورە باوەڕدارە چەوساوەکان ڕزگار بکە و سزای خۆت توندتر بکە لەسەر (موضر) (واتە: قوڕەیش و چوار دەوری) و گرانیشیان بەسەردا بهێنە وەك گرانییەکەی یوسف (عليه السلام).

ئەوە بوو خوای گەورە ئەو موسوڵمانە بەڕێزانەی ڕزگار کرد لە چەوسانەوە و ژێر دەستەیی کە تیایدا بوون. عبدالملك کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەفەرموێت: (عیاش و سەلەمە و وەلید لە کافرەکان هەڵهاتن و بە ڕێکەوتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و خۆم بینیم کە عیاش و سەلەمە هەردووکیان سواری پشتی یەك وشتر بوو بوون و وەلیدیش لە دواوە وشترەکەی بۆ لێدەخوڕین)[٥٥٩]، (وە هەر لەو ساڵەشدا پێغەمبەر ﷺ دایکی ئیمانداران عائیشەی کچی ئەبوبەکری ﷺ گوێزایەوە)[٥٦٠]، واتە: ساڵی یەکەمی کۆچی لە مانگی شەوالدا.

## وەرگرتنی بەیعەت لەئافرەتان

کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە لە دوای وەرگرتنی بەیعەتی عەقەبەی یەکەم و دووەم لە پیاوانی ناو شاری مەدینە، لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پەیمان و گفتی لە ئافرەتانی ناو شاری مەدینەش وەرگرتووە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن و ئاینی خوا لە ناو خۆیاندا دامەزراو بکەن، وە هیچ شتێك نەکەن کە خوای گەورە لێی حەرام کردوون و ئەو ڕیوایەتانەش:

**یەکەم:** ڕیوایەتەکەی ئوم عەطیە کە دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێت: (کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە ئافرەتە پشتوانانی کۆکردەوە لە ماڵێکدا و ئیمامی عومەری ناردەلامان لەبەر دەرگاکە وەستا و نەهاتە ژوورەوە و سەلامی لێ کردین و ئێمەش وەڵامی سەلامەکەیمان دایەوە و وتی: من نێرراوی پێغەمبەری

(٥٥٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (١٠٠٦).

(٥٥٩) أخرجه: عبدالرزاق في (المصنف) (٤٠٣١)، والطبراني في (الكبير) (٦٣٦٢)، و الهيثمي في (المجمع) (١٣٨/٢): مرسل صحيح.

(٥٦٠) أنظر: البخاري في (الصحيح) (٣٨٦٩،٥١٥٨)، ومسلم في (الصحيح) (١٤٢٢).

خوام ﷺ، ئێمەش وتمان: مەرحەبا و پێشوازی لە پێغەمبەری خوا ﷺ و نێرراوەکەی، ئینجا ئیمامی عومەر ﷺ وتی: پەیمانم بدەنی بە هیچ جۆرێ هاوتا و هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن و زینا نەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و بوختان نەکەن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن وتیان: بەڵێ، پاشان ئیمامی عومەر ﷺ دەستی درێژ کرد و ئێمەش دەستمان لە ماڵەکەوە درێژ کرد، و ئینجا ئیمامی عومەر ﷺ وتی: خوایە شاهیدبە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین کە لە ڕۆژی جەژندا خۆمان و سەرجەم ئافرەتانی شاری مەدینە هەتا ئەوانەشی کە نوێژیان لەسەر نییە پێکەوە بێین بۆ ئەوبەری شاری مەدینە بۆ ئامادەبوونی مەراسیمی نوێژی جەژن و ئاگاداری کردینەوە کە جومعەمان لەسەر نییە و هەر لەوێدا نەهی لێ کردین کە شوێن جەنازە بکەوین)[٥٦١].

**دووەم:** ڕیوایەتەکەی ئوم ئەیمەن ﷺ دەفەرموێت: (هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەتدا کە بەیعەتی بدەینێ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتت دەدەینێ کە بە هیچ جۆرێك هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدەین و دزی نەکەین و زینا نەکەین و منداڵەکانمان نەکوژین و بوختان نەکەین و لە هەموو کارێکی چاکەدا سەرپێچی نەکەین، کە ئەمانەمان وت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەوا بەیعەتتان لێ وەردەگرم، بەڵام لەو شتانەی کە لە تواناتاندا هەیە و بە گوێرەی تواناتان، ئێمەش وتمان: خوا و پێغەمبەر ﷺ بە بەزەیی ترن لە نەفسی خۆمان بۆ خۆمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستت بێنە تا بەیعەتت بدەینێ (چونکە بەیعەت بەدەست خستنە ناو دەست دەبێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من تەوقە لەگەڵ ئافرەتدا ناکەم و قسە کردنم بۆ یەك ئافرەت وەکو قسەکردنم وایە بۆ سەد ئافرەت)[٥٦٢]، بۆیە

(٥٦١) أخرجه: أحمد في (المسند) (٨٥/٥) وفي (٤٠٩/٦) (٢٠٧٩٧) وقال محققه: حديث صحيح دون ذكرعمر فيه،و أبو داود (١١٣٩)، وابن أبي شيبة (٣٩٠/٣)، والطبراني في (الكبير) (١٨٣/٣)، و أبويعلى في (المسند) (٢٢٦)، والبيهقي في (الكبرى) (١٨٤/٣)، وابن حبان (٣٠٤١)، والذهبي في (مختصر البيهقي) (١٣٣/٢) وقال إسناده حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٨/٦) رجاله ثقات، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف سنن أبي داود) (٢٤٥)، وأشار إلى تحسينه الشيخ الألباني في (حجاب المرأة المسلمة) (٢٥).

(٥٦٢) أخرجه: مالك في (الموطأ) (١٤٧/٣)، وأحمد في (المسند) (٣٥٧/٦)، والنسائي (السنن) (١٤٩/٧)، والترمذي في (السنن) (١٥٩٧) وابن ماجه في (السنن) (٢٨٧٤)، والحميدي (٣٦٨)، والطيالسي (١٦٢١)، والطبراني في (الكبير) (٤٧٠/٢٤)،

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا دەستی بەر ئافرەتێك نەکەوتووە کە حەڵاڵ نەبوو بێت بۆی)[٥٦٣] واتە: مەحرەم و حەڵاڵی خۆی نەبوو بێت.

جگە لەم مەرجانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی لەسەر وەرگرتووە لە ڕیوایەتەکەی ئومەیمەدا ﵂ هاتووە کە دەفەرموێت: (ئومەیمە هات کە بەیعەت بدات لەسەر ئیسلام، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەیعەتت لێ وەردەگرم بەوەی کە بەهیچ جۆرێك هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەیت و........ (لە کۆتاییدا فەرمووی:) وە شین و شەپۆڕ و واوەیلا نەکەیت لە کاتی موصیبەتدا و ڕووت و قووتییەکەی زەمانی نەفامیش نەکەیت ولێی دوور بیت)[٥٦٤].

لەڕیوایەتێکی تردا: ((سەلمای کچی قەیس ﵂ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ گفتی لە من و هەندێك ئافرەتانی ئەنصار وەرگرت لەسەر ئەوەی کە فێڵ لە مێردەکانمان نەکەین، بەڵام ئێمە کە گەڕاینەوە لە ناو خۆماندا وتمان: با بگەڕێینەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ تا پرسیاری لێ بکەین کە فێڵ کردن لە مێردەکانمان چییە؟ ئێمە گەڕاینەوە و پرسیارمان لێ کردوو ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: (أنْ تُحابِينَ أو تُهادِينَ مالهُ إلى غَيْرِهِ)[٥٦٥] واتە: فێڵ کردن لە مێردەکانتان ئەوەیە کە سامانەکەی بە دیاری و بەخشین بدەنە کەسانی تر بەبێ ئاگاداری و مۆڵەتی ئەوان)).

---

والحاكم في (المستدرك) (٧١/٤)، وابن حبان (٤٥٥٣) وقال الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، و الدار قطني(١٤٧/٤)، والبيهقي في (السنن) (١٤٦/٨)، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٥٢٩) وفي (صحيح الترمذي) (١٣٠٠) وفي (صحيح ابن ماجه) (٢٣٢٣) وفي (صحيح النسائي) (٣٨٩٧)، وصححه الحافظ في (المطالب) (٤٠٢٨)، و البوصيري في (مختصر الأتحاف) (٧٦٩٣).

(٥٦٣) أخرجه: البخاري (٢٧١٣).

(٥٦٤) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٩٦/٢) (٦٨٥٠) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٧/٦): رواه الطبراني ورجاله ثقات، وقال الشيخ الألباني في (حجاب المرأة المسلمة) (٥٥): إسناده حسن.

(٥٦٥) أخرجه: أحمد (٤٢٢/٦) (٢٧٣٧٥) وقال محققه: إسناده ضعيف، وأبو يعلى (٧٠٧٥)، والطبراني (الكبير) (٢٤/ ٧٥٧)، وابن سعد (١٩/٨)، وقال البوصيري في (إتحاف الخيرة المهرة) (٣٨٢٩): رواه أبو يعلى بسند صحيح.

## لەدایك بوونی یەکەم منداڵی موهاجیرەکان

سەرەتا بە گەیشتنی ئەو کۆچکارە بەڕێزانە بۆ شاری مەدینە جولەکەکان کەوتنە پڕوپاگەندە دروست کردن دژیان بە تایبەتی پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە کە سیحریان کردووە لە کۆچکارەکان و منداڵیان نابێت و بۆیان نامێنێت، چونکە ئەوانی جولەکە سیحریان لێ کردوون بۆ ئەوەی نەوەیان زیادنەکات یاخود نەمێنێت، لە شاری مەدینەدا، و سەرفراز نەبن شکۆمەندی و باڵادەستی تەنها بۆ جولەکەکان بێت بەم شێوەیە خوای گەورە ئەو پڕوپاگەندەیەی بەدرۆ خستەوە و منداڵی بەخشییە کۆچکاران و یەکەم منداڵ کە لەدایك بوو منداڵی پورزاکەی پێغەمبەر ﷺ بوو کە ناوی زوبەیری کوڕی عەوام بوو.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکری خێزانی زوبێر دەیگێڕێتەوە کە چۆن عەبدوڵڵا لە دایك بووە و دەفەرموێت: (عەبدوڵڵا لە سکمدا بوو کە بەڕێکەوتین لە شاری مەککەوە بەرەو مەدینە، و وەختی ئەوەم بوو کە منداڵەکەم بێت، بەڵام لە ڕێگادا نەم بوو تاگەیشتینە ئەو بەری شاری مەدینە، ئینجا عەبدوڵڵام بوو سەرەتا بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش خستییە ناو باوەشی خۆی و داوای خورمایەکی کرد و بۆیان هێنا خورماکەی نەختێ جوی هەندێ تفی موبارەکی خۆی خستە ناو دەمیەوە و هێنای بە مەڵاشویدا و یەکەم شتێ کە چووە دەمی عەبدوڵڵا تفی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هەروەها پێغەمبەر ﷺ داوای بەرەکەتی لە خودا کرد بۆ ئەم منداڵە و عەبدوڵڵا یەکەم منداڵ بوو لەدایك بوو لە ئیسلامدا و بە ڕاستی کۆچکاران زۆر پێی دڵخۆش بوون، چونکە ئەوان پێیان وترابوو کە جولەکەکان سیحریان لێکردووون و منداڵیان نابێت)[٥٦٦]، وە (یەکەم کەسیش کە لەدایك بوو لە پشتیوانان لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ و کۆچکارە بەڕێزەکان بۆ ئەو شارە پیرۆزە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو کە یەکەم منداڵ بوو لەدایك بوو دوای هاتنی ئەوان)[٥٦٧].

---

(٥٦٦) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٥٤٦٩).

(٥٦٧) أنظر: (البداية) لابن كثير (٣/٢٣٠).

## بارودۆخی ناو شاری مەدینە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ

پێش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێت بۆ ناو شاری مەدینە، دوو لایەنی سەرەکی هەبوون:

**لایەنی یەکەم:** عەرەبەکان کە دوو هۆز بوون ئەوس و خەزرەج کە شەڕ و ئاژاوەیەکی گەورە هەبوو لە نێوانیاندا و سەخت ترین شەڕیان شەڕی (بعاث) بوو کە چەند ساڵێکی کەم پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ ڕوویدا بوو کە ناودارەکانی هەردوولای تیادا کوژرا بوو، تەنها دوو کەس لە سەرکردەکانیان لە ژیاندا بوو ئەویش (عەبدوڵلا کوڕی سەلول و ئەبو عامری ڕاهیب) بوون، کە پێغەمبەر ﷺ نازناوی فاسقی لێ نابوون.

**لایەنی دووەم:** جولەکەکان ئەو چینە سەرەکییە دەوڵەمەندە بوون کە نیشتەجێی مەدینە و دەوروبەری بوون و پێك هاتبوون لە (کوڕانی بەنو قەینوقاع و بەنو نەضیر و بەنو قورەیضە) بە تایبەتی بەنو قەینوقاع کە گەڕەکێك بوو لەناو شاری مەدینەدا، و پیاوانی زۆر دەوڵەمەندی تیابوو کە بازرگانیان بە چەك فرۆشتنەوە دەکرد.

بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵلا کوڕی سەلول و ئەبو عامری ڕاهیب سەرکردایەتی و شکۆمەندی شاری مەدینەیان لەدەس چوو، چونکە وا بڕیاردرا بوو کە تاج دروست بکەن و عەبدوڵلا بکەن بە پاشا، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ هات خەڵکی ئەو شارە بڵاومیان لە دەوری ئەو دوانە کرد، ڕوویان کردە پێغەمبەر ﷺ و هەر ئەویشیان هەڵبژارد کە هاوەڵی بەڕێزیان بێت و خۆشەویستیان بێت و هەموویشیان لە ژێر گوێڕایەڵی ئەو دابن، بەڵام جگە لەو موسوڵمانە بەڕێزانەی پشتیوانان هەندێ کەس هەرمابوون لە ڕیزی پیاوانی ناو شاری مەدینەدا کە هەر هاوبەش پەیداکەر و موشریك بوون.

پێغەمبەر ﷺ بە گەیشتنی بۆ ناو ئەو شارە دەستی کرد بە بەرقەرارکردنی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی و پەیڕەوی کردنی حوکمەکانی خوا و بەشارستانییەت کردنی ئەو شارە وە گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی لە هەموو چینەکانی ئەو شارەدا دروست کرد،

بەشێوەیەك گۆڕانکارییەکی وەهای بەخۆیەوە نەدیبوو، شاری مەدینە وەك هەموو شارەکانی تر هەندێ داب و ونەریتی خراپی تیادا بڵاوبووبووەوە، بەڵام بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەو دیاردانە بەرەو نەمان چوون، چونکە خوای گەورە حەرامی کرد لەسەریان.

بۆ ڕوون کردنەوی ئەو دوو لایەنە ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە ئەو شارە لە هەموو شارێك خراپتر بوو تەرازوویان هەمووی ساختە و فێڵ بوو، بەڵام خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾﴾(المطففين) کە هەڕەشەیەکی توند بوو لەو کەسانەی کە تەرازووبازییان دەکرد، ئینجا تەرازوویان دادپەروەرانە بوو وە دوورکەوتنەوە لەو تەرازوبازییەی پێشوویان کە خوا حەرامی کرد بوو لەسەریان)[٥٦٨].

لە ئەبو واقیدی لەیثی یەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە خەڵکی سەرپشتی وشترەکانیان بەجیا دەبڕی و گەر پارەیان پێ نەبووایە دەیان فرۆشت یاخود دەهاتن دووگی مەڕەکانیان بەجیا دەبڕی و دەیان فرۆشت، چونکە دڵیان نەدەهات مەڕەکانیان سەربڕن و بیان فرۆشن، پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەم مامەڵەیە فەرمووی: ((ما قُطِع مِن البهيمةِ وهي حيَّةٌ فهي مَيْتةٌ)) واتە: ئەو پارچەیەی کە دەببڕدرێت لە ئاژەڵێکی زیندوو وەکو مردارەوە بوو وایە).

(واتە: حەرامە کڕین و فرۆشتن) بەم شێوەیە وە گۆڕانکاری چاك و بنەڕەتی لە ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی مەدینەدا ڕوویدا، بەڕاستی پشتیوانان و پیاوچاکانی نیشتەجێی مەدینە پێشوازیەکی گەورەیان کرد لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی بە جوانترین شێوە و بەرزترین خوڕەوشت مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، تا ئەوان وا هەست بکەن کە لەناو دۆست و خزمانی خۆیاندان و ئەوەندە شانازی و سەروەری بەس بێت بۆ ئەنصار کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُو الدَّارَ

---

(٥٦٨) أخرجه: النسائي في (الكبرى) (١١٦٥٤)، وابن ماجه (٢٢٢٣)، والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٠٤١)، والحاكم (المستدرك) (٣٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في(السنن الكبرى) (٣٢/٦)، وابن حبان (٤٩١٩) وقال محققه: إسناده حسن، وصحح إسناده الحافظ في (الفتح) (٦٩٦/٨)، وصححه السيوطي في (لباب النقول) (٢٨٨)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٨٠٨).

وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾(الحشر)[٥٦٩]

**لێرەدا خوای پەروەردگار سەبارەت بە مامەڵەی خەڵکی شاری مەدینە دەدوێت لەگەڵ کۆچکاران و ڕوونی دەکاتەوە کە ئەمە سیفەتیانە:**

**یەکەم: پێیان ناخۆش نییە کە ئەو برایانەیان هاتوون بەڵکو زۆریان پێ خۆشە و زۆریشیان خۆش دەوێن.**

**دووەم: بە هیچ جۆرێك بەغیلی و حەسودی و ڕق لە دڵیاندا نییە بەرامبەر ئەو برا بەڕێزانەیان کە کۆچیان کردووە بۆ ناویان و چی خوای گەورە پێ ی بەخشیبن ئەوان لەوان زیاتر پێیان خۆشبوو.**

**سێهەم: ئەگەر نەشیان بێت ئەوا لەگەڵ نەبوونی خۆشیانەوە یارمەتیان دەدەن لەوەی کە هەیانە هەرچەندە کەمیش بێت، و ئەوەندە ئەو برایانەیان خۆش دەوێت پێش خۆیانیانی دەخەن و ڕازین کە خۆیان برسی بن و ئەو برا بەڕێزانەیان برسی نەبن کە هاتوونەتە ئەو شارە بۆ بەرز کردنەوەی ئاینی ئیسلام، چاکترین نمونەی شکۆداری موسوڵمانانی ناو شاری مەدینەمان بۆ دەردەکەوێت لە مامەڵە و هەڵس و کەوتی سەعدی کوڕی ڕەبیع ﷺدا کە ئەنجامیدا لەگەڵ هاوەڵی بەڕێز عەبدل ڕەحمان کوڕی عەوف ﷺ بوو کە دەوڵەمەندێکی شاری مەککە بووە و سەروەت و سامانەکەی لێ زەوت کرابوو، وە تەنها خۆی کۆچی کردبوو بۆ مەدینە و هیچ شتێکی بۆ دەرنەچوو بوو، دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوانی سەعد و عبدالرحمنەوە.**

**بەسەر هاتی ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك کە کۆچکارە بەڕێزەکان گەیشتنە شاری مەدینە، پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان عبدالرحمن و سعدی کوڕی ڕەبیعەوە، سەعد ﷺ بە عبدالرحمانی ﷺ وت: هەموو پشتیوانانی ناو شاری مەدینە دەزانن کە من لە هەموویان پارەدار ترم و دەوڵەمەندترم و چی پارەم هەیە دەیکەم بە دوو بەشەوە**

---

(٥٦٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢١٨/٥)، وأبو داود (السنن) (٢٨٥٨)، والترمذي (السنن) (١٤٨٠)، والطبراني (الكبير) (٣٣٠٤)، والحاكم في (المستدرك) (٢٠٩/٤) وصححه على شرط البخاري وقال الذهبي صحيح على شرط مسلم، و أبويعلى (٨٤/١)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٤٨٥) وفي (صحيح الترمذي) (١١٩٧) وفي (صحيح ابن ماجه) (٢٦٠٦) وفي (غاية المرام) (٤٨).

و نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ من، وە دوو ژنیشم هەیە سەیریان بکە و کامیانت پێ باشتر بوو بۆت تەڵاق دەدەم و کاتێك کە عیددەی بەسەر چوو بیخوازە بۆ خۆت با ببێت بە خێزانت و بیگوێزەرەوە، نیوەی ماڵەکەم بۆ من و نیوەکەی تریشی بۆ تۆ، بەڵام عبدالرحمن ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو ماڵ و خێزانت و پێویستیم پێیان نییە، بەڵام بازاڕەکەتان لە کوێیە نیشانم بدە؟ ئەویش بازاڕی بەنو قەینوقاعی نیشاندا و ئەو ڕۆژە هەرچی کڕین و فرۆشتن هەبوو کردی و ئێوارە هاتەوە هەندێ کەشك و هەندێ ڕۆنی پەیدا کردبوو لەو کاسپیەی کە کردبووی (واتە: جگە لەوەی کە خۆی لە بازاڕ خواردبووی ئەوەشی لێ مابۆوە و هێنابوویەوە) دیسان بەیانی چووەوە بۆ بازاڕ و بەم شێوەیە هەتا ڕۆژێکیان هەندێ شوێنەواری زەردی پێوە دیاربوو کە وای دەگەیاند کە ئەم پیاوە ژنی هێناوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: ئایا ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: کێت هێناوە؟ وتی: ئافرەتێکی لە پشتیوانانم خواستوە و گواستوومەتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((كَمْ سُقْتَ إِلَيْهَا؟)) واتە: ئایا چەندەت مارەیی داوەتێ؟ ئەویش وتی: بە ئەندازەی یەك ناوك ئاڵتون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: [(بارك الله لك، أولِمْ ولو بشاةٍ)][٥٧٠] واتە: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئەو ژنەوە بۆت کە هێناوتە، بەڵام خواردنی شایی دروست بکە ئەگەر شەکێکیش بێت).

کەواتە: ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەرگیز ڕازی نەبوو مشەخۆر و تەمەڵ و سەربار بێت بەسەر جوتیارەکانی ناو شاری مەدینەوە، هەروەها سەرجەم هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ مشەخۆر و لات نەبوون، بەڵکو پیاوی مەیدان بوون لە کشتوکاڵ و بازرگانی و لە جەنگ و جیهادیشدا وە لە هەموو بوارەکاندا، لەبەر ئەوە ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەوڵیدا لە ڕێگەی کڕین و فرۆشتنی بازاڕدا بژێوی ژیانی دابین بکات تا ئەوەبوو بەیەکجاری دیسان دەوڵەمەند بووەوە و تا کاتێ وەفاتی کرد هەژاری بەخۆیەوە نەدی.

---

(٥٧٠) أخرجه: مالك (٧٦/٢)، وأحمد (المسند) (١٩٠/٣)، والحميدي (١٢١٨)، والبخاري (الصحيح) (٥١٦٧،٣٧٨١،٢٠٤٩)، ومسلم (١٤٢٧)، وعبدالرزاق (المصنف) (١٠٤١١)، والدارمي (٢٢٠٤)، وابن ماجه (٢١٠٩)، وأبو داود (٢١٠٩) أبو داود والترمذي (السنن) (١١٠٠)، والنسائي(١١٩/٦)، والبيهقي في (الكبرى) (٢٥٨/٧)، وابن حبان (٤٠٦٠) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٨٥٤) وفي (صحيح الترمذي) (٨٧٤)وفي(صحيح النسائي) (٣١٧٢،٣١٤٣) وفي (صحيح ابن ماجه) (١٥٤٨).

ئیبنو حەجەر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ عبدالرحمن وەفاتی کرد چوار ژنی هەبوو وە ئەو میراتەی کە لێی بەجێ مابوو سێ ملیۆن و دوو سەد هەزار دینار بوو) [٥٧١]. کەواتە بەم شێوەیە کۆچکاران نەبار و نەسەربار بوون بەسەر برا نیشتەجێکانی ناو شاری مەدینە.

پشتیوانان پیاوی مەیدان بوون بۆ برا کۆچکردووەکانیان کە هاتوون بۆلایان و ئەوەندە ڕەوشت بەرز بوون تا ویستیان داواکاریەك پێش کەش بە پێغەمبەر ﷺ بکەن وەکو ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێشنیارێکیان خستە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و داوایان کرد کە هەرچی دارخورما هەیە لەناو شاری مەدینەدا پێغەمبەر ﷺ بەشی بکات نیوەی بۆ کۆچکاران و نیوەشی بۆ خۆیان بێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو. پاشان ئەنصاریەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد وتیان: ئەوانە با لە زەویەکانماندا یارمەتیمان بدەن و کە کاتی بەروبووم هات دەیکەین بە دوو بەشەوە لەگەڵیاندا؟ کۆچکاران ئەمەیان لاپەسەند بوو وە زۆریشیان پێ باش بوو کە یارمەتیان بدەن تا بەروبوومەکە هاتە بەرهەم، بیکەن بە دوو بەشەوە لە نێوانیاندا) [٥٧٢].

ئەنەس ﷺ سەبارەت بە وەفاداری پیاوانی ئەنصاری مەدینە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە سەرفرازی و شکۆمەندی پێ بەخشی لە شاری مەدینەدا و دەوڵەمەندی پێ بەخشی لەدوای چەند غەزایەك، ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ پیاوانی پشتیوانانی بانگ کرد و پێشنیاری ئەوەی بۆ کردن کە وڵاتی بەحرەین سەرتاسەری خاکەکەی ببەخشێتە ئەنصاریەکان، بەڵام ئەوان ئەوەندە بەڕێز بوون ڕازی نەبوون و وتیان: ئەگەر ئەوەندەش بۆ برا کۆچکارەکانمان دابین دەکەیت ئەوا ڕازی دەبین وە ئەگەر تایبەت بە ئێمەیە ئەوا ڕازی نین) [٥٧٣].

بۆیە پێغەمبەر ﷺ داوای لێ خۆشبوون و بەزەیی خوای کرد بۆ ئەنصاریەکان، لە پاداشتی ئەو چاکانەی کە کردوویانە دەرهەق بە پێغەمبەر ﷺ و کۆچکاران، پێغەمبەر ﷺ بەوەفا و پێزان بوو بەرامبەر ئەو هەموو چاکەیەی کە ئەوان کردیان لەگەڵ

---

(٥٧١) أنظر: (فتح الباري) لابن حجر (٢٩٣/٩).

(٥٧٢) أخرجه: البخاري (٣٧٨٢،٢٣٢٥).

(٥٧٣) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٧٩٤).

موسوڵمانان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کرد هەر کەسێك بوو بە فەرمانڕەوای موسوڵمانان تا دەتوانێت با بە چاکی مامەڵە بکات لەگەڵ پیاوانی ئەنصاردا، تەنانەت خۆشەویستی ئەوانی کردۆتە بەڵگەی باوەڕداریێتی هەموو موسوڵمانێك تا قیامەت دێت وەکو ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((آيَةُ الإِيمانِ حُبُّ الأنْصارِ، وآيَةُ النِّفاقِ بُغْضُ الأنْصارِ))[٥٧٤] واتە: نیشانەی باوەڕداریێتی خۆشویستنی ئەنصارە و نیشانەی دووڕوویی بوغز ورق لێ بوونەلە ئەنصار)، هەروەها بەراء ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الأنْصارُ لا يُحِبُّهُمْ إلَّا مُؤْمِنٌ، ولا يُبْغِضُهُمْ إلَّا مُنافِقٌ، فمَن أحَبَّهُمْ أحَبَّهُ اللَّهُ، ومَن أبْغَضَهُمْ أبْغَضَهُ اللَّهُ))[٥٧٥] واتە: ئەنصاریەکان تەنها باوەڕدار خۆشی دەوێن و تەنها مونافیقیش ڕقی لێیانە و دەیان بوغزێنێت و هەر کەسێك ئەنصاری خۆش بوێت خوای گەورەش ئەو کەسەی خۆش دەوێت و هەر کەسێك ڕقی لە ئەنصار بێت خوای گەورەش ڕقی لەو کەسەیە و دەیبوغزێنێت).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ شاهیدی دەدات و دەفەرموێت: ((اللَّهُمَّ أنْتُمْ مِن أحَبِّ النَّاسِ))[٥٧٦] واتە: خوا ئاگادارە کە ئێوە خۆشەویستترین کەسن لای من)، وە پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردن و فەرمووی: ((اللَّهمَّ اغفِرْ لِلأنصارِ ولِأبناءِ الأنصارِ ولِأبناءِ أبناءِ الأنصارِ)[٥٧٧] واتە: (خوایە خۆشبیت لە ئەنصار و لە کوڕانی ئەنصار ولە کوڕانی کوڕانی ئەنصار)، وەلە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لَوْ أنَّ الأنْصارَ سَلَكُوا وادِيًا، أوْ شِعْبًا، لَسَلَكْتُ في وادِي الأنْصارِ، ولَوْلا الهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأنْصارِ))[٥٧٨] واتە: (گەر خەڵکی هەموویان بەیەك شیودا بڕۆن و ئەنصار بەیەك شیوی تردا بڕوات من شیوەکەی ئەنصار هەڵدەبژێرم و بە شیوەکەی ئەواندا دەڕۆم و گەر کۆچکردن نەبووایە منیش پێم خۆش بوو پیاوێك بم لە پیاوانی ئەنصار).

هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ کۆچکاران لە مەدینە بوون هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ

(٥٧٤) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٧٨٤).

(٥٧٥) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٧٨٣).

(٥٧٦) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٧٨٥).

(٥٧٧) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (٤١٢/٩).

(٥٧٨) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٧٧٩).

کەسانێك هەتا ئێستا بەچاو نەمان بینیوە کە لە دەوڵەمەندیاندا زۆر بەخشندە بن و لە نەبوونیاندا ئەوەندە یارمەتی دەربن لە چاو خەڵکی تر کە ئێمە چووینەتە ناویانەوە، بەڕاستی چی مەینەتی و ناڕەحەتی هەیە لەئێمەیان دوور خستۆتەوە و لە هەموو دەستکەوت و خۆشیەکانیشدا ئێمەیان بەشدار کردوە تا ترساوین لەوەی کە هەموو پاداشتێك ئەوان بۆ خۆیانی بەرن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ما دعَوتُمُ اللهَ لهم ، وأثنَيتُم بِالْأَجْرِ لَهُمْ))[٥٧٩] واتە: تا ئێوە دوعایان بۆ بکەن و بە چاکە باسیان بکەن ئێوەش هەر پاداشتتان دەبێت بە ئەندازەی ئەوان).

پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان نیشتەجێ بووانی ناو شاری مەدینە و پیاوە کۆچکارەکانی ناو شاری مەککە و برایەتیەکی ئەوتۆ بوو کە گەیشتە سنوری ئەوەی کە میرات ببەن لە یەکتری.

ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (کۆچکاران هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە لەوکاتەدا میراتیان وەردەگرت لە برا ئەنصاریەکانیان جگە لە خزمانی خۆیان و ئەویش بەهۆی ئەو برایەتییە بوو کە پێغەمبەر ﷺ دروستی کردبوو لە نێوانیاندا و بۆیە خوای گەورە ئایەتی: ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ۚ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾ ﴾(النساء) دابەزاند و ئەو ئایەتەی نەسخ کردەوە بە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴾[٥٨٠].

واتە: میرات گری نەما لە نێوان کۆچکاران و لایەنگراندا و تەنها برایەتی موسوڵمانانە نەبێت ئەویش بریتی بوو لە سەرکەوتن و میوانداریێتی و ئامۆژگاری و دڵسۆزی دەربرین بۆ یەکتری، پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە ئەو برایەتییە، بەیاننامەیەکی برایەتی لە ماڵی ئەنەس ئاشکرا کرد، لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پەیمانداریێتی برایەتی خستە نێوان کەسانی قورەیش و لایەنگران واتە: (کۆچکاران

---

(٥٧٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (٣/٢٠٠)، والبخاري في (الأدب المفرد) (٢١٧)، والترمذي (٢٤٨٧)، و إبي داود (السنن) (٤١١٢)، والحاكم في (المستدرك) (٢/٦٣) وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن كثير في (البداية) (٣/٢٢٨) وقال إسناده على شرط الشيخين، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الأدب المفرد) (١٥٩) وفي (صحيح أبي داود) (٤٠٢٧) وفي (صحيح الترغيب) (٩٦٧) وفي (صحيح الترمذي) (٢٠٢٠) وفي (المشكاة) (٣٢٠٦).

(٥٨٠) أخرجه: البخاري (٢٢٩٢،٤٥٨٠).

و پشتیوانان) لە خانووەکەی مندا)[٥٨١]، سەبارەت بەو یەکخستنە هەندێ فەرموودە هەیە بە پاڵپشتی گێڕانەوەی ڕاستن (إسناد صحیح) کە ئەم ڕیوایەتانەیە:

**یەکەم:** لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان ئەبوعوبەیدە و طلحەوە)[٥٨٢] ئەویان لە کۆچکاران و ئەویتریش لە ئەنصار.

**دووەم:** لە ئەبوجوحیفەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان سەلمان و ئەبودەردائەوە)[٥٨٣].

**سێهەم:** لە ئبینو عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان ئەنەس و ئیبنو مەسعودەوە)[٥٨٤].

**چوارەم:** هەروەها سەبارەت بەو برایەتییە جابیر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نوسی سەبارەت بەوەی کە لە هەموو چین و توێژێکی ئەنصاری گەر خوێنێك ڕژا دەبێت هەمووان بەشدار بن لە دانەوەی پارەی خوێنەکەدا)[٥٨٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نوسی لە نێوان کۆچکاران و ئەنصاردا کە هەردوولا وەکو یەك دەبن بۆ بژاردنی خوێن گەر لە هەر لایەکیان بێت)[٥٨٦] واتە: ئەگەر موهاجرێك پارەیەکی خوێنی هاتە سەر دەبێت ئەنصاریەکان سەرجەم یارمەتی بدەن، وە ئەگەر یەکێکیان دەست بەسەر کرا دەبێت هەردوولا وەك یەك پارە بدەن بۆ ڕزگارکردنی ئەو گیراوە، وە بەشێکی تری ئەو بەیاننامەیە دەفەرموێت: تا دەتوانن چاك مامەڵە بکەن لەگەڵ یەکتریدا.

سەبارەت بەو هۆکارانەی کە هاندەر بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ تا بەیاننامەیەکی بەوجۆرە گەلاڵە بکات، کە برایەتییەکی شەرەفمەندانە بوو لە نێوان پیاوانی کۆچکاران

(٥٨١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٢٩٤)، ومسلم (الصحيح) (٢٥٢٨)، و أبو داود (٢٩٢٦).

(٥٨٢) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٥٢/٣)، ومسلم (الصحيح) (٢٥٢٨)

(٥٨٣) أخرجه: البخاري (١٩٦٨)، والترمذي (٢٤١٥).

(٥٨٤) أخرجه: البغوي، وقال الحافظ في (الإصابة) (٣٦٩/٢) (٤٩٥٤) أخرجه: البغوي بسند صحيح.

(٥٨٥) أخرجه: مسلم (الصحيح) (١٥٠٧)، وأحمد في (المسند) (٣٤٢/٣)، والنسائي (السنن) (٥٢/٨).

(٥٨٦) أخرجه: أحمد (٢٧٠/١)، وقال الساعاتي في (الفتح الرباني) (١٠/٢): إسناده صحيح، وقال الأرناؤوط في تحقيق المسند (٦٩٠٤): إسناده ضعيف.

و ئەنصاردا. (العمري) دەفەرموێت: (کۆچکارانی مەککە کە ڕوویان کردە مەدینە چەند گیروگرفتێکی جۆراوجۆر ڕووی تێکردن لە گیروگرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستی چونکە زانراوە کە کۆچکاران سەرجەم سەروەت و سامانیان لێ زەوت کراوە وبەجێیان هێشتووە، وە شارەزا بوونیان تەنها لە بواری بازرگانیدا بووە ئەو بازرگانیەی کە تەنها قوڕەیش خۆی پێوە سەرقاڵ کردبوو، بەو شێوەیە پیاوانی کۆچکاران بە هیچ جۆرێك شارەزاییان نەبوو لە کشتوکاڵ و پیشەسازیدا کە ئەو دوانەش دوو بناغەی سەرەکی ئابووری بوون لەناو شاری مەدینەدا و سەبارەت بەوەی کە بازرگانی ئیشی ئەوانە و پێویستی بەسەرمایە و پارە هەیە و موسوڵمانانیش پارەیان بەدەستەوە نەبوو. لەبەر ئەوە زۆر بە ئاسانی نەیان دەتوانی کە بژێوی خۆیان دابین بکەن تا بتوانن ڕێگەی خۆیان بدۆزنەوە بۆ دروست بوونی قەوارەی خۆیان لەناو شاری مەدینەدا.

هەروەها سەبارەت بەوەی کە کۆچکارانی مەککە تازەن و نەناسراون و ئاوارەن لەناو شارەکەدا و پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ و نزیکیان نەبوو لەگەڵ پیاوانی نیشتەجێی ناو شاری مەدینەدا، چونکە کۆچکاران خۆیان لە خود و ناخی خۆیاندا هەستیان دەکرد بەو دووری و نامۆیی و ئاوارەییەی خۆیان و دوورییان لە خزم وکەس و کاریان و بێتاقەتییان بۆیان، ئەمانە هەمووی وای لێ کردن پێویست بکات بەوەی کە کۆچکاران وەکو هەژار و ئاوارە نەبن و بێنەوا و بێ دەرەتان تەماشا نەکرێن لەناو شاری مەدینەدا، بەو شێوەیە پێویست بوو کە یاسایەکیان بۆ دابڕێژرێت کە بژێویەکی شەرەفمەندانە و سەربەرزانەیان بۆ مسۆگەر بکرێت و وەك یەك تەماشا بکرێن لەگەڵ پیاوانی خاوەن موڵکی ناو شاری مەدینەدا، وە پێویست بوو یاسایەك هەبێت کە هەموو هەستێکی خۆبەکەم زانین دوور بخاتەوە لە پیاوانی ئاوارە و کۆچکار کە هاتوونەتە ناو شاری مەدینە بۆیە بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ بەیاننامەیەکی دەرکرد کە هەموو ڕوویەکی گرتبووە وە لە باسی ئامۆژگاری و سەردانی یەکتری و خزمایەتی و خۆشەویستی لە نێوان یەکتریدا، وە یارمەتی دانی یەکتری و ئاسان کردنی گیروگرفتی یەکتری، بەو برایەتیەی خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ و یارانی شکۆمەند و سەربەرز کرد بوو تا گەیشتبووە ئاستێك لە برایەتی ڕاستەقینە (الأصل) بەرزتر بوو بەوەی کە میراتیان لەیەکتر دەگرت)[٥٨٧].

(٥٨٧) أنظر: السيرة الصحيحة (٢٤١/١).

ئایا چەند جار پێغەمبەر ﷺ ئەم برایەتییەی خستە نێوان کۆچکاران و لایەنگرانەوە؟. سەبارەت بەم باسە ئیبن و عەباس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ دوو جار برایەتی خستە نێوانیان: جارێکیان برایەتی خستۆتە نێوان کۆچکاران لە ناو خۆیاندا (چونکە ئەوان هەر کەسەی خەڵکی شوێنێك بوون، هەندێکیان خەڵکی مەککە بوون و هەندێکیان خەڵکی هۆزەکانی دەوری مەککە بوون و دەشتەکی بوون و هەموویان ئاوارە بوون و یەکتریان نەدەناسی لەبەر ئەوە برایەتی خستە نێوانیان) پاشان برایەتی نێوانی کۆچکاران و لایەنگران لەلایەکی تر، بەڵگەش بۆ ئەمە ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان عەبدوللا کوڕی زوبێری کوڕی عەوامی پورزای خۆی لەگەڵ عەبدوللای کوڕی مەسعود کە هەردووکیان کۆچکارن)[٥٨٨]، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ هاوپەیمانێتی خستە نێوانی کۆچکاران و پشتیوانانی مەدینەوە لەناو خانووەکەی مندا ئەویش دووجار یان سێجار)[٥٨٩].

بەم شێوەیە هەندێ لەو بڕگانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕیزی بەیاننامەکەدا هێنابووی بۆ جێگیر بوونی پەیوەندی نێوان کۆچکاران و پشتیوانان لە نێوان خۆیاندا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە سەقام گیرکردنی برایەتی نێوانیان لە لایەکی ترەوە لە هەندێ بڕگەدا هاتووە کە وەکو نوسراوێك مابووەوە لای ئیمامی عەلی ﷺ و هەمیشە لەناو کیفی شمشێرەکەیدا هەڵی گرتبوو، بڕگەکانیش بەم شێوەیەن و هەموو ڕیوایەتەکان لە ئیمامی عەلییەوەیە ﷺ:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ لەو بەیاننامەیەدا فەرمووی: ((المَدِينَةُ حَرَمٌ ما بيْنَ عَيْرٍ إلى ثَوْرٍ، فمَن أحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعليه لَعْنَةُ اللَّهِ والمَلَائِكَةِ والنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يُقْبَلُ منه يَومَ القِيَامَةِ صَرْفٌ ولَا عَدْلٌ. ومَن والَى قَوْمًا بغيرِ إذْنِ مَوَالِيهِ، فَعليه لَعْنَةُ اللَّهِ والمَلَائِكَةِ والنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يُقْبَلُ منه يَومَ القِيَامَةِ صَرْفٌ ولَا عَدْلٌ. وذِمَّةُ المُسْلِمِينَ واحِدَةٌ، يَسْعَى بهَا أدْنَاهُمْ، فمَن أخْفَرَ مُسْلِمًا فَعليه لَعْنَةُ اللَّهِ والمَلَائِكَةِ والنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يُقْبَلُ منه يَومَ القِيَامَةِ صَرْفٌ ولَا عَدْلٌ))[٥٩٠].

---

(٥٨٨) أخرجه: الحاكم (المستدرك)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٧٠/٧): إسناده حسن.

(٥٨٩) أخرجه: أبو داود (السنن) (٢٩٢٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٥٣٩).

(٥٩٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (١٨٧٠،٣١٧٦)، ومسلم (الصحيح) (١٣٧٠)، و أبو داود (السنن) (٢٣٠٤)، والترمذي (السنن) (٢١٢٨)، وأحمد في (المسند) (٨١/١) (١٠٧٣) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط: حديث صحيح، وأبو يعلى (٢٦٣)، و الطحاوي في (شرح معاني الآثار) (١٩١/٤)، وابن حبان (٣٧٠٨)، و اللاكائي (١٨٨)، والبيهقي في (السنن)

واتە: شاری مەدینە حەرام کراوە لە نێوان عائیر بۆ ثور، هەر کەسێك ئاژاوەیەکی تیا بنێتەوە یان شتێکی تیادا دروست بکات یان ئاژاوەچییەك دالْدە بدات نەفرینی خوا و فریشتەکان و سەرجەم خەڵکی لێ بێت لە قیامەتدا تەوبە و کاری چاکەی لێ وەرناگیرێت، وە بەخشینی موسوڵمانان گەورە و بچوکیان هەر هەمووی وەك یەك وایە و هەر کەسێك ئەمانی برایەکی خۆی بشکێنێت ئەوا نەفرینی خوا و فریشتەکان و سەرجەم خەڵکی لێ بێت بە هیچ جۆرێك لە ڕۆژی کۆتاییدا تەوبە و کاری چاکەی لێ وەرناگیرێت، وە هەر (عەبدێك) سەر بە خاوەنەکەیەتی گەر خۆی بخاتە ناو هەر کۆمەڵێکی ترەوە بەبێ ئیزنی خاوەنەکەی و بچێتە لای ئەوان، ئەوا نەفرینی خوا و فریشتەکان و سەرجەم خەڵکی لێ بێت و لە ڕۆژی کۆتاییدا تەوبە و کاری چاکەی لێ وەرناگیرێت).

**دووەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ إبراهيمَ حرَّمَ مَكَّةَ ، وإنِّي أحرِّمُ المدينةَ ، حرامٌ ما بينَ حرَّتيها وحماها كلُّهُ ، لا يُختَلى خَلاها ، ولا ينفَّرُ صيدُها ، ولا تُلتَقطُ لُقطتُها ، إلا لمن أشارَ بِها ، ولا تُقطَعُ منها شجرةٌ إلا أن يَعلِفَ رجلٌ بعيرَهُ ، ولا يُحمَلُ فيها السِّلاحُ لقتالٍ)) واتە: ئیبراهیم ﷺ مەککەی قەدەغە کردووە و منیش مەدینەم قەدەغە کردووە لە نێوان هەردوو بەرزاییەکەیدا و هەموو سنور و پاوەنە کانیشیدا کەس بۆی نییە لەهەر جێگەیەك بەویستی خۆی سەر ئاو بکات و کەسیش بۆی نییە نێچیری ئەو جێگەیە ڕاو بکات یاخود شتێك بدۆزێتەوە و هەڵی بگرێت تەنها بۆ یەکێك نەبێت کە ئاشکرای بکات لای خەڵکی و بیەوێت بیداتەوە دەست خاوەنەکەی و هیچ کەسیش بۆی نییە درەختی ناو شاری مەدینە بشکێنێت مەگەر پێویستی پێی هەبێت بۆ خواردنی ئاژەڵەکانی و کەس بۆی نییە چەك هەڵ بگرێت لەناو شاری مەدینەدا بۆ شەڕکردن)[٥٩١].

**سێهەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لعَنَ اللهُ مَن سرَقَ مَنارَ الأرضِ ولعَنَ اللهُ مَن لعَنَ

---

(١٩٦/٥)، والبغوي في (شرح السنة) (٢٠٠٩)، و الطيالسي (١٨٤)، وعبدالرزاق (الصنف) (١٧١٥٣)، والنسائي في (السنن الكبرى) (٥٩٧٤).

(٥٩١) أخرجه: أحمد في (المسند) (١١٩/١)، وأبو داود (السنن) (٢٠٣٥)، والنسائي (السنن) (٢٠/٨)، والبيهقي في (معجم الكبير) (٢٠١/٥) وفي (معرفة الآثار) (٣٦٦/٢) مطولاً، والبزار (٦١٨)، وقال الشيخ الأرناؤوط في تخريج (المسند) (٩٥٩): إسناده حسن، وقال أحمد شاكر في تحقيق (المسند) (١٩٨/٢): إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (١٧٠٩) وفي (الإرواء) (١٠٥٩)، واللفظ للإمام أحمد.

والدَيْهِ لعَن اللهُ مَن آوَى مُحدِثاً))[٥٩٢] واتە: نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت کە قوربانی بۆ غەیری خوای دەکات وە نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە سنوری نێوانی زەوی دەگۆڕێت و دەیدزێت و زەوی داگیر دەکات وە نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە نەفرەت لە دایك و باوکی دەکات (واتا: یەکێ بە یەکێ دەڵێ لەعنەت لە دایك و باوکت ئەویش دەڵێ لەعنەت لە دایك و باوکی خۆت ئەوە لەعنەتی کردووە لە دایك و باوکی خۆی) وە نەفرەتی خوا لەو کەسە بێت بیدعەچیەك یان ئاژاوەچیەك دالْدە دەدات).

**چوارەم**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((المُسلِمونَ تَتَكافَأُ دِماؤُهمْ ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أدْناهُمْ، و يُجِيرُ عليهم أقصاهُمْ ، وهُم يَدٌ على مَن سِواهُمْ ، يَرُدُّ مُشِدَّهمْ على مُضْعِفِهِمْ ، و مُسْرِعِهِمْ على قاعِدِهِمْ ، لا يُقتلُ مؤمِنٌ بِكافِرٍ ، و لا ذُو عهدٍ في عهدِهِ (من أحدث حَدَثًا فعلى نفسِه، ومن أحدث حَدَثًا أو آوى مُحدِثًا فعليه لعنةُ اللهِ والملائكةِ والنَّاسِ أجمعينَ))[٥٩٣] واتە: موسوڵمانان خوێنیان وەك یەك وایە و بەخشینیشیان گەورە و بچوك وەکو یەك وایە و یەك دەستن سەبارەت بە کەسانی غەیری خۆیان (واتا: دوژمنانیان) وە بەهێزەکان وخێراکان ئەوەی کە لایانە دەیگێڕنەوە بۆ لاوازەکان و دانیشتووەکان و بێ تواناکان (واتا: گەر جەنگ ڕوویدا ئەوا لاواز و بەهێز لە دەست کەوتدا وەك یەك وان) وە هیچ باوەڕدارێك بە کافرێك ناکوژرێت (واتا: گەر موسوڵمان کافرێکی کوشت ناکوژرێتەوە بەڵکو خوێنەکەی دەدات) وە کەس بۆی نییە (ذمي) یەك بکوژێت جولەکە بێت یان گاور (واتا: ئەوانی سەرانە دەدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی دەبێت پارێزراو بن لەلایەن موسوڵمانانەوە وە ئەگەر موسوڵمانێك یەکێکی لێ کوشتن ئەوا دەبێت خوێنەکەی بدات) وە هەر کەسێك ئاژاوەیەك دروست کات لەناو شاری مەدینەدا ئەوا ئەنجامەکەی لە ئەستۆی خۆی دەبێت و هەر کەس ئاژاوەچییەك بگرێتەخۆ ئەوا نەفرتی خوا و فریشتەکان و سەرجەم خەڵکی لێ بێت).

---

(٥٩٢) أخرجه: البخاري في (الأدب المفرد) (١٧)، ومسلم (الصحيح) (١٩٧٨)، والنسائي (السنن) (٢٣٢/٧)، والبزار (٤٩١)، و أبويعلى (المسند) (٦٠)، وابن حبان (٥٨٩٦)، وأحمد في (المسند) (٩٥٤) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، والحاكم (المستدرك) (١٥٣/٤).

(٥٩٣) أخرجه: أحمد في (المسند) (٩٩٣) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأبو داود(٤٥٣٠،٢٧٥١)، والنسائي(١٩/٨)، وابن ماجه (٢٦٨٥)، وأبو يعلى (٦٢٨)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٣/٧)، و الطحاوي في (مشكل الآثار) (١٩٢/٣)، والبغوي في (شرح السنة) (٢٥٣١)، والبزار (٧١٤)، وصححه الشخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٩٠،٣٧٩٧) وفي (صحيح النسائي) (٤٤١٢) وفي (صحيح ابن ماجه) (٢١٧٤) وفي (الإرواء) (٢٢٠٨) وفي (المشكاة) (٣٤٧٥)، واللفظ لأبي داود.

# هەڵوێستی جولەکەکانی شاری مەدینە سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان

بۆ زانینی هەڵوێستی جولەکەکان بەرامبەر عەرەب بە گشتی و بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان بە تایبەتی، وە بۆ ناسینی ئەو فرت‌وفێڵانەی کە پێی هەستاون لە پێش ئیسلامدا و لە دوای هاتنی ئیسلام، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ پێشتر و بزانین جولەکەکان کاریان چی بووە و چۆن بوون لە پێش هاتنی ئیسلامدا، ئاشکرایە کە دوای چەوسانەوەی ئاشوریەکان و ڕۆمەکان بۆ ئەم جولەکانە و ڕاوەدونانیان لەجێگەکانی خۆیانەوە؛ ئەمانە بە کۆچکردن و ڕەوکردن گەیشتنە دوورگەی عەرەب و لە شوێنانێکی وەکو خەیبەر و مەدینە و یەمەندا نیشتەجێ بوون و لە ماوەی مانەوەیان و بەسەر بردنی ژیانیان لەگەڵ عەرەبەکاندا فێری زمانی عەرەبی بوون و تێکەڵ بە عەرەبەکان بوون لە ڕێگەی ژن و ژنخوازیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر زۆر چالاکانە قەوارەی خۆیان دەپاراست و زۆر شانازییان بە کەسایەتی جولەکەیی خۆیانەوە دەکرد.

بە نموونە عەرەبەکان پێیان دەوتن ئەوانە نەخوێندەواران (الأمين) وە ئەو شتانەی کە بۆ خۆیان حەرام بوو ئەوان بە حەڵاڵیان زانیوە کە ئەنجام بدرێت لەگەڵ کەسانی غەیری خۆیان وەك عەرەبەکان کە لە ناویاندا ژیاون، هەروەها جولەکەکان کەسانێك بوون باڵادەست بوون لە بازرگانیدا و بە تایبەتی بازرگانی دانەوێڵە و خورما و جل و بەرگ و شەراب و چەك و چەکسازی و زەڕەنگەرێتی وە نەیان هێشتووە کەس ئەو بازرگانیانەی دەست بکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە پیشەگەریدا زۆر کارامە بوون بە تایبەتی لە بواری پیشەسازی زەڕەنگەریدا، هەروەها کەوتبوونە بڵاوکردنەوەی سووخواردن لەو شوێنانەی کە تیایدا دەژیان لەگەڵ هەڵگیرساندنی ئاشوب و ئاژاوە لە نێوان خەڵکیدا بۆ ئەوەی لاوازیان بکەن و سبەی ڕۆژ خۆیان باڵادەست بن، وە هەوڵیان دەدا بە پارەی خۆیان هۆزەکانی ناو عەرەب هان بدەن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ یەکتریدا و دوای شەڕەکەش داوای سوویەکی زۆر گەورەیان دەکرد لەو قەرزانەی کە دەیاندا بە عەرەبەکان دوای کوژانەوەی ئاگری ئەو شەڕەی کە ئەوان هەڵیان دەگیرساند پێشتر.

لە ڕێگەی ئەم کارانەیانەوە دەیانتوانی هەندێ قەوارەی سەربەخۆ بۆ خۆیان دروست بکەن و بەو قەوارانەش خۆیان گرێ بدەن لەگەڵ لایەنەکانی تری عەرەبی. چواردەوریان، بۆ مانەوەی قەوارەکەیان و زوو زوو دەبوو بە شەڕیان لەگەڵ عەرەبەکاندا ئەگەر شکستیان بەدەست بهێنایە ئەو کاتە دەکەوتنە هەڕەشە کردن لێیان بەوەی کە پێغەمبەرێك هاتنی نزیك بۆتەوە و ئەوان دەچنە ڕیزی ئەو پێغەمبەرەوە و هەر هەموو دەکەونە کوشتن و لەناو بردنی عەرەب و دوژمنانی کوڕانی بەنی ئیسرائیل.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە عاصمی کوڕی عومەرەوە کە ئەویش لە هەندێ پیاوە ڕیش سپیەکانی مامۆستایانی خۆیەوە کە دەفەرموون: (ئەوەی هانی داین بۆ ئیسلام بوونمان دوای ڕەحمەت و ڕێنموویی خوا ئەو قسانە بوو کە ئەمان بیست لە جولەکەکان، چونکە ئێمە کەسانێکی موشریك بووین و بتمان دەپەرست، بەڵام ئەوان کەسانێکی ئەهلی کیتاب بوون و زانستیان لابوو، ئێمە هەندێ جار ئەگەر زیانمان پێ بگەیاندنایە و یاخود سەربکەوتینایە بە سەریاندا ئەوان پێیان دەوتین: نزیکە کاتی هاتنی پێغەمبەرێك و ئێمە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا بەو دەردەتان دەبەین کە خوای گەورە قەومی عاد و ئیرەمی پێ لەناو بردووە خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە قوڕەیش نارد باوەڕمان پێکرد))[٥٩٤].

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: کاتێ بانگ کراین بۆ ئیسلام پاش سوز و بەزەی خوا ئەوە بووە هاندەرمان کەدەمان بیست لە پیاوانی جولەکە ئەوکات ئێمە موشریك بووین وە ئەوان (ئەهلی کیتاب) بوون وە زانستیان پێ بووەوە بەردەوام ئاژاوە لە نێوانمادا هەبووە کاتێ ڕقیان هەڵدەستا پیان دەوتین لەناوتان دەبەین وەك لەناو بردنی عاد و ئیرەم، و زۆر جار ئەم هەڕەشەیەمان بەرگوێ دەکەوت لەلایەن ئەوانەوە، کاتێ خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ نارد ئێمە دەست پێشخەریمان کرد بۆ باوەڕهێنان پێی کە بانگی کردین بۆلای خوای گەورە، زانیمان ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان هەڕەشەیان لێدەکردین پێی، پێش ئەوەی ئەوان خۆیانی پێ بگەیەنن ئێمە خۆمان گەیاندە پێغەمبەر ﷺ و باوەڕمان پێهێنا و بەڕاستمان زانی، بەڵام جولەکەکان بێباوەڕ بوون بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و سەبارەت بە ئێمە و ئەوان ئەم ئایەتە

---

(٥٩٤) أنظر: (السيرة) لابن هشام (١٣٨/٢) (٤٠٨)، والطبراني (١٥١٩)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٧٥/١) وقال الحافظ في (الأحياء (١٨٣/٣): منقطع.

هاتە خوارەوە: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾(البقرة)[٥٩٥].

ئەمانە هەڕەشەیان لە عەرەبەکان دەکرد، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ هات بێ باوەڕ بوون و باوەڕیان پێ نەهێنا، سەبارەت بە و جولەکانەی کە چەند کەسێك بوون وبە پەنجەی دەست دەژمێردران کە باوەڕیان هێنابوو بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد بوو، بەڵام جولەکەکانی تر کەوتبوونە دوژمنایەتی کردنیان چونکە ئەوان چوونەتە ڕیزی موسوڵمانانەوە، وە ئەو جولەکانەش ئەمانە بوون:

(ڕیفاعی قەورەضی و عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و زەیدی کوڕی سەعنە و ئوسامەی کوڕی عوبەید و مەیمونی کوڕی یاسینی زانای جولەکەکان)[٥٩٦] تەنها ئەمانە بوون کە موسوڵمان بوو بوون.

ڕیفاعە ﷺ دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە دابەزی سەبارەت بە ئەهلی کیتاب کە من یەکێك بووم لەوانەی کە باوەڕم هێنابوو بە پێغەمبەر ﷺ بەڵام ئازار دراین لەسەر ئەو باوەڕبوونەمان و خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾﴾(القصص)[٥٩٧]. واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە پەیامی خۆمانمان یەك لە دوای یەك پێگەیاندوون بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرن. ئەوانەی پێشتر کتێبی ئاسمانیمان پێ بەخشیون، ئەوانە بە قورئان باوەڕ دەهێنن. کاتێك قورئان دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن: ئێمە باوەڕمان پێ هێنا، چونکە بەڕاستی حەقە و ڕاستەقینەیە ولەلایەن پەروەردگارمانەوە پێمان ڕاگەیەنراوە بێگومان ئێمە پێشتر هەر موسوڵمان و فەرمانبەر بووین. ئەوانە دووجار پاداشتیان

(٥٩٥) أخرجه: ابن إسحاق أنظر (سيرة ابن هشام) (٢٠٣/١)، وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة) (ص:٥٧): إسناده صحيح، وقال الشيخ مقبل بن هادى الوادعي في (الصحيح المسند من أسباب النزول) (ص:٣٦): حديث حسن.

(٥٩٦) أنظر: (الأصابة) (٤٧١/٣) (٨٢٨٨).

(٥٩٧) أخرجه: ابن جرير(٥٦/٢٠)، والطبراني في (الكبير) (٤٥٦٣)، وقال الحافظ في (الفتح) (١٩١/١): إسناده صحيح،وقال الهيثمي في (المجمع) (٩١/٧): رواه الطبراني بإسنادين أحدهما متصل ورجاله ثقات، وقال الشوكاني في (فتح القدير) (٢٣٧/٤): أخرجه: ابن أبي شيبه وابن جرير وابن المنذر وابن أبي حاتم والبغوي وابن قانع والطبري وابن مردوية بسند جيد، و أنظر (الإصابة) (٤٧١/٣) (٨٢٨٨).

پێدەدرێت بە هۆی خۆگریی و ئارام گریانەوە، بەچاکەش بەرهەڵستی خراپە دەکەن، هەروەها لەو رزق ورۆزیەی کە پێمانداون دەبەخشن.

پێ دەچێت ئەم دە کەسە لە جولەکە سەرکردەکان نەبوون لە ناو شاری مەدینەدا، چونکە دە پیاوی ناوداری سەرکردەیان هەبوو گەر ئەوان موسوڵمان بوونایە سەرجەم ئەو جولەکانە موسوڵمان دەبوون، دوانە دەکەوتن لە شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ وەکو فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَوْ آمَنَ بِي عَشَرَةٌ مِنَ اليَهُودِ، لآمَنَ بِي اليَهُودُ). واتە: گەر دە کەس لە جولەکەکان باوەڕیان بە من بهێنایە ئەوا هەموو جولەکەکان باوەڕیان دەهێنا)[٥٩٨].

یەکەم هەڵوێستیان سەبارەت بە هاتن و گەیشتنی کۆچکاران بۆ شاری مەدینە ئەوە بوو هەستان بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە کە ئەوان سیحریان لە موسوڵمانان کردووە و نایەڵن منداڵیان ببێت و نایەڵن بۆیان بمێنێت، وە سەرکردەکانیشیان دەستیان کرد بە بەرپا کردنی جەنگێکی دەروونی لەگەڵ شەڕە قسە و توانج گرتن و پرسیاری قورس و گومان کردن لە پێغەمبەر ﷺ و دروست کردنی گومانی گەورە لە دڵی موسوڵماناندا سەبارەت بە ئاین و پێغەمبەرەکەیان ﷺ، (لەو سەرکردە هەرە خراپانەی کە رۆڵی سەرەکی یان هەبوو لە دژایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ و دوور خستنەوەی خەڵکی لە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ: کوڕانی بەنو قەینوقاع و بەنو نەضیر و کوڕانی بەنو قورەیضە و بەنو عەوف و ئەوانی تر، لە کوڕانی بەنو قەینوقاع و بەنو نەضیر ئەم سەرکردانەیان دوژمنی سەرسەختی موسوڵمانان بوون: (حویەی کوڕی ئەخطەب، هەر دوو براکەی ئەبو یاسری کوڕی ئەخطەب و جودەیی کوڕی ئەختەب، سەلامی کوڕی موشکیم، کینانەی کوڕی رەبیعی کوڕی ئەبول حقیق، براکەی سەلامی کوڕی رەبیع، رەبیعی کوڕی رەبیعی کوڕی الحقیق، عەمری کوڕی جەحاش، کەعبی کوڕی ئەشرەف، حەجاجی کوڕی عەمروی کوڕی قەیس.

لە کوڕانی بەنو قەینوقاع: عەبدوڵلای کوڕی صوریا، زەیدی کوڕی لوسەید، سەعدی کوڕی حونەیف، محمودی کوڕی سەیحان، عوزەیری کوڕی ئەبو عوزەیر، سومیدی کوڕی حارث، فینحاص و ئوشەیع و نعمانی کوڕی ئەضا، بوحرای کوڕی

(٥٩٨) أخرجه: البخاري في (الصحيح) (٣٩٤٥)، وفي رواية ((لو آمن بي عشرة من أحبار اليهود لآمن بي كل يهودي على وجه الأرض) أخرجه: أحمد (المسند (٢/٣٤٦) (٨٥٥٥) وقال محققه: حديث صحيح..

عەمر، شاشی کوڕی عادی، شاشی کوڕی قەیس، زەیدی کوڕی حەرس، نوعمانی کوڕی عەمر، سوکەینی کوڕی ئەبو سوکەین، عودەی کوڕی زەید، و نوعمانی کوڕی ئەبو ئەوفا، مەحمودی کوڕی دوحیە، کەعبی کوڕی راشد و عازەر و ڕافعی کوڕی ئەبو ڕافیع، ڕافیعی کوڕی حارث و ڕافیعی کوڕی حورەیمیلە، ڕافیعی کوڕی خاریجە، مالیکی کوڕی عەوف، ڕافیعی کوڕی زەیدی کوڕی تابوت).

لە کوڕانی بەنی قورەیضە: زوبێری کوڕی طابە و عەزالی کوڕی شەمۆێل و کەعبی کوڕی ئەسەد و شەمۆئێل کوڕی زەید و جەبەلی کوڕی زەید، نەحامی کوڕی زەید، قوردومی کوڕی کەعب، وەهەبی کوڕی زەید، نافع کوڕی نافع، عودەی کوڕی زەید، حارثی کوڕی عەوف، ئوسامەی کوڕی حەبیب، و ڕافیعی کوڕی ڕومەیلە، و جەبەلی کوڕی ئەبی قوشەیر، و وەهەبی کوڕی یەهوزا.

وە لە کوڕانی بەنی زورەیق: سیحربازی ناوداریان لوبەیدی کوڕی ئەعصەم، وە لە کوڕانی بەنی حاریسە: کینانەی کوڕی صوریا، وە لە کوڕانی بەنی عەمری کوڕی عەوف (کە ئەمانە جولەکەی ئەنصاری بوون بەڵام جولەکەی سەرسەختییان تیا بوو کە موسوڵمان نەبوون): قوردمی کوڕی عامر، وە لە کوڕانی بەنی نەجاڕ: سەلسەلەی کوڕی بورهام).

ئەمانە بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا بۆ لاواز کردنی موسوڵمانانی ناو شاری مەدینە و ئەم جوولەکانە پرسیان دەکرد سەبارەت بە یەکتایی خوا (توحید) و هاتنی ڕۆژی قیامەت و (ذو القرنين) و چەندین پرسیاری ئاڵۆزی تریان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ و ئەم جۆرە پرسیارانەش بۆ ئەوە نەبوو کە لە ئیسلام نزیك ببنەوە تا شارەزا ببن و باوەڕ بهێنن، بەڵکو تەنها بۆ گومان دروست کردن بوو لە دڵی موسوڵمانانی شوێن کەوتووی پێغەمبەردا ﷺ، لە یەکێك لەو جارانەدا هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پەیمانیاندا گەر ئەو پرسیارانە وەڵام بداتەوە کە ئەوان لێ ی دەکەن ئەوا سەرجەم لەوێدا موسوڵمان دەبن و دێنە ڕیزی موسوڵمانانەوە بەڵام دوای ئەوەی ئەو بەڵێنەیاندا پێغەمبەر ﷺ وەڵامەکانی دانەوە جولەکەکان وتیان: ڕاست دەکەیت ئەوە وەڵامی ڕاستەو دەشیانزانی کە جبریل عليه السلام وەحی دەهێنێت بۆ پێغەمبەران عليهم السلام بۆیە لێرەدا بە مەبەستی خۆدزینەوە لە باوەڕهێنان بە پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئایا کێ

وەحی دێنێت بۆلای تۆ؟ بۆ ئەوەی بڵێت جبریلە، کە فەرمووی: جبریلە ؑ، وتیان: ئێمە ئەوە دوژمنمانە کەواتە: باوەڕت پێ ناکەین)[٥٩٩].

ئەم بەسەرهاتەش ئیبنو عەباس ؓ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (جولەکەکان هاتنەلای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: ئەی ئەبو قاسم ئێمە پرسیارت لێدەکەین سەبارەت بە هەندێ شت گەر وەڵامت داینەوە شوێنت دەکەوین و بەڕاستت دەخەینەوە و باوەڕت پێ دەهێنین؟ پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لێ وەرگرتن بەو پەیمانەی کە ئیسرائیل واتە: (یعقوب) وەریگرتبوو لە کوڕەکانی و ئەوانیش دوای پەیمانەکە وتیان: (اللهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ) واتە: خوای گەورە وەکیلە لەم پەیمانەماندا کە ئێمە پابەند دەبین و دەیهێنینە دی.

یەکەم پرسیار وتیان: پێمان بڵێ نیشانەی پێغەمبەر چییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تنامُ عيناهُ ولا ينامُ قلبُهُ)) واتە: نیشانەی ئەوەیە کە چاوی دەخەوێت و دڵی ناخەوێت، وتیان: ڕاست دەکەیت!!، پێمان بڵێ بۆ چی منداڵی سکی ئافرەت هەندێ جار کوڕ دەبێت و هەندێ جار کچ دەبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يلتقي الماء انِ فإن علا ماءُ المرأةِ ماءَ الرجلِ أُنّثتْ وإن علا ماءُ الرجلِ ماءَ المرأةِ أُذكِرَتْ)). واتە: هەردوو ئاوەکە بەیەك دەگەن گەر ئاوی ئافرەتەکە بەرز بوو بەسەر ئاوی پیاوەکەدا ئەوا کچ دەبێت و ئەگەر ئاوی پیاوەکە بەسەر ئاوی ئافرەتەکەدا سەرکەوت و بەرز بوو ئەوا کوڕ دەبێت، وتیان: ڕاست دەکەیت و پێمان بڵێ سەبارەت بە هەورە بروسکە چی یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ملَكٌ من ملائكةِ الله عز وجل موكّل بالسحابِ (في بيدهِ مِخْراقٌ من نارٍ) يَسُوقُ بها السَّحابَ حيثُ شاء اللهُ)). واتە: ئەوە فریشتەیەکە لە فریشتەکانی خوای گەورە کە کاری هەورە بروسکەی پێ سپاردووە و گورزێکی ئاگری بەدەستەوەیە هەورەکان هاتووچۆ پێ دەکات بۆ ئەو شوێنەی کە خوای گەورە ویستی لێیەتی، وتیان: ئەی ئەو دەنگە چییە کە گوێمان لێیەتی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زَجْرُهُ السَّحابَ إذا زجَرَه حتى ينتهيَ إلى حيث أمرَه)). واتە: ئەوە توڕە بوونی فریشتەیەکە کە لە هەورەکە توڕە دەبێت و دەیانبات تاکو ئەو شوێنەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە ئەو هەورانە بگەیەنێتە ئەوێ، وتیان: ڕاست دەکەیت، پێمان بڵێ ئیسرائیل (واتا: یەعقوب) ئەو شتانەی کە

(٥٩٩) أنظر: سيرة ابن هشام (١١٣/١).

حەرامی کردبوو لەسەر خۆی چیبوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (كان يسكُنُ البدوَ فاشتكَى (عرق النساء) فلم يَجِدْ شيئًا يُلَائِمُهُ إلا لُحُومَ الإبِلِ وألبانَها ، فلذلك حَرَّمَها....). واتە: ئەو نیشتە جێی لادێ بوو تووشی نەخۆشی (عرق النساء) بوو (کە ڕەگێکە لە قاچدایە و وا دەکات ئەو کەسە نەتوانێ بەڕێگادا بڕوات) و هیچ شتێکی نەبینی کە پێی بکەوێت و پێی چاك بێتەوە تەنها گۆشت و شیری وشتر نەبێت، لەبەر ئەوە حەرامی کرد لەسەر خۆی، وتیان: ڕاست دەکەیت، ئینجا لە کۆتایی قسەکانیاندا وتیان: پێمان بڵێ کێ وەحییت بۆ دەهێنێت هەر ئەم پرسیارەمان ماوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جبریل ﷺ، وتیان: ئەو کەسەی کە شەڕ و سزا دێنێتە خوارەوە؟ ئەوە دوژمنی ئێمەیە گەر بتوتایە میکائیل کە ڕەحمەت و باران و ڕواندنی زەوی بە دەستە ئەوا باوەڕمان پێ دەهێنایت و شوێنت دەکەوتین، خوای گەورە سەبارەت بەوان ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت:﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾(البقرة)[600]. واتە: ئەی محمد پێیان بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جبریلە، بابزانێت کە هەر ئەو جبریلەیە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆوەتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بەڕاست دادەنێت و ڕێنمویی بۆ چاکە دەکات و مژدە بە ئیمانداران دەدات.

ئەم جوولەکانە دەکەوتنە پڕوپاگەندە دروست کردن بۆ لەکەدار کردنی کەسایەتی ئەو زانا جوولەکانەی کە پێشتر موسوڵمان بوو بوون و چووبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بە چاوی سووك تەماشایان بکەن، و ڕۆژێك لەڕۆژان نەچنە ناو ڕیزی موسوڵمانانەوە.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و سەعلەبەی کوڕی سەعنە و ئوسەیدی کوڕی سەعنە و ئەسەدی کوڕی عوبەید و هەندی لە پیاوانی جولەکە موسوڵمان بوون، زانا جولەکەکان وتیان: ئەوانەی کە باوەڕیان بە محمد هێناوە و شوێنی کەوتوون ئەوانە خراپکارانی ئێمەن و گەر چاکەکارانی ئێمە بوونایە وازیان لە ئاینی باوك و باپیریان نەدەهێنا تا بچنە ناو دینێکی ترەوە، خوای

(٦٠٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٧٤/١) (٢٤٨٣) وقال محققه الأرناؤوط: حديث حسن، وابن سعد في (الطبقات) (١١٥/١)، و الطيالسي (٢٧٣١)،والترمذي (السنن) (٣١١٧)، والنسائي (السنن) (٩٠٧٢)، والطبري في (التفسير) (٣٤٢/١)، والطبراني في (الكبير) (١٢٤٢٩)، و إبو نعيم في (الحلية) (٣٠٤/٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٤٢/٨):رجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٩٢) وفي (السلسلة الصحيحة) (١٨٧٢).

گەورەش سەبارەت بەم قسانەی ئەوان ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾(آل عمران)[601]. واتە: گاور و جولەکە هەموویان یەکسان نین، بەڵکو لە خاوەن کتێبەکان دەستەیەك لە ئیماندارانیان هەن، ئایەتەکانی خوا لە شەودا دەخوێننەوە و نوێژ دەکەن سوجدە دەبەن.

جولەکەکان دەکەوتنە پیلان گێڕان و زیان گەیاندن بە موسوڵمانان لە هەر هەلێکدا کە بۆیان ڕێبکەوتایە، یەکێك لەو کارە چەپەڵانەیان وەکو ئەنەس ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (جولەکەیەك لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ پەلاماری جاریەیەکیدا کە ملوانکەیەکی لەملدا بوو لێی سەند و خستی بە زەویدا و یەك بەردی کێشا بە سەریدا و سەری پان کردەوە، خزمانی ئەو جاریەیە هەڵیان گرت و هێنایان بۆلای پێغەمبەر ﷺ کە هێشتا گیانی تیا مابوو بەڵام زمانی شکابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ تۆی کوشت؟ ئایا فڵانە کەس بوو ئافرەتەکەش بەسەر ئیشارەتی کرد وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی فڵانە کەس کە جولەکەیە تۆی کوشتووە؟ ئیشارەتی کرد نەخێر، کە یەکێکی تری فەرموو: جارییەکە ئیشارەتی کرد وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە ئەو جولەکەیە دەستگیر بکرێت و بهێنرێت و سەری دابنرێت لەسەر بەردێك و بە هەمان شێوە بەردێك بکێشرێت بە سەریدا)[602].

جولەکەکان هەمیشە لە گێڕانی پیلاندا بوون بۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانانی ئەنصار بە تایبەتی وە کۆچکاران بە گشتی. (شاشی کوڕی قەیس کە جولەکە بوو ڕۆژێکیان تێپەڕی بەلای کۆمەڵانێکی ئەنصاریدا کە دانیشتبوون و تەبایی و برایەتی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا بوو، ئەم خۆی ئەوانی دەناسی کە پێش ئیسلام بوونیان دوژمنی سەرسەختی یەکتر بوون و شەڕی بوعاث ڕوویدا بوو لە نێوانیاندا، سەرکردەکانیشیان کوژرا بوون، ئێستاش دەبینێت برایەتی و ئاشتی و تەبایی هەیە لە نێوانیاندا، لەبەر ئەوە زۆری پێ ناخۆش بوو بانگی یەکێ لە جولەکەکانی کرد

---

(٦٠١) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١٥٣/٢) (٤٣٥)، والطبري في (التفسير) (٧٦٤٤)، والبيهقي في (الدلائل) (٥٣٣/٢)،والطبراني في (الكبير) (٨٧/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٢٧/٦): رجاله ثقات.

(٦٠٢) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٥٢٩٥،٦٨٧٨)، ومسلم (الصحيح) (٤٣٣٧)، و أبي داود (السنن) (٤٥٢٩)، وابن ماجه (السنن) (٢٦٦٦)، والبيهقي في (المعجم الكبرى) (٤٢/٨).

کە بچێتە ناویان دابنیشێت و لە قسەکردندا ڕۆژی بوعاثیان بە بیر بهێنێتەوە، ئەو شەڕەی کە زۆریان لە یەکتر کوشتووە تیایدا بۆ ئەوەی ئەو برینەیان بکولێنێتەوە و دیسان هۆزایەتییان تیا زیندوو بکاتەوە و ئاشوبە و شەڕێك لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا دروست بکات، ئەوە بوو هاوار بەرز بووەوە لە هەردوو لایەنەکە و خۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕ کردن، تا پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناویان و خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ ئەو ئاشوبەیەی شاشی کوڕی قەیسی کوژاندەوە و برایەتی و تەبایی گێڕایەوە ناو ڕیزی ئەوس و خەزرەج لەلایەك و لە لایەکی ترەوە لە نێوان کۆچکاران و ئەنصاردا)[٦٠٣].

هەروەها جولەکەکان بەوەوە نەدەوەستان بەڵکو دەکەوتنە بڵاوکردنەوەی سیفەتی ناشیرین و ناوی ناشیرین و جنێودان و خراپەکاری و بەخراپ باسکردنی خوای گەورە لە نێوان موسوڵمانانندا وەك ئەو ڕووداوەی کە لە نێوان هاوەڵی پایە بەرز ئەبوبەکر لەگەڵ زانایەکی جولەکە کە ناوی فینحاص بوو.

ئیبن ئیسحاق ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ڕۆژێك ئەبوبەکر ﷺ چووە (بیت المدراس) (واتە: قوتابخانەیەکی جولەکەیە کە بۆ خوێندنی تەوراتە) کە ئەبو بەکر ﷺ چوو بینی کۆمەڵێکیان لە پیاوێکی زانایان کۆبوونەتەوە کە ناوی فینحاص بوو، جگە لەویش یەکێك لە زاناکانی تریشیان کە ناوی ئوشەیع بوو لەگەڵیاندا بوو، ئەبوبەکر ﷺ بە فینحاصی وت: لە خوا بترسە موسوڵمان ببە تۆ دەزانیت کە محمد پێغەمبەری خوایە ﷺ و بەحەق هاتووە لەلایەن خواوە و دەیبینیت لە تەوراتی خۆتاندا ناوی هاتووە؟!!

فینحاص بە ئەبوبەکری وت: ئەی ئەبو بەکر ئێمە هەژارنین بەڵکو خوا هەژارە و پێویستی بە ئێمەیە، ئێمە لە خوا ناپاڕێینەوە، خوا لە ئێمە دەپاڕێتەوە، ئەگەر پێویستی بە ئێمە نەبووایە داوای قەرزی لێ نەدەکردین وەکو محمدەکەی لای ئێوە دەڵێت!!!

ئەبوبەکریش ﷺ خۆی پێ نەگیرا و کەوتە لێدانی فینحاص و دوایی فینحاص خۆی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری بانگ کرد و پێی وت: چی

(٦٠٣) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١٥١/٢)، والطبري في (التفسير) (٧٥٢٤).

وای لێ کردیت تا وای لێ بکەیت؟ ئەبو بەکریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوژمنەی خوایە قسەی زۆر ناشرینی دەوت بە خوا و دەیوت: کە خوا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین و..... منیش لە پێناوی خوادا توڕەبووم و لێمدا، فینحاص وتی: نەخێر من قسەی وام نەکردووە و هەرگیز شتی وام نەوتووە، سەبارەت بەم ڕوداوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾(آل عمران)[٦٠٤]. واتە: بێگومان خوا وتەی ئەو کەسانەی بیست کە وتیان: خوا هەژارەو، ئێمە داراو دەوڵەمەندین ئەو قسە و گوفتارەیان و، ئەو بەناهەق کوشتنەی پەیامبەرانەیان لەسەر دەنووسین و تۆڵەیان لێدەکەینەوە تۆڵەیان لێدەسێنین و پێیشیان دەڵێین: دەسا سزای سووتێنەر بچێژن.

لەگەڵ ئەمانەشدا پێغەمبەر ﷺ دەچوو بۆلایان و بانگەوازی دەکردن و ئاگاداری دەکردن کە دان بەحەق و ڕاستیدا بنێن، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (کوڕێکی جولەکە هەبوو خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد ﷺ، ئەو خزمەتکارە نەخۆش کەوت و پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای بۆ سەردانی و لای سەریەوە دانیشت و بە کوڕەکەی فەرموو: موسوڵمان ببە، (لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: بڵێ: (لا إلهَ إلاَّ الله) تا بەوە تکات بۆ بکەم لای خوا لە قیامەتدا، ئەویش لای باوکیەوە نزیك بوو وە تەماشای باوکی کرد تا بزانێت ڕازییە؟! باوکیشی وتی: بەقسەی ئەبو لقاسم بکە، ئەویش وتی: شایەتی دەدەم کە تەنها الله هەر خوایە و محمد پێغەمبەری خوایە ﷺ و موسوڵمان بوو، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لحمدُ للهِ الَّذي أنقذه بي من النَّارِ))[٦٠٥] واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایە کە بەهۆی منەوە ڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ).

هەروەها ئەبو صەخری عقیلی لە پیاوێك لە پیاوانی ئەعراب دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (جەڵەبێ ئاژەڵم هێنا بۆ شاری مەدینە لە کاتی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ، و کاتێ کڕین و فرۆشتنم تەواو کرد وتم: دەبێ بچم بۆلای ئەم پیاوە و لێی نزیك

---

(٦٠٤) أخرجه: ابن هشام (١٥٤/٢) (٤٣٧)، والطبري في (التفسير) (٨٣٠٠)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٣١/٨): رواه ابن أبي حاتم وابن منده بإسناد حسن، وقال السيوطي في (لباب النقول) (ص:٦٢): إسناده حسن.

(٦٠٥) أخرجه: البخاري (١٣٥٦)، وأبو داود(٣٠٩٥)، والنسائي (٢٣٨/٢)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (٣٨٣/٣)، وأحمد في (المسند) (٢٢٧/٣)، والحاكم في (المستدرك) (١٢٩/٤)، وابن حبان (٢٩٦٠) وقال محققه: الشيخ الأرناؤوط: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٦٥٣).

ببمەوە و گوێی بۆ بگرم، ڕۆیشتم و پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕووم هات و ئەبوبەکر و عومەری لەگەڵدا بوو، دوای ئەوە ڕۆیشتن و منیش شوێنیان کەوتم و چوون بۆلای پیاوێکی جولەکە تەوراتەکەی بڵاوکردبووەوە و دەیخوێندەوە و دڵخۆشی خۆی پێ دەدایەوە سەبارەت بە کوڕێکی جوان چاکی خۆی کە لە سەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە پیاوەکە: (أنشُدُك بالَّذي أنزلَ التَّوراةَ ، هَل تجدُ في كتابِكَ ذا صِفَتي ومخرَجي ؟...) واتە: سوێندت دەدەم بەو خوایەی کە تەوراتی ناردووەتە خوارەوە ئایا لە کتێبەکەتدا وەصفی من و جێگەی کۆچ کردنی من دەبینیتەوە تیایدا؟ ئەویش بەسەر ئیشارەتی کرد و وتی: نەخێر، کوڕەکەشی کە لەسەرەمەرگدا بوو وتی: بەڵێ سوێند بەوەی کە تەوراتی هێناوەتە خوار لە کتێبەکەماندا سیفەتی تۆی تیایە و سیفەتی مەدینەی تیایە و منیش شاهیدی دەدەم کە خوای گەورە تاك و تەنهایە و تۆش پێغەمبەری خوایت ﷺ، ئینجا کوڕەکە وەفاتی کرد، و پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە فەرمووی: (أقيموا اليهوديَّ عَنْ أَخِيْكُمْ) واتە: ئەو جولەکەیە لە براکەی خۆتان دوور بخەنەوە، پاشان بە نەریتی ئیسلامەتی شۆررا و کفن و دفن کرا و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد)[٦٠٦].

لە یەکێك لە ڕووداوەکانی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ چۆن سەردانی کردوون و لەگەڵیاندا کەوتووەتە گفتوگۆ، عەوفی کوڕی مالیك دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و منیشی لەگەڵدا بووم چووە ناو کەنیسەیەکی جولەکەکان لە ناو شاری مەدینەدا لە ڕۆژێکدا کە ڕۆژی جەژنی ئەوان بوو، ئەوان پێیان ناخۆش بوو کە پێغەمبەر ﷺسەردانی کردوون لەو ڕۆژەدا و ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ((يا معشرَ اليَهودِ أروني اثنَي عشرَ رجلًا منكُم يشهدونَ أنَّهُ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ محمَّدًا رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وعلى آلِهِ وسلَّمَ يَحُطُّ اللَّهُ عن كلِّ يَهوديٍّ تحتَ أديمِ السَّماءِ الغضبَ الَّذي غضبَ عليه)). واتە: ئەی کۆمەڵانی جولەکە دوانزە کەس لە ئێوەم نیشان بدەن کە شایەتی بدەن کە (الله) تاك و تەنهایە و محمد پێغەمبەری خوایە، خوا غەزەبی بە ئەندازەی نێوان ژێر پەردەی ئاسمان لادەبات لە سەر هەموو یەکێ لە پیاوانی ئێوەدا لەو غەزەبەی کە دایناوە لەسەرتان، ئەوان هەر هەموویان بێدەنگ

---

(٦٠٦) أخرجه:أحمد في (المسند) (٤١١/٥) (٢٣٤٩٢)، وابن كثير في (السيرة) (٣٢٣/١) وقال: إسناده جيد وقال في (التفسير) (٢٥١/٢): حديث جيد قوي، وقال الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٦٩): إسناده صحيح.

بوون و کەس وەڵامی نەدایەوە، دووبارە و سێبارەی کردەوە بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أبيتُمْ فواللَّهِ إنِّي لأنا الحاشِرُ وأنا العاقبُ وأنا النَّبيُّ المصطفى آمنتُمْ أو كذَّبتُمْ)) واتە: سوێند بە خوا ڕازی نەبوون و پشتتان هەڵکرد بزانن من (حاشر و عاقب) و من هەر پێغەمبەری هەڵبژێرراوی خوام باوەڕم پێ بهێنن یان بە درۆم بخەنەوە وباوەڕم پێ نەهێنن، ئینجا گەڕایەوە)[٦٠٧].

(حاشر و عاقب) دوو ناوی پێغەمبەری خوان ﷺ و (حاشر) ئەوکەسەیە کە شەفاعەت دەکات و لە ڕێگەی شەفاعەتی ئەوەوە خەڵکی حەشر دەکرێن، (عاقب) ئەوکەسەیە کە هیچ پێغەمبەرێك لە دوای ئەوەوە نەهاتووە و نایەت.

## چەسپاندنی حوکمی خوا بۆ جوولەکان بە کتێبی تەورات

پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە چەسپاندنی هەندی حوکمی خوا لە کتێبی تەوراتەکەیاندا کە ئەوان دەیان شاردەوە و ئاشکرایان نەدەکرد هەتا لە نێوان جولەکەکانی خۆیاندا، گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، سەبارەت بە دیاری کردنی سزای ئەو کارە و جێگیرکردنی وە پێی دەسەلماندن کە ئەو سزایەی خوا دایناوە لە قورئاندا هەمان سزایە کەپێشتر داینـاوە لەتەوراتدا ئەم باسە لەم ڕیوایەتانەی خوارەوەدا هاتووە:

**یەکەم:** ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پیاو و ئافرەتێکی جولەکەیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ زینایان کردبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئێوە دەبینن لە تەوراتدا سەبارەت بەو کەسەی کە زینا بکات سزاکەی چیە؟ وتیان: ڕوویان ڕەش دەکەین و پاشان سواری کەرێکیان دەکەین و پشتاوپشت دایان دەنێین و ئینجا دەیانگێڕین بەناو شاردا!! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فَأْتُوا بالتَّوْرَاةِ إنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ)) واتە: تەورات بهێنن گەر ئێوە ڕاست دەکەن، ئەوانیش تەوراتەکەی خۆیانیان هێنا و دەستیان کرد بە خوێندنەوەی هەتا گەیشتنە ئایەتی ڕەجم، ئینجا ئەو کوڕەی کە دەیخوێندەوە یەکسەر دەستی دانا لەسەر ئایەتەکە و پێش ئایەتەکەی ڕەجم و دوای ئایەتەکەی

---

(٦٠٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢٥/٦) (٢٣٩٨٤) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، والطبراني في (الكبير) (١٨٣/١٨)، والطبري في (التفسير) (١١/٢٦)، والحاكم في (المستدرك) (٤١٥/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧١٦٢) وقال الأرناؤوط: إسناده حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٦/٧): رجاله رجال الصحيح، وقال السيوطي في (لباب النقول) (ص/١٩٠): إسناده صحيح، وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند من أسباب النزول) (ص:٢١١): صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني على شرط مسلم في (صحيح السيرة) (ص:٨١).

ڕەجمی خوێندەوە، عەبدوڵلای کوڕی سەلام ﷛ کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو خۆی شارەزای تەورات بوو وە زانایەکی (حیبری) جولەکە بووە وە موسوڵمان بوو بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کوڕە بڵێ دەست لەو شوێنە لابدات و ئەوەی ژێر دەستی بخوێنێتەوە، کاتێ کە دەستی لادا تەماشا دەکەن ئایەتی ڕەجمی تێدایە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بە ڕەجمی ئەو دووانە کە لە تەوراتدا هەیە و لە قورئانیشدا هەیە چونکە ئەو دوو کەسە ژن و پیاو بوون نەك کوڕ وکچ)[٦٠٨].

**دووەم:** (بەڕائی کوڕی عازیب ﷛ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەلای جولەکەیەکدا تێپەڕی جەڵدیان لێدابوو وە ئاوی گەرمیان بەسەردا کردبوو، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن و فەرمووی: ((هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ؟)) واتە: ئایا سزای زیناکار بەم شێوەیە دەبیننەوە لەناو کتێبەکەتاندا؟ وتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ یەکێ لە زانا جولەکەکانی بانگ کرد و فەرمووی: ((أَنْشُدُكَ باللّٰهِ الذي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ علَى مُوسَى، أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ)) واتە: سوێندت دەدەم بەوەی کە تەوراتی ناردۆتە خوار بۆ موسا ﷵ، ئایا بەو شێوەیە سزای زیناکار دەبیننەوە لە کتێبەکەتاندا؟ زاناکە وتی: نەخێر بەڵام گەر تۆ سوێندت نەدامایە بەم سوێندە قەت پێم نەدەوتیت، ڕاست دەکەیت لای ئێمەش لە تەوراتدا هەر ڕەجمە، بەڵام پیاوە دەوڵەمەند و کار بەدەستەکانمان کاتێك کە زینایان زۆر تیا باوبوو ئێمە گەر یەکێکمان لەوانە بگرتایە لەسەر زینا کردن وازمان لێ دەهێنا و سزاکەمان بەسەردا جێ بەجی نەدەکرد، بەڵام گەر پیاوێکی لاوازمان بگرتایە ئەوا سزاکەمان بەسەردا جێبەجێ دەکرد و دەمان چەسپاند، بەڵام دوایی وتمان: با کۆببینەوە یان شتێك بکەین کە بۆ هەژار و دەوڵەمەند وەك یەك وابێت ئێمەش هاتین سزای جەڵد و ئاوی گەرم کردن بەسەر زیناکاراندا دانا لە جیاتی ڕەجم کردن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهمَّ إنِّي أوَّلُ من أحيا أمرَك إذ أماتوه)) واتە: خوای پەروەردگار من یەکەم کەسم کە فەرمانەکەت زیندوو دەکەمەوە دوای ئەوەی ئەوان مراندوویانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە ئەو جولەکەیە دەبێت ڕەجم بکرێت و خوای گەورەش سەبارەت بەم باسە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ

(٦٠٨) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٦٨١٩)، ومسلم (الصحيح) (٤٤١٢)، وأبو داود (السنن) (٤٤٤٦)، وابن ماجه (السنن) (٢٥٥٦).

﴿لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّـٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّـٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾﴾(المائدة). واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ باغەمبارت نەکات ئەوانەی لە بێباوەڕیدا پێش ڕەوی دەکەن، ئەوانەیان بە زوبان دەڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەڵام بەدڵ باوەڕیان نەهێناوە، وە ئەوانەش کە بوونەتە جولەکە و هەردەم گوێ بۆ درۆ دەگرن، گوێ بۆ کەسانێکی تری جاسوس و خوانەناس دەگرن کە نەهاتوونەتە لای تۆ وەك جولەکەکانی (خەیبەر و تەبوك) لە باتی ئەوە کە گوێ بۆ تۆ بگرن، کە چی گوێ بۆ خەڵکی تر دەگرت، بەبڕیاری ئەوان ڕەفتاریان دەکرد و قسەی تۆشیان دەبردە لای ئەوان حوکمەکانی خوا دەگۆڕن وە چۆن بەردە بارانی زینا کاریان گۆڕی بۆ قامچی لێدان، دەڵێن بچن بۆلای محمد ئەگەر حوکمەکەی وەك هی خۆمان بوو لێی وەربگرن، بەڵام ئەگەر وانە بوو ئەوا خۆتانی لێ بپارێزن و بە گوێی مەکەن، هەرکەسێ خوا بیەوێت بەسەختی تاقی بکاتەوە و گومرای بکات هەرگیز تۆ ناتوانیت لای خوا شتێکی بۆ بکەیت و ڕزگاری بکەیت ئەمانە خەڵکانێکن خوا نایەوێت دڵیان لە چڵك و چەپەڵی و شیرك پاك بکاتەوە بەشیان لەم جیهانەدا ڕسواییە وە لە دواڕۆژیشدا سزای سەخت وگەورەیە.

(خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو جولەکانە لەو پرسیار کردنەیان مەرامیان ئەوە بوو وتیان: با بڕۆین بۆلای ئەم پێغەمبەرە، بەڵکو شتێکی سووکتری لەلا بێت بۆ ئێمە تا لەو ڕەجم کردنە خۆمان بپارێزین و ئەگەر جەڵدە و ئاوی گەرمکراوی پێ وتین وەری دەگرین، بەڵام ئەگەر ڕەجمی پێ وتین ئەوا بەقسەی ناکەین) ئینجا خوای گەورە سەبارەت بەم جولەکانە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت: ﴿......وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾(المائدة). هەروەها ئایەتی ﴿.... وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾(المائدة) بەڵام ئایەتی: ﴿....وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾(المائدة). سەبارەت بە گشت کافرەکان هاتە خوارەوە)[٦٠٩].

(٦٠٩) أخرجه: مسلم (الصحيح) (٤٤١٥)، وأبو داود (السنن) (٤٤٤٨)، وابن ماجه (السنن) (٢٥٥٨).

**سێهەم:** ئیبنو عومەر ؓ دەفەرموێت: (کۆمەڵێك لە جولەکەکان پێغەمبەریان بانگ کرد ﷺ بۆ شیوی (قوفی) ئەو بەری شاری مەدینە، و پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ئەوێ بۆ شوێنی تەورات خوێندنەکەیان و پێیان وت: ئەی باوکی قاسم پیاو و ئافرەتێك لە ئێمە زینایان کردووە چی یان لێ بکەین؟ پێغەمبەر ﷺ ویستی دابنیشێت و دۆشەکێکیان بۆ هێنا و لەسەری دانیشت و فەرمووی: تەوراتەکەی خۆتانم بۆ بهێنن، ئەوانیش بۆیان هێنا و ئینجا پێغەمبەر ﷺ دۆشەکەکەی دەرهێنا لەژێر خۆی و تەوراتەکەی خستە سەر و فەرمووی: (آمنتُ بكِ وبِمن أنزلَكِ)[٦١٠] واتە: باوەڕم بەتۆ هەیە (واتە: تەورات) و بەوەی کە ناردوویەتی (واتە: خوای گەورە)).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((ائْتوني بأعلَمِ رَجُلَيْنِ مِنْكُمْ)) واتە: دوو پیاوی هەرە شارەزای خۆتانم بۆ بانگ بکەن، ئەوانیش عەبدوڵڵا و براکەیان بانگ کرد کە هەردووکیان کوڕی صوریا بوون و دووانی هەرە شارەزای جولەکەکان بوون). لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (بانگیان کردن و پێغەمبەر ﷺ بەیەکێ لە دوو کوڕەکەی صوریای فەرموو: ((أُذكِّركمْ بالله الذي نجاكم من آلِ فرعونَ ، وأقطعَكم البحرَ ، وظلَّل عليكم الغمامَ ، وأنزل عليكم المَنَّ والسَّلوى ، وأنزل عليكم التوراةَ على موسى ، أتجِدونَ في كتابِكم الرَّجمَ؟)) واتە: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە ڕزگاری کردن لە بنەماڵەی فیرعەون و دەریاکەی بۆ لەت کردن و هەوری کرد بە سێبەر بەسەرتانەوە و گەزۆ و شەلاقەی بەسەردا باراندن و تەوراتی دابەزاند بۆ موسا ؑ، ئایا لە کتێبەکەتاندا ڕەجمی تیادەبیننەوە (چونکە زمانی سریانی کە تەوراتی پی نوسرابوو کەم کەس دەیزانی بۆیە پرسیاری لە خۆیان کرد) ئەوانیش وتیان: سوێندت داین بە شتێکی زۆر گەورە کە ناتوانین درۆت لەگەڵدا بکەین)[٦١١]، بەڵێ ڕاست دەکەیت ئێمە لە تەوراتەکەماندا دەبینین ئەگەر چوار کەس شاهیدی بدەن کە پیاوێك عەورەتی لە عەورەتی ئافرەتێکدا بێت (کە حەڵاڵی نەبێت) بە وێنەی میل لە کلداندا ئەوا ڕەجم دەکرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فما يمنَعُكما أنْ ترجُمُوهما؟)) واتە: ئەی چی ڕێی لێگرتوون کە ئەو دوانە ڕەجم بکەن؟ وتیان: ئێمە شکۆداری و سەروەری وڵاتی خۆمانمان لە دەست داوە و پێمان ناخۆش بوو یەکتری بکوژین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چوار شاهیدەکە بێنن کە شاهیدن بەسەر ئەم دوانەوە، ئەوانیش هەر چواریان هێنا و شاهیدییاندا

(٦١٠) أخرجه: أبو داود (السنن) (٤٤٤٩)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٧٣٩) و في(الإرواء) (٩٤/٥) (٩٠٥).

(٦١١) أخرجه: أبو داود (السنن) (٤٤٥٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٧٤٠).

کە عەورەتی پیاوەکەیان بینیوە لە عەورەتی ئافرەتەکەدا کاتێ کە زینایان لەگەڵ یەکتریدا کردووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بە ڕەجم کردنی هەردووکیان[٦١٢].

جولەکەکان زۆر دڵنیا بوون لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر ﷺ بەتایبەت عەبدوللا کوڕی صوریا کە یەکەم زانایانە وەکو خۆی لەم بەسەرهاتەدا دەڵێ: (وەڵاهی ئەی ئەبو قاسم ئەو جولەکانە خۆیان دڵنیان و دەزانن کە تۆ پێغەمبەریت و نێرراوی خوایت بەڵام حەسودیت پێ دەبەن (واتە: تۆ لە بەنی ئیسرائیل نیت و لە عەرەبیت))[٦١٣].

جولەکەکان لە هەندێ ئاشوبەی خۆیاندا دیسان پەنایان دەبردە بەر پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی سوڵحیان بکات، چونکە دەیانزانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ و بە حوکمی خوا کاردەکات، بەڵام هەر باوەڕیان پێ نەدەهێنا:

ئیبن عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەو ئایەتانەی کە لە سورەتی مائیدەدا هەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿....فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٤٢﴾(المائدة).

سەبارەت بە پارەی خوێنی کوڕانی بەنی نەضیر دابەزی کە بەهێز و سەروەر بوون و کەسانێکیان بکوشتایە لە بەنی قوڕەیضە ئەوا نیوەی خوێنەکەیان دەدا چونکە ئەوانی بەنی قوڕەیضە کەسانێکی لاواز و بێ دەسەڵات بوون و ئەگەر کەسانێکیان بکوشتایە لە بەنی نەضیر ئەوا دەبوو هەموو خوێنەکەیان بدایە.

سەبارەت بەم باسە هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند و ڕوونی کردەوە کە هەموو کەس پارەی خوێنی وەك یەك وایە دەوڵەمەند بێت یان هەژار، بەهێز بێت یان لاواز پلەبەرز بێت یان پلە نزم)[٦١٤].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (بەنی قوڕەیضە و بەنی نەضیر (دوو تیرەی جولەکە بوون و هەندێکیان چوارسەد تا حەوت سەد چەکداریان هەبوو) ئەو

---

(٦١٢) أخرجه: أبو داود (٤٤٥٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٧٤٠).

(٦١٣) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١٦٠/٢) (٤٤٧)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٦٩/٦).

(٦١٤) أخرجه: أحمد في (المسند) (١/ ٣٦٣)، وأبو داود (السنن) (٣٥٩١)، والنسائي (السنن) (١٩/٨)، والطبري في (التفسير) (١١٩٧٩)، والطبراني في (الكبير) (١١٥٧٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٠٦٣) وفي (صحيح النسائي) (٤٤١١) والفظ له.

دوولایەنە لە چواردەوری مەدینەدا بوون بەنی نەضیر پلەی بەهێزتر بوون لە کوڕانی بەنو قوڕەیضە، ئەگەر پیاوێکیان بکوشتایە لە بەنو قوڕەیضە ئەوا نیوەی خوێنەکەیان دەدا کە سەد ویسق خورما بوو، بەڵام ئەگەر قوڕەیضیەیەك یەکێکی بەنی نەضیری بکوشتایە دەبوو بکوژرایەتەوە، لە دوای ئەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ نارد، پیاوێك لە بەنو نەضیر پیاوێکی لە بەنو قورەیضە کوشت و ئەوانیش وتیان: بیدەنە دەستمان تاکو بیکوژینەوە؟ هەردوولا وتیان: با محمد لە نێوانماندا بێت بۆ ئەوەی حوکممان بکات، ئینجا هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ وخوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿......وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾﴾(المائدة). واتە: (خۆ ئەگەر داوەریشت کرد لەنێوانیاندا، دەبێ بەدادگەرانە بێت بەڕاستی خوا خەڵکانی دادپەروەر و، دادگەری خۆش دەوێ). مرۆڤ بە مرۆڤ و وەکو یەك دەبێت بکوژرێتەوە و پاشان ئەم ئایەتەی تری دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ (المائدة)[(٦١٥)]. واتە: ئایا ئەوانە یاسا و نەریتی نەفامی هەڵدەبژێرن و پشت لە یاساکانی خوا دەکەن، ئایا یاسای چاکتر هەیە لە یاساکەی خوا بۆ کەسانێکی بڕوادار.

هەروەها جولەکەکان دەکەوتنە پڕوپاگەندە و درۆ دروستکردن لەناو موسوڵمانان‌دا و فەرمانیان پێ دەکردن کە پارە سەرف نەکەن لە ڕێگەی خوادا و ئاگایان لە خەرجی خۆیان بێت، چونکە ئەوان ئەگەر وا بکەن ئەوا سەرجەم خەڵکی ئەو شارە هەژار دەکەون و شیرازەیان دەپچڕێت، جولەکەکان دوای ئەو کارانەیان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و قسەی مانادارییان دەکرد وە لەناو خۆیاندا جوێنیان بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ئاینی خوا دەدا، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ئاگایانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن و ئاگاداری ڕەفتاریان بوو، لەو ڕەفتارە دزێو و ناشیرینانەی کە دەیان کرد بەرامبەر بە خودی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانانی ناو شاری مەدینە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (جولەکەیەك سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی کرد وتی: (السّام عليكم) واتە: تێر لێتاندا یان مردنتان لەسەر و بە مردن بچن، ئەمە لە جیاتی (السَّلامُ عَلَيكُم)، پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (و عَلَيك)

---

(٦١٥) أخرجه: أبو داود (٤٤٩٤)، والنسائي (١٨/٨)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٧٧٢) وفي (صحيح النسائي) (٤٤١٠).

واتە: لەسەر تۆ. دوای ئەوە بە هاوەڵانی فەرموو: دەزانن وتی چی؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە سەلامی كرد لێمان! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر ئەوە وتی: ((السَّامُ عليكم، فإذا سلَّم عليكم رجُلٌ مِن أهلِ الكتابِ فقولوا: وعليك))[٦١٦]. واتە: (مردنتان لەسەر و دوور بن لە ئاینی خوا، گەر یەكێك لە پیاوانی ئەهلی كیتاب سەلامی لێ كردن ئێوە لە وەڵامدا بڵێن (وعليك)).

ئیبنو عومەر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی ئاگادار كردەوە و پێی فەرموون: ((إنَّ اليَهُودَ إذا سَلَّمُوا علَيْكُم يقولُ أحَدُهُمُ السَّامُ علَيْكُم فَقُلْ عَلَيْكَ))[٦١٧] واتە: ئەگەر جولەكەكان سەلامیان لێ كردن یەكێك لەوان دەڵێت (السام عليك) لەبەر ئەوە ئێوەش بڵێن: (وعليك).....).

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەفەرموێت: (جولەكەكان دەهاتن و بەزۆر پژمەیان لە خۆیان دەهێنا لە مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئەوەی پێیان بڵێت (يَرحَمُكَ الله) بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی دەوتن: ((يهدِيكم اللهُ و يُصلحُ بالَكم)) واتە: خوا هیدایەتتان بدات و بیر و هۆشتان باش بكات)[٦١٨]، چونكە ئەو جوولەكانە باش دەیانزانی كە پێغەمبەر ﷺ دوعای قبوڵە و ئەگەر بیوتایە (يرحمك الله) ئەوا خوا ڕەحمی پێ دەكردن (والله اعلم).

**چوارەم:** پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ئاگایانە مامەڵەی لەگەڵ دەكردن سەبارەت بە زمانی خۆیان لە ڕێگەی ئەو نامانەی كە ئاراستەی دەكرا لەوانەوە، بۆیە یەكێك لە پیاوانی موسوڵمانی باوەڕ پێ كراوی بانگ كرد و داوای لێ كرد كە فێری زمانەكەیان ببێت بۆ ئەوەی ئەگەر نامەی ئەوان هات موسوڵمانێكی باوەڕپێكراو بیخوێنێتەوە و ماناكەی بكات بە عەرەبی و وەڵامیان بە زمانی خۆیان بداتەوە و بۆیان بنوسێت، سەبارەت بەم مەسەلەیە زەیدی كوڕی ثابت ﷺ زانای پایەبەرزی شاری مەدینە كە ئەبوبەكر هەڵی بژارد بۆ نوسینەوەی قورئان، زەید خۆی ئەم بەسەرهاتەمان

(٦١٦) أخرجه: ابن أبي شيبة (٦٣٠/١)، وأحمد في (المسند) (٩٩/٣)، والبخاري (الصحيح) (٦٩٢٩)، ومسلم (الصحيح) (٢١٦٣)، وأبو داود (٥٢٠٧)، وابن ماجه(٣٦٩٧)، وابن حبان (٥٠٣) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما واللفظ له.

(٦١٧) أخرجه: ابن أبي شيبة (٦٣٠/٨)، والبخاري (الصحيح) (٦٩٢٨)، ومسلم (الصحيح) (٢١٦٤)، وأبو داود (السنن) (٥٢٠٦).

(٦١٨) أخرجه: أبو داود (السنن) (٥٠٣٨)، والترمذي (السنن) (٢٧٣٩)، وقال النووي في (الأذكار) (ص:٢٤٣): إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٤٢١٣) وفي (صحيح الترمذي) (٢٢٠١) وفي (مشكاة المصابيح) (٤٧٤٠).

بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم کە لە نوسینی جولەکەکان شارەزا ببم و فەرمووی: ((إِنِّي واللَّهِ ما آمَنُ يَهودَ علَى كتابِي ، فَهَل تَستَطِيعُ أَنْ تَتَعَلَمَ كِتاب السَّريانية)) واتە: من وەڵاهی هیچ متمانە ناکەم بە جولەکەکان سەبارەت بە خوێندنەوەی نوسراوەکانی من بۆ ئەوان، ئایا دەتوانیت فێری نوسینی سریانیببیت؟ (سریانی نزیکە لە عیبرییەوە و عیبری تایبەتە بە جولەکەوە و لە سریانیشدا بالآدەستن وەکو چۆن گاورەکان شارەزای زمانی سریانین). زەید ﷺ دەفەرموێت: وەڵاهی نیو مانگم بەسەردا نەچوو تا بەتەواوی شارەزا بووم لە زمانی جولەکەکاندا و فێری بووم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەر نامەیەکی ئاراستەی جولەکەکان بکردایە من بۆم دەنووسی بەزمانی خۆیان و هەر نامەیەکیش بهاتایە لە لای ئەوانەوە من بۆم دەخوێندەوە[٦١٩].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی ئاگادار دەکردەوە لەوەی کە زۆر بە وریایی و بە ئاگابوونەوە مامەڵە لەگەڵ خزمانی جولەکەی خۆیاندا بکەن لە ناو شاری مەدینەدا، چونکە ژن و ژنخوازی هەبوو لە نێوانیاندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری دەکردنەوە تا لایەنگیری و خۆشەویستی و هاتوچۆکردن دروست نەبێت لە نێوان موسوڵمانان و جولەکەکانی خزمانیاندا.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پیاوانێك لە موسوڵمانان سەردانی خزمە جولەکەکانی خۆیان دەکرد بەهۆی ئەو هاوپەیمانێتی و خزمایەتییەی کە هەبوو لە نێوانیاندا و خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە قەدەغەی نزیك بوونەوە ومتمانە پێکردن ولایەنگیری ئەوانی ڕاگەیاند و فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾(آل عمران)[٦٢٠]. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! جگە لە خۆتان، کەسێك مەکەن دۆست و جێی ڕازو نیازی خۆتان و نهێنیەکانی

(٦١٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٨٦/٥)، و أبو داود (السنن) (٣٦٤٥)،والترمذي (السنن) (٢٧١٥)، والطبراني في (الكبير) (٤٨٥٦)، وابن حبان (٧١٣٦) وقال الأرناؤوط: إسناده صحيح، والحاكم في (المستدرك) (٧٥/١) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٣٠٩٨) وفي (صحيح الترمذي) (٢١٨٣) وفي (المشكاة) (٤٦٥٩)، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٣٥٧).

(٦٢٠) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (١٥٤/٢)، والطبري في (التفسير) (٧٦٨٠).

خۆتانیان لا بدرکێنن، چونکە ئەوان لەکار تێکدان و زیان پێگەیاندنتان، درێغ ناکەن و کۆڵنادەن، پێیان خۆشە و ئاواتیانە ئێوە هەر لەدەرد و ئازاردا بن، جگە لەوەش کە بەئاشکرا دژایەتیتان دەکەن، ئەو رق و قینەیەش لەدڵیاندا دەیشارنەوە زۆرترو گەورەترە لەوەی کەبە زمانیان دەیڵێن ، ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان بۆ رۆشنکردەوە، ئەگەر ئێوە بەهۆش وبیربن و دەرك بە راستییەکان بکەن.

## هەڵوێستی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو شاری مەدینە لەو ڕۆژەدا سەرکردەی و ناوداری مەدینە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو خزم و کەسەکانی خۆی ناکۆکییان بە هیچ جۆرێك لەناودا نەبوو سەبارەت بە گەورەیی و سەروەری ئەو پیاوە، هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج پێشتر کۆ نەبوون وەك چۆن کۆبوون لەسەر دیاری کردنی عەبدوڵلای کوڕی سەلول بە پاشای مەدینە، ئەوە بوو خزمانی هەستان بە ئامادەکردنی تاج بۆی تا بیکەن بە پاشای مەدینە، بەڵام لەو کاتەدا خوای گەورە پێغەمبەری نارد ﷺ ئەوە بوو خەڵکی و خزمانی هەر هەموو ئەوەی لە چواردەوری بوون بڵاوەیان لێ کرد و دوور کەوتنەوە و چوونە چواردەوری ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ، ئا لەو ڕۆژەوە عەبدوڵلا ڕق و کینەی گەورە نواند بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ وای دەزانی کە پێغەمبەر ﷺ پاشایەتییەکەی لێ زەوت کردووە، بەو شێوەیەش مایەوە وەکو ناودارێك وە دوو دڵ و بەگومان بوو بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ!![٦٢١] عەبدوڵلا هەر بەوەوە نەوەستا بەڵکو هەوڵی دەدا کە ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات بە قسە و ناو و ناتۆرە بەرەو ڕوو یاخود لە پاشملەوە).

لە هەڵوێستە ناپەسەندەکانی عەبدوڵلا سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ تەنها دوو هەڵوێستی دەخەینە بەرچاو ئیتر بەسە بۆ ناسینی خراپی ئەو کابرایە و تێنەگەیشتنی لەئیسلام و ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا ﷺ:

**یەکەم:** ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو کورتانێکی بەسەر پشتەوە بوو لە ژێر کورتانەکەدا سەرجلێکی فەدەکی کە پێوە بوو (جۆرە قوماشێکی ناوچەی فەدەکە)، ئوسامەی سوار کرد لە دوای خۆیەوە و

(٦٢١) أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢/١٧٦) (٤٦٤)، وأبو نعيم في (الدلائل) (٤١).

چوون بۆ ئەوەی سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە بکەن کە لە کوڕانی بەنی حارثی خەزرەجی بوو، ئەمە پێش بەسەرهاتی جەنگی بەدر، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای کۆڕوکۆمەڵێکدا، کە کەسانێکی موسوڵمان و بێ باوەڕ و بت پەرست و جولەکەی تێدا بوو، وە لە ناویاندا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، هەر لەو کۆڕەدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی تیا بوو کاتێ پێغەمبەر ﷺ بەو گوێدرێژە نزیك بووەوە لەو کۆڕە تەپ و تۆزی پێی گوێدرێژەکە بەڕووی دانیشتوەکاندا بڵاوبۆوە و عەبدوڵڵا بە عەباکەی لووتی خۆی گرت و وتی: ئەو تەپ و تۆزە مەکەن بەسەرماندا، پێغەمبەر ﷺ سەلامی لێ کردن و پاشان وەستا و دابەزی و لەوێ بانگەوازی کردن بۆلای خوا، قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، عەبدوڵڵا وتی: ئەی ئەو پیاوە هیچ شتێك چاکتر نییە لەم قسانەی تۆ دەیڵێیت، ئەگەر ڕاست بێت ئازارمانی پێ مەدە و مەیەرە ناو دانیشتنەکانمانەوە و بڕۆرەوە ماڵی خۆت و هەر کەسێك لە ئێمە هات بۆلات چی بۆ دەگێڕیتەوە بۆی بگێڕەرەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ زۆرمان پێخۆشە ئەو باسانەمان بۆ بکەیت و بێیتە ناومان.

ئوسامە ﷺ دەفەرموێت: لەو دانیشتنەدا موسوڵمان و هاوبەش پەیداکاران و جولەکەکان بوو بە شەڕە قسەیان هەتا نزیك بوو شەڕ ڕووبدات لە ناویاندا تا پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگی کردن، ئینجا سواری گوێدرێژەکەی بوو وە چوو بۆلای سەعدی کوڕی عوبادە و چووە ژوورەوە و پێی فەرموو: ئەی سەعد ئایا گوێت لێ نەبوو ئەبو حەباب ئەی وت چی؟ وای دەوت و وای دەوت!! سەعد وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ لێی ببورە و گوێی مەدەرێ وەڵاهی خوای گەورە کاتێ ئەم بەخشیشەی بەتۆ بەخشی لە کاتێکدا بوو کە خەڵکی ئەم دۆڵە (واتا: مەدینە) هەر هەموو کۆبوون لەسەر ئەوەی کە تاجی بۆ دروست بکەن و بیکەن بە پاشای مەدینە، بەڵام کاتێ خوای گەورە ئەو پاشایەتیەی لێ سەندەوە بەو حەقەی کە بەخشیویەتی بەتۆ، ئەو بە یەکجاری ڕقی هەستاوە وا دەزانێت کە تۆ موڵکەکەت لێ زەوت کردووە و ئەوە وای لێکردووە کە ئاوا بێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەخشیی و لێی بوورا)[٦٢٢].

(٦٢٢) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢٠٣/٥)، والبخاري (٥٦٦٣،٦٢٠٧)، ومسلم (الصحيح) (٤٦٣٥)، وعبدالرزاق في (المصنف) (٩٧٨٤).

**دووەم:** ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرمووێت: (بە پێغەمبەر ﷺ وترا: بۆ ناچی بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوت بۆلای عەبدوڵڵا و سواری گوێدرێژێك بوو وە موسوڵمانانیش لە خزمەتیدا بوون بە خاکێکی قوڕاوی سوێردا دەڕۆیشتن کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە لای عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا وتی: بڕۆ دوور کەوەرەوە لێم وەڵاهی بۆگەنی گوێدرێژەکەت ئازاری دام، پیاوێکی ئەنصاری کە لەوێ دانیشتبوو بە عەبدوڵڵای وت: وەڵاهی بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر ﷺ لە بۆنی تۆ خۆشترە، لەوێدا یەکێ لە خزمانی عەبدوڵڵا لەسەری هەڵی دایە و هەردووکیان کردیان بە شەڕە قسە و هەریەك لەم دووانە هاوەڵانێکی لە دەور کۆبوونەوە و هەستان و بوو بە شەڕە پێڵاو و شەڕە نەعل و شەڕە بۆکس، وە وامان پێگەیشتووە کە خوای گەورە سەبارەت بەو شەڕە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ۝٩ ﴾(الحجرات)[٦٢٣]. واتە: ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بە جەنگ هاتن ، جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوە جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەی تر، ملی ڕانەکێشا بۆ ئاشتیی و یەککەوتن ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن کە دەستدرێژی دەکات، تا ناچار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا. ئینجا ئەگەر کۆمەڵە ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی خوا، جا ئێوەیش بەئینصاف ناوبژییان بکەن ، وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

وە هەڵوێستەکانی تری عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی وپیلانەکانی کە دای ڕشتووە دژ بە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ و خیانەتکاریەکانی لێرە بە دواوەو لە غەزاکاندا بە ڕوونی دەوری خۆی و برا دووڕووەکانی بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

---

(٦٢٣) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٢٦٩١)، ومسلم (الصحيح) (٤٦٣٧).

## هەڵوێستی قورەیش

یەکەم هەنگاوێك کە قورەیش پێی هەستا دژ بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو هەستا بە ئاژاوە نانەوە لەناو شاری مەدینەدا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەتوانێت لەوێ جێگیر ببێت، ئەوە بوو نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی ئاڕاستەی سەرکردەی مەدینەی کۆن عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کرد و هەڕەشەی توندیان لێ کرد و پێیان وتن: گەر محمد و کۆچکاران بگرنە خۆ ئەوا چاوەڕێی هەڕەشە و تۆڵە سەندنەوەی قورەیش بن، وەك عەبدل رەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (کافرەکانی قورەیش نامەیەکیان نووسی و ئاڕاستەی عەبدوڵڵایان کرد بۆ خۆی و ئەو کەسانەی کە بت پەرستن بوون لەگەڵیدا لە هەر دوو لایەنی ئەوس و خەزرەجی نیشتەجێی مەدینە، لە ڕۆژێکدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردبوو بۆ شاری مەدینە پێش جەنگی بەدر وە لە نامەکەدا بەم شێوەیە هەڕەشەکەیان نووسیبوو: (ئێوە ئەو هاوەڵەی ئێمەتان گرتۆتەخۆ و سوێند دەخۆین بەخوا یان ئەوەتا دەجەنگێن لەگەڵیدا و دەری دەکەن لەناوتاندا یان ئەوەتا ئێمە هەر هەمووومان هەڵدەکوتینە سەرتان و شەڕ کەرەکانتان دەکوژین و ئافرەتەکانتان بۆ خۆمان حەڵاڵ دەکەین).

کاتێ ئەم نامەیە گەیشت بە عەبدوڵڵا، خۆی و ئەوانەی کە بت پەرست بوون و مابوونەوە لەگەڵیدا کۆبوونەوەیەکیان کرد دژ بە پێغەمبەر ﷺ کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەمەی پێ گەیشت هات بۆلایان و فەرمووی: ((لقد بلَغَ وَعيدُ قُرَيشٍ منكم المبالغَ، ما كانَتْ تَكيدُكم بأكثَرَ ممَّا تُريدونَ أنْ تَكيدوا به أنفُسَكم، تُريدونَ أنْ تُقاتلوا أبناءَكم وإخوانَكم؟!)). واتە: هەڕەشەی قورەیش بە جارێ کاریگەر بووە لەئێوەدا و نەیتوانیوە ئەوەتان لێ بکات کە ئێوە بە دەستی خۆتان لە خۆتانی دەکەن، دەتانەوێ بجەنگن لەگەڵ کوڕان و برایانی خۆتان و بیان کوژن؟! کە ئەمەی فەرموو ئەوان بڵاوەیان لێ کرد و دەست بەرداری ئەو کارە بوون و ئەو هەواڵەش گەیشتەوە بە قورەیش)[٦٢٤].

سەبارەت بە هەڵوێستی دووەمیان ئەوە بوو کە بەوەوە نەوەستان بەڵکو هەستان

---

(٦٢٤) أخرجه: أبو داود (٣٠٠٤)، وقال الحافظ ابن حجر في (الفتح) (٣٣١/٧): رواه ابن مردوية بإسناد صحيح، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (صحيح سنن أبي داود) (٢٥٩٥).

بە فەدەغە کردن و ڕێگرتن لەو حاجیانەی ناو شاری مەدینە کە بەنیازی حەج و عەمرە سەردانی ماڵی خوا بکەن، لەو ڕووداوانە ڕووداوی ڕێگرتنی ئەبو جەهلە لە پیاوی بەرزی خەزرەج سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ، وەك ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (سەعدی کوڕی موعاذ هاوڕێی ئومەیەی کوڕی خەڵەف بوو وە ئومەیە هەر کاتێ بۆ بازرگانی ڕێی بکەوتایەتە شام لایدەدایە شاری مەدینە و دەچووە ماڵی سەعد، و سەعدیش هەر کات بگەیشتایەتە مەککە دەچووە ماڵی ئومەیە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆمەدینە و نیشتەجێ بوو تیایدا.

سەعد بەڕێکەوت بۆ شاری مەککە بە نیازی سەردان و عەمرە کردن، لەوێ دابەزی و چووە ماڵی ئومەیە و وتی: تەماشا بکە هەر کات تۆزێ چوار دەوری کەعبە چۆڵبوو ئاگادارم بکەرەوە تا تەواف بکەم، ئومەیەش بە سەعدی وت: چاوەڕێ بکە تا نزیکی نیوەڕۆ ئینجا خەڵکی هەر یەکە بڵاوەی لێ دەکەن و دەڕۆن بەلای ئیش و کاری خۆیانەوە ئەو کاتە تەواف بکە، ئەوە بوو چوون بۆ تەواف کردن بە چوار دەوری کەعبەدا و کاتێ تەوافیان دەکرد ئەبو جەهل پێیان گەیشت و بە ئومەیەی وت: ئەی باوکی سەفوان ئەمە کێیە لەگەڵت تەواف دەکات؟ ئومەیەش وتی: ئەوە سەعدە، سەعدیش وتی: منم سەعد! ئەبو جەهل وتی: ئایا دەتەوێت بە ئارامی بە دەوری کەعبەدا بسوڕێیتەوە کاتێ کە هاوەڵانی محمدتان گرتۆتەخۆ؟ وە گوایە وتوتانە ئێوە سەری دەخەن و یارمەتی دەدەن؟ بەڵام وەڵاهی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت لەگەڵ باوکی سەفوانیت نەم دەهێشت بە سەلامەتی بگەڕێیتەوە بۆلای خزمانی خۆت!! سەعد بە هەڕەشەوە دەنگی بەرز کردەوە و وتی: وەڵاهی ئەگەر ڕێگرم بیت لەم تەوافە ئەوا دەبم بە ڕێگر لێت لەو شتەی کە خراپتر و کاریگەر ترە ئەویش بازرگانییەکەتانە بۆ شام! ئومەیە زووزوو بە سەعدی دەوت: دەنگ بەرز مەکەرەوە بەسەر ئەبو حەکەمدا ئەوە گەورە و سەرۆکی ئەم دۆڵەیە، تا سەعد بێزار بوو لە ئومەیە و پێی وت: واز بهێنە وەڵاهی گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوان تۆ دەکوژن! وتی: من؟ سەعد وتی: بەڵێ، ئومەیە وتی: لە مەککەدا؟ سەعد وتی: نازانم، ئومەیە ترسێکی زۆری لێ نیشت و وتی: وەڵاهی محمد هەرگیز درۆ ناکات، ئەگەر ئەو قسەیەی کرد بێت، ئینجا گەڕایەوە بۆلای خێزانی و پێی وت: دایکی صەفوان نازانی برا مەدینەییەکە چی پێ وتم؟ خێزانیشی وتی:

چی پێ وتیت؟ ئومەیە وتی: گوایە محمد پێی ڕاگەیاندووە کە من دەکوژن، وەڵاهی محمدیش هەرگیز درۆی نەکردووە، دایکی صەفوان وتی: لە مەککە؟ ئومەیە وتی: وەڵاهی نازانم و لێم پرسی لە مەککە وتی: نازانم، ئومەیەش وتی: کەواتە: لە شاری مەککە دەرناچم)[٦٢٥].

لەبەر ئەمە موسوڵمانانی شاری مەدینە سەبارەت بە هەڕەشە گەورەکانی قوڕەیش و دوژمنی سەرسەختی سیانزە ساڵەی لەمەو پێشیان، ئەوە بوو کە هەموو موسوڵمانانی بەڕێزی شاری مەدینە پشتیوانان و کۆچکاران پێکەوە شەو و ڕۆژیان دەکردەوە بە چەکەوە و هەمیشە چەکیان پێبوو بۆ هەموو جێگەیەك هەتا شەویش بە چەکەکانیانەوە دەخەوتن.

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵانی گەیشتنە شاری مەدینە و کاتێ ئەنصاریەکان ئەوانیان گرتە خۆ هەموو عەرەب دژ بە خەڵکی ناو شاری مەدینە وەستان و موسوڵمانانیش شەو بە چەکەکانیانەوە نەبێ نەدەخەوتن و بەڕۆژیش بە چەکەکانیانەوە نەبێت نەدەسوڕانەوە ئەوان لەبەر خۆیانەوە دەیان وت: تۆ بڵێی ڕۆژێك بێت بە چاوی خۆمان ببینین کە ئێمە ئارامین و لە خۆمان ناترسین؟ تۆ بڵێی ڕۆژێکی وا بێتەپێش؟ ئەمە لەو کاتەدا بوو کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾ (النور)[٦٢٦] واتە: (بێگومان خوا بەو کەسانەتان کە بڕوایان هێناوەو کارە چاك و جوانەکانیان ئەنجامداوە، بەڵێنیدا: لەم زەمینەدا بیانکا بە جێنشین ، ئەو دین و ئایینەش خوا خۆی بۆی پەسەند کردوون، ڕیشە دار و سەقامگیر و دەکا بۆیان وە ترس و بیمەکەشیان بۆ دەگۆڕێ بە ئارامیی و ئاسوودەیی ئیتر ئەوکاتە تەنها من بپەرستن و هیچ شتێکش نەکەنە هاوبەشم ئەوسا هەر کەسێکیش - پاش ئەوە- کافر بوو، واتە: پاش هاتنە دی بەڵێنەکە ئا ئەوانەن فاسیق و دەرچوو لە سنووری شەرع).

---

(٦٢٥) أخرجه: أحمد (٤٠٠/١)، والبخاري (٣٦٣٢،٣٩٥٠)، والطبراني في (الكبير) (١٤/٦)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٥/٣).

(٦٢٦) أخرجه: الطبراني في (الأوسط) (٢١١٧)، والحاكم في (المستدرك) (٤٠١/٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٨٣/٧): ورواه الطبراني في (معجم الاوسط) رجاله ثقات.

وە پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەو هەڕەشانەی قوڕەیش و جولەکەکانی ناو شاری مەدینە و بت پەرستەکانی ناو شاری مەدینە هەموو شەوێك پاسەوانی دەکرا نەوەك دوژمنان زەفەری پێ ببەن.

عائیشە ﵂ سەبارەت بە یەکێك لەو شەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ درەنگ خەوتووە و چۆن سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص پاسەوانی پێغەمبەری ﷺ کردووە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ یەکەم جار هاتە ناو شاری مەدینە شەوان درەنگ دەخەوت و شەوێکیان خەوی لێ نەکەوت و فەرمووی: ((لَيْتَ رَجُلًا صَالِحًا مِن أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ)) واتە: خۆزگە پیاو چاکێك لە هاوەڵانی خۆم ئەم شەو پاسەوانی دەکردم. لەم قسانەدا بووین گوێمان لە خشەخشی شمشێر دەرهێنان بوو لە کێلان، یەکسەر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە کێیە؟ سەعد وتی: منم سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی وای لێ کردیت ئێستا بێیت؟ سەعد وتی:خەیاڵ کەوتە دڵمەوە و ترسام پێغەمبەر ﷺ شتێکی لێبکرێت بۆیە هاتم کە پاسەوانیت بکەم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد و خەوت)[٦٢٧] وە (ئەم پاسەوانی کردنەی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو تا ماوەیەکی زۆر بەڵکو تا دوای جەنگی حونەین).

تا دواجار خوای گەورە خۆی ئەرکی پاراستنی پێغەمبەری ﷺ گرتەخۆ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پاسەوانەکانی خۆی بلاوەپێکرد[٦٢٨]. خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێشتر پاسەوانی پێغەمبەریان دەکرد هەتا خوای گەروە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾(المائدة). واتە: (ئەی پەیامبەر! هەر فەرمان وبریارێك لەلایەن پەوەردگارتەوە بۆت هاتووە، بێ دوودڵی و ترس لەهیچ کەسێ رایگەیەنە ، خۆ ئەگەر وات نەکرد، چاك بزانە کە بەتەواوی پەیامەکەی خوات نەگەیاندووە، دڵنیاشبە خوا لەئازارو پیلانی ئەو خەڵکە دەتپارێزێ، هەر کە بیانەوێ دووچاری بەڵایەکت بکەن، بێگومان خوای گەورە هیدایەت و ڕێنوێنی هۆزو گەلی بێ

(٦٢٧) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٤١/٦) وفي (الفضائل) (١٣٠٥) وقال محققه: إسناده صحيح، وابن أبي شيبة (٨٨/١٢)، والبخاري (٧٢٣١،٢٨٨٥)، ومسلم (٤٤١٠)، والترمذي (٣٧٥٦)، والنسائي في (الكبرى) (٨٨٦٧،٨٢٠٧)، والحاكم في (المستدرك) (٥٠١/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن أبي عاصم في (السنة) (١٤١١)، وابن حبان (٦٩٨٦)، واللفظ للنسائي والترمذي.

(٦٢٨) أنظر: (فتح الباري) (٣٧٢/١٣).

باوەڕان ناکات،). ئەو کات پێغەمبەر ﷺ سەری لە قوبەو دەوارەکەی خۆیەوە هێنایە دەرو بە هاوەڵانی فەرموو: (( یا أیها الناسُ انصرِفوا، فقد عصمني اللهُ))[629] واتە: ئەی خەڵکینە بڵاوەبکەن لە چوار دەوری من، خوای گەورە منی پاراستووە).

ئابەو جۆرە موسوڵمانان چاویان لێ سووردەکرایەوە وە دوژمنایەتیان دەکرا لە لایەن دوژمنە کۆنە دێرینەکەی خۆیانەوە کە قورەیش بوو، هەروەها لە لایەن جولەکەو هاوبەش پەیداکەرانەوە لەبەر ئەو هەموو دوژمنایەتییە خوای گەورە ڕێگەی بەموسوڵمانانیدا کە بەرگری لە خۆیان بکەن و بجەنگێن دژ بەو کەسانەی کە لە گەڵیاندا دەجەنگێن، بەڵام هێشتا لەسەریان فەرز نەکرابوو.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: ((کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەرکرا لە شاری مەککە و ناچاربوو کۆچ بکات بۆ شاری مەدینە، لەو کاتەدا ئەبو بەکر ﷺ وتی: پێغەمبەرەکەی خۆیان دەرکرد [(إنَّا للَّهِ وإنا إليهِ راجعونَ)] ئەوان بەهۆی ئەمەوە لەناو دەچن، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾(الحج). واتە: ڕێگەدراوە بەوانەی ستەمیان لێ کراوە کە بەرگری لە خۆیان بکەن و خوای گەورەش سەریان دەخات ئەبوبەکر ﷺ وتی: من پێشتر دەمزانی کە شەڕ دەبێت). ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: ئەمەش یەکەم ئایەت بوو سەبارەت بە شەڕکردن لەگەڵ دوژمنانی خوادا دابەزی)[630].

---

(٦٢٩) أخرجه: النسائي (السنن) (٣٤/٨)، والترمذي (السنن) (٣٠٤٦)، والحاكم (المستدرك) (٣١٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الحافظ في: (الفتح) (٦٠/٦)، وحسنه ايضا الشيخ الألباني في: (صحيح الترمذي) (٢٤٤٠)، (والسلسلة الصحيحة) (٢٤٨٩).

(٦٣٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٢١٦/١)، والترمذي (السنن) (٣١٧١)، والنسائي (السنن) (٢/٦)، والطبراني (الكبير) (١٢٣٣٦)، والحاكم (٦٦/٢) وصححه على شرطها ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١٠/٩)، وابن حبان (٤٧١٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط المسلم، و صحح إسناده الأرناؤوط في: (جامع الأصول) (٢٤٣/٢)، وصححه ايضا الشيخ الألباني في: صحيح الترمذي (٢٥٣٥)، و صحيح النسائي (٢٨٩٠).

# سریە وغەزاکانی پێغەمبەر ﷺ

دوای ئەو جێگیربوونەی کە خوای گەورە ڕەخساندی بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە مەدینەو دروست کردنی مزگەوت و بەدیهێنانی برایەتی و تەبایی لەناو ڕیزی موسوڵمانانداو جێگیربوونی دەسەڵاتی سیاسی و دەرکردنی دەستور و یاسای بەڕێوەبردنی شاری مەدینە و پەیڕەوکردنی ئاینی ئیسلام بەئاشکرا، دوژمنانی ئیسلام بەتایبەتی قوڕەیش و جولەکەکان چاویان هەڵنەدەهات بەئازادی و سەربەخۆیی موسوڵمانان.

قوڕەیشیەکان دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیان ناچار بە کۆچ کردن کرد لەشاری مەککە، هەر بەوەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتنە ئاژاوە نانەوە لە شاری مەدینەدا، ڕێگرتن لە دانیشتوانەکەی کە بە مەبەستی حەج و عەمرە سەردانی ماڵی خوا بکەن لە مەککە، و سەرکردەکانی شاری مەککە کەوتنە ئاشکراکردنی ویستی شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵماناندا. ئەم بارودۆخە وای پێویست کرد موسوڵمانان وریا و بەئاگابن لە هەڵسوکەوت و جم وجووڵەکانی قوڕەیش و دوژمنەکانیان، و هەوڵی زیاتر بخەنەگەڕ بۆ پاراستنی ئیسلام و موسوڵمانان. پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە ناردنی سریەکان و خۆیشی سەرکردایەتی غەزاکانی دەکرد[٦٣١].

سەرجەم غەزا و سریەکانی پێش شەڕی بەدر، بەرەو ڕۆژئاوای شاری مەدینە دەکەوتنە ڕێ بەمەبەستی هەڕەشە خستنە سەر ڕێگای بازرگانی قوڕەیش بۆ شام، وە بە مەبەستی مۆرکردنی چەندین هاوپەیمانی و ڕێکەوتننامە لەگەڵ ئەو هۆزانەی کە نیشتەجێ بوون لە نێوان مەککە و مەدینەدا بۆ ئەوەی هاریکاری زیاتری موسوڵمانان بکەن یاخود هیچ نەبێت بێ لایەن بن لە ململانێی نێوان موسوڵمانان

(٦٣١) **سریە:** بریتیە لەو کۆمەڵە موسوڵمانەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیناردن، و یەکێکیانی دەکرد بە سەرۆکیان بۆ لێدانی دوژمن یاخود ترساندنی، یاخود بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست، زۆرجار ژمارەیان کەم دەبوو. وە سەرجەم سریەکان لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ (٣٨) سریەیە.

**غەزا:** بریتیە لەو کۆمەڵ موسوڵمانەی کە پێغەمبەر ﷺ سەرۆکایەتی دەکردن و دەچوون بۆ بەگژاچوونەوەی دوژمن و شەڕکردن لە گەڵیدا. وە سەرجەم غەزاکانی پێغەمبەر ﷺ (٢٧) غەزایە لای ژیاننامە نووسان بەڵام: جابری کوڕی عەبدوللا دەفەرموێت:کە تەنها (٢١) غەزایە. بڕوانە:(صحیح مسلم (١٨١٣)، و (فتح الباری) (٧/٢٨٠).

و کافرەکاندا، وە بۆ زیاتر دەرخستنی هێزی موسوڵمانان و توانای بەرەنگاربوونەوە و تۆڵە سەندنەوەیان لە هەموو دوژمنان.

وە بۆ ناسینی بەرواری ڕووداوەکان ومێژووی ئیسلامی یەکەم ڕۆژی گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆناو شاری مەدینە کرابە یەکەم ڕۆژی دەست پێکردنی مێژووی ئیسلامی کە ڕۆژی دووشەمەی دوانزەی (ربیع الاول) بوو وەك عاصمی کوڕی عودەی دەفەرموێت: (قدِمَ رسولُ اللَّهِ ﷺ المدينةَ يومَ الاثنينِ لاثنتَي عشرَةَ ليلةً خلَت من ربيعِ الأوَّلِ فأقامَ في المدينةِ عشرَ سنينَ )[٦٣٢]، یەکەم کەس کەهەستا بەم کارە: یەعلای کوڕی ئومەیە بوو لە یەمەن[٦٣٣]. وە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بوو لە مەدینە، وەك سەعیدی کوڕی موسەیەب دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (ئیمامی عومەر موسوڵمانانی کۆکردەوە و پرسیاری لێ کردن، لە کام ڕۆژەوە مێژوو بنوسرێتەوە، ئیمامی عەلی ﷺ فەرمووی: لەو ڕۆژە وە کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە و خاڵکی هاوتا بۆ خوا بڕیاردانی تیاجێ هێشت، ئەم بۆچوونە ئیمامی عومەر لای پەسەند بوو بڕیاری لەسەر دا)[٦٣٤].

## سریەی (سیف البحر)

ئەمەش یەکەم سریەی موسوڵمانانە وەك سەرچاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەیان پێکردووە، ئەم سریەیەش دوای حەوت مانگ بوو لە هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ناو شاری مەدینە، لەم سریەیەدا سی پیاو لە کۆچکارانی مەککە (المهاجرين) پێکهاتبوو بە سەرکردایەتی حەمزەی کوڕی عەبدولموطلیب، دەرچوون بە مەبەستی ڕێگەگرتن بە کاروانێکی بازرگانی قوڕەیش بەسەر کردایەتی ئەبو جەهل کە سێ سەد پیاوی قوڕەیشی لەگەڵدا بوو دەگەڕایەوە لە شامەوە بۆ شاری مەککە، هەردوولا بەیەك گەیشتن لە (سیف البحر) کە کەوتۆتە نێوان یەنبع و حەرە، وە موجدی کوڕی عمروی جوهەنی کە هاوپەیمانی هەردوولا بوو. کەوتە نێوانیان و لەیەکی جیاکردنەوە و شەڕ ڕووی نەدا[٦٣٥]. ئەبو جەهل کە گەڕایەوە شاری مەککە هەواڵەکەی

---

(٦٣٢) أخرجه: الطبراني (المعجم الكبير) (١٧٢/١٧)، الطبري (التأريخ) (٣٩٢/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٥٠٣/٢)، قال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٢٣): رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٦٣٣) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٥/٣)، وصحح إسناده الحافظ في (الفتح) (٢٦٨/٧)، وصححه أيضاً الارناؤوط في تحقيقه لـ(زادالمعاد) (٣١٦/٣).

(٦٣٤) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي،وانظر فيها أثر ابن عباس وسهل بن سعد.

(٦٣٥) أخرجه: مسلم في (الصحيح) (١٨١٣)، أبو يعلى بإسناد الصحيح كما قال الحافظ في (فتح الباري) (٢٨٠/٧).

دابە قورەیش و مەترسییەکانی ئەم باسە و کۆمەکی کردنی دانیشتوانی شاری مەدینەی بۆ شیکردنەوە.

جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ دەفەرمویت: (ئەبو جەهل دوای ئەم ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ حەمزەدا گەڕایەوە شاری مەککە و وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش، محمد دابەزیوەتە مەدینە و سەربازەکانی بڵاوە پێکردووە بەم لاولادا، دەیەوێت زیانتان پێ بگەیەنێت، زۆر وریابن لە ڕێگەیەکەیەوە مەڕۆن و نزیکی مەکەونەوە، ئەو وەك شێرێکی پەلاماردەری تورەی قین لە دڵ وایە بەرامبەرتان، کە لە شارەکەتان دەرتان کردووە، سوێند بەخوا چەند سیحر بازێکی لەگەڵدایە، هەر کاتێك خۆی یان یەکێ لە هاوەڵەکانیم بینیبێت شەیتانەکانم لەگەڵدا بینیون، وە ئێوەش باش دەزانن دوژمنایەتی دوو کوڕەکەی قیلە (واتە: ئەوس و خەزرەجی دانیشتووانی مەدینە)، کەوابوو ئەو دوژمنە و پەنای بردۆتە بەر دوژمن.

موطعەمی کوڕی عودەی پێی وت: ئەبو حەکەم سوێند بەخوا نەم بینیوە کەس زمانی ڕاستگۆتر و بەڵێنی ڕاستتر بێت لەو برایەتان کە دەرتان کردووە، وەك چۆن دەرتان کردووە بێ زیانترین کەس بن بەرامبەری. ئەبوسوفیانی کوڕی حاریس (کەئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ وتی: لێرە بەدواوە زیاتر دوژمنایەتی بکەن، چونکە (ئەوس و خەزرەج) گەر ئێوەیان بەر دەست بکەوێت ئەوا هیچ جۆرە کەسایەتی و خزمایەتیەکتان لەگەڵدا ڕەچاوناکەن، گەر گوێڕایەڵی من دەکەن وەك لە ناوبردنی (کینانە) لە ناویاندەبەن، یا ئەوەتا محمد دەردەکەن لەنێوانیاندا، ئەوجا محمد دەرکرا تەنها دەبێت..... ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((سوێند بەوەی ڕۆحی منی بە دەستە بە کوشتن و لە سێدارەدان و بە (هیدایەت) دانیان دەبەم هەرچەندە پێیان ناخۆش بێت من بەزەییەکم خوا ناردوومی، وە نام مرێنێ تا ئایینەکەی خۆی سەر دەخات، من پێنج ناوم هەیە: من محمدم وە من ئەحمەدم وە من (الماحی)م سڕەرەوەم کە خوا بێ باوەڕیم پێ دەسڕێتەوە و من (الحاشر)م خەڵکی (لای منەوە کۆ دەکاتەوە) وە من (العاقب)م واتە: هیچ پێغەمبەرێکم بەدوادا نایەت)[٦٣٦].

(٦٣٦) أخرجه: الطبراني (المعجم الكبير) (١٥٣٢) وقال: قال أحمد بن صالح أرجو ان يكون الحديث صحيحاً،وقال الهيثمي في المجمع (٦٨/٦) رواه الطبراني، ورجاله ثقات.

## سریەی عوبەیدی کوڕی حارث

ئەم سریەیە لەمانگی شوالدا نێررا دوای هەشت مانگ لەگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرمویێت: (پێغەمبەر ﷺ دوای نیشتەجی بوونی لە مەدینەدا عوبەیدەی کوڕی حارثی کوڕی موطەلیب نارد (کە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ و برای ئەبو سوفیانی کوڕی حارثە) لەگەڵ شەست یاخود هەشتا سواردا هەموویان لە (المهاجرين) بوون و هیچ (أنصار) یەکیان لەگەڵدا نەبوو، ئەوان بەڕێ کەوتن هەتا گەیشتنە ئاوی (الحجاز) لە خوارووی تەپۆڵکە (المردة)، لەڕێدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێکی زۆری قوڕەیشی بوونەوە لێك ترازان، بەڵام شەڕ ڕووی نەدا لەنێوانیاندا، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لەو ڕۆژەدا تیرێکی تێگرتن، (ئەمەش یەکەم تیر بوو کە گیرایە کافرەکان لە ئیسلامدا)[٦٣٧]. پاشان هەردوولا لەیەك جیابوونەوە و موسوڵمانەکان پاشەکشەیان کرد و چەند سوارێکیان دانا دوای خۆیان بۆ پارێزگاری کردنیان وە لەو ڕۆژەدا میقدادی کوڕی عەمر و عوتبەی کوڕی غەزوان لە کافرەکان هەڵهاتن وخۆیان گەیاندە ناو موسوڵمانەکان چونکە ئەوان لەگەڵ کافرەکاندا هاتبوون تاخۆیان بگەیەننە ناو موسوڵمانانەوە، وە سەرکردەی کافرەکان لەم ڕووبەڕوو بوونەوەیەدا عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل بوو[٦٣٨].

## غەزای (ودان)

لە مانگی صفردا و دوای ساڵێك لەهاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ناو شاری مەدینە، پێغەمبەر ﷺ بۆ جیهاد و غەزاکردن لە پێناوی خوادا لە مەدینە دەرچووە دەرەوە، سەعدی کوڕی عوبادەی ﷺ لەجێی خۆی دانا بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکان، پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانەکان بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە (وَدان) کە بیست و سێ میل دوورە لە (الجُحفة)وە، بۆ پەلاماردانی قوڕەیش و کوڕانی بنی حمزەی کوڕی عبدمنافی کینانە، لەوێدا پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی تووشی شەڕ نەهاتن و ئەمە کۆتایی هات بەڕێککەوتن نامەیەك لەگەڵ هۆزی (بنی الضمرة) کە موخشی کوڕی

---

(٦٣٧) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٨٣/٧)، ومسلم (الصحيح) (٢٢٧٧)، وابن ماجه (السنن) (٤٧/١)، والحمدي (٧٨) وأحمد في (المسند) (١٧٤/١) وفي (الفضائل الصحابة) وقال محققه: إسناده صحيح.

(٦٣٨) انظر:(السيرة) لابن هشام (١٨٣/٢)، و(التأريخ) للطبري (٤٠٤/٢)، (الدلائل) للبيهقي (١١/٣) و(البداية والنهاية) لابن كثير(٢٣٤/٣)، و(تأريخ الاسلام) للذهبي (٤٦/١).

عەمر سەرۆکایەتی دەکردن، پاشان پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی گەڕانەوە ناو شاری مەدینە(٦٣٩).

## غەزای (بواط)

لە مانگی (ربيع الاول)ی ساڵی دووەمی کۆچیدا، پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی کە دوو سەد سواریان لە ناودا بوو شاری مەدینەیان بەجێ هێشت و بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە (بواط) لە ناوچەی (رضوي) شتومەك و بارەکانیەوە [بەمەبەستی ڕێگرتن بە کاروانێکی بازرگانی قوڕەیش کە سەد پیاویان لەگەڵدابوو لەگەڵ باری پانزە وشتردا بە سەرۆکایەتی ئومەیەی کوڕی خەلەف] وە لەم غەزایەشدا پێغەمبەر ﷺ سائب کوڕی عثمان کوڕی مضعونی لەجێی خۆی دانا بۆ بەڕێوەبردنی شاری مەدینە. لەم غەزایەشدا پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان تووشی شەڕ نەهاتن و پاشان گەڕانەوە شاری مەدینە(٦٤٠).

بۆ زیاتر ئاشنا بوون لە بەسەر هات و ڕووداوەکانی ئەم غەزایە دەچینە خزمەت فەرموودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا کە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (بەڕێکەوتین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە غەزای دۆڵی (بواط)دا، کاتێك بە شوێن مەجدی کوڕی عەمری جوهەینیدا دەگەڕاین، و هەموو وشترێك پێنج و شەش و حەوتمان بەدوای یەکدا بە نۆرە سواری پشتی دەبووین، جارێك نۆرەی پیاوێك لە (أنصار) بوو کە سواری وشترێك بێت، وشترەکەی یخلێدا و سواری پشتی بوو پاشان ویستی هەڵبسێتەوە وشترەکە یەك دووجار تەمەڵی کرد و پیاوەکە پێی وت: (شأ) [ئەم وشەیەکە دەوترێت بە وڵاغی بەرزە بۆ هەستانەوە و ڕۆیشتنی] لەعنەتی خوات لێ بێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من هذا اللاعن بعيره)) واتە: ئەوە کێیە لەعنەتی لە وشترەکەی کرد؟ پیاوەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((لەپشتی دابەزە و هاوڕێیەیەتیمان مەکە بە وشترێکی نەفرەت لێ

(٦٣٩) انظر: (السيرة) لابن هشام (١٨٢/٢)، و(الطبقات) لابن سعد (الطبقات) (٨/٢)، و(الدلائل) للبيهقي (١٠/٣) و (التأريخ) للطبري (٤٠٧/٢)، و (البداية) لابن كثير (٢٣٤/٣)، و (تأريخ الاسلام) للذهبي (٤٥/١) و (الزاد) لابن القيم (١٦٤/٣)، و(الدرر) لابن عبد البر (ص:٩).

(٦٤٠) أنظر: (السيرة) لإبن هشام (١٨٩/٢)، والطبري في (التأريخ) (٤٠٥/٢)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (١١/٣)، وأبن كثير في (البداية والنهاية) (٢٤٦/٣).

کراوەوە، ئێوە دوعا لەخۆتان مەکەن، دوعا لەمندالّەکانتان مەکەن، دوعا لە مالّ و سامانەکانتان مەکەن نەوەك دوعاکانتان بکەوێتە کاتێکەوە کە هەر شتێکی تیادا داوا بکەن خوای گەورە تیایدا دوعاکانتان بۆ گیرا و جێبەجێ بکات)).

بەرێ کەوتین لەگەلّ پێغەمبەر ﷺ ئێوارەمان بەسەر داهات، و نزیك بوینەوە لەیەکێك لە کانیاوەکانی عەرەب پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَنْ رَجلٌ يتقدَّمنا فيمدُرُ الحَوضَ، فيشرَبُ و يَسقِينا))؟ واتە: کام پیاو لە ئێوە پێشمان دەکەوێت حەوزێك دروست بکات لە ئاو تا خۆی لێی بخواتەوە و پاشان ئاویش بداتە ئێمە؟

جابر ﷺ دەفەرموێت: من هەستام وتم: ئا ئەمە (واتا: بەخۆی وت) پیاوێکە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کێی تر لەگەلّ جابر دەڕوات؟ جەبار کوڕی صخریش هەستاو لەگەلّمدا هات و ڕۆیشتین تا گەیشتینە بیرەکە، و یەك دوو دۆلّچە ئاومان هەلّێنجاو خاکەکەمان کرد بە قوڕ پاشان حەوزێکمان لێ دروست کرد، ئاومان هەلّێنجا لە بیرەکە تا بە تەواوی پڕمان کرد، و چاوەڕوانیمان کرد، و ڕوانیمان یەکەم کەس بە ڕووماندا هات پێغەمبەری خوا بوو ﷺ هات و فەرمووی: ((أتأذنان؟)) واتە ڕێگەم پێدەدەن؟ ئێمەش وتمان بەلّی ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا وشترەکەی نزیك کردەوە لە حەوزەکە تا تێر ئاو بوو پاشان چوو بەولاوە و وشترەکە میزی کرد و ئینجا پێغەمبەر ﷺ وشترەکەی برد بەو لاوە و دووری خستەوەو و یخی لێ داو حەوایەوە و پێغەمبەریش ﷺ لە پشتی دابەزی و دەستنوێژی شۆرد، وە جەبار کوڕی صخریش چوو بۆ سەر پێشاو تا دەستبەئاو بگەیەنێت، منیش (بوردە) واتە: پەشتەمالێکم لەبەردابوو ویستم لە خۆمیەوە بیپێچم، بەلاّم هەردوولایەکەی نەگەیشتەوە بەیەك و چەند لایەکی درێژو شۆڕبوون، ناچار پەشتەمالّکەم بە شان و ملمدا داو خۆمم پێ پێچایەوە و بەژێر چەناگەم گرتم و خۆم تیایا کزەلّە کرد، پاشان هاتم لای چەپی پێغەمبەرەوە ﷺ وەستام، پێغەمبەریش ﷺ دەستی گرتم و منی هێنایە لای ڕاستەوە، پاشان جەبار کوڕی صخریش دەست نوێژی شۆرد و هات لای چەپی پێغەمبەرەوە ﷺ پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی هەردووکمانی پالّ پێوەنا تا هەردووکمان لە پەنایەکدا لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ وەستاین و نوێژمان خوێند، پێغەمبەریش ﷺ لە نوێژەکەدا جارجار بە لاچاو تەماشای دەکردم و منیش باش ئاگادار نەبووم، پاشان بە ئاگا هاتم، لە نوێژەکەدا بەدەست ئیشارەتی بۆ کردم (واتا: لە پشتێنەتدا بیبەستە تاعەورەتت دەرنەکەوێت).

جابر ﷺ دەفەرمویێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکە تەواو بوو فەرمووی: ((جابیر)). وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی ((إِذَا كانَ وَاسِعًا فَخَالِفْ بيْنَ طَرَفَيْهِ، وإذَا كانَ ضَيِّقًا فَاشْدُدْهُ علَى حَقْوِكَ [فَاتَّزِرْ بِهِ])) واتە: ئەگەر پەشتەماڵەکەت فراوان و گەورە بوو بیپێچە لە خۆتەوە، وە ئەگەر بچووك و تەسك بوو بیپێچە بەناو قەدتەوە و تا لە ناوك بەرە و خوارتەوە دادەپۆشێت. جابر ﷺ دەفەرمویێت: بەڕێکەوتین لەو سەفەرەماندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وە خواردنی هەر پیاوێك لە ڕۆژێکدا یەك خورما بوو، دەیمژی و پاشان لە جل و بەرگەکەیدا دەیپێچایەوە و هەڵی دەگرت، وە ئێمە لە برساندا بە کەوانەکانمان لەگەڵای دارمان دەدا و دەمان خوارد، تا هەموو لێومان قڵیشی برد و درزی برد بوو (واتا: لە زبری و گەرمی گەڵاکەدا) وە ئێمە سەرکارێکمان هەبوو کە ڕۆژانە دەنکە خورماکەی بەش دەکرد بەسەرماندا سوێند بەخوا لە بەش کردندا یەکێکمانی بیرچوو خورمای بداتێ ئێمەش چووینە ژێر باڵیەوە و بردمان و شایەتیمان بۆدا کە دەنکە خورماکەی وەرنەگرتووە، ئینجا یەك خورمای پێداو وەری گرت و ڕاست بووەوە. لەڕێ ڕۆیشتنەکەماندا بەردەوام بووین، تا گەیشتینە شیوێکی فراوان و لەوێ دابەزین، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ پێشاو و دەست بە ئاو گەیاندن منیش دوای کەوتم بە کەمۆڵەیەك ئاوەوە، تەماشای کرد هیچی نەدی تادای پۆشێت و دیار نەبێت، بەڵام دوو درەخت لەم سەر و ئەو سەری شیوەکەوە دیاربوو.

پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای یەکێکیان پەلێك لە پەلەکانی درەختەکەی گرت و فەرمووی ((انقادي علَيَّ بإذْنِ اللهِ)) واتە وەرە بەدوامدا بە ئیزنی خوا، درەختەکەش بەدوایدا ڕۆیشت وەك چۆن وشتری مل کەچ بە دوای خاوەنەکەیدا دەڕوات، پاشان هات بۆلای درەختەکەی تر و پەلێك لە پەلەکانی گرت و فەرمووی ((انقادي علَيَّ بإذْنِ اللهِ)) واتە: بەئیزنی خوا وەرە بە دوامدا، درەختەکەش بە دوایدا ڕۆیشت، تا نزیکی کردەوە لە درەختەکەی تر کۆی کردەوەو فەرمووی ((إلتِئما علَيَّ بإذْنِ اللهِ)) واتە: تێکەڵ بەیەك بن بە سەرمدا بەئیزنی خوا، هەردووکیان تێکەڵ بەیەك بوون، بەسەریداو دایان پۆشی و سێبەریان بەسەرەوە کرد.

جابر ﷺ دەفەرمویێت: (منیش هەستام و ڕام کرد ئەوێم بەجێ هێشت نەوەك پێغەمبەر ﷺ هەستم پێ بکات و زیاتر دوور بکەوێتەوە تا دوور کەوتمەوە و لەشوێنێکدا دانیشتم و لە خەیاڵدا بووم ئاوڕێکم دایەوە تەماشام کرد پێغەمبەر ﷺ

بەرەوە لای من دێت و دەگەڕێتەوە وە دوو درەختەکە جیابوونەتەوە لە یەکتری، هەریەکەیان لەلایەکەوە وەستاوە بینیم پێغەمبەر ﷺ وەستانێك وەستاوە بە سەری ئیشارەتی بەلای ڕاست و چەپدا کرد بۆ درەختەکان و هەریەکەیان چوونەوە شوێنی خۆیان، پاشان بەرەو لای من هات و گەیشتە لام و فەرمووی: جابر ئاگات لێ بوو لە کوێ وەستام؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((فَانْطَلِقْ إلى الشَّجَرَتَيْنِ فَاقْطَعْ مِن كُلِّ وَاحِدَةٍ منهما غُصْنًا، فأقْبِلْ بهِمَا، حتَّى إذَا قُمْتَ مَقَامِي فأرْسِلْ غُصْنًا عن يَمِينِكَ وَغُصْنًا عن يَسَارِكَ)) واتە: برۆ بۆلای هەردوو درەختەکە و لە هەریەکەیان پەلێك ببڕە و بیهێنە تا دەگەیتە شوێنی وەستانەکەم ئینجا پەلێکیان فڕێ دە بە لای ڕاستدا و ئەوی تریان بەلای چەپدا.

جابر ﷺ دەفەرموێت: منیش هەستام و بەردێکم هەڵگرت و شکاندم تالایەکی تیژ بوو ئینجا هاتم بۆلای هەردوو درەختەکە و هەریەکەیان پەلێکم لێ بڕی و پاشان هەردوو پەلەکەم بە دوامدا ڕاکێشا و هێنام تا لە جێگە وەستانەکەی پێغەمبەر ﷺ وەستام و پەلێکیانم بەلای ڕاستدا فڕێ داو ئەوی تریان بەلای چەپدا، ئینجا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: جێبەجێم کرد ئەی پێغەمبەری خوا مەبەست لەو کارە چی بوو؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((إنِّي مَرَرْتُ بقَبرينِ يُعذَّبانِ فأحبَبْتُ بشَفاعتي أنْ يُرفَّهَ عنهما ما دام الغُصنانِ رَطْبَيْنِ)). واتە: من تێپەڕیم بە لای دوو گۆڕدا ئەشکەنجە دەدران، پێم خۆش بوو بە تکاکردنم بۆیان ئەشکەنجەیان لەسەر سووك بکرێت تا ئەو کاتەی دوو پەلەکە وشك دەبن.

جابر ﷺ دەفەرموێت پاشان گەڕاینەوە ناو سەربازەکانمان وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يا جابر نادِ بوضوءٍ)) واتە: جابر بانگ بکە بۆ ئاوی دەستنوێژ، جابر ﷺ دەفەرموێت: منیش بانگم کرد کێ ئاوی دەست نوێژێکی لایە؟ کێ ئاوی دەست نوێژێکی لایە؟ کێ ئاوی دەست نوێژێکی لایە؟ ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا یەك دڵۆپ ئاوم دەست نەکەوت لەکەسیان، جابر ﷺ دەفەرموێت: بەڵام تەنها پیاوێکی ئەنصاری مەشکەیەك[٦٤١] ئاوی بەچەند دارێکەوە هەڵواسی بوو بە وشترەکەیەوە بۆ ئەوەی ئاوەکەی سارد بێت و بەشی پێغەمبەری لێ بدات، پێغەمبەر ﷺ پێی وتم ((انْطَلِقْ إلى فُلَانِ ابْنِ فُلَانٍ الأنْصَارِيِّ، فَانْظُرْ هلْ في أَشْجَابِهِ مِن شيءٍ؟ )) واتە: برۆ بۆ لای فلانی

(٦٤١) مەشکە پێستی مەڕە یان بزنە خۆش دەکرێت و پاك دەکرێت و پاشان بۆ ئاو کێشان بەکاردێت.

کوڕی فلانی ئەنصاری تەماشا بکە بزانە لە مەشکەکەیدا هیچ ئاوێکی تێدایە؟ جابر ﷺ دەفەرموێت: ڕۆیشتم و تەماشام کرد تەنها کەمێك ئاوی لەدەمی مەشکەکەدا ماوە ئەگەر ئاوەکە بگەڕایەتەوە ناو مەشکەکە ئەویش نەدەما لەبەر وشکی مەشکەکە پاشان گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا هیچم تیا نەدیەوە تەنها کەمێك ئاو نەبێت لەدەمی مەشکەکەدا ئەگەر بەرزی بکەیتەوە ئاوەکە بگەڕێتەوە ناو مەشکەکە لەبەر وشکی مەشکەکە ئەویشی تیا نامێنێت!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ بۆم بێنە، منیش ڕۆیشتم و بۆم هێنا و بە دەستی گرتی و هەندێك شتی فەرموو من باش ئاگام لێ نەبوو ئینجا بەدەستی لە هەموو لایەکەوە گوشی و پاشان دایە دەستی من و فەرمووی: ((جابر بانگ بکە تا مەنجەڵێکی گەورە بهێنن))، منیش بانگم کرد: ئەی خاوەنی مەنجەڵە گەورەی ئەم سوارانە لە کوێیە مەنجەڵەکەت بهێنە، ئینجا مەنجەڵەکەمان بە دەست هەڵگرت هێنامان لەبەر دەستیدا دامان نا، پێغەمبەریش ﷺ دەستی کردەوە و پەنجەکانی بڵاو کردەوەو لە بنی مەنجەڵەکەدا داینا، مەشکەکەیدا بەدەستمەوە و فەرمووی: ((خُذ يا جابرُ فصُبَّ عليَّ وقل بسمِ اللَّهِ)). واتە: ها جابر بیگرە و ئاو بکە بە دەستمدا و بڵێ: بسم الله. منیش ئەو کەمە ئاوەی مەشکەکەم کرد بە دەستیدا و وتم: بسم الله، و بەچاوی خۆم بینیم ئاو بەخوڕ لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەردەچوو، ئەوەندەی پێ نەچوو مەنجەڵەکە بە تەواوی پڕ بوو لەئاو. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((يا جابرُ نادِ مَن كانت له حاجةٌ بماءٍ))؟! واتە: جابر بانگ بکە کێ پێویستی بەئاو هەیە با بێت؟. ئەوەندەی پێ نەچوو هەر هەموویان هاتن ئاویان خواردەوە، تا تەواو تێر ئاو بوون، ئینجا من دەم وت: کێی تر پێویستی بە ئاوە با بێت، تا هەموویان تەواو بوون ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرز کردەوەو دەری هێنا لە مەنجەڵەکە هێشتا تەواو پڕ بوو لە ئاو. پاشان موسوڵمانان سکاڵای برسێتی خۆیان بردە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((عَسَى اللَّهُ أَنْ يُطْعِمَكُمْ)) واتە: بەڵکو خوای گەورە خواردنیشتان بداتێ؟! بەڕێ کەوتین تا گەیشتینە قەراغی دەریا، دەریاکە یەك شەپۆلی داو گیاندارێکی هەڵدایە قەراغەکەیەوە (پێ دەچێت نەهەنگ بوو بێت)، ئێمەش ئاگرمان لە لایەکەوە کردەوە، هەندێ لەگۆشتەکەیمان برژاندو هەندێکمان لێ کوڵاند و لێمان خوارد تا بەتەواوی تێربووین.

جابر ﷺ دەفەرموێت: (من و فلان و فلان و تا پێنج کەسی ژمارد چووینە چاڵاییی چاویەوە تیایدا ون دەبووین و نەدەبینراین تا هاتینە دەرەوە و پەراسویەك لە پەراسووەکانیمان ڕاست کردەوە و چەمانمانەوە و باڵا بەرزترین سوارمان هێناو بەرزترین کۆپان و سواری بەرزترین وشترمان کرد بەژێریدا تێپەڕبوو بەبێ ئەوەی سەری بچەمێتەوە)[٦٤٢]. پاشان گەڕاینەوە شاری مەدینە.

## غەزای (العُشَيرة)

لەمانگی (جمادی الاولی)دا پێغەمبەر ﷺ [لەگەڵ سەد و پەنجا یان دوو سەد و پەنجا لە موسوڵمانانندا لە مەدینە دەرچوون دوای ئەوەی هەواڵی دەرچوونی کاروانێکی بازرگانی قورەیشیان پێ گەیشت کە لە مەککە وە دەرچوو بوون بەرەو شام][٦٤٣] وەئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسدی دانا بۆ بەڕێوە بردنی ئیش و کارەکانی ناو شاری مەدینە (واتە: پێش نوێژی کردن و وتار خوێندنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ)، بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە (العشیرة) کە لەناوچەی یەنبوعی نێوان مەککە و مەدینەیە، لەوێ ڕۆژانی (جمادی الاولی) و چەند شەوێك لە (جمادی الاخرة) مایەوە و ڕێکەوتن نامەی لەگەڵ هۆزی (بنی مدلج) و هاوپەیمانەکانیان لە (بنی ضمرة) دا ئەنجامدا.

عەماری کوڕی یاسر ﷺ یەکێك لە ڕووداوەکانی ئەم غەزایەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (من و عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەغەزای (العشیرة)دا بەیەکەوە بووین، کاتێك لەوێ دابەزین و ماوەیەك ماینەوە هەندێك لە خەڵکی (بنی المدلج) مان بینی کە بیرێکیان هەڵدەکەند لە ناو خورماکانیاندا، عەلی کوڕی ئەبو طالیب بە منی وت: باوکی (الیقظان) بۆ نەچین تەماشای ئەو خەڵکە بکەین تا بزانین چۆن کاردەکەن؟ منیش وتم: گەر ئارەزوت لێ بێت بابڕۆین، ئینجا ڕۆیشتین بۆ لایان و ماوەیەك تەماشامان کردن و تا نزیك بوو خەومان لێ بکەوێت، پاشان من و عەلی چووین لەناو خۆڵە نەرمی ژێرسێبەری هەندێك دارخورمای بچووکدا پاڵ کەوتین و خەومان لێ کەوت سوێند بەخوا ئاگامان لە خۆمان نەبوو تا پێغەمبەر ﷺ جوڵاندینیەوە بە قاچی و لە خەو هەستاین خۆڵاوی بوو بووین لەو خۆڵەی کە تیایدا ڕاکشابووین ئا

(٦٤٢) أخرجه:البخاري (٣٦١) مختصراً جداً، ومسلم (الصحيح) (كتاب الزهد و الرقائق) (٧٤٣٧) مطولاً واللفظ له.

(٦٤٣) أنظر: (المغازي) للواقدي) (١٢/١).

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ بەعەلی کوڕی ئەبو طالبی فەرموو: ((ما لَكَ يا أَبا تُراب)) واتە: ئەوە چیتە ئەی خۆڵاوی. لەبەر ئەو خۆڵەی لەسەری نیشتبوو، پاشان فەرمووی: ((ألا أُحدِّثُكما بأشقى الناسِ رجُلينِ)) واتە: ئایا باسی دووکەسی خراپترین و چەپەڵ ترین کەستان بۆ بکەم لەناو خەڵکدا؟ وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: (( أُحَيْمِرَ ثمودَ الذي عقر الناقةَ والذي يضربُك يا عليُّ على هذه وضَع يدَهُ على قَرْنِهِ [حتى يَبُلَّ منها هذه] وأ خذ بِلِيَتِه)) واتە: [أحيمركە: پێ دەچێت مانای سوورە کورتە بالآکەی] سەموودە کە وشترەکەی سەر بڕی، وە ئەو کەسەی کە ئالێرمت دەدا ئەی عەلی وە دەستی خستە سەر سەری تا ئەمە تەڕ دەکات و بەدەستی ڕیشی گرت))[٦٤٤]. لەم غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان تووشی شەڕ نەهاتن پاشان گەڕانەوە شاری مەدینە[٦٤٥].

## غەزای (سفوان)

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ پاش گەڕانەوەی لە غەزای (العشيرة) و هاتنەوەی بۆ ناو شاری مەدینە چەند شەوێکی کەمی بەسەردا تێ پەڕی نەگەیشتە دە شەو، تا ئەوە بوو کورزی کوڕی جەباری فەهری پەلاماری بەشێك لە مەڕ و مالآت و پاوەنەکانی شاری مەدینەیدا، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ بەشێك لە موسوڵمانانداا بە دوای کەوتن تا گەیشتنە شیوێك لە ناوچەی بەدردا کە پێیان دەوت شیوی (سفوان)، و کورزی کوڕی جابر دەرباز بوو و پێی ڕانەگەیشتن ئەمەش پێی دەوترێت (غەزای بەدری یەکەم)، پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ناو شاری مەدینە و تیایدا مایەوە تا کۆتایی مانگی (جمادى الاخرة) و مانگی ڕەجەب و شەعبان وە لەم غەزایەشدا

---

(٦٤٤) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٦٣/٤) (١٨٣٢١) وقال محققه الارناؤوط: حسن لغيره، وعبد الله بن أحمد(فضائل الصحابة) (١١٧٢) وقال محققه: إسناده حسن متصل، النسائي (الكبرى) (٨٥٣٨)، والحاكم (المستدرك) (١٤٠/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبى، والبيهقي (الدلائل) (١٢/٣)، والطحاوى (مشكل الاثار) (٣٥٢/١) وقال الهيثمي في (المجمع) (١٣٦/٩) رجاله موثقون الا ان التابعى لم يسمع من عمّار.وللحديث شواهد عندالطبراني (الكبير) (١٧٣)، والحاكم (١١٣/٣) وصححه على شرط البخاري، وقوله ﷺ (يأبا تراب) له شاهد عند البخاري (٤٤١، ٣٧٠٣) واللفظ له، ومسلم (٢٤٠٩) من حديث سهل بن سعد قال: جاء رسول الله ﷺ بيت فاطمة، فلم يجد علياً في البيت، فقال: ((اين ابن عمّكَ)) ؟ قالت: كان بينى وبينه شيء، فغاضبنى فخرج فلم يقل عندى، فقال رسول الله ﷺ لإنسانٍ ((انظر اين هو)) ؟ فجاء فقال: يارسول الله هوفي المسجد راقد، فجاء رسول الله ﷺ وهو مضطجع قد سقط رداؤهُ عن شقه، واصابه تراب، فجعل رسول الله ﷺ يمسحه عنه ويقول: ((قم يا أبا تراب)).

(٦٤٥) انظر:(التاريخ) للطبرى (٤٠٥/٢)، و(الدلائل) للبيهقى (١١/٣)، و (السيرة) لابن هشام (٩٠/٢) رقم(٤٧٥)، و(الطبقات) لابن سعد (٦/٢)، و(البداية) لابن كثير(٢٤٦/٣)، و(تاريخ الاسلام) للذهبى (٤٧/١)، و(عيون الاثر) (٢٢٦/١).

پێغەمبەر ﷺ زەیدی کوڕی حاریثە ی لە جیَی خۆی کردە فەرمانڕەوا تا لە غەزاکە گەڕایەوە)[٦٤٦].

## سریەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی لەگەڵ هەشت لە مهاجریندا نارد، بەرەو (الخراز)، ئەوان بەڕێکەوتن تا گەیشتنە ئەو جێگەیە لە خاکی حیجازدا، و پاشان گەڕانەوە و تووشی هیچ شەڕێك نەهاتن)[٦٤٧].

لە ڕیوایەتێکی (ضعیف) وا هاتووە (لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە کە ژمارەیان سەد کەس بووە و بە مەبەستی ڕێگرتن بە کاروانێکی قورەیش چوون و هەندێکیان ڕۆیشتوون و هەندێکیشیان گەڕاونەتەوە ناو شاری مەدینە)[٦٤٨].

## سریەی عەبدوڵلای کوڕی جەحش

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ و ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموون: (پێغەمبەر ﷺ پاش گەڕانەوەی لە غەزای (سفوان) یا (بدر الاولی)، کۆمەڵیکی نارد و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی ﷺ کرد بە سەرکردەیان، کاتێك ویستی بڕوات فرمێسك لە چاوانی هاتە خوارەوە لە نارەحەتی دوورکەوتنەوەی لە پێغەمبەر ﷺ، بۆیە ئەوی لابرد و عەبدوڵلای کوڕی جەحشی ﷺ خستە جێگەی، ئەو کۆمەڵەش لە هەشت کەس لە مهاجرین پێکهاتبوو هیچ ئەنصاریی یەکیان لە ناودا نەبوو ((پێغەمبەر ﷺ بە عەبدوڵلای فەرموو: بڕۆ هەواڵی قورەیشمان بۆ بهێنەرەوە)) فەرمانی پێ کرد کە هیچ شەڕ و جەنگێك نەکات، چونکە لەکاتی مانگە حەرامەکاندا بوون، وە نامەیەکی بۆ نووسی پێش ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە کە بەرەو کوێ بچێت و پێی فەرموو ((اخرج أنتَ وأصحابُكَ حتى إذا سِرْتَ يومينِ فافْتحْ كتابكَ وانظرْ فيهِ , فما أمَرْتُكَ بهِ فامضِ لهِ ,

(٦٤٦) انظر:(السيرة) لابن هشام (١٩٢/٢) برقم (٤٧٩)، و(التاريخ) للطبري (٤٠٧/٢)، و (الدلائل) للبيهقي (١٣/٣)، و (البداية) لابن كثير(٢٤٧/٣)، (الزاد)لابن القيم(١٦٦/٣).

(٦٤٧) انظر: (السيرة) لابن هشام (١٩١/٢)، و(التاريخ) للطبري (٤٠٧/٢)، و(الدلائل) للبيهقي (١٣/٣) و (الطبقات) لابن سعد(٤/٢)، (البداية) لابن كثير (٢٣٤/٣)، و (الدرر) لابن عبدالبر(ص:٩٦).

(٦٤٨) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (١٢٣/١٢)، وأحمد (المسند) (١٥٣٩) وقال محققه الارناؤوط: إسناده ضعيف، والبيهقي (الدلائل) (١٥/٣) والبزار(١٧٥٧).

ولا تستكرهنّ أحدا من أصحابكَ على الذهابِ معك)) واتە: تۆ و هاوەڵەکانت بەڕێ کەون تا دوو ڕۆژ ((وأمَرَه أن لا يَقْرأ فيهِ حتى] يسيرَ يومَيْنِ [وحتى يَبلغَ مَكان كذا وكذا]) و نامەکە مەکەرەوە تا دەگەیتە جێگەی فلان وفلان، کە گەیشتیتە ئەوێ، نامەکەت بکەرەوەو بڕۆ جێ بەجێی بکە و زۆر لە هیچ کەسێك لە هاوەڵەکانت مەکە تا لەگەڵتدا بێن.

لەم سریەیەدا هاوەڵەکانی عەبدوڵلای کوڕی جەحش ئەمانە بوون: (ئەبو حوزەیفە، عوتبە کوڕی ڕەبیعە، عوکاشەی کوڕی موحصین، و عوتبەی کوڕی غەزوان، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، عامری کوڕی ڕەبیعە، واقیدی کوڕی عەبدوڵلا، خالیدی کوڕی بەکیر، سوهەیلی کوڕی بەیزا) هەموو بەڕێ کەوتن لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی جەحشدا تا گەیشتنە ئەو جێگەیەی بۆیان دیاری کرا بوو، ئینجا عەبدوڵلا نامەکەی کردەوە، تەماشای کرد ئەمەی تیا نووسرا بوو:

(هەر تەماشای ئەم نووسراوەت کرد بەڕێ کەوە تا دەگەیتە (النخلة)ی نێوان مەککە و طائیف، وە لە نزیکەوە چاودێری قوڕەیش بکە هەواڵەکانیان بزانە و پێمان بگەیەنەرەوە) کاتێك عەبدوڵلا لە خوێندنەوەی نامەکەی تەواو بوو وتی: گوێگر و گوێڕایەڵین (سمعاً و طاعة) پاشان بەهاوەڵەکانی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووم بەڕێ کەوم بۆ دۆڵی (النخلة) تا چاودێری قوڕەیش بکەم و هەواڵ زانیاریەکانی پێ بگەیەنمەوە، داوای لێ کردووم کە زۆر لە هیچ کە سێکتان نەکەم تا لەگەڵمدا بێت، هەر کەسێکیش لە ئێوە شەهیدی دەوێت و پێی خۆشە پێی بگات، با لەگەڵمدا بێت، وە هەر کەسێکیش لە ئێوە ئەوەی پێ ناخۆشە با بگەڕێتەوە، بەڵام من وا بەڕێ دەکەوم بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ، عەبدوڵلا بەڕێ کەوت خۆی و هاوەڵەکانی وە هیچ یەکێکیان نەگەڕایەوە، بەڕێ کەوتن بە بەرزایی یەکانی حیجازدا تا گەیشتنە چاڵی (بحران) لە سەرووی (الفرع) وە، لەوێ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عوتبەی کوڕی غەزوان وشترەکەیان لێ ون بوو کە بە نۆرە سواری پشتی دەبوون، ئەوان لەوێ جێمان تا بە دوایدا بگەڕێن، وە عەبدوڵلا و هاوڕێکانی بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە دۆڵی (نخلة) و لەوێ دابەزین و چاودێری چواردەوریان دەکرد لەو کاتەدا چوار وشتر باری قوڕەیش هاتن ئەوانیش: عەمروی کوڕی حەزرەمی، و عوسمانی کوڕی عەبدوڵلا، و نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلای مەخزومی و حەکمی کوڕی کیسان کە مێووژ و پێستە و هەندێك کاڵای بازرگانی

تری قورەیشیان پێ بوو لە طائیفەوە هێناboooیان بەرەو مەککە، ئەوان هاتن و لە نزیك عەبدوللا و هاوەڵەکانی دابەزین و کاتێ ئەوانیان بینی ترسان، عوکاشەی کوڕی موحصین بوو یا خود واقیدی کوڕی عەبدوللا بوو کەسەری تاشی بوو خۆی نیشانی ئەوان داو کاتێك قورەیشیەکان ئەمەیان بینی وتیان: ترسمان لێیان نی یە ئەوانە بۆ عەمرەکردن هاتوون وبێ ترس بوون، چونکە ئەوە لەڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەجەبدا بوو.

عەبدوللا و هاوەڵەکانی ڕاوێژیان لەگەڵ یەکدا کرد وتیان: سوێند بەخوا گەر ئەم شەو لێیان گەڕێین دەچن تا دەگەنە ناوچەی (الحرم) و هیچمان پێ ناکرێت لەگەڵیاندا و گەر بیان کوژین مانگەکەش مانگی حەرامە، بۆیە هەموویان دوودڵ بوون کەپەلاماریان بدەن، پاشان ورەیان بە خۆیاندا و کۆبوون لەسەر پەلاماردانیان و ئەوی لێیان بەردەست کەوت بیکوژن و ئەو کە لوپەلەی پێیانە بیبەن.

واقیدی کوڕی عەبدوللا تیرێکی گرتە عەمرۆی کوڕی مەخزومی و کوشتی، عوسمانی کوڕی عەبدوللا وحەکەمی کوڕی کیسان دەستگیرکران و بەڵام نەوفەلی کوڕی عەبدوللا ڕای کرد و دەست گیر نەکرا.

عەبدوللا و هاوەڵەکانی بە وشتر و بارەکان و دوو دەستگیر کراوەکە وە گەڕانەوە، عەبدوللا بەهاوەڵەکانی وت: ئەوەی دەستمان کەوتووە دەیکەینە پێنج بەش بەشێکی دەدەینە پێغەمبەر ﷺ [ئەمە پێش ئەوە خوای گەورە ئەم بەشە دیاری بکات] ئەوە بوو بەشەکەی پێغەمبەری ﷺ جیاکردەوە و ئەوانی تری دابەش کرد، کاتێ کە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە و چوونە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند پێ‌ی وتن: (([والله ما أمرتكم بِالقِتالِ في الشهرِ الحَرامِ])) واتە: سوێند بەخوا فەرمانم پێ نەکردن بە شەڕ کردن لە مانگی حەرامدا. پێغەمبەر ﷺ ئەو بەشەی وەرنەگرت لێیان و وشتر و بار و دوو دەست بەسەرەکەی داناو ڕای گرت، عەبدوللا و هاوەڵەکانی ئەمەیان بینی و وتەکەی پێغەمبەر ﷺ یان بیست زۆریان پێ ناخۆش بوو وە گومانیان وابوو کەتیاچوون و هەڵەیەکی گەورەیان ئەنجام داوە و برا موسوڵمانەکانیان گازندەیان کردن لەسەر ئەم کارەیان.

قورەیش کاتێك ئەم هەواڵەیان پێ گەیشتەوە وتیان: محمد و هاوەڵەکانی مانگە

حەرامکراوەکانیان بۆ خۆیان حەڵاڵ کرد، و خوێنیان تیا ڕشت و پیاوانیان دەست بەسەر کرد و سامانیان تیایدا بەتاڵان برد. هەندێك لە موسوڵمانان کەهێشتا کۆچیان نەکردبوو لە مەککە مابوونەوە وەڵامیان دەدانەوە و دەیان وت: ئەوان ئەو کارەیان لە مانگە حەرام کراوەکاندا ئەنجام نەداوە بەڵکو لە مانگی شەعباندا ئەنجامیان داوە.

جولەکەکانی مەدینەش دەیان وت: (عمرو) مانای ئەوەیە کە شەڕ ئاوەدان دەبێت و (الحضرمی) مانای ئەوەیە کە شەڕ ئامادە دەبێت، و (واقد) بە مانای بڵێسە دەسێنێت. بەڵام هەموو پێش بینیەکانی جولەکە بەسەر خۆیاندا شکایەوە بە زیانی خۆیان تەواو بوو.

کاتێك خەڵکی زۆر لەسەر ئەم باسە دوان، خوای گەورە ئەم چەند ئایەتەی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ...... ﴿٢١٧﴾ ﴾ (البقرة) واتە: ئەگەر ئێوە کوشتارتان ئەنجام دابێت لە مانگە حەرام کراوەکاندا، ئەوان ڕێگریان دەکردن و ئێوەیان دوور دەخستەوە لە (المسجد الحرام) و ئێوەی دانیشتوی شاری مەککەیان دەرکرد لەمەککە ئەمانە گەورەترە لای خوا لەو کوشتارەی موسوڵمانەکان لە ئێوەیان کرد و ﴿ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ﴾ واتە: موسوڵمانانیان ناچار دەکرد و زۆر یان لێ دەکردن تا لە باوەڕیان پاشگەز ببنەوە و بگەڕێنەوە سەر بێ باوەڕی، ئەم کارەش گەورەترە لای خوا لە کوشتار وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ...... وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ..... ﴿٢١٧﴾ ﴾ (البقرة). واتە: ئەوان لێرە بە دواوە بە نیازن کاری گەورەتر بەرامبەر ئێوە ئەنجام بدەن بەوەی بجەنگێن لەگەڵتاندا تا لەتوانایاندا هەبێت بۆ ئەوەی ئێوە لە ئاینەکەتان دوور بخەنەوە، وە دەست بەردار نابن و واز ناهێنن لە دوژمنایەتیتان.

کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند و دوو دڵی و نیگەرانی و ترسی لەسەر موسوڵمانان ڕەواندەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەست بەسەرا گیراوەکانی بەش کرد، و قوڕەیش نوێنەری خۆی نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆڕێکەوتن لەسەر ئازاد کردنی هەر دوو دیلەکە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((ئێمە هەر دوودیلەکانتان ئازاد ناکەین تا ئەو دوو هاوڕێیەمان (واتە: سەعد و عوتبە) نەگەڕێنەوە، ئێمە دەترسین

لەوەی ئێوە بیان کوژن گەر بیان کوژن ئێمەش ئەم دووانە دەکوژین)).

ئەوەنەی پێ نەچوو سەعد و عوتبە گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەردوو دیلەکی بۆ ئازاد کردن، و یەکێکیان کە حەکەمی کوڕی کیسان بوو موسوڵمان بوو لای پێغەمبەر ﷺ مایەوە و موسوڵمانێکی زۆر باش دەرچوو تا شەهید بوو لە (بئر المعونة) دا، بەڵام ئەوی تریان گەڕایەوە بۆ مەککە و لەوێ بە کافری مرد. هەندێك لە موسوڵمانان لە ناو خۆیاندا سەبارەت بە سریەکەی عەبدوڵلا و هاوەڵەکانی دەیان وت: گەر ئەوان تووشی تاوان نەبووبن پاداشتیان نی یە یا خود گەر سامانیان دەست کەوتبێت پاداشتیان نی یە، عەبدوڵلا و هاوەڵەکانی کاتێك ناڕەحەتی یەکەیان بە سەرەوە لاچوو پێیان خۆش بوو پاداشتیان بە دەست هێنا بێت بە پێغەمبەریان وت: بەهیوا بین کە بەغەزا بۆمان نووسرابێت ئایا پاداشتی (المجاهدین) وەردەگرین. لە وەڵامیاندا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو مژدەی پێدان: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾ (البقرة)).

ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت: ئەمە یەکەمین دەست کەوتی موسوڵمانان بوو، و عەمروی کوڕی حەزرەمیش یەکەمین کوژراوی کافرەکان بوو. عوسمانی کوڕی عەبدوڵلا و حەکەمی کوڕی کیسان یەکەمین دیلی کافرەکان بوو[٦٤٩].

## گۆڕینی قیبلە

دوای شانزە مانگ یان حەڤدە مانگ لەهاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ناوشاری مەدینە، خوای گەورە قیبلە (ڕووگە)ی موسوڵمانانی لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕی بۆ (بیت الحرام) لە مەککە، بەڕائی کوڕی عازیب دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ یەکەم جار هاتە شاری مەدینەوە دابەزی یە لای خاڵۆزاکانی بەنی نەجار لەئەنصاریەکان. وە لە نوێژدا

(٦٤٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٦٧٠)، وابو يعلى(المسند) (١٥٣٤)، والبيهقي في (الكبرى) (١٨٢٤٣، ١٨٤٩٧) وفي (الدلائل) (١٧/٣)، وابن جرير(التاريخ) (٢٤٠/٢)، وابن سعد(الطبقات) (٧/٢)، وابن هشام (السيرة) (١٩٢/٢) برقم (٤٨٠،٤٨١)، وابن كثير في (البداية) (٢٤٨/٣)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (١٥٥/١):رواه الطبراني بإسناد حسن وهوحديث صحيح بجموع طرقه، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٣٣٦):رواه الطبراني ورجاله ثقات، وقال الشوكاني في (فتح القدير) (٣٢٤/١): أخرجه البيهقي بسند صحيح، وقال الشيخ الالباني في تخريج (فقه السيرة) (ص:٢٣١): إسناده صحيح، واللفظ لابن اسحاق و عروة بن الزبير.

ڕووی دەکردە (بيت المقدس) شازدە مانگ یا حەڤدە مانگ، وەپێی خۆش بوو کە قیبلەکەی (بيت الحرام) بێت لە مەککە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ .... ﴿١٤٤﴾ ﴾ (البقرة). واتە: ئەی پێغەمبەر ئێمە دەبینین دەڕوانیتە ئاسمان و چاوەڕێ ئەوە دەکەیت سروشتت بۆ بێت ، بەدڵنیاییەوە روت لە بەیتول مەقدیسەوە وەردەگێرین بۆ روگەیەك کە حەزت پێیەتی کە ئەویش روکردنە مزگەوتی حەرامە (کەعبە)یە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ رووی کردە کەعبە و زۆری پێ خۆش بوو] و یەکەم نوێژێك (ڕووبە قیبلەی نوێ کردی) نوێژی عەسر بوو، کۆمەڵێك لەگەڵیدا نوێژی کرد، یەکێك لەو پیاوانەی کە نوێژی لەگەڵدا کردبوو، چوو بەلای نوێژ خوێنانی مزگەوتێکدا لە ڕکوعدا بوون پێی وتن: شایەتی دەدەم بەخوا کە ئێستا نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کرد ڕووبە کەعبە. ئەوانیش هەر لە ڕکوعەکەیاندا سوڕانەوە بەرەو کەعبە. جولەکەکان و گاورەکانیش پێیان خۆش بوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕووی دەکردە (بيت المقدس)، کاتێك ڕووی کردە کەعبە هەموویان ڕەخنەیان لێ گرت)[٦٥٠].

بەم جۆرە هەواڵی قیبلە گۆڕین یەکەم جار لە نوێژی عەسردا گەیشتە شاری مەدینە، پاشان هەواڵەکە نوێژی بەیانی گەیشتە ناوچەی قوبائی دەرەوەی شاری مەدینە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك خەڵکی لە نوێژی بەیانیدا بوون لە قوباء، یەکێك هات بۆلایان و پێی وتن: پێغەمبەر ﷺ ئەمشەو چەند ئایەتێکی بۆ دابەزیوە و فەرمانی پێ کراوە ڕووبکاتە کەعبە ئێوەش ڕووی تێ بکەن، نوێژ خوێنەکان ڕوویان لە شام بوو (واتا: قودس) هەر لە نوێژەکەدا ڕوویان وەرگێڕا بەرەو کەعبە)[٦٥١].

هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ترسان لەوەی کە نوێژەکانی خۆیان و مردووەکانیان پێش گۆڕینی قیبلە بە فیڕۆ چووبێت، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ

---

(٦٥٠) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٠،٣٩٩،٤٤٨٦)، ومسلم (الصحيح) (١١٧٦)، والترمذي (السنن) (٢٩٦٢)، والنسائي (السنن) (٢٤٢/١)، وابن ماجه (السنن) (١٠١٠).

(٦٥١) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٤٠٣)، ومسلم (الصحيح) (١١٧٨)، وأحمد (المسند) (١٦/٢)، والترمذي (السنن) (٣٤١)،والنسائي (السنن) (٦١/٢) (٦٧٢)، ابن حبان (الصحيح) (١٧١٥).

دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکانیدا کە ڕووی دەکردە کەعبە، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەو برایانەمان کە مردن وەلە نوێژەکانیاندا ڕوویان دەکردە (بیت المقدس) خوای گەورەش ئەوەی دابەزاند: ﴿.......وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ .......﴾ (البقرة ١٤٣) (واتە: نوێژەکانیان بەفیڕۆ نەچوون و هەمووی قبووڵ کراون)[٦٥٢].

## غەزای بەدری گەورە

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر کوشتنی عومەیری حەزرەمیدا، لە ئەبو سوفیان بە خۆی و کاروانێکی بازرگانی گەورەی قوڕەیشەوە، لەگەڵ حەفتا سواردا لە تیرەکانی قوڕەیش بەیاوەری مەخرەمەی کوڕی نەوفەل و عەمری کوڕی عاص بەمەبەستی بازرگانی کەوتنە ڕێ بەرەو شام.

کاروانە بازرگانییەکە هەموو سامانی دانیشتوانی شاری مەککەی تیابوو وەك دەڵێن لەهەزار بار وشتر پێکهاتبوو [کە مەزەندە دەکرا بە پەنجا هەزار دیناری زێڕ][٦٥٣] چونکە هەموو کەسێکی قوڕەیش پارەی کەم بوو بێت یان زۆر بەسامان بەشداری کردبوو لەکاروانەکەی ئەبوسوفیاندا تەنها (حومیطیبی کوڕی عەبدعوزا) نەبێت بۆیە دواکەوت لەجەنگی بەدرو ئامادە نەبوو.

هەواڵی ئەم کاروانە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ کەپێشتر جەنگ هەبوو لە نێوانیاندا، پێغەمبەریش ﷺ عەدی کوڕی ئەبو زەغبائی ئەنصاری لەگەڵ بەسبەسی کوڕی عەمری نارد بۆ چاودێری کردنی کاروانەکە و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەری، هەر دوو چاودێرەکە بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی جوهەینی نزیك قەراغی دەریا و پرسیاریان لە دانیشتوانەکەی کرد سەبارەت بە کاروانەکە ئەوانیش هەواڵی کاروانەکەیان پێ ڕاگەیاندن، پاشان هەردووکیان گەڕانەوە شاری مەدینە و هەواڵ و زانیاریەکانیان گەیاندە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ موسوڵمانانی ئاگادار کردەوە بۆ دەرچوون ئەمەش لەمانگی ڕەمەزاندا بوو)[٦٥٤].

---

(٦٥٢) أخرجه: أحمد (٣٤٧/١)، والترمذي (٢٩٦٤)، والدارمي (السنن) (٢٨١/١)، والطبراني (الكبير) (١١٧٢٩) و أبو داود (السنن) (٤٦٨٠)، وابن حبان (الصحيح) (١٧١٧)، والحاكم (المستدرك) (٢٦٩/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ في (صحيح الترمذي) (٢٣٦٥).

(٦٥٣) أنظر: (المغازى) للواقدى (٢٠٠/١)، والذهبي (التأريخ) (ص:٣٠١).

(٦٥٤) سيرة موسى بن عقبة من اصح المغازى كما قرر ذلك العلماء منهم الإمام مالك كما في (دلائل البيهقي) (١٠١/٣)،

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ چۆنیەتی گەیشتنی هەواڵەکە بە پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە وە دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەسبەسی وەك چاودێرك نارد تا تەماشا بکات کاروانەکەی ئەبو سوفیان چی بەسەر هات، بەسبەس گەڕایەوە و تەنها من و پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەدا بووین هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند، پێغەمبەریش ﷺ هەواڵەکەی لای یەکێك لە خێزانەکانی درکاند و چووە دەرەوەو فەرمووی: ((إنَّ لَنا طَلِبَةً، فمَن كانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا فَلْيَرْكَبْ معنَا))[٦٥٥]. واتە: ئێمە بەدوا گەڕانێکمان هەیە هەر کەسێك وڵاخەکەی ئامادەیە با سەرکەوێت و لەگەڵماندا بێت).

لەڕیوایەتێکی تردا ڕوونی دەکاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوای گەیشتنی هەواڵەکە ڕاوێژ بەموسوڵمانان دەکات و پرس و ڕایان وەردەگرێت بەتایبەت ئەنصارییەکان چونکە ئەوان بەگوێرەی گفتی عەقەبە و پەیمان نامەی مەدینە تەنها پابەندن بەپارێزگاری کردن لە پێغەمبەر ﷺ لەناو شاری مەدینە.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە هەواڵی گەڕانەوەی کاروانە بازرگانیەکەی ئەبو سوفیانی پێ گەیشت ڕاوێژی بەهاوەڵانی کرد. ئەبو بەکر ﷺ هەستا و هەڵویستی خۆی ئاشکرا کرد لەگەڵ عومەردا پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕان، ئینجا سەعدی کوڕی عوبادە هەستا و وتی: ئێمەت مەبەستە ئەی پێغەمبەری خوا؟ سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە گەر فەرمانمان پێ بکەیت بچینە ناو دەریاوە دەچینە ناویەوە، وەگەر فەرمانمان پێ بکەیت لەپشتی وڵاخەکانمان بدەین تادەگەینە (برك الغماد) [کە جێگەیەکە لەیەمەن]) ئەو کارە بەدڵنیاییەوە جێ بەجێ دەکەین، ئینجا پێغەمبەر ﷺ خەڵکی هاندا بۆ دەرچوون بەدوای کاروانەکەدا)[٦٥٦].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی کاروانەکەی قوڕەیشی پێ گەیشت کە لە شامەوە دەگەڕێتەوە موسوڵمانانی هاندا بۆ دەرچوون و فەرمووی: ((هذه عيرُ قُريشٍ، فيها أموالُهم، فاخرُجوا إليها، لعلَّ اللهَ يُنفِلُكُموها)) واتە: ئەوە کاروانەکەی قوڕەیشە کەسامانەکانیانی تیایە بچنەدەر بۆ ڕێگەپێگرتنی بەڵکو خوای گەورە بیکاتە

ويحيى بن معين والامام الذهبي كما في (سير اعلام النبلاء (٦/١١٥-١١٧) وأنظر: (تأريخ الاسلام) للذهبي (ص:١٠٣).

(٦٥٥) أخرجه: أحمد (المسند) (٣/١٣٦)، ومسلم (الصحيح) (١٩٠١).

(٦٥٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٣/١٠٠)،ومسلم (الصحيح) (١٧٧٩).

سامانتان و دەستی بەسەردا بگیرێت. خەڵکی خۆیان ئامادەکرد هەندێکیان ویستی بەشداربوونی هەبوو هەندێکیان ویستی بەشدار بوونی نەبوو چونکە ئەوان گومانیان وابوو کە پێغەمبەر ﷺ تووشی شەڕ نایەت)[٦٥٧].

بۆ دەرچوون بۆ ئەم غەزایە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بەهەندێ لەمنداڵان نەدا بەشداری لەم دەرچوونەدا بکەن سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تەماشای عومەیری کوڕی ئەبو وەقاصی برامی کرد لەکاتی دەرچوونیدا بۆ بەدر بە بچووکی زانی، و عومەیر گریا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داو بەدەستی خۆی هەڵگری شمشێرەکەی بەقەدیەوە بەست)[٦٥٨].

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەفەرموێت: (من و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خۆمان پیشانی پێغەمبەر ﷺدا بۆ بەشداری کردن لە جەنگی بەدر بەڵام بە بچووکی زانین و ڕێگەی نەداین)[٦٥٩]. وە ڕێگەی بە ئافرەتانیش نەدا کەبەشداری لەم جەنگەدا بکەن.

دایکی وەرەقەی کوڕی نەوفەل ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ویستی دەرچوونی هەبوو بۆ جەنگی بەدر منیش پێم وت: ئەی پێغەمبەر خوا ڕێگەم پێ بدە لەگەڵتدا غەزا بکەم تا دەرمانی نەخۆشەکانتان بکەم بەڵکو خوا شەهیدیم پێ ببەخشێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قالَ : قرِّي في بيتِكِ فإنَّ اللَّهَ تعالى يرزقُكِ الشَّهادةَ ، قالَ : فَكانت تسمَّى الشَّهيدةُ)). واتە: لە ماڵەکەتدا بمێنەرەوە خوای گەورە شەهیدیت پێ دەبەخشێت، دوا جار پێیان دەوت شەهیدە تا ئەوە بوو بە پلەی شەهیدی گەیشت و شەهید بوو[٦٦٠].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدا بە بەشداربوونی عوسمانی کوڕی عفان ﷺ لەو جەنگەدا لەبەر ئەوەی ڕوقیەی خێزانی زۆر ناساغ بوو. هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدا بە حوزەیفە و باوکی بەشداری لەم جەنگەدا بکەن لەبەر ئەو بەڵێنەی کە قوڕەیش لەو دووانەی وەرگرتبوو. موصعەبی کوڕی سەعد ﷺ دەفەرموێت:

---

(٦٥٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩٨/٢) (٤٨٥)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص:٢٣٣) حديث صحيح.

(٦٥٨) أخرجه:الحاكم (المستدرك) (١٨٨/٣) وصححه، والبزار (١٧٧٠)،وابن سعد (١٤٩/٣) وعزاه الحافظ في (الاصابة) (٦٠٤٣) إلى أبي يعلى والبغوي وعبد بن حميد، وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٤٤):رواه البزار ورجاله ثقات.

(٦٥٩) أخرجه: البخاري (الصحيح) (٣٩٥٦)، والطبراني (الكبير) (١١٦٦)، و الهيثمي في (المجمع الزوائد) (١٠٨/٦) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(٦٦٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣٢٦/٢٥)، وابي داود (٥٩١) وحسن إسناده الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٥٥٢).

(موشریکەکان حوزەیفە و باوکیان پێش بەدر دەستگیر کردبوو ویستبوویان بیانکوژن بەڵام ئازادیان کردبوون بەمەرجێك بەشداری لەجەنگی بەدردا نەکەن)[٦٦١].

وە لەڕیوایەتێکی تردا حوزەیفە ﷺ دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (ئەوەی ڕێگەی پێ نەدام کە بەشداری جەنگی بەدر بکەم ئەوە بوو: من و حوسەیلی باوکم دەرچوو بووین لەڕێگەدا بێ باوەڕانی قوڕەیش ئێمەیان گرت و وتیان: ئێوە بۆلای محمد دەچن؟ ئێمەش وتمان: بۆلای ئەو ناچین تەنها بۆ شاری مەدینە دەچین، ئەوانیش بەڵێن و پەیمانیان لێ وەرگرتین کە بچین بۆ مەدینە لەو جەنگەدا لەگەڵ موسوڵمانان بەشداری نەکەین، ئێمەش هاتینە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەمان بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: ((انصَرِفا نَفِي لهم بعَهْدِهم، ونَستعينُ اللهَ عليهم))[٦٦٢] واتە: بڕۆنەوە، بەڵێنەکەیان بەجێ دەهێنین و داوای پشتیوانی لەخوا دەکەین دژ بەوان.

لەم جەنگەشدا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدا بەوانە کە وڵاخەکانیان ئامادەنە بوو بەشداری بکەن، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ((هەندێك لە پیاوانی موسوڵمان داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد تا ڕێگەیان بدات بچن وڵاخەکانیان لەسەرووی شاری مەدینەوە بهێننەوە تا بەشداری لەم جەنگەدا بکەن، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ نەدان و فەرمووی: ((لَا، إلَّا مَن كانَ ظَهْرُهُ حَاضِرًا))[٦٦٣] واتە: نەخێر تەنها ئەو کەسانەی کە وڵاخەکانیان ئامادەیە. بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەی لە کەس نەگرت لەسەر بەشدار نەبوونی لەم جەنگەدا. کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (بەشداریم نەکرد لە جەنگی بەدردا، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەی لەهیچ کەس نەگرت لەبەشدار نەبوونی لەوجەنگەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ وموسوڵمان بۆ گرتنی کاروانەکە دەرچوو بوون نەك بۆ جەنگ...)[٦٦٤].

پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی لە دوانزەی ڕەمەزاندا خۆیان ساز و ئامادەکرد بۆ

---

(٦٦١) أخرجه:أحمد (٣٩٧/٥)، والحاكم (المستدرك) (٢٠١/٣)، والطبراني (الكبير) (١٦٢/٣)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢١٩١)

(٦٦٢) أخرجه:مسلم (الصحيح) (٤٦١٥).

(٦٦٣) أخرجه: مسلم (الصحيح) (١٩٠١).

(٦٦٤) أخرجه: البخاري (٤٤١٨)، ومسلم (٢٧٦٩)، وأبو داود (السنن) (٢٢٠٢)، والترمذي (السنن) (٣١٠٢)، والنسائي في (السنن) (١٥٢/٦).

دەرچوون و سەرجەم موسوڵمانان سێ سەد و نۆ تا سێ سەد و پانزە کەس دەبوون. عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەرەو بەدر دەرچوو سێ سەد و پانزە کەس لە هاوەڵانی لەگەڵدابوو)[٦٦٥]. وەلە ڕیوایەتی (أهل السيرة)دا هاتووە کە ژمارەیان سێ سەد و حەڤدە کەس بووە و هەشتاو شەش لە (مهاجرين) بوون و ئەوانی تر لە (الانصار) بوون کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سوپاکەیدا بەڕێ کەوتبوون و نزیك بوو شاری مەدینە جێ بهێڵن، پیاوێکی ئازا و بەجەرگ شوێنی کەوت و داوای کرد لەم جەنگەدا بەشدار بێت، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ نەدا تا موسوڵمان بوو ئینجا ڕێگەی پێدا و بەشداری کرد.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەرە و بەدر کاتێك گەیشتە (حرة الوبرة) پیاوێك کە ئازایەتی و بەجەرگی و قارەمانێتیان لێ باس دەکرد بەدوای موسوڵمانان کەوت و خۆی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ کاتێك بینیان دڵخۆش بوون پیاوەکە هات و بە پێغەمبەری ﷺ وت: هاتووم تا لەگەڵتاندابم و شتم دەست کەوێت؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ((تُؤْمِنُ باللَّهِ وَرَسولِهِ))؟ واتە: باوەڕت هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی؟ وتی: نەخێر پێی وت ((فَارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ)) واتە: بگەڕێرەوە کۆمەکی موشریکم ناوێت، ئینجا کابراکە ڕۆیشت و کاتێك گەیشتە لای (الشجرة) [ناوی جێگەکە] پیاوەکە دیسان گەیشتەوە بەوان وەك یەکەم جار و داوای بەشداری کردنی لە پێغەمبەر ﷺ کرد وەك یەکەم جار پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە و ڕۆیشت و گەڕایەوە، تا گەیشتە ناوچەی (البيداء) دیسان سێ بارە گەیشتەوە لای پێغەمبەر وەك یەکەم جار داوای بەشداری کردنی کرد، پێغەمبەریش ﷺ وەك یەکەم جار پێی فەرموو: باوەڕت هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی؟ ئینجا پیاوەکە لە وەڵامدا وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێدا و فەرمووی: وەرە لەگەڵمان[٦٦٦].

لەم دەرچوونەیدا پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومی دانا تا پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکات وەك دایکی باوەڕداران عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر

(٦٦٥) أخرجه: ابوداود (٢٧٤٧)، والحاكم (المستدرك) (١٤٥/٢)، والبيهقي (٥٧/٩)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٩٢/٧):حديث حسن، وحسنه أيضاً الشخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٨٦).

(٦٦٦) أخرجه: أحمد (المسند) (٦٧/٦)، ومسلم (الصحيح) (٤٦٧٧)، وأبو داود (السنن) (٢٧٣٢)، والترمذي (السنن) (١٥٥٨)، والدارمي (السنن) (٢٣٣/٢)، وابن ابي شيبة (المسند) (٣٩٥/١٢)، وابن ماجه (٢٨٣٢)، وابن حبان (٤٧٢٦) وقال محققه: صحيح على شرط مسلم وأنظر: و(سيلسيلة الاحاديث الصحيحة) (٩٣/٣) (صحيح ابى داود) (٢٣٧٢)، و (صحيح ابن ماجه) (٢٢٨٤)، و(صحيح الترمذي (١٢٦٢).

ﷺ عەبدوللای کوڕی ئوم مەکتومی نابینای لەمەدینە جێ هێشت تا پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان بکات)[٦٦٧].

وەکاتێك (پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی گەیشتنە (الروحاء) [کە لە دووری سی تا چل میل لە خۆرئاوای شاری مەدینەیە] لەوێ ئەبو لوبابە ڤاچی شکاو پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە بۆ مەدینە بۆ بەڕێوەبردنی ئیش وکارەکان)[٦٦٨].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ ئاڵاکەی دایە موصعەبی کوڕی عومەیر) (کە ئاڵایەکی سپی گەورە بوو[٦٦٩]. وە دوو ئاڵای بچووکی ڕەش لە پێشەوەی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، یەکێکیان ئاڵای موهاجرین بوو بەدەستی عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ کەپێی دەوترا (العقاب)، وە ئاڵای ئەنصاریش بەدەستی سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ بوو)[٦٧٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: کە بەدەستی سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ بوو)[٦٧١]. وەڤەیسی کوڕی ئەبو صعصەعیشی کردە سەرکاری پیادەڕەوەکان. وە لەم جەنگەدا (تەنها یەك ئەسپ سوار لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابوو ئەویش میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو)[٦٧٢].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: کە (دوو ئەسپ سواری لەگەڵدا بوو: زوبەیری کوڕی عەوام لە دەستەڕاست، و میقدادی کوڕی ئەسوەد لەدەستە چەپ)[٦٧٣]. وە لەم ڕێ ڕۆیشتنەدا موسوڵمانان تەنها ژمارەیەکی کەم وشتریان پێ بوو کە بەنۆرە سواری پشتی یەك وشتر دەبوون.

---

(٦٦٧) أخرجه: أحمد (المسند) (١٩٢/٣)، عبدالرزاق (المصنف) (٣٨٢٩)، وابي داود (السنن) (٥٩٥)، وابن حبان (الصحيح) (٢١٣٥) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وحسن إسناده ابن الملقن في (خلاصة البدر) (٦٦١)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٥٥٥).

(٦٦٨) أنظر:(السيرة) لابن هشام (٢٠٣/٢)، والحاكم (٦٣٢/٣).

(٦٦٩) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٠٣/٢)

(٦٧٠) أخرجه:الترمذي (السنن) (١٦٨١), وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢١٠٠).

(٦٧١) أخرجه الطبراني (الكبير) (١٢٠٨٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٠٣٣) رواه الطبراني وفيه مدلس، وبقية رجاله ثقات.

(٦٧٢) أخرجه: أحمد (المسند) (١٠٢٣)وقال محققه الارناؤوط:إسناده صحيح.

(٦٧٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣١)، والأموي والبيهقي كما في (البداية) (٢٦٠/٣).

عەبدوڵڵای کوڕی مسعود ﷺ دەفەرموێت: (ئێمە لە ڕێ ڕۆیشتنی بەدردا، هەموو سێ کەسێکمان بەنۆرە سواری پشتی یەك وشتر دەبووین. ئەبو لوبابە [٦٧٤] ﷺ وە عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ هەردووکیان هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بوون [کاتێك کە سەرەیان دەهات بە پێغەمبەریان ﷺ دەوت: فەرموو سواربە] ئێمە لەجیاتی تۆ دەڕۆین. (واتە: نۆرەکەی ئێمەش بۆ تۆ) پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ما أنتُما بأقوى مني علَى المشيِ ولا أنا بأغنى عنِ الأجرِ منكُما . !))[٦٧٥]. واتە: هەردووکتان لە من بە توانا تر نین لە ڕۆیشتندا، وە منیش لە ئێوە زیاتر نیم و پێویستم بە پاداشتە).

ئەمە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە ڕێ ڕۆیشتن لەگەڵ هاوەڵانیدا بەڵکو جابر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە ڕێ ڕۆیشتندا خۆی دوا دەخست، گەر بێ توانای ببینیایە دادەبەزی و لە جێگەی خۆی سواری دەکرد، یاخود لە دوای خۆیە وە لەسەر پشتی وڵاخەکە سواری دەکرد و دوعای بۆ دەکردن و بۆیان دەپاڕایەوە)[٦٧٦].

بۆ زانینی ژمارەی وشترەکان کە موسوڵمانان لەم ڕێ ڕۆیشتنەیاندا بەکاریان هێناوە بەپێی ڕیوایەتەکەی عبدوڵڵای کوڕی مسعود ﷺ کە دەفەرموێت: هەموو وشترێك سێ کەس بە نۆرە سواری پشتی دەبوون ئەوا ژمارەی وشترەکان سەد و پێنج وشتر بووە.

وەلە ڕیوایەتەکەی ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی تەنها سەد وشتریان پێ بوو)[٦٧٧]. وە لە ڕیوایەکەی ئیبنو ئیسحاقدا ﷺ دەفەرموێت: (لەو ڕۆژەدا تەنها حەفتا وشتریان پێ بوو)[٦٧٨]. پێ دەچێت ڕیوایەتەکەی ئیبنو عەباس بە هێزتر بێت. وە لەم ڕێ ڕۆیشتنەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە زەنگۆڵەکان

---

(٦٧٤) پێ دەچێت ئەمە پێش قاچ شکان و گێڕانەوەی ئەبولوبابە بێت بۆشاری مەدینە.وەك (ابن كثير) دەفەرموێت. بڕوانە (البداية) (٣٦١/٣).

(٦٧٥) أخرجه: أحمد (المسند) (٣٩٠١)، والحاكم (٩١/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٥ /٢٥٨) وفي (الدلائل) (٣٩/٣)، والبزار (١٧٥٩)، وأبويعلى (المسند) (٥٣٥٩)، والبغوي (شرح السنة) (٢٦٨٦)، وابن حبان (٤٧٣٣) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٩٦/١٠):رواه الطبري بإسناد جيد،وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٢٥٧)، و(فقه السيرة) (ص: ٢٣٤)، وحسنةه الارناؤوط في (زاد الميعاد)(٩٥/٢) و (١٧٠/٣).

(٦٧٦) أخرجه: أبو داود (السنن) (٢٦٣٩)،وصححه الشيخ الألباني في(صحيح أبي داود) (٢٢٩٨)،و (الصحيحة) (٢١٢٠).

(٦٧٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢١٠٥)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٤٣): فيه ضعف.

(٦٧٨) أنظر):السيرة) لابن هشام (٢٠٤/٢).

لە ملی وشترەکان بپچڕێنرێت، وەك عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ (لە ڕێ ڕۆیشتنی) بەرەو جەنگی بەدردا فەرمانی کرد کە زەنگۆڵەکان بپچڕێنرێت] ولێ بکرێنەوە لە ملی وشترەکان)[٦٧٩].

ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە فریشتەکانی خوایان لەگەڵدابن، وەك ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ((لا تصحَبُ الملائكةُ رُفْقةً فيها جَرَسٌ))[٦٨٠] واتە: فریشتەکان هاوڕێیەتی کاروانی پیادەڕەوێك ناکەن کە زەنگۆڵە بە ملی ئاژەڵەکانیانەوە بێت.

## وریایی و ئاگا لە خۆبوونی ئەبو سوفیان و دەربازکردنی کاروانەکە

ئیبنو عباس ﵁ دەفەرموێت: (ئەبوسوفیان کاتێك کەنزیك بووەوە لە ناوچە بەرزایەکانی (الحجاز) بە وریاییەوە دەڕۆیشت و هەواڵی کۆدەکردەوە و هەر کەسێکی پێ بگەیشتایە پرسیاری لێ دەکرد لە ترسی هەواڵەکانی خەڵکی، تا هەواڵێکی لەلایەن هەندێك سوارەوە پێ گەیشت: کە محمد خۆی و هاوەڵانی ئامادە و سازکردووە بۆ تۆ و کاروانەکەت، ئیتر زۆر بەوریایی یەوە دەڕۆیشت))[٦٨١].

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەڕێ ڕۆیشتنەکەیدا لەچاڵاییەکانی مەدینەوە بەڕێ کەوت تا گەیشتە (العقيق)، ئینجا (ذی الحليفة)دا سەرکەوت بەرەو ناوچەی (اولات الجيش) و بەسەر (تربان) و (ملل) و(غميس الحمام)ی ناوچەی وردە بەردەکانی (اليمام)دا ، و پاشان بەسەر ناوچەی (السيالة) بەرە و شیوی (الروحاء)، بەسەر ناوچەی (شنوكة)دا ڕۆیشت تاگەیشتە بیری (سجج)ی ڕەوحاء، و پاشان لەوێوە بەڕێ کەوت تا گەیشتە ناوچەی (المنصرف) لەدەستە ڕاستی ڕێگەی شاری مەککەوە بەسەر (النازية)دا ڕۆیشت بە مەبەستی گەیشتن بە مەرزی (بدر) تا ئاگادار و گوێ

---

(٦٧٩) أخرجه:أحمد (١٥٠/٦)، وابن حبان(٤٦٩٩)وقال محققه:إسناده صحيح علة شرط الشيخين، وقال ابن كثير في (البداية (٢٦١/٣): على شرط الصحيح وقال الهيثمي في (المجمع الزوائد) (١٧٤/٥) رواه أحمد رجاله رجال الصحيح.

(٦٨٠) أخرجه: أحمد (٨٣٣٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، وأخرجه مسلم (٢١١٣،١٠٣).

(٦٨١) أنظر: (السيرة) لابن هشام (١٩٨/٢)، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (٢٣٣): حديث صحيح.

قولاغ بن لە هەواڵەکانی ئەبوسوفیان و کاروانەکەی)[٦٨٢] (ئەوە بوو بەسبەس و عەدی خۆیان گەیاندە ناوچەی (جهینة) و هەواڵیان زانی کە ئەبو سوفیان کاروانەکەی لە پاش ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دەگەنە مەرزی (بدر))[٦٨٣].

(ئەم هەواڵەشیان کاتێك دەست کەوت کە هەردووکیان گەیشتنە (بدر) و لای تەپۆڵکەیەکی نزیك ئاوەکە لایان داو مەشکۆڵەکانیان پڕکرد لە ئاو و مەجدی کوڕی عەمری جوهەنی ئەوانی بینی و ئەوان هەواڵەکەیان لە گفتوگۆی دوو ئافرەتی ئەو ناوەوە وەرگرت و پاشان گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند، ئەبو سوفیانیش زۆر بە وریاییەوە لە پێش کاروانەکەدا دەڕۆیشت تا گەیشتە ئاوەکەی بەدر، و بەمەجدی کوڕی عەمری وت: هیچ کەسێکت لەم ناوە بینیوە کەجێی گومان بێ؟ ئەویش وتی: کەسم نەبینیوە گومانم لێ ی هەبێت تەنها دوو وشتر سوار نەبێت کە لایان دایە لای ئەو تەپۆڵکەیە و مەشکوڵەکانیان پڕ لەئاو کرد ورۆیشتن، ئەبو سوفیان ڕۆیشتە جێگەی لادانەکەیان و تەرسی وشترەکانی شکاند وپشکنی و تەماشای کرد ناو کەخورمای تیایە وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئالفەکانی دانیشتووانی شاری مەدینە یە، ئەوە بوو خێرا بەرە و قەراغی دەریاکە ڕۆیشت و لە (بدر) دوور کەوتەوە)[٦٨٤].

موسای کوڕی عوقبە دەفەرموێت: (هەر لەوێدا پیاوێکی لە بەنی غیفار کەناوی ضمضمی کوڕی عەمر بوو نارد بۆ لای قوڕەیش کە زوو خۆتان ئامادە بکەن و بێن بەهانای کاروانەکەتانەوە و بیپارێزن لە محمد و هاوەڵەکانی.

[عاتیکەی کچی عەبدول موطەلیبی (پوری پێغەمبەر ﷺ پێش سێ ڕۆژ لە هاتنی ضمضم بۆ مەککە خەوێکی بینی کە ترساند بووی، ئەویش ناردی بەدوای عەباس کوڕی عەبدول موطەلیبی برایدا و پێی وت: ئەی برام، سوێند بەخوا ئەم شەو خەوێکم بینی تۆقاندمی وە ترسام کە نارەحەتی و موسیبەت ڕووبکاتە خزمانت، ئەمەی بۆت دەگێڕمەوە لای کەس مەیدرکێنە. عەباس وتی: چیت بینیوە؟ عاتیکە

---

(٦٨٢) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٠٤/٢).

(٦٨٣) أنظر: (المغازي) للواقدي (٤٠/١).

(٦٨٤) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٠٨/٢)، و(تأريخ الاسلام) (٤٠١/١).

وتی: سوارێکم بینی بەسەر وشترەکەیەوە لە (ابطح) وەستا، و پاشان بە بەرزترین دەنگی هاواری کرد: هەی غەدارەکان دەرچن بۆ جێگەی کوشتنەکانتان لە دوای سێ ڕۆژدا، خەڵکانم بینی لێی کۆبوونەوە، پاشان چووە لای کەعبەوە و خەڵکی بە شوێنیەوە دوای کەوتبوون، کاتێك ئەوان بەچوار دەوریەوە بوون وشترەکەی بەرزی کردەوە سەر کەعبە و دیسان هاواری کرد و وتی: هەی غەدارەکان دەرچن بۆ جێگەی کوشتننتان لە دوای سێ ڕۆژدا، پاشان وشترەکەی گەیاندە سەر شاخی (أبي قبيس) و هەمان هاواری دووبارە کردەوە، پاشان بەردێکی لەشاخەکەوە بەرەو خوار تلۆر کردەوە هات تا گەیشتە بنی شاخەکە پارچە پارچە بوو خانو و ماڵ نەما لە شاری مەککەدا بەشێك لەبەشەکانی بەردەکە نەچێتە ناوی.

عەباسیش وتی: بەڕاستی خەوێکی ترسناکە تۆش بۆ کەسی تری مەگێڕەوە و باسی مەکە. پاشان عەباس دەرچوو لەماڵ و گەیشت بە وەلیدی کوڕی عوتبە کە هاوڕێی بوو و خۆی پێ نەگیراو خەوەکەی لاباسکرد و داوای لێ کرد لای کەس نەی درکێنێ، وەلیدیش لای عوتبەی باوکی گێڕایە وە پاشان باسەکە لە مەککە بڵاوبووە، لە شوێنە گشتی یەکاندا باس دەکرا، وعەباس ﷺ دەفەرموێت: بەیانی زوو ڕۆیشتم تا بەچوار دەوری کەعبەدا بسوڕێمەوە تەماشا دەکەم ئەبو جەهلی کوڕی هیشام لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوڕەیش دانیشتوون و باسی خەوەکەی عاتیکە دەکەن، کاتێك ئەبو جەهل منی بینی وتی: باوکی فەضل گەر تەواو بوویت لە سوڕانەوە بە چواردەوری کەعبەوە، وەرە بۆ لامان. منیش کە تەواو بووم ڕۆیشتم تا لەگەڵیان دانیشتم و ئەبو جەهل پێی وتم: ئەی کوڕانی عەبدول موطەلیب کەی ئەم پێغەمبەرە ژنەتان تیا پەیدابووە؟ منیش وتم: کامە؟ ئەبو جەهل وتی: ئەو خەوەی کەعاتیکە بینیویەتی منیش وتم: جا چی بینیوە؟ ئەبوجەهل وتی: کوڕانی عەبدول موطەلیب هەر بەوەوە نەوەستان کەپیاوانتان بکەنە پێغەمبەر تا گەیشتە ئەوەی ئافرەتانیشتان خۆیان بکەنە پێغەمبەر، عاتیکە وای بڵاوکردۆتەوە کە ئێمە دوای سێ ڕۆژی تر دەردەچین بۆ جەنگ، ئێمەش ئەم سێ ڕۆژە لە سەرتان دەوەستین گەر وتەکە ڕاست بێت ئەوا دێتەدی، وە ئەگەر سێ ڕۆژەکە تێپەڕی و هیچ نەهاتەدی ئەوا نوسراوێکتان لەسەر دەنووسین کە ئێوە درۆزن ترین بنەماڵەی عەرەبن.

عەباس ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەخوا زۆر بایەخم بە وتەکانی نەدا تەنها ئەوە نەبێت کە نکوڵیم کرد لەوەی کە عاتیکە هیچی بینی بێت و لەیەك جیابووینەوە. ئێوارەی ئەو ڕۆژە هیچ ئافرەتێك نەما لە ئافرەتەکانی بنەماڵەی عەبدول موطەلیب هەر هەموویان لێم کۆبوونەوە و پێیان وتم: بێ دەنگ بوویت لەم تاوانبارە پیسە کە وتەی ناشیرین بە پیاوانمان بڵێت تا گەیشتە ئەوەی وتەی ناشیرین بە ئافرەتانیشمان بڵێت تۆش گوێت لێ بوو، بەڵام هیچ تورە بوونێکت نەبوو بۆ ئەوانەی گوێت لێ بوو، عەباس ﷺ دەفەرموێت: منیش پێم وتن: سوێند بەخوا من هیچ بایەخێکم بە وتەکانی نەدا. بە گەورەم نەزانی، بەڵام سوێند بەخوا دەچمەوە یەخەی پێ ئەگرم گەر دووبارەی کاتەوە تۆڵەی هەمووتانی لێ دەکەمەوە. ئەوە بوو لەبەرە بەیانی ڕۆژی سێهەمی خەوەکەی عاتیکە لە ماڵ چوومە دەر و من زۆر پەست و تورەبووم بەدوای ئەبوجەهلدا دەگەڕام تا تۆڵەی لێ بکەمەوە، چوومە لای کەعبە و بەرچاوم کەوت و بەرە و ڕووی ڕۆیشتم تا ڕێگەی پێ بگرم، چونکە ئەو پیاوێکی سووکی چاوتیژ و زمان تیژ و ڕووگرژ بوو، ئەبو جەهلم بینی لایدا بەپەلە و خێرا بەرە و دەرگای چوونە دەرەوەی مزگەوتی کەعبە دەڕۆیشت، منیش لە دڵی خۆمدا دەم وت: ئەوە چیەتی هەی لەعنەتی خوای لێ بێت بۆ وا لە ترسدا دەڕوات.

عەباس ﷺ دەفەرموێت: تەماشا ئەکەم ئەبوجەهل گوێی لە هاوارەکەی ضمضم بوو لە دەرەوە بۆیە وا خێرا دەڕوات و من گوێم لێ نەبوو بێ ئاگابووم لەو هاوارە هەموو خێرا ڕۆیشتین بەرە و هاوارەکە و تەماشا دەکەین ضمضمی کوڕی عەمری غەفاری لەناوەڕاستی شیوەکەی دەرەوەی کەعبە وەستاوە بەسەر وشترەکەیەوە و لوت و گوێی وشترەکەی هەڵقڵیشاندووە، کۆپانەکەی بە پێچەوانەوە بەستووە و یەخەی کراسەکەی دادڕیوە و هاوار ئەکات و ئەڵێت: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش، کاروانەکەتان، کاروانەکەتان سامانەکەتان لەگەڵ ئەبو سوفیانە، محمد و هاوەڵانی بۆ دەست بەسەراگرتنی دەرچوون، باوەڕناکەم پیایانا بگەن، ئەی هاوار فریاکەون، ئەی هاوار فریاکەون.

عەباس ﷺ دەفەرموێت: ئەم هەواڵە کتوپڕە وای لێ کردین من و ئەبوجەهل هەریەکەمان بیری ئەوی تری نەبێت، خەڵکانی مەککە بەپەلە خۆیان ئامادەکرد و وتیان: محمد و هاوەڵانی گومانیان وایە کە ئەمەش بارە وشترەکانی ئیبنو لحضرمیە،

نەخێر هەرگیز وانی یە سوێند بەخوا بۆیان دەردەکەوێت ئەم جارە وەك جاری پێشتر نی یە. عەباس ﷺ دەفەرموێت: بەم جۆرە سەرجەم دانیشتوانی مەککە خۆیان ئامادەکرد بۆ دەرچوون، دوو جۆر بوون هەندێکیان خۆیان دەڕۆیشتن و هەندێکیان یەکێکیان لەجیێ خۆیان دەنارد.

بەڵام ناودارەکانی قوڕەیش کەسیان دوانەکەوتن لە بەشداری کردنی ئەم جەنگە تەنها ئەبو لەهەبی کوڕی عەبدول موطەلیب نەبێت دواکەوت و عاصی کوڕی هیشامی لە بنی موغیرە لەجیێ خۆی نارد چونکە عاص چوار هەزار درهەم قەرزاری ئەبو لەهەب بوو بڕیاریدا بی بەخشێت گەر لەجیێ ئەو بۆ ئەم جەنگە بچێت).

هەموو دانیشتوانی مەککە بەبیستنی ئەم هەواڵە تۆقین و زیاتر ترسان لەخەوەکەی عاتیکە، بە هەموو وڵاخێکی چاك و خراپەوە خۆیان ئامادەکرد و ئەبو جەهل دەیوت: محمد گومانی وایە ئەوەی لە ناوچەی (نخلة)دا بەدەستی هێنا ئەم جاریش بەدەستی بێنێ بۆی دەردەکەوێت، کە ئێمە پارێزگاری لە کاروانەکەمان دەکەین یان نا)[٦٨٥]. قوڕەیشیەکان لە خۆئامادەکردنیاندا بەبیریان هاتەوە کە دوژمنێکی تریشیان لە سەر ڕێگەدایە ئەویش هۆزی بەنی بەکرە و ترسان لەم هێرشەیاندا بکەونە نێوان دوو دوژمنەوە بۆیە کەمێك ساردبوونەوە لەم کارەیاندا.

## شەیتان پەنای قوڕەیشیەکان دەدات

عوروەی کوڕی زوبێر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك قوڕەیشیەکان کۆبوون لەسەر ئەم ڕۆیشتنەیان، ئەو دوژمنایەتیەیان بە بیرهاتەوە، کە لەنێوان ئەوان و بەنی بەکردا هەیە، و نزیك بوو ئەمەش وایان لێ بکات لەم کارەیان گەڕێن و پەشیمان ببنەوە، ئەو کات ئیبلیس لە وێنەی سوڕاقەی کوڕی مالکی کوڕی جوعشمی مودلیجیدا خۆی

(٦٨٥) هذا الأثر وإن كان ضعيفاً من حيث الأسناد، ولكن أوردناه لتواتره عند اهل السير وخاصة صاحب اصح السير والمغازى (موسى بن عقبة) والاثر أخرجه: الطبري (التاريخ) (٤٢٨/٢)، والحاكم (١٩/٣)وسكت عنه الحاكم وضعفه الذهبـي، والبيهقي(الدلائل) (٢٩/٣)، وابن سعد (الطبقات) (٣٦/٨)،والطبراني (الكبير) (٨٥٩،٨٦٠)،وابن هشام (السيرة) (٢٠٠/٢) برقم (٤٨١) وضعف إسناده الحافظ في (الاصابة) (٣٤٧/٤) (١١٤٥٥)، وقال الهيثمي (المجمع) (٧١/٦): رواه الطبراني مرسلاً وفيه ابن لهيعة فيه ضعف وحديثه حسن، وقال ابراهيم العلى في (صحيح السيرة) (٢٢٧) يرتقى الحديث إلى درجة الحسن لغيره.

نیشان دان، کە سوراقە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی سەرجەم هۆزەکانی بەنی کینانە و پێی وتن: من پەناتان دەدەم لەوەی کە کینانە لە دواتانەوە هیچ کارێك بکەن، کە ئێوە پێتان ناخۆش بێت. ئەم هاندانەش ئەوەنەی تر قورەیشیەکانی جۆشدا بۆ دەرچوون دژ بە موسوڵمانان)[٦٨٦].

ئەم باسەش خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ .... ﴿٤٨﴾ ﴾ (الأنفال)واتە: کاتێك کە شەیتان کارەکانیانی لاجوان کردن و پێی وتن: ئێوە ئەمڕۆ کەس ناتوانێت بەسەرتاندا زاڵ بێت و من پشتتان دەگرم و پەناتان دەدەم.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئبلیس لەگەڵ هەندێك سەربازە شەیتانەکاندا هات بە ئاڵاکەیەوە، خۆی لە شێوەی سوراقەی کوڕی مالیکدا وە سەربازەکانی لە شێوەی پیاوانی بەنی مودلەجدا هات و بە موشریکەکانی وت: من پەناتانم و کەس نیە بتوانێت ئەمڕۆ بەسەرتاندا زاڵ بێت)[٦٨٧].

## ئەبو جەهل ئومەیەی کوڕی خەلەف هان دەدات بۆ بەشداربوون لە جەنگە بەدر

ئومەیەی کوڕی خەلەف یەکێك بوو لە سەرکردە ناودارەکانی قورەیش، کاتێك کە هاوڕێ مەدینەییەکەی کە ناوی سەعدی کوڕی مەعاذ بوو هات بۆ مەککە بۆ عەمرە کردن، بەئومەیەی ڕاگەیاند کە پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی کوشتنی ئومەیەی کردووە لە دەرەوەی شاری مەککە، ئومەیەش لەو کاتەوە زۆر ترسا و بڕیاریدا کە لە مەککە نەچێتە دەرەوە.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (....کاتێك جەنگی بەدر هاتە پێش، ئەبو جەهل خەڵکی هاندا بۆ بەشدار بوون لەم شەڕەدا وتی: ئەی خەڵکینە فریای کاروانەکەتان

(٦٨٦) أنظر: (التأريخ) للطبري (٤٣١/٢) و (السيرة) لابن هشام (٢٠٣/٢) برقم (٤٨٩) و معظم رواية عروة، عن خالته عائيشة رضي الله عنها.

(٦٨٧) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (٣٥٤/٢)، والطبري (التفسير) (١٦١٩٨) وقال محقق (الشفا) لقاضي عياض (١٥٥٤):إسناده ضعيف.

کەون، ئومەیەش پێی ناخۆش بوو لەم جەنگەدا بەشداربێت، ئەبوجەهل هات بۆلای و پێی وت: باوکی صەفوان تۆ یەکێکیت لەناودارانی ئەم شیوە (واتا: مککە) و خەڵکی هەرکات تۆ ببینن دواکەوتوویت لەم جەنگەدا، ئەوانیش دوادەکەون [هیچ نەبێت ڕۆژێك دوو ڕۆژ لەگەڵمان وەرە]، ئەبو جەهل لەگەڵیدا خەریك بوو تا قایلی کرد بەبەشدار بوونی.

ئومەیەش وتی: ناچارت کردم کەبەشداری بکەم، بەڵام سوێند بەخوا دەبێت باشترین وشتر بکڕم لە مەککەدا. (واتا: بۆ مەبەستی ڕاکردن لە جەنگدا و گەڕانەوە بۆ مەککە)، ئومەیە هاتەوە ماڵەوەو بە ژنەکەی وت: دایکی صەفوان ئامادەم بکە و کەلوپەلم بۆ بپێچەرەوە؟ ئەویش پێی وت: باوکی صەفوان بیرت چوو برا مدینەییەکەت چی پێ وتیت؟ باوکی صەفوانیش وتی: نەخێر تەنها دەمەوێت تا جێیەکی نزیك بڕۆم. کاتێك ئومەیە چووەدەر بۆ بەشداربوون لەم جەنگە، دەگەیشتە هەر لادان و جێیەك دەست بەجێ وشترەکەی دەبەستەوە [بۆئەوەی پێی بگەڕێتەوە] بەم جۆرە بەردەوام بوو تا خوای گەورە بە کوشتنی برد لە بەدردا)[٦٨٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەردەکەوێت کە ئەبو جەهل پلانێکی تر ڕێك دەخات، بۆ ناچار کردنی ئومەیە تا بەشداربێت لەم جەنگەدا، عوقبەی نارد بۆ ئابڕو بردنی ئومەیە لەناو خزمانیدا. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو نەجیح بۆی گێڕامەوە وتی: ئومەیەی کوڕی خەلەف بڕیاری دانیشتن و بەشداری نەکردنی لەم جەنگە دابوو، چونکە پیاوێکی گەورە و قورس و بەساڵاچوو بوو، عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت هات بۆلای ئومەیە لە کاتێکدا کە دانیشتبوو لەناو خزمانیدا لای کەعبە، جێ گوڵاو و بوخوردێکی پێ بوو (کە ئەمە تایبەت بوو بۆ ڕازاندنەوەی ئافرەتان) هێنای و لە بەردەم ئومەیە داینا و پێی وت: باوکی عەلی خۆت بۆن خۆش بکە، چونکە تۆ لە ڕیزی ئافرەتانی، ئومەیەش پێی وت: خوا خۆت و ئەوکارەی پێی هاتووی ڕسوای کات، پاشان خۆی ئامادەکرد بۆ بەشدار بوون لەم جەنگە)[٦٨٩].

---

(٦٨٨) أخرجه: أحمد (٤٠٠/١)، والبخاري (٣٩٥٠،٣٦٣٢)، والطبراني (الكبير) (١٤/٦)، والبيهقي (الدلائل) (٢٦/٣).

(٦٨٩) انظر: (السيرة) لابن هشام (٢٠١/٢)، و (التأريخ) للطبري (٤٣٠/٢).

ئەبو جەهل هەر بەو کارەوە نەوەستا بەڵکو (عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ و ناودارانی هۆزی (عەبدولموطلیب) و خزمانی پێغەمبەری ﷺ ناچار کرد بەبەشداربوون و ڕاپێچی شەڕەکەی کردن بە خەرجی خۆیانەوە)[٦٩٠]. لەگەڵ ئەوانەی کە بەنهێنی موسوڵمان بوو بوون.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کەسانێك هەبوون کە بە نهێنی موسوڵمان بووبوون و موشریکەکان بەزۆر ڕاپێچی شەڕی بەدریان کردن [و لەگەڵیاندا بوون و ژمارەیان زیاد دەکردن و هەندێکیان بە کوشتن چوون][٦٩١])[٦٩٢].

## دەرچوونی سوپای موشریکەکان بۆ بەدر و گەڕانەوەی هەندێکیان

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (موشریکەکان ژمارەیان نۆ سەد و پەنجا کەس بوون لەگەڵ سەد یان دووسەد ئەسپ سوار [لەڕیوایەتەکەی ئەمەویدا هاتووە: ژمارەیان شەست ئەسپ سواربوو، لەگەڵ شەش سەد قەڵغان لەسینگ بەستوو] لەگەڵ هەندێك ئافرەتی گۆرانی بێژدا، بە دەفەوە گۆرانیان بۆ ناشیرین کردنی موسوڵمانەکان دەوت. وە لەم جەنگەدا موشریکەکان ئەوانەی کە بەلایانەوە پەسەند نەبوو بەزۆر لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچیان کردبوو لەوانە: عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب، نەوفەلی کوڕی حاریس و طالب و عەقەیلی کوڕی ئەبو طالیب.

وە خەرجی و ئازوقەی سوپاکەیان دابوو بەسەر عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب و ئەبو بوختوری، بە بەشداربوونی: ئەبو جەهل، و ئومییەی کوڕی خەلەف، و سوهەیلی کوڕی عەمرو، وشەیبەی کوڕی ڕەبیعە، وعوتبەی کوڕی ڕەبیعە، و نەبیهە و مونەبیهی دوو کوڕانی حەجاج. وهەموو ڕۆژێك نۆ تا دە وشتریان بۆ خواردنی سوپاکەیان سەردەبڕی)[٦٩٣].

(٦٩٠) أخرجه: أحمد (٦٧٦) وقال الشيخ الأرناؤوط: اسناده صحيح.

(٦٩١) أخرجه:الطبري (التفسير) (٨١١٤)، والطحاوي (مشكل الاثار) (٣٦٨٧).

(٦٩٢) أخرجه:البخاري (٤٥٩٦) الطبري (التفسير) (٨١١٦).

(٦٩٣) أنظر: (تاريخ الاسلام) للذهبي (١٠٥/١) من رواية موسى بن عقبة، و(البداية) لابن كثير (٢٦٠/٣) من رواية الأموي وابن إسحاق.

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبێر و ئیبنو ئیسحاق دەفەرموون: (قوڕەیش بەڕێ کەوتن، تا گەیشتنە (الجحفة) و لەوێ دابەزین، و جوهەیم ی کوڕی صەڵتی کوڕی مەخرەمەی کوڕی عەبدول موطەلیبی کوڕی عەبدول مناف خەوێکی بینی کە هەستا لە خەو بۆی گێڕانەوە و وتی: لە خەومدا وام دەزانی کە من لە نێوان خەو و بەئاگابوون دام، تەماشام کرد پیاوێك بەسەر ئەسپەکەیەوە و وشترێکی بە دواوە بوو بەرەو ئێمە هات و وەستا و وتی: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەبو حەکەمی کوڕی هیشام و ئومەیەی کوڕی خەلەف و فلاّن کەس و فلاّن کەس کوژران (واتە: ناوی پیاوانێکی ناوداری قوڕەیشی هێنا کە لە شەڕی بەدردا کوژران)، ئینجا بینیم لەلا تەنیشتی وشترەکەیدا و بەری دایە سوپاکە و چادرێك نەما لەچادرەکانی سوپاکە خوێنی ئەو وشترەی بەرنەکەوتبێت. جوهەیم لەخەوەکەیدا بەدەم ترسەوە بەئاگا هات و بەهاوەڵەکانی وت: ئەو سوارەتان بینی کەئێستا لەبەردەممدا وەستابوو؟ (پاشان خەوەکەی بۆ گێڕانەوە) ئەوانیش وتیان: بزانە شەیتان گاڵتەی پێ کردوویت لەخەوەکەتدا، و هەواڵەکە گەیشتە ئەبو جەهل ئەویش وتی: ئەمەش پێغەمبەرێکی ترە لە کوڕانی عەبدولموطلیب [بەڕاستی درۆی بەنی موطلیب پشتان کۆکردەوە لەگەڵ بەنی هاشمدا] سبەینێ کەبەیەك گەیشتین ئەوکات دەزانن کێ کوژراو دەبێت.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرمەوێت: (کاتێك ئەبوسوفیان بۆی ڕوون بووەوە کە کاروانەکەی ڕزگار بووە، دەست بەجێ هەواڵی پاشە کشێکردنی سوپاکەی نارد بۆلای ئەبو جەهل، ئەم هەواڵەش گەیشتە سوپاکە کاتێك کە لە (الجحفة) بوون، و ئەبو سوفیان وتبووی: ئێوە بۆ ئەوە هاتوون، کە کاروانەکە و پیاوەکان و سامانەکانتان ڕزگاربکەن، خودا خۆی پاراستی ئێوەش ئیتر بگەڕێنەوە، ئەبو جەهل وتی: نەخێر سوێند بەخوا نا گەڕێینەوە تا نەچینەلای ئاوەکانی بەدر (بەدر جێگەی کۆڕینەوە و بازاڕ و مەرزی ساڵانەی عەرەب بوو، کە بۆ بازرگانی تیایدا کۆدەبوونەوە)، لەوێ سێ ڕۆژ دەمێنینەوە، و وشتر سەردەبڕین و خواردن دروست دەکەین و عەرەق و مەی تیا دەخۆینەوە، با ئافرەتە گۆرانی بێژەکان گۆرانیمان بۆ بڵێن و هەواڵی ئەم لە شکرکێشیە و کۆبوونەوەمان بگاتە سەرجەم عەرەب و لێرە بەدواوە هەتا هەتایە لێمان دەترسن لەبەر ئەوە بەردەوام دەبین لەڕۆشتنەکەماندا.

[ئەخنەسی کوڕی شورەیق ئەم کارەی پێ ناخۆش بوو ئاگاداری خزمانی کرد کە بگەڕێنەوە سەرەتا گوێ ڕایەڵی نەبوون] تا ئەخنەس پێی وتن: ئەی کوڕانی (بنی زهرة) خودا سامانەکانتان و هاوەڵەکەتان مەخرەمەی کوڕی نەوفلی ڕزگار کردووە، ئێوەش تەنها بۆ ئەم کارە هاتوون لەبەرئەوە بگەڕێنەوە و ترسنۆکیەکەی بخەنە ئەستۆی من و هیچ پێویست ناکات دەرچن و خۆتان بە فەوتان بدەن، گوێ مەگرن بۆ ئەبو جوهل. هەرهەموو (بنی زهرة) گەڕانەوە تەنها کەسێکیان لەم جەنگەدا بەشداریان نەکرد و سەرجەم گوێ ڕایەڵی ئەخنەس بوون و لەگەڵ کوڕانی بەنی عەدی کوڕی کەعبدا دوورە پەرێز بوون و هیچیان بەشدار نەبوون لە بەدردا، و طالبی کوڕی ئەبو طالب پەنادانی هەبوو لەگەڵ هەندێك لە ناودارانی قورەیش ئەویش لەگەڵ ئەوان گەڕانەوە مەککە، [کوڕانی بەنی هاشمیش ویستی گەڕانەوەیان هەبوو، بەڵام ئەبو جەهل ڕێی گرتن] وتی: [ئا ئەم کۆمەڵە نابێت لێمان جیاببنەوە تا دەگەڕێینەوە])[٦٩٤].

بەم جۆرە سوپاکەی قورەیش بەفیز و خۆنواندن و دەمارگیری و ڕکەبەرایەتیەوە دەرچوون بۆ شەڕ دژ بە موسوڵمانان وەك خوای گەورە باسی کردوون و فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الأنفال) لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بەڕەوا دەزانی و داوای سەرکەوتنیان لە خوا دەکرد و دەیان وت: ((اللهُمَّ انْصُرْ اعلى الجُنْدينِ وأَكْرِم الفِئَتَيْنِ وَخَيْرَ القبيلَتَينِ))[٦٩٥] واتە: خوایە ئێمە و محمد کاممان بەرزترین و بەڕێز ترین و باش ترینین سەرمان بخەیت.

(٦٩٤) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٠٨/٢) من رواية ابن اسحاق، والذهبي في (تاريخ الاسلام) (١٠٥/١) من رواية موسى بن عقبة، وأنظر (المغازي) لعروة بن الزبير (ص:١٣٦) وقد رتبنا الخبر بعد جمع الروايات الثلاث مع التوفيق فيما بينها.

(٦٩٥) أخرجه: ابن كثير في (التفسير) (٢٥/٣) من رواية السدى.

## پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژ دەکات لەگەڵ هاوەڵانیدا

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ گەیشتە شیوی زەفران و لەوێ لایدا، و هەواڵی سوپاکەی قوڕەیش بۆ پارێزگاری کردنی کاروانەکەیان لەوێدا پێ گەیشت[٦٩٦]. ئەبو ئەیوب ﷺ دەفەرموێت: ئەم جێگەیەش لە دووری ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پیادە ڕەویە لە مەدینەوە لەوێدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ما ترونَ في القومِ فإنّهم أُخبروا بِمُخْرَجِكُمْ)) واتە: بۆچوونتان چییە بەرامبەر قوڕەیش، چونکە ئەوان هەواڵی دەرچوونەکەی ئێوەیان پێ گەیشتووە؟ ئێمەش وتمان: نە سوێند بەخوا ئێمە توانای شەڕ و بەرەنگاربوونەوەی ئەوانمان نی یە ئێمە تەنها بۆ کاروانەکە هاتووین، پاشان فەرمووی: ڕاو بۆچوونتان چۆنە بەرامبەر قوڕەیش؟[٦٩٧] ئێمەش هەروەك پێشتر وەڵامان دایەوە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی سوپاکەی قوڕەیشی بە وردی گەیاندە موسوڵمانان، و گوێ بیستی ڕاوێژ و ڕاو بۆچوونی موسوڵمانان بوو)[٦٩٨] (ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: من شارەزاترم بە ماوەی ڕێگەکەیان، عەدی کوڕی ئەبو زەغبا هەواڵی پێدان کەئەوان لەشیوی (کذی) ین. عومەریش ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە قوڕەیشە بەفیزو لوت بەرزییەوە، هاتۆتە مەیدان سوێند بەخوا لەوکاتەی شکۆمەند بوون سەرشۆڕییان بەخۆیانەوە نەدیوە، لەوکاتەی بێ باوەڕییان بەخۆیانەوە دیوە، باوەڕیان بەخۆیانەوە نەدیوە، سوێند بەخوا ئەوان هاتوون شەڕت لەگەڵدا بکەن، تۆش خۆتی بۆ ئامادە بکە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: زیاتر باگوێم لەڕاو بۆچوونەکانتان بێت).

ئەبوبەکر ﷺ هەستاو وتەیەکی زۆرچاکی پێشکەش کرد پاشان عومەری کوڕی خەطاب هەستاو وتەیەکی زۆر چاکی وت، پاشان میقدادی کوڕی عەمر هەستاو

---

(٦٩٦) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٠٥/٢) إسناده صحيح كما في (صحيح السيرة) (٢٣٣) وفي (السيرة الصحيحة) (٣٥٨/٢).

(٦٩٧) وقد أشار الله تعالى إلى هذا بقوله: ﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦ ﴾ (الأنفال).

(٦٩٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٠٥٦)، وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٥٠): إسناده حسن، وأخرجه:أحمد (٢٣٥٦٧) وقال محققه: إسناده حسن، وحسنه ابن كثير في (البداية) (٢٧١/٣).

وتی[٦٩٩]: (ئەی پێغەمبەری خودا: بڕۆ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانەی کەخوا داوای لێ کردوویت ئێمەت لەگەڵداین، سوێند بەخوا ئێمە ئەو وتەیەت پێ ناڵێین کە بەنی ئیسرائیل بەموسایان وت: بڕۆ خۆت و خواکەت بجەنگێن ئێمە ئالێرەدا دانیشتووین، بەڵام ئێمە دەڵێین: بڕۆ خۆت و خواکەت بجەنگێن و ئێمە لەگەڵتاندا جەنگاوەرین، سوێند بەوەی تۆی ناردووە بەو ڕاستی یە، گەر بەڕۆیشتن بمان بەیت بۆ (برك الغماد) (کە جێگەیەکە لە یەمەن) بەجەنگ دێین لەگەڵتدا دژبە هەموو کەس تا دەگەیتە ئەو جێگەیە. پێغەمبەریش ﷺ بەباشی وەڵامی دایەوە و دوعای بۆکرد).

پاشان فەرمووی ((أشيروا عليَّ أيُّها النَّاسُ)) واتە: ڕاوێژ و پرس و ڕاتانم پێ بڵێن ئەی خەڵکینە، مەبەستیشی تەنها (الانصار) بوو چونکە ئەوان زۆرینەی ژمارەی مسوڵمانان بوون، وەلە گفتی عەقبەدا پێشتر بە پێغەمبەر یان ﷺ وتبوو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە هیچ بەرپرسیار نین لەوەی بەسەرت دێت تا دەگەیتە ناو خانووەکانمان، کە گەیشتیتە لای ئێمە پاراستنی تۆ لە ئەستۆمانە دەت پارێزین هەروەکو منداڵ و ئافرەتەکانمان دەپارێزین.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەترسا لەوەی کە (الانصار) وابزانێت کە سەرخستنی پێغەمبەریان ﷺ لە ئەستۆدایە تەنها دژ بەوانەی کە دێنە سەری لە ناو شاری مەدینەدا[٧٠٠]. کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە [هەندێك لە (الانصار) وتیان: پێغەمبەر ﷺ ئێوەی دەوێت ئەی کۆمەڵی الانصار سوێند بەخوا کەسی تری ناوێت تەنها ئێوە نەبێت]).

ئینجا سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ فەرمووی: سوێند بەخوا وا دەزانم کە ئێمەت مەبەست بێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((بەڵێ))[٧٠١]. سەعدیش فەرمووی: (پێ دەچێت ئەی پێغەمبەری خوا لەوە بترسێیت کە (الانصار) نەیانەوێت کۆمەکیت بکەن و بە پێویستی نەزانن لەسەر خۆیان پارێزگاریت لێ بکەن تەنها دژ بەو دوژمنەی کە دەیبیننەوە لە ناو ماڵی منداڵ و ئافرەتانیاندا، ئەوا من لەجیاتی

---

(٦٩٩) من رواية: موسى بن عقبة أنظر: (تاريخ الاسلام) للذهبي (١٠٦/١).

(٧٠٠) أخرجه: البخاري (٤٦٠٩).

(٧٠١) أخرجه: أحمد (١٠٥/٣)، ومسلم (١٧٧٩)، وابن حبان (٤٧٢٢،٤٧٢٣) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وابويعلى (٣٧٦٦)، و صحح إسناده ابن كثير في (البداية) (٢٦٣/٣).

(الانصار) وەڵامت دەدەمەوە و لە نوێنەرایەتی ئەوانەوە قسەدەکەم[٧٠٢] و دەڵێم: (سوێند بەوەی کە رێزی لێ گرتوویت و کتێبی بەسەردا دابەزاندوویت تا ئێستا بە رێگەی (برك الغمار) ی یەمەندا نەڕۆیشتووم و شارەزاییم لەبارەیەوە نییە، بەڵام بەڕۆیشتن بمان بەیت تا ئەو جێگەیە لەگەڵتدا دێین، وەك ئەوانەش نابین کەبە موسایان وت: ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤ ﴾ (المائدة) بڕۆ تۆ و خوایەکەت بجەنگێن ئێمە ئالێرەدا دانیشتووین، بەڵام ئێمە دەڵێین: بڕۆ خۆت و خوایەکەت بجەنگێن ئێمەش جەنگاوەرین لەگەڵتاندا، وە تۆ بۆ کارێك هاتیتە دەر بەڵام خوای گەورە بۆی گۆڕیت بە کارێکی تر، بڕۆ بۆ جێ بە جێ کردنی ئەو کارەی کەخوا پێی سپاردوویت، بڕۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسە ببەستە کە خۆت دەتەوێت وە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسە بپچڕە کەخۆت دەتەوێت، [بڕۆ بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆت دەتەوێت]، دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو کەسە بکە کە خۆت دەتەوێت، ئاشتی لەگەڵ ئەو کەسە بکە، کە خۆت دەتەوێت، وە ببە لە سامانەکانمان ئەوی دەتەوێت)، (وە ئەو سامانەمان بدەرێ کە خۆت دەتەوێت، وە ئەوەی لە سامانەکانمانت بردووە لامان خۆشەویستره لەوەی کە بۆت بەجێ هێشتووین).

ئێمە تۆمان بەڕاست زانیوە و باوەڕمان پێ هێناویت، و شایەتیمان داوە ئەوەی کە تۆ پێی هاتوویت ڕاست و ڕەوایە، لەسەر ئەمەش ئێمە گفت و بەڵێنمان داویتێ کە گوێت بۆ بگرین و گوێ ڕایەڵت بین، بڕۆ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو کارەی کەخۆت دەتەوێت ئێمەت لەگەڵتداین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بەوەی کە تۆی ناردووە بەو ڕاستی یە گەر پێشمان بکەویت بۆ ناو ئەو دەریایە هەر هەمووومان شوێنت دەکەوین و یەك پیاومان لێ دواناکەوێت، وە هیچ پێمان ناخۆش نییە سبەینێ بمان گەیەنیتە دوژمنەکەمان و ڕووبە ڕوویان بوەستین، ئێمە بە ئارامین لە جەنگدا، و ڕاستین لە جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا، وە بەڵکو خوا نیشانت بدات لە ئێمەدا ئەوەی کە دەبێتە مایەی دڵخۆشیت، پێشمان بکەوە و بمانبە لەسەر بەرەکەتی خوا.

پێغەمبەریش ﷺ بە وتەکەی سەعد دڵخۆش و چالاك بوو[٧٠٣] (ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی هاندا بۆ دەرچوون بەرەو بەدر) وە فەرمووی: (بەڕێ کەون مژدە بێت

---

(٧٠٢) من رواية: موسى بن عقبة كما في (تاريخ الاسلام) للذهبي (١٠٧/١).

(٧٠٣) من رواية: ابن مردوية كما في (البداية) (٢٦٤/٣).

خوای گەورە بەڵێنی یەك لە و دوانەی پێداوم، (واتە: یا کاروانەکە یا سەرکەوتن لە جەنگەکەدا) وە سوێند بەخوا دەڵێی ئێستە لە پێش چاومە جێگەی کوشتنەکانیان[٧٠٤].

(ئەبو ئەیوبی ﷺ ئەنصاری دەفەرموێت: زۆر دڵخۆش بووین بە وتەکەی پێغەمبەر ﷺ پاشان پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد تا بزانێت پێشی سوپاکەی قورەیش بە کوێ گەیشتوون و ژمارەیان چەندە؟ ئەو کەسە هاتەوە و وتی: ڕەشاییەکم بینی نەمزانی چەندن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هُمْ هُمْ، هَلِمُّوا أن نَتعادَّ)) واتە: ئا ئەوە ئەوانن، وەرن بابزانین ژمارەمان چەندە، ئەبو ئەیوب ﷺ دەفەرموێت: سەر ژمێری کراین ئێمە سێ سەد و سیانزە پیاو بووین، وە ژمارەکەمان دایە پێغەمبەر ﷺ و زۆر پێی دڵخۆش بوو وە فەرمووی: ((عِدَّةِ أصْحَابِ طَالُوتَ)) واتە: هەمان ژمارەی هاوەڵانی تالوتن)[٧٠٥] پاشان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە (ذفران) و بەرز بوونەوە بەسەر بەرزاییەکانی (الاصافر) پاشان لە وێوە شۆڕبووەوە بەلای ڕاستی تەپۆڵکە بەرزەکەی (الحنان) تا گەیشتە جێگەیەك کە پێی دەوترا (الدبه)، پاشان لە جێگەیەکی نزیك (بدر) دابەزین، و پێغەمبەر ﷺ خۆی و ئەبوبەکر سواربوون و ڕۆیشتن تا بزانن ئەو چوار دەورەچۆنە و کێی لێ یە)[٧٠٦].

## گەیشتنە شەڕگەی بەدر

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە نزیك ئاوەکانی بەدر خۆی و ئەبوبەکر ﷺ چوار دەوری ئەو جێگەیەیان پشکنی و پاشان گەڕانەوە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: [(پاشان پێغەمبەر ﷺ) و ئەبوبەکر گەڕانەوە لای هاوەڵانیان، کاتێك ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەسەردا هات، پێغەمبەر ﷺ چەند کەسێك لەهاوەڵانی کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب و زوبەیری کوڕی عەوام و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصیان لە ناودابوو، ناردنی بۆ سەر ئاوەکەی بەدر، تاهەواڵی ئەو جێگەیەی

---

(٧٠٤) أخرجه: ابن حبان (٤٧٢٢) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما.

(٧٠٥) أخرجه: الطبراني في (معجم الكبير) (٤٠٥٦) وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٠٥٩٩) وأحمد (٧٦٥٣٢) وقال محققوه: إسناده حسن، وحسنه ابن كثير في لبداية (١٧٢/٣).

(٧٠٦) رواية ابن اسحاق: أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٠٥/٢)، وصحح إسناده كل من: العمري في (السيرة الصحيحة) (٣٥٨/٢)، وابراهيم العلى في (صحيح السيرة) برقم (٢٣٣).

بۆ بهێننەوە] [عەلی کوڕی ئەبو طالیب دەفەرموێت: تەماشامان کرد موشریکەکان لە پێش ئێمەدا دوو کەسیان ناردووەتە سەر ئاوەکە یەکێکیان قوڕەیشیە ئەوی تریان خزمەتکارێکی عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیتە، قوڕەیشیەکە لە دەستمان هەڵهات و ئەوی ترمان دەستگیر کرد، کە خزمەتکارەکە بوو ئەویش کۆیلەیەکی ڕەشی بەنی حەجاج بوو]، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و دەست بەسەرا گیراوەکەمان لەگەڵ خۆمان هێناو لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدابوو]، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گرتیان و پرسیاریان لێ دەکرد: ئەبوسوفیان لەکوێیە و لەکوێ جێت هێشتن؟ ئەویش دەیوت: سوێند بەخوا هەواڵی ئەبوسوفیان نازانم، بەڵام ئەوە قوڕەیشە هاتووە: ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە وئومەیەی کوڕی خەلەفیان لەگەڵدایە، کە ئەمەی دەوت ئەوان لێیان دەدا، ئەویش دەیوت: لێم گەڕێن لێم گەڕێن تا هەواڵەکەتان پێ ڕاگەیەنم، کە وازیان لێ دەهێنا ئەویش دەیوت: سوێند بە خوا هیچ ئاگایەکم لە ئەبو سوفیان نییە، بەڵام ئەوە سوپاکەی قوڕەیشە هاتووەکە (ئەبوجەهل و عوتبەو شەیبەو ئومییەی کوڕی خەلەفیان) لەگەڵدایە، من ئاوکێشی قوڕەیشم منیان ناردووە تا لەو ئاوە یان بۆ بکێشم، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەیان پێ ناخۆش بوو وهیوایان وابوو کە ئەمە لە کاروانەکەی ئەبوسوفیان بێت).

(پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بووە و پێی فەرموون: [سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ئەو کابرایە ڕاست دەکات لەگەڵتاندا ئێوە لێی دەدەن، وە کە درۆ دەکات لەگەڵتاندا ئێوە لێی دەگەڕێن، ئەوە قوڕەیشە هاتووە تا پارێزگاری لە کاروانەکەی ئەبوسوفیان بکات] ) (ئینجا پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی و پێی وت: (ئەوان ژمارەیان چەندە)؟ ئەویش وتی: سوێند بەخوا ئەوان ژمارەیان زۆرە و زۆر بەتوانان [ئەوان لەپشتی ئەو تەپۆڵکەوەن، کە لەو سەری شیوەکەی خوارەوەیە] پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد تاژمارەکەیانی پێ بڵێت ئەو نەی درکاند، پاشان پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد و فەرمووی: ((لە هەموو ڕۆژێکدا چەند وشتر سەردەبڕن))؟ دەستگیرکراوە کە وتی دە وشتر سەر دەبڕن لە هەموو ڕۆژێکدا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ژمارەیان هەزار کەس دەبێت و هەموو وشترێك بۆ سەد کەسێك سەردەبڕن)). لەڕیوایەتەکەی عوروەی کوڕی زوبیردا: هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((القومُ ما بينَ التِّسعمائةِ

إلى الألفِ)) واتە: ئەوان ژمارەیان لە نۆ سەد وە بۆ هەزار کەسە پاشان پرسیاری لە دەستگیر کراوەکە کرد و فەرمووی: ((کێیان تێدایە لە ناودارەکانی قورەیش))؟ ئەویش وتی: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، و شەیبەی کوڕی ڕبیعە، ئەبو بوختوری کوڕی هیشام، وحەکیمی کوڕی حوزام، و نەوفەلی کوڕی خویەلید، و حارثی کوڕی عامیر، و توعەیمەی کوڕی عەدی، و نەزری کوڕی حارث، و زەمعەی کوڕی ئەسوەد، وئەبو جەهلی کوڕی هیشام، وئومییەی کوڕی خەلەف و نبیهە و مونەبهی هەردوو کوڕەکەی حەجاج، و سوهەیلی کوڕی عەمرو، و عەمری کوڕی عەبدوەدە).

پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: ((هذِهِ مكَّةُ قَد ألقَت إليكُمْ أفلاذَ كبِدِها))[٧٠٧] واتە: خەڵکی مەککە هەموو پیاوە ئازاو بەجەرگ و ناودارەکانیان بۆ ئەم شەڕە هاتوون.

پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعای سەرکەوتن و دەسکەوتی باشی کرد بۆ هاوەڵەکانی: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەیشتە بەدر (دوعای کرد) و فەرمووی: ((اللهمَّ انَّهُم جياعٌ فأَشبعهُم، اللَّهُمَّ انَّهُم حُفاةٌ فأحملهُم، اللَّهُمَّ انَّهم عراةٌ فأكسِهم)) واتە: خوایە ئەوانە برسین تێریان بکە، خوایە ئەوانە پێ پەتین سواریان بکە، خوایە ئەوانە ڕوتن پۆشتەیان بکە خودا لە بەدردا دەرگایی بەڕوویاندا کردەوە کاتی کەگەڕانەوە هەر پیاوێك بارێك یان دوو باری پێ بوو وە پۆشتەو و تێر بوون)[٧٠٨].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (سوپای قورەیش بەرێ کەوتن تا دابەزینە خوارووی شیوەکە ڕوو بە مەککە لە پشتی تەپۆڵکەکەوە، موسوڵمانانیش لای بیرە ئاوەکانی بەدر لە سەرووی شیوەکە ڕوو بە مەدینە بوون، وە ئەو شیوە هەمووی

(٧٠٧) أخرجه: (السيرة) لابن هشام (٢٠٧/٢) ومسلم في (الصحيح) (٢٧٩٩) أحمد (١١٧/١) برقم (٩٤٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح، ومسلم (١٧٩٩) وابن أبي شيبة (٣٦٢/١٤)، والبزار (٧١٩،١٧٦١)، وأبو داود (٢٦٨١)، وابن حبان (٤٧٢٢)، وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم (المستدرك) (١٨٧/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٤٢/٣)، والطبري (التاريخ) (٤٣٦/٢)، وابن هشام (السيرة) (٢٠٧/٢) واللفظ له، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٩٥٣) رجاله أحمد رجال صحيح غير حارثة و هو ثقة، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٢٢).

(٧٠٨) أخرجه: ابوداود (السنن) (٢٧٤٧)، والحاكم (المستدرك) (١٣٢/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٥٧/٩)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٣٣/٧): حسن، وحسنه ايضاً الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص: ٢٥٢)، و (صحيح ابي داود) (٢٣٨٦).

نەرمە لمی خلیسك بوو، خوای گەورە بارانێکی باراند بەسەر پێغەمبەر ﷺ و موسوڵماناندا زەوییەکەی بۆ تەخت کردن و ڕێگەی ڕۆیشتنی لێ نەگرتن، بەڵام ئەو بارانە وای لەقورەیش کرد کە نەتوانن ئەو شەوە ئەو جێگەیە بەجێ بهێڵن، بۆیە پێغەمبەرﷺ پێشیان کەوت و گەیشتە سەر نزیك ترین ئاو لە ئاوەکانی بەدر و لەوێ دابەزی)[٧٠٩] ئابەوشێوەیە کۆی کردنەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾ (الأنفال)

[لە سەرەتای شەودا موسەڵمانان بیرێکی ئاویان پاك کردەوە و ئاوەکەیان لێ هەڵدەیەنجا تا ئاوی زۆر بوو و پاشان حەوزێکی گەورەیان لێ دروست کرد و پڕیان کرد لە ئاو، و هەموو بیرە ئاوەکانی تریان پڕکردەوە][٧١٠]، وە یەکێك لەوانەی ئەم کارەیان جێ بەجێ کرد، عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ بوو کە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم کە بیرە ئاوەکانی بەدر پڕبکەمەوە)[٧١١].

لەوێدا سەعدی کوڕی موعاذ ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با کەپرێکت بۆ دروست بکەین و وشترە باشەکانمان بە کۆپانە کانیانەوە لات دابنێین، و پاشان ڕوو بەڕووی دوژمنمان دەبینەوە، گەر خوا سەربەرزمان بکات و سەرکەوتوومان بکات بەسەر دوژمنەکەماندا هەموومان دڵخۆش دەبین، وە ئەگەر ئەوی تریان بێت ئەوا لەسەر پشتی وشترەکەت سوار دەبیت و دەگەیتە ئەوانەی کە بەجێمان هێشتوون لە کەسەکانمان، بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان کەسانێك بوون فریا نەکەوتن بەشداربن لەم جەنگەدا ئەوان وەك ئێمە تۆیات خۆش

---

(٧٠٩) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢١٠/٢)، و(التاريخ) للطبري (٤٣٧/٢).

(٧١٠) أنظر: (تاريخ الاسلام) للذهبي (١٠٨/١) من رواية موسى بن عقبة، وأنظر (المغازي) لعروة بن الزبير (ص:١٣٨).

(٧١١) أخرجه: ابو يعلى (المسند) (٥٥٨)، وأخرجه: عبدالرزاق وابن جرير وصحح وصله (أنظر: منتخب كنز العمال) (١٠٠/٤).

بەڵام ئەو ڕیوایەتەی کەباس لەوە دەکات کە ئەم کارە لەسەر پێشنیارو ڕاوێژی (الحباب بن المنذر) بووە = ئەم ڕیوایەتە (لاوازە)ە و لەم سەرچاوانە هاتووە: أخرجه: ابن هشام في (السيرة) (٢١٠/٢) برقم (٤٩٥)، والحاكم (المستدرك) (٤٢٧/٣) وسكت عنه وقال الذهبي: حديث منكر ومتنه، والبيهقي (الدلائل) (٣٥/٣)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٩/٢) برقم (١٥٥٧،١٥٥٢): رواه ابن شاهين بإسناد ضعيف، وقال الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٢٤٠): إسناده ضعيف، وقال الارناؤوط في (زاد المعاد) (١٥٧/٣) في سنده جهاله.

دەوێت، وە ئەگەر گومانیان وا بوایە کە تووشی شەڕ و جەنگ دێیت هیچیان لێت دوانەدەکەوتن، ئەوان دڵسۆزن بۆ تۆ و تێدەکۆشن لەگەڵتدا و خوای گەورە بەوان دەتپارێزێت. پاشان پێغەمبەریش ﷺ ستایشی سەعدی کردو دوعای خێری بۆ کرد، کە پرەکەیان بۆ دروست کرد بۆ بۆ ئەوەی لەوێدا بێت)[٧١٢]. هەر لەو ئێوارەیەدا پێغەمبەر ﷺ شوێنی کوشتنی یەکە بەیەکەی گەورە پیاوانی قوڕەیشی نیشان دان.

وەك ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەو ئێوارەیەدا جێگەی یەکە بەیەکەی کوژراوانی قوڕەیشی نیشان دەداین، و دەیفەرموو: ((هذَا مصرعُ فلانٍ غَدًا إنْ شاءَ اللهُ)) [وَ وَضَعَ يَدَه على الأرضِ])[٧١٣] واتە: ئەوە جێگەی کوشتن و لاشەی فلان کەسە بەیانی گەر خوا ویستی لێ بێت، و دەستی دادەنا لەجێگەکەدا. لەو شەوەدا بارانەکە هەر بەردەوام بوو، خوای گەورە کردیە پاککەرەوەی موسوڵمانان و لابردنی ختوورەی شەیتان لە دڵیاندا و لێیان خواردەوە و بووە مایەی ورە بەرزییان، ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ ﴾ (الأنفال).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (..موسوڵمانان لەوێدا دابەزین و لاوازیەکی زۆر رووی تێ کردبوون، وشەیتان خەیاڵات و گومانی خراپ و قینی خستبووە دڵیانەوە... خوای گەورە ئەو شەوە بارانێکی زۆری بەسەردا باراند، و موسوڵمانان تێر ئاویان لێ خواردەوە، و خۆیانیان پێ پاك کردەوە، و خوای گەورە خەیاڵات و گومانی پیسی شەیتانی لێ دوور خستنەوە و لمی زەویەکەی پێ ڕەق کردو موسوڵمانان و ئاژەڵەکانیان دەیان توانی بەسەریدا بڕۆن)[٧١٤].

پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە نەخەوت و هەر دوعای دەکرد، وەك ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (((لەو شەوەدا) بارانمان بەسەردا باری و هەموومان خۆمان خستە ژێر درەختە (کوڵەکان) و قەڵغانەکانمانەوە لە تاو بارانەکە، وە ئەو شەوە پێغەمبەر ﷺ بێدار بوو شەوی خستە سەر ڕۆژ و نەخەوت

---

(٧١٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢/٢١١)، والطبري (التاريخ) (٢/٢٤٠)، والبيهقي (الدلائل) (٣/١١٢)، وله شاهد عند البخاري برقم (٣٩٥٣).

(٧١٣) أخرجه: مسلم (٧١٥١).

(٧١٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٢٢٥٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣/٧٨)، أبو نعيم في (دلائل النبوة) (٤٠٠).

و هەر دوعای دەکرد و دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ إنْ تُهلك هذهِ الفئةَ لاتُعبَد))[٧١٥] واتە: خوایە گەر ئەم کۆمەڵە لە ناوبەریت نا پەرستریێت [لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئەو شەوە هەموومان خەومان لێ کەوتبوو تەنها پێغەمبەر نەبێت ﷺ کە لەژێر درەختێکدا شەو نوێژی دەکرد و دەگریا تا ڕۆژ بووەوە]).

کاتێك بەرە بەیان نزیك بووەوە و کاتی نوێژی بەیانی هات بانگی کرد: نوێژەکانتان ئەی بەندەکانی خوا. موسوڵمانانیش لە ژێر کوڵە درەختەکان و قەڵغانەکانیانەوە هاتن و پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بۆ کردن بۆ نوێژی بەیانی و هانی دان بۆ جەنگەکە و فەرمووی: ((کۆمەڵەکەی قوڕەیش لەژێر ئەو سورایەی لای بەرزاییەکەوەن))[٧١٦].

ئەم بەرە بەیانی یەش، بەیانی ڕۆژی جومعەی حەقدەی ڕەمەزان بوو[٧١٧] پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی ڕیز کرد بۆ جەنگ، وەك ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك گەیشتین بە قوڕەیش لە ڕۆژی بەدردا ڕیزبووین، هەندێك جەنگاوەرمان پێش ڕیزەکە کەوتبوون، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کردن و فەرمووی: ((مَعِي مَعي))[٧١٨] واتە: (وەرنە ناو ڕیزەکە و لەگەڵ من بن).

ئینجا ئەو بەیانیەش قوڕەیشیەکان هاتن بەرە و گۆڕەپانی شەڕەکە بە خۆبەزل زانین و بەفیزەوە، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (قوڕەیش کە بەیانی ڕۆژ بووەوە بەڕێ کەوتن بەسەر تەپۆڵکەکەدا هاتنە خوارەوە بەرە و شەڕگەی بەدر، کاتێك

---

(٧١٥) أخرجه: أحمد في (المسند) (١١٧/١) رقم (٩٤٨) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح، ومسلم في (الصحيح) (١٧٩٩) وإبن أبي شيبة في (مصنف) (٣٦٢/١٤)، والبزار في (المسند) (١٧٦١)وأبو داود في (السنن) (٢٦٨١)، وإبن حبان في (الصحيح) (٤٧٢٢) وقال محققه إسناده صحيح على شرط مسلم، والحاكم في (المستدرك) (١٨٧/٣)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٤٢/٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن أبي داود) (٢٣٢٢) والطبري التأريخ (٤٣٦/٢) وابن هشام (٢٠٧/٢).

(٧١٦) أخرجه: أحمد في (المسند) (١٢٥/١) رقم (١٠٢٣) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح، وإبن أبي خزيمة في (المسند) (٨٩٩) وابن أبي شيبة (٣٦٦٦٨)، وأبو يعلى في (المسند) (٤١٢)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٣٦٦٦٧)، وإبن حبان في (الصحيح) (٢٢٥٧) وقال محققه إسناده صحيح وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (٥٤٦) وصححه الشيخ مقبل في (صحيح المسند) (٩٨٨).

(٧١٧) أخرجه: أحمد (٢١٣٢) وقال محققه: إسناده ضعيف، وابن أبي شيبة (٣٦٦٥٣)، والطبراني (الكبير) (١٢٠٨٣)، والبزار (١٧٨٣).

(٧١٨) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٢/٥) (٢٣٥٦٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وحسنه ابن كثير في (البداية ٢٧١/٣) والطبراني (الكبير) (٤٠٥٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٥٠): إسناده حسن.

پێغەمبەر ﷺ چاوی پێ کەوتن دوعای کرد و فەرمووی: ((اللّهم هذهِ قريش قد أَقبَلَت بخُيَلائِها، وفَخرِها تحادُّك وَتكذّبُ رسُولَك. اللّهمَّ فَنَصرُك الّذي وَعَدتني بِهِ اللهم أحنِهم الغداة))[٧١٩]. واتە: خوایە ئەوە قورەیشە واهات بەفیز و خۆبەزل زانینەکەیەوە دژایەتی تۆ دەکات و پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخاتەوە، خوایە داوای سەرکەوتنەکەت دەکەم، کە بەڵێنت پێ داوم، خوایە ئەم بەیانیە کەچ و خواریان بکەیت (واتە: سەرشۆڕیان بکەیت. قورەیش هاتن و لە شەڕگەکە دابەزین و کەسانێکیان بەرە و حەوزەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتن تا لێی بخۆنەوە کە حکیمی کوری حوزام یان لە ناو دابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لێیان گەڕێن)) تا هاتنە سەرحەوزەکە و کەوتنە ئاو خواردنەوە، ئینجا موسوڵمانان پەلاماریان دان ئەوەی لە حەوزەکەی ئاویان خواردەوە کوژران تەنها حکیمی کوڕی حوزام نەبێت دەرباز بوو نەکوژرا، و پاشان (واتە: دوای چەند ساڵێك) باوەڕی هێناو موسوڵمانێکی چاك دەرچوو، هەرکاتێك سوێندی قورسی بخواردایە دەی وت: نا سوێند بەوەی کە ڕزگاری کردم لە ڕۆژی بەدردا).

لەو کاتەشدا ئاوکێشی موسوڵمانان لە حەوزەکە جابر بوو، وەك خۆی دەی گێڕێتەوەو دەفەرموێت: ( من ئاوم دەگێڕا بەسەر هاوەڵانمدا لە شەڕی بەدردا)[٧٢٠].

## دووبەرەکایەتی لەناو قورەیشدا

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (قورەیشیەکان دابەزین بۆ شەڕ و خۆیان ئامادەکرد و عومەیری کوڕی وەهبیان نارد و پێیان وت: سەر ژمێریەکی هاوەڵانی محمدمان بۆ بکە؟ عومەیریش لە دوورەوە بە ئەسپەکەیەوە بە دەوری موسوڵمانانلدا گەڕا و پاشان گەڕایەوە بۆ لایان و پێی وتن: ژمارەیان سێ سەد پیاو دەبێت یان کەمتر یان کەمێك زیاتر، بەڵام چاوەڕێم کەن تا تەماشا بکەم (کەمین) و هێزی تریان لە پشتەوەیە، ڕۆیشت بە خێرایی ئەم سەر و ئەو سەری شیوەکە گەڕا وهیچی نەدی و گەڕایەوە لایان و پێی وتن: هیچم نەبینی، بەڵام ئەی کۆمەڵی قورەیش بینیم بەڵاکان (واتە: وشترەکان) نارەحەتیەکانیان هەڵگرتووە ئەوەش وشترەکانی

---

(٧١٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢١١/٢)، والطبري (التاريخ) (٤٤٠/٢)، وعروة في(المغازي) (ص: ١٣٩)، والبيهقي (الدلائل) (١١٢/٣) الطبراني (الكبير) (١١٦/٣) برقم (٣٠٧١)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٣٨٤/٩) رواه الطبراني ورجاله ثقات.

(٧٢٠) أخرجه: أبو داود (السنن) (٢٧٣١)، وقال الحافظ في (الاصابة) (١٠٢٢) و(الفتح) (٢٩٢/٧): إسناده صحيح، وصححه أيضاً الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٧١).

مەدینەیە کە مردنی یەك جاریان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، ئەوان کەسانێکن کە هیچ پەناو پاسارێکیان نیە تەنها شمشێرەکانیان نەبێت، سوێند بەخوا من وا ئەزانم، کە ئێوە ناتوانن پیاوێکیان لێ بکوژن تا پیاوێکتان لێ نەکوژن، ئەگەر ئەوان بەوێنەی ژمارەی خۆیان لە ئێوە کوشت چ خۆشییەك لە ژیاندا هەیە لە دوای ئەوە، لەبەر ئەوە باش بیرلەم کارەتان بکەنەوە.

کاتێك حەکیمی کوڕی حوزام گوێی لەم قسانە بوو بە ناو سوپاکەدا ڕۆیشت[٧٢١]. تاخۆی گەیاندە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و (پێی وت: دەتەوێت گەورە و سەروەری قوڕەیش بیت هەتا لە ژیاندا یت؟ عوتبە وتی: چ کارێك ئەنجام بدەم بۆ ئەوە؟ وتی: هەردوولا (واتە: هەردوو سوپاکە) لەیەك دوور بخەرەوە و خوێنەکەی ئیبنو حەفرەمی وشتر و کەل و پەلەکانیان ببژێرە، چونکە ئەوان تەنها لە تۆڵەی ئەوەدا هاتوون دەجەنگێن دژ بە محمد.

عوتبە وتی: بەڵێ باش ئەو کارەم جێبەجێ کرد، وتم قسەکانت زۆر باشە، و تۆش بەناو خزمانتا بگەڕێ و پێیان ڕابگەیەنە کە ئەو شتانە لە ملی من و هەموویان دەبژێرم. حەکیم بەجیا بە ناو ناودارانی قوڕەیشدا گەڕاو هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندن. عوتبەش بەجیا سواری وشترەکەی بوو بە ناو ڕیزەکانی قوڕەیشدا دەڕۆیشت دەیوت: ئەی خەڵکینە گوێ ڕایەڵیم بکەن لەو پیاوە گەڕێن و وازی لێ بێنن [ئێوە سوێند بەخوا هیچ سودێکتان دەست ناکەوێت لە جەنگ کردن و ڕوو بەڕوو بوونەوەتان لەگەڵ محمد و هاوەڵانی]دا، ئەگەر ئەو پیاوە درۆزن بوو بە دەستی کەسانی عەرەبی تر جگە لە ئێوە دەکوژرێت، چونکە لە ڕیزی هاوەڵانی محمددا پیاوانێکی تێدایە کەخزمی نزیکی ئێوەن، گەر ئەوان بەدەستی ئێوە بکوژرێن، ئەوا بەردەوام پیاو لە ناو ئێوەدا دەبێت تەماشای بکوژی براکەی و کوڕەکەی و برازاکەی و ئامۆزاکەی بکات، ئەمەش ڕق و کینەو دوو بەرەکایەتی لە ناو ئێوەدا دروست دەکات.

وە ئەگەر ئەو پیاوە (پێغەمبەر ﷺ بووە پاشان، ئێوەش لە سامانی براکەتاندا بەشدار دەبن، وە ئەگەر پێغەمبەر بوو با بەدەستی ئێوە نەکوژرێت و هەتا هەتایە بەم کارە ناشرین نەبن، وە ئێوە ناتوانن بگەنە ئەوان هەتا ئەوەندەی ژمارەی

---

(٧٢١) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢١٢/٢) وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٣٥٩/٢) إسناده جيد.

خۆیانیانتان لێ نەکوژن، وە من دڵنیانیم لەوەی بگەڕینەوە سەرتان و سەربکەون بەسەرتاندا [بۆیە بگەڕینەوە و دەرچن لە نیوان محمد و عەرەبدا] [ئەبو جەهلیش حەسودی گرتی لە قسە جوانەکانی عوتبە] حەکیم دەڵی: پاشان پێی وتم: بڕۆ ئەوە بە ئەبو جەهل ڕاگەیەنە، چونکە تەنها لەو دەترسم ئاگری شەڕەکە خۆش بکات. حەکیم دەڵێ: چووم تا خۆم گەیاندە ئەبوجەهل و بینیم وا قەڵغانی سنگی لە توێشەبەرەکەی دەردەکاو پاکی ئەکاتەوە و ئامادەی دەکات پێم وت: ئەبو حەکەم عوتبە منی ناردووە بۆ لای تۆ و ئەو ئەوەت پێ ڕادەگەیەنێت، و قسەکەیم بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: سوێند بەخوا هەناسەی سوار بووە لەترسدا کە محمد و هاوەڵانی بینیوە. نەخێر وەڵڵا ناگەڕێینەوە تاخوا یەك لایی ئەکاتەوە لە نێوان ئێمە و محمددا، عوتبە ڕاست ناکات لەو قسانەیدا وا دەزانێت محمد و هاوەڵانی وشتر قوت دەدەن، و کوڕەکەی خۆی لەناویاندایە دەترسێت شتێکی بەسەر بێت)[٧٢٢].

عوتبە بەسەر پشتی وشترەکەیەوە بەسەر سوپاکەدا دەگەڕاو وتەکانی خۆی پێ ڕادەگەیاندن و هەر لە دوورەوە دیاربوو: عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەفەرموێت:

(کاتێك موشریکەکان نزیك کەوتنەوە و بەڕیز لە ڕوویاندا وەستاین بینیمان پیاوێکیان بەسەر وشترێکی سوورەوە بەسەریاندا دەگەڕا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يا عليُّ نادِ لي حمزةَ)) واتە: عەلی حەمزەم بۆ بانگ بکە، چونکە حەمزە لە پێشەوە بوو وە نزیکترین کەس بوو بەوان. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((پێی بڵێ (واتە: حەمزە) کێیە خاوەنی ئەو وشترە سوورە و چیان پێ دەڵێت؟)) [گەر ئەوان گوێ ڕایەڵی بکەن سەرفراز دەبن][٧٢٣]))؟

کاتێ حەمزە هات و فەرمووی: ئەوە عوتبەی کوڕی ڕبیعەیە، داوایان لێ دەکات نەجەنگێن و شەڕ نەکەن، وپێیان دەڵێت: ئەی کەسانم، ئەوان کەسانێکی خۆڕاگرن بەسەلامەتی و بێ زیان ئێوە ناگەنە ئەوان، ئەی خەڵکینە ئابڕوو چوونەکەی بخەنە

(٧٢٢) أخرجه: ابن أبي شيبة (٣٦٦٦٧)، و الذهبي (التأريخ الاسلام) (١٠٩/١) من رواية موسى بن عقبة والبزار (١٧٦٢)، وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٥٤): رواه البزار ورجاله ثقات، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٣٥٩/٢)، الطبري (التأريخ) (٤٤٣/٢) بسند حسن.

(٧٢٣) أخرجه: أحمد (١١٧/١) برقم (٩٤٨) وقال محققه الارناؤوط:إسناده صحيح، والبزار (٧١٩)، وأبو داود (٢٦٦٥)، والبيهقي (الدلائل) (٢٧٦/٣)، وابن حبان (٤٧٢٢) وقال محققه: إسناده صحيح.

ئەستۆی من و بڵێن: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ترسنۆك بووە، خۆتان باش دەزانن کەمن لە هەموتان ترسنۆك ترنیم[٧٢٤] [ئەی خەڵکینە گوێڕایەڵیم بکەن مەجەنگێن لەگەڵ ئەوان، ئەگەر ئەوان بەشەڕبێن و ئەم جەنگە ئەنجام بدەن بەردەوام ڕق و تۆڵەی ئەم ڕۆژە لەدڵتاندا دەمێنێتەوە، تا هەموو پیاوێك تەماشای بکوژی براکەی، و بکوژی باوکی دەکات، ئەم ئابڕوو چوونەی گەڕانەوەیە بدەنە پاڵ من و بگەڕێنەوە].

ئەبو جەهل گوێی لەم وتانەی عوتبە بوو لێی نزیك بووەوە و پێی وت: تۆ ئەوە دەڵێیت ئەگەر هەر کەسێکی تر جگە لە تۆ ئەوەی دەوت دەمزانی چی پێ دەڵێم تۆ تەواو تۆقیویت لەوان. عوتبەش پێی وت: ئەوە لەگەڵ منتە ئەی ئەو کەسەی هێشتا زەردی بە خوارتەوە هەیە، ئەمڕۆ دەزانیت کاممان ترسنۆکین و[زیان بەخشین بەکەسەکانمان، بەڵام ئەمڕۆ دەتان بینم چۆنتان لێ دەدەن نابینن سەریان وەك مار وایە، و ڕوخساریان وەك شمشێر تیژە][٧٢٥] .

حەکیمی کوڕی حوزام دەڵێت: (لە پاش ئەم مشتومڕە ئەبو جەهل ناردی بۆلای عامری کوڕی حەزرەمی (واتە: برای کوژراوەکە کە ناوی: عامری کوڕی حەزرەمی بوو و پێی وت: وا نزیکە تۆڵەی براکەت بە چاوی خۆت ببینیت ئەوەتا هاوپەیمانەکەت دەیەوێت خەڵکی نەجەنگێن و بیان گەڕێنێتەوە، هەستە داوای پەیمان و تۆڵەی براکەت بکە، عامریش هەستاو خۆی نیشان دان و هاواری کرد: کوا تۆڵەی عەمر، کوا تۆڵەی عەمر، بەبیستنی ئەم هاوارە هەموو تەنگەتاو بوون کۆ بوون لە سەر تۆڵە و جەنگ بڵێسەی سەند و هەموویانی تێکداو بۆچوونەکەی عوتبەی پووچ کردەوە، پاشان عوتبەش سووربوو لەسەر ئەم شەڕە و بەدوای تاسکلاوێکدا گەڕا تا بیکاتە سەری و خۆی ئامادەبکات بۆ ئەم جەنگە و دەستی نەکەوت و جەمەدانەیەکی بەست بەسەریەوە)[٧٢٦].

---

(٧٢٤) أخرجه: البزار في (المسند) (١٧٦٢)، والحاكم (١٨٧/٣) وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٩٥٤) رجاله ثقات، وحسن إسناده صاحب (صحيح السيرة) (٢٣٦).

(٧٢٥) في رواية البزار (١٧٦٢)، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٩٩٥٤): رواه البزار ورجاله ثقات، أخرجه الحاكم في (المستدرك) (١٨٧/٣) وحسّن إسناده صاحب (السيرة) برقم (٢٣٦).

(٧٢٦) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢١٤/٢)برقم (٤٩٧)، (التاريخ) للطبري (٤٤٢/٢)، و (البداية) لابن كثير (٣٣٠/٣،٣٢٩).

## ڕێنمووی کردنی موسوڵمانەکان و ئامادەباشیان بۆ جەنگ

پێغەمبەر ﷺ لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە، موسوڵمانانی ئاگادار کردەوە کە دەست بپارێزن لەوانەی کەچاکەیان هەبووە بۆیان و بە زۆر پەلکێشی شەڕەکە کراون و بەبێ ڕەزامەندی خۆیان ڕاپێچ کراون[٧٢٧] لەوانە بەنی هاشم و بەنی موطلیب و عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب، و ئەبو بوختوری کوڕی هیشام و کەسانی تر، وەك عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەی گێڕێتەوە و دەفەرموێت: (لەو ڕۆژەی بەدردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من استطعتم أن تأْسِروا من بني عبدِ المطلبِ فإنَّهم خرجوا كُرْهًا)) واتە: ئەوەی توانیتان دەست گیری بکەن لە کوڕانی بەنی عەبدو موطلیب ئەوانە دەستگیر بکەن، چونکە ئەوان بە زۆر هێنراون بۆ ئەم جەنگە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ چەند وشەیەکی ناو نیشانی دانا بۆ هاوەڵانی تا یەکتری پێبناسنەوە لەکاتی تێکرژاندا، عوروەی کوڕی زوبەیر دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە شەڕی بەدردا، وشەی نهێنی (یا بَني عبد الرحمن) ی بۆ (مهاجرين) داناو، وشەی (یا بني عبيدالله)ی بۆ ئەوس داناو، وشەی (یا بني عبدالله) ی بۆ خەزرەج دانا...)[٧٢٨].

وە بۆ زیاتر هاندانی هاوەڵانی، بڕیاری ئەوەیدا کە هەر کەسێك دەست بەسەر هەر سامانێکی بێ باوەڕاندا بگرێت ئەوە بۆ خۆیەتی، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَن قتَلَ قَتيلًا فله كذا وكذا، ومَن أسَرَ أسيراً فله كذا وكذا)) وفي رواية ((مَنْ أَخَذَ شَيْئاً فَهوَ لَه))[٧٢٩]. واتە: هەر کەسێك یەکێك لەوان بکوژێت ئەوە و ئەوە بۆ ئەو دەبێت، وهەرکەسێك یەکێك لەوان بە دیل بگرێت ئەوە، و ئەوە بۆ ئەو دەبێت. تا فەرمووی: هەر کەسێك دەست بەسەر هەر شتێکدا بگرێت ئەوە بۆ خۆی دەبێت.

---

(٧٢٧) أخرجه: أحمد (٦٧٦) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح، وابن أبي شيبة (٣٦٧٠٦)، وابن أبي شيبة (٣٦٧٠٦) والبزار (١٧٦٣،٧٢٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٨٥/٦) رواه أحمد ورجاله ثقات.

(٧٢٨) أخرجه: الحاكم (١٠٦/٢) وصححه وقال الذهبي: فيه ضعيفان، البيهقي (الكبرى) (٣٦١/٦) وقال: هذا مرسل وقد روى موصولا.

(٧٢٩) أخرجه: ابوداود (السنن) (٢٧٣٨)، والحاكم (المستدرك) (٢٢١/٢)وصححه، والبيهقي (الكبرى) (٣٥١/٦)، وقال ابن الملقن في (خلاصة البدر المنير) (١٨١٦): أخرجها: ابوداود والحاكم بإسناد صحيح على شرط البخاري، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٧٧).

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ڕیزبوونیاندا لە ڕۆژی بەدردا، تووشی وەنەوز هاتن کە بەڵگەی سەرکەوتن و ئارامییە لە جەنگدا، ئەبو طەڵحە ﷺ دەفەرموێت: ((وەنەوز) (واتە: سەرەتای خەو) گرتینیەوە کاتێك ئێمە لە ڕیزەکانماندا بووین لە پێش جەنگی بەدردا، وە من یەکێك بووم لەوانەی کە ئەو ڕۆژە ئەو وەنەوزەم تووش هات و شمشێرەکەم لە دەست دەکەوتە خوارەوەو دەمگرتەوە و دەکەوت و دەمگرتەوە)[٧٣٠]. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ ..... ﴿١١﴾ ﴾ (الأنفال). واتە: کاتێك وە نەوز دەیگرتنەوە ئەمە هێورکردنەوە و ئارامکردنەوەی خوا بوو بۆتان. وە هەر لەو ڕۆژەدا و پێش شەڕەکە، خوای گەورە ژمارەی هەر دوولای لە پێش چاوی یەکتر کەم کردبووەوە، و هەردوولا یەکتریان زۆر بەکەمتر دەهاتە پێش چاو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٤٤﴾ ﴾ (الأنفال) واتە: کاتێك بەیەك گەیشتن خوای گەورە ژمارەی ئەوانی لە پێش چاوی ئێوەدا کەم کردبۆوە، وە ژمارەی ئێوەشی لەپێش چاوی ئەواندا کەم کردبۆوە بۆ ئەوەی خوای گەورە ئەو کارە جێ بەجێ بکات، کە پێشتر بڕیاری لەسەر دابوو بۆ لای خوا سەرجەمی هەموو کارەکان دەگەڕێتەوە.

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (لەڕۆژی بەدردا موشریکەکان واکەم دیاربوون لەپێش چاوماندا، تا بەهاوەڵەکەی پەنای خۆمم وت: تۆ بڵێی ئەوان حەفتا کەس بن؟ ئەویش وتی: وابزانم سەد کەس دەبن، تا (لەکۆتایی شەڕەکەدا بەدیلێکمان وت: ژمارەتان چەندبوو؟ وتی: هەزار کەس دەبووین).

لە کاتی شەڕی بەدریشدا خوای گەورە چەند ئایەتێکی دابەزاند کەموسوڵمانان هان دەدات بۆ جەنگ، وە هەڕەشەی توند و تیژ لەوانە دەکات، کە هەڵبێن لە گۆڕەپانی جەنگ و پشت بکەنە بێ باوەڕان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾(الأنفال)[٧٣١] واتە: ئەی

---

(٧٣٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٩/٤) (١٦٣٥٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح على شرطهما وقال أحمد شاكر ايضا (٢١٩٧): إسناده صحيح، وابن حبان (١٧٨٠) وقال محققه: إسناده صحيح، واللفظ لأحمد.

(٧٣١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٢٦٩)، والطبراني (التفسير) (١٢٥٣٩)، وابن ابي شيبة (٣٦٦٨٧)، والبيهقي (الدلائل) (٦٧/٣)، ورواه ابن حاتم وابن جرير كما في (البداية و النهاية) (٢٦٩/٣) وقال الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٤٣):إسناده

بڕواداران گەر بەکافران گەیشتن لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا پشتیان لێ هەڵنەکەن هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا پشتیان تێبکات (تەنها ئەوانە نەبێت کەبۆ شەڕەکە جێی خۆیان دەگۆڕن یاخود پاشەکشێ بۆ ناو کۆمەڵێك دەکەن تا باشتر بجەنگێن و کاریگەرتربن) جگە لەوانە ئەوا ئەو کەسە خۆی تووشی توڕە بوونی خوا کردووە، جێگەی دۆزەخ دەبێت و خراپ ترین چارەنووس چاوەڕێی دەکات.

ئەبو سعیدی خودری ﷺ دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾ (الأنفال) لە ڕۆژی بەدردا خوای گەورە دایبەزاند)[٧٣٢].

## نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ

هەرچەندە موسوڵمانان ژمارەی بێ باوەڕەکانیان بەکەم دەهاتە پێش چاو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ باش دەیزانی کە ژمارەیان سێ ئەوەندەی موسوڵمانەکانە، بۆیە نیگەرانی ڕووی تێکردبوو، چونکە ئەمە یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەی چەکدارییە، کە بێ باوەڕان باش خۆیانیان بۆ ئامادەکردووە بەرق و کینەی چەندین ساڵە ، کە ئەوان چاوەڕێی ڕۆژێکی ئاوایان دەکرد لە کاتێکدا کە موسوڵمانان ژمارەیان کەمە و خۆیان بۆ ڕێگرتنی کاروانەکە ئامادەکردووە نەك بۆ جەنگ لەگەڵ هەرە ئازا و ناودارەکانی قوڕەیشدا لەشەڕێکی نابەرامبەردا.

عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت[٧٣٣]: (کاتی ڕۆژی بەدر، پێغەمبەر ﷺ تەماشای موشریکەکانی کرد ئەوان هەزار پیاون و هاوەڵانیشی سێ سەد و نۆزدە پیاون، ڕووی کردە قیبلە و دەستی بەرزکردەوە کەوتە پاڕانەوە لە خوا و دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي ما وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ آتِ ما وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ إنْ تُهْلِكْ هذِهِ العِصَابَةَ مِن أَهْلِ الإِسْلَامِ

---

صحيح، وقال البوصيري (مختصر الاتحاف) (٥١٨٢)إسناده صحيح.

(٧٣٢) أخرجه: ابوداود (السنن) (٢٦٤٨)، والنسائي(التفسير) (٢٢٣) وقال محققه: صحيح، والحاكم (المستدرك) (٣٢٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٠٦).

(٧٣٣) أحمد (٣٠/١) (٢٠٨) وقال محققه: إسناده حسن، و أخرجه مسلم (١٧٦٣)، وابو داود (٢٦٩٠) والترمذي (٣٠٨٠)، والطبري (التفسير) (١٢٢٢٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٧/٣) وابن حبان (٤٧٩٣) وقال محققه حسن، وابو نعيم الدلائل (٤٠٨) وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترمذي (٢٤٦) وافقه السيرة (ص:٢٤١).

لا تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ [أبداً] [اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ ووَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ][٧٣٤])) واتە: خوایە بەڵێنەکەتم بۆ جێ بەجێ کە، خوایە بەڵێنەکەتم پێببەخشە، خوایە گەر ئەم کۆمەڵەی ئەهلی ئیسلام لە ناو بەریت هەرگیز ناپەرستریێت لە زەویدا، خوایە من داوای جێ بەجێ کردنی بەڵێن و پەیمانەکەت لێ دەکەم، خوایە گەر ویستت لێ بێت ناپەرستریێت) بەردەوام دەپاڕایەوە لە خواو دەستی بەرزکردبووە وە ڕووە بەقیبلە تاعەباکەی لە سەر هەردوو شانی کەوتە خوارەوە ئەبوبەکر هات و [دەستی گرت و پێی وت: ئەوەندەت بەسە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوندەت بەسە ئەی پێغەمبەری خوا][٧٣٥] [بەڕاستی زۆرت داوا کردەوە لە خوای خۆت][٧٣٦] ئینجا عەباکەی بۆ هەڵگرتەوە و خستیە سەر هەردوو شانی و باوەشی پیاکرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەستە هاوار کردنت لە خوای خۆت بێگومان بەڵێنەکەت بۆ جێ بە جێ دەکات.

[لەڕیوایەتێکی تردا: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا دەفەرموێت: لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ تەماشای موشریکەکانی کرد ژمارەیان زۆرە، وە تەماشای موسوڵمانانی کرد کە ژمارەیان کەمە، ئینجا دوو ڕکات نوێژی کرد و ئەبوبکر لای ڕاستیەوە وەستا، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەیدا دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ لا تَخْذلنِي، اللَّهُمَّ لا تَتْرُكْنِي اللَّهُمَّ أَنْشدك ما وَعَدتَنِي))][٧٣٧] واتە: خوایە پشتم بەرنەدەی (سەرم شۆڕنەکەیت)، خوایە بەش بەشمان نەکەیت، خوایە لێت دەپاڕێمەوە بەڵێنەکەتم بۆ جێ بەجێ بکەیت. ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە کەپرەکەیدا سەرخەوێکی شکاند، پاشان هەستاو فەرمووی: ((أَبشِرْ يا أبا بكرٍ؛ أَتاكَ نَصْرُ اللهِ هذا جِبْرِيلُ مُعْتَجِرٌ بعمامتِهِ، [آخِذٌ برَأْسِ فَرَسِهِ [يقوده] عليه أَدَاةُ الحَرْبِ][٧٣٨] علَى ثَنايا النَّقعِ ! أتاكَ نَصْرُ اللهِ وعِدَتُهُ))[٧٣٩] واتە: مژدە بێت ئەی ئەبو بەکر سەرکەوتنی خوا وا

---

(٧٣٤) أ خرجه: البخاري (٣٩٥٣).

(٧٣٥) نفس المصدر السابق.

(٧٣٦) أخرجه: أحمد (٣٢٩/١)، البخاري (٤٨٧٥).

(٧٣٧) أخرجه: سعيد بن منصور في (السنن) (٢٨٧٢).

(٧٣٨) أخرجه: البخاري (٣٩٩٥).

(٧٣٩) أخرجه: أحمد (٤٣١/٥)، وابن ابى شيبة (٣٥٤/٧)، والطبراني (التاريخ) (٤٤٨/٢)، وابن هشام (٢١٧/٢) والحاكم (٣٢٨/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٥٤/٣)، وحسنه الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (٢٤٣)، وقال العمرى في (السيرة الصحيحة) (٣٦٥/٢) أخرجه الاموى في مغازيه بإسنادحسن،وحسن إسناده الارناؤوط ايضا في (الزاد المعاد) (١٨٠/٣).

هات، ئەوە جبریلە وا (جەمەدانەکەی) بە سەریەوە پێچاوە (واتە: چونکە جبریل و فریشتەکان بەشێوەی ئادەمیزاد لە جل و بەرگی پیاوانی موسوڵمانانندا دادەبەزین) [و سەری ئەسپەکەی گرتووە و تاوی دەدات و بەرگ و پێویستی جەنگی پێیە و تۆز لە دوایە وە بەرز دەبێتەوە، ئەوە بەڵێن و سەرکەوتنەکەی خوا گەیشتەلات] پاشان پێغەمبەر ﷺ لە کەپرەکە هاتە دەرەوە و [قەڵغانەکەی سەرسنگی پێوە بوو][٧٤٠] دەیفەرموو: ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ٤٥﴾ (القمر)[٧٤١] واتە: ئەو کۆمەڵە دەبەزێن و هەڵدێن، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩﴾ (الأنفال) واتە: کاتێك ئێوە دەپاڕانەوە لە خوای خۆتان و پاڕانەوەکەی لێ وەرگرتن و کۆمەکی بۆ ناردن کە هەزار فریشتە بوو یەك بە دوای یەکدا. بەم جۆرە خوای گەورە فریشتەی بە کۆمەکی بۆ ناردن)[٧٤٢].

ئیبنو مەسعود ؓ سەبارەت بەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هیچ کەسێکمان نەدیوە بپاڕێتەوە بۆ مافێکی خۆی توندتر لە پاڕانەوەکەی پێغەمبەر ﷺ لە خوای خۆی لە شەڕی بەدردا، دەیفەرموو: ((خوایە داوات لێ دەکەم بەڵێنەکەتم بۆ جێ بەجێ بکەیت)) پاشان ئاوڕی دایەوە و ڕووی وەك مانگ سپی بوو و فەرمووی: ((جێگەی لاشەکانیان ئەم ئێوارەیە لەبەدردا دەبینم))[٧٤٣].

## هەوڵدانی ئەبوجەهل بۆ بەرزکردنەوەی ورەی قوڕەیش

لەم کاتەدا ئەبوجەهل هەوڵی بەرزکردنەوەی ورەی سوپاکەی دا، تا خۆڕاگرتربن لە جەنگدا، ئەوەش لە ڕێگەی پاڕانەوەی ئەبوجەهل و تێگەیاندنی قوڕەیش کە ئەوان خاوەنی حەق و ڕاستین وە هەر ئەوان سەرکەوتوو دەبن:

---

(٧٤٠) أخرجه: عبدالرزاق وابن مردوية وابن ابي حاتم وابن ابي شيبة انظر (الدرّالمنثور) (٦٨١/٧).

(٧٤١) أخرجه: البخاري (٣٩٥٣).

(٧٤٢) حديث عمر بن الخطاب (ؓ): أخرجه: أحمد (٢٠٨) وقال محققه لارنؤوط:إسناده حسن، وأخرجه:مسلم (١٧٦٣) وأبو داود (٢٦٩٠) والترمذي (٣٠٨١)،وابن حبان (٤٧٩٣)، والطبري (التفسير) (١٢٢٢٤)، والبيهقي (الدلائل) (١٣٧/٣)، وأبو نعيم (الدلائل) (٤٠٨).

(٧٤٣) أخرجه:الطبراني (الكبير) (١٠٢٧٠)، والنسائي (الكبرى) (١٠٤٤٢،٨٦٢٨)،والبيهقي (الدلائل) (٥٠/٣)،و حسن إسناده الطبراني: الحافظ في (الفتح) (٢٨٩/٧).

عەبدوللای کوڕی سەعلەبە ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك موسوڵمانەکان و موشریکەکان لەیەك نزیك بوونەوە ڕوبەڕووی یەکتر بوونەوە، ئەبو جەهلی کوڕی هیشام دەست پێشخەری کرد بۆ دوعا کردن و پاڕانەوەو وتی: خوایە کاممان پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە، و شتێکی هێناوە کە نایناسین ئەمڕۆ لاری بکەیتەوە و ژێری بخەیت [خوایە چاکترین ئەم دوو دینە [و خۆشەویسترینیان لای تۆ] ئەمڕۆ سەری بخەیت][٧٤٤] خوایە ئاینە کۆنەکەی ئێمە یان ئاینە تازەکەی محمد کامیانت لا پەسەند ترە سەری بخەیت)[٧٤٥] (خوایە یارمەتی و کۆمەکی بدەیتە سەربەرزترینی ئەم دوو لایەنە وە بەڕێزترینی ئەم دوو هۆز و کۆمەڵە وە زۆر ترینی ئەم دوو تاقمە)[٧٤٦] (ئەوە بوو ئەبوجەهل کوژرا) ئەمەش دەست پێشخەری دوعاکردنەکەی ئەبو جوهل بوو، سەبارەت بەمەش خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ .....﴿١٩﴾ ﴾ (الأنفال)[٧٤٧]. واتە: خوای گەورە دوعا و پاڕانەوەکەی ئەبو جەهلی قبوڵکرد و دینی ڕاسترین و چاکترین و بەڕێزترین وخۆشەویسترینی ئەو دوو لایەنە کە (پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بوو سەری خست و شکۆمەندبوون).

هەندێکی تر لە دانیشتوانی مەککە کە پێشتر خۆیان بە موسوڵمان ناساندبوو بۆ سەرکەوتنی کارە دووڕووەکەی خۆیان، ئەو ڕۆژە خۆیان ئاشکراکرد و توانجیان لە (پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان دا، عامر ﷺ دەفەرموێت (کەسانێکی دانیشتوی مەککە کەپێشتر خۆیان بەموسوڵمان نیشان دابوو لەگەڵ موشریکەکان لە ڕۆژی بەدردا هاتبوون دژبە موسوڵمانان کاتێك کەمی ژمارەی موسوڵمانیان بینی وتیان: ((غَرَّ هؤلآءِ دينَهم)) واتە: بەڕاستی ئەمانە ئاینەکەیان بە هەڵخڵەتاندن بردوون و بێ ئەقڵ وهۆشی کردوون. خوای گەورەش سەبارەت بەوان ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ .....﴿٤٩﴾ ﴾ (الأنفال)[٧٤٨].

---

(٧٤٤) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (١١٥/٣) عن موسى بن عقبة.

(٧٤٥) أخرجه:الطبري (التفسير) (١٢٣١٣) عن يزيد بن رومان.

(٧٤٦) أخرجه:الاموى في (المغازى) كما في (البداية) (٨٣/٣)وحسن إسناده الارناؤوط في تخريجه لـ (زاد المعاد) (١٨٠/٣).

(٧٤٧) أخرجه: أحمد (٤٣١/٥)، والطبراني (التفسير) (١٥٨٥٢،١٢٣٠٧)،والنسائي في (التفسير) برقم (٢٢١) وقال محققه: حديث صحيح، وابن شيبة (٣٦٦٦٣)، وابن هشام (السيرة)برقم (٥٠٨)، والحاكم (٣٢٨/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والواحدى في (اسباب النزول) برقم (٤٧٤)،والبيهقي (الدلائل) (٧٤/٣)، وقال العمرى في (السيرة الصحيحة) (٣٦٠/٢): إسناده صحيح من طريق الحاكم والطبري.

(٧٤٨) أخرجه: الطبري(التفسير) (١٢٥٧٢)، والطبراني (الاوسط) كما في (المجمع) (٩٩٥٨) وقال: فيه ضعيف.

## سەرەتای جەنگەکە

هەردوولا ڕیز بوون و سەرەتای جەنگەکە بەوە دەستی پێ کرد کە هەندێك لە موشریکەکان هەوڵی نزیك بوونەوەیاندا لەحەوزە ئاوەکەی موسوڵمانان تا لێی بخۆنەوەو پاشان بیرِوخێنن.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کوژراوی موشریکەکان ئەسوەدی کوڕی عەبدول ئەسەد بوو کە پیاوێکی دڕی خورەوشت ناشیرن بوو، وتی: پەیمان بێ بەخوا دەبێت لەو حەوزەیان ئاو بخۆمەوە یان بیرِوخێنم یان لەو پێناوەدا دەکوژرێم، کاتێك دەرچوو بۆ ئەم کارە حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب بۆی ڕۆیشت و لێیدا تا کوشتی ئەموی لە (المغازي) یەکەیدا دەفەرموێت: ئا لەو کاتەدا عوتبەی کوڕی ڕەبیعە گەرم بوو، ویستی ئازایەتی خۆی نیشان بدات، خۆی لەنێوان وەلیدی کوڕی و شەیبەی برای دەکرد و ڕۆیشت بۆ ناوەڕاستی گۆڕەپانی جەنگەکە ڕووبەڕووی موسوڵمانان و داوایان کرد: کێ دەوێرێت بابێتە دەرەوە بۆمان؟ سێ گەنجی (ئەنصاری)عەوف و موعاذ هەردوو کوڕەکەی حاریث و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە چوونە دەرەوە بۆیان، ئەوان وتیان: ئێوە کێن؟ ئەمانیش وتیان چەند کەسێکی ئەنصارین. ئەوان وتیان: هاوشانی بەڕێزن، بەڵام پێویستمان بە ئێوە نی یە با ئامۆزاکانمان (لەبەنی عەبدول موطەلیب) بێنە دەرەوە بۆمان.

[ئا لێرەدا زانای ژیاننامەناسی (الأموی). دەفەرموێت: کاتێك چەند کەسەکەی (الأنصار) چوونە دەر پێغەمبەر ﷺ ئەمەی پێ ناخۆش بوو، چونکە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ دوژمنانیدا، بۆیە پێی خۆش بوو کە چەند کەسێك لەخزمانی خۆی بەم کارە هەستن] پێغەمبەر ﷺ داوای لە (الأنصار) یەکان کرد کە بگەڕێنەوە دواوەو پاشان فەرمووی: ((هەستە عوبەیدەی کوڕی حاریث، هەستە ئەی حەمزە، هەستە ئەی عەلی)) ئەمان چوونە دەرەوە بۆیان کاتێك لێیان نزیك بوونەوە ئەوان وتیان: ئێوە کێن؟ عوبەیدە وتی: عوبەیدەم، حەمزە وتی: حەمزەم، عەلیش وتی: عەلیم. ئەوان وتیان: هاوشانی خۆمانن. ئینجا عوبەیدە کە لە هەموویان بەتەمەن تر بوو بەشەڕ هات لەگەڵ عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، وەحەمزەش بەشەڕهات لەگەڵ شەیبە [لەڕیوایەتێکی تردا: لەگەڵ وەلید] وە عەلیش بە شەڕ هات

لەگەڵ وەلیددا. [لەرِیوایەتێکی تردا: لەگەڵ شەیبە].

حەمزە ماوەی بە شەیبە نەداو دەست بەجێ کوشتی، وە عەلیش ماوەی وەلیدی نەداو ئەویش دەست بەجێ کوشتی، بەڵام عوبەیدە و عوتبە هەردووکیان یەکتریان بەخەستی بریندار کردبوو وەهەردووکیان لە جووڵە کەوتبوون حەمزە و عەلی هەردووکیان گەیشتنە سەر عوتبە و لە ناویان برد [عەلی ﷺ دەفەرموێت: ئێمە ئەمەمان کرد و پێغەمبەر ﷺ رەخنەی نەبوو بەرانبەرمان][٧٤٩] پاشان حەمزە و عەلی ﷺ عوبەیدە کە قاچێکی قرتابوو هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆلای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ)[٧٥٠].

لەسەرەتای ئەم جەنگەدا باسکرا کە پێغەمبەر ﷺ سوپاکەی رِیز لە دوای رِیز وەستاندبوو، وە تیرهاوێژەکانی لە پێشەوەی رِیزی سوپاکە جێگیر کردبوو هاتە لایان و ئامۆژگاری و رِێنموونی کردن پێی فەرموون: ((إذا أكثَبوكم فارمُوهم بالنَّبلِ، واستَبقُوا نَبْلَكم))[٧٥١] واتە: گەر ئەوان لێتان هاتنە پێش ئێوەش تیر بارانیان بکەن و ئاگاتان لە تیرەکانتان بێت و بەفیرۆی مەدەن وە فەرمووی: ((ولا تسُلُّوا السُّيوفَ حتَّى يغشَوكم))[٧٥٢] واتە: ئێوە شمشێریان لێ دەرمەکەن تا ئەدەن بەسەرتاندا و تێکرژان دروست دەبێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردنەوە کە هیچ کەسێکیان هیچ جۆرە کارێك ئەنجام نەدات تا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دەکات. ئەنەسی کوری مالیك ﷺ دەفەرموێت: موشریکەکان کەوتنە جووڵە روو بەئێمە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنكُم على شيءٍ حتَّى أكُونَ أنَا دُونَهُ))[٧٥٣] واتە: هیچ کەسێك لەئێوە کارێك ئەنجام نەداو لێی نەچێتە پێش تامنی لێ ئاگادار نەکاتەوە.

---

(٧٤٩) أخرجه: الطبراني بإسناد حسن كما قال الحافظ في (الفتح) (٢٩٨/٧)، وحديث ابن اسحاق أخرجه: ابن هشام (٤٩٨) والبيهقي (الدلائل) (٦٢/٣) والطبري (التأريخ) (٤٤٤/٢).

(٧٥٠) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٦٦٦٨)،والبخاري (٣٩٦١)، وأحمد (١١٧/١)، وأبو داود (٢٦٦٥) والحاكم (١٨٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (٧١/٣)،وصحح إسناده الحافظ في (الفتح) (٢٩٨/٧)، وصححه ايضا الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٢١)،و(صحيح ابن ماجه) (٢٢٨٧)،وحسن إسناده عند الحاكم (الشيخ الاناؤوط) في (تحقيق (زاد المعاد) (١٧٩/٣)،وانظر: (السيرة) لابن هشام (٤٩٨)، و (دلائل) للبيهقي (٦٢/٣)،والبداية (٢٧٢/٣).

(٧٥١) أخر جه:البخاري (٣٩٨٤)، وأحمد (٤٩٨/٣)،وابوداود (٢٦٦٣).

(٧٥٢) أخرجه: ابوداود (٢٦٦٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٢٠).

(٧٥٣) أخرجه: أحمد (١٦٣/٣) (١٢٣٩٨) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، ومسلم (١٩٠١).

ئیبنو ئیسحاقیش ﷺ دەفەرموێت: [پاشان هەردوولا لەیەك هاتنە پێش و نزیك بوونەوە لەیەکتر، و پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی ئاگادار کردەوە کە پەلاماریان نەدەن تا ئەو فەرمانیان پێ دەکات][٧٥٤]. پێغەمبەر ﷺ وشەی نهێنی دانا بۆ یەکتر ناسینەوەی هاوەڵانی لەکاتی تێکرژاندا، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەفەرموێت: ((وشەی نهێنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی (لەم جەنگەدا) ((أَمِتْ أَمِتْ))[٧٥٥] واتە: بکوژە، بکوژە لە ڕیوایەتێکی تردا کە (ضعیف)ە هاتووە کە نهێنی موهاجرین (يا بني عبد الرحمن) بووە و نهێنی خەزرەجیش (يابني عبدالله) بووە، ونهێنی ئەوسیش (يابني عبيدالله) بووە[٧٥٦].

## دابەزینی فریشتە

لە پێشتردا لە باسی (پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ) باس کرا، کە پێغەمبەر ﷺ مژدەی دایە ئەبوبەکر کەخوای گەورە کۆمەکی فریشتەی بۆ ناردون و هەموویان لە شێوەی پیاوانێکی بەرگ سپی چوار شانەدا بوون بەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە و بەکەلوپەل و پێداویستەکانی جەنگەوە بوون، و پاشان پێغەمبەر ﷺ بەدڵنیایەوە فەرمووی: کۆمەڵەی قوڕەیش دەبەزێن و هەڵدێن.

هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ کەوتنە پاڕانەوەو زۆر یاد کردنی خوای گەورەو بە ئارام و ورەیەکی پۆڵایینەوە لەڕووی دوژمنەکەیاندا وەك چیا لوتکە بەرزەکان وەستان، و خوای گەورەش چەند پۆلێك لە فریشتەکانی بۆ ناردن تا لەڕیزیاندا دژبە کافرەکان بجەنگن و بوەستن و ورەیان بەرزبکەنەوە، وەترس و تۆقینی خستە دڵی دوژمنەکەیانەوە وەك دەفەرموێت: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾﴾ (الأنفال). ئیمامی بەیهەقی ﷺ لە ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (فریشتەکان دەهاتنە ڕیزی موسوڵمانەکان و خۆگر و ورەبەرز و ئارامیان دەکردن، فریشتەکان لە شێوەی چەند پیاوێکی ناسراوی ڕیزی موسوڵمانان دەهاتن بۆلای

---

(٧٥٤) أنظر: (السيرة) لابن هشام برقم (٥٠٠)،و(التاريخ) للطبرى (٤٤٦/٢)، و(البداية والنهاية) لابن كثير (٢٧٢/٣).

(٧٥٥) أخرجه:ابو الشيخ في (أخلاق النبي ﷺ (١٦٥)، وحسن إسناده الارناؤوط في (تحقيق شرح السنة) للبغوى برقم (٢٦٩٩)

(٧٥٦) أخرجه: الحاكم (١٠٦/٢) وصححه وقال الذهبي: فيه ضعيفان، والبيهقي (الكبرى) (٣٦١/٦) و (الدلائل) (٧٠/٣) وقال: هذا مرسل

ناسراوەکانیان و پێیان دەوتن: مژدە بێت ئەوان هیچ نین و خواتان لەگەڵدایە و هێرش ببەنە سەریان و خۆڕاگربن، یاخود هەندێ فریشتە بەوێنەی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەهاتن و دەیان وت: گوێمان لێ بوو موشریکەکان لە ناو خۆیاندا دەیان وت: سوێند بەخوا گەر موسوڵمانەکان هێرش بهێننە سەرمان ڕاومان دەنێن، ئەم باسەش موسوڵمانەکان لە نێو خۆیاندا باسیان دەکرد)(٧٥٧).

بەم جۆرە دابەزینی فریشتەکان بووە هۆی ورە بەرزی موسوڵمانان و پاشان سەرکەوتنیان لەگەڵ کەمی ژمارەیان وەك خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ (آل عمران). واتە: خودای گەورە ئێوەی سەرخەست لەجەنگی بەدردا کە ئێوە ژمارەتان کەم بوو، ئێوەش لەخودا بترسن و سوپاسی بکەن لەسەر ئەو نیعمەتانی پێ بەخشیون.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە بۆ پشتیوانی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان هەزار فریشتەی نارد، جبریل ﷺ لەقۆڵێکەوە لەگەڵ پێنج سەد فریشتەدا وە میکائیلیش ﷺ لەلایەکەی ترەوە لەگەڵ پێنج سەد فریشتەدا)(٧٥٨).

ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بە من و ئەبوبەکری فەرموو لەڕۆژی بەدردا: ((مع أحدِكما جبريلُ ومع الآخرِ ميكائيلُ وإسرافيلُ مَلَكٌ عظيمٌ يشهَدُ القتالَ أو يكونُ في الصَّفِّ))(٧٥٩). واتە: جبریل لەگەڵ یەکێکتانە و میکائیلیش لەگەڵ ئەوی ترتانە، و ئیسرافیلیش فریشتەیەکی مەزنە ئامادەی جەنگەکە دەبێت یاخود لەڕیزدا دەبێت.

شێوە و سیمای فریشتەکانیش کەپێی دەناسرێنەوە (عمائم صفر) واتە: جەمەدانەکەیان زەردبوو، هیشام ﷺ لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (زوبەیری کوڕی عەوام جەمەدانەیەکی زەردی پێچابوو بەسەریەوە لە ڕۆژی بەدردا و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّ الملائِكَةَ نزلَت على سيماءِ الزُّبَيْرِ))(٧٦٠). واتە: فریشتەکان بەوێنەی سەرو نیشانەی زوبیر دابەزین.

(٧٥٧) أنظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٥٣/٣)، و(تفسير) لابن كثير (٢٠/٣).

(٧٥٨) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٢٢٥٣)، والبيهقي (الدلائل) (٧٨/٣)، واونعيم (الدلائل) رقم(٤٠٠).

(٧٥٩) أخرجه:أحمد (١٤٧/١)، وابن ابي شيبة (٦٦٦٥٩)، والبزار (١٧٦٢،١٤٦٧)، وابويعلى (٣٤٠)، والحاكم (١٣٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٤١)، والعمرى في (السيرة الصحيحة) (٢٦٨/١).

(٧٦٠) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٢٧/٣) بإسناد صحيح كما قال الحافظ في (الاصابة) (٢٧٨٩).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا عوروە ﷺ دەفەرموێت: (جبریل لە جەنگی بەدردا بەوێنەی زوبێر دابەزی و جەمەدانەیەکی زەردی بەسەریەوە پێچا بوو)[٧٦١]. وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: (فریشتەکان دابەزین لەڕۆژی بەدردا و جەمەدانەکانیان زەرد بوو)[٧٦٢] هەروەها ئەو ڕیوایەتەی کە گێڕڕاوەتەوە لە ئیمامی عەلیەوە ﷺ کەفەرموویەتی: (فریشتەکان لە ڕۆژی بەدردا دابەزین و جەمەدانەی سپییان لەسەردا بوو و بەپشتیاندا هێنابوویانە خوارەوە)[٧٦٣]. بەڵام ئەم فەرموودەیە (ضعیف)ە و ڕاست ئەوەیە کەجەمەدانەکانیان زەرد بووە و بەسەریانەوە پێچاوە.

لە ڕیوایەتێکی جوبەیری کوڕی موطعیم ﷺ دەری دەخات کە فریشتەکان لەگەرمەی شەڕەکەدا دابەزیون پۆل پۆل وەك دەفەرموێت: (لەگەرمەی شەڕەکەدا پێش ئەوەی قوڕەیش بشکێن ڕەشاییەك لە ئاسمانەوە هاتە خوار پۆل پۆل بەوێنەی دابەزینی مێرووله ڕەشە باڵدارەکان من گومانم لەوە نەبوو کە ئەوانە فریشتەن ئەوەندەی پێنەچوو قوڕەیش لە جەنگەکە شکا))[٧٦٤].

بەم جۆرە فریشتەکانی خوای گەورە پشتیوانی موسوڵمانەکانیان دەکرد لەو جەنگەدا، ئەوە بووە هۆی سەرکەوتنیان، بەڵام موشریکەکان ئیبلیس و سەربازە شەیتانەکانی تا سەرەتای شەڕەکە پشتیوانیان لێ کردن و پاشان پشتیان بەردان و هەڵهاتن، و موشریکەکان تووشی شکست هاتن، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئیبلیس و شەیتانەکانی بە وێنەی سوراقە و چەند پیاوێکی بەنی مودلیج هاتنە لای قوڕەیش و هەڵیان دەخەڵەتاندن و بەردەوام پێیان ڕادەگەیاندن کە ئەوان پشتیوانیان لێ دەکەن و بەڵێنی سەرکەوتنیان پێ دەبەخشین)[٧٦٥].

تا ئەوە بوو جەنگ دەستی پێ کرد ئەوان هەڵهاتن و بەڵێنەکەی خۆیان بۆ موشریکەکان شکاند و نەیان بردە سەر.

(٧٦١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٣٠)،وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٩٥): مرسل صحيح الإسناد.

(٧٦٢) أخرجه: أحمد في (فضائل الصحابة) (١٢٦٩) وقال محققه: إسناده صحيح مرسل.

(٧٦٣) أخرجه: ابو نعيم (الدلائل) (٤٠٧)، والبيهقي (الدلائل) (٥٧/٣)، والطبراني (الكبير) (٢٥/١١)، وابن هشام في (السيرة) برقم (٥١٧) وقال محققاه: فيه الحسن بن عمارة متروك،وقال الهيثمي (المجمع) (٨٣/٦): فيه ضعيف.

(٧٦٤) أخرجه: اسحاق بن راهويه (المسند)، وقال الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٤٥): إسناده حسن ان كان اسحاق سمع من جبير، وقال البوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٢٥): إسناده حسن.

(٧٦٥) أخرجه: ابونعيم (الدلائل) (٤٠٠)، والبيهقي (الدلائل) (٧٨/٣)، والطبري (التفسير) (١٢٥٦٢).

## پێغەمبەری خوا ﷺ مشتێك خۆڵ دەپژێنێت بەڕووی موشریکەکاندا

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر ؓ دەفەرموێت: (پاشان هەردوولا بەرە و یەك چوون و کاتێك نزیك بوونەوە لە یەکتری، پێغەمبەر ﷺ چووە دەروو [جبریل ؑ پێی فەرموو: (خُذْ قَبْضَةً مِنْ الترابِ) واتە: مشتێك لەو خۆڵە هەڵبگرە] [ئەویش مشتێك لەخۆڵەکەی هەڵگرت][٧٦٦] و چووە ڕووی قوڕەیش و لەدوورەوە مشتە خۆڵەکەی هەڵدا بەڕوویاندا و فەرمووی: ((شاهتِ الوجوهُ)) واتە: ڕووخسارەکانتان قێزەون بێت. [عەبدوڵڵا دەفەرموێت: لە پاش هەڵدانی ئەم مشتە خۆڵە هیچ کەسێك لەموشریکەکان نەما کەئەم خۆڵە نەچوو بێتە هەردوو چاوو لوت و دەمیەوە]). پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((احملوا يا مَعْشرَ المُسلِمِينَ وَ هَذَمَ اللهُ قُرَيْشاً))[٧٦٧] واتە: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان هێرش بەرن، موسوڵمانان هێرشیان برد و خوای گەورەش قوڕەیشی بەزاند)).

حەکیمی کوڕی حوزام ؓ پاش ئەوەی موسوڵمان بوو بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوەو دەیفەرموو: ((لەکاتی جەنگی بەدردا پێغەمبەر ﷺ ئەو مشتە خۆڵەی پژاند بەڕووماندا فەرموی: ((ڕووخسارتان قێزەون بێت)) هێزمان بڕا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾ (الأنفال) [وگوێمان لەدەنگێك بوو لەئاسمان هاتە خوارێ بەوێنەی دەنگی خڕە بەردێك کە فڕێ بدرێتە ناو تەشتێکەوە و ئێمە تۆقین وهێزمان لەبەر بڕاوو بێ توانا و بێ ورە بووین][٧٦٨]))[٧٦٩].

---

(٧٦٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٨١/٣)، وفي رواية (قال ﷺ) لعلي ((ناولني كفاً من حصًى)) فناوله أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٧٥٠)، وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٩٩): رجاله رجال الصحيح.

(٧٦٧) أخرجه: الطبري في (الكبير) (١١٧٥٠) وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٩٩): رجاله رجال صحيح.

(٧٦٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣١٢٧)، والطبري (التفسير) (١٢٢٩٢)، والبيهقي (الدلائل) (٨٠/٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٩٧): رواه الطبراني وإسناده حسن.

(٧٦٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٣١٢٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٩٨): إسناده حسن.

# دەست پێکردنی جەنگەکە

سەرەتا موشریکەکان هێرشیان هێنایە سەر موسوڵمانان، و هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ تیربارانیان کردن، و پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەو مشتە خۆڵەی بەڕوودا پژاندن، موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ ئەو مشتە خۆڵەی بەڕوویاندا پژاند و خوای گەورەش گەیاندیە دەم وچاویان هەموویان [وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿......وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ..... ﴿١٧﴾﴾ (الأنفال) واتە: تۆ لەو ڕۆژەدا ئەوەی تێت گرتن تۆ لەڕاستیدا تێت نەگرتن بەڵکو خوا تێی گرتن موشریکەکان وایان لێ هاتبوو هەموو یەکێکیان دەستی لەپاك کردنەوەی چاوەکانیابوو و سەرقاڵ بوون و نەیان دەزانی هێرشەکە بەرەو کوێ بەرن))[٧٧٠].

پاش دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لەکەپرەکەی و فڕێدانی مشتە خۆڵەکە جەختی لە موسوڵمانان کردەوە کە ئارامگربن و یادی خوا بکەن وە خوای گەورە فەرمانیان پێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾﴾ (الأنفال)

پاشان موشریکەکان زۆرتر نزیك بوونەوە و تێکرژان، ڕوویدا ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هەستان و هێرش بردنە سەریان و پەلاماردانیانی کرد و فەرمووی: ((احملوا يا معشرَ المُسلمينَ))[٧٧١] واتا: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان پەلاماریان بدەن. ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی زیاتر هاندا و ورە بەرزتری کردن ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (موشریکەکان نزیك بوونەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قوموا إلى جنَّةٍ عرضُها السَّمَواتُ والأرضُ)) واتە: هەستن بۆ ئەو بەهەشتەی کەپانتاییەکەی زەوی و ئاسمانەکانە.

عومەیری کوڕی حەمامی ئەنصاریش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەهەشتێکە پانتاییەکەی زەوی و ئاسمانەکانە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ)) ئەویش وتی: بەخ بەخ!!! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((چی وات لێ دەکات تا بڵێیت بەخ بەخ!!)) ئەویش وتی: ناسوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم وت بەهیوای

---

(٧٧٠) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (١١٤/٣)، والاموى في (المغازى) كما في (البداية) (٢٨٤/٣).

(٧٧١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٨١/٣).

ئەوەی کەمن یەکێك بم لە خاوەنەکانی! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فإنَّكَ مِن أَهْلِهَا)) واتە: تۆ یەکێکی لەخاوەنەکانی ئەو بەهەشتە، عومەیریش کەمێك خورمای پێ بوو دەری کرد و کەوتە خواردنی وتی: بەڕاستی ژیانێکی دوور و درێژە من بوەستم تا ئەم خورمایانە دەخۆم، ئینجا ئەوەی پێ‌ی مابوو فڕێ‌ی داو کەوتە شەڕەوە لەگەڵ موشریکەکان تا شەهید کرا)[٧٧٢].

ئینجا موسوڵمانان زۆر بەگەرمی کەوتنە شەڕەوە، و پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر لەگەڵ هاوەڵان زۆر بەتوندی دەجەنگان دژبە موشریکەکان، ئومەدی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی جەختی دەکردەوە لەسەر موسوڵمانان لەهەمان کاتدا خۆشی بەجەستە و ڕۆحی پیرۆزی دەجەنگا. هەروەها هاوەڵی بەڕێز ئەبو بەکر ﷺ چون لەژێر کەپرەکەدا زۆر بەکوڵ دوعایان دەکرد بەهەمان شێوە کە دەرچون زۆر بە ئازایانە جەنگیان دەکرد)[٧٧٣].

ئیمامی عەلی ﷺ شێوەی بەشداری کردنەکەی پێغەمبەرمان ﷺ لەم جەنگەدا بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: (کاتێك کە ترس و تۆقین دەهاتە پێش و چاوەکان سوور دەبوون خۆمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپاراست وە هیچ کەسێکمان لەوەوە نزیك تر نەبوو لە دوژمنەوە)[٧٧٤] (ئێمەت دەبینی لە جەنگی بەدردا چۆن خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ و ئەو لە هەمووکان نزیکتر بوو لە دوژمن و لە هەمووکان ئازا و بەتواناتر بوو ئەو ڕۆژە)[٧٧٥].

## کۆمەکی فریشتەکان بۆ جەنگەکە

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان کەوتنە پەلاماردانی موشریکەکان، وەفریشتەکانی خوای گەورەش جوانترین ڕۆڵیان هەبوو لە بەڕێوەبردنی ئەم

---

(٧٧٢) أخرجه: أحمد (المسند) (١٣٦/٣) برقم (١٢٣٩٨) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، ومسلم (١٩٠١)، والحاكم (٤٢٦/٣) وصححه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٤٣/٩).

(٧٧٣) أنظر: (البداية و النهاية) (٢٧٨/٣).

(٧٧٤) أخرجه: أحمد (١٢٦/١) (١٣٤٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح، والنسائي (الكبرى) (٨٩٣٦)، والحاكم (١٤٣/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٦٩/٣)، وابويعلى (٣٠٢).

(٧٧٥) أخرجه: أحمد(٨٦/١)، وابوالشيخ (اخلاق النبوة) (ص:٥٧)، وابن ابي شيبة (٣٥٧/١٤)، والبغوي (شرح السنة) (٣٦٩٩)، وصحح إسناده أحمد شاكر في تحقيق (المسند) (٢٢٨/٢)، و الارناؤوط في تحقيق (مسند أحمد) برقم ((٦٥٤).

جەنگەدا و یارمەتی دانی موسوڵمانان و لەناوبردنی موشریکەکان، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك یەکێك لە موسوڵمانەکان لەو ڕۆژەدا ڕای دەکرد بەدوای یەکێك لە موشریکەکان لەپێش خۆیدا، کوتو پڕ گوێی لەلێدانی قەمچیەك دەبوو لەسەرووی خۆیەوە و گوێی لە دەنگی ئەسپ سوارێك بوو دەیوت: پێشی کەوە حەیزووم (دیارە: حەیزووم ناوی ئەسپ سوارەکەیە)، موسوڵمانەکەش بینی موشریکەکەی پێش خۆی بەپشتاکەوت و تەماشای کرد سەرلوتی ڕەش بووە و دەم و چاوی بووە بەدوو کەرتەوە وەك بە قەمچیەك لێی درابێت و ڕوخساری سەوز هەڵگەڕابوو ئەو موسوڵمانە (لە دوای تەواو بوونی جەنگەکە) هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە و پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((صَدَقْتَ، ذلكَ مِن مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ)) واتە: ڕاستت گوت ئەوە لە فریشتە پشتیوانەکانی ئاسمانی سێهەمە)[٧٧٦].

هەروەها ئەبو داودی مازنی ﷺ دەفەرموێت: ((لەو ڕۆژەدا من شوێنی پیاوێك لە موشریکەکان کەوتبووم بۆ لێدانی کتوپڕ سەری کەوتە خوارەوە پێش ئەوەی شمشێرەکەی من بیگاتێ ئەو کات زانیم کە کەسێکی تر جگە لە من کوشتوویەتی))[٧٧٧].

هەر لەو باسەدا ئیمامی عەلی ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((پیاوێکی کورتە باڵای ئەنصاری [کە ناوی ئەبو یوسر کەعبی کوڕی عەمر بوو][٧٧٨] عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیبی بە دەستگیر کراوەیی هێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ (واتە: لەدوای تەواو بوونی جەنگەکە)، و عەباس ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا ئائەمە منی دەستگیر نەکردووە، بەڵکو پیاوێکی زۆر ڕووخسار جوان کە قژی بە هەر دوولای سەریدا بەردابووەوە بە سواری ئەسپێکی بەڵەکەوە بوو ئەو منی دەستگیر کرد لە ناو ئێوەدا ئێستا من نایبینم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەبو یوسر چۆن دەستگیرت کرد))؟ ئەویش وتی: من دەستگیرم کرد و [پیاوێکیش یارمەتی دام کە تا ئێستا نەمناسیوە و ئێستاش نایبینمەوە شێوەی ئاواو ئاوا بوو]. پێغەمبەریش ﷺ

---

(٧٧٦) أخرجه: أحمد (٣٠/١)، ومسلم (١٧٦٣)، وابن حبان (٤٧٩٣).

(٧٧٧) أخرجه:أحمد (٤٥٠/٥) برقم (٢٣٧٧٨) وضعفه محققه، والبيهقي (الدلائل) (٥٦/٣)، وأبو نعيم (الدلائل) (٤٠٤)، وابن هشام (السيرة) برقم (٥١٦)، وحسن إسناده الارناؤوط في تحقيق (زادالمعاد) (١٨٣/٣).

(٧٧٨) أخرجه: أحمد (٣٣١٠) وقال محققه الارناؤوط: حسن،وابن سعد (١٢/٤)، وابى نعيم (الدلائل) (٤٠٢).

فەرمووی: ((ئەوە فریشتەیەکە خوای گەورە کردوویەتیە کۆمەك کارت)))[٧٧٩].

ئەبو ئومامەش دەفەرموێت: باوکم پێی وتم: ((کوڕی خۆم ئێمەت دەبینی لە جەنگی بەدردا هەریەکێکمان شمشێرەکەی ڕاست دەکردەوە لە کافرەکە و سەری دەکەوتە خوارەوە لە لاشەی پێش ئەوەی شمشێرەکە بیگاتێ))[٧٨٠]. ئەو کوژراوانەی کە بەدەستی فریشتەکان کوژرابوون بەوە دەناسرانەوە کە لەسەریان و لەسەرە پەنجەکانیان درابووە وە وەك خوای گەورە فەرمانی پێکردوون و فەرموویەتی: ﴿.....فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢﴾ (الأنفال).

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمانەکان لەجەنگی بەدردا ئەوانەی بەدەستی فریشتەکان کوژرابوون بەوە دەیان ناسینەوە کەلەسەریان درابوو وەسەرە پەنجەکانیان سوتێنرابوو وەشوێنی داخ کردنی پێوە دیاربوو)[٧٨١].

سوهەیلی کوڕی عەمریش ﷺ لەو باسەدا دەفەرموێت: (بینیم لەشەڕی بەدردا پیاوانێکی ڕووخسار سپی بەسەر پشتی چەند ئەسپێکی بەڵەکەوە دەناسرانەوە لەنێوان زەوی و ئاسماندا دەجەنگان و دەیان کوشتن و دەستگیریان دەکردن)[٧٨٢]. هەر لەو ڕۆژەدا (خوای گەورە بایەکی گەرمی تەپ و تۆزاوی هەڵکرد بەڕووی موشریکەکاندا وەك ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [بایەك هەڵیکرد بە ڕووی موشریکەکاندا ئەوەندەی تر شپرزەی کردن][٧٨٣].

## هەڵاتنی ئیبلیس

ئیبلیس و چەند شەیطانێکی کە لەو ڕۆژەدا بە وێنەی سوراقە و پیاوەکانی هاتبوون بۆ کۆمەکی کردنی موشریکەکان دژ بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، کە جبریل عليه السلام

---

(٧٧٩) أخرجه: أحمد(١١٧/١) برقم (٩٤٨) وقال محققه: إسناده صحيح، وبرقم (٣٣٠٩) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وأبو داود (٢٦٦٥)،وابن ابي شيبة (٣٦٢/١٤)، والبزار(٧١٩)، والحاكم (١٨٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وصحيح إسناده أحمد شاكر في (المسند) (١٩٤/٢) وحسن إسناده الارناؤوط في (زاد المعاد) (١٨٣/٣).

(٧٨٠) أخرجه:الطبراني (الكبير) (٤٧/٦)، والحاكم (٤٠٩/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٥٦/٣)، وابي نعيم (الدلائل) برقم (٤٠٦).

(٧٨١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٥٦/٣).

(٧٨٢) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (٥٧/٣).

(٧٨٣) أخرجه: البزار (١٧٨٢) عن ابن عباس، وقال الهيثمي في (المجمع) (٧٨/٦): رجاله ثقات.

و فریشتەکانی خوایان بینی وابەرە و جەنگەکە هاتن و بەشداری دەکەن هەموویان هەڵهاتن و ڕایان کردوو پشتی کافرەکانیان بەردا لەو کاتی تەنگانەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ......فَلَمَّا تَرَاءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ ﴾ (الأنفال) واتە: کاتێك هەردوولا لەیەکتری دیاربوون و نزیك کەوتنەوە ئیبلس لەسەر پاژنەکانی پشتا و پشت گەڕایەوە و وتی: من بەریم لەئێوە و ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن من لە خوا دەترسێم و خوا سزای زۆر توندە، وە چۆنیەتی ڕاکردنی ئیبلیس و شەیطانەکانی لە چەندین فەرموودەدا هاتووە کە ئیسنادەکانیان (ضعیف)ە ئێمەش هەندێکی دەهێنین تەنها بۆ شارەزابوون و بەئاگابوون.

ئیبنو عەباس ﷺ لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (جبریل هات بەرە و ئیبلیس دەستی لە ناو دەستی پیاوێك لە موشریکەکاندا بوو کە جبریلی بینی واهات، دەستی لەو پیاوە بەرداو پشتاو پشت خۆی و سەربازەکانی ڕایان کردوو، پیاوەکە پێی وت: سوراقە ئەی تۆ نەت وت: پەناتان دەگرم و کۆمەکیتان دەکەم؟ ئەویش وتی: ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن من لە خوا دەترسم و خوا سزای زۆر توندە)(٧٨٤).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر ﷺ کە فەرموویەتی: (ئیبلیس کە فریشتەکانی بینی پشتا و پشت گەڕایە دواوە وتی: من بەریم لەئێوە نیم و هەڵهات، ئەبو جەهل ئەمەی بینی هانی موشریکەکانی داو پێی وتن: ترستان نەبێت لە ڕاکردنی سوراقە چونکە ئەو دیارە لەژێرەوە لەگەڵ محمد و هاوەڵەکانی بووە، پاشان وتی: سوێند بە لات و عوزا ناگەڕێینەوە تا هەموویان پەت کراو و دەست بەسەر نەکەین ئێوە ئەوان مەکوژن بەڵکو پەلاماریان بدەن و دەست بەسەریان بکەن)(٧٨٥).

هەروەها گێڕاویانەتەوە لە ریفاعەی کوڕی ڕافع ﷺ کە فەرموویەتی: [ئیبلیس کاتێك بەچاوی خۆی بینی فریشتەکان چ کارێك دەکەن بە موشریکەکان ترسا لەوەی کوشتنەکەش بگاتە ئەو ویستی ڕابکات، لەوکاتەدا حارثی کوڕی هیشام گرتی وای

---

(٧٨٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٢٥٦٢)، وابي نعيم (الدلائل) برقم (٤٠٠)، والبيهقي (الدلائل) (٧٨/٣)، وقال محققا (كشف الخفاء) (٢٠٩/٢): إسناده منقطع وفيه ضعيف.

(٧٨٥) أنظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٥٣/٣).

دەزانی سوراقەیە، ئەویش پاڵێکی بەحارثەوە ناو بەپشتا خستی، پاشان ڕای کرد تا خۆی گەیاندە دەریا و خۆی تێهاویشت و دەستی بەرز کردەوە وتی: خوایە داوات لێ دەکەم ئاگات لێم بێت. ئەبو جەهلیش هاتە نێو سوپاکە و وتی: ئەی خەڵکینە ڕاکردنی سوراقە ورەتان بەرنەدات، چونکە ئەو هەر ژێر بە ژێر لەگەڵ محمددا بووە. کوشتنی عوتبە و شەیبە نەتان تۆقێنێت، چونکە ئەوان نەیان زانی و پەلەیان کرد، هیچ یەکێك لەئێوە یەکێك لەوان نەکوژێت، بەڵکو بیان گرن بەچۆن گرتنێك تا نیشانیان بدەن کە چارەنووسی کارە خراپەکەیان چۆن دەبێت و دوور کەوتنەوەیان (لەلات و عوزا) چیان بەسەر دێنێت][٧٨٦].

## موسوڵمانەکان قارەمانانە دەجەنگان

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆر جوامێرانە ڕۆڵی خۆیان گێڕا لەبەڕێوەبردنی سەرجەم قۆناغەکانی جەنگەکە، هەرچەندە ئەمە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیانە لەگەڵ دوژمنەکانیاندا، بەڵام زۆر خۆڕاگرانە لە ڕوویان دەجەنگان و دلێرانە بەشەڕ هاتبوون دەستیان نەدەپاراست تەنانەت لەخزم و کەس وکارەکانی خۆیان کە لەڕیزی کافرەکاندا دەجەنگان.

ئیبنو سیرین ﷺ دەفەرموێت: (عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر کەلەڕۆژی بەدردا لەڕیزی موشریکەکاندا دەجەنگی دوای موسوڵمان بوونی بەباوکی وت: لە شەڕی بەدردا هاتیتە بەردەستم، بەڵام نەمکوشتیت و خۆمم لێ دوور خستیتەوە، ئەبو بەکریش ﷺ فەرمووی: بەڵام ئەگەر تۆ بەردەستم بکەوتیتایە خۆمم لێ دوور نەدەخستیتەوە)[٧٨٧].

عەبدوڵڵای کوڕی شەوزەب ﷺ دەفەرموێت: (باوکی ئەبو عوبەیدە ڕووبەڕووی ئەبو عوبەیدە دەوەستاو ئەو خۆی لێ دوور دەخستەوە، کاتێك باوکی ئەبو عوبەیدە زۆر ڕووبەڕووی ئەبو عوبەیدە بووەوە، ئەبو عوبەیدە کوشتی و خوای گەورەش ئەم

(٧٨٦) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٥٥٠)، وقال الهيثمي (المجمع) (٩٩٥٦): فيه عبد العزيز بن عمران ضعيف، وقال الحافظ ابن حجر في (التقريب) (٥١١/١): فيه متروك.

(٧٨٧) أخرجه: ابن عساكر (تاريخ دمشق) (١٢٧/٣٠)،والدينوري (المجالسة) (١٠٧٦)، وابن قتيبة (غريب الحديث) (٥٧٨/١) وابن أبي شيبة كما في (فنتخب كنز العمال) (١١١/٤).

ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٢٢)﴾ (المجادلة)[٧٨٨]. واتە: هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژەکەی تر ببێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پەیامبەرەکەی دەکەن! هەر چەندە ئەوانە باوکیان، یان کوڕو نەوەیان، یا براو عەشرەتیان بن، ئەوانە کەسانێکن خوا ئیمان و باوەڕی لە نێو دڵیاندا چەسپاندووە، وە پشتگیری کردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە ، لە پاشە ڕۆژیشدا دەیانباتە نێو چەند باخاتێکی بەهەشتەوە کە جۆگە ئاوی زۆر لە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات بە هەتا هەتاییش تێیدا دەبن، خوا لێیان خۆشنوودو ڕازیی بووە، ئەوانیش لە خوا ڕازیی بوون ، ئا ئەوانە گرووپەکەی خوان ، ئاگادارو هۆشیاربن! کە هەر گرووپەکەی خوا براوەکان لە دونیاو، لە قیامەتدا.

عوروەی کوڕی زوبیر ﷺ دەفەرموێت: (زوبیر وتی: لە ڕۆژی بەدردا بەعوبەیدەی کوڕی سەعیدی عاص گەیشتم و هەموو گیانی توند و تۆڵ کردبوو بەئاسن و تەنها هەردوو چاوی دیاربوو.... پەلاماریمدا بە (عنزە) (واتە: شمشێرە کوڵێکە وەك حەربە تۆزێ درێژتر) و چەقاندمە چاویەوە و مرد و دوایی قاچم خستە سەری وخواربوو وە بەناڕەحەتی دەرم کرد)[٧٨٩].

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (سەعد لە ڕۆژی بەدردا شەڕی سوار و پیادە ڕەوی دەکرد)[٧٩٠] عاصمی کوڕی عەوف دەفەرموێت: إعەوفی کوڕی حارث وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا بەچ کارێکی بەندەکەی پێکەنینی دێ؟ پێغەمبەریش

---

(٧٨٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٥٤/١)، والحاكم (٢٦٤/٣)، وابو نعيم (الحلية) (١٠١/١)، والبيهقي (الكبرى) (٢٧/٩) وقال: منقطع، وقال الحافظ في (الاصابة) (٢٥٢/٢) رقم (٤٤٠٠): السند إلى عبدالله جيّدٌ، وقال في (الفتح) (٩٣/٧)مرسل، وقال في (التلخيص) (١٠٢/٤): هذا معضل وكان الواقدي ينكره، وقال الهيثمي(المجمع) (٢٥/٦): إسناده منقطع ورجاله ثقات. واورده كل من ابن كثير (التفسير) (١٣٠/٦)، والقرطبي (التفسير) (٢٦٠/١٧).

(٧٨٩) أخرجه: البخاري(٣٩٩٨).

(٧٩٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٠٠٤)، والبزار (٨٦٧١)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٦٨٤١): رواه الطبراني ورجاله رجال صحيح غير إبراهيم بن يوسف وهو ثقة، وأخرجه أيضًا ابن سعد (١٤١/٣)، وأحمد في (الفضائل) (٩١٣١) وقال محققه: إسناده صحيح.

ﷺ فەرمووی: (غَمْسُهُ يَدَهُ في العدوِّ حاسرًا) واتە: بەوەی کەبەندەکەی دەستەویەخە لەگەڵ دوژمندا بجەنگێت بەبێ درعی سەر سنگ وقەڵغان، عەوفیش درعەکەی سەرسنگی لێکردەوە و فڕێی دا، و شمشێرەکەی بەدەستەوە گرت وبەجەنگ هات شەهید بوو][(٧٩١)].

بەم جۆرە موسوڵمانەکان ئازایانە و بەکۆمەکی خوا و پاشان بەکۆمەکی فریشتەکانی خوا دەجەنگان دژ بە موشریکەکان تا ژمارەیەکیان لە ناودارەکانیان لێ کوشتن و ژمارەیەکی تریان لێ بەدیل گرتن و سوپاکەی قوڕەیش لەبەر یەك هەڵوەشا و هەریەك بەلایەکدا هەڵهاتن و شەڕگەکەیان بەجێ هێشت، خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی سەرخست و شکۆمەندی کردن.

## کوشتنی ئەبو جەهل

زۆر جار خوای گەورە دوژمنە سەرسەختەکانی خۆی بەدەستی کە سانێکی لاوازو کەم توانا لە ناودەبات، وەك ئەبوجەهل لەم جەنگەدا بە دەستی دوو منداڵی ئەنصاری لە ناوبرد.

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەفەرموێت: (لە گەرمەی جەنگەکەدا و لەڕیزی موسوڵماناندا لەشەڕگەکە دەجەنگام، تەماشای لای ڕاست و چەپی خۆمم کرد دەبینم من لە نێوان دوو کوڕی کەم تەمەنی ئەنصاریدام... یەکێکیان هاتەلامەوە و دەستێکی لێ دام و بەچپە پێی وتم مامە ئەبوجەهل دەناسیت. منیش وتم: بەڵێ برازاکەم چ کارێکت پێی هەیە. وتی بۆیان گێڕاوەمەتەوە کە ئەو جوێن و قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەری خوا ﷺ وتووە. سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بیبینم نایەڵم رووم لەڕووی بترازێت تا کاممان بەپەلە بێت ئەوی تریان بکوژێت، عەبدولڕحمان دەفەرموێت زۆر سەرم سوڕما لە وتەکەی. کوڕەکەی تریشیان هاتەلامەوە وهەمان وتەی پێ وتم. منیش تەماشام کرد ئەبوجەهل بەناو خەڵکەکەدا دێت و دەڕوات ئەوجا بە هەردووکیانم وت.. تەماشاکەن ئەوە ئەوکەسەیە کە بەدوایدا دەگەڕێن و پرسیاری لەبارەوە دەکەن... یەکسەر هەردووکیان پە لاماریان

(٧٩١) أخرجه:ابن هيشام (السيرة) برقم (٥٠٧)، والطبري (التأريخ) (٤٤٨/٢)، والبيهقي (الكبرى) (٩٩/٩)، وفي (دلائل النبوة) (١٠١/٣).

داو بەشمشیرەکانیان کوشتیان[٧٩٢]. ئەو دوو کوڕەش ناویان مەعاذ و مەعوذ بوو.

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە بەوردی باسی لەچۆنیەتی کوشتنی ئەبوجەهل دەکات مەعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەموح دەفەرموێت.. (لەشەڕی بەدردا گوێم لێ بوو دەیان وت ئەبوجەهل هاوەڵەکانی لەهەموو لایەکەوە وەك درەختێکی زۆر پەلدار پارێزگاری لێ دەکەن.. وەدەیان وت.. کەس ناتوانێت بگاتە ئەبوجەهل کاتێك من ئەمەم گوێ لێ بوو وتم دەبێت خۆمی پێ بگەیەنم.. خۆڕاگرانە بەرەو ڕووی ڕۆیشتم تا لێی نزیك بوومەوە و پەلاماریمدا و شمشێرێکم لەڕانیدا و پەڕانم..... وەعەکریمەی کوریشی لەوێدا شمشێرێکی لەسەر قۆڵمدا دەستی قرتانم و تەنها پێستەکەی پێوەمایەوە و دەستم پێوەی هەڵواسرابوو ئەمەش بووە هۆی دوورکەوتنەوەم لە ئەبوجەهل. منیش قاچم خستە سەر دەستەکەم وشانم ڕاکێشا تا لێم کردەوە و فڕێم دا. ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت: پاشان مەعوذی برای مەعاذ بەلای ئەبو جەهلدا ڕۆیشت و لێیدا تا لە جوڵەی خست و پاشان بە جێی هێڵا هێشتا گیانی تیامابوو)[٧٩٣].

## کوشتنی ئومەیەی کوڕی خەلەف

لەو ڕۆژە شکۆدارەدا خوای گەورە یەکێکی تر لە دوژمنە سەرسەختەکانی لەناو برد ئەویش ئومەیە بوو کە دژایەتی ئیسلام و موسوڵمانانی بەتوندی دەکرد و ئازارو ئەشکەنجەی موسوڵمانە چەوساوەکانی وەك بیلالی دەدا تا لە ئاینەکەیان پاشگەزیان بکاتەوە. ئەوە بوو بەبیستنی هەڕەشەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆر ترساو بڕیاریدا نەچێتە دەرەوەی مەککە، بەڵام ئەبوجەهل ناچاری کرد تا بەشداری لەم جەنگەدا بکات و ئەویش وشترێکی زۆر چاکی لەگەڵ خۆیدا برد تا لە سەر پشتی خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە ناو شاری مەککە، بەڵام مەرگ لە چاوەڕوانیدا بوو.

هەرچەندە ئەو لە شەڕەکەدا زۆر خۆی دەپاراست بۆ ئەوەی نەکوژرێت. تا دەست بەسەر کراو پاشان بە دەستی بیلال کوژرا بەسەر هاتی کوشتنە کەی لە چەندین

---

(٧٩٢) أخرجه: أحمد (١٦٧٣)، والبخاري (٣٩٨٨)، ومسلم (١٧٥٢)، والحاكم (٤٢٥/٣)، وابن حبان (٤٨٤٠)، والبيهقي (الدلائل) (٨٣/٣) وفي (الكبير) (٣٠٦/٦).

(٧٩٣) أخرجه: ابن هيشام في (السيرة) برقم (٥١٩). وأبو نعيم (الدلائل) برقم (٤١١). ووالطبري في (التأريخ) (٤٥٤/٢). والبيهقي (الدلائل) (٨٤/٣). والاصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٦٥٦/٢) وقال محققه:إسناده حسن.

ڕیوایەتدا هاتووە دوای کۆ کردنەوەی هەموویان و ڕێکخستنیان بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت: (عبدلڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەفەرموێت: (ئومەیەی کوڕی خەلەف پێشتر هاوڕێم بوو لەشاری مەککە و منیش ئەو کات ناوم عەبد عەمرو بوو. کاتێك موسوڵمان بووم ناوی خۆم گۆڕی بە عەبدولڕحمان کاتێك کە ئومەیە پێم دەگەیشت دەیوت: ئەی عەبد عەمر ئایا ئەو ناومت نەویست کە باوکت لێی نابوویت؟ منیش دەم وت بەڵێ، ئومەیەش دەیوت: من (الرحمن) نا ناسم بەڵام تۆ ناوێکی تر لەنێوانماندا دابنی تابەو ناوە بانگت بکەم تۆش بەیەکەم بانگکردن وەڵامم مەدەرەوە، وەمنیش بە ناوێك بانگت ناکەم کە نەیناسم. منیش وتم: باوکی عەلی گەر ئارەزوت لەناوێك بوو پێم بڵێ وئاگادارم بکە؟ ئومەیە پێی وتم: تۆ ئیتر با ناوت (عبد لإله) بیت؟ منیش وتم: باش، ئیتر هەر کات بەلایدا تێپەڕ بووایەم بەناوی (عبد لإله) بانگی دەکردم منیش دەچووم لەگەڵیدا دادەنیشتم [وە من نوسراوێکم نووسیبوو لەگەڵ ئومەیەدا کە ئەو سامانەکەم بپارێزێت لەمەککەدا وەمنیش سامانی ئەو بپارێزم لە مەدینەدا)[٧٩٤].

کاتێك کە ڕۆژی بەدر هات تێپەڕیم بەلایدا وبینیم وەستابوو لەگەڵ عەلی کوڕیدا وە دەستی گرتبوو منیش هەندێك (درع) قەڵغانی سەرسنگم کۆ کردبووەوە لەگەڵ خۆم هەڵم گرتبوو، کاتێك منی بینی بانگی لێ کردم: ئەی عەبد عەمرو منیش وەڵامم نەدایەوە، ئینجا وتی: ئەی (عبد الإله)؟ وتم: بەڵێ، وتی وەرە دەستی من بگرە من باشترم بۆت لەو قەلغانە سەرسنگانەی کە هەڵتگرتووە؟ منیش وتم بەڵێ: ئەرە وەڵڵا ئیتر قەڵغانەکانم فڕێدا، و دەستی خۆی و کوڕەکەیم گرت، ئومەیە دەیوت هیچ ڕۆژێکم وەك و ئەم ڕۆژە نەدیوە ئایا ئێوە پێویستتان بە شیرنیە، منیش دەستی هەردووکیانم بەدەستەوە بوو دەم ویست لەشەڕگەکە دووریان بخەمەوە)[٧٩٥]. (لەوێدا ئومەیە پێی وتم: ئەی عەبدول ئیلاه: ئەو پیاوە کێ بوو لەناوتاندا کە دەناسرایەوە بەوەی کە پەڕی نەعامەی بەسەر سنگەوە بوو؟ منیش وتم ئەوە حەمزەی کوڕی عەبدلموطلیب بوو. ئومەیە وتی: ئا ئەوە بوو ئەو هەموو کارەی بەسەر هێناین.

---

(٧٩٤) أخرجه: البخاري (٢٣٠١)، ومسلم (١٧٥٢).

(٧٩٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٢٢/٢) برقم (٥١٢)، والطبري (التأريخ) (٤٥١/٢) والبيهقي (الدلائل) (٩١/٣)، وقال الحافظ في (الأصابة) رقم (٥١٧٩): أخرجه ابو نعيم بسند حسن، وقال صاحب (صحيح السيرة) (٢٥٧) إسناده صحيح.

عەبدورەحمان ﷺ دەفەرمویێت: سوێند بە خوا لە نێوانیاندا دەستی هەردووکیانم گرتبوو ڕام دەکێشان [بەرەو شاخەکە بۆ ئەوەی پەنایان بدەم تا خەڵکی دەخەون، ئەوەندەی پێ نەچوو بیلال هەردووکیانی بەرچاوکەوت][٧٩٦]. بیلال کە ئەوانی بینی وتی: سەری کوفر ئومەیەی کوڕی خەلەف ڕزگار نەبم گەر ئەو ڕزگار ببێت، منیش وتم: بیلال هەردوو کیان دیلی منن [بیلالیش ڕۆیشت تا لای کۆمەڵێکی دانیشتووی ئەنصار وەستاو] هەتا هێزی تیابوو بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی لایەنگرەکانی خوا سەری کوفر ئەوە ئومییەی کوڕی خەلەفە ڕزگار نەبم گەر ئەو ڕزگاری ببێت. [ئیتر ئەو کۆمەڵە ئەنصاریە هەر هەموو هاتن بە شوێنماندا] لەهەموولایەکەوە وەك بازن چواردەوریان لێ گرتین و منیش پارێزگاریم دەکردن [کاتێك ترسام پێمان بگەن دەستی کوڕەکەیم بەردا بۆ ئەوەی سەرقاڵیان بکەم] پیاوێك پێ‌ی گەیشت و شمشێرێکی لە قاچی کوڕەکەیدا و کەوت... ئومەیە هاوارێکی کرد هاواری وام هەرگیز لێوەی گۆی لێ نەبووە [و کوشتیان و ئینجا هەرشوێنمان کەوتن و ئومەیەش پیاوێکی قورس بوو] پێم وت: خۆت ڕزگار بکە و باوەڕیش ناکەم ڕزگارت بێت سوێند بەخوا هیچم پێ ناکرێت بۆت [کاتێك کە گەیشتنە سەرمان وتم بە چۆکەوە دانیشە، ئینجا من خۆمدا بەسەریدا بۆ ئەوەی بیپارێزم، بەڵام لەژێرمەوە بەشمشێر لێیاندا ومیەکێك لە شمشێرەکانیش بەر قاچی من کەوت].

[ڕیفاعەی کوری ڕافیع لەم بارەیەوە دەفەرمویێت: (لە ڕۆژی بەدردا خەڵکانێك لە موسوڵمانان کۆبوونەوە لەسەر ئومەیەی کوڕی خەلەف، منیش هاتم و تەماشام کرد قەڵغانەکەی سەرسنگی لەژێر باڵیدا پارچەیەکی لێ فرتاوە و منیش شمشێرێکم لێداو قەڵغانەکەیم پچڕاند)[٧٩٧]. پاشان کوژرا، دوای ئەوە ئیتر هەموو جار عەبدو ڕەحمان دەیوت: ڕەحمەتی خوا لە بیلال بێت قەڵغانەکانیشم لە دەست چوو وە منی تۆقاند بە کوشتنی هەردوو دیلەکەم)[٧٩٨].

---

(٧٩٦) اخرجه: البخاري (٢٣٠١).

(٧٩٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٤٢/٥) والبيهقي (الدلائل) (١٠٠/٣)، والحاكم (٢٣٢/٣) وصححه ووافقه الذهبـي، وقال ابن كثير (البداية) (٢٩١/٣): غريب من هذا الوجه وإسناده جيد.

(٧٩٨) أخرجه: ابن اسحاق كما في (السيرة) لابن هشام (٢٢٣/٢) (٢٥١٣)، وابن أبي شيه (٣٦٦٩٣)،والبزار (١٧٦٦)،والبيهقي (الدلائل) (٩٢/٣)، صحح استاده الارتؤواط في (زاد المعاد) (١٨٦/٣)، والعمري في (السيرة الصحيحة) (٣٦٤/٢).

## کۆتای شەڕەکە و کۆکردنەوەی کوژراوەکانی هەردوولا

بەم جۆرە شەڕەکە کۆتای هات و خوای گەورە موسوڵمانەکانی سەرخست و شکۆمەندی کردن و بەڵێنەکەی خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنایەدی وموشریکەکانی نابووت کرد و ژمارەیەکیان لێ کوژرا و هەندێکی تریان لێ بریندار کران وبەدیل گیران، سەبارەت بەژمارەی کوژراوەکانی هەردوولا چەندین ڕیوایەت لەو بارەیەوە هاتووە لەوانە: ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: یازدە کەس لە موسوڵمانەکان شەهید بوون لە جەنگی بەدردا ئەوانیش چوار لە (مهاجرین) وحەوتیش لە (انصار)، وە موشریکەکانیش چل و ئەوەندە یان پەنجا و ئەوەندەیان لێ کوژرا لەگەڵ چل و چوار دیلدا)[799].

موسای کوڕی عوقبەش ﷺ دەفەرموێت: (لەجەنگی بەدردا) چواردە کەس لەموسوڵمانەکان شەهیدکران شەش لە موهاجرەکان و هەشتیش لە ئەنصار، وە موشریکەکانیش چل و نۆ کەسیان لێ کوژرا و سی ونۆ کەسیشیان لێ بەدیل گیرا)[800]. ئەم دوو بۆ چوونە هەردووك لاوازن، بۆچوونی ڕاست و بەهێز ئەوەیە کە ژمارەی کوژراوەکان حەفتا کەس بوون و ژمارەی بەدیل گیراوەکانیش هەر حەفتا کەس بوون، بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی لەجەنگی بەدردا سەد و چل یان لەموشریکەکان پێکا، حەفتایان لێ کوشتن و حەفتایان لێ بە دیل گرتن)[801].

وە ئیمامی علی کوڕی ئەبو طالبیش ﷺ دەفەرموێت ((لەوجەنگەدا حەفتامان لێ کوشتن و حەفتامان لێ بە دیل گرتن)[802]. لە ناو کوژراوەکانی موشریکەکاندا کەسانێکی موسوڵمانی تێدا بوو کە بە پەنامەکی موسوڵمان بوو بوون و بە زۆر ڕاپێچی ئەم شەڕە کرابوون.

---

(٧٩٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢/٢٩٦)، والبيهقي (الدلائل) (٣/١٢٣).

(٨٠٠) أنظر: ابن عبدالبر في (الدرر) (١٠٩)، والبيهقي(الدلائل) (٣/١٢٢).

(٨٠١) أخرجه: البخاري (٣٩٨٦).

(٨٠٢) أخرجه: أحمد (المسند (٩٤٨) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح، وأبو داود (٢٦٦٥)، وابن حبان (٤٧٢٢).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویت: (كەسانێك لە خەڵكی مەككە بە نهێنی موسوڵمان بوو بوون، و موشریكەكان ئەوانیان لەگەڵ خۆیان ڕاپێچی شەڕەكە كردبوو، وە هەندێكیان بەركەوتن، و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەم هاوەڵانەمان موسوڵمان بوو بوون و ناچار كرابوون بۆ ئەم شەڕە و داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەكردن وخوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ ﴾ (النساء)[٨٠٣]. واتە: (بێگومان ئەوانەیان كە فریشتە گیانیكێشان، لەكاتێكدا ناهەقییان لەخۆیان كرد، چونكە (دار الشرك) یان بەجێ نەهێشت و كۆچیان نەكرد بۆ نیشتمانی ئیمان (مەدینە) بەرلەوە دەڵێن: باشە ئێوە لەكوێبوون، بۆچی لێرە كۆچتان نەكرد و لەگەڵ موشریكەكاندا مانەوە ؟! ئەڵێن: ئێمە لەو وڵاتەی مەككەدا بێ دەسەڵات و لاوازكرا بووین، نەمان دەتوانی بۆ هیچ لایە كۆچ بكەین و بەناچاریی هەر لەوشوێنە ماینەوە فریشتەكان دەڵێن: ئایا زەویی خوا فراوان و ئاواڵە نەبوو تا لەوێ كۆچ بكەن و بڕۆنە جێگایەكی ترو، بە ئازادانە خواپەرستی خۆتانتان كردبا؟ جا لە قیامەتدا ئەنواو جێگایان جەهەننەمەو، ئەویش چارەنووسێكی نالەبارو خراپە).

لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرمویت: (كەسانێكی موسوڵمان لەگەڵ موشریكەكان بوون و ژمارەیان زیاد دەكردن لە یەكێكیان دەدرا و دەكوژرا یاخود تیردەهات و یەكێكیانی دەكوشت، خوای گەورەش سەبارەت بەوان ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ....... ﴾ (النساء))[٨٠٤].

لە كۆتایی شەڕەكەدا پێغەمبەر ﷺ داوای لە هاوەڵانی كرد كە بەسەر كوژراوەكاندا بگەڕێن تا هەواڵی ئەبو جەهل بزانن، ئیبنو مەسعود ئەبو جەهلی دۆزییەوە هێشتا گیانی تیامابوو لەوێدا بەتەواوی كوشتی و گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەو مژدەیەی دایە، ئەم باسەش لە سێ ڕیوایەتدا هاتووە:

ئەنەس ﷺ دەفەرمویت: (پێغەمبەر ﷺ لەدوای جەنگی بەدردا فەرمووی: ((مَنْ يَنْظرُ ما يَصْنَع أبو جهل)) واتە: كێ دەچێت تەماشا بكات تابزانێت ئەبوجەهل چی بەسەرهات.

---

(٨٠٣) أخرجه: الطبري (التفسير) (٨١١٤)،والطحاوي (مشكل الأثار) (٣٦٨٧).

(٨٠٤) أخرجه: البخاري (٤٥٩٦)،والطبري(التفسير) (٨١١٦)،والطبراني (الكبير) (١١٥٠٥).

[((لەڕیوایەتێکی تردا: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بڕۆن لەناو کوژراوەکاندا بەدوای ئەبوجەهلدا بگەڕێن و گەر نەتان ناسییەوە تەماشای برینەکەی سەر ئەژنۆی بکەن، چونکە من و ئەو لە منداڵیدا شان بەشانی یەکترمان دەکرد بۆ چوونە سەر خوانێکی عەبدڵڵای کوڕی جەدعان من لەو کەمێك بەخۆ تر بووم و پاڵم پێوەنا لەسەر هەردوو ئەژنۆی کەوت ئەژنۆیەکی بریندار بوو لەدوایدا جێی برینەکەی هەر دیار بوو][٨٠٥]. ئیبنو مەسعودیش ﷺ (بەدوایدا گەڕا وبینیانەوە کە هەردوو کوڕەکەی عفراء (مەعاذ و مەعوذ) لێیان داوە بەشمشێر و لە جۆڵەیان خستووە، ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [بە ئەبوجەهل گەیشتم لە دواهەمین هەناسەیدا بوو و ناسیمەوە، و قاچم خستە سەر قوڕگی و پاشان پێم وت: ئا ئەوا خوا سەر شۆڕی کردیت هەی دوژمنی خوا؟ ئەبو جەهل وتی: بەچی سەر شۆڕبووم لەوە بەرزتر هەیە کە پیاوێك بەدەستی خزمانی بکوژرێت][٨٠٦]. [خۆزگە بەدەستی جوتیارێك نە دەکوژرام][٨٠٧]. [پێم بڵێ: سەرکەوتن ئەمڕۆ بۆکێ بوو؟ ئیبنو مسعودیش ﷺ وتی: بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو))][٨٠٨]. [پاشان ئەبو جەهل وتی: بەسەر شوێنێکی بەرزدا سەر کەوتیت هەی شوانە گچکەی مەڕ][٨٠٩].

ئیبنو مەسعود ﷺ لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: بە ئەبوجەهل گەیشتم لە ڕۆژی بەدردا هێشتا گیانی تیامابوو وپێم وت: ئەی دوژمنی خوا ئاوا خوا ڕسوا وسەرشۆڕی کردیت؟ وتی: بەچی سەرشۆڕبووم پیاوێکە و بەدەستی خۆتان کوژراوە. ئیبنو مسعود ﷺ دەفەرموێت: شمشێرێکم پێ بوو لێم ئەداو کاری تێنەدەکرد وئەویش شمشێرێکی باشی بەدەستەوە بوو لە دەستیم داو شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارێ وگرتم ولە ملمدا وپاشان هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەم پێگەیاند ئەویش فەرمووی (سوێندت دەدەم بەو خوایەی کەهیچ خوایەك نیە تەنها ئەو نەبێت، ئایا ئەم هەواڵە ڕاستە؟ (دووجار ئەمەی دووبارە کردەوە) وفەرمووی [(الله

(٨٠٥) أخرجه: الطبري (التأريخ) (٤٥٤/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٨٤/٣)، والاصبهاني (سيرهة السلف) (٦٥٦/٢) وقال محققه:انساده حسن.

(٨٠٦) أخرجه: أبو نعيم (الدلائل) رقم (٤١١).

(٨٠٧) أخرجه: أحمد (١٢١٤٣)، والبخاري (٣٩٦٣)، ومسلم (١٨٠٠) وأبي داود (٢٧١٠)، وابن أبي شيبة (٣٦٦٨٣).

(٨٠٨) أخرجه: أبو نعيم (الدلائل) رقم (٤٠٠).

(٨٠٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٨٧/٣)،والاصبهاني في (سيرالسلف) (٦٥٥/٢)، وقال محققه: إسناده ضعيف.

أكبر) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەبەڵێنەکەی خۆی هێنایە دی و ئاینەکەی خۆی شکۆدار کرد] وپاشان فەرمووی: (بڕۆرەوە و تەماشابکە تا زیاتر دڵنیا ببیت).

ئیبنو مەسعودیش ﷺ دەفەرمویت: من ڕۆیشتم بەخێرایی وەك باڵندە و گەڕامەوە خێرا و پێ ئەکەنیم و هەواڵەکەشم دووبارە پێگەیاندەوە، ئینجا فەرمووی ((بابڕۆین جێگەکەیم نیشان بدە))، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم و نیشانیمدا و کاتێك لەسەر لاشەکەی وەستا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوپاس بۆ [ئەو خوایەی کە ڕسوای کردیت ئەی دوژمنی خوا] ئا ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە))[٨١٠].

ڕیوایەتی سێهەم لەم باسە دا، ڕیوایەتەکەی (موسای کوڕی عوقبەیە) کە ناسراوە بە (أصح المغازي)، موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرمویت: ((پێغەمبەر ﷺ هات ولای کوژراوەکان وەستا و بەدوای ئەبوجەهلدا گەڕا وکەمێك ناڕەحەتی بە ڕوخساریەوە دیار بوو وە فەرمووی: ((خوایە لە دەستم دەرنەچێت فیرعەونی ئەم ئوممەتە)) هاوەڵانی بەهەموولادا بڵاوبوونەوە بۆ دۆزینەوەی. تا ئیبنو مەسعود دۆزییەوە تۆزێك لە ناوچەیەکی ئەو لای شەڕگەکەوە بوو و بینی وا تاس کڵاوە و زرێرپۆشەکەی لە سەردایە و شمشێرەکەی لەسەر ڕانەکانیەتی و برینی پێوە دیار نیە و توانای جووڵەکردنی تیانەماوە وسەری بەلا داشۆڕبووەتەوە و تەماشای زەویەکە دەکات. کاتێك ئیبنو مەسعود بینیی بە چواردەوریدا دەسوڕایەوە بۆ ئەوەی بیکوژێت و دەترسا لەوەی هەڵسێتەوە بۆی و پەلاماری بدات و زیاتر لێی نزیك بووەوە و زانی کەبریندار و توانای جوڵەی تیانەماوە، ویستی بە شمشێرەکەی لێی بدات ترسا لەوەی کە سوودی نەبێت، بۆیە لە دوای ئەبوجەهلەوە هات و شمشێرەکەی ئەوی دەرهێنا و لەملی داوکوشتی، و پاشان ئیبنو مەسعود گەڕایەوە و ئەم هەواڵانەی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ وە ئەویش فەرمووی (ئەوە لێدانی فریشتەکانە خوایە بەڵێنەکەت بۆ جێبەجێ کردم))[٨١١]. ئەمەو چەندەها ڕیوایەتی تر لەم بارەیەوە هەیە لەبەر

(٨١٠) أخرجه: أحمد (٤٢٤٦،٣٨٢٥)، وقال محققه الارناؤوط: إسناده ضعيف لأنقطاعه، وابن أبي شيبة (٣٧٣/١٤)، والطبراني (الكبير) (١٤٧٤)، والنسائي (الكبرى) (٢٧٠٩)، وابويعلى (٥٢٣١)، والبيهقي (الدلائل) (٨٨،٨٩/٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٦٥) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير محمد بن وهب وهوثقه، وقال صاحب (صحيح السيرة) (١٧٧/١): حديث حسن.

(٨١١) أخرجه: موسى بن عقبه كما في (الدلائل) للبيهقي (١١٦/٣)، و(تأريخ الاسلام) للذهبي (ص:١١١)، وانظر (المعازي) لعروة بن الزبير (ص:١٤٣،١٤٢).

زۆر لاوازیان نەم هێناون و تەنها ئەمانەم هەڵبژاردووە لەبەر ڕاستی و بەهێزیان. پێغەمبەر ﷺ مژدەی کوشتنی ئەبو جەهلی دایە عەمار کەباوك و دایکی بەدەستی ئەبو جەهل کوژرابوون.

ئیمامی موجاهید ﵀ دەفەرموێت (کاتێك ئەبو جەهل کوژرا، پێغەمبەر ﷺ بەعەماری وت: ((بکوژەکەی باوکت خوای گەورە کوشتی))[٨١٢].

## شاردنەوەی کوژراوانی قوڕەیش

پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە بیست و چوار لە ناودارانی قوڕەیش بشارێتەوە وبنێژرێن لەیەکێك لە بیرەکانی بەدردا: ئەبوطەلحە ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی بەدردا فەرمانیدا کە بیست و چوار پیاو لە ناودار و گەورە پیاوانی قوڕەیش [یەك بەسەر یەکدا] بخرێنە ناو یەکێك لەبیرە کۆنە پیسەکانی بەدر)[٨١٣].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا ئەو کوژراوانە فڕێ بدرێنە بیرە کۆنەکانەوە، ئەوە بوو هەموویان تێی فڕێ دران، تەنها ئومەیەی کوڕی خەلەف نەبێت کە پڕ بە قەڵغانی سەر سنگەکەی ئاوسا بوو ویستیان بیجوڵێنن بەڵام ئەندامەکانی لاشەی لەیەك دەبوونەوە وازیان لێ هێنا هەر بە خۆڵ و بەرد دایان پۆشی[٨١٤] (موسای کوری عوقبە ﵀ دەفەرموێت: چونکە ئومەیە پیاوێکی قەڵەو بوو وە (ڕۆژەکە گەرم بوو) و ئەو زۆر ئاوسابوو کاتێك ویستیان فڕێی بدەنە بیرەکەوە ئاوساوییەکەی تەقی و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((لێی گەڕێن)). هەرلەوێدا خۆڵ و بەردیان بەسەردا کرد و شاردیانەوە وناشتیان).

لەوێدا کاتێك ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوقبەی کوڕی ڕەبیعە، باوکی بەکوژراوی دی کە ڕادەکێشرا[٨١٥] بۆ بیرەکە تابیکەنە ناویەوە، لەوێدا دەم و چاوی گرژ بوو وە خەم دای گرت چونکە باوکی بە پیاوێکی ژیر دەزانی و هیوای بە موسوڵمان بوونی هەبوو.

---

(٨١٢) أخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٤٧٥/١)، وقال الحافظ في (الاصابة) (٣٣٥/٤) رقم (١٢٨٥):إسناده صحيح.

(٨١٣) أخرجه: أحمد (١٠٤/٣)،والبخاري (٣٩٧٦)، ومسلم (٢٨٧٣،٢٨٧٥).

(٨١٤) أخرجه: أحمد(٢٦٣٦١) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وقال الحافظ في(الفتح) (٣٨٦/٧): إسناده حسن.

(٨١٥) أخرجه: البيهقي(الدلائل) (١١٧/٢).

خاتو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: [کاتێك ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبە باوکی بینی بەکوژراوی ڕادەکێشرا بەرەو بیرەکە، پێغەمبەر ﷺ گرژییەکی بینی بەڕوخساریەوە] بۆیە پێی فەرموو ((ئەبو حوزیفە سوێند بەخوا وەك پێت ناخۆش بێت کە باوکت وای لێهاتووە و [ئەم دیمەنەت پێ ناخۆش بێت] ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا گومانم نەبووە لە خواو پێغەمبەرەکەی، بەڵام [باوکم پیاوێکی ناوداری لەسەرخۆ بوو] و خاوەن بیروڕابوو منیش هیوام وا بوو کە نەمرێت تا خوا هیدایەتی دەدات بۆ ئیسلام، کاتێك بینیم کە ئەوە ڕاستە لەدەستم چوو و بەم جۆرە کۆتایی هات ئەمە غەم باری کردم، پێغەمبەریش ﷺ لەوێدا دوعای خێری بۆ کرد)[٨١٦].

لەدوای ناشتنی کوژراوەکان، بە پێغەمبەر ﷺ وترا: با دوای کاروانەکەیان بکەوین، بەڵام ڕازی نەبوو، ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: ((کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە ناشتنی کوژراوەکان بووەوە پێی وترا: پەلاماری کاروانەکە بدە هیچ شتێکت لە بەردەمدا نیە، عەباسی مامی بەدەست بەستراوی بانگی لە پێغەمبەر ﷺ کردوو فەرمووی: ئەوە بەکەڵکت نایە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بۆچی))؟ عەباس فەرمووی: چونکە خوا تەنها بەڵێنی یەکێك لەو دووانە (سوپا، یان کاروانەکە)ی پێ دایت و بەڵێنەکەی خۆی بۆت جێبەجێکرد)[٨١٧].

لە ڕیوایەتێکی (ضعیف) داهاتووەکە عەباس هەر دوو دەستی کراوەتەوە تا ناڕەحەت نەبێت لەبەر ڕێزی پێغەمبەر ﷺ. ئیبنو عەباس ﵁ دەفەرموێت: (کاتێك ئێوارەی ڕۆژی یەکەمی بەدر بەسەردا هات، دیلەکان هەموو بەسترابوونەوە و پێغەمبەر ﷺ (سەرەتای ئەو شەوە) خەوی لێنەکەوت، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چیتە بۆ ناخەویت فەرمووی: گوێم لەناڵە ناڵی عەباسی مامەم بوو لە (دەست و قاچ بەستنەوەکەیدا) ئەوان چوون هەموو پەتەکانیان کردەوە وناڵە ناڵەکەی نەما، ئینجا پێغەمبەر ﷺ خەوی لێکەوت)[٨١٨].

(٨١٦) أخرجه: الحاكم (٢٢٤/٣)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٠٨٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده جيد، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٨٦/٧)ايضا:إسناده جيد.

(٨١٧) أخرجه: أحمد (٢٠٢٢)، وابن ابي شية (٣٧٦/١٤)، والترمذي (٣٠٨٠) وقال حسن صحيح، وابويعلى (٢٣٧٣)، والطبراني (الكبير) (١١٧٣٣)، والحاكم (٣٢٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي ايضاً في (تأريخ الاسلام) (ص:٩٩)، وقال ابن كثير في (التفسير) (١٣/٣)إسناده جيد.

(٨١٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (١٤١/٣) بسند فيه مجاهيل، وعبد الرزاق (المصنف) (٩٧٢٩).

موسوڵمانان هەواڵی ئەوەیان پێ گەیشت کە (کرز) بەخۆی و تیرەکەیەوە دێن بۆ فریاکەوتنی قورەیش، ئیمامی شەعبی ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمانەکان لەبەدردا هەواڵی ئەوەیان پێگەیشت کە کرز کوڕی جابری فەهری بەهێزێکەوە بەڕێکەوتووە بۆ پشتیوانی کردن لە موشریکەکان و موسڵمانان ئەمەیان بەلاوە ناخۆش بوو. وەخوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ (آل عمران) (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانت بڵێ ئایە هاورکاریی خودای بەس نیە بۆتان؟! کە سێ هەزار فریشتەی بۆ مەیدانی جەنگ دابەزاند کە یارمەتی دەر و هاوکارتان بوون) و ئەویش کە هەواڵی شکستەکەی قورەیشی پێگەیشت و نەهات بەهانایانەوە)[٨١٩].

## دابەش کردنی دەستکەوتەکان

دوای ئەوەی خوای گەورە بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێ کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، و موشریکەکان شکستیان هێنا کەلوپەل و کوژراوەکانیان لە دوای خۆیان بەجێ هێشت و خوای گەورە کردیە دەستکەوت بۆ موسوڵمانان و ئەوان کەوتنە کۆکردنەوەی بێ ئەوەی بزانن، ئایا ئەمە حەڵاڵە یان حرامە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (لە کاتی ڕۆژی بەدردا موسوڵمانەکان پەلەیان کرد و کەوتنە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان پێش ئەوەی بزانن بۆیان حەڵاڵە یان حەرام) وخوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ (الأنفال)[٨٢٠].

واتە: (ئەگەر پێشتر لەقەزاوقەدەری خودا نەنوسرایە، کەغەنیمەت و کڕینەوەی دیل حەڵاڵە بۆ ئەم ئومەتە، ئەوا بەهۆی وەرگرت و کڕینەوەی دیلەکانەوە توشی عەزابێکی گەورە دەبوون). سەرەتا کەمێك جیاوازی لە بۆچوونەکانی هاوەڵاندا هەبوو سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکان، چونکە هەندێکیان گەنج و چالاك بوون ، وە هەندێکیان بەتەمەن بوون، وە لەلایەکی ترەوە پێش شەڕەکە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری ئەوەی دابوو کە هەر کەسێك دەست بەسەر هەرشتێکدا بگرێت ئەوە بۆ خۆی

(٨١٩) أخرجه: ابن أبي حاتم (التفسير) (١٨٧٤)، والطبري (التفسير) (٦١٣٨)، ابن كثير في (التفسير) (٥٦٩/١)،وقال الحافظ في (الفتح) (٧/ ٢٨٥): سنده صحيح إلى الشعبي.

(٨٢٠) أخرجه: الترمذي (٣٠٨٤) وابن حبان (٨٤٠٦) وقال محققه: صحيح، وصححه الشيخ الالباني (رحمه لله) في (الصحيحة) (٢١٥٥) و(صحيح الترمذي) (٢٤٦٣).

دەبێت، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدردا فەرمووی: (([من فعلَ كَذا وَكَذا ، فلَهُ منَ النَّفلِ كَذا] [ومَن قتَلَ قَتيلًا فله كذا وكذا، ومَن أسَرَ أسيرًا فله كذا وكذا])). واتە: ((هەر کەسێك ئاوا و ئاوا بکات ئەوە و ئەوەی دەدرێتێ، وە هەر کەسێك یەکێکیان لێ بکوژێت ئەوە ئەوەو ئەوە بۆ ئەوە، وەهەر کەسێك یەکێکیان لێ بەدیل بگرێت ئەوە ئەوە و ئەوەی دەدرێتێ)).

بەبیستنی ئەم فەرموودەیە گەنجەکان بەپەلە بوون بۆ هێرش کردنە سەریان وە بەتەمەنەکانیان لای ئاڵاکان مانەوە، و کاتێك خوا سەری خستن، گەنجەکان هاتن و داوای ئەوانەیان کرد کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردبوو، لەویدا بەتەمەنەکانیان پێیان وتن: نابێ هەموو تەنها ئێوە بیبەن [چونکە ئێمە لە پشتتانەوە بووین گەر ئەوان بگەڕانایەتەوە ئەوا بۆ لای ئێمە دەگەڕانەوە]. خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ...فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ ....١﴾ (الأنفال). (واتە: گوێڕایەڵی خوا بکەن خوا باشتر لە ئێوە دەزانێت چارەنوسەکەی بەچی دەگات و نێوانتان چاك بکەن ئەوە خێری تیایە بۆ ئێوە)[٨٢١].

ئەم بۆ چونە جیاوازەش بۆیە هاتەکایەوە لە نێوان موسوڵماناندا، چونکە کاتێك موشریکەکان شکان و هەڵ هاتن هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ سێ بەش بوون: هەندێکیان لە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ مانەوە نەوەك دووژمن بگەڕێتەوە، وەهەندێکیان بەدوایان کەوتن بەدیلیان دەگرتن و دەیان کوشتن، وە هەندێکیان دەست کەوتەکانیان لە گۆڕەپانی جەنگەکە کۆ دەکردەوە.

عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەفەرموێت: (لەخزمەت پێغەمبەردا بووین لە جەنگی بەدردا، کە بەیەك گەیشتین خوای گەورە دوژمنی بەزاند، و هەندێکمان بەشوێنیان کەوتین ولێمان دەکوشتن و هەندێکمان دایان بە سەر کەل وپەل و خێوەتەکانیاندا و دەیان گرتن و کۆیان دەکردنەوە، وە هەندێکمان لە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ ماینەوە نەوەك کتوپڕ دوژمن فرسەتی لێ بهێنێت [ئەوە بوو کاتێك هاوەڵان کەلوپەلەکانیان

---

(٨٢١) أخرجه: ابوداود (٢٧٣٧،٢٧٣٨) والطبري (التفسير) (٣٦٧/١٣) (١٥٦٥١) وقال محققه أحمد شاكر: إسناده صحيح،والطبراني (الكبير) (٢٥٦٥٠)وابن ابي شية (٣٥٦/١٤) والنسائي الكبرى (١٣٢/٥) برقم (١١١٩٧) وابن حبان (٥٠٩٣) وقال محققه: صحيح، والحاكم (١٣١/٢)وصححه وقال الذهبي: على شرط البخاري، وصححه الشيخ الالباني في (صحح ابي داود) (٢٣٧٦،٢٣٧٧) وللفظ لابن حبان والطبري والزيادتان لأبي داود.

**کۆکردەوە بۆ چوونەکانیان جیاوازبوو]، تا شەو بەسەردا هات، هەموو هاتنەوە لای یەك و کۆبوونەوە ئەوانەی کە دەسکەوتەکانیان کۆکردبووەوە وتیان: ئێمە دەستمان بەسەردا گرت و کۆمانکردەوە و بۆ ئێمەیە و کەسی تر بەشی تێدا نیە و [پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا هەر کەسێکمان هەر شتێك دەست بەسەرا بگرێت ئەوە بۆ خۆیەتی] و ئێمە دەستمان بەسەر خێوەتگا و کەلوپەلەکاندا گرت و ئەوە تەنها بۆ ئێمەیە و بەشی کەسی تری تێدا نیە، ئەوانەی کە بەدوای دوژمندا ڕۆیشتبوون و هێرشیان بردبووە سەریان وتیان: [سوێند بەخوا ئەوە چەندە بەئێوە ڕەوایە ئەوەندەش بە ئێمە ڕەوایە (گەر ئێمە نەبووینایە چۆن دەستتان دەکەوت، ئێمە دوژمنمان سەر قاڵ کرد] ڕاوماننان و دوورمان خستنەوە لە کەلوپەلەکانیان، وە ئەوانەی کە بەچوار دەوری پێغەمبەرەوە ﷺ وە مابوونەوە بۆ پارێزگاری کردنی وتیان: ئەوە چەندە بە ئێوە ڕەوایە ئەوەندەش بەئێمە ڕەوایە ئێمە لە چوار دەوری پێغەمبەر ﷺ ماینەوە و بەمەوە سەر قاڵ بووین [سوێند بەخوا کاتێك لە شەڕدا بووین لەگەڵیاندا و ئەوان بەزین و ڕایان کرد و کەلوپەلەکانیان لەو ناوەدا بەجێما، گەر کۆمان کردایەتەوە و بمان بردایە کەس ڕێگرمان نەبوو، بەڵام ترساین کوتوپڕ و لەناکاو دوژمن هێرش بێنێتەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە وازمان لە کەلوپەلەکان هێنا و پێغەمبەرمان ﷺ پاراست].**

**[ئا لەو کاتەدا ئەبو یوسری کوڕی عەمرو دوو دیلی بەدەستەوە بوو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بەڵێنێك داینێ، کە هەر کەسێك یەکێکیان لێ بکوژێت، ئەوەندە بۆ ئەوە، وە هەرکەسێك یەکێکیان لێ بەدیل بگرێت ئەوەندە بۆ ئەوە، ئەوە دوو دیلم لەگەڵ خۆم هێناوە]. سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە نەبێت ئێمە قیامەتمان نەویستبێت. یاخود لە دوژمن ترسابین، بەڵام ئێمە لێرە ماینەوە بۆ ئەوەی نەك هەر خۆت بمێنیتەوە و دوژمن بێتەوە بۆت وە ئەگەر تۆ هەموو ئەوانە بدەیت بەوان هیچ نامێنێتەوە بۆ هاوەڵانت. ئیتر بوو بە دەمەقاڵە و ئەمان وایان دەوت و ئەوان وایان دەوت: عودبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك جیاوازی کەوتە نێوانمان سەبارەت بە دەسکەوتەکە و خوڕەوشتمان ناشیرین بوو، خوای گەورە لە هەمووانی سەندەوە و دایە دەستی پێغەمبەر ﷺ و ئەم ئایەتە دابەزاند: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ**

وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١﴾ (الأنفال).
**واتە: (هاوەڵان لە بابەت ئەو دەستكەوتەی جەنگی (بەدر)ەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ بۆ كێبێ و، چۆن دابەش دەكرێ ؟ پێیان بڵێ: حوكمی (ئەنفال) بەدەست خواو پەیامبەرە، دەبێ ئێوەش لەخوا ترستان هەبێ و، نێوان خۆتان بسازێنن و، گشت كاتێ لە فەرمانی خواو، لەقسەی پەیامبەری ئەو، گوێرایەڵیی بكەن، كە بڕواتان هێناوە، دەبێ ملكەچبن).**

**(ئەنجا هەموو دەسكەوتەكانمان هێناو دامان بە پێغەمبەر ﷺ و پاشان ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ..... ﴿٤١﴾ ﴾ (الأنفال). **واتا وە پێغەمبەریش ﷺ بەیەكسانی بەسەر هەمووماندا دابەشی كرد [و بەڕاستی ئەم كارە مل كەچی وگوێ ڕایەڵی بۆ خوای گەورەی تێدا بوو، وە گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر ﷺ تێدا بوو وە نێوانی هەموو لایەكی پێ چاك بوو] وە پێغەمبەر ﷺ گەر هێرشی ببردایەتە سەر خاكی دوژمن چوار یەكی دەسكەوتەكەی دابەش دەكرد..... و پاشان دەیفەرموو: (([لِيرُدَّ قويُّ المؤمنينَ على ضعيفِهم]))[٨٢٢] واتە: ئەو باوەڕدارانەی كە بەتوانا و دەوڵەمەندن با لە بەشەكەی خۆیان بەشی ئەو باوەڕدارانە بدەن كە دەست كورت و هەژارن).**

**وە هەندێ لە زانایان وەك (موجاهید و عكریمە و سەدی و ئەبو قاسم) پیان وایە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەسكەوتی بەدری دابەش كردووە بەبێ جیا كردنەوەی پێنج یەك، بەڵام ڕاست وایە كە پێنج یەك دابەش كرا بێت، وەك ئیبنو حەجەر ﷺ دەفەرموێت: (دەگونجێ كە دەسكەوتی بەدر بەیەكسانی دابەش كرابێت دوای دەركردنی پێنج یەكی پێغەمبەر ﷺ وەك لەبەسەرهاتی سریەكەی عەبدڵڵای كوڕی جەحشدا)[٨٢٣] هەموو دەسكەوتەكە كرا بە پێنج بەشەوە واتە پێنج یەكی دەسكەوتەكە بۆ پێغەمبەر بوو ﷺ وە (آل البيت)ی بەڕێزی، وە چوار بەشەكەی تر وەك یەك دابەشكران بەسەر موسوڵماناندا). وە پێغەمبەر ﷺ وشترێكی بە ئیمامی**

---

(٨٢٢) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٢٧٤٧-٢٢٧٦٢) وقال محققه الارناؤوط: حسن لغيره، والطبري في (التفسير) (١٢١٥٥)، وابن حبان (٤٨٥٥) وقال محققه:إسناده حسن، وعبدالرزاق (المصنف) (٩٤٨٣) وابن هشام (السيرة) برقم (٥٣١) والحاكم (١٣٥،٣٢٦/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٢٩٢/٦)،وقال الحافظ في (الفتح) (١٩٩/٦): أخرجه ابن اسحاق بسند حسن، واللفظ لأحمد، والزيادات للحاكم وعبد الرزاق وابن حبان.

(٨٢٣) انظر: (فتح الباري) (٢٤٥/٦) و (البداية والنهاية) (٣٠٣/٣) و (جامع البيان) (٢٣٥/٦).

عەلیدا لە پێنج یەکەکەی خۆی لە دەسکەوتەکەی بەدر)[٨٢٤]. وە بەم جۆرە زۆر بە دادپەروەرانە بەشکرا و هیچ شتێکیش لە دەسکەوتەکە نەدرا بەهیچ کەسێك پێش دابەشکردنەکە.

باشترین بەڵگەش بۆ ئەم باسە شمشێرەکەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەکە پێش بەشکردنەکە هەڵیگرتبوو لە دەسکەوتەکە و پێغەمبەریش ﷺ داوای لێ کرد کە بیگێڕێتەوە ناو دەسکەوتەکە و لە دوای دابەش کردنەکە بەر پێغەمبەر ﷺ کەوت و ئەویش بەخشیە سەعد، وەك لەم دوو ڕیوایەتەی سەعدا دەردەکەوێت:

### ١- سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص رضي الله عنه دەفەرموێت:

(لە جەنگی بەدردا عومەیری برام کوژرا و منیش سەعیدی کوڕی عاصم کوشت وشمشێرەکەیم هەڵگرت کە پێی دەوترا (ذا الکتیفة) هێنام بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرمووم: (بڕۆ فڕێیدەرە ناو دەسکەوتەکان)) منیش چووم فڕێم دایە ناو دەسکەوتەکان و گەڕامەوە، تەنها هەر خوا ئاگای لێبوو کە چەندە دڵتەنگی و غەمباری ڕووی تێکردم، کە عومەیری برام کوژراوە، و دەسکەوتەکەشم لێ سەندرایەوە کەمێك لەو ناوە دوور کەوتمەوە وخوای گەورە (سورة الانفال)ی دابەزاند (پێغەمبەر ﷺ لەبەشەکەی خۆیدا) فەرمووی: (بڕۆ شمشێرەکەت هەڵبگرەوە)[٨٢٥].

### ٢- هەروەها سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص دەفەرموێت:

(لە جەنگی بەدردا هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وشمشێرێکم بەدەستەوە بوو، وتم: ئەمڕۆ خوا خەفەتی لە دڵمدا نەهێشت (سەبارەت بە موشریکەکان) و ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ هَذا السَّيفَ ليْسَ لِيَ وَلالك [ضَعْهُ])) واتە: ئەو شمشێرە نەهی منە و نەهی تۆیە بڕۆ بیکەرە ناو دەسکەوتەکانەوە و داینێ، [منیش چووم دامنا و پاشان گەڕامەوە] و من لە دڵی خۆمدا دەموت: [لەوە دەچێت ئەمڕۆ ئەو شمشێرە بدرێتە یەکێك کە وەك من ڕۆڵی لە جەنگەکەدا نەدیبێت] من لەم خەیاڵانە دابووم ئەوەندەم نەزانی نێرراوێك [لەدوامەوە بانگی لێدەکردم] و دەیوت: پێغەمبەر ﷺ بانگت دەکات. منیش وام زانی ئایەت لە بارەی خەیاڵ و وتەکەی منەوە

---

(٨٢٤) أخرجه: البخاري (٣٠٩١)، و (٣٧١١)، و المسلم (٨٦/٦).

(٨٢٥) أخرجه: ابن ابي شية (٣٧٠/١٢) وأحمد (١٨٠/١) برقم (١٥٥٦) وقال محققه الارناؤط: حسن لغيره.

دابەزیوە، خێرا هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وپێی فەرمووم: (تۆ کاتێك داوای ئەم شمشێرەت لێ کردم نەهی من بوو وە نەهی تۆ، بەڵام ئێستا خوای گەورە داویەتیە من (واتە: بەر بەشەکەی من کەوتووە) منیش دەیبەخشمە تۆ)[٨٢٦].

لەم شەڕەدا پێغەمبەر ﷺ کەلوپەلەکەی ئەبوجەهلی دایە مەعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەموح[٨٢٧]، وە شمشێرەکەشی بەر ئیبنو مەسعود کەوت، وەك خۆی دەفەرموێت: (لەجەنگی بەدردا پێغەمبەر ﷺ شمشێرەکەی ئەبوجەهلی دایە من)[٨٢٨]. وە شمشێرێك کەناوی (ذا الفقار) بوو لەگەڵ وشترەکەی ئەبوجەهل بەر پێغەمبەر ﷺ، کەوت، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (شمشێرەکەی پێغەمبەر ﷺ کەناوی (ذا الفقار) بوو، لەجەنگی بەدردا بەری کەوت)[٨٢٩]. ئەم شمشێرە دوو سەر نەبووە، بەڵکو چەند خەتێکی تیابووە، وەك ئەصمەعی بینیویەتی دەڵێت: (چووینە ژوورەوە بۆ لای خەلیفە رشید وپێی وتین: شمشێرەکەی (ذا الفقار)ی پێغەمبەرتان ﷺ نیشان بدەم؟ وتمان: بەڵێ، چوو هێنای، ومن لە ژیانمدا شمشێری وا جوانم نەدی بوو ئەگەر بووە ستێنرایە هیچی تیا نەدەبینرا، بەڵام گەر بەلادا دابنرایە حەوت خەتی تیا دەبینرا وە سەرت سوڕدەما لەجوانی ئەم شمشێرە یەمانی یە)[٨٣٠].

وە وشترەکەی ئەبوجەهلیش پێغەمبەر ﷺ کردیە قوربانی لە ساڵی حودەیبیەدا وەك ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ وشترەکەی ئەبو جەهلی بەرکەوت لەشەڕی بەدردا، و پارچە زیوێك بە پێشە سەریەوە بوو، لە ساڵی حودەیبیەدا کردیە قوربانی)[٨٣١].

---

(٨٢٦) أخرجه: أحمد (١٥٣٨) وقال محققه: إسناده حسن، ومسلم (١٧٤٨)، ١٨٧٧)، والترمذي (٣٠٨٠)، ابي داود (٢٧٤٠) والنسائي (الكبرى) (١١١٩٦) والحاكم (١٣٢/٢) وصححه ووافقه الذهبي وصححه الشيخ الالباني في: (صحيح الترمذي) (٢٤٦٠) و(صحيح ابي داود) (٢٣٧٨).

(٨٢٧) أخرجه: البخاري (٣٩٨٨) ومسلم (١٧٥٢).

(٨٢٨) أخرجه: أحمد (٤٢٤٦) وقال محققه: إسناده ضعيف لانقطاعه،وابن ابي شية (٣٧٣/١٢)، وابو يعلى (٥٢٣١)، والطبراني (لكبير) (٨٤٦٩).

(٨٢٩) أخرجه: أحمد (٢٧١/١)، والترمذي (١٥٦١)، وابن ماجه (٢٨٠٨)، والحاكم (١١٩/٢)،وصححه ووافقه الذهبي، والطبراني (الكبير) (١٠٧٣٣) وحسنة الشيَخ الالباني في (صحيح الترمذي) (١٢٢٦)، و (صحح ابن ماجه) (٢٢٦٦).

(٨٣٠) انظر: (المقاصد الحسنة) للامام السخاوي رقم (١٣٠٧).

(٨٣١) أخرجه: أحمد (٢٣٦٢) وقال محققه الارناؤوط: حديث حسن، وأبو داود (١٧٣٢) والترمذي (٨١٥) وابن ماجة (٣١٠٠) والبيهقي (الكبرى) (٢٣٠/٥) وقال: إسناده صحيح، وصححه الشيَخ الالباني في (صحح ابي داود) (١٥٣٨)،و(صحيح الترمذي) (٦٥٢)، و(صحيح ابن ماجه) (٢٥١٦).

وە هەر لەو ڕۆژەدا پارچە قەیفەیەکی سوور دیار نەما هەندێك وایان زانی گەیشتوەتەوە پێغەمبەر ﷺ، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە دابەزی سەبارەت بەپارچە قەیفەیەکی سوورکە ون بوو بوو لەجەنگی بەدردا، و هەندێك دەیان وت: بەڵکو گەیشتبێتەوە بەپێغەمبەر ﷺ ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾﴾ (آل عمران) (واتە: بێگومان خیانەت بۆ هیچ پەیامبەرێك شیا و نییە و ناشێ، لەگەڵ خەڵکیدا بیکا، بەتایبەتی لە دەستکەوتی جەنگدا هەر کەسێ خیانەت بکات، ئەوا لەرۆژی قیامەتدا ئەو دزیەی بەکۆڵیەوەیە -بۆ ئەوە ئابڕوی بچێت- دەبینرێ، لەپاشان هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەکەی خۆی سزا دەدر، و ستەمی هیچ شتێکیشیان لێناکرێ))[٨٣٢].

ئەم هەموو دەسکەوتە بەهۆی پاڕانەوەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو لە خوای گەورە کە داوایکرد هاوەڵانی تێرو پۆشتە و سوار بکات، وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کە دەرچوو بۆ شەڕی بەدر لەگەڵ سێ سەد و پانزە لە هاوەڵانی، پاڕایەوە لە خواو فەرمووی: ((اللَّهمَّ إنَّهم حُفاةٌ فاحملْهم اللَّهمَّ إنَّهم عُراةٌ فاكسُهم اللَّهمَّ إنَّهم جياعٌ فأشبعهم)) واتە: خوایە ئەوانە پێ پەتین سواریان بکەیت، وئەوانە کە ڕووتن پۆشتەیان بکەیت، وە ئەوانەی برسین تێریان بکەیت)[٨٣٣] ئەوە بوو خوای گەورە دەسکەوتەکەی جەنگی بەدری بەڕوودا کردنەوە، و کاتێك گەڕانەوە هەموو پیاوێك لەوان وشترێك یان دوو وشتری لەگەڵ خۆی هێنایەوە، و هەموویان پۆشتەو تێر بوون).

## پێغەمبەر ﷺ بانگ لە کوژراوەکانی ناو بیرەکە دەکات

پێغەمبەر ﷺ لە گۆڕەپانی هەموو شەڕگەیەکدا سێ ڕۆژ دەمایەوە و پاشان بەجێی دەهێشت، دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لە شەڕگەکەی بەدردا مایەوە، لە ئێوارە ی سێهەم ڕۆژدا هات بۆ لای (القليب) واتە: (ئەو بیرە کۆنەی کە پڕ نەکرابووەوە) وە لاشەی بیست و چوار لەسەرکردە و ناو دارەکانی قوڕەیشی تێفڕێ درابوو، وەستا وبانگی لێکردن.

(٨٣٢) أخرجه: الترمذي (٣٠٠٩) وقال حسن غريب، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٠٧)، و (الصحيحة (٢٧٨٨).

(٨٣٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٥)،(وابو داود) (٢٧٤٧) والحاكم برقم (٢٦٤٣) وقال صحيح على شرطهما ووافقه الذهبي، وحسنة الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٨٦).

ئەم بەسەر هاتەش ئەبو طەڵحە ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەسەر هەرکەسانێکدا سەر بکەوتایە لەجەنگدا سێ ڕۆژ لەشەڕگەکەدا دەمایەوە، کاتێکیش کە لە سێهەم ڕۆژی مانەوەیدا بوو لەبەدردا [لەنیوە شەودا] فەرمانیدا وشترەکەی ئامادە بکرێت [کاتێك کە هەموو خۆیان ئامادەکردووە بۆ گەڕانەوە] پاشان بە پێ ڕۆیشت و هاوەڵانی دوای کەوتن و دەیان وت: لەوە دەچێت بۆ هەندێ ئیش وکاری خۆی بچێت تا ڕۆیشت و لەقەراغی بیرە کۆنەکەی [کە ئەبو جەهل و هاوڕێکانی تێ فڕێدرابوون. لەدوای کوشتنیان بەسێ شەو] وەستا و دەستی کرد بەبانگ لێکردنیان بەناوی خۆیان و باوکیانەوە و فەرمووی: (([يا أهل القليب] [يا أبا جهلِ بنَ هِشامٍ، يا عُتْبةَ بنَ رَبيعةَ، يا شَيْبةَ بنَ رَبيعةَ، فهلْ وجَدْتُم ما وعَدَكم ربُّكم حَقًّا؟ فإنِّي قد وجَدْتُ ما وعَدَني ربِّي حَقًّا)) واتە: ئەی ئەوانەی کە لەم بیرە کۆنە دان، ئەی ئەبوجەهلی کوڕی هیشام، ئەی ئومەیەی کوڕی خەلەف، ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، ئێستا پێتان خۆشە کە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر ﷺ بونایە، ئایا بەڵێنەکەی خوای خۆتان دییەوە و پێی گەیشتن بەڕاستی، چونکە من بەڵێنەکەی خوای خۆم دی بە ڕاستی.

ئیمامی عومەر ﷺ ئەم وتەیەی پێغەمبەری ﷺ گوێ لێ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەگەڵ کۆمەڵێك لاشەی بێ ڕوحدا دەدوێیت: [ئەوانە چۆن گوێیان لێ یە و چۆن وەڵام دەدەنەوە، دوای ئەوەی بوون بە کەلاکێکی بۆگەن؟] (ئایا لە دوای سێ ڕۆژ بانگیان لێ دەکەیت؟ و ئایا ئەو وتانە دەبیستن)؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وَالَّذِي نَفْسِي بيَدِهِ ما أَنْتُمْ بأَسْمع لِما أَقُولُ منهمْ، [وَلَكِنَّهُمْ اليَوم] [أُتْبِعَ أصْحَابُ القَلِيبِ لَعْنَةً])). واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئێوە باشتر لەوان وتەکانی من نابیستن: (واتە: ئێستا ئەوان وەك ئێوە وتەکان دەبیستن) بەڵام ئەوان [ئەمڕۆ] ناتوانن وەڵام بدەنەوە، ئەوان نەفرەتیان بەدواداچوو)).

قەتادە ﷺ دەفەرموێت: خوای گەورە ئەوانی زیندوو کردەوە لەو کاتەدا تا ئەو وتانەیان بیست ئەویش بۆ ناشرین کردنیان وە بچوك کردنیان وە غەم و پەشیمانیان)[٨٣٤]. سەبارەت بەدرێژەی وتەکەی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا دوو فەرموودە

(٨٣٤) أخرجه: البخاري (٣٩٨٠،٣٩٧٩،٣٩٧٦)، ومسلم (٢٨٧٥،٢٨٧٣)، وأحمد (١٠٤/٣) في رواية وصحح إسناده ابن كثير في (البداية) (٢٩٣/٣)، وأحمد (٢٨٧/٣)، وفي رواية اخرى النسائي (١٠٩/٤) والطبراني (الكبير) (١٠٣٢٠)، وصحح

هەن کە هەردووکیان (ضعیف)ن تەنها بۆ ئاگابوون دەی هێنین:

**١- لە عائیشەوە رضي الله عنها گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی:**

(پێغەمبەرﷺ) بانگی لێکردن و فەرمووی: (جَزاكُمُ اللهُ شَرًّا مِن قَومِ نَبيٍّ، ما كان أسوَأَ الطَّرَدَ! وأشَدَّ التَّكذيبَ!)) واتە: خوا جەزای ئەو خراپانەتان بداتەوە کەلەگەڵ خزمێك و پێغەمبەرەکەی خۆتان ئەنجامتاندا چەندە بەتوندی بەدرۆتان خستەوە وبەناشرینی دەرتان کرد)[٨٣٥].

**٢- ئیبنو ئیسحاق رحمه الله گێڕاویەتیەوە کە بانگی لێ کردوون وفەرموویەتی:**

((یا أهلَ القَلیب بِئْسَ عشیرةُ النَّبيِّ کنتم لنبیِّکم ، کذَّبتموني وصدَّقني النَّاسُ ، وأخرجتموني وآواني النَّاسُ، وقاتلتموني ونصرني النَّاسُ)) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە لەم بیرە کۆنە دان: خراپ ترین خزمانی پێغەمبەر ئێوە بوون بۆ پێغەمبەرەکەتان، ئێوە منتان بەدرۆ خستەوە وخەڵکی منیان بەڕاست خستەوە ئێوە منتان دەرکرد، وخەڵکی منیان گرتەخۆ، ئێوە بەشەڕ هاتن لەگەڵمدا وخەڵکی منیان سەرخست)[٨٣٦].

## گەڕانەوە بەرە و مەدینە و کوشتنی عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط

پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەڕانەوەو بەرەو شاری مەدینە بە دەسکەوتەکان و دیلەکانەوە، لەڕێگادا بڕیاری کوشتنی توعەیمە و عوقبە و نەزر درا، چونکە ئەمانە گەورە تاوانبارانی جەنگ بوون کە بە هەموو یاسا و نەریتێك بڕیاری کوشتنیان دەدرێت لەسەر ئەو هەموو تاوانە گەورانەی کە ئەنجامیان داوە.

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت: (گەڕانەوە تا گەیشتنە ناوچەی (الصفراء) لەوێدا نەزری کوڕی حارث بەدەستی عەلی کوڕی ئەبو طالیب کوژرا..... ئینجا بەڕێ کەوتن

---

إسناده الحافظ في (الفتح) (٣٠٣/٧)، وأبو داود (٢٦٩٥) وابن ابي عاصم (السنة) (٩٠٤) وقال محققه: حديث صحيح، وابن هشام (السيرة) (٥٢٦) وجود إسناده الحافظ في (الفتح) (٣٨٦/٧) والبيهقي (الدلائل) (١١٧/٢) واللفظ للبخاري والزيادات لأحمدوابن ابي عاصم ومسلم والطبراني.

(٨٣٥) أخرجه: أحمد (١٧٠/٦) برقم (٢٥٣٧٢) وقال محققه الارنوط: إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٨٣٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣١/٢) رقم (٥٢٧) بلاغاً بدون إسناد، وضعفه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٢٤٨).

تا گەیشتنە ناوچەی (عرق الظبية) لەوێدا عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط کوژرا)[٨٣٧].

سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کوشتنی سێ کەسیدا لە ڕۆژی بەدر)[٨٣٨]. لەڕیوایەتێکی تردا، ئیبنو عەباس ﷺ لێیان گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (سیان لەو ڕۆژەدا کوژران، نەزری کوڕی حاریث، وتوعەیمەی کوڕی عەدی، و عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیت)[٨٣٩]. بەڵام ڕاست وایە کە تەنها عوقبە کوژراوە، وەك موسای کوڕی عوقبە لە مەغازیە کەیدا کە (أصح المغازية) لای زانایان فەرموویەتی: (لەدیلەکاندا تەنها عوقبە کوژراوە ئەویش بەدەستی عاصی کوڕی ثابت)[٨٤٠].

لەڕیوایەتەکەی ئیبنو عەباسدا ﷺ هاتووە کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کوشتوویەتی وەك دەفەرموێت: (عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیت کوژرا پێش ئازاد کردنەکە بە(فدية) لەوێدا عوقبە وتی: منداڵەکان کوێیان بۆ هەیە ئەی محمد؟ فەرمووی: ((ئاگری دۆزەخ))[٨٤١]. (لەوێدا هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی قورەیش بۆ لەناو هەمووتاندا دەکوژرێم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بِكُفرِكَ بِاللهِ (وَفُجُورِكَ وَعُتوكَ) (وَعلى عَداوتكَ) للهَ وَرَسُولِهِ). واتە: لەبەر بێباوەڕ بونت بەخواو زیادە ڕەویت لە خراپەکاریت لەدوژمنایەتیدا بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، پاشان بەدەستی عەلی کوڕی ئەبو طالیب کوژرا)[٨٤٢]. وە زیاد لەوەش لە شاری مەککەدا تەنها ئەم دوژمنە سەرسەختە تف و بەڵغەمی لەڕووی پێغەمبەر ﷺ کردووە، و شیلاوك و ناوسکی پیسی وشتری سەربڕاوی کردوە بەسەر پێغەمبەردا ﷺ لە نوێژدا وە بەهەموو

---

(٨٣٧) انظر: (السيرة) لأبن هشام (٢٣٦/٢) رقم (٥٣٥) و (التأريخ) للطبرى (٤٥٩/٢).

(٨٣٨) أخرجه: ابو داود في (المراسيل) (ص:٢٧) وقال الحافظ في (بلوغ المرام) (١٣٥٦): رجاله ثقات.

(٨٣٩) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (١٤٢٠)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠١٩): فيه عبدالله بن حماد لم اعرفة وبقية رجاله ثقات.

(٨٤٠) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (١١٧/٣)، وابن كثير(البداية) (٣٠٥/٣)، وابن هشام (السيرة) (٥٣٦).

(٨٤١) أخرجه:عبدالرزاق (٩٣٩٤)، وأبو داود (٢٦٨٦)، والطبراني (الكبير) (١٢١٥٤)، والحاكم (١٢٤/٢) وصححه على، شرطهما ووافقه الذهبي، وحسن إسناده الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٣٣٦)، و(الارواء) (١٢١٨،١٢١٤).

(٨٤٢) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٣١)، والبزار(١٧٨١)، والبيهقي (الكبرى) (٣٢٣/٦) (١٨٥٣٤)، وفي (الدلائل) (١١٧/٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٨٩/٦): رواه البزار وفيه يحيى بن سلمة ضعيف و وثقه ابن حبان وقال محقق (الشفا) لقاض عياض (١٧٧٠): إسناده ضعيف.

شێومیەك ئازاری پێغەمبەری داوە ﷺ (وەك لەپێشەوە باسمان کرد).

ئیبنو عەباس ﷺ فەرموویەتی: (عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط لەهەر سەفەرێك کەدەگەڕایەوە خواردنێکی دروست دەکرد و دراوسێکان و هەندێ کەسانی ناو شاری مەککەی بۆ بانگ دەکرد، و زۆرجار دەچوو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشت و فەرموودەکانی ئەوی بەلاوە باش بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا خۆی زۆر پیاوێکی خراپ بوو، جارێکیان لەگەشتێکی گەڕایەوە وە خواردنێکی دروست کرد و پێغەمبەری ﷺ بۆ ئەو خواردنە بانگ کرد، و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ما أنا بِالَّذِي آكُلُ مِن طَعامِكَ حَتّى تَشْهَدَ أنْ لا إلَهَ إلّا اللَّهُ، وأنِّي رَسُولُ اللَّهِ)) واتە: من ئەو کەسە نیم خواردنەکەت بخۆم تا شایەتی نەدەیت کە خوا تاك و تەنهایە و منیش پێغەمبەری خوام. عوقبە داواکاریەکی دووبارە کردەوە و پێغەمبەریش ﷺ هەمان وەڵامی دایەوە، پاشان عوقبە شایەتمانی هێنا، و پێغەمبەریش ﷺ خواردنەکەی خوارد، ئەم باسە گەیشتەوە بە ئوبەی کوڕی خەلەف ئەویش هات بۆ لای عوقبەی هاوڕێی و پێی وت: بێدین بوویت عوقبە؟ عوقبەیش وتی: نا من بێدین نەبووم، بەڵام پیاوێکم بانگ کرد بۆماڵەکەم و ڕازی نەبوو نانەکەم بخوات تا شایەتی بۆ نەدەم منیش شەرمم کرد کەلەماڵەکەم بڕواتە دەرەوە و نانەکەم نەخوات بۆیە شایەتیم بۆدا. ئوبەی پێی وت: من بەمە لێت ڕازی نابم هەرگیز هەتا نەچیتە لای تفی لێ نەکەیت، ئەوە بوو ئەو کارە ناپەسەندەی ئەنجام دا، وە ڕۆژێکی تریش (لەسەر داوای ئەبو جەهل شیلاوگ و ناوسکی وشتری هەڵگرت، و کە پێغەمبەر ﷺ چووە سوجدە، کردیە سەر مل و سەرو ناوشانی پێغەمبەر ﷺ (کە تەنها ئەم توانیویەتی و ڕێگەی بەخۆی داوە لەناو هەموو قورەیشدا ئەم کارە ناپەسەندە ئەنجام بدات))[٨٤٣]. [و پێغەمبەریش ﷺ پێی وت: ((لا أَلْقاكَ خارِجًا مِنْ مَكَّةَ إِلَّا عَلَوْتُ رَأْسَكَ بِالسَّيْفِ)) واتە: گەر پێت بگەم لە دەرەوەی مەککەدا بەشمشێر لەسەرت دەدەم، ئەوە بوو ئەم تاوانبارە لەشەڕی بەدردا بەدیل گیراو لەناو هەموویاندا تەنها ئەم لەملی دراو کوژرا))][٨٤٤]. وە ئەم تاوانبارە هەر ئەو کەسەبوو کە، (کاتێك پێغەمبەر ﷺ بوردەیەکی بەشانەوە بوو نوێژی دەکرد لای کەعبە، هات لەپشتەوە بووردەکەی پێغەمبەری ﷺ گرت و گرێیدا لەملی داو بەتوندی جەڕاندی

(٨٤٣) أخرجه: أحمد (٤١٧/١) والبخاري (٣١٨٥،٣٩٦٠) ومسلم (٤٦٢٥) والنسائي (١٦١/١) وابن حبان(٦٥٧٠).

(٨٤٤) أخرجه: ابو نعيم (الدلائل) (٤٠١) وقال السيوطي في(الخصائص الكبرى) (٥١٥/١) أخرجه ابو نعيم بسند صحيح.

هەتا وەخت بوو بخنکێت، تا ئەبو بەکر لە دوورەوە هات و عوقبەی دوور خستەوە و پێغەمبەر ﷺ هێشتا هەر لە نوێژەکەیدابوو)[٨٤٥].

## هەواڵی شکستەکەی قورەیش دەگاتە مەککە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (یەکەم کەس هەواڵی شکستەکەی گەیاندە شاری مەککە حیسمانی کوڕی عەبدوللای خوزاعی بوو هات و پێیان وت: هەواڵ چۆنە وچی ڕوویدا؟ ئەویش وتی: عوقبەی کوڕی ڕەبیعە، و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، و ئەبو حەکەمی کوڕی هیشام، و ئومەیەی کوڕی خەلەف، وزمعەی کوڕی ئەسوەد و ونەبیهە و مونەبیهی هەردوو کوڕەکەی حەجاج و ئەبول بوختوری کوڕی هیشام کوژران.... کاتێك کە ئاوها ناوی ناو دارانی قورەیشی دەهێنا یەك بەدوای یەکدا، صەفوانی کوڕی ئومەیەش لای (الحجر)ی کەعبە دانیشتبوو وتی: [سوێند بە خوا ئەم پیاوە هۆشی خۆی لەدەست داوە، و دڵی فڕیوە و ئاگای لەخۆی نەماوە، ئێوە پرسیاری منیشی لێبکەن، وابزانم ئێستا باسی کوشتنی منیش دەکات، هەندێکیان پێیان وت: ئەی هەواڵی صەفوانی کوڕی ئومەیەت لایە؟

وتی بەڵێ: ئا ئەوەتا دانیشتووە لە (الحجر))]، وەسوێند بەخوا باوکی و براکەیم بینی کاتێ کە کوژران. [پاشان تاکوتەراکانی قورەیش یەك بەدوای یەکدا گەڕانەوە شاری مەککە و هەواڵەکەیان ڕاگەیاند][٨٤٦].

موسای کوڕی عوقبەش ﷺ دەفەرموێت: (ئیتر بەم جۆرە دانیشتوانی شاری مەککە لە هەموو ماڵێکدا یەك مانگ شیوەنیان گێڕا، و ژنانیان پرچی خۆیان بڕی، و وشتر و ئەسپی کوژراوەکانیان دەهێنا و دمیان وەستان و ژنان گریان وشیوەنیان بەچوار دەوریدا دەکرد، و لە هەموو کۆڵانەکاندا هەر شیوەن بوو)[٨٤٧].

---

(٨٤٥) أخرجه: البخاري (٣٦٧٨،٣٨٥٦)، وابو نعيم (الدلائل) (١٥٩) وابن ابي شية (٢٩٧/١٤)، وابو يعلى (٣٤٣/١)، وابن حبان (٦٥٦٩).

(٨٤٦) انظر: (السيرة) لابن هشام (٢٣٩/٢) برقم (٥٤٠)، (الدلائل) للبيهقي) (١١٦/٣)، و (التأريخ) للطبري (٤٦١/٢)، و (البداية) لابن كثير (٣٧٥/٣).

(٨٤٧) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (١١٧/٣) و (البداية) لابن كثير (٣٠٨/٣).

عەبدوللای کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (قوڕەیش سەرەتا بڕیاری شیوەن و گریانی زۆریدا، کە بکرێت لەسەر کوژراوەکانی بەڵام دواجار پاشگەزبوونەوە لەم بڕیارەیان و وتیان: شیوەن بۆ کوژراوەکانتان مەکەن. نەوەك ئەم باسە بگاتەوە ئەوان و خۆش حاڵ بن)[٨٤٨].

سەبارەت بەم باسە ڕیوایەتێکی (ضعیف) هەیە کە (باس لەوە دەکات کە موسوڵمانە چەوساوەکانی شاری مەککە کاتێك هەواڵی شکست خواردنەکەی قوڕەیشیان پێ گەیشت زۆر دڵ خۆش بوون و هەستیان بەهێزی خۆیان دەکرد، وە چۆن ئەبو سوفیانی کوڕی حاریث گەڕایەوە وە باسی پیاوانێکی سپی بەسەر ئەسپی بەڵەکەوە دەکرد لەجەنگی بەدردا، و چۆن ئەبو لەهەب سوێ و ناڕەحەتی ئەم شکستە زۆر چووە ناخیەوە و دوای حەوت ڕۆژ لەو باسە مردووە....) بەڵام ئەم ڕیواتە (ضعیف)ە بۆیە بەدرێژی نەمان هێنا)[٨٤٩].

## پێغەمبەر ﷺ مژدەی سەرکەوتنەکە دەداتە شاری مەدینە

ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: (لەدوای تەواو بوونی شەڕی بەدر و گەڕانەوەیان پێغەمبەر ﷺ، دوو کەسی نارد تا ئەو مژدەی سەرکەوتنە بگەیەننە شاری مەدینە، ئەوانیش زەیدی کوڕی حاریثە بوو کە ناردی بۆ مژدەدان بەدانیشتوانی خوارووی شاری مەدینە، وە عەبدوللای کوڕی ڕەواحەشی نارد بۆ مژدەدان بەدانیشتوانی بەشی سەرووی شاری مەدینە (وەك نیشانەیەکی ڕاستی هەواڵەکە) [زەیدی کوڕی حاریثە بەسواری وشترەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ کەناوی (العضباء) بوو مژدەکەی دەگەیاند] وگەیشت بە کوڕەکەی کە ناوی ئوسامە بوو کاتێك ئەوان لە تەواو بووندا بوون لە ناشتنی ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ، ئوسامە ﷺ دەفەرموێت: [گوێم لەدەنگە دەنگ بوو وتیان: ئا ئەوە باوکتە وە گەڕاوەتەوە، تەماشام کرد].

---

(٨٤٨) أخرجه: الطبراني (٢٠٠/١٩)،وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٢١): رجاله ثقات.

(٨٤٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٣٨٦٤) وقال محققه الارناؤوط:إسناده ضعيف،والطبراني (الكبير) (٩١٢)، وعبد الرزاق (٩٤٠١)، والحكم (٣٢١/٣)، والبزار (١٧٧٨).

وا وەستاوە مژدەکە دەگەیەنێت دەڵێت: عوقبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا لەگەڵ شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەبوجەهلی کوڕی هیشام و نەبیهە و مونەبیهە و ئومەیەی کوڕی خەلەف منیش وتم: باوەگیان ئەوە بە ڕاستە؟ باوکم وتی: بەڵێ سوێند بەخوا ئەی کوڕی خۆم، (ئوسامە دەفەرموێت: سوێند بەخوا من، زۆر دڵنیا نەبووم لەم هەواڵە تا پێغەمبەرم ﷺ بینی و دیلەکانی لەگەڵبوو، پێغەمبەریش ﷺ بە عوسمانی کوڕی عەفانی فەرموو: ((إِنَّ لكَ أجْرَ رَجُلٍ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا، وسَهْمَهُ))[٨٥٠] واتە: پاداشت و بەشی دەسکەوتی پیاوێکت بۆ هەیە لەوانەی بەشداری جەنگی بەدر بوون و عوثمانی کوڕی عەفانی بەشدار کرد لەدەسکەوتەکاندا)).

کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەڕانەوە ناو شاری مەدینە موسوڵمانان چوون بۆ پێشوازی لێ کردنیان، موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموون: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەبەدر گەڕایەوە و هاتەوە ناو شاری مەدینە بەدیلەکان و دەسکەوتەکانەوە دوای ئەوەی کەخوای گەورە سەرکردەکانی موشریکەکانی لە ناو بردووە موسوڵمانەکانی مەدینە تا ناوچەی (الروحاء) ڕۆیشن ولەوێدا بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەیشتن و پیرۆزبایی و دەستخۆشیان لێ دەکردن و پرسیاری کوژراوەکانی موشریکەکانیان لێ دەکردن.)[٨٥١].

ئەوە بوو دیلەکانیان هێنا و بردیانەوە ناو خانوەکانی شاری مەدینە، عەبدو ڕەحمانی کوڕی ئەسعدی کوڕی زوراره دەفەرموێت: (سەودەی کچی زەمعەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ چووبووە سەردانی بنەماڵەی (عفراء) ئەمەش پێش ئەوە بوو کە حیجاب فەرز بکرێت، سەودە ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەخوا من لەوێ بووم و هاتن بۆ لامان وتیان: ئەوە دیلەکانە وا هێنایانن، منیش گەڕامەوە ماڵێ خۆم وتەماشام کرد پێغەمبەر ﷺی لێیە، لە سوچێکی ژوورەکەش سوهەیلی کوڕی عەمری لێ یە و هەردوو دەستی بە پشتی ملیەوە بەپەتێك گرێ دراوە دەفەرموێت: سوێند بەخوا کە ئەوم بینی خۆم پێ نەگیرا وتم: باوکی یەزید ئاواتان لەخۆتان کرد و خۆتان

(٨٥٠) أخرجه: ابن ابي شية (٣٦٦٧٤) والبخاري (٣٦٩٩) والحاكم (٢١٧/٣) وصححه على شرط مسلم واللفظ له والبيهقي (الدلائل) (١٣٠/٣) وفي(الكبرى) (١٧٤/٩) رقم(١٩٠٩٧)، وصحح إسناده السيوطى كما في (منتخب كنز العمال) (١١٠/٤) والشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٢٥٠)، وانظر صحيح(السيرة) رقم (٢٨٥).

(٨٥١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٣٦/٢) والبيهقي (الدلائل) (١٤٧/٣) والحاكم (٤١٨/٢) وقال: صحيح مرسل ووافقه الذهبي و(التأريخ) للطبري (٤٥٨/٢).

دابەدەستەوە ئەی بۆ بەرێزەوە نەمردن، سوێند بەخوا دواتر بەئاگا هاتمەوە گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لەسووچی ژوورەکەوە فەرمووی: ((سەودە ئایا بەرانبەرخواو پێغەمبەرەکەی هانیان دەدەیت))؟ منیش وتم: سوێند بەو خوایەی کە تۆی ناردووە بە ڕاستی خۆمم پێ نەگیرا کە ئەوم ئاوها بینیم تا ئەو وتەیەم لەدەم دەرچوو)[٨٥٢].

## ڕاوێژ کردنی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەدیلەکان

دوای گەڕانەوە و حەوانەوەی موسوڵمانان لەمەدینە کێشەی دیلەکان پێویستی بەچارەسەرکردن هەبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە موسوڵمانان کرد سەبارەت بەم مەسەلەیەو نەی ویست خۆی بڕیاری یەك لایەنەی لە بارەوە بدات، چونکە ئەو دیلانە زۆر بەیان خزمی نزیکی موسوڵمانی (مهاجرین) بوون، و ڕێگە چارەی دیلەکان بەوە گەیشت کە هەندێکیان بێ بەرامبەر ئازاد کران، و هەندێکیان بە بەرامبەر ئازادکران، ئەم باسەش لەم ڕیوایەتانە هاتووە:

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە ئەبو بەکر و عومەرو عەلی کردوو و فەرمووی: ((يا أَبا بَكر وَعَليّ وعُمَر ما تَرَونَ فِي هَؤلاءِ الأَسْرَى)). واتە: ئەی ئەبو بەکرو عەلی و عومەر ڕاو بۆ چوونتان چی یە سەبارەت بەم دیلانە)؟ ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە برا و ئامۆزا و [کەسانی] ئێمەن، من ڕام وایە کە (فديه) و بەرامبەرێکیان لێ وەربگیرێت تا ببێتە هێز بۆمان دژبە بێ باوەڕان، وە بەڵکو دواتر خوا هیدایەتیان بدات بۆ ئیسلام (ئەو کاتە دەبنە پشتیوانیمان). پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ما تَرَى يا ابنَ الخَطَّابِ؟)) واتە: ڕات چی یە ئەی کوڕی خەطاب؟ عومەریش ﷺ فەرمووی: (نا سوێند بەخوا من بۆ چوونەکەم وەك بۆ چوونی ئەبو بەکر نییە ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام من ڕام وایە بیان دەیتە دەستمان تا لەگەردنیان بدەین، و عەقیلی برای عەلی بدەیتە دەست عەلی تا لەگەردنی بدات، و فلان کەس [کەخزمی عومەر بوو] بدەیتە دەستم تا لەگەردنی بدەم، و [براکەی حەمزەش بدەیتە دەست حەمزە تا لەگەردنی بدات، وخوای گەورە دەزانێت کە هیچ خاتر و خزمایەتیەك نیە لەدڵماندا بەرانبەر موشریکەکان] چونکە ئەوانە پێشەواکان و پاڵەوانەکان و [سەرکردەکانی] کوفرن.

(٨٥٢) أخرجه: ابن ابي شية (٣٦٦٧٨)، وإبن هشام (السيرة) (٢٣٨/٢) (٥٣٨)، والحاكم (٢٢/٣)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي،والطبراني (الكبير) (٢٨/٢٤)، وقال إبراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٢٨٦):سنده صحيح.

عومەر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ زیاتر مەیلی بەلای وتەکانی ئەبو بەکردا بوو، وە ئەوی لا پەسەندتر بوو لە بۆ چوونەکەی من، بەلام بۆ رۆژی دوایی هاتم و تەماشا دەکەم پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر دانیشتبوون دەگرین، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا پێم ڕاگەیەنە بۆ چی تۆ و هاوەڵەکەت دەگرین تا ئەگەر پێویستی بە گریان بێت منیش لەگەڵتاندا بگریم، وە ئەگەر پێویستی بە گریان نەبوو لەبەر گریانەکەی هەردووکتان دەگریم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەگریم چونکە سزادانتانم نیشان درا نزیکتر لەم درەختە (لەبەر ئەو (فدیة) و بەرامبەرەی کە بۆ ئازاد کردنی دیلەکان وەرتانگرت))؛ و پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾ ﴾ (الأنفال) پاشان دەست کەوت حەلاڵ کرا) لەم چەند ئایەتەی دواییدا)[٨٥٣].

ئەم سزادانەی کە نیشانەی پێغەمبەر ﷺ درا، و هێنایە گریان ئەوە بوو کە حەفتا کەس لە هاوەڵانی ساڵی داهاتوو دەکوژرێن لەبەرامبەر حەفتا دیلەکەدا، ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: (جبریل ﷺ دابەزییە لای پێغەمبەر ﷺ وپێی فەرموو: هاوەڵانت سەرپشك بکە [سەبارەت بەدیلەکانی بەدر] کوشتنی ئەوانیان دەوێت (واتە: باجێبەجێی بکەن) ، وە گەر (فدی) و بەرامبەریان دەوێت ئەوا بەوێنەی ژمارەی ئەوانتان لێ دەکوژرێت ساڵی ئایندە؟)[٨٥٤].

ئەمانە تەنها ڕیوایەتی ڕاستن و(صحیح)ن سەبارەت بەم باسە. وە هەندێك ڕیوایەتی تر هەن کە وردەکاری زیاتری باسەکە ڕوون دەکاتەوە، بەلام سەرجەم ئەو ڕیوایەتانە (لاوازن) و نابن بە بەڵگە، لێرەدا هەندێکیان دەهێنین تەنها بۆ زیاتر ناسینەوەیان وبەئاگا بوون لێیان.

---

(٨٥٣) أخرجه: أحمد (٣٠/١)برقم (٢٢١،٢٠٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، ومسلم (١٧٦٣) والترمذي (٣٠٨١)، والطبري (التفسير) (١٢٦٥٦)، وابن حبان (٤٧٩٣) واللفظ لهم.

(٨٥٤) أخرجه ابن ابي شية (٣٦٦٧٥)، والترمذي (١٥٦٧) والنسائي (الكبرى) (٢٩٧/١) وعبد الرزاق (٩٤٠٢) والطبري (التفسير) (١٦٣٠٣)، والحاكم (١٤٠/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٧٩٥) وقال محققه: إسناده قوي: والبيهقي (الكبرى) (٣٢١/٦)وقال الحافظ في (الفتح) (٣٢٤/٧): سنده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في: (صحيح الترمذي) (١٢٧٢) و(الارواء) (٤٨/٥) و (المشكاة) (٣٩٧٣).

گێڕراوەتەوە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (سەبارەت بە دیلەکانی شەڕی بەدر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چی دەڵێن سەبارەت بەدیلەکان))؟ ئەبوبەکر فەرمووی: ئەوانە خزم و کەسانی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا بیان هێڵەرەوە و لەسەریان بوەستە و بەڵکو خوا تەوبەیان لێوەربگرێت: عومەریش فەرمووی: ئەوانە تۆیان بەدرۆ خستەوە و دەریان کردیت نزیکیان کەرەوە ولە گەردنیان بدە [ئەی پێغەمبەری خوا من ڕام وایە کە تۆ نابێت دیلت هەبێت، چونکە ئێمە بانگەوازخواز و خۆبەیەکەوە گرین][٨٥٥].

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش ﷺ فەرمووی: [ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە شیوێك دایت کە چیلکە و داری زۆرە ئاگرێك بکەرەوە و ئەوانی تێ بخە، عەباسیش پێی وت: خوا پەیوەندیت لەگەڵ خزمەکانتدا بپچڕینێت][٨٥٦]. ئیتر پێغەمبەر ﷺ چووە ژورەوە و وەڵامی هیچیانی نەدایەوە. لەو کاتەدا هەندێ کەسیان وتیان: بەڕای ئەبو بەکر دەکات، هەندێکی تریش وتیان: بەڕای عومەر دەکات، هەندێکی تر وتیان: بەڕای عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دەکات، پێغەمبەریش ﷺ. هاتە دەر بۆلایان و فەرمووی: ((خوای گەورە دڵی پیاوانێك نەرم دەکات لە پێناویدا هەتا نەرم تری دەکات لە شیر. وە خوای گەورە دڵی پیاوانێك ڕەق دەکات لەپێناویدا هەتا ڕەق تری دەکات لە بەرد..... ئێوە دەس کورتن و هیچ یەکێك لەوان گەر بە (فدية) یان لە گەردن دان نەبێت لە دەستتان دەرباز نەبێت)).

لەو کاتەدا ئیبنو مسعود ﷺ وتی: تەنها سوهەیلی کوڕی بەیزا نەبێت، چونکە من ئیسلام بوونیم گوێ لێ بوو. ئالەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو (ئیبنو مەسعود ﷺ) دەیوت: هیچ ڕۆژێك نەبوو لەژیاندا وەك ئەو ڕۆژە زیاتر بترسم لەوەی کە بەرد بەسەر مندا ببارێت. تا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تەنها سوهەیلی کوڕی بەیزا نەبێت)) و خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابە زاند: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ

---

(٨٥٥) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٣٥٦٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، الطبراني (الكبير) (٤٠٥٦)،وقال الهيثمي في (المجمع) (٩٩٥٠):إسناده حسن، وحسن إسناده ايضاً ابن كثير في (البداية) (٢٥/٣)

(٨٥٦) أخرجه أحمد (المسند) (٣٦٣٣) وقال محققه الارناؤوط: إسناده ضعيف.

ﭐللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ (الأنفال)[857]. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت دواجار [پێغەمبەر ﷺ بەعومەر گەیشت و فەرمووی ((نزیك بوو لە جیاوازیدا بەلایەکمان تووش بیت))][858].

## ئازادکردنی دیلەکان

دیلەکان هەندێکیان بەبێ بەرانبەر ئازادکران، وە هەندێکیان بەرامبەر فێرکردنی نوسین بۆ مندالانی مدینە ئازاد کران، وە هەندێکیان بەرامبەر بڕێك دراو ئازاد کران، ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت (هەموو دیلێك لەدیلەکانی قوڕەیش بەرامبەر چوار هەزار درهەم ئازاد کران)[859]. وە لەڕیواتێکی تردا [بەرامبەر چوار سەد][860] کەواتە ئازاد کردنی دیلەکان بە گوێرەی بوون ونەبوونییان یاخود ناودارو بێ دەسەڵاتیان جیاواز بوو (هەیان بوو بەرامبەر تەنها چوار سەد درهەم ئازادکراوە، وە تیایاندا هەبوو بەرامبەر چل ئوقیە ئاڵتون ئازادکراوە، وە هەیانبوو بەرامبەر چوار هەزار درهەم ئازاد کراوە)[861].

یەکەم دیل کە ئەو برە پارەیەی بۆ هێنرا تا ئازادبکرێت ئەبو ویداعەی کوڕی صوبەیرەی ئەلسەهمی بوو. وەك عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: لەدیلەکاندا ئەبو دویداعەی کوڕی صوبەیرەی ئەلسەهمی تیابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((ئەو لە مەککەدا کوڕێکی ژیری بازرگانی خاوەن پارەی هەیە نزیکە بێتە لاتان بۆ ئازادکردنی باوکی)) قوڕەیشیش لە ناو خۆیاندا بڕیاریاندا بوو وتبوویان

---

(٨٥٧) أخرجه: ابن أبي شيبة (٤١٧/١٢) (٣٦٦٧٩)، وأحمد(٣٦٣٢) وقال محققه: أسناده ضعيف لانقطاعه، والترمذي (١٧١٤)، والحاكم (٢١/٣)وصححه الذهبي، والطبراني (الكبير) (١٠٢٥٨)، والطبري (التفسر) (١٢٦٥٥)، والبيهقي (الكبرى) (٣٢١/٦)، وفي (الدلائل) (١٣٨/٣)،وأبويعلى (٥١٨٧)،وضعفه الشيخ الألباني في (الارواء) (٨٧/٦) ومع ذلك صحح إسناده الحافظ في (الأصابة)رقم (٣٥٦١).

(٨٥٨) أخرجه: الحاكم (٣٢٩/٢)وصححه وقال الذهبي: صحيح على شرط مسلم،وقال محققه: (٣٣٢٣): سنده قوي، وقال الشيخ الألباني في (الأرواء) (٤٧/٥) وهو كما قالاً لولا ان فيه إبراهيم بن مهاجر قال الحافظ (صدوق لين الحفظ).

(٨٥٩) أخرجه: عبد الرزاق (٩٣٩٤)، والطبراني (الكبير) (٣٢١/١١)، و أبو داود (٢٦٩١)، والنسائي (٤٧/١)، والحاكم (١٢٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٣٤٠)، و (الارواء) (١٢١٨).

(٨٦٠) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٢٣٨) وفي (الكبير) (١٢١٥٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٨٩/٦): رجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الالباني (الارواء) (٤٤/٥) إسناده لا بأس به في الشواهد.

(٨٦١) انظر: (البداية والنهاية) لابن كثير (٣٢٨/٣)، و (السيرة) لأبن هشام (٢٥٣/٢).

پەلەمەکەن لە ئازاد کردنی دیلەکانتاندا تا محمد و هاوەڵانی لەسەرتان زیادنەکەن) موطلیبی کوڕی ئەبو ویداعەش وتی: ڕاست دەکەن سوێند بەخوا گەروا بکەن لەسەرتان زیاد دەکەن، وپاشان لە شەودا بەنهێنی دەرباز بوو وەخۆی گەیاندە مەدینە و باوکی ئازاد کرد بەرامبەر چوار هەزار درهەم)[٨٦٢].

پاشان قوڕەیش ناردیان بۆ ئازادکردنی دیلەکان، و موکرزی کوڕی حەفص هات بۆ ئازادکردنی سوهەیلی کوڕی عەمر لەڕیوایەتێکی (ضعیف)دا هاتووە کە عطاء ﷺ دەیگێڕێتەوە ودەفەرموێت: کاتێك سوهەیل دیل بوو عومەری کوڕی خەطاب ﷺ وتی: بە پێغەمبەری خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێم گەڕێ با هەردوو خرێکانی سوهەیلی کوڕی عەمر دەرکەم و زمانی لێ شۆڕ بێتەوە تا جارێکی تر لە هیچ جێگەیەکدا هەڵنەستێت و تارێك دژبە تۆ بدات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی ئەتکی ناکەم تاخوا ئەتکم نەکات، هەرچەندە پێغەمبەریش بم: (لێی گەڕێ بەڵکو ڕۆژێك لە جێگەیەك بووە ستێت و تارێك بدات و دڵخۆشت بکات))[٨٦٣].

هەندێکی تر لە دیلەکان ئازادکران بەرامبەر فێرکردنی نووسین بۆ منداڵانی ئەنصاری شاری مەدینە، ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کەسانێك هەبوون لە دیلەکاندا پارەی ئازاد کردنیان نەبوو، و پێغەمبەریش ﷺ مەرجی ئازاد کردنیانی بەوە دانا کە منداڵانی ئەنصار فێری نووسین بکەن، ڕۆژێکیان منداڵێك لەوانەی کە فێری نوسین دەبوون هات بەگریانەوە بۆلای (باوکی بوو یان دایکی) وپێی وت: ئەوە چیە؟ منداڵەکەش وتی: مامۆستاکەم لێی داوم. ئەویش وتی: ئەو پیسە دەیەوێت تۆڵەی بەدربکاتەوە، وەڵاهی ناچیتەوە بۆلای جارێکی تر)[٨٦٤].

پێغەمبەر ﷺ زۆر بە وەفاو و پێزان بوو، بەچاکەی موطعمی کوڕی عەدی

---

(٨٦٢) أخرجه:الطبراني (الكبير) قطعة من حديث (١٣)، (٢٤٥)وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٠٢١): رجاله ثقات، وأخرجه: أحمد (٢٣٦٨٤) وقال محققه إسناده ضعيف، وعبدالرزاق (٩٤٠٣)، والطبري (التأريخ) (٤٦١/٢)، والحاكم (٣٢١،٣٢٢/٣)، وابن هشام (السيرة) (٢٤٢/٢) (٥٤٢).

(٨٦٣) أخرجه: ابن ابي شيبة (٣٦٧٢٨)، وابن هشام (السيرة) (٢٤٣/٢) معضلا، والحاكم (٢٨٢/٣) مرسلاً، والبيهقي (الدلائل) (٣٦٧/٦) منقطعاً وهو حديث ضعيف لايثبت.

(٨٦٤) أخرجه: أحمد (٤٧/٤) (٢٢١٦) وقال محققه:حديث حسن، والحاكم (١٤٠/٢)وصححه ووافقه الذهبي وقال: محققه (٢٦٦٨):إسناده حسن، والبيهقي (الكبرى) (١٣١١٩)،وفي (الدلائل) (٣٥٢/٣)، وقال ابن كثير(البداية) (٣٢٨/٣): تفردبه أحمد وهوعلى شرط السنن.

کاتێك کە لە طائیف گەڕایەوە، و کەس ڕێگەی نەدا بێتەوە ناو شاری مەککە تەنها موطعمی کوڕی عەدی نەبێت، کە هەرچەندە موشریکیش بوو، ئەو هات خۆی و کوڕ وخزمەکانی بەچەکەوە پەنای پێغەمبەری ﷺ داو پارێزگاری لێ کرد تا هێنایەوە ناو شاری مەککە)[٨٦٥]. و پێش شەڕی بەدر موطعم مردبوو پێغەمبەریش ﷺ هەر بەئەمەك و پێزان بوو بەرامبەر ئەو چاکەیەی جوبەیری کوڕی موطعمی کوڕی عەدی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بەدیلەکانی بەدری فەرموو: ((لو كان مُطعِمُ بنُ عَدِيٍّ حَيًّا ثمَّ كَلَمَني في هؤلاءِ النَّتْنَى، لأطلَقْتُهم له!))[٨٦٦] واتە: گەر موطعمی کوڕی عەدی زیندوو بووایە وە داوای ئازاد کردنی ئەم دیلانەی لێ بکردمایە هەر هەموویانم بۆ ئازاد دەکرد).

سەبارەت بە مامەڵەی موسوڵمانەکان لەگەڵ دیلەکاندا ئەبو عزیزی کوڕی عومەیر کە یەکێك بووە لە دیلەکان دەڵێت: (من لای کەسانێك بووم لە ئەنصار کاتێك کە خواردنیان بۆ دەهات کولێرەی گەنمەکەیان دەدا بەمن و خۆیان تەنها خورمایان دەخوارد)[٨٦٧].

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە دیلەکانی بەبێ بەرامبەر ئازاد کردووە لە وانە (ئەبو عیزەی جومەیحی شاعیر، موطلیبی کوری حەنطبی مخزومی، و صەیفی کوری عابدی مەخزومی) ئەمانە ئازاد کران بەو مەرجە جارێکی تر بەشداری هیچ جەنگێك نەکەن دژ بە موسوڵمانان)[٨٦٨].

کاتێك کە موشریکەکانی مەککە دەهاتن بۆ ئازادکردنی دیلەکانیان ڕێزیان لێ دەگیراو وە پێغەمبەریش ﷺ لە مزگەوتدا دایدەنان و شەوێك لە مزگەوت دەمانەوە تا لە نزیکەوە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ وە هاوەڵەکانی وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ببینن، جوبەیری کوڕی موطعمی کوڕی عەدی دەفەرموێت: (کاتێك کە گەیشتمە ناو شاری مەدینە (بەمەبەستی ئازاد کردنی هەندێك لە دیلەکانی بەدر) ئەو ڕۆژگارە من

---

(٨٦٥) أخرجه: ابن هشام(السيرة) (٣٨١/١)،وقال الحافظ في(الفتح) (٣٢٤/٧)أخرجه الفاكهي بأسناد حسن مرسل.

(٨٦٦) أخرجه: البخاري (٤٠٢٤)، ومسلم (٢٧٦٥)، وأحمد (٨٠/٤)، وأبو داود (٢٦٨٩).

(٨٦٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٩٧٧/٢٢) وقال الهيثمي (المجمع) (٨٩/٦): إسناده حسن، ولكنه منقطع كما قال الحافظ في (الاصابة) (١٠٢٥٢).

(٨٦٨) أخرجه: ابن هاشم (السيره) (٢٥٣/٢) برقم (٥٥٥) والبيهقي (الكبرى) (١٣١١٢).

هێشتا موسوڵمان نەبووبووم، گەیشتمە ئەویٚ زۆر ماندوو بووم خەوتم لە مزگەوتدا (واتە: دیارە دوای نیوەڕۆ یان عەسر بوو) و بەدەنگی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ کەپێش نوێژی بۆ دەکردن لەنوێژی مەغریبدا وە سورەتی (الطور)ی بۆ دەخوێندن من بە ئاگا هاتم و ترسام، کاتێك لە خوێندنەکەیدا بەردەوام بوو گەیشتە ئەم ئایەتە: ﴿ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ (الطور) واتە: (یا خێر نەردیوان و پەیژەیەکیان بۆ هەیە؟ پیایدا سەر دەکەون بۆ ئاسمان، لەویٚ گویٚ دەگرن بۆ وتوووێژی فریشتەکان ، جا ئەگەر وایە دەبا گوێگرەکەیان بەڵگەیەکی ئاشکرا بهێنیٚ) کە گوێم لەم ئایەتانە بوو نزیك بوو دڵم بفڕێت [و پاشەو پاش لە مزگەوت هاتمە دەرەوە و ئەمە یەکەم جار بوو ئیسلام چووە قوڵای دڵمەوە].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: [هێشتا لە دەرەوەی مزگەوت بووم گوێم لەدەنگی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ مَّا لَهُ مِن دَافِعٍ ﴿٨﴾ ﴾ (الطور) واتە: هیچ ڕەتکەرەوەیەکیشی بۆ نیە، کەس ناتوانیٚ بەری بگریٚ ، ئەو ڕۆژەیە کە ئاسمان بەتوندی دێت و دەڕوات و ئەکەوێتە لەرزەو شۆکەو گەڕان و خوا هەمووی تێکدەدا . کە ئەم ئایەتەم بەرگویٚ کەوت نزیك بوو دڵم دووکەرت بێت][٨٦٩].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب کەلەدیلەکاندا بوو، پارەی ئازادکردنەکەی لە هەموو دیلەکانی تر زیاتربوو، چونکە ئەو پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، سەد ئۆقیە ئاڵتونیدا بۆ ئازادکردنی خۆی)[٨٧٠]. عەباس ﷺ پارەی ئازاد کردنی خۆیدا لەگەڵ هەر دوو برازاکەی (عەقیل و نەوفل) و لەگەڵ عوتبەی کوڕی جەحدمی هاوپەیمانیدا، هەندێك لەپیاوانی ئەنصار داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە عەباس ئازاد بکات بە بیٚ بەرامبەر، وەك ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پیاوانێکی ئەنصار بە پێغەمبەریان ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەمان بدە با پارەی فدیەکەی عەباسی خوشکەزامان بۆی بگێرینەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

---

(٨٦٩) أخرجه: أحمد (٨٣/٤) عبدالرزاق (١٦٢١)، والطبراني (الكبير) (١٤٩٨-١٤٩٩)،والطيالسي (٩٤٣)، و ابو يعلى (٣٤٩/١)، والطحاوي (مشكل) (١٢٤/١)، والبيهقي(الكبرى) (٤٤٤/٢)، وقال الشيخ الالباني في (الثمرالمستطاب) (٧٧١،٧٧٤/٢):إسناده صحيح.

(٨٧٠) انظر: (الدلائل النبوة) للبيهقي (١٤١/٣)، و (البداية) لابن كثير (٣٢٨/٣).

(نا سوێند بەخوا یەك درهەمی بۆ ناگێڕنەوە))[٨٧١].

عەباسی کوڕی عەبدول موطەلیب مامی پێغەمبەر ﷺ داوای لە پێغەمبەری خوا کرد کە ئەو بیست ئوقیە ئاڵتونەی کە لەگەڵیدا گیراوە، لەسەر پارەی (فدیة) کەی دای بنێت، عەبدوڵلای کوڕی عەباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەعەباسی فەرموو: ((ئەی عەباس (فدیە)ی خۆت و هەردوو برازاکەت، عەقیلی کوڕی ئەبو طالیب، و نەوفەلی کوڕی حاریث، و هاوپەیمانت عوتبەی کوڕی جوحدم برای ئەبو حاریثی کوڕی فەهر بدە، چونکە تۆ پیاوێکی پارە داری؟)) عەباسیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێشتر موسوڵمان بووم، بەڵام ئەوان بە زۆر ڕاپێچیان کردم لەگەڵ خۆیان [ئیتر بۆ دەبێت (فدیە) مان لێ وەربگیرێت]؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِسْلامِكَ ، إِنْ يَكُ مَا تَقُولُ حَقًّا فَاللَّهُ يَجْزِيكَ بِهِ [وَأَمَّا ظَاهِرُ أَمْرِكَ فَقَدْ كَانَ عَلَيْنَا] فافدِ نَفْسَك، وابنَيْ أَخَوَيْكَ)). واتە: خوا باشتر دەزانێت بە ئیسلام بوونت، ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت ئەوە خوا پاداشتی ئەوەت دەداتەوە (بەڵام ڕووکەشی هەڵسوکەوتەکەت دژ بە ئێمە بوو) لەبەر ئەوە (فدیە)ی خۆت و هەردوو برازاکەت بدە.

عەباس کەدیل کرابوو بیست ئوقیە ئاڵتونی پێ بوو لێی وەرگیرابوو (وەك دەسکەوت دابەش کرابوو)، لەوێدا عەباس فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئاڵتونەشم بۆ بخەرە ڕیزی (فدیە) کەمەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا [أَفْعَلُ] ذلكَ شَيءٌ أعطانا اللهُ مِنْكَ)) واتە: نا کاری واناکەم ئەوە شتێکی تۆیە کە خوا داویەتی بە ئێمە). عەباسیش فەرمووی.: پارەی ئەو (فدیە) یەم لا نییە ئەی پێغەمبەری خوا) [ئایا ئەمەت بۆ خزمایەتی پێکردم؟ سوێند بەوەی کە عەباس سوێندی پێ دەخوات وات لێ کردم کە هەژارترین کەسی قوڕەیش بم هەتا لە ژیاندا ماوم]. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((ئەی کوا ئەو پارەیەی کە پێش دەرچوونت (تۆ ودایکی فەزل شاردتانەوە) لەمەککە کاتێك کە هەردووکتان بوون و کەستان لەگەڵدا نەبوو)).

لەریوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەعەباسی فەرموو: (([كيف تكونُ فقيرَ قُريشٍ وقد استودعتَ بنادقَ الذهبِ أمَّ الفضلِ وقلتَ لها إنْ قُتلتُ تركتكِ غنيَّةً ما بقيتِ[٨٧٢]. [إنْ

(٨٧١) أخرجه:البخاري (٢٥٣٧،٤٠١٨).

(٨٧٢) أخرجه: أبونعيم في (دلائل النبوه) (٤١٠)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٣٢٤/٨): إسناده حسن.

أُصِبْتَ فِي سفري هذا فلِلْفَضْلِ كذا، ولِقُثَمَ كذا، ولعبدِ اللهِ كذا؟])) واتە: تۆ چۆن هەژار تریني قوڕەیش دەبیت، ئەی پارچە ئاڵتونەکانت نەسپاردە ئوم فەضڵ و ئینجا بەرەو لای من هاتیت (واتە: بەرە و شەڕی بەدر) و بە ئوم فەضڵت وت: ئەگەر کوژرام ئەوا تۆم بەجێ هێشتووە، بەدەوڵەمەندی هەتا لەژیاندا بێت، وە ئەگەر گەڕامەوە خەمی هیچ شتێکت نەبێت و گەر لەم سەفەرەشمدا کوژرام ئەوا ئەوەندە بۆ فەضڵ، و ئەوەندەش بۆ قوسم و ئەوەندەش بۆ عەبدوڵلا؟ عەباسیش ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی کەتۆی بەم ڕاستی یە ناردووە (کەس بەمەی نەزانیوە) تەنها من و ئەو نەبێت، وەمن دەزانم کە تۆ پێغەمبەری خوایت (وە سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا من شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت. ئینجا عەباس (فدیە)ی خۆی و برازاکەی و هاوپەیمانەکەیدا) و خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (الأنفال)[٨٧٣]. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بەو دیلانەی کە لە ژێر دەستاندایە ڕاگەیەنە گەر ئیمان و باوەڕ لە دڵتاندا هەبێت ئەوا خوای گەورە باشترتان دەداتێ لەوەی کەلێتان سەنراوە و لێتان خۆش دەبێت و خوای گەورە بەبەزەیی و لێخۆش بووە.).

خوای گەورە بەڵێنەکەی خۆی هێنایە دی بۆ ئەو دیلانەی کە موسوڵمان بوون وە قەرەبووی ئەو پارانەی بۆ کردنەوە کەلێیان وەرگیرابوو، وەك ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (عەباس ﷺ دەیوت: سوێند بەخوا سەبارەت بەمن دابەزی ئەم ئایەتە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠ ﴾ (الأنفال)

ئەوەش ئەو کاتە بوو کەبە پێغەمبەرم ﷺ ڕاگەیاند کەمن پێشتر موسوڵمان بووم، وداوام لێ کرد ئەو بیست ئوقیەیەی پێم گیرا بە (فدیة)کەم بۆ حساب بکات و پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو کارە ڕازی نەبوو، بەڵام خوای گەورە دواتر لەجیاتی ئەو بیست ئوقیە یە بیست کۆیلەی پێبەخشیم کە هەموویان بەپارەی من بازرگانیان بۆ

---

(٨٧٣) أخرجه: أحمد (٣٣١٠) وقال محققه الارناؤوط:حسن، والطبري (التأريخ) (٤٦٣/٢) وابي نعيم (الدلائل) (٤٠٩)، والبيهقي (الدلائل) (١١٩،١٤٣/٣)، والحاكم (٣٢٤/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وحسن الارناؤوط إسناد الحاكم في (المسند) (٣٣٦/٥).

دەکردم، وەلەگەڵ چاوەڕوانیمدا بۆ لێخۆش بوونی خوای گەورە))[٨٧٤].

له دواتر (عەباس ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگەم دەخواست کە ئەو کاتە زۆر زیاترت لێومر بگرتمایە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە زیاتری پێ ببەخشیمایە)[٨٧٥]. وە لەدوای چەند ساڵێکی تر، پێغەمبەر ﷺ سامانێکی گەیشتە لا لە بەحرینەوە لە ناو هاوەڵانیدا بەشی کرد و ئەو کات عەباس ﷺ ئەوەندەی بەر کەوت کە نەیدەتوانی بیدا بەسەر شانیدا و هەڵیبگرێت، وەك ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: ((پێغەمبەر ﷺ پارەو سامانێکی لە بەحرینەوە پێ گەیشت و فەرمووی: ((هەمووی هەڵبڕێژن لە مزگەوتدا)) وە ئەوەش زۆرترین سامانێك بوو کەگەیشت بووە دەستی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ نوێژ و ئاوڕی بەلایدا نە دایەوە، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد هاتە لای پارەکە دانیشت و هەر کەسێکی بەر چاو بکەوتایە بەشی دەدا، عەباس ﷺ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەشم بدە... پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بگرە)) ئەویش چارۆگەیەکی هێنا و پێغەمبەر ﷺ زۆری بۆ تێکرد و ویستی هەڵیبگرێت نەیتوانی و ئینجا هەندێکی لێ بەتاڵ کردەوە، پاشان دای بەسەر شانیدا و هەڵیگرت و ڕۆیشت...)[٨٧٦].

پێغەمبەر ﷺ بیستی کە عەباسی مامی کراسی لەبەردا نیە لەدوای شەڕی بەدر، بۆیە ویستی کراسێکی بداتێ دەستی نەکەوت تەنها کراسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی نەبێت، جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەفەرموێت: (لەدوای تەواو بوونی شەڕی بەدر، عەباسیان هێنا کراسی لەبەردا نەبوو) پێغەمبەر ﷺ بەدوای کراسێکدا گەڕا تا پێیبدات (پشتیوانانیش بەدوای کراسێکدا دەگەڕان بۆی، هیچ کراسێکیان دەستنەکەوت کە بۆی گونجاو بێت تەنها کراسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی نەبێت) هێنایان و پێغەمبەر ﷺ کردیە بەری عەباس. (ئا لەبەر ئەوەش بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مرد، پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی کرد بەکفن بۆی لەپاداشتی کراسەکەی کە بە عەباسی مامی پێغەمبەری ﷺ بەخشیبوو)[٨٧٧].

(٨٧٤) أخرجه: الطبري (التفسير) (١٠٣/١٤) وقال أحمد شاكر في تحقيقه: إسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١١/١٤) (١١٣٩٨)، والبيهقي (١٤٣/٣)، وصحح إسناده الحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٤٤)، و البوصيري في (مختصر الأتحاف) (٥١٨).

(٨٧٥) أخرجه: أبونعيم في (دلائل النبوه) (٤١٠)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٣٢٤/٨): إسناده صحيح.

(٨٧٦) أخرجه: البخاري (٤٢١).

(٨٧٧) أخرجه: البخاري (٣٠٠٨)، والحاكم برقم (٥٤٧٦) واللفظ لهما.

# پێغەمبەر ﷺ ئەبو عاصی کوڕی ڕەبیعی زاوای ئازاد دەکات

ئەبو عاصی کوڕی ڕەبیع یەکێك بوو لەدیلەکانی بەدر، و مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ بوو وە کەس نەبوو پارەیەك بدات بۆ ئازاد کردنی تا زەینب ﵂ هەندێك پارەی نارد کە ملوانکەیەکی خۆی لە ناودا بوو بۆ ئازادکردنی، کە پێشتر خدیجەی دایکی کردبوویە دیاری بۆی لە گوێزانەوەیدا و پێغەمبەر ﷺ داوای لە هاوەڵانی کرد کە مێردەکەی بۆ ئازاد بکەن.

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (دانیشتوانی مەککە پارەیان دەنارد بۆ ئازاد کردنی دیلەکانیان، و زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئازاد کردنی مێردەکەی هەندێ پارەی نارد لەگەڵ ملوانکەیەکی خەدیجە کە کردبوویە دیاری بۆ زەینەب لە گواستنەوەیدا کاتێ پێغەمبەر ﷺ ملوانکەکەی بەرچاو کەوت زۆر بەزەی و سۆزی بۆ جۆڵا و بەهاوەڵانی فەرموو: ((إن رأيتُم أن تُطلِقوا لها أسيرَها وتردُّوا عليها مالَها فافعلوا)) واتە: گەر بەچاکتان زانی ئەوا دیلەکەی بۆ بەربدەن و پارەکەشی بۆ بگەڕێننەوە. هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ فەرموویان: بەڵێ باشە ئەی پێغەمبەری خوا، پاشان دیلەکەیان بۆ ئازادکردوو پارەکەیان بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبەریش ﷺ مەرجی لەسەر ئەبو عاص دانا کە ڕێگەی زەینەب بدات تا کۆچ بکات بۆ مەدینە، ئینجا ئازادی کردوو و زەیدی کوڕی حاریسە و پیاوێکی ئەنصاری نارد تا بچن زەینەبی بۆ بێنن و پێی فەرموون: ((هەردووکتان بەرێکەون تا دەگەنە دۆڵێ (يأجج) (کە هەشت میل نزیکە لەمەککەوە) لەوێ چاوەڕێ کەن تا زەینەبتان بەلادا تێدەپەڕێت (و ئەم مستیلەیەی منی) بدەنێ و پاشان لەگەڵ خۆتانی بهێنن). [ئەوانیش هەردووکیان لەدوای مانگێك لە تەواو بوونی جەنگی بەدر بەرێکەوتن تا گەیشتنە (يأجج) و ئەبو عاصیش گەیشتەوە مەککە و ڕێگەی بەزەینەبدا تا کۆچ بکات])[٨٧٨] وردەکاری بەسەر هاتی کۆچکردنەکەی زەینەب ﵂ لە دوو ڕیوایەتدا

(٨٧٨) أخرجه: أحمد (٢٧٦/٦) (٢٦٣٦٢) وقال محققه الاناؤوط: إسناده حسن، وابو داود (٢٦٩٢)، والطبراني (الكبير) (١٠٥٠/٢٢)، وابن هشام (السيرة) (٢٤٦/٢) برقم (٥٤٨)، والحاكم (٢٣/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، و الطحاوي (مشكل الاثار) (٤٧٠٨)، والبيهقي (الكبرى) (١٣١٢١)، وفي (الدلائل) (١٥٦/٣) وأخرجه: من طريق اخر: الحاكم (٢٤/٤) وصححه على شرط الشيخين، والطبراني (الكبير) (١٠٥٠/٢٢) وقال الهيثمي (المجمع) (٢١٣/٩): رجاله رجال الصحيح.

هاتووە، ودوای ڕێکخستنی هەردوو ڕیوایەتەکە باسەکە بەم جۆرە دەبێت:

(زەینەب ﵂ دەفەرموێت: کاتێك من خۆم ڕێك دەخست بۆ ئەوەی کۆچ بکەم بۆ لای باوکم هیندی کچی عوتبەم پێگەیشت و پێی وتم: ئەی کچەکەی محمد هەواڵم پێگەیشتووە کە دەتەوێت کۆچ بکەیت بۆ لای باوکت؟ و منیش وتم: ناشتی وانەبووە، هیندیش وتی: ئەی کچی مامم وامەکە، گەر پێویستت بە کەلوپەل یان پارە هەبوو بۆ سەفەرەکەت تا پێی دەگەیتە لای باوکت هەموو ئەوانەم لا هەیە و شەرم مەکە، چونکە ئەوەی لە نێوان ئافرەتداندا هەیە لە نێوان پیاواندا نیە؟ زەینەبیش ﵂ دەفەرموێت: سوێند بەخوا دەمزانی ڕاست دەکات لە قسەکانیدا، بەڵام من ترسام و لەبەردەم ئەودا نکوڵیم کرد لە وەی کە بمەوێت کاری وا بکەم و پاشان کەل و پەلەکانم ئامادەکرد.

ئیبنو ئیسحاق ﵀ دەفەرموێت: کاتێك زەینەب تەواو بوو لە ئامادەکردنی کەلوپەلەکانی برای مێردەکەی کە ناوی کینانەی کوڕی ڕەبیع بوو، وشترێکی هێنا و زەینەب سوار بوو، تیرو کەوانەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و هەوساری وشترەکەی ڕاکێشا و وشترەکەش کەژاوەیەکی بەسەر پشتەوە بوو زەینەبی تیابوو کەوتنە ڕێ لە نیوەڕۆدا و هەندێ لە پیاوانی قوڕەیش ئەمەیان لە ناو خۆیاندا باس کرد. وە بەدوایدا چوون تا لەناوچەی (ذی الطوی) پێیان گەیشتنەوە، و یەکەم کەسیش کە گەیشتە سەریان (هەباری کوڕی ئەسود و نافعی کوڕی عەبدو قەیسی فەهری بوو [هەردووکیان لەگەڵ کینانە بەشەڕ هاتن (بەشمشێر) بەسەریدا زاڵ بوون] و هەباریش وشترەکەی گرت و زەینەبی ترساند لەکەژاوەکەیدا و زەینەبیش لەو کاتەدا دووگیان بوو.

[عائیشە ﵂ دەفەرموێت: هەباری کوڕی ئەسود گەیشتە وشترەکەی زەینەب و بەردەوام بەڕمەکەی لە وشترەکەیدەدا تا وشترەکە زەینەبی لەسەر پشتی فڕێدا و (کەوتە خوارەوە بەسەر بەردێکدا) و خوێنی لەبەر ڕۆیشت ومنداڵەکەی لە بارچوو] پاشان کینانە خۆی دایە پشتی زەینەب و تیروکەوانەکەی ئامادەکرد و وتی: سوێند بەخوا هەر پیاوێك لێم نزیك ببێتەوە تیری تێدەگرم، ئەوانیش لێی چوونە دواوە.

پاشان ئەبو سوفیان و هەندێك لە قوڕەیش هاتن و ئەبو سوفیان وتی: کینانە تیر

وکەوانەکەت لاببە تا لەگەڵت بدوێین و قسە بکەین، ئەبوسوفیان هاتە لای کینانە وەستا و پێی وت: کارێکی باشت نەکردووە کەدەرچوویت لە پێش چاوی خەڵکی بەئاشکرا وخۆشت باش بەڵاو شکەستیەکەمان دەزانیت کە بەدەستی محمد تووشمان هات خەڵکی گەر تۆ کچەکەی ئەوت لەپێش چاویان بە ئاشکرا برد وا دەزانن کە ئەمە سەرشۆڕییە و نیشانەی بێ دەسەڵاتی و ڕسوایی ئەوانە، وە ئێمە نامانەوێت تۆڵە لە زەینەب بکەینەوە و پێویستمان بەمانەوەی ئەو نیە لە ناوماندا، لەبەر ئەوە زەینەب بگێڕەرەوە تا دانیشتوانی مەککە باسی ئەوە بکەن کە گێڕاومانەتەوە، وە چاوەڕێ بکە تا شەو دادێت و خەڵکی دەخەون ئەو کات بەنهێنی دەری کە لەمەککە و بیگەیەنەرە لای باوکی.

(عائیشە ﵂ دەفەرموێت: زەینەب یان هەڵگرت وگێڕایانەوە، وە بەنو هاشم و بەنو ئومەیە بووە دەمەقاڵەیان لەسەر زەینەب بەنو ئومەیە وتیان: دەبێت زەینەب لای ئێمە بێت، چونکە خێزانی ئەبو عاصی ئامۆزامانە، بەنو ئومەیە لای خۆیان دایان ناو چووە لای هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕبیعەی خێزانی ئەبوسوفیان، و هیند بەزەینەبی دەوت: ئەمەش بەهۆی باوکتەوە تووشت هات).

(عوروە ﵁ دەفەرموێت: چەند ژنێکی بەنی هاشم هاتنە لای ئەبوسوفیان و ئەویش زەینەبی دایە دەستیان) لای ئەوان مایەوە هەتا زەید و (ئەنصاریەکە) گەیشتنە جێگەی دیاری کراو، ولەوێ زەید ڕۆیشت تا بەشوانێك گەیشت لێی پرسی: تۆ شوانی کێیت؟ وتی: شوانی ئەبو عاصمم. وتی: ئەی ئەم مەڕانە هی کێن؟ شوانەکە وتی: مەڕی زەینەبی کچی محمدن. زەیدیش ماوەیەك لەگەڵ شوانەکە ڕۆیشت و پاشان پێی یوت: ئایا شتێکت بدەمێ دەیگەیەنیتە دەستی زەینەب لای کەس باسی ناکەیت؟ شوانەکە وتی: بەڵێ باش، زەیدیش: مستیلەکەی دایە دەستی، و شوانەکە مەڕەگانی بردەوە ناو شاری مەککە و مستیلەکەی دایە دەست زەینەب و ئەویش ناسیەوە و وتی: کێ ئەمەی پێدایت؟ شوانەکە وتی: پیاوێك بوو. زەینەبیش وتی: لەکوێ بەجێت هێشت: شوانەکە وتی: لەوێ ولەوێ) پاشان زەینەب چەند شەوێکی تر مایەوە ولە شەوێکی درەنگ وەختدا (کینانە) بردیە دەرەوەی شار تا گەیاندیە دەستی زەید و هاورێکەی، ئەوانیش لەگەڵ خۆیان هێنایان تا گەیاندیانە پێغەمبەر ﷺ (و لەوەدواش زەینەب چەند ساڵێکی تر هەر نەخۆش بوو بە هۆی کەوتنە

خوارەوەی لە وشترەکە تا وەفاتی کرد و هەموو وایان دەزانی کە ئەو شەهیدە))[٨٧٩].
و پێغەمبەریش ﷺ سەبارەت بەزەینەب دەیفەرموو: ((زینبُ خیرُ بناتي أُصیبَتْ بي))[٨٨٠].
واتە: زینب چاکترینی کچەکانمە کە بەهۆی منە وە تووشی ناڕەحەتی هاتووە.

## عومەیری کوڕی وەهەب دێتە شاری مەدینە بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ

عومەیری کوڕی وەهەب کە بەبریندارى گەڕایەوە شاری مەککە لە دوای شەڕی بەدر، ئەو لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەی کوڕی خەلەف کۆدەبنەوە، ڕێدەکەون لەسەر ئەوەی کە عومەیر بچێت و پێغەمبەر ﷺ تیرۆر بکات، صەفوانیش لە بەرامبەر ئەوەدا ماڵ و خێزانەکەی دەگرێتە خۆ و قەرزەکانیشی بۆ دەداتەوە، عومەیر بەناوی هاتنی بۆ ئازاد کردنی کوڕە دیلەکەی دێتە شاری مەدینە، پێغەمبەریش ﷺ پیلانەکەی ئەو لەگەڵ صەفەواندا بۆ دەگێڕێتەوە و پاشان عومەیریش موسوڵمان دەبێت.

ئەم باسە لە ڕاست ترین مغازی کە (مغازی) موسی کوڕی عوقبە و عروەی کوڕی زوبەیر هاتووە بە (مرسل)ی لای هەندێك (أهل الحدیث) ڕیوایەتی (مرسل التابع) هەندێکیان وەردەگیرێن. باسەکەم لە سەرچاوەکانیە وە هێناوە، دوای ڕێکخستنی فەرموودەکان بەسەر هاتەکە بەم جۆرە دەبێت:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (عومەیری کوڕی وەهەبی جومەحی بێ باوەڕ بوو و لەجەنگی بەدردا بەشداری کرد، و لە ناو کوژراوەکاندا بوو، وە پیاوێك بەلایدا تێپەڕی شمشێرێکی لێدا...... وای زانی کوژراوە و بەو شمشێرە بریندار بوو و کە شەوی بەسەر داهات و تارێك بوو هەر چۆنێك بێت خۆی گەیاندە شاری مەککە و برینەکەی چاك بووەوە).

عوڕوەی کوڕی زوبەیرو و زوهری ﷺ دەفەرموون: (دوای گەڕانەوەی موشریکەکان

(٨٧٩) أخرجه: ابن هشام (السیرة) (٢٤٨/٢) والطبري (التأریخ) (٤٦٩/٢) والطبراني (الکبیر) (٢٢) (١٠٥٣،١٠٥٠) وحسنه الشیخ الالباني في (الصحیحة) (٣٠٧١) والحاکم ٤٢/٤ وصححه على شرطها وقال الذهبي: خبر منکر ویحیى لیس بالقوي وقال محقق (المستدرك) (٦٩١٩)، ویحیى وثقه ابو داود والنسائي وابن معین وابن حبان، والبیهقي (الدلائل) (١٥٥/٣) والبزار (٢٠٠٩) وقال الهیثمي (المجمع) (٢١٢/٩): رجاله رجال الصحیح، وقال في (٢١٣/٩): مرسل ورجاله رجال الصحیح، وفي روایة ثانیة (٢١٣/٩) (١٢٢٧٣): مرسل رجاله رجال صحیح.

(٨٨٠) أخرجه:الطبراني (الکبیر) (٤٣١/٢٢)،والبزار(٢٦٦٦)،وصححه الشیخ الالباني في (الصحیحة) (٣٠٧١).

لە بەدر و کوشتنی هەندێکیان) عومەیری کوڕی وەهەبی جومەحی یەکێك بوو لە پیاو کوژەکانی قوڕەیش وە یەکێك بوو کە ئازاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەدا لە مەککە، وە کوڕەکەی عومەیریش بەدیل گیرابوو لە شەڕی بەدردا. جارێکیان عومەیر و صەفوانی کوڕی ئومەیە بەیەکەوە لە (الحجر) دانیشتبوون، [هەردوولا باسی کوژراوەکانی بەدر و ئەوانەی خرانە ناو بیرەوە و باسی شکستەکەیان دەکرد، صەفوان وتی: [سوێند بەخوا ژیان تاڵ بووە لە دوای کوژراوەکانی بەدر]؟ عومەیریش پێی وت: [بەڵێ] ڕاست دەکەیت، [سوێند بەخوا ژیان خۆشی تیانەماوە لەدوای ئەوان] سوێند بەخوا لەبەر ئەوە نەبێت کە قەرزارم و هیچم لانیە تا بیدەمەوە، خێزانەکەم دەترسم لە دوای خۆم تیابچن (هیچیشم نیە تا بۆیان بە جێ بهێڵم) ئەوا (ئێستا بەڕێدەکەوتم) تا دەچوومە لای محمد و هەر ئەوم بەرچاو بکەوتایە دەمکوشت، چونکە من بەڵگەیەکم لای ئەوان هەیە [دەتوانم بیکەمە پاساو بۆ خۆم] ئەویش کوڕەکەمە کە لەلای ئەوان دیلە (و دەڵێم: هاتوم بۆ لای کوڕە دیلەکەم) صەفوانیش پێی وت: ئەی دوای ئەوە چی دەکەیت؟ عومەیریش وتی: (دەچم دەی خلافێنم و لەناکاو بە شمشێر لێی دەدەم و پاشان بەسواری ئەسپ خۆم دەرباز دەکەم و نایەڵم کەس پێم بگاتەوە). صەفەوانیش ئەمەی بەهەل قۆستەوە و [دڵ خۆش بوو بەقسەکەی] و پێی وت: تۆ ئەو کارە ئەنجام بدە من قەرزەکەت بۆ دەدەمەوە وە منداڵەکانت دەهێنم با لەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا بن و خەرجی هەردوولایان جێبەجێ دەکەم و نایەڵم لە هیچیان کەم بێت. عومەیریش پێی وت: دەباشە ئەمانە بانهێنی بێت لە نێوانماندا و کەس پێی نەزانێت، پاشان صەفوان [عومەیری ڕێکخست و هەموو پێداویستیەکی بۆ دابین کرد] وفەرمانیدا [شمشێرەکەی عومەیر] تیژ و ژەهراوی بکرێت. دوای ئەوە عومەیر بەڕێ کەوت تا گەیشتە ناو شاری مەدینە، لەوکاتەدا عومەری کوڕی خەطاب لەناو کۆمەڵێك موسوڵماندابوو باسی شەڕی بەدریان دەکرد، کە چۆن خوا ڕێزی لێ گرتن و شکۆمەندی کردن و دوژمنەکەیانی نابووت کرد.

کاتێك عومەر تەماشای عومەیری کوڕی وەهەبی کرد بەسەرپشتی و شترەکەیەوە واهات و لەبەردەم مزگەوتدا لایدا و [وشترەکەی یخ پێ لێ داو بەستیەوە] و عومەیریش شمشێرەکەی بەملەوەیە [وەبەرەو لای پێغەمبەر ﷺ دەچێت] [عومەر کە بینی شمشێرەکەی پێ یە ترسا] و وتی: ئەو سەگە دوژمنی خوایە ئەوە عومەیری

کوڕی وەهەبە کە دژمان وەستاو ئێمەی سەر ژمێرکرد لە ڕۆژی بەدردا سوێند بەخوا ئەوە تەنها بۆ خراپە هاتووە، پاشان [عومەر هەستاو چووە ژوورەوە] بۆ لای پێغەمبەری خوا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دوژمنی خوایە عومەیری کوڕی وەهەب (وا بۆ ناو مزگەوت دێت) و شمشێری پێ یە [ئەوە خراپکاری غەدارە متمانەت پێی نەبێت] پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((برۆ بیهێنەرە ژوورەوە)) عومەریش ڕۆیشت و (شەیالە)ی هەڵگرێ شمشێرەکەی عومەیری گرت و لەملیەوە جەڕاندی و پێشی خۆی داو، بەچەند کەسێکی ئەنصاری وت: کە لەگەڵیدابوو ئێوە بچنە ژورەوە و لە چواردەوری پێغەمبەر ﷺ دانیشن و زۆر وریابن، چونکە ئەم پیسە متمانە پێ نەکراوە [پیاوێکی غەدارو خراپکارە و گومانم لە هاتنەکەی هەیە].

پاشان عومەیری بردە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ عومەری بینی پەتی شمشێرەکەی لەملی عومەیر جەڕاندووە و بەتوندی گوشیویە فەرمووی: (بەریدە ئەی عومەر، تۆش نزیك بەرەوە ئەی عومەیر و عومەیریش لێی نزیك بووەوە وتی: بەیانیتان باش (ئەوەش سڵاوی جاهیلەکان بوو لەنێوان خۆیاندا) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قد أكرَمَنا الله بِتحيةٍ خيرٍ مِن تحيَّتِك يا عُميرُ [وَجَعَلَ تَحيَّتُنا (السَّلامَ وهي)، تَحيَّةَ أهلِ الجنَّةِ])). واتە: خودا ڕێزی لێ گرتووین و سڵاوێکی چاکتری لە سڵاوەکەی تۆ پێ بەخشیوین ئەویش (السلام) سڵاوی خەڵکی بەهەشتە. عومەیر وتی: سوێند بەخوا (ئەی محمد من تازە ئەمەم زانیوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((قدْ أبدَلَنا اللهُ خيراً منها) فَما جاءَبِكَ يا عُميرُ))؟ واتە: خوا سڵاوەکەی بەباشتر بۆ گۆڕیوین، چی تۆی هێناوەتە ئێرە. عومەیر وتی: هاتووم بۆ ئەو دیلەی کە لەژێر دەستتانایە بینینم و چاك بن لەگەڵیدا (و دیلەکانمان بۆ ئازاد کەن ئێوە خزم و کەسی ئێمەن). پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەو شمشێرەت بۆ لە مل دایە))؟ عومەیر وتی: [ئەوە بیرم چوو لەملمدا کاتێك دابەزیم ئەوە پەندی تیایە بۆ من] خوا شمشێرەکانمان قێزەون کات هیچ سودێکیان پێ نەگەیاندووین [ئێمە لەبەدر هەڵمانگرتبوون، بەڵام کەڵکیان نەبوو وە ئێمەش سەرکەوتوو نەبووین].

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕاستم لەگەڵدا بڵێ چی تۆی هێناوەتە ئێرە))؟ عومەیر وتی: تەنها بۆ ئەو کارە هاتووم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [ئەی ئەو بەڵێنە چی بوو کەدات بە صەفوانی کوڕی ئومەیە لە (الحجر) دا] عومەیریش ترساو وتی:

[هاچیت وت؟؟] کام بەڵێنەم داوەتێ؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە نەبوو تۆ و صەفوان لە (الحجر) دانیشتن و باسی کوژراوەکانی (قوڕەیشتان کرد) کە فڕێ درانە ناو (القلیب) پاشان تۆ وتت: گەر لەبەر قەرزاری و منداڵەکانم نەبووایە دەچووم تا محمدم دەکوشت و صەفوانیش بڕیاریدا کە قەرزەکانت بۆ بداتەوە و منداڵەکانت بۆ بەخێو بکات بەمەرجێك تۆ منی بۆ بکوژیت، وە خوای گەورە ڕێ گرە لە نێوان تۆ و ئەو کارەدا)).

عومەیریش وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَنَّكَ رَسُولُ الله) ئێمە پێشتر تۆمان بە درۆ دەخستەوە، و بەدرۆمان دەزانی کە هەواڵ و وەحیت لە ئاسمانەوە بۆ بێت [وە ئەم قسە و ڕووداوەش تەنها لە نێوان من و صەفواندا بوو) لە (الحجر) وە هیچ کەسێکی تر ئاگای لێ نەبووە تەنها من و ئەو نەبێت] سوێند بەخوا من دەزانم هیچ کەسێك ئەم هەواڵەی پێ نەگەیاندویت تەنها خوا نەبێت، منیش باوەڕم هێنا بەخوا و پێغەمبەرەکەی وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەم شێوەیە ڕێنموی کردم بۆ ئیسلام.

ئیتر موسوڵمانانیش زۆر دڵخۆش بوون بە موسوڵمان بوونی عومەیر هەتا عومەر ﷺ پێی وت: سوێند بەخوا (ئەو هات لە بەراز زیاتر ڕقم لێی بوو) ئەوە تا ئێستا لە منداڵەکانم خۆشەویستره لام. پێغەمبەریش ﷺ بەعومەیری فەرموو: (دانیشە عومەیر تا کۆمەکت بکەین) وە بەهاوەڵەکانی فەرموو: (ئەم برایەتان لە ئاینەکەی تێگەیەنن، و قورئانی بۆ بخوێننەوە وە دیلەکەی بۆ ئازادکەن)) هاوەڵانی ئەوەیان جێبەجێ کرد.

پاش ماوەیەك عومەیر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێشتر بە هەموو توانایەکمەوە تێدەکۆشام بۆ کوژانەوەی ڕوناکیەکەی خوا (واتە ئاینی ئیسلام) و زۆر بەتوندی ئازاری ئەو کەسانەم دەدا کە موسوڵمان دەبوون وە ئەمڕۆ من پێم خۆشە ڕێگەم بدەیت تابگەڕێمەوە شاری مەککە و بانگیان بکەم بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی و ئاینەکەی، بەڵکو خوای گەورە هیدایەتیان بدات و [ڕزگاریان بکات لە لەناوچوون] گەرواش نەکەن ڕەخنە لە ئاینەکەیان دەگرم و ئازاریان دەدەم [وەك چۆن پێشتر ئازاری هاوەڵەکانی تۆم دەدا]). پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیدا (و عومەیریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (عەمامەکەت) واتە: (جەمەدانیەکەتم بدەرێ وەك نیشانەیەك)؟ پێغەمبەریش ﷺ عەمامەکەی خۆی پێدا پاشان ڕۆیشت و بەرێ کەوت بەرە و شاری مەککە).

صەفوانی کوڕی ئومەیەش هەرلەو کاتەوە کە عومەیر دەرچوو بوو بۆ مەدینە دەهاتە شوێن دانیشتەکانی قورەیش، و بەقوڕەیشەکانی دەوت: مژدەبێت بەم نزیکانە هەواڵی (ڕوداوێکتان) پێ دەگات ئازارەکانی شەڕی بەدرتان لە بیردەباتەوە. صەفوان بەردەوام (پرسیاری لە هەموو کەسێك دەکرد کە لەمەدینە وە دەهات: ئایا لە مەدینە هیچ ڕوی داوە؟ چونکە صەفوان زۆر دڵی بە بەڵێنەکەی عومەیر خۆش بوو تا ئەوە بوو پیاوێك لەمەدینەوە هات و پرسیاری عومەیری لێ کرد؟ پیاوەکەش پێی ڕاگەیاند: کە عومەیر موسوڵمان بووە، ئیتر قوڕەیشیەکان نەفرەتیان لێ دەکرد و دەیان وت: عومەیریش بێ دین بوو) ئیتر صەفوان سوێندی خوارد کەهیچ سودێکی پێ نەگەیەنێت وە بەهیچ جۆرێك قسەی لەگەڵدا نەکات.

عومەیریش کاتێك گەڕایەوە مەککە وە دەستی کرد بەبانگ کردنی قورەیش بۆ لای خوا و چوونە ناو ئاینی ئیسلامەوە و بەتوندی بەرهەڵستی لەوانە دەکرد کە لە ڕویدا دەوەستان، تا کەسانێکی زۆر لە ڕێگەی ئەوە وە موسوڵمان بوون)[881]

ئابەو شێوەیە خودا هیدایەتی دڵی عومەیریدا بۆ ئیسلام کە سەرەتای ئەو ڕۆژە دەجەنگا لە دژی ئیسلام، ئێوارە بەرگری لە ئیسلام دەکرد دەجەنگا دژی بت پەرستانی قورەیش وە پێغەمبەری خوا کوڕەکەی بەردا بەبێ فیدیە بۆئەوەی زیاتر دڵی ڕابکێشێت وە دڵی ئەوانەشی کە وەك ئەون بەتەواوی ڕاستی ئەم دینە تازەیە نازانن لە نزیکەوە.

## نەجاشی دڵخۆش دەبێت بەسەرکەوتنی موسوڵمانەکان لەجەنگی بەدر

هەواڵی شەڕی بەدر و سەرکەوتنی موسوڵمانان گەیشتە نەجاشی لە حەبەشە و زۆر دڵخۆش بوو، کۆچ کارانی موسوڵمانی ئەوێی کۆکردەوە ومژدەی سەرکەوتنەکەی موسوڵمانانی پێ دان و هەموو لا سوپاسی خوایان کرد لەسەر ئەو شکۆمەندییە:

(٨٨١) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٧) برقم (١١٧،١١٨،١١٩،١٢٠)، والطبري (التأريخ) (٤٧٢/٢)،وابو نعيم (الدلائل) برقم (٤١٣)،والبيهقي (الدلائل) (٤٧/٣)، وابن هشام (السيرة) (٢٥٤/٢) برقم (٥٥٦،٥٥٧)، وقال الهيثمي حول الرواية الاولى، للطبراني في (المجمع) (٢٨٦/٨)، مرسل إسناده جيد، وقال في (المجمع) (٢٨٦/٨) حول الرواية الثانية: مرسل وإسناده حسن، عبد الطبراني في (المجمع) (٢٨٧/٨) حول الرواية الثالثة:رجاله رجال الصحيح،وقال الحافظ في (الاصابة) (٣٦/٣): وقد أخرجه ابن منده من وجه أخر موصولاً......(ثم قال)وظاهرإسناده انه حسن،واللفظ لابن اسحاق والزيادات للطبراني،ولمزيد من الاطلاح:أنظر: (البداية) (٣٨١/٣)،و(التأريخ لخليفة بن خياط) (١٤٢)، و(سيرالسلف) (٦١٣/٢).

ئەم بەسەر هاتەش ئیمامی بەیهەقی ﷺ دەیهێنێت لە پیاوێکی دانیشتوی (صنعاء) وە کەناوی عەبدولڕەحمانە و دەفەرموێت: (ڕۆژێك نەجاشی ناردی بەدوای جەعفەرو هاوەڵانیدا، ئەوان چوونە ژورەوە بۆ لای نەجاشی و تەماشایان کرد پۆشاکێکی کۆنی لەبەر دایە و لەسەر خۆڵ دانیشتووە.

جەعفەر ﷺ دەفەرموێت: ئێمە بەزەییمان بە نەجاشیدا هاتەوە کە بەو شێوەیە بینیمان، پاشان ئەو تەماشای ئێمەی کرد و پێی وتین: مژدەیەکتان دەدەمێ کەدڵخۆشتان بکات، یەکێك لە هەواڵدەرەکانم لە وڵاتەکەی ئێوە وە گەڕاوەتەوە و پێی ڕاگەیاندم: کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەرخستووە و دوژمنەکانی لەناو بردووە، لەپێکدا دانێك کە لە شیوێکی پڕ لەداری (أراك) ڕوویداوە کە ناوی شیوی (بەدر)ە و فلاّن کەس وفلاّن کەس و فلاّن کەس دەستگیر کراون، وفلاّن کەس و فلاّن کەسیش کوژراون.

جەعفەریش پێی وت: ئەی بۆچی پۆشاکێکی کۆنت لەبەردایە و لەسەر خۆڵ دانیشتوویت و هیچت لە ژێردانییە؟ نەجاشی وتی: ئێمە لە کتێبەکەماندا هەیە کەخوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ عیسا ﷺ دەفەرموێت: پێویستە لەسەر بەندەکانی خوا هەرکات خوای گەورە نیعمەتێکی پێ بەخشین ئەوان خۆ بەکەمزانین نیشان بدەن بۆ خوا، وە کاتێك خوای گەورە ئەم سەرکەوتنەی بەخشیە پێغەمبەرەکەی ﷺ منیش ئەم خۆ بەکەمزانینەم نیشاندا بۆ خوا)[٨٨٢].

## پلەی ئەو موسوڵمانانەی کە لەجەنگی بەدردا بەشداربوون

خوای گەورە پاداشتی گەورەی بەخشیوەتە ئەو موسوڵمانانەی کە لەجەنگی بەدردا بەشداربوون، چونکە هەرە چاکەکانی لە موسوڵمانان و فریشتەکان لەم جەنگەدا بەشداربوون، و پێغەمبەریش ﷺ مژدەی هەرە گەورەی بەخشیوەتە بەشداربووانی غەزای بەدر:

**١- جابر ﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((لن

(٨٨٢) أخرجه:البيهقي (الدلائل) (١٣٤/٣)، وابن كثير (البداية) (٣٠٧/٣).

يدخلَ النارَ رجلٌ شَهِد بدرًا والحُدَيْبِيَة))[٨٨٣] واتە: هەرگیز ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە پیاوێك بەشداری کردبێت لەبەدر یان لە حودەیبیەدا.

**٢- هەروەها لە جابرەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** ((لعلَّ اللهَ قدِ اطَّلَعَ على أهلِ بدرٍ فقال: اعمَلوا ما شِئتُم فقد غفَرْتُ لكم))[٨٨٤]. واتە: خوای گەورە تەماشای بەشداربووانی شەڕی بەدری کرد و پێی وتن: ئەو کارەی پێتان خۆشە ئەنجامی بدەن، چونکە من لە هەمووتان خۆش بووم.

## ٣- ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەفەرموێت:

(جبریل ﷺ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو: ((ماتَعُدُّونَ أهل البدرِ منكم))؟ واتە: بەشدار بووانی بەدر لەناو ئێوەدا بە چیان دادەنێن؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من أفضل المسلمين)) واتە: بەچاکترینی موسوڵمانان، جبریل ﷺ فەرمووی: بەهەمان شێوە فریشتە بەشداربووەکانی بەدریش لای ئێمە ئاوهان)[٨٨٥].

## ٤- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت:

(حارثی کوڕی سوراقەی [پورزام] [گەنجێك] بوو لە جەنگی بەدردا لەگەڵ موسوڵمانان بوو، تیرێکی وێڵ هات و کوشتی. دایکیشی هات بۆلای پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆت دەزانی کەحاریسە چەندە [لەدڵمدا شیرین بوو] [بۆم باس بکە] گەر لە بەهەشتدا بێت (لەسەری ناگریم) و ئارام دەگرم و چاوەڕێی پاداشتەکەی دەکەم، وە گەر لەوەی تریاندا بێت [هەتا بتوانم لەسەری دەگریم] پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ويْحَكِ، أوَهَبِلْتِ، أوَجَنَّةٌ واحِدَةٌ هي [يا أُمَ حارِثَةَ إنَها] [لَيْسَ بِجَنَّة واحدة] إنَّها جَنات كَثِيرَة [في الجَنَةِ] وإنَّ ابْنَكِ أصاب الفِرْدَوْسَ الْأَعْلَى والفِرْدَوْسُ))[٨٨٦].

---

(٨٨٣) أخرجه: أحمد(١٥٢٦٢) وقال الارناؤوط:حديث صحيح، وابن ابى شيبة(١٥٥/١٢)، والحاكم(٣٠١/٣)، والترمذي (٣٨٦٤)، وابن ماجه(٤٢٨١)، وابويعلى(١٩٠٠)، وابن حبان(٤٨٠٠) وقال محققه: صحيح على شرط مسلم، وصححه أيضاً على شرط مسلم الحافظ في (الفتح) (٣٠٥/٧)، وابن كثير(البداية) (٣٢٩/٣)، وانظر (السلسلة الصحيحة) (٢١٦٠).

(٨٨٤) أخرجه: البخاري (٣٩٨٣)، ومسلم (٢٤٩٤)، وبوداود (٢٦٥٠).

(٨٨٥) أخرجه: أحمد (٤٦٥/٣)، والبخاري (٣٩٩٢)،وابن ماجه (١٦٠) وابن حبان (٧٢٢٤).

(٨٨٦) أخرجه:احمد (١٢٤/٣)، والبخاري (٣٩٨١،٦٥٥٠)، والترمذي (٣٦٧٤)، والحاكم (٢٠٨/٣) (وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٩٥٨)، وصححه الشيخ الالباني في: (الصحيحة) (١٨١١)، و (صحيح الترمذي) (٢٥٣٦).

(واتە: ئەوە هۆشت لای خۆت نەماوە بۆ ئەوە یەك بەهەشتە؟! ئەی دایکی حاریسە ئەوە تەنها یەك بەهەشت نیە، ئەوە چەندین بەهەشتی زۆرە لەناو بەهەشتدا، وە کوڕەکەی تۆ فیردەوسی هەرە بەرزی بەدەست هێناوە).

## گرنگی غەزای بەدر

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ و بڕوادارانی سەربەرز کرد بەجەنگی بەدر، و موشریکەکان و دووڕووەکانی سەرشۆڕکرد، هیچ دووڕوویەك و جولەکەیەك نەما لە مەدینەدا سەری نەوی نەبێت، بۆ دەستکەوتەکانی بەدر، بەڕاستی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی یەکلاکەرەوە بوو، لە نێوان باوەڕ و شیرکدا، ئەو کات جولەکەکان بەدڵنیاییەوە وتیان: ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کە لەتەوراتدا باسکراوە، لەمەودوا هەر ئاڵایەك بۆ هەرجەنگێك بەرز بکاتەوە سەرکەوتوو دەبێت تیایدا)[٨٨٧]. بەڕاستی جەنگی بەدر سەرکەوتنێکی یەك جار گەورە بوو، بۆ موسوڵمانەکان بەشایەتی هەموو عەرەب، شکستێکی زۆر قورسیش بوو بۆ قوڕەیش و موشریکەکان، وە تاقیکردنەوەیەکی سەربازی سەرکەوتووی بێ وێنە بوو لەژیانی موسوڵمانەکاندا، وە دەستکەوتێکی باش بوو بۆ ئەو تەنگژە ئابووریەی کە موسوڵمانەکان تیایدا دەژیان، وە ئەم جەنگە بووە هۆی زیاتر ڕێکخستن و یەك خستنی ڕیزی موسوڵمانان، وە وشیارکەرەوەیەکی گەورەش بوو بۆ قەوارە جولەکەکان ناچاری کردن کە بەخۆیان و هەڵوێستەکانیاندا بچنەوە بەرامبەر موسوڵمانان، وە ئەم جەنگەش وریاکەرەوەیەکی بەهێز بوو بۆ هەموو لایەك بەدروست بوونی هێزێکی ڕامیاری و سەربازی زۆر بەهێز لە نیمچە دوورگەی عەرەبدا، وەجەنگی بەدریش بووە هۆی توندو تۆڵ کردنی هێزو دەسەڵاتی موسوڵمانەکان لە مەدینە و چوار دەوریدا هەتا وای لێ هات ئەو موشریکانەی کە مابوونەوە لە مەدینە، هەندێکیان بەڕاستی موسوڵمان بوون، و ئەوانی تریان ناچارانە موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد، بەڵام لە ناخدا دووڕوو بوون وەك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول.

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ غەزای بەدری ئەنجام

(٨٨٧) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (١٢٧/٣).

داو سەرکردە ناودارەکانی کافرانی قورەیش کوژران، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و ئەو موشریکانەی کە لەگەڵیدابوون وتیان: ئەم ئاینە جێگیربوو وە هیوای لابردنی نەما، ئیتر هەموویان هاتن و پەیمانیان داو موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند)[٨٨٨].

## غەزا و سریەکانی نێوان بەدر و ئوحود

## غەزای بەنی سولیم

هەندێك لەو هۆزانەی کە گرێ بەستی بازرگانیان هەبوو لەگەڵ قورەیش دا، کاروانە بازرگانیەکانی قورەیش بەلایاندا تێدەپەڕی، و خۆیان بەدۆستی ئەوان دەزانی، وپەکخستنی کاروانە بازرگانیەکانی قورەیش زیانێکی ئابووری گەورەی هەبوو بۆ ئەوان، لەبەر ئەم هۆیانە ویستیان هێز کۆبکەنەوە و پەلاماری موسوڵمانان بدەن.

بەسەرهاتەکە ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە لەدوای جەنگی بەدر بە حەوت شەو، خۆی و هەندێك لە هاوەڵەکانی بەڕێکەوتن بۆ پەلاماردانی بەنی سولەیم، ڕۆیشتن تاگەیشتنە هەندێك لە کانیاوەکانیان کە پێی دەوترا (الكدر)، لەوێ سێ شەو مانەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە و تووشی هیچ شەڕێك نەهاتن. لەوێدا مایەوە لەو چەند ڕۆژانەی کۆتای مانگی شەوال و زولقەعیدە لەبەر ئەو کاروانەی قورەیش کە بەبەدردا تێ دەپەڕین)[٨٨٩]. وەلەم ساڵەشدا پێغەمبەر ﷺ حەفصەی کچی عومەری ﷺ خواست، و فاطمەی کچی دایە عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوا لە هەموویان ڕازی بێت[٨٩٠].

## غەزای (السَّويق)

عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك ئەبو سوفیان گەڕایەوە بۆ مەککە و شکستەکەی بەدریان بەسەر هات، ئەبو سوفیان نەزری کرد و بڕیاریدا [کە نزیکی خێزانەکەی نەکەوێتەوە و خۆی نەشۆرێت تانەچێت هێرش بکاتە سەر مەدینە و هەندێ شوێنی بسوتێنی] [هەرچەندە هانی قورەیشیدا زۆر بەیان ترسێکی گەورە کەوتبووە دڵیانەوە و نەیان وێرا بەشداربن] [ئەبو سوفیان

(٨٨٨) أخرجه: البخاري(٦٢٠٨).

(٨٨٩) انظر:(السيرة) لابن هشام(٣٣٦/٢)،و(الدرر في المغازي) (ص: ١٤٥)، و(دلائل النبوة) للبيهقي(١٦٣/٣).

(٨٩٠) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (١٥٨/٣-١٦٢).

بەنهێنی دەرچوو لە شاری مەککە تەنها سی سواری لەگەڵ بوو] وە هەندێکیش دەڵێن دوو سەد سوار بوون، بەڕێ کەوت بەسەر چیاکانی (النجدية)دا تا دابەزییە نزیك چیای (سیب)ی ناوچەی (قناة)ی نزیك شاری مەدینە. لەوێ مایەوە تا شەو بەسەر داهات و پاشان خۆی دەرچوو بەوشەوە بەرەو بەنی نضیر و لەدەرگای ماڵی گەورەکەی دان کە ناوی حویەی کوڕی ئەخطب بوو ئەویش ئەوانی ناسیەوە ترساو نەیوێرا دەرگاکەیان بۆ بکاتەوە.

پاشان ئەبو سوفیان چوو لە دەرگای ماڵی سەلامی کوڕی موشکمیدا کە یەکێك بوو لە ناودارانی بەنی نضیر ئەو دەرگای بۆ کردنەوە و خزمەت و میوانداری کردن، و هەواڵی ئەو چوار دەورەی بۆ زانین و پێی ڕاگەیاندن، هەر لەو شەوەدا ئەبو سوفیان گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی و چەند پیاوێکی لە هاوەڵانی نارد [و فەرمانی پێکردن کە گەیشتە نزیکترین دارخورما لە دارخورماکانی مەدینە لەوێ ئاگری تێبەردەن و بیسوتێنن] ئەوان بەڕێکەوتن تا گەیشتنە هەندێ دارخورمای بچووکی تازە لە دارخورماکانی ناوچەی (العريفي) و گڕیان تێبەردا] و هەر لەوێ دوو پیاوی ئەنصاریان بینی کاریان دەکرد لە کێڵگەکەیاندا خافڵگیرانە هەردووکیان کوشت [و پاشان بەڕاکردن گەڕانەوە] و هەڵاتن بەرە و مەککە، وخەڵکی ئەو دەورە [پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانانیان لێ ئاگادار کردنەوە].

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا دوایان کەوتن تا ناوچەی (قرقرة الكدر) ڕاویان نان، و ئەبو سوفیان و هاوەڵانی بۆ دەرباز بوونیان زۆرینەی ئازوقەکانیان لە دوای خۆیان فڕێ دا، و پاشان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی گەڕانەوە بەرەو مەدینە، و لەڕێگادا هاوەڵانی لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کارەمان بەغەزا بۆ دەژمێررێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ)).

ئیبنو ئیسحاق ﷬ دەفەرموێت: ئەم غەزایە بۆیە ناونرا غەزای (السويق) چونکە موشریکەکان زۆربەی ئەو خواردنەی کە دوای خۆیان فڕێیان دابوو خواردنی (السويق) بوو وە موسوڵمانان کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو (السويق)ە و زۆریان لێ کۆکردەوە[٨٩١].

---

(٨٩١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٣٦/٢)، وموسى بن عقبة وعروة بن الزبير في مغازيهما كما في (دلائل النبوة) للبيهقي (١٦٤/٣-١٦٥)، والطبراني (التاريخ) (٤١٣/٢)، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٣٧٦/٢): أخرجه ابن اسحاق بسند صحيح مرسل.

(السويق) خواردنێکە لە گەنم یان جۆی سورەوەکراو بەرۆن دروست دەکرێت، یان دەهاڕدرێت و دەکرێتە کولێرە و لەگەڵ هەنگویندا دەخورێت).

## غەزای (ذي أَمَر)

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای (السويق) ئەو رۆژانەی مابوو لەمانگی (ذي الحجة)ی بەسەری برد، پاشان لەگەڵ چوارسەد و پەنجا پیاو لە هاوەڵانی هێرشیان بردە سەر هۆزی غەطفان.

لەم غەزایەدا پێغەمبەر ﷺ عوسمانی کوڕی عەفانی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان لەمەدینەدا لەدوای خۆی دانا. و لەم غەزایەشدا تووشی شەڕ نەهاتن، و لەوێ مایەوە تەواوی ئەو رۆژانەی کە لە مانگی (ربيع الاول) مابوو پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە)[٨٩٢].

## غەزای (الفُرَعْ)

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ غەزایەکی تری ڕێکخست بەرەو ناوچەی هۆزی بەنی سولەیم و قوڕەیش [وە ئیبنو ئوم مەکتومی دانا بۆ نوێژ و سەروکاری مەدینە] موسوڵمانان بەڕێ کەوتن تا گەیشتنە (البحران) لەناوچەی (الفُرع)ی حیجاز، و لەوێ مانگی (ربيع الاخر) و (جمادى الاولى) مایەوە و پاشان گەڕایەوە مەدینە و تووشی شەڕنەهات)[٨٩٣].

## سریەی (ذي القِرَد)

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (قوڕەیش لەدوای جەنگی بەدر ترسان و بێ ئومێد بوون لە ڕێگەی بازرگانیان بۆ شام کەبەلای ناوچەکانی چواردەوری مەدینەدا تێدەپەڕی، بۆیە بڕیاریاندا ئەمجارە ڕێگەکەی عێراق بگرنە بەر بۆ شام، هەندێك لە بازرگانەکانیان بەیاوەری ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب زیوێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت، و پیاوێکی بەنی بەکری کوڕی وائیلیان بەکرێ گرت تا ڕێ نیشان دەریان بێت لەو ڕێگەدا، کاروانەکە بەڕێکەوتن، و ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ

(٨٩٢) انظر:(السيرة) لابن هشام (٣٣٨/٢)، و(الدلائل) للبيهقي (١٦٥/٣)، و(المغازي) للواقدي (١٩٣/١).

(٨٩٣) انظر: (السيرة) لابن هشام(٣٣٨/٢).

و سریەیەکی بەسەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریثە ڕێك خست، و بەرەو ئەو ڕێگایە کەوتنە ڕێ، کاروانەکەی ئەبو سوفیان گەیشتە یەکێك لە کانیاوەکانی نەجد کەناوی (القردة) بوو لەوێ لایاندا بۆ حەوانەوە، و سریەکەی زەید گەیشتە سەریان و پیاوەکانی کاروانەکە هەموو ڕایان کرد، و کاروانەکە دەستی بەسەردا گیراو هێنایانەوە بەرەو شاری مەدینە)[٨٩٤].

## غەزای (بنی قینقاع)

بەنی قەینوقاع هۆزێکی جولەکەی نیشتەجێبووی گەڕەکی (بەنی قینقاع) لە قەراغ شاری مەدینە بوون، ئەم هۆزە لە هەموو کەس زیاتر دوژمن بەئیسلام بوون، کارە خراپەکاریەکانی خۆیان لەگاڵتەجاڕی و سوکایەتی کردن بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ﷺ پەرەی سەند و لەزیادبووندا بوو، و ئەوان یەکەم کەس بوون کە پەیمان نامەی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەڵوەشاندەوە و پابەند نەبوونی خۆیان ڕاگەیاند بەیاسا و بڕیارنامەکەی شاری مەدینەکە پێشتر لەسەری ڕێکەوتبوون لەگەڵ موسوڵمانان و هەموو لایەنەکانی شاری مەدینەدا، تا پێغەمبەر ﷺ هات و کۆبووە وە لەگەڵیاندا و ئامۆژگاری کردن، بەڵام ئەوان هەر زیاتر لاسار وناپاك دەبوون، تا دواجار پێغەمبەر ﷺ و سوپاکەی چواردەوریان لێ گرتن و ڕایان گواستن و دووریان خستنەوە لە مەدینە، بۆ خۆپارێزی لەکارە دوژمن کاریەکانیان.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوەیەکی کرد بە هۆزی بەنی قەینقاع لە بازاڕەکەیاندا و پێی فەرموون: ((ئەی کۆمەڵی جولەکە، وریای خۆتابن نەوەك ئەو بەڵایەی خوا هێنای بەسەر قوڕەیشدا بەسەر ئێوەشدا بهێنێت، موسوڵمان بن ئێوە باش دەزانن، کە من پێغەمبەرێکی نێرراوم و ئەمەش لەکتێبەکەتاندا دەبیننەوە)) ئەوانیش وتیان: ئەی محمد تۆ وا دەزانیت کە ئێمەش وەك خزمە قوڕەیشیەکانتین، تۆ بەوە (مغرور) مەبە کەڕووبەڕووی کەسانێك بوویتەوە، شارەزای جەنگ نەبوون و هەلێکت بۆ ڕێککەوت، بەڵام ئێمە گەر بەشەڕ بێین لەگەڵتدا ئەوجا دەزانیت کە ئێمە بەڕاستی جەنگاوەرین.

---

(٨٩٤) انظر : (السيرة) لابن هشام (٣٤٢/٢)،و(الدلائل) للبيهقي (١٧٠/٣)،و(التاريخ) للطبري (٤٩٢/٢).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: ئەمان یەکەمین کەس بوون کەجەنگیان ڕاگەیاند بەرامبەر موسوڵمانان و کەوتنە کاری شەڕخوازانە و ئەم ئایەتەش سەبارەت بەوان دابەزی: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا...... ﴿١٣﴾ ﴾ (آل عمران)[٨٩٥]. واتە: بەوانەی کە بێ بڕوان بڵێ کە بەم زووانە تێدەشکێن و ژێر دەکەون، وە لەدوارۆژیشدا بەرەو دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە و ڕادەپێچرێن «هەرچەندە ئەمڕۆ موسڵمانان لەئوحوددا بەرەواڵەت تێك شکابن» کە دۆزەخیش جێ خەوێکی خراپە! ﴿١٣﴾ بەراستیی لەو دوو کۆمەڵەدا لەجەنگی (بەدر)دا رووبەرووی یەکتر وەستان، دەرس و ئامۆژگارییەك هەبوو بۆ ئێوە ئەی جوولەکە ! دەستەیەکیان بۆ خوا دەجەنگێن و دەستەکەی تریان کافر و بێ بڕوان و، لەپێناوی تاغووتاندا، دژ بەخوا دەجەنگێن بەچاوی خۆیان کۆمەڵە بڕوادارەکەیان بەدوو ئەوەندەی خۆیان دەبینی، ئەوساش خوا ترسی خستە دڵیانەوە و تێشکان، دیارە خوا پشتگیری هەر کەسێك کە خۆی بیەوێ و بەشیاوی بزانێ دەکات، وانەو ئامۆژگارییەکی گەورە هەیە بۆ ئەوانەی بینایی خۆیان دەخەنە کارو خاوەن فامن.

لە ڕیوایەتێکی ئیبنو هیشامدا ﷺ داهاتووە کە ئەوان سووکایەتیان کردووە بە یەکێك لە ئافرەتانی موسوڵمانان و پیاوێکی موسوڵمانیشیان کوشتووە.

قەتادە ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان هێرشیان کردنە سەر، وە جولەکەکان لە ڕوو بەڕوو بوونەوە ترسان و چوونە ناو قەڵاکانیان، موسوڵمانان گەمارۆیان دان، تا پانزە ڕۆژ ئینجا هەموویان خۆیان دابەدەستەوە، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سلول (گەورەی منافقەکان) کەوتە پارێزگاری لێکردنیان، وتی: ئەی محمد چاك بە لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانەماندا؟ پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە، ئەو وتەکەی دووبارە کردەوە، و پێغەمبەریش ﷺ ڕووی کرد بەولادا، و پاشان عەبدوڵڵا گیرفانی قەڵغانی سەر سنگەکەی پێغەمبەری گرت، پێغەمبەر ﷺ تووڕە بوو فەرمووی: ((بەرم دە)) ئەویش وتی: وەڵا بەرت نادەم تاچاك نەبیت لەگەڵ ئەم هاوپەیمانانەمدا، ئەوان سێ سەد پیاوی قەڵغان لە سنگ و چل پیاوی بێ قەڵغان هەموو پارێزگاریان لێکردووم، لە هەموو سوور و ڕەشێك، من پیاوێکم دەترسم شتم بەسەر بێت؟

---

(٨٩٥) انظر: (السيرة) لابن هشام (٣٣٩/٢) و(الدلائل) للبيهقي (١٧٤/٣)، وأبو داود (٣٠٠١)، وحسن إسناده الحافظ في (الفتح) (٣٣٢/٧)، وضعف إسناده الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (٦٤٧).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوان هەموو بۆ تۆ))[٨٩٦] ئاوا عەبدوڵڵای دووڕوو ڕۆڵی گێڕا بۆ ڕزگارکردن و دەربازکردنی ئەو جولەکە ناپاکانە بەبیانووی ئەوەی کە ئەوان کۆن هاوپەیمانی بوون، بەڵام موسوڵمانانی ڕاستەقینە، وەك عوبادەی کوڕی صامت بێ بەری بوونی خۆیان ڕاگەیاند لەو هاوپەیمانیەی کە لە نێوان ئەوان و بەنی قەینقاعدا هەبوو.

عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامت ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك بەنی قەینوقاع جەنگیان ڕاگەیاند و کەوتنەکاری شەڕەنگێڕانە دژ بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان ئالەوێدا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی پارێزگاری لەوان کرد و دەربازی کردن، بەڵام عوبادەی کوڕی صامت چوو بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بێ بەری بوونی خۆی ڕاگەیاند لە هاوپەیمانی و دۆستایەتی و کۆمەکی کردنی بەنی قەینوقاع وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لایەنگری خوا و و پێغەمبەر و باوەڕدارانم، بەهەموو جۆرێك من بەریم لە هاوپەیمانی و لایەنگری ئەم کافرانە. سەبارەت بەم دوو هەڵوێستە جیاوازەی عەبدوڵڵا و عوبادە ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ........فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ (المائدة)[٨٩٧]. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گاور و جولەکە مەکەنە دۆست و پشتیوانتان، واتە: نە یارمەتیان بدەن و، نەداوای یارمەتیشیان لێبکەن، وە بەهیچ جۆرێك (موالات) و هاوکاریی و خۆشەویستیان نەبێ بۆیان.......).

## کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کەعبی کوڕی ئەشرەف (شاعیر و ناودارێکی بەنی نەضیر بوو): کاتێك کە هەواڵی جەنگی بەدری پێ گەیشت وتی: تۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێت؟ ئێوە لەو باوەڕەدان کە محمد ئەو پیاوانەی کوشتبێت کە ئەو دوو پیاوانە ناویان هێناوە زەید وعەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئەوانە سەرکردە و ناودارانی قوڕەیشن وەڵاهی گەر ئەم هەواڵە ڕاست بێت ژێری خاك باشترە لەسەر زەوی.

---

(٨٩٦) انظر: (السيرة) لابن هشام (٣٤٠/٢) وإسناده صحيح مرسل، والبيهقي (الدلائل) (١٧٤/٣) و (صحيح السيرة) (٣٥٠).

(٨٩٧) نفس المصدر.

کەعب دوای ئەوەی کە دڵنیابوو لە ڕاستی هەواڵەکە بەڕێ کەوت تا گەیشتە شاری مەککە، و لەماڵی موطلیب کوڕی وەداعەی سەهەمی کەخێزانەکەی ناوی عاتیکە کچی ئەبو عیص) بوو لای ئەوان دابەزی، ڕێزیان لێ گرت و لەوێ حەوایەوە، پاشان کەوتە شیعر وتن و هاندانی خەڵك لە دژی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، وە کەوتە لاوانەوەی ناوداره کوژراوەکانی قوڕەیش لە بەدر[٨٩٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: حویەی کوڕی ئەخطب لەگەڵ کەعبی کوڕی ئەشرەف، هەردوو پێکەوە ڕۆیشتن بۆ شاری مەککە وهاوپەیمانیان سازکرد لەگەڵ قوڕەیشدا بۆ شەڕکردن دژ بە پێغەمبەر ﷺ قوڕەیشیش بە هەر دووکیان وت: ئێوە کەسانێکی شارەزان لە زانستە کۆنەکان و خاوەن کتێبی ئاسمانین [وە تۆ ئەی کەعبی کوڕی ئەشرەف گەورە و ناودارو چاکترینی کەسانی خەڵکی مەدینەیت] پێمان بڵێن ئایا ئێمە (باشترو ڕاست ترین) یان محمد؟ هەردووکیان وتیان: ئێوە کێن؟ و محمد کێیە؟ ئەوان وتیان: [ئێمە دەرگاوانی (کەعبەین)] وە ڕزگارکەری [لێقەوماو و دیلین] وشترە قەڵەوەکان سەردەبڕین لەگەڵ شیرو ئاو و دەیبەخشینە حاجی یەکان و خزمەتیان دەکەین، و پەیوەندی خزمایەتی بەڕێوە دەبەین.

هەردووکیان پرسیاریان کرد و وتیان: ئەی محمد کێیە؟ ئەوان وتیان: ئەو پیاوێکی بێ وەچەیەو پەیوەندی خزمایەتی شێواندووین و چەتە و دزەکانی بەنی غیفار دوای کەوتوون، کەحاجیەکان ڕوت دەکەنەوە) وخۆی بەڕاست دەزانێت، (ئایا ئێمە باشتر و ڕاستترین یان ئەوان؟) کەعب و حویەی لە وەڵامیاندا وتیان: ئاین و ڕێگەی ئێوە ڕاست ترە و ئێوە چاکترن لەوان، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾ (الكوثر) واتە: دووژمنەکانت وەجاخ کوێر و بێوەچە دەبن، وە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا﴾ (النساء)[٨٩٩]، واتە: ئاخۆ سەیری ئەوانەت نەکردووە کە

---

(٨٩٨) انظر: (السيرة) لابن هشام (٣٤٢/٢).

(٨٩٩) أخرجه: الطبري (التفسير) (٩٧٨٦)، والنسائي (التفسير) (٧٢٧) وقال محققه:إسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (١١٦٤٥)، والبزار(٢٢٩٣)،وابن حبان (٦٥٧٢) وقال محققه:إسناده صحيح، وقال ابن كثير (التفسير) (٣٠٦/٦):إسناده

بەشێك لە کتێبی (تەورات)یان پێدراوە؟ کەچی باوەڕیان بە بت و، تاغووت و فالگرتنەوەو جادوو و شەیتان هەیە، واتە: پەیڕەوی لە بەرنامە دنیاییەکان دەکەن!! بەموشریك و بێ باوەڕەکان دەڵێن: ڕێ و ڕێبازی ئەوانە (موشریك و کافرەکان) لەڕێی باوەڕدارەکان نما ترە ﴿٥١﴾ ئا ئەوانەن خوا نەفرینی لێکردوون و لەمیهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە دیارە هەرکەسێك خوا نەعلەت و نەفرینی لێبکات، هەرگیز تۆ هیچ یارمەتیدەرێکت بۆ دەست ناکەوێ . ئەم دوو تاوەنبارە گەڕانەوە مەدینە، بەڵام کەعب خراپتر لە جاران کەوتە وتنی شیعر دژ بەخوا و پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام و موسوڵمانان، کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (کەعبی کوڕی ئەشرەف کەوتە دژایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ بەشیعر، و هاندانی موشریکەکان و قوڕەیش دژ بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، خوای گەورەیش سەرەتا فەرمانیدا بە لێبووردن و ئارام گرتن بەرامبەر ئەوان، و ئەم ئایەتەش دابەزی: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾ (آل عمران) واتە: سوێند بەخوا گیان و داراییتان (ئەی موسڵمانان!) بەبەڵا و نەهامەت بەر تاقیکردنەوە دەکەون، وە لەوانەی کتێبیان پێدراوە لە پێش ئێوەوە و لە هاوبەشدانەرانەوە زۆرو زەبەندە قسەی نابەجێ و ناخۆش ئەبیستن و، پێی دڵتەنگ دەبن، بەڵام ئەگەر ئێوە لەبەرامبەر وتەکانیانەوە خۆگربن و، لە کردارو وتارتاندا پارێز بکەن ، سەرکەوتوو دەبن، بەراستیی کاری وا، لە کاری مەردان و جوامێران دەچێت. بەڵام کەعب هەر دەس بەرداری ئەم کارە خراپانەی نەدەبوو)[٩٠٠]، وەکەعب دەهات و پرسیاری جۆرا و جۆری دەکرد تا پێغەمبەر ﷺ نارەحەت بکات.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کەعبی کوڕی ئەشرەف لەگەڵ حویەی کوڕی ئەخطب و هەندێك جولەکە هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتیان: ئەی محمد ئەو خوایەیی کە تۆی ناردووە چۆنە بۆمان باس بکە؟ خوای گەورەش سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ (الإخلاص)ی دابەزاند)[٩٠١].

---

صحيح، واللفظ للطبراني والزيادات لابن ابي حاتم والنسائي والبزار وابن حبان.

(٩٠٠) أخرجه: ابوداود (٣٠٠٠)، وقال الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٢٥٩٣):إسناده صحيح.

(٩٠١) أخرجه: ابن عدي (الكامل) (٢٣٥/٤)، والبيهقي (الاسماءوالصفات) برقم (٦٠٥)، و الهروی في (ذم الكلام واهله) رقم (٦٥٢) وقال محققه: حسن.

کەعب هەردەس بەرداری ئەم تاوانەی نەدەبوو، وە شیعرەکانیشی نزیك بوو ورەی هەندێ لەکافران بەرز بکاتەوە و بیان بزوێنێ، وە توانایان بداتە بەر بۆ دژایەتی کردنی موسوڵمانان، تا ڕۆژی تۆڵە هاتە پێش.

بەسەر هاتی لەناو بردنی ئەم تاوەنبارە لە زۆر سەرچاوەدا هاتووە، هەندێکیان بەکورتی و هەندێکیان بەدرێژی، وە هەریەکەیان تەنها چەند لایەنێکی باسەکەی تێدایە، بەکۆکردنەوە و ڕێکخستنی هەموویان لەبەسەرهاتەکە باشتر ئاشنا دەبین لەهەموو ڕوویەکەوە، باسەکەش بەدرێژی بەم جۆرەیە:

جابر ﷺ دەفەرموێت: (کەعب هەر دەس بەرداری ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان نەبوو، تا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَن لِكَعْبِ بنِ الأشْرَفِ، فإنَّه قدْ آذَى اللَّهَ ورَسولَهُ [فَقَدْ آذَانَا بِشِعْرِهِ وَقَوّى الْمُشْرِكِينَ])) واتا: کێ تۆڵە لە کەعبی کوڕی ئەشرەف دەکاتەوە بەڕاستی ئازاری خوا و پێغەمبەر ﷺ دەدات بە شیعرەکانی و موشریکەکان بەهێز دەکات. محمدی کوڕی مەسلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێت خۆشە بیکوژم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ))، (بەڵام بچۆ ڕاوێژ بە سەعدی کوڕی موعاذ بکە).

محمدی کوڕی مەسلەمە ﷺ دەڵێت: من چووم بۆلای سەعد و باسەکەم بۆ گێڕایەوەو ئەویش وتی: بڕۆ بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە پشت بەخوا، بەڵام حارث کوڕی ئەوسی برازام وە عەبادی کوڕی بشر وە ئەبو عەبسی کوڕی جابری ئەلحارث وە ئەبو نائیل سەلکانی کوڕی قەیسی ئەشهەلی ئاگادار بکەرەوە و لەگەڵ خۆتدا بیان بە، منیش چووم بۆلای هەموویان و لەکارەکە ئاگادارم کردنەوە، هەموویان قایل بوون تەنها (سەلکان) نەبێت پێی وتم (برازام من تۆ بەڕاست دەزانم، بەڵام پێم خۆشە ئەو کارە ئەنجام نەدەم تا خۆم دەچم قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکەم، ئەو ڕۆیشت و باسەکەی لای پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوەو ئەویش پێی فەرموو بوو: ((لەگەڵ هاوڕێکانتدا بڕۆ)).

محمدی کوڕی مەسلەمە دەڵێت: وتم (ئەی پێغەمبەری خوا) ڕێگەم بدە تا (شت) بڵێم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بڵێ))، (واتا: پێویستت بەهەر قسەیەك بوو وەك فێڵ بیڵێ و بەکاری بێنە)، (پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەسەعدی کوڕی مەعاذ

کە ئەو کۆمەڵە بنێرێت بۆ کوشتنی کەعب، سەعدیش ئەو پێنج کەسەی بۆ نارد، هەرپێنجیان چوون بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف کە دانیشتبوو لەناو خزمەکانیدا لە (العوالي) واتە: ناوچەی سەرووی مەدینە.

کاتێك کەعب کە ئەو پێنج کەسەی بینی لێیان ترساو پێی وتن: بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟ ئەوانیش وتیان: ئیشووکارمان بە تۆ هەیە؟ کەعب وتی: با یەکێکتان لێم نزیك بێتەوە و کارەکەیم پێ ڕاگەیەنێت؟) محمدی کوڕی مەسلەمە لێی نزیك بۆیەوە و کەوتە باسی پەیوەندی هەردوولا و پاشان پێی وت: ئەم پیاوە (داوای) زەکاتی لێ کردووین و بەڕاستی ماندووی کردووین (من هاتووم بۆلات کە هەندێك خورمام بەقەرز بدەیتێ، کەعب ئەمەی گوێ لێبوو وتی: ئەمەشی هێنا بەسەرتاندا وەڵا لێی بێزار دەبن، (لەوکاتەوە ئەم پیاوە هاتۆتەلاتان تەواو ماندووی کردوون) محمدی کوڕی مەسلەمە پێی وت: ئێمە ئێستا شوێنی کەوتووین پێمان ناخۆشە لێی دوور کەوینەوە تا نەزانین کۆتاییەکەی بە چی دەگات، ئێمە هاتووین دەمانەوێت وسقێك یا دوو وسقمان خورما بەقەرز بدەیتێ).

کەعب وتی: باشە بەڵام (بارمتەم لادانێن)؟ ئەویش وتی: چیت دەوێت؟ کەعب وتی: (ژنەکانتانم بە بارمتە لادادەنێن) ئەویش وتی: [چۆن ئێمە ژنەکانمان بە بارمتە لای تۆ دادەنێین] تۆ جوانترین پیاوی، کەعب وتی: [دە منداڵەکانتان لام بە بارمتە دابنێن] ئەویش وتی: (ئەمە شوورەییە لەسەر ئێمە) دواجار بەمنداڵەکانمان دەوترێت و دەڵێن: ئێوە هاوشێوەی وسقێك یا دوو وسق خورما بە بارمتە گیراون، ئەمە ناکەین، بەڵام چەکت بە بارمتە لادادەنێین. کەعبیش وتی: باشە. ئینجا محمد بەڵێنی دایە [کە لەدوای بێدەنگی شەو] هەر پێنجیان بێن بۆلای.

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (هەر پێنجیان پێغەمبەر ﷺ بەڕێی کردن (واتا دوای تەواو بوونی نوێژی عیشا) و لەگەڵیاندا ڕۆییشت تا گۆڕستانی (بقیع الغرقد) لەوێ ئەوانی ناردوو فەرمووی: ((انطلِقوا على اسمِ اللهِ ، اللَّهمَّ أَعِنهُم)) واتا بڕۆن بەناوی خواوە، خوایە کۆمەکیان بکە؟ پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوەماڵەوە، وە ئەو شەوەش مانگە شەوێکی ڕووناك بوو، ئەوان (هەر پێنجیان) ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای قەڵاکەی، ئەبو نائیلە و محمدی کوڕی مەسلەمە بانگیان لێ کرد، وکەعبیش

تازە ژنێکی خواستبوو، کە ئەو دەنگەی بیست لە جێگاکەی بەرز بووەوە، و ژنەکەی لایەکی کراسەکەی گرت و پێی وت: تۆ پیاوێکی دوژمن داری، [دوژمندار لەم کاتەدا ناچێتە دەرەوە؟] کەعب وتی: ئەوە ئەبو نائیلەیە گەر بیزانیایە من خەوتووم هەڵی نەدەستاندم. ژنەکەی پێی وت: وەڵا من بە دەنگەکەیدا دەزانم کە خراپ کارە (بۆ کوێ دەچیت ئالەم کاتەدا؟) [ئەمانە لەم کاتەدا نەهاتوون بۆ لات بۆشتێك کە تۆ پێت خۆش بێت] [من گوێم لە دەنگێکە بۆنی خوێنی لێدێت؟] کەعب وتی: [ئەمە تەنها محمدی کوڕی مەسلەمە و ئەبو نائیلەی برا شیریەکەیەتی] [و ئەوان پێشتر ئەم پێویستیەی خۆیان لاباس کردووم] و بەڕێز ئەوەیە گەر بۆ کوشتنیشی بانگ بکرێت بە شەو هەر دەڕوات. (پاشان محمد بە هاوەڵەکانی وت: (گەر ئەو هات من دەست درێژدەکەم بۆ سەری [بۆنی دەکەم] و گەر ئێوەش (منتان) بینی کە(سەری) وا لەناو دەستم دایە. (ئەوجا بە هەمووتانەوە لێی بدەن) (محمد کوڕی مەسلەمەش هاوەڵەکانی ئاگادار کردەوە کە لەژێر دارخورماکەدا چاوەڕێی بکەن).

لەپاشان کەعب دابەزیە لایان و یەك پۆشاکی لەبەردابوو و بە (خۆیەوە پێچابوو بۆنی گوڵاوی لێ دەهات، ئینجا هاتە لای محمدی کوڕی مەسلەمەو دانیشت لەگەڵی، محمد پێی وت: چەند بۆنەکەت خۆشە و قەد و باڵات ڕێکە و لەوێدا ماوەیەك لەگەڵ هەموویان دانیشتوو قسەی لەگەڵدا کردن، ئەوان وتیان: کەعب با بەپیاسە هەموو بچین تا شیوی (العجوز) و لەوێ قسەکانمان تەواو بکەین؟ کەعبیش وتی، گەر پێتان خۆشە بابڕۆین، بەپیاسە هەموو ماوەیەك ڕۆشتن، ئینجا محمدی کوڕی مەسلەمە دەستی برد بۆ سەری کەعب و پاشان بۆنی دەستی خۆی کرد و وتی: تا ئێستا بۆنێکم نەدیوە خۆشتر بێت لەم بۆنەی ئەم شەو، کەعبیش وتی: ئەوە خۆشترین بۆنی عەرەبە لەبەر ئەوە لەخۆمداوە کە فلان ئافرەتم خواستووە، محمدی کوڕی مەسلەمە پێی وتەوە: ڕێگەم دەدەیتەوە دیسان بۆنی سەرت بکەمەوە؟ وتی: بەڵێ، پاشان دەستی برد بۆسەری و بۆنی کرد، هاوەڵانی بۆنیان کرد تا (سێیەم جار) ئینجا دەستی بردەوە بۆ سەری ئەمجارەیان بەهەردوو دەستی سەری توند گرت و بەهاوەڵانی وت: (لەم دوژمنەی خوا بدەن) و بیکوژن، ئینجا هەمووی لێی کۆبوونەوە..... تا کوشتیان.

لەوێدا و دەنگە دەنگ بڵاوبووەوەو جولەکەکان هەموو لە قەڵاکانیانەوە هەستان و ئاگریان هەڵگیرساند، بەڵام شمشێری یەکێکیان گەڕایەوە بۆ بەر قاچی حارثی کوڕی ئەوس کوڕی موعاذ کەوتو قاچی بریندار کرد، ئینجا هەموویان بە ڕاکردن بەسەر نیمچە تەپۆلکەی بەنی ئومەیەداو لەوێشەوە بۆ نیمچە تەپۆلکەکانی بەنی قورەش ڕۆیشتن.

محمدی کوڕی مەسلەمەش دەڵێت: ڕامان کرد و دەرچووین بۆ سەر بەرزایەکەی (حرة العريض) حارثی کوڕی ئەوسمان لێ دواکەوت و برینەکەی خوێنی لێدەهات، وە ئێمەش ماوەیەك لەسەری وەستاین، تا بینیمان وا بەشوێنمانا دێت، ئێمەش چووین و هەڵمان گرت، وە تا لە کۆتایی شەودا گەیشتینە لای ماڵی پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ شەو نوێژی دەکرد و لەدەرەوە سەلاممان لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ دوای تەواو بوونی نوێژەکەی هاتە دەرەوە بۆ لامان فەرمووی: (أفلحت الوجوه) واتە: ڕوخسارەکانتان سەرفراز و سەرکەوتوو دیارە، ئیتر ئێمەیش موژدەی کوشتنی دوژمنەکەی خوامان پێداو تفێکی نایە سەر برینەکەی حارث، و پاشان گەڕایەوەو ئێمەیش گەڕاینەوە بۆ لای خێزانەکانمان.

ئیتر لەم ڕووداوەوە هەموو چاوترسێن بوون و هەموو جولەکەیەك لەخۆی دەترسا. کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (لەدوای ئەم ڕووداوەوە جولەکەکان و موشریکەکان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: کەعبی سەرکردەمان بە پیلانێك ئەم شەو کوژراوە؟

پێغەمبەریش ﷺ بەبیری هێنانەوە کەچۆن کەعب ئازاری پێغەمبەر و موسوڵمانانی دەدا، بە شیعرەکانی دژایەتی هەموویانی دەکرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردن کەڕێکەوتن نامەیەك لەنێوانیاندا بنوسرێت، تا هەموولایەك بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتن نامەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدا بکەن، ئیتر ئەوە بوو ئەو ڕێکەوتن نامەیە لەلایەن پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان لەگەڵ جولەکەکان نوسراو هەموو لەسەری ڕێکەوتن، ئەو ڕێکەوتن نامەیەش لای عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ مایەوە)[٩٠٢].

---

(٩٠٢) أخرجه: البخاري (٤٠٣٧)، ومسلم (١٨٠١) وأحمد (٢٣٩١) وقال محققه:إسناده حسن، وانظر الحديث رقم (٢٤٠٠٩)، وقال محققه ايضاً:صحيح لغيره، وابوداود(٣٠٠٠، ٢٧٦٨)، وعبدالرزاق (٩٣٣٨) والطبري (التفسير) (٨٣١٧)، والطبراني (الكبير) (١١٥٥٤) (١٩/ (١٥٥،١٥٤)، والحاكم برقم (٥٨٩٦،٥٨٩٧)، والبيهقي (الكبرى) (١٨٦١٣،١٨٦١٢) وفي

بەم جۆرە کەعبی کوڕی ئەشرەف بەتۆڵەی تاوانەکانی خۆی گەیشت، لەپەیمان شکاندن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، وەخەیانەت کردن لەدانیشتوانی شارەکەی خۆی و پشت گیریکردنی دوژمنانی ئیسلام و هاندانیان بۆ بەرەنگاری و بەگژدا چوونەوەی ئیسلام و موسوڵمانان و دەرکردنی شایەتی ناهەق بۆ موشریکەکان و جوێندان بە پێغەمبەر ﷺ و بوختان کردن بۆ ئافرەتانی موسوڵمانان، هەموو هەڵوێستێکی ئەم ناپاکە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر شکاندنی ئەو پەیمان نامەیەی کە لەنێوان هەردوو لادا هەبوو، وە هەموو یەکێك لەم تاوانانە وا دەکات لەخاوەنەکەی کە خوێنی بە فیڕۆ بچێت و بەدوژمن بناسرێت و مامەڵەی دوژمنی لەگەڵدا بکرێت)[٩٠٣].

---

(الدلائل) (١٩٦/٣)، وابن هشام (السيرة) برقم (٥٨٠، ٥٨١)،والنسائي (الكبرى) (٨٦٤١)،والبزار(١٨٠١)،وحسن إسناد ابن اسحاق: الحافظ في: (الفتح) (٤٢٩/٧)،وفي (المطالب) (٤٢٥٦،٤٢٥٥)، واللفظ لمسلم وابن هشام والزيادات للحاكم والطبراني وأبو داود والبيهقي.

(٩٠٣) انظر: (السيرة النبوية دروسٌ وعبر) (٥٨/٢).

## غـەزای ئـوحـود

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کافرەکانی قوڕەیش دوای ئەوەی کەتووشی شکستە گەورەکەی بەدر هاتن، و کاروانە بازرگانیەکەیان دەربازبوو و گەڕایەوە مەککە، هەندێك لە ناودارانی قوڕەیش وەك: عەبدوللای کوڕی ڕەبیعە، و عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، صەفوانی کوڕی ئومەیە، و پیاوانێکی تر لە قوڕەیش کە کوڕ و باوك و برایان کوژرابوو لە جەنگی بەدردا، هەموو پێکەوە داوایان لە ئەبو سوفیان و ئەو بازرگانانە کرد کە کاروانە بازرگانیەکەیان پێك هێنابوو و پێیان وتن: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش خۆتان دەزانن کە محمد ئێوەی کردووەتە دووکەرتەوە و پیاوە باشەکانیشی کوشتوون، ئێوەش بەم سامانەتان کۆمەکی بکەن بۆجەنگ کردن لەگەڵیدا، بەڵکو تۆڵەی کوژراوانی خۆمانی لێبکەینەوە.

قوڕەیش هەموو بەم پێشنیارە ڕازی بوون. هەموو کۆبوونەوە لەسەر جەنگ بە ئەبوسوفیان و هەموو خاوەن کاروانەکان و هەموو لایەنگرانی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان لە هۆزەکانی کینانە و دەشتی توهامە. [و پێشتر ئەبو عیزەی جومەحی لەگەڵ هوبەیرەی مەخزومی و ئیبن زەعبەری و عەمری کوڕی عامر، کەوتبوونە جۆشدانی خەڵك بۆ ئامادەباشی و بەشداری کردن لەم جەنگەدا بۆ تۆڵە سەندنەوە] ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: هەندێ لەزانایان دەفەرمون ئەم ئایەتە بۆ ئەوان هاتۆتە خوارەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (الأنفال). واتە: (بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ڕێگرتن لە ڕێبازی خوا ، جا بە تەئکید بەردەوام بەختی دەکەن بۆ ئەو مەبەستە، پاشان دەبێتە مایەی ئێش و داخ بۆیان و، پەشیمان ئەبنەوە ، سامانەکەیان بەخت دەکەن، بەڵام بۆ دوایی هەر ژێر دەکەون و تێدەشکێن، دڵنیابن گشت بێباوەڕان بەرەو دۆزەخ ئەبرێن و کۆ دەکرێنەوە).

پاشان قوڕەیش بە هەموو ورەیەکەوە و بە هەموو چەك و چەکدارەکانیەوە خۆیان سازدا و بەڕێکەوتن و ژنانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا لەگەڵ کۆیلەکان بۆ ورە بەرزکردنەوە، ئەبو سوفیان کە سەرکردەیان بوو ژنەکەی هیندی کچی عوتبەی

لەگەڵ خۆی هێنا بوو، سەفەوانی کوڕی ئومەیەش ژنەکەی بەرزەی کچی مەسعودی لەگەڵ خۆی هێنا، وە عەمری کوڕی عامیش ڕیطەی کچی مونەبهی ژنی لەگەڵ خۆی هێنا، و طەلحەی کوڕی ئەبو طەلحەش سولافەی کچی سەعدی ژنی لەگەڵ خۆی هێنا، هەموو پێکەوە بەرێکەوتن بەرەو مەدینە)[٩٠٤]. واقیدی لە (المغازي)دا دەڵێ: (عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی وردی ئەم سوپایەی بەنێرراوێکدا گەیاندە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە، پێش دەرچوونی سوپاکەی قورەیش)[٩٠٥].

زوهری ﷺ دەفەرموێت: (سەرجەم ژمارەی سوپاکەی قورەیش سێ هەزار کەس بوو، و دوو سەد ئەسپیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو)[٩٠٦]، ئەمەش لەمانگی شوالی دووەمی کوچیدا بوو. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (سوپاکەی قورەیش گەیشتنە نزیك شاری مەدینە و لە ئەو سەری شیوەکەی (السبخة) بەرامبەر بە مەدینە و لای بەرزایی (العنين) دابەزین).

## ڕاوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (هەندێك لەو موسوڵمانانەی کە بەشدار نەبوون لە جەنگی بەدردا، خۆزگەیان دەخواست کە دوژمن بێت تا ئەوانیش وەك برایانی تریان ڕۆڵ بگێڕن لە جەنگی قورەیشدا و پاداشتی بەرز بەدەست بێنن، وە کاتێك ئەبوسوفیان لەگەڵ موشریکەکاندا لای خوارووی ئوحود دابەزین، ئەو موسوڵمانانە زۆر دڵخۆش بوون، بەهاتنی دوژمن و دەیان وت: خوای گەورە ئاواتەکەمانی بۆ هێنایەدی.

پێغەمبەریش ﷺ لە شەوی جومعەدا خەوێکی بینی و کە ڕۆژ بووە وە بۆ هاوەڵەکانی گێرایەوە کەهاتبوون بۆلای وە پێی فەرموون: ((رأَيْتُ البارِحَةَ فِي مَنامِي بَقراً تُذبَحُ، ورأيْتُ سَيْفي ذا الفَقارِ أنقَصَمَ مِنْ عند ظُبَتِهِ)) أو قَالَ ((بِهِ فُلُولٌ فَكَرِهْتُهُ وَهُمَا مُضَبَّبَتَانِ)) إنِّي رأَيتُ أنِّي فِي دِرعٍ حَصينةٍ، وأنِّي مردِفٌ كَبشًا))[٩٠٧]. واتە: ئەم شەوی ڕابردوو لە خەومدا بینیم

---

(٩٠٤) انظر: (السيرة) لابن هشام (٥/٣) برقم (٥٨٤)،و (التفسير) للطبري (١٦٠٧٧).

(٩٠٥) انظر: (المغازي) للواقدي (٢٠٤/١).

(٩٠٦) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٢٢٠/٣).

(٩٠٧) أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٢٠٦/٣).

هەندێك مانگا سەر دەبڕان، وەشمشێری (ذا الفقار)ی خۆمم بینی لە قەراغەکەیەوە کەرتێکی لێ بووە، لە ڕیوایەتێکدا ((هەر دوولای شمشیرەکە قرنجا بوو، و بینیم کە من لە قەڵغانێکی قایمدام و بەرانیك بەدوای خۆمدا ڕادەکێشم))، ئەو خەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بینی لە چەند فەرمودەیەکدا هاتووە، دوای ڕیکخستنیان بەم جۆرەیە: (پیغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((رَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فانْقَطَعَ صَدْرُهُ)) لە گێڕانەوەیەکی تردا: [وَرَأَيْتُ فِي ذُبَابِ سَيْفِي ثَلْمًا] لەگێڕانەوەیەکی تردا: [رأيتُ في سَيْفِي ذا الفَقار فلاً] لەگێڕانەوەیەکی تردا: [كأن ضُبةَ سَيْفِي انْكَسَرَتْ] ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعادَ أحْسَنَ ما كانَ، فإذا هو ما جاءَ اللَّهُ به مِنَ الفَتْحِ واجْتِماعِ المُؤْمِنِينَ، ورَأَيْتُ فيها أيضًا بَقَرًا [تُذبَحُ فَبقرٌ]، واللَّهُ خَيْرٌ، فإذا هُمُ النَّفَرُ مِنَ المُؤْمِنِينَ يَومَ أُحُدٍ، وإذا الخَيْرُ ما جاءَ اللَّهُ به مِنَ الخَيْرِ بَعْدُ، وثَوابُ الصِّدْقِ الذي آتانا اللَّهُ بَعْدَ يَومِ بَدْرٍ [ورأيت أني مُرْدِفٌ كبْشًا] [وَرَأَيْتُ أَنِّي أَدْخَلْتُ يَدِي فِي دِرْعٍ حَصِينَةٍ، فَأَوَّلْتُهَا الْمَدِينَةَ]))[٩٠٨] واتە: لەخەوەکەمدا بینیم شمشیرەکەم لەرانەوە نوکی پێشەوەی شکا، لەڕیوایەتێکدا [بینیم لەنوکی تیژی شمشیرەکەمدا کەرتێکی لێ بووەوە]، لە ڕیوایەتێکدا: [کەرت بوونێکم بینی کە لە شمشیرەکەم (ذا الفقار)دا بوو] لە ڕیوایەتێکدا: [بینیم لایەکی شمشێرەکەم شکابوو] [ئەوەش کوشتنی یەکێکە لە خزمەکانم]... پاشان شمشێرەکەم جارێکی تر لەرانەوە تەماشام کرد چاك بووە وە ولە جاران باشتر بووە وە ئەمەش سەرکەوتنی خودایە و یەکبوونەوەی ئیماندارانە، لەخەوەکەمدا بینیم هەندێك مانگا سەردەبڕان، سوێند بەخوا ئەوەش ئەو بڕوادارانەیە کە لە جەنگی ئوحودا (واتە: شەهید دەبن)، وە ئەو خێرەش پاداشتی ئەو ڕاست گۆییەیە کە خوای گەورە پێی بەخشین لە دوای جەنگی بەدر [لە خەوەکەمدا بینیم بەرانێکم بە دوای خۆمدا ڕادەکێشا]. ئەوەش مانای ئەوەیە کە گەورەیەکیان لێ دەکوژین) [بینیم وەکو دەستم خستبێتە قەڵغان سنگێکی زۆر پتەووەوە] ئەوەش مانای شاری مەدینەیە).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کە خەوەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە و (بۆی لێکدانەوە) بە هاوەڵەکانی فەرموو: ((بابمێنینەوە لە شاری مەدینە

(٩٠٨) أخرجه البخاري (٤٠٨١)، ومسلم (٢٢٧٢)، والترمذي (١٥٦١)، وابن ماجه (٣٩٢١)، والدارمي (٢١٥٨)، وأحمد (٣٥١/٣) (١٤٧٩٧) وقال محققه: إسناده حسن، و عبد الرزاق (٣٦٢/٥)، والحاكم (١٢٨/٢)، والبيهقي (الدلائل) (٢٠٤،٢٠٥/٣)، وابن هشام (السيرة) (٨/٣)، والطبراني (الكبير) (٣٩٤/١١)، وابن سعد (٣٤/٢)،ووحسن إسناد أحمد: الحافظ في (الفتح) (٢٨٥/١٥)، وابن كثير (البداية) (١١/٤) واللفظ للبخاري والزيادات لأحمد والدارمي وابن ماجه والحاكم والبيهقي.

گەر ئەوان بێنە ناوەوە لە ناو شارەکەدا شەڕیان لەگەڵدا دەکەین))[٩٠٩].

لەڕوایەتەکەی ئیبنو ئیسحاقدا ﷺ پێی فەرموون: ((گەر بەچاکی دەزانن با لە مەدینەدا بمێنینەوە، و وازیان لێ بهێنن با ئەوان لەجێگەی خۆیاندا بمێننەوە و ئەوە خراپترین شوێنە بۆ ئەوان، ئەگەر هاتنە سەرمان ئەوا لەناو شارەکەدا لەگەڵیان دەجەنگێین))[٩١٠].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: ((بمێننەوە لەناو شاردا، و ژن و منداڵەکان ببەنە ناو ماڵەکانەوە، گەر ئەوانیش هاتنە ناوەوە بۆمان، (کۆڵان بە کۆڵان) لەگەڵیان دەجەنگێین و لەسەر خانووەکانیشەوە (ئافرەتان) تیر بارانیان دەکەن))، بەڵام ئەوانەی کە جەنگی بەدریان نەدیبوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بە خوا ئەوان لە زەمانی نەفامیدا نەیان توانیوە بێنە سەرمان بۆ ناو شار، ئەی ئێستا چۆن دەتوانن بێنە سەرمان دوای موسوڵمان بوونمان، ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاواتە خوازبووین و داوامان لەخوا دەکرد کە ڕۆژێکی وا بێتە پێشەوە بۆمان ئەوەتا ئێستا خوای گەورە ئاواتەکەمانی بۆ هێناوینەتە دی و ڕێگەکەی بۆ نزیك کردووینەتەوە.

هەندێك لە پیاوانی ئەنصار وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر لە شیوەکەی خۆمان لەگەڵیان بەجەنگ نەیەین ئەی کەی ولە کوێ لەگەڵیان بجەنگێین. وە هەندێکی تریان وتیان: ئێمە چی بکەین دەبێت جەنگەکە لە کێڵگەکانمان دوور بخەینەوە. وە پیاوانێکی تر وتەی خۆیان وت و ڕاست گۆیانە لەسەری ڕۆیشتن لەوانە: حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی ئەو کتێبەی بۆ دابەزاندوویت دەبێت بەجەنگ بێین لە گەڵیاندا (لە دەرەوەی شار)، وە یەعموری کوڕی مالکی کوڕی سەعلەبە ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەهەشتمان لێ قەدەغە مەکە سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە دەبێت بچمە ناو بەهەشتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بەچی دەچیتە ناو ئەو بەهەشتەوە؟ وتی: بەوەی کە من خواو پێغەمبەرم خۆش دەوێت، وەلە ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەشدا ڕاناکەم پێغەمبەر

(٩٠٩) أخرجه: أحمد (٣٥١/٣)، والدارمي (٢١٥٩)، وعبد الرزاق (٣٦٤/٥) وصحح إسناده الحافظ في (الفتح) (٤٢١/١٢) وصححه أيضاً الأرناؤوط في تحقيق (المسند) برقم (١٤٧٨٧).

(٩١٠) انظر: (السيرة) لابن هشام (٩/٣).

ﷺ پێی فەرمووو: ((ڕاست دەکەیت))[٩١١].

ئیبنو ئیسحاق ﷬ دەفەرموێت: (بۆ چوونی عەبدوللای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول لەگەڵ بۆچوونی پێغەمبەر ﷺ دابوو کەنەچنە دەرەوە بۆیان)[٩١٢].

موسای کوری عوقبە ﷬ دەفەرموێت: (بەم جۆرە زۆرینەی خەڵکی ڕازی نەبوون بە بەمانەوە لە مەدینە، و لەگەڵ وتە و بۆچونەکەی پێغەمبەردا ﷺ نەبوون، گەر ئەوان ڕازی بوونایە بە فەرمانەکەی هەر ئەوە چاکتر بوو، بەڵام قەزاو قەدری خوا وا بوو. ئەو ڕۆژە ڕۆژی (جمعة) بوو، پێغەمبەر ﷺ لە وتاری جومعەدا ئامۆژگاری کردن و ئەو باسەی بەبیرهێنانەوە، و فەرمانی پێکردن بە خەبات و تێکۆشان و ئینجا وتارەکەی تەواو کرد و نوێژەکەی بۆ کردن، و پاشان داوای چەکەکەی و کەل وپەلی جەنگی کرد و جلی جەنگی لەبەر کرد (و پێی فەرموون: گومانم وایە کە ئەمڕۆ کوژراو زۆر دەبێت لە ئێوە و لەوان) ئالەو ڕۆژەدا پیاوێك لە ئەنصار کە ناوی مالکی کوڕی عەمر بوو مرد، و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد (دوای تەواو بوونی و ناشتنی) گەڕایەوە ناو موسوڵمانان.

پاشان ئەوان پەشیمان بوو بوونەوە و لە ناوخۆیاندا وتبوویان: نەدەبوو ئێمە پێغەمبەر ﷺ ناچار بکەین و زۆری لێ بکەین بۆ چوونە دەرەوە، و هەندێك لە پیاوە کارناس و ژیرەکانیان وتیان: پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کردین کە لە مەدینە بمێنینەوە، گەر دوژمن هاتە ناوە وە بۆمان لە کۆڵانەکاندا لەگەڵیان دەجەنگێین وە ئەو پێغەمبەرە و هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت و زاناترە بە خوا و فەرمانەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە زۆرمان لێکرد تا بۆچوونەکەی ئێمە قبوڵ بکات (پاشان ئەم وتانە لەلایەن هەموو ئەنصارەوە لە ناو خۆیان دەیان وتەوە، بۆیە هەموو تێکڕا هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لەشاردا بمێنینەوە و هەر بۆ چوونەکەی تۆ ڕاستە و ئێمەش پشت گیریت لێ دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لنبيٍّ إذا لبِس لَأْمَتَه أن يضَعَها حتى يُقاتِلَ، وقد دَعَوتُكم إلى هذا الحديثِ

---

(٩١١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٠٧/٣)، وأحمد(المسند) (٤٨٧٨) وقال محققه: حديث صحيح، واللفظ لهما

(٩١٢) أخرجه: ابن هشام (٩/٣) عبد الرزاق (المصنف) (٩٧٣٥)، وأحمد (المسند (١٤٨٧٨) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي (الكبرى) (٧٦٤٧).

فأبَيتُم إلَّا الخروجَ؛ فعَليكم بتَقْوى اللهِ والصَّبرِ إذا لَقيتُمُ العَدوَّ، وانظُروا ما أمَرتُكم به فافعَلوه))[٩١٣] واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە چەکی لە خۆی بەست دای بنێت تا شەڕ نەکات، وە من پێش تر ئەوەم لێ داوا کردن بەڵام ئێوە تەنها بە دەرچوون نەبێت ڕازی نەبوون، لەبەر ئەوە گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانەکانی خوا، ئارام وخۆگربن لە کاتی تێکرژانتان لەگەڵ دوژمن دا، ئەوەی فەرمانم پێ کرد (زۆر بە چاکی جێبەجێ بکەن). پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە خۆئامادەکردن بۆ دەرچوون لە شار و ڕووبەڕوو بوونەوەی موشریکەکان.

## خۆ ئامادەکردن و دەرچوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی موشریکەکان

سەرجەم موسوڵمانان کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی موشریکەکان، تەنانەت ئەوانەش کە منداڵ و کەمئەندام بوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی تەنها بە هەندێکیاندا بۆ بەشداربوون لەم جەنگەدا، لەوانە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدان عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کوڕی خەطاب ﷺ بوو، وەك خۆی دەفەرموێت: (داوای بە شداربوونم کرد لە جەنگی ئوحوددا تەمەنم چواردە ساڵان بوو بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدام)[٩١٤].

ئیبنو هیشام ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیدا بە سەمورەی کوڕی جوندوب وە ڕافعی کوڕی خەدیج کە هەردووکیان تەمەنیان پانزە ساڵ بوو.... بەڵام ڕێگەی نەدابە: ئوسامەی کوڕی زید.... وەزیدی کوڕی ثابت، و بەرائی کوڕی عازب، وعەمری کوڕی حەزم، و ئوسەیدی کوڕی ضوهەیر)[٩١٥]، وە لە هەندێك (ڕیوایەت)دا هاتووە (کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەداوە بە چواردە منداڵ کە بەشداربن لە جەنگی ئوحود دا)[٩١٦].

موسوڵمانان هەموو پێشبڕکێیان دەکرد بۆ بەشدار بوون لەم جەنگەدا، تەنانەت

---

(٩١٣) المصدر السابق.

(٩١٤) أخرجه: البخاري (٤٠٩٧)، ومسلم (١٨٦٨،٢٩٥٧)، والنسائي (الصغرای) (١٥٥/٦)،والترمذي (١٧٧١).

(٩١٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٦٩،٤٢٤١،٦٧٤٩)، والحاكم (٥٦١/٣)، والبيهقي (الكبرى) (١٨/١٠)، وابن هشام (السيرة) (١٤/٣).

(٩١٦) انظر: (عيون الأثر) لابن سيد الناس (٧/٢).

بە کەم ئەندامەکانیانەوە. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموویێت: (عەمری کوڕی جەموح پیاوێکی شەلی قاچ خوار بوو، خاوەنی چوار شێرە کوڕ بوو کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە هەموو جەنگەکاندا بەشدار دەبوون، کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پێش ویستیان ڕێگە لە باوکیان بگرن وە پێیان وت: تۆ پاساوی بەشدار نەبوونت هەیە و خوای گەورە داوای بەشدار بوونت لێ ناکات.

ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: کوڕەکانم دەیانەوێت ڕێگەم لێ بگرن نەیەم بۆ ئەم جەنگە لەگەڵتدا، سوێند بە خوا من بە هیوام بەم قاچە شەلەمەوە بە ناو بەهەشتدا بڕۆم. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ((بەڵام تۆ جیهادت لەسەر نیە وە خاوەن (عُذر)یت)) وە بە کوڕەکانیشی فەرموو: ((پێویستە ئێوەش ڕێگری نەکەن بەڵکو خوا شەهیدی پێ ببەخشێت)) ئەوە بوو بەشدار بوو وە لەجەنگی ئوحودیشدا شەهید بوو)[٩١٧].

ئەم باسەش بە ڕیوایەتێکی تر لە جابرەوە ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (عەمری کوڕی جەموح قاچی شەل بوو، هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر من ئەمڕۆ بجەنگێم لە پێناوی خوادا تا دەکوژرێم (دەچمە بەهەشت) وە ئەم قاچەم ساغ دەبێتەوە و پێی بڕۆم لە ناو بەهەشتدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ)) عەمریش وتی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ناگەڕێمەوە بۆ لای خێزانەکەم تا نەچمە ناو بەهەشتەوە! عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرمووی: سوێندەکەت مەکە بەمەرج بەسەر خواوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مَهلًا يا عُمَرُ فإنَّ منهم مَن لو أقسَم على اللهِ لَأبَرَّه : منهم عمرُو بنُ الجَموحِ))[٩١٨] واتە: لەسەرخۆبە ئەی عومەر کەسانێك هەیە گەر سوێند دانێن لەسەر خوا، خوای گەورە سوێندەکەی ناشکێنێت بۆی دەهێنێتە دی لەوانەش عەمری کوڕی جەموحە).

بڕگەی (سوێند دانێت لەسەرخوا) ماناکە ئەوەیە: گەر سوێند لە خوا بخوات کە ئەبێت ئەو کارەی بۆ ئەنجام بدات ئەوە خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکات و سوێندەکەی ناشکێنێت.

---

(٩١٧) أخرجه: البيهقي (الكبير) (٢٤/٩)، وفي (الدلائل) (٢٤٦/٣)، وابن هيشام (السيرة) برقم (٦٣١).

(٩١٨) أخرجه: أحمد (٢٢٥٥٣) وقال محققه:إسناده حسن، وابن حبان (٧٠٢٤) وقال محققه: إسناده جيد، وحسنه الحافظ في (الفتح) (٢١٦/٣)، وقال الشيخ الألباني في تحقيق (فقه السيرة) (ص: ٢٨٢): إسناده صحيح.

وە جابر و باوکیشی پێش برکێیان بوو بۆ بەشداری کردن لە جەنگی ئوحوددا. جابر ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوللای باوکم پێی وتم: جابر بمێنەوە لە ناو شاردا لەگەڵ دانیشتووانی مەدینە، تا بزانیت جەنگەکەمان بەکوێ دەگات وە چۆن دەبێت، سوێند بەخوا گەر لەبەر ئەوە نەبێت ئەو کچانەم لەدوای خۆم بەجێ دەهێڵم ئەوە پێم خۆش بوو لە پێشمەوە بکوژرێیت)[٩١٩].

لەریوایەتێکی تردا جابر ﷺ دەفەرموێت: (کە جەنگی ئوحود هاتە پێش لەو شەوەی پێش جەنگەکەدا عەبدوللای باوکم بانگی کردم و پێی وتم: وا ئەزانم کە من یەکەم کوژراو دەبم لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وە هیچ کەسێك نیە لە دوای خۆم بەجێی بهێڵم خۆشەویستر بێت لام وەك تۆ جگە لە پێغەمبەر ﷺ وە من قەرزێکم لەسەرە بیدەرەوە بە خاوەنەکەی وە زۆر چاك ئاگات لە خۆشکەکانت بێت. جابر ﷺ دەڵێت: بەیانی یەکەم کوژرا و باوکم بوو)[٩٢٠].

بەم جۆرە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە پێشبرکێدا بوون بۆ بەشدار بوونیان لە جەنگی ئوحوددا بۆ دەرخستنی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەر ﷺ تەنانەت ئەوانەش کە گلەییان لە یەکتر هەبوو، وەك بەسەر هاتەکەی موعاذ ﷺ لەگەڵ (حەرام یاخود سەلیم) جابر ﷺ دەفەرمووێت: (موعاذ نوێژی عیشای لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە و پێش نوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد. (واتە: لە مزگەوتەکەی گەڕەکی بەنی خیطم) (شەوێکیان) (دواکەوت و نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد و پاشان گەڕایەوە بۆلای خزمەکانی و پێش نوێژی بۆ کردن، و سورەتی (البقرة)ی بۆ خوێندن) و (حەرام) هات بۆ مزگەوت تا نوێژەکەی بخوێنێت و پاشان بچێت دارخورماکانی ئاو بدات، کاتێ بینی موعاذ ﷺ نوێژەکەی درێژکردەوە هاتە دواوە و بەتەنها خۆی (نوێژەکەی خوێند و بەپەلە تەواوی کرد) و پاشان چووە دەرەوە و (ڕەشمەی وشترەکەی گرت و) (چوو بۆ ئاودانی دارخورماکانی).

موعاذیش نوێژەکەی تەواو کرد و باسەکەی حرامیان بۆ کرد و موعاذیش وتی: (ئەوە (موونافیق) و دووڕووە کە نوێژەکەی بەپەلە دەخوێنێت لە پێناوی ئاودانی

---

(٩١٩) أخرجه: أحمد (٣/٣٩٧) برقم (١٥٢٨١) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح.

(٩٢٠) أخرجه: البخاري (١٣٥١)، وأبو داود (٣٠٣٢)، والحاكم (٣/٢٠٣)،وابن حبان (٣١٨٤).

**دارخورماکانی) (دەبێت کارەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ بگێڕمەوە).**

**موعاذ هات و بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوە و (دواتریش) (حەڕام) هات بۆ لای پێغەمبەر و ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ موعاذ دێت بۆلای تۆ نوێژ دەکات (و زۆر خۆی لای تۆ دوا دەخات و دەمێنێتەوە) و پاشان دەگەڕێتەوە بۆلای ئێمە لە کاتی خەوتندا و ئێمە بەڕۆژ لە کارەکانماندا (ماندووین) و دێت و بانگمان دەکات بۆ نوێژ، و ئێمەش لەماڵەکانمان دەردەچین بۆلای ئەویش نوێژەکەمان بەسەرەوە درێژ دەکات [تۆ (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) شەوی ڕابردوو نوێژەکەت دواخست و موعاذ نوێژی لەگەڵ کردیت، پاشان گەڕایەوە وپێش نوێژی بۆ کردین] [من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ] (لەو کاتەدا) دەمویست زوو بچم تا دارخورماکانم ئاو بدەم، هاتمە مزگەوتەوە تا لەگەڵ ئەواندا نوێژ بکەم) (موعاذیش دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی (البقرة)) و [نوێژەکەی درێژ کردەوە] ومنیش هاتمە دواوە و نوێژەکەم خوێند [بەپەلە چووم بەلای ئاودانی دارخورماکانمەوە] (ئێمەش خاوەنی وشترە ئاوکێشەکانین و بەدەستەکانمان کار دەکەین ((لەگەڵ ئەوەشدا موعاذ بە من دەڵێت [منافق]…. بەڵام موعاذ بۆی دەردەکەوێت سبەینێ کە دوژمن هاتە پێش و هەموو دەبینین کە پێیان گەیشتین چۆن دەبێت إن شاء الله].**

**جابر ﷺ دەفەرموێت: لەوکاتەشدا هەواڵی نزیك بوونەوەی دوژمنانیان پێ گەیشتبوو، وە موسوڵمانان هەموو خۆیان ئامادەدەکرد بۆ ئوحود، وحڕامیش لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو (دواتر پێغەمبەر ﷺ بە موعاذی فەرموو: ((ما فَعَلَ خَصْمِي وَخَصْمُكَ)) واتە: چی کرد ئەوەی ناکۆکی و گلەیی لە هەردووکمان هەبوو؟ وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ سوێند بەخوا ئەو ڕاستی کرد و من درۆم کرد ئەو شەهید بوو)[٩٢١].**

**موسوڵمانان هەموو چەکیان لە خۆبەست، پێداویستی جەنگیان ئامادەکرد، پێغەمبەریش ﷺ چەکی لە خۆبەست و دوو قەڵغانی سەر سنگی بەست: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحودادا دوو (درع) واتە:**

(٩٢١) أخرجه: البخاري (٦١٠٦)، ومسلم (٤٦٥،١٧٨)، وأحمد ((١٤٣٠٧،٢٢٤٧) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، والنسائي في (الصغرى) (٢/ ١٠٢)، وفي (الكبرى) (١١٦٧٤)، وأبو داود (٧٩٠)، ابن خزيمة (١٦٣٤، ٥٢٠)، وابن حبان (٢٤٠٠٢،٢٤٠٩، والبيهقي (الدلائل) (٨٥/٣) وقد جمعنا الحديث من سياقاتها المختلفة.

قەڵغانی پاریزگاری کردنی سنگی لە خۆبەست بوو لە پێش و پاشەوە [واتە قەڵغانێك بۆ پاراستنی سنگ وقەڵغانێك بۆ پاراستنی پشت] )[٩٢٢]. وە لە گێڕانەوەی عروەدا دەفەرموێت: (پێغەمبەر دوو درعی بەستبوو)[٩٢٣].

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بەدەرچوونی سوپای موسوڵمانان و (هەموو دەرچوون بەسەر ناوچەی (البدائع)دا ڕۆیشتن و ژمارەیان هەزار کەس دەبوون، وە ژمارەی موشریکەکان سێ هەزار کەس دەبوون)[٩٢٤]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( فَهَلْ مِنْ رَجُلٍ يَدُلُّنَا الطَّرِيقَ عَلَى الْقَوْمِ مِنْ كَثَبٍ)) واتە: ئایا پیاوێك هەیە ڕێگەمان نیشان بدات بەسەر ئەو بەرزاییەدا بڕۆین تا دەگەینە لایان، هەندێك لە شارەزایانی ڕێگە لە پێشەوە دەڕۆیشتن و ئەو ڕێگەیە یان نیشاندا (کە بەسەر (ثنية الوداع) واتە: تەپۆڵکەکانی (الوادع) دا) دەڕۆیشت[٩٢٥].

## گێڕانەوەی هێزێکی جولەکەکان

موسوڵمانان کە لە مەدینە دەرچوون، هێزێکی جولەکەی پڕ چەکیان بینی کە هاتبوون بۆ کۆمەکیان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گێڕانیەوە چونکە موسوڵمان نەبوون.

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ جەنگی ئوحود، لە ناوچەی (ثنية الوداع) تێپەڕ بوو، ئاوڕی دایەوە تەماشای کرد هێزێکی پڕ چەك بە دوایاندا دێت فەرمووی: ((ئەوانە کێن؟)) وتیان: ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە لەگەڵ شەس سەد کەس لە جولەکە هاوپەیمانە کانی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئەوان موسوڵمان بوون؟)) وتیان نەخێر ئەوان لەسەر ئاینی خۆیانن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قُولُوا لهم فلْيَرجِعوا؛ فإنَّا لا نَستعينُ بالمُشرِكينَ على المُشرِكينَ)) واتە: پێیان بڵێن با بگەڕێنەوە ئێمە داوای یارمەتی لە موشریکین ناکەین دژ بە موشریکینی تر)[٩٢٦].

---

(٩٢٢) أخرجه: أبو داود (٢٥٩٠)،وابن ماجه (٢٨٠٦) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن أبي داود) (٢٢٥٧).

(٩٢٣) أخرجه: الحاكم (٢٥/٣).

(٩٢٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٨/٣).

(٩٢٥) أخرجه: عبد الرزاق في (المصنف) برقم (٩٧٣٥).

(٩٢٦) أخرجه: ابن أبي شيبة (١٢/ ٣٩٤)، وابن سعد (٣٧/٢)، والحاكم (١٢٢/٢)، والبيهقي (الكبرى) (٣٧/٩) برقم (١٨٣٧٩) وقال هذا إسناد أصحّ، والطحاوي في (مشكل الآثار) (٢٤١/٣)،وحسن إسناده كل ٌمن: الحافظ في (المطالب)

## پاشە کشێ کردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی (منافق) لەجەنگەگەدا

سوپای موسوڵمانان کاتیك گەیشتە ناوچەی (الشواط) یاخود (الشيخين)، ئالەوێدا عەبدوڵڵ کوڕی ئوبەی (منافق)، هانی خەڵکیدا بۆ گەڕانەوە و سێ سەد کەسی لە خزمەکانی خۆی گێرایەوە.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوت تا دابەزی لە نزیکی کێوی ئوحود، ئا لەوێدا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول سێ سەد کەسی لێ گێڕانەوە، و تەنها حەوت سەد کەس لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ مانەوە، و دوو کۆمەڵە موسوڵمانان، کە ئەمەیان بینی ناڕەحەتی کەوتە نێوانیان، ئەو دووانەش: بەنو حاریسە، بەنوسەلەمە بوون)[٩٢٧]، بەڵام خوای گەورە دڵی هەردوولایانی جێگیر و خۆڕاگر کرد، ڕیزی سوپای موسوڵمانانی زیاتر پتەوکرد.

زوهری ﷺ دەفەرموێت: کاتێك سوپای موسوڵمانان گەیشتە ناوچەی (الشواط) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی خۆی جیاکردەوە کە نزیکەی یەك لەسەر سێی سوپای موسوڵمانان بوو، پێغەمبەر و هاوەڵان کە ژمارەیان حەوسەد کەس بوو[٩٢٨].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ سەبارەت بەم باسە دەفەرموێت: (کاتێك سوپای موسوڵمانان گەیشتنە ناوچەی (الشواط)ی نێوان مەدینە و ئوحود، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی (ترسا) و پشتی موسوڵمانانی بەردا و یەك لەسەر سێی سوپاکەی گێڕایەوە وتی: گوێڕایەڵی ئەوان دەکات و سەر پێچی من دەکات، ئەی خەڵکینە ئێمە ئالێرەدا لەسەر چی خۆمان بەکوشت بدەین، بەم جۆرە دووڕوو گومان لە دڵەکانی خزمانی خۆی دوای کەوتن و گەڕانەوە و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حرام دوایان کەوت وپێی وتن: ئەی خەڵکینە لەبەر خوا پشتی خزمەکان و پێغەمبەرەکەتان بەرمەدەن لەڕووی دوژمن دا؟ ئەوانیش وتیان: گەربمان زانیایە تووشی شەڕ دێن، ئاوا ئێوەمان بەدەستەوە نەئەدا، ئێمە باوەڕمان وانیە کە شەڕ ڕووبدات.

---

(٤٣١٩)،والبوصيري في (الاتحاف) (٦٢٤٩)، وحسنه ايضاً الشيخ الألباني في (الصحيحة) (١١٠١)، و (صحيح الجامع) (٢٢٩٢).

(٩٢٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٠٨/٣)، وعبد الرزاق (المصنف) (٩٧٣٥).

(٩٢٨) أنظر: (تأريخ الاسلام) للذهبي (ص:١٦٦).

عەبدوللای کوڕی عەمر چەند ئامۆژگاری کردن، بەڵام ئەوان هەر سەرپێچیان کرد و ڕۆیشتن، عەبدوللاش پێی وتن: ئەو لاترچن وخوا دوورتان خاتەوە ئەی دوژمنانی خوا، خوای گەورە جێگەی ئێوە پڕ دەکاتەوە بۆ پێغەمبەرەکەی و پێویستی بە ئێوە نابێت)[٩٢٩].

ئەم بەسەرهاتە هەرچەندە (إسناد)ەکانی (مرسل) و (ضعيف) بن بەڵام بەسەرهاتەکە ڕاستەقینەیە، وەك خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە دەفەرموێت: ﴿ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ﴾(آل عمران) وەلە فەرمودەکەی زەیدی کوڕی ثابت ﷺدا هاتووەکە دەفەرموێت: ((کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەرە و غەزای ئوحود ڕۆیشت، هەندێك لەوانەی کەلەگەڵی دەرچوو بوون گەڕانەوە))[٩٣٠].

وەلە فەرمودەکەی جابردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە ﴿ إِذْ هَمَّت طَائِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ (آل عمران) سەبارەت بە ئێمە دابەزی، بەنو سەلەمە و بەنو حارثە، وە پێشم خۆشە کە دابەزیوە چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا ﴾واتە: خوا پشتیوانی هەردوولایانە)[٩٣١].

بەم جۆرە خوای گەورە ڕیزی سوپای موسوڵمانانی لەو چەپەڵانە پاك کردەوە وە موسوڵمانانی زیاتر بەهێز وورە بەرزترکرد، چونکە ئەو دووڕووانە گەر بەشدار بوونایە لەو جەنگەدا تەنها بۆ پشێوی نانەوە و پشتگیری کردنی دوژمن دەهاتن.

## ڕێکخستنی سوپای موسوڵمانان

لەبەرە بەیانی ڕۆژی شەممەی ناوەڕاستی مانگی شەوالی ساڵی سێی کۆچیدا، سوپای موسوڵمانان گەیشتنە بەرزای شاخی ئوحود[٩٣٢].

---

(٩٢٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١١/٣) برقم (٥٨٨)، وحسن مرسل كما قال صاحب (صحيح السيرة) (٢٠٤/١)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة) (ص: ٢٧٠): حديث صحيح له شواهد كثيرة.

(٩٣٠) أخرجه: البخاري (٤٠٥٠)، ومسلم (٢٧٧٦).

(٩٣١) أخرجه: البخاري (٤٠٥١)، ومسلم (٢٥٠٥)

(٩٣٢) انظر:(الدلائل) للبيهقي (٢٠١/٣)، و (المجمع)للهيثمي (١٢٤/٦)،و (السيرة الصحيحة) للعمري (٣٧٨/٢).

لەو ڕۆژەدا بەیداخێکی ڕەش هەڵکرا لەگەڵ سێ ئاڵادا، ئاڵای موهاجرین بەدەستی موصعەبی کوڕی عومەیرەوە بوو، یاخود عاصم، ئاڵای ئەوس بەدەستی ئوسەیدی کوڕی حوضەیریەوە بوو، ئاڵای خەزرەج بەدەستی حوبابی کوڕی منزیرەوە بوو، سەعیدی کوڕی موسەیب ﷺ دەفەرموێت: (بەیداخەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحودادا پارچە پۆشاکێکی ڕەشی خاتوو عائیشە بوو، وە بەیداخەکەی ئەنصار پێی دەوترا (العقاب)، فەرماندەی قۆڵی دەستە ڕاست عەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ بوو، فەرماندەی دەستە چەپ مونزیری کوڕی عەمری کوڕی ساعیدی ﷺ بوو، فەرماندەی پیادەڕەوەکان زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ بوو یاخود میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ بوو، فەرماندەی ناوەڕاستی سوپاکە حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب ﷺ بوو، ئاڵا سەرەکیەکەش بەدەستی موصعەبە ﷺ وە بوو)[٩٣٣].

لەو ڕۆژەدا (هێما و نهێنی یەکتر ناسینەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ (أمت أمت) بوو واتە: بکوژە بکوژە) بوو [٩٣٤].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان لەخوارووی چیای ئوحود ڕیزبوون، وە موشریکەکانیش لە (السبخة) واتە: زەویە خوێیاویەکەی بەرامبەر بە چیای ئوحود وەستان، و هەردوو لاخۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕەکە)[٩٣٥].

## ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بۆ تیرهاوێژەکان

پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە سوپاکەی ڕێکخست، پەنجا تیرهاوێژی زۆر چالاکی لە سوپاکەی هەڵبژارد، فەرمانی پێ کردن لەسەر تەپۆلکەی (عینین) یاخود تەپۆلکەی تیرهاوێژەکان بەرزایەکەی پانزە مەتر بوو وە سەد و پەنجا مەتر دوور بوون لەسوپای موسوڵمانانەوە، فەرمانی پێ کردن کە لەوێ جێگیربن و بەهیچ جۆرێك نەیەنە خوارەوە تا فەرمانیان پێ دەکات.

---

(٩٣٣) انظر: (التاريخ) لخليفة بن خياط (ص:٦٧)، و(تاريخ الاسلام) للذهبي (ص:١٧٠)، وقال العمري في (السيرة الصحيحة) (٣٨١/٢): إسناده حسن مرسل.

(٩٣٤) أخرجه: أحمد (٤٦/٤)، وأبو داود (٢٥٩٦)،والنسائي (الكبرى) (٨٦٦٥)، وابن ماجه (٢٨٤٠) (١٠٧/٢)، وصححه ووافقه الذهبي، وابن هشام (السيرة) (١٧/٣)،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٢٦١).

(٩٣٥) انظر: (دلائل النبوة) (٢٠٩/٣)، و(السنن الكبرى) (٣٥٦٣) للبيهقي.

**گرنگی تیرهاوێژەکان لە سێ خاڵ دابوو:**

- دەست بەسەراگرتنی ئەو جێگەیە و زاڵ بوون بەسەر هەموو قۆڵەکانی شەڕەکەدا.
- پاراستنی سوپای موسوڵمانان لە پشتەوە.
- بەرەنگار بوونەوەی هێرشی دوو سەد ئەسپ سوارەکەی مەککە کە ڕۆڵیان وەك (زرێ پۆش)ی ئێستاوا بوو لە شەڕەکەدا[936].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ ئەو ئامۆژگاریەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری کردە فەرماندەی تیرهاوێژەکان کە ژمارەیان پەنجا کەس بوو، وە عەبدوڵلا پۆشاکی سپی لەبەر دابوو، وە بەوە لە ناویاندا دەناسرایەوە.

پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری عەبدوڵلای کرد و فەرمووی: (([هێرشی] ئەسپ سوارەکانی قوڕەیشمان لێ دوور بخەرەوە بەتیر، تا لەدواوە پەلامارمان نەدەن، گەر لە جەنگە کەدا سەرکەوتین یان سەرنەکەوتین تۆ لە جێی خۆت بمێنەرەوە تا لەوێوە پەلامارنەدرێین))[٩٣٧].

پاشان پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری تیرهاوێژەکانی کرد، موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ) پەنجا کەسی تیرهاوێژی هەڵبژارد و لە ڕووی ئەسپ سوارەکانی قوڕەیشدا دانان، عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری کردە فەرماندەیان، پاشان ئامۆژگاری تیرهاوێژەکانی کرد و فەرمووی: ((ئەی تیرهاوێژەکان گەر ئێمە شوێن پێی خۆمان لە شەڕەکەدا قایم کرد، بینیتان ئەسپ سوارەکانی موشریکین کەوتنە جووڵە و دوژمنانی خوا شکان و ڕایان کرد ئێوە جێگەی خۆتان جێ مەهێڵن، من داواتان لێ دەکەم کە هیچ پیاوێك لە ئێوە جێگەی خۆی چۆڵ نەکات و (هێرشی) ئەسپ سوارەکانمان لێ دوور بخەنەوە))[٩٣٨].

هەروەها ئامۆژگاری کردن بەشداری سوپاکە نەکەن لە کۆکردنەوەی

---

(٩٣٦) انظر: (غزوة أحد دراسة دعوية) (ص:٩٠).

(٩٣٧) أخرجه: ابن هيشام (السيرة) برقم (٥٨٩)، والبيهقي (الدلائل) ((٢٢٧/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٠٦/٢).

(٩٣٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل (٢٠٩/٣).

دەستکەوتەکانیشدا، ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تیرهاوێژەکانی لەوێدا جێگیرکرد و پاشان پێی فەرموون: (احموا ظُهورَنا فإنْ رأيتمونا نُقتلُ فلا تنصُرونا وإنْ رأيتُمونا قد غَنِمْنا فلا تَشْرَكونا)) واتە: دوای سوپاکەمان بپارێزن، گەر ئێمەتان بینی دەکوژراین سەرمان مەخەن، وە گەر ئێمەتان بینی دەسکەوتمان لێ گرتن بەشداریمان مەکەن)[٩٣٩].

هەروەها ئامۆژگاری کردن جێگەکانی خۆیان چۆڵنەکەن گەر موسوڵمانانیش شکان لە شەڕەکەدا. بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردن و پێی فەرموون: (جێگەکان چۆڵ مەکەن گەر سەرکەوتین بەسەریاندا، یان ئەوانتان بینی سەرکەوتن بەسەرماندا (مەیەن بۆ لامان) و کۆمەکیمان مەکەن)[٩٤٠].

وە ئاگاداری کردنەوە، کە نابێت ئەو جێگەیە چۆڵ بکەن تا خۆی نێراو دەنێرێتەلاتان، (پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: (( إنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ فلا تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ، هذا حتَّى أُرْسِلَ إلَيْكُمْ، وإنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا القَوْمَ وأَوْطَأْنَاهُمْ، فلا تَبْرَحُوا حتَّى أُرْسِلَ إلَيْكُمْ))[٩٤١] واتە: گەر ئێمەتان بینی باڵندە دەیفڕاندین ئێوە جێگەی خۆتان چۆڵ مەکەن تا نێراو دەنێرمە لاتان، وە گەر ئێمە تان بینی ئەوانمان شکاند و بەدوایان کەوتین ئێوە جێگەی خۆتان چۆڵ مەکەن تا نێراو دەنێرمە لاتان).

## پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانان هان دەدات بۆ بەرنگاربوونەوەی موشریکەکان

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕیزی سوپای موسوڵمانانی ڕێکخست و هەرە موسوڵمانە قارەمانە ئازاکانی لە پێشەوەی سوپاکە دانا و پێی ڕاگەیاندن هیچ کەسێك هیچ کارێك لەخۆیەوە ئەنجام نەدات تا فەرمانی پێغەمبەر ﷺ پێی دەگات. پاشان بە مەبەستی بەرزکردنەوەی وەرەی موسوڵمانان و زیاتر خۆڕاگریان پێغەمبەر ﷺ شمشێرەکەی خۆی بەرزکردەوە و فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێت و مافی

---

(٩٣٩) أخرجه: أحمد (المسند) (٢٦٠٩) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٠٧٣١)، والحاكم (٢/٢٩٦) وصححه ووافقه الذهبي.

(٩٤٠) أخرجه: ابن حبان (٤٧٣٨) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري.

(٩٤١) أخرجه: أحمد (٤/٢٩٣)، والبخاري (٣٠٣٩)، وأبو داود(٢٦٦٢).

خۆی دەداتێ، تا ئەبودوجانە وەری گرت و زیاتر ورەی موسوڵمانانی بەرزکردەوە، ئەم بەسەر هاتەش لەم سێ ڕێوایەتەدا هاتووە:

**١- ئەنەس ﷺ دەفەرموێت:** ((پێغەمبەر ﷺ شمشێرێکی (بەرزکردەوە) و فەرمووی: ((کێ ئەم (شمشێرەم) لێ وەردەگرێت))؟ هەموویان دەستیان بۆ درێژکرد و هەر یەکەیان دەیوت: من من (تا هەندێکیان لێ یان گرت و تەماشایان دەکرد) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی کێ وەری دەگرێت و حەقی بۆ دەستێنێت))؟ ئینجا هەموو چوونە دواوە، ئەبو دوجانە (سماکی کوڕی خەرشە) وتی: من وەری دەگرم و بەحەقی خۆی دەگەیەنم. پاشان وەری گرت و پێشە سەری موشریکەکانی پێ شکاند و [ڕاستگۆیانە لە ڕووی دوژمندا پیێ جەنگا و بەحەقی خۆی گەیاند])[٩٤٢].

**٢- زوبەیری کوڕی عوام ﷺ دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحودادا شمشێرێکی نمایش کرد و پیشانی موسوڵمانانیدا وفەرمووی: ((مَن يأخذُ هذا السيفَ بحقِّه)) واتە: کێ ئەم شمشێرە وەدەگرێت و حەقی خۆی دەداتێ؟ [عومەر] هەستاو وتی: من وەری دەگرم ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، و پاشان وتەکەی دوو بارەکردەوە، و منیش وتم: من وەری دەگرم ئەی پێغەمبەری خوا؟ بەڵام ڕووی لە منیش وەرگێڕا)، پاشان وتەکەی سێ بارەکردەوە. ئەبو دوجانە (سەماکی کوڕی خەرشە) هەستا و وتی: من بەحەقی خۆی وەری دەگرم، بەڵام حەقی خۆی چی یە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پیێ فەرموو: ((ألاّ تَقْتُل بِهِ مُسلِماً وَلا تَفِرُّ بِهِ عَنْ كافرٍ)) لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((أن تضربَ بهِ في العدوِّ حتى ينحني)). واتە: حەقی ئەوەیە موسوڵمانی پێ نەکوژێت و لە ڕووی کافریشدا ڕانەکەیت [وە لە دوژمن بدەیت تا دەچەمێتەوە].

پاشان پێغەمبەر ﷺ شمشێرەکەی دایە دەست ئەبو دوجانە ﷺ [ئەویش پیاوێکی ئازا بوو و فیزی دەنواند لەکاتی جەنگدا] و ئەگەر ویستی شەڕ کردنی بووایە خۆی نیشانە دەکرد و [پارچە قوماشێکی سووری بەناوچەوانەوە دەبەست و خەڵکی ئەوەیان بەرچاو بکەوتایە دەیانزانی کە (بەڕاستی) شەڕ دەکات])[٩٤٣].

---

(٩٤٢) أخرجه:مسلم (٢٤٧٠)، وابن أبي شيبة (٣٦٧٧٢)، وأحمد (١٢٢٣٥) وقال محققه:إسناده صحيح على شرط مسلم، وابن سعد (٥٥٦//٣)، وعبد بن حميد (١٣٢٧)، وموسى بن عقبة: كما في (الدلائل) للبيهقي (٢١٥/٣)، و(سنن الكبرى) (١٣٥٦٣).

(٩٤٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٩/١٩))، والحاكم (٣/ ٢٣٠) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٧٨٧،٩٧٩)،والبيهقي

**٣-ئیبنو ئیسحاق** ﷺ **دەفەرموێت:** (ئەبو دوجانە شمشێرەکەی وەرگرت لە دەستی پێغەمبەر ﷺ ئینجا پارچەکەی دەرکرد و بە نەوچەوانیەوە بەست، پاشان بە فیزەوە دەڕۆیشت لە بەردەم ڕیزی پێشەوەی موسوڵمانان وە لەپێش چاوی موشریکەکاندا. پێغەمبەر ﷺ ئەبو دوجانەی بینی کە بەفیزەوە دەڕوات فەرمووی: ((إِنَّها لَمَشيَة يُبْغِضُها اللهَ إلاّ في مِثلِ هَذا المَوطِنِ))[944] واتە: ئەوە جۆرە ڕۆیشتنێکە خوای گەورە خاوەنەکەی دەبوغزێنێت مەگەر لە جێگەیەکی وا دانەبێت)).

ئا لەو جێگەیەدا هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ داوای سەرکەتن و شەهیدی و شکۆمەندیان لە خوای گەورە کرد، ئەمەش بووە هۆیەکەی تر بۆ بەرزکردنەوەی وورەی موسوڵمانان.

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوڵلای کوڕی جەحش لە ڕۆژی ئوحوددا پێی وتم: وەرە با داوا لە خوا بکەین. هەر دووکمان چووینە ئەو لاوە و من سەرەتا دوعام کرد وتم: خوایە گیان گەر بە دوژمن گەیشتم، ڕووبەڕووی پیاوێکی زۆر ئازای پڕچەکەم بکەرەوە تا لە پێناوی تۆدا بەشەڕ بێم لەگەڵیدا، پاشان سەرم بخە بەسەریدا تا بیکوژم و کەل و پەلەکانی ببێتە دەسکەوتم.

پاشان عەبدوڵلای کوڕی جەحشیش ﷺ وتی: ئامین، ئینجا ئەو دوعای کرد وتی: خوایە ڕووبەڕووی پیاوێکی زۆر ئازای پڕچەکم بکەرەوە تا لەپێناوی تۆدا بەشەڕ بێم لەگەڵیدا و پاشان بمکوژێت و گوێچکە و لوتم ببڕیت تا سبەینێ پێت بگەم و پێم بڵێیت: کێ لوت و گوێچکەی بڕیت؟ منش بڵێم: لە پێناوی تۆدا و پاشان لە پێناوی پێغەمبەرەکەتدا تۆش بڵێیت: ڕاستت کرد. سەعد ﷺ وتی: بەڕاستی دوعاکەی ئەو لە دوعاکەی من باشتر بوو و (بۆ ئەو ئێوارەیە هاتە دی)[945].

---

(الدلائل) (٢١٥/٣، ٢٣٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (٦/ ١٠٩) رواه البزار ورجاله ثقات،وانظر: (السيرة) لابن هشام برقم (٥٩٣) واللفظ للحاكم والزيادة لابن هشام وموسى بن عقبة.

(٩٤٤) انظر: (السيرة) لابن هشام (١٦/٣) برقم (٥٩٤).

(٩٤٥) أخرجه: الطبراني (٩/٧)، والحاكم (٧٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وأبو نعيم (الحلية) (١٩٠/١)، والبيهقي (الكبرى) (٣٠٧/٦)، وفي (الدلائل) (٢٥٠/٣)، وابن سعد (٦٣/٣)، وقال الحافظ العراقي في تخريج (الاحياء) (٣٢١/٤): إسناده جيّد، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٤٨/٦): أخرجه الحاكم والبيهقي بإسناد صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (٣٠١/٩) (١٥٦٥٢): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح. واللفظ للحاكم والطبراني.

لەوکاتەدا عومەر و زەیدی برای ﷺ پێش برکێیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد بۆ بەدەست هێنانی پلەی شەهیدی. عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت: (عومەر لە ڕۆژی ئوحوددا بەزەیدی برای وت: برام ئەو قەڵغانی سەر سنگم بگرە با بەتۆ بێت؟ زەیدیش وتی: تۆ چۆن شەهیدیت دەوێت منیش ئاوها شەهیدیم دەوێت، ئیتر هەردووکیان بەجێیان هێشت)[٩٤٦].

## خۆگەیاندنە ڕیزی موسوڵمانان

لەو ڕۆژەدا هەندێك پیاوی بەتەمەن، یاخود جولەکەی پەیمان ڕاست خۆیان گەیاندە ڕیزی سوپای موسوڵمانان، لەوانە (باوکی حذیفەی، ثابتی کوڕی وەقش).

مەحمودی کوڕی لوبەید ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لەگەڵ موسوڵمانان بۆ جەنگی ئوحود، ثابتی کوڕی وەقش و یەمانی کوڕی جابر لەگەڵ ژن منداڵەکانیان لەقەڵاکاند دانرا بوون، وهەر دووکیان زۆر بە تەمەن بوون، یەکێکیان بەوی تریانی وت: باشە ئیمە چاوەڕێی چی دەکەین سوێند بەخوا هەریەکە لە ئێمە تەمەنێکی زۆر کەمی ماوە [لەم ڕۆ و سبەینێداین]، ئەوە بۆ شمشێرەکانمان هەڵنەگرین، و پاشان خۆمان بگیەنینە پێغەمبەر ﷺ [بەڵکو خوای گەورە شەهیدیمان پێ ببەخشێت لەگەڵ پیغەمبەر ﷺدا ئەوە بوو هەردووکیان شمشێرەکانیان هەڵگرت، پاشان چوون تا خۆیان گەیاندە ڕیزی موسوڵمانان بێ ئەوەی سوپای موسوڵمانان لێیان بە ئاگابن)[٩٤٧].

هەر لەو ڕۆژەدا ئوصەیرمی کوڕی ثابتی کوڕی وەقش کە ئەو باوەڕە پتەوەی لە باوکە بەتەمەنەکەیدا دی، موسوڵمان بوو وە ئەویش خۆی گەیاندە ڕیزی سوپای موسوڵمانان: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەفەرموێت: (ئوصەیرم کەناوی عەمری کوڕی ثابتی کوڕی وەقش بوو) پێشتر ڕەخنەی لە موسوڵمان بوونی خزمەکانی دەگرت و [هەندی پارەی سوی لە نەفامیدا هەبووە ئەوە ڕێگر بوو لە موسوڵمان بوونی، دەی ویست

(٩٤٦) أخرجه: الطبراني (الأوسط) (٥/٤)، وابن سعد (٢٧٥/٣)، وابو نعيم (الحلية) (٣٦٧/١)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٩٨/٥): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(٩٤٧) أخرجه:ابن هشام (الشيرة) برقم (٦٢٥)، والحاكم (٢٠٢/٣) وقال: صحيح على شرط مسلم = وقال محقق (المستدرك) (٤٩٦١): إسناده صحيح متصل والطبراني (التأريخ) (٥١٠/٢).

پارەکانی وەرگرێتەوە، پاشان موسوڵمان ببێت]، بەڵام کە ئەو ڕۆژە هاتە پێش پێغەمبەر ﷺ تیایدا چوو بۆ جەنگی ئوحود، ئالەو ڕۆژەدا ئیسلام چووە دڵیەوە و موسوڵمان بوو [وە چوو پرسیاری کرد: ئاموزاکانم لەکوێن؟ وتیان: لە ئوحودن، وتی: ئەی [سەعدی کوڕی موعاذ] لەکوێیە؟ وتیان: لە ئوحودە] [ئەویش قەڵغانی سنگی لەبەر کرد و شمشێرەکەی و ڕمەکەی هەڵگرت] [سواری پشتی ئەسپەکەی بوو] پاشان چوو بۆ ئوحود و بەخێرایی خۆی خستە ناو ڕیزەکانی موسوڵمانانەوە [وکاتێك موسوڵمانان ئەو یان بینی پێیان وت: عەمر دوور کەوەرەوە لێمان؟ ئەویش وتی: من موسوڵمان بووم.....)[٩٤٨].

وە موخەیریق جولەکەیەکی سەر ڕاست بوو لەو پەیمانەی کە لەگەڵ موسوڵمانان بەستبووی کە پارێزگاری لەشارەکە بکات: ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: موخەیریق یەکێك بوو لە جولەکەکانی بەنی ثەعلەبە، کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پیش بە جولەکەکانی خزمی خۆی وت: ئەی کۆمەڵی جولەکە وەڵاهی دەزانن کە پێویستە لە سەرتان (ئەمڕۆ) محمد سەر بخەن؟ ئەوانیش وتیان ئەمڕۆ ڕۆژی شەممە یە (واتە: ڕۆژی پشووە) ئەویش وتی: هەرگیز شەممەو پشووتان نەبێت، پاشان شمشێر وکەل وپەلەکەی هەڵگرت وتی: گەر کوژرام سامانەکەم هی محمدە چی لێ دەکات ئارەزووی خۆیەتی، ئەو بەرەبەیانیە خۆی گەیاندە سوپای موسوڵمانان و پێغەمبەر ﷺ و پشتیوانی لێ کردن تا کوژرا)[٩٤٩].

## خۆئامادەکردنی موشریکەکان بۆ جەنگەکە

موشریکەکانیش خۆیان ئامادەکرد و بەڕێز وەستان، و سەد ئەسپ سواریان بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید لە قۆڵی دەستە ڕاستی سوپاکەیان ڕاگرت، وە سەد ئەسپ سواری تریش بەسەرکردایەتی عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل لە قۆڵی

(٩٤٨) أخرجه: أحمد (٢٣٦٣٤) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، والطبراني (الكبير) (٣٧/١٧)، وابو داود (٢٥٣٧)، والحاكم (١١٣/٢)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١٦٧/٩) والدينوري (المجالسة) (٢٤٢٤) وقال محققه: سنده حسن، والحديث حسنه أيضاً كل من: الحافظ في (الأصابة) برقم (٥٧٥٨)، و الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٢١٢)، والشيخ المقبل في (صحيح المسند) (١٤٠٧).

(٩٤٩) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤٤/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٣١/٢)، وابن سعد (الطبقات) (٣٨٩/١)،وأبو نعيم (الدلائل) (٧٨/١) وابن كثير (البداية) (٤١/٤).

دەستە چەپی سوپاکەیانەوە ڕاگرت، صەفوانی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەلەفیش بووە سەرکردەی هێزە پیادەکانی پێشەوە وە سەرکردایەتی سەرجەم سوپاکەش بە دەست ئەبو سوفیان بوو، وە ئاڵاکەشیان بە دەستی طەلحەی کوڕی عوسمان بوو لە کوڕانی بەنی عەبدول دار.

ئەبو سوفیان ئاموژگاری ئاڵا هەڵگرەکەی کردوو هانیدا بۆ شەڕەکە. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو سوفیان بە هەڵگرانی ئاڵاکەی لە کوڕانی عەبدولدار) وت وەك هاندانیك بۆیان، ئەی کوڕانی عەبدول دار، ئیوە بە ئاڵاکەوە ڕاتان کرد لە شەڕی بەدر وبینیتان چیمان لێهات، و خەڵکی بەهۆی ئاڵاکەیانەوە تووشی تەنگەشەدێن، گەر نەمێنێت ئەوانیش نامێنن، یا ئەوە تا ئاڵاکەمان بۆ دەبپارێزن، یا ئەوە تا بیدەنە دەست خۆمان تا بۆتانی دەپارێزین. ئاڵا هەڵگرەکانیش (تورە بوون) وهەرەشەیان لێ کرد وپێیان وت: ئێمە ئاڵاکەمان بدەینە تۆ، کە شەڕ دەستی پێکرد و پێیان گەیشتین ئەوجا دەزانی چۆن دەبین)[٩٥٠].

لە ڕیوایەتێکی تردا موسای کوڕی عوقبە ﷺ لە ئیمامی زوهریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (خاوەن هەڵگری ئاڵای قورەیش طەڵحەی کوڕی عوسمان کەمێك ناساغ بوو وە ئەوان لە بەنو عەبدولدار) بوون کەخاوەنی (پەردەپۆشی کەعبە، و بەڕێوەبردنی دانیشتنەکان، و ئاڵا هەڵگری) قوڕەیش بوون، ئەبو سوفیان پێی وتن: ئاڵاکەتان تیاچوو لەشەڕی بەدردا تا ئەو هەمووە بە چواردەوریەوە کوژران، وا بە چاك دەزانم ئاڵایەکی تر هەڵبکەم، بەنو عەبدول دار و (الاحلاف) وتیان: گەر دەتانەوێت ئاڵایەکی تر بەرز کەنەوە، بەڵام دەبێت تەنها بەدەستی یەکێك لە بنو عەبدولدار بەرز بکرێتەوە. ئەو کاتە ئەبو سوفیان پێی وتن: نا بەڵام خۆڕاگربن بە ئاڵاکەتانەوە)[٩٥١].

هەروەها قوریش داوایان لە ئەبو عامری ڕاهیب کرد کە سەرکردە و ناوداری پێشووی مەدینە بوو، کە هەوڵبدات تا دووبەرەکایەتی دروست بکات لە ڕیزی سوپای موسوڵمانان دا.

---

(٩٥٠) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٦/٣)وليس له سندٌ يعرفُ به.

(٩٥١) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٠٩/٣)من مراسيل الزهري، وقال البيهقي أيضا في (السنن الكبرى) (١٤٧/٧)برقم (١٣٥٦٣): هكذا ذكره موسى بن عقبة عن الزهري، وكذلك ذكره محمد ابن اسحاق عن شيوخه وان كان منقطعاً و كتبناهُ موصولاً بإسنادٍ حسنٍ.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو عامر کە ناوی عەبد عەمروی کوڕی صەیفی) بوو، یەکێك بوو لە ناودارەکانی مەدینە، و بەهاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو شارە، ئەبو عامر بە خۆی و پەنجا یاخود پانزە گەنجەوە لە هۆزی ئەوس چوون و خۆیان گەیاندە مەککە، و ئەو بە قورەیشی ڕاگەیاندبوو کە هەرکات بە خزمەکانی خۆی ئەوس بگات هەموو گوێ ڕایەڵی دەکەن وە هیچ یەکێکیان سەرپێچی ناکەن.

بۆیە لەم شەڕەدا کە هەردوولا ڕووبەڕووی یەك وەستان، ئەبو عامر لەڕیزی هاوپەیمانەکانی قورەیش هاتە دەرەوە و بانگی لێ کردن وتی: ئەی کۆمەڵی ئەوس من ئەبو عامرم، ئەوسیش وەڵامیان دایەوە وتیان: ئەی فاسق هەرگیز خۆشی بەچاوی خۆت نەبینی. [ئەبو عامر لە جاهلیەتدا نازناوی (الراهیب)ی هەبوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نازناوی (الفاسق)ی لێ نابوو] کە ئەبو عامر وەڵامی ئەوانی گوێ لێ بوو وتی: بەڕاستی خزمەکانم لە دوای من تێکچوون و شێت بوون)[٩٥٢].

## دەست پێ کردنی جەنگەکە و سەرکەوتنی موسوڵمانان

لەدوو ڕیوایەتی (ضعیف)دا هاتووە کە شەڕەکە سەرەتا بە شەڕە شمشێر لە نێوان ئاڵا هەڵگرەکانی قورەیش و ئاڵا هەڵگرەکانی موهاجرین لە موسوڵمانان دەستی پێ کردووە:

**١- موسای کوڕی عوقبە ﷺ لە ئیمامی زوهری یەوە ﷺ دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت:**

(طەلحەی کوڕی عوثمان ئاڵا هەڵگری موشریکەکان بوو، وە ئاڵا هەڵگرەکەی موهاجرین (عاصم) بوو کە دەیوت: من پارێزەرم بۆ ئەوانەی کە لەگەڵمدان (إن شاء الله) طەلحەی کوڕی عوثمان پێی وت: دەتوانیت لەگەڵمدا بجەنگێیت؟ وتی: بەڵێ و عاصمیش دەست پێشخەری کرد و بەشمشێرەکەی دای بەسەریداو کوشتی بە کوشتنی ئەم ئاڵا هەڵگرەی قورەیش خەوەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتنەدی کە لە خەوەکەیدا بینیبووی بەرانێك بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت)[٩٥٣].

(٩٥٢) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٦/٣)، والطبري (التاريخ) (٥١٢/٢)، وقال صاحب (صحيح السيرة) برقم (٣٣٦): سنده حسن والحديث مرسل.

(٩٥٣) أخرجه البيهقي (الدلائل) (٢١٠/٣)، وفي (السنن الكبرى) (١٣٥٦٣)،والذهبي في (تأريخ الأسلام) قسم المغازي (ص:

**٢- ابن هشام دەفەرموێت:** (ئیمامی عەلی ﷺ بە [ئاڵاکەوە] چووە پێش و وتی: من پشت شکێنم. ئەبو سەعدی کوڕی ئەبو طەلحە کە ئاڵا هەڵگری قورەیش بوو وتی: بۆ نایەیتە مەیدانەوە تا بەشەڕ بێین. هەر دوولایان بەشەڕ هاتن و ئیمامی عەلی ﷺ دای بەزەویدا و کوشتی.

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەڵێت: ئەبو طەلحە لە نێوان هەردوو سوپاکەدا هاتە مەیدانی نێوانیان و بانگی کرد. من پشت شکێنم کێ دێتە دەرەوە بۆم؟ چەند جار ئەمەی دووبارە کردەوەو کەس لە موسوڵمانان نەچووە دەرەوە پاشان وتی: ئەی هاوەڵانی محمد ئێوە ئەڵێن کوژراوەکانتان لە بەهەشتدایە، و کوژراوەکانی ئێمەش لە دۆزەخدایە، درۆ دەکەن گەر ئەوە بەڕاست بزانن یەکێکتان دەهاتە دەرەوە بۆم. ئینجا عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ بۆی ڕۆیشت و بەشەڕهات لەگەڵیدا و کوشتی)[٩٥٤].

دوای کوشتنی طەلحە ئاڵا هەڵگری قورەیش نازناوی (كبش الكتيبة)ی لێ نرا بوو. واتە: بەرانی جەنگاوەرەکانی قورەیش، لە دوای ئەو پێنج کەسی تر لەبراکانی هەڵیان گرت یەك لە دوای یەك کوژران، لە دوای ئەوانیش پانزە کەس لە کوڕانی بەنی عەبدول دار هەڵیان گرت و یەك لە دوای یەك کوژران، لە کۆتاییاندا کۆیلەیەکیان هەڵی گرت کە ناوی (الصوأب) لەدوایدا ئەویش کوژرا، و پاشان ئاڵاکەیان کەوتە سەر زەوی و کەسیان نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە.

زوبێری کوڕی عوام ﷺ دەفەرموێت: (([ئاڵا هەڵگرەکانی قورەیش یەك لە دوای یەك کوژران تا کۆیلەیەکیان هەڵی گرت کە ناوی (الصوأب) بوو لەدوایدا ئەویش کوژرا] و هەموویانمان کوشت و ئاڵاکەیان کەوتە سەر زەوی و هیچ کەسێکیان نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە [تا ئافرەتێکیان کە ناوی عەمرەی کچی عەلقەمە بوو) بەرزی کردەوە (وبرديەوە) ولێی کۆبوونەوە])[٩٥٥].

پاشان هێرشی موشریکەکان دەستی پێ کرد بۆ سەر موسوڵمانەکان لە قوڵی

---

١٧٨).

(٩٥٤) أخرجه:ابن هشام (السيرة) (٢٢/٣)برقم (٦٠٠)، والطبري (التفسير) (٢٨١/٧)، وقال العمري في(السيرة الصحيحة) (٣٨٤) سنده صحيح مرسل من مراسيل السدي.

(٩٥٥) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٨/٣)، والحاكم (٢٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، اسحاق بن راهويه بسند صحيح كما في (المطالب العالية) (٤٣١٣) و(فتح الباري) (٤٥٧/٧)، وفي (اتحاف الخيرة المهرة) للبوصيري (٦٢٤٢)، وحسنه الارناؤوط في تخريج (الزاد) (١٩٧/٣).

(دەستەڕاست و دەستە چەپ و ناوجەرگەوە) و لە دوایشیانەوە ئافرەتەکانیان دەفیان لێ دەدا و ورەیان بەرزدەکردنەوە و هانیان دەدان بۆ شەڕەکە. ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك هەردوولا بەیەك گەیشتن و (هێرش دەستی پێ کرد) و لەیەکتر نزیك بوونەوە، هیندی کچی عوتبە و ئافرەتەکانی تر کە لەگەڵیان بوون هەستان و دەفەکانیان بەدەستەوە گرت و لە دواوە پیاوانیان هاندەدا، و هیند دەیوت:

وَيْهًا بَنِي عَبْدِ الدّارْ

وَيْهًا حُمَاةَ الْأَدْبَارْ

ضَــرْبـًا بِكُلِّ بَتَّارْ

واتە: ئای کوڕانی عەبدول دار ئای پارێزگارانی دوای خەڵکی لێبدەن بە هەموو شمشێرێکی تیژ. وە دەیان وت:

نَحْنُ بَنَاتُ طَارِقْ نَـمْشِي عَلَى النَّمَارِقْ

الــدُّرُّ فِي المَخَانِقْ وَالمِسْكُ فِي المَفَـارِقْ

إنْ تُقْبِلُوا نُعَانِـقْ أوْ تُــدْبِـرُوا نُفَـارِقْ

فِرَاقَ غَيْرَ وَامِقْ)[٩٥٦]

واتە: ئێمەین کچانی (طارق) دەڕۆین لەسەر دۆشەکەی نەرم و بۆنی میسکیش لەسەر مەچەکەکانمانە گەر بێنەلامان دەستەملان دەکەین، گەرپشتمان لێبکەن بە ناخۆشی لێیان جیادەبینەوە).

سەبارەت بەبەشدار بوونی ئافرەتانی موسوڵمان لەم جەنگەدا ڕیوایەتێکی (ضعيف) هەیە لە ئیبنو مسعودەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (ئافرەتانی موسوڵمانان لەجەنگی ئوحودادا لە دوای پیاوانی موسوڵمانەوە بوون و (کۆمەکیان دەکردن لە جەنگەکەدا)...)[٩٥٧].

(٩٥٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٧/٣)، والطبراني (الكبير) (٩/١٩)، والحاكم (٢٣٠/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبزار (١٧٨٧)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٣/٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠٩/٦): رواه البزار رجاله ثقات، واللفظ له ولابن هشام، والبزار.

(٩٥٧) أخرجه: أحمد(المسند) (٤٤١٤) وقال محققه الاناؤوط:حسن لغيره وهذا إسناده ضعيف لانقطاعه وصححه قي

جارێکی تر هێرشی موسوڵمانان بۆ سەر موشریکەکان بەتوندی دەستی پێکرد، موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (لە دوای کوشتنی ئاڵا هەڵگرەکانی قوڕەیش، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە هەموو قوڵێکەوە هێرشیان بردە سەر موشریکەکان و پەلاماریان دان (و هێرشی ئەوانیان پەك خست)، و پاشان سێ جار ئەسپ سوارەکانیان هێرشیان هێناو تیرهاوێژە موسوڵمانەکانی سەر تەپۆڵکەکە لێیان هاتنە دەست و لە هەرسێ جارەکەدا ڕاویان نان و پاشەکشێیان پێ کردن)[٩٥٨].

پاڵەوانانی موسوڵمانان لێیان هاتنە دەست، بەڕاستی شەڕێکی بێ وێنەیان لەگەڵ کردن لەوانە حەمزە و ئەبودوجانە، وەك سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص دەفەرموێت: (حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب ﷺ لە جەنگی ئوحوددا لە پێشی پێغەمبەر ﷺ دەجەنگاو دەیوت: من شێری خوا و پێغەمبەرم)[٩٥٩].

وە عومەیری کوڕی ئیسحاقیش ﷺ دەفەرموێت: (حەمزە لە جەنگی ئوحوددا لە پێشی پێغەمبەر ﷺ بە دوو شمشێر شەڕی دەکرد و دەی وت: من شێری خوام)[٩٦٠].

ئەبو دوجانەش ﷺ قارەمانانە بە شمشێرەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەجەنگا و چۆنیەتی جەنگەکەشی لەم دوو ڕیوایەتە (ضعیف)ەدا هاتووە:

**١-زوبێری کوڕی عەوام** ﷺ **دەفەرموێت**: (ئەبودوجانە بە هەرکەسێکی موشریکەکان بگەیشتایە دەی کوشت، لە موشریکەکانیشدا پیاوێك هەبوو، بەهەر برینداری‌کی ئێمە بگەیشتایە دەیکوشت، هەریەکەیان لە یەکتر نزیك بوونەوە، منیش دوعام کرد بەیەك بگەن، ئەوە بوو بەیەك گەیشتن، موشریکەکە شمشێرێکی داوەشان بۆ ئەبو دوجانە، وئەبو دوجانەش قەڵغانێکی دایەبەری، و پاشان شمشێرێکی لێ داو کوشتی)[٩٦١].

تعليقه على (الزاد) (٥٠٣/١)، وضعفه ابن كثير في (البداية) (٤٠/٤).

(٩٥٨) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٢١٠/٣).

(٩٥٩) أخرجه: الحاكم(١٩٣/٣) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال العدوى في (صحيح فضائل الصحابة) (ص:١٨٧):إسناده صحيح.

(٩٦٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٩/٣)، والحاكم(١٩٢/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٤٣/٣)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٦٨/٩):رجاله رجال الصحيح.

(٩٦١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٩/٣) بغير سند.

**٢-هەر زوبیر ﷺ دەفەرموێت:** (وتم دەبێت ئەمڕۆ تەماشای ئەبو دوجانە بکەم تابزانم چۆن شەڕێك دەكات، تەماشام دەكرد هەر كەسێك بهاتایەتە بەردەمی دەی خست و لەناوی دەبرد)[٩٦٢].

وە پیاوێك كە ناوی قەزمان بوو وە لەبەرخوا لەم جەنگەدا بەشداری نەكرد بوو، بەڵكو لەبەر ناو و شوهرەت، ئەم پیاوە زۆر بەتوندی دەجەنگا دژبە موشریكەكان. سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك هەبوو لە ڕیزی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دا دەجەنگا، و نەی دەهێشت موشریكێك لەدەستی دەربازبێت تا خۆی پێی دەگەیاند و بەشمشێرەكەی لێی دەدا، تا دواتر وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فلان كەس ئەنجامیدا ئەمڕۆ بەكەسمان ئەنجام نەدرا، پێغەمبەر ﷺ یش فەرمووی: ((أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهلِ النّار))[٩٦٣] واتە: لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە دۆزەخی یە).

هێرشی موسوڵمانان بۆ سەر موشریكەكان بەردەوام بوو، تاراویان نان، و گەیشتنە سەركردایەتیان، و نزیك بوو ئەبوسوفیانی سەرۆكیان بكوژرێت: زوبیری كوڕی عەوام ﷺ دەفەرموێت: (حەنظلەی كوڕی ئەبو عامر بە ئەبو سوفیان گەیشت و دای بەزەویدا، ونزیك بوو بیكوژێت، بەڵام شەدادی كوڕی ئەوس چاوی پێكەوت و هات لە دواوە شمشێرێكی لێ داو شەهید بوو)[٩٦٤].

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گیان لەسەر دەستانە دەجەنگان، جابر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لە جەنگی ئوحودا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بكوژرێم لەكوێ دەبم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لەبەهەشتدا دەبیت)) پیاوەكەش هەندێك خورمای بەدەستەوە بوو، فڕێی داو جەنگا تا شەهید بوو)[٩٦٥].

وە لە ڕیوایەتێكی (ضعیف)دا هاتووە: (عەبدوڵلای كوڕی جەحش ئەو ڕۆژە شەڕی

(٩٦٢) أخرجه: الحاكم (٢٣٠/٣) وصححه ووافقه الذهبي،و فيه عبيدالله الوازع قال الحافظ في (التقريب) (١٥١٧): مجهول.

(٩٦٣) أخرجه: البخاري (٤٢٠٢)، ومسلم (١١٢) و تكررت القصة في(خيبر وحنين) أيضاً.

(٩٦٤) أخرجه: ابن هشام (٢٣/٣)، والطبراني في (الكبير) (١٢١٤)، والحاكم (٢٠٤/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى) (٥١/٤): وفي (الدلائل) (٢٤٦/٣)، وابن حبان (٧٠٢٥) وقال محققه الارناؤوط:حديث صحيح، وقال النووي في (المجموع) (٢٦٠/٥): سنده جيد، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٣/٣): رواه الطبراني (١٢٩٤) وسنده حسن.

(٩٦٥) أخرجه: البخاري (٤٠٤٦)، ومسلم (١٨٩٩)، والنسائي (٣٣/٦).

کرد تا شمشێرەکەی شکا، و هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پله دارخورمایەکیدا یە دەستی عەبدوللا و بوو بە شمشێرو پێی دەجەنگا)[٩٦٦] هێرشی موسوڵمانان بەردەوام بوو، وە موشریکەکانیش ڕایان کرد، خێوەتگاکەیان گیرا، و ئەو ئافرەتانەش کە لەگەڵیاندا بوون هەڵاتن.

براء ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك بەموشریکەکان گەیشتین و (هێرشمان بردە سەریان) ڕایان کرد، هەموو ئافرەتەکانیشیان ڕایان دەکرد بەرە و بەرزاییەکە و جلەکانیان هەڵکردبوو و خڕخاڵەکانی قاچیشیان دیار بوو)[٩٦٧].

زوبیریش ﷺ دەفەرموێت: ( سوێند بەخوا تەماشام دەکرد خڕخاڵەکانی هیندی کچی عوتبە و هاوەڵە ژنەکانی دیاربوو، خۆیان کۆکردبووە وە و ڕایان دەکرد، کەم تازۆرێکیان مابوو کە دەست بەسەر بکرێن)[٩٦٨].

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە خرخاڵەکانی ئافرەتەکانیان دیاربوو خۆیان کۆکردبووە وە ڕایان دەکرد، و سوپاکەشیان بەزی بوو هەموو ڕایان دەکرد وامان دەزانی هەموو دەکوژرێن، و هیچ کەسێکیان لێ ناگەڕێتەوە و دەرباز نابێت)[٩٦٩].

لەو ڕۆژەدا ئەبو دوجانە بەدوایان کەوت تا گەیشتە هیندی کچی عوتبە، ڕێزی لە شمشێرەکەی پێغەمبەر ﷺ گرت کە بەو شمشێرە لە ژن بدات. زوبیر ﷺ دەفەرموێت: ئەبودوجانە بەدوایان کەوت تا گەیشتە لای ئافرەتە دەف بەدەستەکانی قوڕمیش لە قەراغی بەرزاییەکەی (ئەو بەر)...... ئەبو دوجانە شمشێرەکەی داوەشان بۆ [هیند] بۆ ئەوەی لێی بدات، پاشان وازی لێ هێنا، کە جەنگەکە تەواو بوو بە ئەبو دوجانەم وت: هەموو کارەکانتم ئەمڕۆ بینی، تەنها ئەوە نەبێت کە شمشێرەکەت بەرزکردەوە

---

(٩٦٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٠/٣).

(٩٦٧) أخرجه: أحمد (٢٩٣/٤)، والبخاري (٤٠٤٣)، وأبو داود (٢٦٦٢).

(٩٦٨) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٨/٣) وحسن إسناده الحافظ في (الفتح) (٤٥٧/٧)، والحاكم (٢٧/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الأرناؤوط في تحقيقه لـ (الزاد) (١٩٧/٣).

(٩٦٩) أخرجه: اسحاق بن راهويه وصحح إسناده كل من الحافظ ابن حجر في (المطالب العالية) (٤٣١٣)، والبوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٤٢).

لە ئافرەتەکە، و بەڵام لێت نەدا؟ ئەبودوجانە وتی: بەڵێ ڕاستە سوێند بە خوا ڕێزم لە شمشێرەکەی پێغەمبەر ﷺ گرت کە ئافرەتێکی [بێ کۆمەکی] پێ بکوژم)[٩٧٠].

## تیرهاوێژەکان جێگەکانی خۆیان چۆڵ دەکەن

سەرکەوتنی یەکجارەکی موسوڵمانان نزیك بووەوە، وەتێشکانی موشریکەکان گومانی تیانەبوو، بەڵام بە هۆی خۆشەویستی دونیا و سووربوون لەسەر کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان، وە سەرپێچی کردن لە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کۆمەڵێکی زۆر لە تیرهاوێژەکان جێگەکەی خۆیان چۆڵ کرد، ئەمەش بووە هۆی شکستی موسوڵمانان و ئابڵووقەی سوپاکەیان لەگەڵ سەرکردایەتیەکەیان، و گەڕانەوەی موشریکەکان و شەهید بوون و برینداربوونی ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەم بەسەرهاتەش لە سەر زمانی هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ، هەروەها لە وتەی زانایانی ژیاننامە و (مغازي)دا کۆمان کردۆتەوە و ڕێکمان خستووە بە گوێرەی هاتنی ڕووداوەکان یەك بەدوای یەکدا، بەسەرهاتەکەش بەم جۆرە دەبێت:

زوبیر ﷺ دەفەرموێت: (سوێند بەخوا ئێمە لەوکاتەدا زاڵ بوو بووین بەسەریاندا و سەرکەوتنمان بەدەست هێنابوو، بەڵام لەناکاو تیرهاوێژەکان فەرمانەکەی پێغەمبەریان ﷺ شکاند. وادیارە تیرهاوێژەکانیش لەناو خۆیاندا جیاوازی کەوتبووە نێوانیان، کۆمەڵێکیان دوای ئەوەی بینیان کە هەندێك لە موسوڵمانان کەوتوون بەسەر ئەو دەستکەوتانەدا [وتیان: دەستکەوتەکان دەستکەوتەکان ئەی خزمان، هاوڕێیانمان سەرکەوتن چاوەڕێی چی دەکەن؟] وە کۆمەڵێکی تریان وتیات: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ کردن کە ئێرە بەجێ نەهێڵن سەرکەوتوو بێت یان نا. [وە سەرکردەکە یان عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر پێی وتن: بیرتان چووەوە پێغەمبەر ﷺ چی پێ وتن][٩٧١] [هێواش بن ئەی نازانن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی ئەوەی لێ وەرگرتن کە ئێرە چۆڵ نەکەن][٩٧٢] [ئیتر بووە دەمەقاڵیان و][جیاوازی کەوتە نێوانیان] و

---

(٩٧٠) أخرجه: البزار (٩٧٩)، والحاكم (٣/٢٣٠) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٦٩): رواه البزار ورجاله ثقات، والسند فيه عبيد الله بن وازع قال الحافظ في(التقريب) (١٥١٧): مجهول.

(٩٧١) أخرجه: أحمد (٢١٣/٤)، وأبو داود (٢٦٦٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابی داود) (٢٣١٩).

(٩٧٢) أخرجه:البخاري (٤٠٤٣)، وابن حبان (٤٧٣٨) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري.

سەرپێچی پێغەمبەریان ﷺ کرد و شکستیان هێنا](٩٧٣). پاشان کۆمەڵێکیان (لەوانەی دەیان ویست بچنە خوارەوە بۆشت کۆکردنەوە) وتیان [سوێند بەخوا دەبێت بڕۆین و لەدەستکەوتەکەدا بەشداربین](٩٧٤) [پاشان هەموویان ئەو جێگەیەیان بەجێ هێشت](٩٧٥).

زوبیر ﷛ دەفەرموێت: (بەم جۆرە تیرهاوێژەکان سەرپێچی فەرمانەکەی پێغەمبەریان ﷺ کرد و جێگەکەی خۆیان چۆڵ کرد، هاتنە جێگەکەی شەڕگەکە کە موشریکەکانمان لێ ڕاونان کەوتنە کەل و پەل کۆکردنەوە و [پشتەوەیان چۆڵ کردین](٩٧٦)، ئالەو کاتەدا [ئەسپ سوارەکانی موشریکەکان [بە سەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید] لە جێگەی تیر هاوێژەکانەوە هێرشیان هێنایە سەرمان و[ئێمە گەڕاینەوە سوپای موشریکەکانیش بەدواماندا گەڕانەوە] [و ڕیزەکانی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ هەموو بەیەکدا چوون وەك تێکەڵ بوونی هەردوو دەست] و هەموو ڕیزەکانیان شێواو و تێکەڵ و پێکەڵ بوون [و یەکێك لەوکاتەدا هاواری کرد هەموو وایان دەزانی کە ئەوە شەیتان بووە، وتی: [بۆیان بگەڕێنەوە بۆیان بگەڕێنەوە] محمد کوژرا. ئەمەش زیاتر موسوڵمانانی شپرزە کرد و هەموو بەسەریەکدا کەوتن و بوونە سێ بەشەوە. بەشێك کوژرا و بەشێك برینداربوو و بەشێکیش ڕای کرد و هەڵات)(٩٧٧).

موسای کوڕی عوقبە ﷬ دەفەرموێت: (موسوڵمانان بەسەریەکدا گەڕانەوە و کەوتنە شەڕ کردن لەگەڵ یەکدا بێ ئەوەی یەکتر بناسنەوە، وکوژراویان زۆر بوو، و هەندێکیان بەرەو نزیکی مەدینە هەڵاتن)(٩٧٨).

---

(٩٧٣) انظر: رواية موسى بن عقبة وعروة بن الزبير = في (المصنف) لعبدالرزاق (٩٧٣٥)، و(دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٢١٠-٢٦٧).

(٩٧٤) أخرجه: أحمد (٤/٢٩٣)، وأبو داود (٢٦٦٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢٣١٩).

(٩٧٥) أخرجه: أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن. (وهو الر اجح من القصة).

(٩٧٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٢٨) برقم (٦٠٥) وقال محققه: إسناده صحيح، وحسن إسناده الحافظ في (الفتح) (٧/٤٥٧).

(٩٧٧) أخرجه: اسحاق بن راهويه وصحح إسناده كل من الحافظ في (المطالب) (٤٣١٣)،و البوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٤٢).

(٩٧٨) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٢١٠)، و(فتح الباري) (٧/٣٤٦).

زوبیر ﷺ دەفەرموێت: (كۆمەڵێك لە موسوڵمانان هەڵاتن و هەندێكیان گەیشتنە [نزیكی كێڵگە و دارخورماكانی] لای چیاكەی نزیك بەشاری مەدینە، و پاشان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ)[٩٧٩].

بەم جۆرە خالیدی كوڕی وەلید، كەبینی تیرهاوێژەكان شوێنەكەیان چۆڵ كردووە، بەفرسەتێكی گەورەی زانی وە لەوێوە پەلاماری دا، لە دواوە پشتی لێ گرتن، و پاشان موشریكەكان بۆیان هەڵگەڕانەوە و موسوڵمانان ئابڵوقە دران، و جێ پێ یەكەی خۆیان لە دەست چوو، و لەبەریەك هەڵوەشان و بێ سەرەو بەرەیی ڕووی تێ كردن و بەش بەش بوون و هەر بەشەی بەجیا لەلایەكەوە شەڕی دەكرد، وە هەندێك نەیدەزانی شەڕ بكات یان هەڵ بێت، بگرە واشپرزەبوون كە یەكتریشیان نەدەناسیەوە و پەیوەندیان بەسەركردایەتیانەوە نەمابوو، وە بەهەڵە (یەمان) كە موسوڵمانێك بوو بەدەستی موسوڵمانان كوژرا وایان دەزانی كە یەكێكە لە موشریكەكان.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (لە جەنگی ئوحود موسوڵمانان شكان، ئیبلیس (لەعنەتی خوای لێبێت) هاواری دەكرد: بۆیان بگەڕێنەوە، بەم جۆرەش هەردوولای سوپاكەیان گەڕانەوە سەر موسوڵمانان، لەو كاتەدا حوزەیفە (یەمان)ی باوكی بینی [عوروە دەفەرموێت: موسوڵمانان بەشمشێرەكانیانەوە لێی كۆبوونەوە، وایان دەزانی كە ئەوە یەكێكە لە موشریكەكان، حوزەیفەش هەر دەیوت: [ئەی بەندەكانی خوا ئەوە باوكمە، ئەوە باوكمە] [بەڵام ئەوان لە قسەكەی تێنەگەیشتن] سوێند بەخوا لێی دوور نەكەوتنەوە تاكوژرا و نەیان دەناسی، حوزەیفە پێی وتن: باوكی منتان كوشت، باوكی منتان كوشت؟ ئەوانیش وتیان: سوێند بەخوا نەمان ناسی، وە ئەوان ڕاستیان دەكرد.

حوزەیفەش وتی: خوا لێتان خۆش بێت خوا لێتان خۆش بێت، [خوا لەهەموو كەسێ بە بەزەیی ترە]، دوا جار پێغەمبەر ﷺ ویستی پارەی خوێنەكەی بدات، بەڵام حوزەیفە وەری نەگرت، كردیە چاكە بۆ موسوڵمانان، ئەمەش بووە هۆی زیاتر ڕێزداربوونی لای پێغەمبەر ﷺ [٩٨٠].

(٩٧٩) أخرجه: ابن حبان (٧٠٢٥) وقال محققه الأرناؤوط: حديث صحيح.

(٩٨٠) أخرجه: البخاري (٤٠٦٥، ٣٧٢٤) واللفظ له، وابن سعد (٤٥/٢)،والزيادات: للحاكم (٢٠٢/٣) وصححه وقال محققه (٤٩٦١): سنده صحيح، والبيهقي (الدلائل) (٢١٨/٣)، والطبري (التاريخ) (٥٣٠/٢)، وابن هشام (السيرة) (٤٢/٣) برقم (٦٢٥).

بەم شێوەیە سوپای موسوڵمانان شپرزەبوون، هەندێکیان چەکیان دانا و دانیشتن و هەندێکی تریان تا مردن شەڕیان کرد وەك ئەنەسی کوڕی نەضر. ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: (ئەنەسی کوڕی نەضری مامم دواکەوتبوو لەجەنگی بەدر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکەم جەنگت لەگەڵ موشریکەکان دواکەوتم. [بەڵام ئەگەر خوای گەورە پاشان پێغەمبەر] ئەم جارە ئامادەی جەنگی موشریکەکانم بکات دەبینێت چی دەکەم و ترسا هیچی تربڵێت.

کاتێك کە شەڕی ئوحود بوو موسوڵمانان ڕایان کرد وتی: خوایە من داوای لێ بوردنت لێ دەکەم لەو کارەی کە موسوڵمانان کردیان، وە لە پێناوی تۆدا بەریم لەوەی کە موشریکەکان پێی هاتوون و[ئەنجامیان داوە]. پاشان [بەشمشێرەکەیەوە] چووە پێش، و سەعدی کوڕی موعاذ بەرەو ڕووی هات و پێی وت: [باوکی عەمر بۆ کوێ دەچیت]؟ ئەویش وتی: دەچم بۆ بەهەشت سوێند [ئاە بۆنی بەهەشت کە خۆشە] لە ناو هەمووتاندا من بۆنی دەکەم. [سەعیدیش پێی وت: ئەی برام چی دەکەیت منت لەگەڵدام]. [سەعد دواتر بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی ئەو ئەنجامیدا من نەمتوانی ئەنجامی بدەم] و ئەنەسی کوڕی نەضر ڕۆیشت جەنگا لەگەڵ موشریکەکان تا کوژرا.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: دواتر لاشەکەی ئەنەسی کوڕی نەضرمان دۆزیی یەوە و تەماشامان کرد لە هەشتاو سێ لاوە لێیاندا بوو بەشمشێرو ڕم وتیر. دواتریش موشریکەکان لاشەکەیان شێواند بوو کەس نەی دەناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت [کە پووری من بوو ناوی ڕوبەیعەی کچی نەضر بوو وتی: براکەم نەدەناسیەوە تەنها بەسەر پەنجەکانیدا نەبێت])[٩٨١].

لەوانەی کە زۆر قارەمانانە دەجەنگان لەو تەنگەژەدا حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ بوو: جابری کوڕی عەبدوللا ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك وتی: من حەمزەم بینی لە لای ئەو کوڵە درەختەوە دەی وت: من شێری خوا و پێغەمبەرەکەیم، خوایە من بەریم لەوەی کە ئەو موشریکانە پێی هاتوون، داوای لێبوردنت لێ دەکەم بۆ ئەو

(٩٨١) أخرجه: البخاري (٢٨٠٥)، ومسلم (١٩٠٣)، والترمذي (٣٢٠٠-٣٢٠١) والنسائي (الكبرى) (١١٤٠٣)، وابن هشام (السيرة) (٣٧/٣).

کارەی ئەمانە ئەنجامیاندا (واتە: ئەو موسوڵمانانەی کەرایان کرد)....)[٩٨٢].

وە حەمزە بەڕاستی شێر ئاسا دەجەنگا و موشریکەکانی شپرزە کرد بوو، تا دواجار لەدوورەوە بەرم شەهید کرا بەدەستی کۆیلە حەبەشیەکەی جوبەیری کوڕی موطعیم کە ناوی (وەحشی) بوو، بەسەرهاتی شەهیدبوو نەکەشی لەم سێ ڕیوایەتەدا هاتووە:

**١-(وەحشی)ی بکوژی حەمزە ﷺ دەڵێت:** (حەمزە لە جەنگی بەدردا مامی خاوەنەکەمی کوشت بوو کە ناوی توعەیمەی کوڕی عەدی بوو، بۆیە خاوەنەکەم جوبەیری کوڕی موطعیمی کوڕی عەدی پیَ‌ی وتم: گەر تۆ حەمزەم بۆ بکوژیت لە تۆڵەی مامەدا من تۆ ئازاد دەکەم، منیش لەگەڵ (قورەیش دا) چووم بۆ جەنگی ئوحود بەشداریم کرد، کاتێك بەڕیز وەستاین بۆ شەڕ، پیاوێك لە قورەیش کە ناوی سیباع بوو چووە دەرەوە و وتی: کێ دێتە دەرەوە جەنگم لەگەڵدا بکات؟ حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیب بۆی چووە دەرەوە و پیَ‌ی وت: ئەی سیباع کوڕەکەی دایکی ئەنمار دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەیت؟ ئینجا حەمزە پەلاماری داو دەست بەجێ کوشتی. منیش لە ژێر (بەردێکدا) خۆم مەڵاسدا بۆی [تا بەلامدا تێپەڕی] و کاتێك لێم نزیك بووەوە ڕمەکەمم تێ گرت و دام لە خواری ناوکی و لەپشتیەوە دەرچوو...)[٩٨٣].

**٢-لە جەعفەری کوڕی ئومەیەی ضەمری بەدرێژی دەیگێڕێتەوە لە (وەحشی)یەوە کە وتویەتی:**

(من کۆیلەیەکی جوبەیری کوڕی موطعیم بووم، وە مامەکەی ناوی توعەیمی کوڕی عەدی بوو لە جەنگی بەدردا کوژرا بوو، کاتێك قورەیش بۆ جەنگی ئوحود ڕۆیشتن منیش لەگەڵیاندا بووم، و جوبەیر بە منی وت: گەر تۆ حەمزەی مامی محمد بکوژیت لە تۆڵەی مامی مندا ئەوا من تۆ ئازاد دەکەم منیش پیاوێکی خەڵکی حەبەشە بووم، وەك ئەوان دەستم ڕاست بوو لەرم هەڵداندا، و بەدەگمەن هەڵەم بکردایە، کاتێك کە شەڕەکە دەستی پێ کرد من دەگەڕام بە دوای حەمزەدا و چاوم

(٩٨٢) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (١٩٩/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(٩٨٣) أخرجه: البخاري (٤٠٧٢).

بۆ دەگێڕا، تا لە ناوەڕاستی شەڕەکەدا بینیمەوە لە هەموو لایەکەوە خەڵکانی بە شمشێرەکەی دەدا بە زەویدا و هیچ کەسێك لە ڕوویدا خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، منیش خۆمم بۆ ئامادەکرد و [ئەو بە شەڕەوە پشتاو پشت هات] وە من خۆم بۆ مەڵاسدا لە ژێر بەردبوو یان کۆڵە درەخت بوو بۆ ئەوەی زیاتر لێم نزیك بێتەوە، لە پشت منەوە سیباعی کوڕی عەبد عوزا بۆی چووە پێش و حەمزە پێی وت: وەرە بۆلای من ئەی کوڕی ژنە خەتەنە چیەکە، ئینجا بە یەکەم جار لێیدا و لەناوی برد. منیش ڕمەکەم بۆی جوڵاند و مشتم لێ گرت و پاشان تێمگرت دام لەبەر میزەڵدانی و لەپشتیەوە دەرچوو، ئینجا ویستی بەرە و من بۆم بێت و کەوت، منیش لێی گەڕام هەتا مرد، پاشان هاتم ڕمەکەم لە لاشەی دەرهێنا و گەڕامەوە لای خێوەتگاکەی قوڕەیش لەوێ دانیشتم و هەقی کەسی ترم نەبوو، چونکە من تەنها حەمزەم کوشت بۆ ئەوەی ئازادبم)[٩٨٤].

## ٣-عومەیری کوڕی ئیسحاق لەڕیوایەتێکی (ضعیف)دا دەڵێت:

(حەمزە ﷺ لەپێشەوە دەجەنگا بە دوو شمشێرەوە و دەی وت: من شێری خوام، دەهات و دەچوو، تاقاچی هەڵکەوت و بەپشتا کەوت و قەڵغانەکەی سەرسنگی لێ بووەوە، ئینجا عەبدە حەبەشیەکە ڕمەکەی تێ گرت و بەهۆیەوە شەهید بوو)[٩٨٥].

هەڵگری ئاڵای مووسوڵمانان موصعەبی کوڕی عومەیریش شەهید بوو، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (موصعەبی کوڕی عومەیر بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تا شەهید بوو، وە ئەو پیاوەی کە ئەوی کوشت ناوی ئیبنو قومئەی لەیثی بوو، وای دەزانی کە پێغەمبەری کوشتووە، بۆیە گەڕایەوە لای قوڕەیش و وتی: محمدم کوشت وە دوای شەهید بوونی موصعەب، ئاڵاکە درایە دەستی عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ کە لەگەڵ چەندین پیاوی موسوڵمانی تردا بەرگریان لە پێغەمبەر ﷺ و سەرکردەی خۆشەویستیان دەکرد)[٩٨٦].

---

(٩٨٤) أخرجه:ابن هشام (السيرة) (٢٢/٣) برقم(٥٩٨)، ومن طريقه ابن حبان في (الصحيح) برقم (٧٠١٦) وقال محققه شعيب الأرناؤوط: إسناده قوي.

(٩٨٥) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٤٣/٣).

(٩٨٦) انظر: (السيرة) لابن هشام (٢٢/٣) برقم (٥٩٩).

## پاشەکشە کردن و ڕێکخستنەوەی هێزی موسوڵمانان

موسوڵمانان تووشی شکست هاتن، تەواو شپرزەبوون بەبیستنی کوژرانی پێغەمبەر ﷺ و هێزەکانیان بەش بەش بوون و بۆچوونەکانیان جیاواز بوو.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ لە ئەبو شیهابی زوهریەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کاتێك هێزەکانی موسوڵمانان پەرتەوازە بوون بە هۆی هێرش هێنانەوە بۆ سەر موسوڵمانان لە پێشەوە، پاشان موسوڵمانان هێزەکانی خۆیان یەکخستەوە بۆ بەرگری کردن، لەو کاتەدا هاوارێك بەرز بووەوە: وەرنەدواوە، وەرنەدواوە، پێغەمبەر کوژرا، بەبیستنی ئەم هەواڵە جەرگ بڕە، ئەوەندەی تر موسوڵمانان ورەی خۆیان لە دەست داو بێ توانا بوون و ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید بوو، کۆمەڵێکیان بەرە و شیوەکان هەڵهاتن و ئاوڕیان لە کەس نەئەدایەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ خۆڕاگرانە لە جێگەی خۆی مایەوەو بانگی لێکردن، تا هەندێکیان کۆبوونەوە و هاتنە شوێن (بارانەوەکەی) شیوەکە، پێغەمبەر ﷺ دیارنەما، پیاوێك لە موسوڵمانان وتی: (دیارە) پێغەمبەر ﷺ کوژراوە ئێوەش بگەڕێنەوە بۆلای خزم و کەس و کارتان تا پەناتان بدەن پێش ئەوەی بگەنە سەرتان و بتانکوژن، چونکە ئەوان دوایی دەچنە ناو شارەوە، پیاوێکی (منافق) وتی: ئەگەر دەسەڵاتمان هەبوایە و شتمان بەدەست بوایە ئالێرە نەدەکوژراین، هەندێکی تریان وتیان: گەر پێغەمبەر ﷺ کوژرا بێت ئێوەش بجەنگێن بۆ پارێزگاری کردن لە ڕێباز و ئاینەکەی پێغەمبەرەکەتان تا شەهید دەبن و دەگەنە خوا.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بەدوای هاوەڵانیدا گەڕا، بەڵام موشریکەکان لە ڕێگەی دابوون پێغەمبەر ﷺ کە ئەوانی بینی فەرمووی: ((اللهُمَّ إنْ تَشأ لا يَغلِبَنَّكَ أحد في الأرضِ...)). واتە: خوایە گەر ویستت لێ بێت کەس لە دەستت ڕزگاری نابێت لەسەر زەویدا. پاشان موشریکەکان بڵاوەیان کرد لەو قوڵ و ڕێگە شاخاوییانە و پێغەمبەریش ﷺ بانگی لە هاوەڵانی دەکرد تابەرەو شاخەکە پاشەکشە بکەن کۆمەڵێك لە موسوڵمانان وەك طەڵحە و زوبیر بە چوار دەوری پێغەمبەرەوە ﷺ مانەوە و خۆڕاگرییان کرد و بەڵێنی جەنگ کردنیان دایە تامردن، و خۆیان بە هەمووڵایەکدا کردبووە قەڵغان و دەجەنگان لەگەڵیدا و پارێزگاریان لێ دەکرد...)[٩٨٧].

---

(٩٨٧) انظر: (دلائل النبوة) للامام البيهقي (٣/٢١٠).

پێغەمبەر ﷺ لە گەرمەی شەڕەکەدا خۆی گەیاندە کۆمەڵێکی تری پەرتەوازەی موسوڵمانان وە بەبینینی پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانان ورە بەرزو چالاك تر بوون.

عوروەی کوڕی زوبیر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەیشتە هەندێك لە هاوەڵانی تری و چاویان پیّ کەوت: کە طەڵحە و زوبیر و سەهلی کوڕی حەنیف و حارثی کوڕی صومەی لەگەڵدان.

موسوڵمانان ئەمانیان نەناسییەوە و وایان زانی دوژمنن، تا یەکێکیان تیرێکی بۆ ئامادەکردن، بەڵام کاتێك ئەوان قسەیان کرد و پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن، بەڕاستی ئەوان کە چاویان بە پێغەمبەر ﷺ کەوت و زانیان کە زیندووە وەك هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشتبێ و (ورە بەرزتربوون)[٩٨٨].

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (ئەو موسوڵمانانە دوای ئەوەی ئەو بانگەیان گوێ لێ بوو کە (محمد کوژرا) هیچ گومانێکیان لەم هەواڵە نەبوو و دەیان وت: ئێمە لەو حاڵە دابووین، تا بینیمان پێغەمبەر ﷺ بە ناوماندا هات لە نێوان هەر دوو (سەعد)ەوە هەر لە دوورەوە بەشێوەی ڕۆیشتنەکەی ناسیمانەوە، زۆر دڵخۆش بووین و دەت وت هیچمان بەسەر نەهاتووە)[٩٨٩].

عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك هێرشی موشریکەکان کەمێك ڕەویەوە تەماشای ناو کوژراوەکانم کرد و پێغەمبەرم ﷺ نەدیەوە وتم: سوێند بەخوا پێغەمبەر ﷺ ڕای نەکردووە، و نەشم بینیەوە لە ناو کوژراوەکاندا، بەڵام وا ئەزانم خوا بە هۆی ئەو کارەمان لێمان تووڕەبوو، وە پێغەمبەرەکەی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە، چاکتر وایە بۆ من شەڕبکەم تا دەکوژرێم، ئینجا کیفی شمشێرەکەم شکاند و ویستم بڕۆم بۆ پەلاماردانی دوژمن ئەوەندەم زانی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە بە ڕوومدا هاتن و تەماشام کرد پێغەمبەر ﷺ لە ناویاندایە)[٩٩٠].

(٩٨٨) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي(٢٧١/٣).

(٩٨٩) أخرجه: أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه: إسناده حسن، والطبراني (الكبير) (١٠٧٣١)، والحاكم (٢٩٦/٢)، والبيهقي (الدلا ئل) (٢٦٩/٣).

(٩٩٠) أخرجه: ابويعلى (٥٤٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٧٥): فيه حرمان بن محمد العقيلي وثقه ابو داود وابن حبان وضعفه ابو زرعه و غيره و بقية رجال رجال الصحيح، وقال كل من الحافظ في (المطالب العالية) (٤٣٢٣) والبوصيري في (اتحاف الخيرة المهرة) (٦٢٥٤): إسناده حسن.

یەکەم کەس لەو موسوڵمانانەی کە پاشەکشەیان کردبووە شێوەکە و پێغەمبەری ناسییەوە، کەعبی کوڕی مالیك بوو ﷺ موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبیر ﷺ، دەفەرموون: (لە دوای شکستی موسوڵمانان و بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر ﷺ یەکەم کەس کە پێغەمبەری ﷺ ناسییەوە کەعبی کوڕی مالیك بوو کە دەیوت: (تەماشام کرد هەردوو چاوە [پیرۆزەکانی] دەدرەوشانەوە لە ژێر کڵاوە ئاسنینە سەنگینەکەی سەری، ئیتر بە هەموو دەنگم هاوارم کرد: [الله أكبر] مژدە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ئەوە پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەریش ﷺ ئیشارەتی بۆ کردم کە بێ دەنگ بم، موسوڵمانان، کە پێغەمبەریان ناسیەوە هەموو هەستان و (پاشەکشەیان) کرد بەرەو شیوەکەی چیای ئوحود، و عەلی کوڕی ئەبو طالیب و ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و زوبیرو حارثی کوڕی صومە و چەند کەسێکی تریان لەگەڵدابوو)(٩٩١).

لە ڕیوایەتێکی تردا کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (لە جەنگی ئوحوددا کاتێك پاشەکشەمان کرد بۆشیوەکە، من یەکەم کەس بووم کە پێغەمبەرم ناسیەوەو وتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەریش ﷺ بەدەستی ئیشارەتی بۆ کردم کە بێ دەنگ بم، پاشان کڵاوە ئاسنینەکەی و قەڵغانەکەی سنگی دایە من، لەبەرم کردو ئەویش ئەوانەی منی لەبەر کرد، لەو ڕۆژەدا لە بیست و سێ لاوە برینداربووم هەموو کەسێك کە لێی دەدام وای دەزانی من پێغەمبەرم)(٩٩٢).

## پارێزگاری کردن لەپێغەمبەر ﷺ

دوای کۆبونەوەی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە لە پێغەمبەر ﷺ موشریکەکان هێرشەکەی خۆیان زۆر توند و چڕوپڕتر کرد لەسەریان، پاشان هەندێکیان لێ شەهید بوو، پێغەمبەریش ﷺ بریندار بوو.

---

(٩٩١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٨/٣)، وعبد الرزاق (٩٧٣٥)، وأبو نعيم (الدلائل) (٤١٤)،والبيهقي (الدلائل) (٢٣٧،٢١١/٣)، وقال البوصيري في (اتحاف الخيرة) (٦٢٤٨): رجاله ثقات لكنه منقطع.

(٩٩٢) أخرجه: الطبراني(الكبير) (١٠٠/١٩) وفي (الاوسط) (١١٠٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٧٧) رجاله ثقات، وقال صاحب (صحيح السيرة) (٣٧٠): حديث صحيح.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا تەنها نۆ کەس لە چواردەوری مانەوە، ئەوانیش حەوتیان ئەنصاری بوون، وەدوانیان موهاجری بوون، موشریکەکان کە زۆر نزیك بوونەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کێ ئەوانمان لێ دوور دەخاتەوە هاوڕێم دەبێت لە بەهەشتدا) پیاوێك لە ئەنصار چووە پێش و جەنگا تا کوژرا، پاشان پێغەمبەر ﷺ وتەکەی دووبارەکردەوەو یەکێکی تر چووە پێش و جەنگا تا کوژرا، بەم جۆرە تا هەر حەوتەکەیان کوژران، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە دوو هاوەڵەکەی وت: کە مابوونەوە لەگەڵیدا: (بەڕاستی دادپەروەر نەبووین لەگەڵ هاوڕێکانماندا)(٩٩٣).

وە لەکاتی پاشەکشێ بەرە و شاخەکە دیسان پەلاماری موشریکەکان توندتربوو، نۆ کەسی تر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شەهید بوون، جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا ڕایان کرد و تەنها یانزە پیاو لە چوار دەوریدا مانەوە کە طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا یان لە ناودا بوو، وە پاشەکشەیان دەکرد بەرەو شاخەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (کێ دێتە دەس بۆ ئەوان)؟ طەڵحە وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، پێی فەرموو: (لەجێی خۆت بە ئەی طەڵحە) پاشان پیاوێکی ئەنصار وتی: [من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێی فەرموو: (تۆ بڕۆ) چوو شەڕی کرد تاکوژرا]، پێغەمبەر و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون کەمێك سەرکەوتن، پاشان موشریکەکان پێی گەیشتنەوە (....و بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ وتەکەی دووبارە کردەوە، و طەڵحە دەی وت: من ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام ڕێگەی نەئەدا، و پیاوێکی ئەنصاری داوای دەکرد، کە بجەنگێ و ڕێگەی ئەدا، ئەویش وەك هاوەڵەکەی پێشووی شەڕی کرد تا کوژرا [ماوەیەك موشریکەکان لێی دوور دەکەوتنەوە و ئەوان سەردەکەوتن بەشاخەکەدا و پاشان دوژمن دەگەیشتەوە سەریان] تاوای لێ هات تەنها طەڵحەی بەچوار دەورەوە مایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کێ دەیانگێڕێتەوە)؟ ئەمجاریش طەڵحە وتی: من، ئینجا طەڵحە شەڕی هەر یانزە کەسەکەی پێش خۆی کرد (واتە: بەماوەی ئەوان جەنگا) [تا لە دەستی درا و هەندێك لە پەنجەکانی قرتا وتی: ئاخ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (گەر بتوتایە (بسم الله) فریشتەکان دەیان فڕاندیت لە پێش چاوی خەڵکیدا)]. لە ڕیوایەتێکی تردا: (گەر بتوتایە (بسم

---

(٩٩٣) أخرجه:أحمد (٢٨١/٣)، ومسلم (١٧٨٩)، وابويعلى (٣٣١٩).

الله) لە پێش چاوی خەڵکاندا فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوە تا دەیان گەیاندیتە ئاسمان)[٩٩٤]. لە ڕیوایەتێکی تردا: [گەر بتوتایە (بسم الله) دەت بینی بەوە ماڵێکت بۆ دروست دەکرا لە بەهەشتدا وە تۆش هێشتا زیندووبوویت لە دونیادا][٩٩٥] وپاشان خوای گەورە موشریکەکانی گێڕایەوە).

طەڵحە بەهۆی ئەم لێدانەوە ئەو دەستەی تووشی (شەلەل) هات، وەك (قەیس ﷺ دەفەرموێت: (ئەو دەستەی طەڵحەم بینی بە ئیفلیجی کە پارێزگاری پێ کردبوو لە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا)[٩٩٦].

لەڕیوایەتێکی تردا ئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی طەڵحە ﷺ دەفەرموێت: (یەکێك لە موشریکەکان کە ناوی مالیکی کوڕی زوهەیر بوو تیرێکی هەڵدا بەرەو پێغەمبەر ﷺ و طەڵحە دەستی دایەبەر ئەو تیرە و لەوەوە توشی ئیفلیجی هات و وتی: ئاخ ئاخ)[٩٩٧]، لەگەڵ ئەوەشدا طەڵحە لە زۆر لاوە بریندار کرا و خوێنی لێ دەڕۆیشت.

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (طەڵحە لە سی و پێنج یان سی وحەوت لاوە بریندارکرا بوو بەتیرو ڕم وشمشێر، وە لە ناوچەوانی درابوو وەپەنجەی شایەتمانی قرتابوو وە پەنجەکانی تری ئیفلیج بوو بوو)[٩٩٨].

دوای ئەمە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ هات و (لەو ڕۆژەدا تەنها سەعد و طەڵحە لای پێغەمبەر ﷺ مانەوە)[٩٩٩]. و سەعدیش تیر هاوێژێکی زۆر دەست ڕاست بوو خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ لە ناو شەڕەکەدا، ئەم بەسەرهاتەش خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: (کاتێك لە شەڕەی ئوحوددا موسوڵمانان پەرشوبڵاوبوون

---

(٩٩٤) أخرجه: النسائي (٣١٤٩)، والبيهقي (الدلائل) (٢٣٦/٣)، وقال الحافظ في (الفتح) (٣٦٠/٧): إسناده جيد، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (٢٩٥١)، و(السلسة الصحيحة) (٢١٧١،٢٧٩٦).

(٩٩٥) أخرجه: أحمد في (فضائل الصحابة) (١٢٩٤)، وقال محققه: إسناده صحيح.

(٩٩٦) أخرجه: البخاري (٤٠٦٣)، وابن ماجه (٤٦/١)، والطبراني (الكبير) (٩٦/١).

(٩٩٧) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٣٦٩/٣).

(٩٩٨) أخرجه: الحاكم (المستدرك) (٢٧/٣) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي.

(٩٩٩) أخرجه: البخاري (٣٧٢٤)، ومسلم (٢٤١٤).

و لە پێغەمبەر ﷺ دوور کەوتبوونەوە، منیش چوومە لایەکەوە و وتم: پارێزگاری لە خۆم دەکەم یان شەهید دەبم یان ڕزگارم دەبێت تا دەگەمە پێغەمبەری خوا، لەو کاتەدا پیاوێکم بینی دەم و چاوی هەڵپێچابوو نەم دەزانی کێیە، موشریکەکان بۆی چوون تا وتم: ئێستا لە ناوی دەبەن، بەڵام ئەو کەسە دەستی پڕ وورده چەو کرد و پاشان پرژاندی بە ڕوویاندا تا هەر هەموویان پاشەوپاش گەڕانەوە دواوە، ئەمە چەند جار ڕوویدا هەر نەم دەزانی ئەو کەسە کێیە، میقدادم لێ نزیك بوو، ویستم پرسیاری ئەو پیاوەی لێ بکەم، بەڵام میقداد وتی: سەعد ئەوە پێغەمبەری خوایە بانگت دەکات. وتم: ئەو لەکوێیە؟ میقداد دەستی بۆ ڕاکێشا و منیش هەستام وەك هیچ (خەفەت) و ئازارێکم تووش نەبووبێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سەعد ئەمڕۆ لەکوێ بوویت)؟ منیش وتم: لەو جێگەیە بووم کەمنت تێدا بینی ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە جێگەیەکی بۆ دەست نیشان کردم و لەو جێگەیە دانیشتم و کەوان و تیرەکانم ئامادەکرد و کەتێم دەگرتن دەم وت: خوایە تیرەکەت بدە لە دوژمنەکەت پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (خوایە داواکەی سەعد جێ بەجێ بکە، خوایە تیرەکانی سەعد بە نیشانەکانی خۆی بگەیەنە) (واتە: بدات لەو جێگایەی کەسەعد بۆی دەهاوێژێت)، (دەی تێیان گرە سەعد باوك و دایکم فیدات بێت)، وە هەرتیرێکم دەهاویشتە موشریکەکان، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (خوایە داواکەی سەعد جێبەجێ بکە و تیرەکانی بگەیەنەبە نیشانەکانی خۆی)، تا هەموو تیرەکانی کیفەکەم تێگرتن و تیرم پێ نەما، ئینجا پێغەمبەر ﷺ تیرەکانی کیفەکەی خۆی بۆ هەڵڕێژام. زوهری ﷺ دەفەرموێت: ئەو ڕۆژە سەعد هەزار تیری هاویشت)[1000].

لە ڕیوایەتێکی تردا سەعد دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تیرەکانی خۆی لە کیفەکەیدا بۆ هەڵڕێژام لە جەنگی ئوحوددا و فەرمووی: (تێیان گرە [ئەی سەعد] باوك و دایکم فیدات بێت)[1001]. وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ئەم

(١٠٠٠) أخرجه: الحاكم (٢٥/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبزار (١٣٦٩) وقال: فيه عثمان متروك. وله شواهد في الروايات الاتية بعدها. وقول الزهري رواه الحاكم (٢٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٠٠١) أخرجه: البخاري (٢٩٠٥،٤٠٥٥)، ومسلم (٢٤١١)، والترمذي (٣٧٥٦)، وابن ماجه (١٢٩).

دوعایەی بۆ کردم: (اللَّهمَّ سَدِّدْ رَميَتَه، وأجِبْ دَعوَتَه)[١٠٠٢] واتە: خوایە تیرەکانی (سەعد) بدە لە نیشانەکانی خۆی و دوعاکانی قبوڵ بکە.

سەعد بە تیروکەوانەکی بەرگری زۆری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە گیڕانەوەیەکی تردا هاتووە: سەعد ئەو ڕۆژە هەزار تیری هاویشتووە[١٠٠٣]. وە لەڕیوایەتێکی (مرسل)ی (ضعیف)دا هاتووە کە عومەیری کوڕی ئیسحاق فەرموویەتی: (کاتێك سەعد تیرەکانی دەهاویشتە موشریکەکان لە جەنگی ئوحوددا، گەنجێك هەر تیری بۆ کۆدەکردەوە و بۆی دەهێنا و پێی دەوت: باوکی ئیسحاق ئەمانەشیان تێگرە، لەدوای تەواوبوونی جەنگەکە کەس ئەو گەنجەی نەناسی و نەبینی)[١٠٠٤].

ئەبو طەڵحەش لەو ڕۆژە سەختەدا بە تیر و کەوانەکەی دەجەنگا و خۆی دەخستە بەر ئەو تیرانەی کە دەهاوێژرا بۆ پێغەمبەرﷺ، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: (لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا هەندێك لە موسوڵمانان بەچوار دەوری پێغەمبەرەوە ﷺ ڕایان کردبوو، بەڵام ئەبو طەڵحە خۆی کردبووە قەڵغانی پێغەمبەر ﷺ و لەبەردەمیدا وەستا بوو، ئەبو طەڵحە تیرهاوێژێکی دەست ڕاست بوو تیرەکانی لە کەوانەکەیدا زۆر ڕای دەکێشان ئینجا دەی هاویشتن بۆیە ئەو ڕۆژە دوو یان سێ کەوان بەدەستیەوە شکا.

لەو ڕۆژەدا هەر پیاوێك لەوێدا بڕۆشتایەو تیری پێ ببوایە پێغەمبەر ﷺ دەی فەرموو: تیرەکانت هەڵڕێژە بۆ ئەبو طەڵحە، ومتیرەکانی بهاویشتایە پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز دەکردەوە تا ببینێت تیرەکە لەکوێ دەدات، ئەبو طەڵحەش سنگی بەرز دەکردە و (واتە: خۆی دەدایە پێشی پێغەمبەر ﷺ و دەی وت): ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایك و باوکم بە قوربانت بێت سەرت بەرز مەکەرەوە نەوەك تیرێك لە تیرەکانیان بەرت کەوێت سنگم قەڵغانە بۆ سنگت [وە ئەبو طەڵحە خۆی خستبووە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و دەیوت: من بەهێزترین کەسم لە ناو خزمەکانی خۆم پێم

---

(١٠٠٢) أخرجه: الترمذي (٣٧٥١)، وأبو نعيم (الحلية) (٩٣/١)، والبزار(٢١٨)، والحاكم (٤٩٩/٣)، وابن حبان (٦٩٩٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وابن ابي عاصم(السنة) (١٤٤٤) وقال محققه: إسناده صحيح. واللفظ له.

(١٠٠٣) أخرجه: الحاكم (٢٦/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٠٠٤) أخرجه: البيهقي (دلائل النبوة) (٢٥٦/٣).

بڵێ چیت دەوێت با بۆت جێبەجێ بکەم])[١٠٠٥].

وە لەڕیوایەتێکی (ضعیف)دا هاتووە، کە ئەبو دوجانە پشتی کردووەتە قەڵغان بۆ پێغەمبەر ﷺ. محمدی کوڕی عەمر ﷺ دەفەرموێت: (ئەبو دوجانە خۆی کردبووە قەڵغان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و خۆی دابوو بەسەریدا تا تیرێکی زۆر چەقا لەپشتیدا)[١٠٠٦].

وە لەڕیوایەتێکی تردا گێڕدراوەتەوە لە قتادەی کوڕی نوعمان ﷺ کە فەرموویەتی: (کەوانێك کرایە دیاری بۆ پێغەمبەرﷺ، ئەویش دای بەمن لە جەنگی ئوحوددا، منیش ئەوندەم تیر پێ هاویشت تا تاڵەکەی قرتا، بەڵام هەر لە جێگەی خۆم وەستام و سەرم لە پێشی سەری پێغەمبەر ﷺ، وەستاند بوو بۆ ئەوەی ڕووخساری لە تیری دوژمن بپارێزم [هەر تیرێك بەرەو ڕووی بهاتایە من سەرم بۆ لار دەکردەوە تا دەم و چاوی پێغەمبەر ﷺ بپارێزم چونکە تیرم هیچ پێ نەمابوو] تا لەکۆتاییدا تیرێك لەلای چاوی دام، چاوم دەرپەڕی، و موشریکەکان ڕایان کرد، منیش چوومە لای پێغەمبەر ﷺ بەلەپی دەستمەوە گرتبووم پێغەمبەر ﷺ کە منی بەو جۆرە بینی فرمێسك لە چاوانی هاتە خوارەوە و فەرمووی: (خوایە قەتادە پارێزراو بکەیت وەك چۆن دەم وچاوی پێغەمبەرەکەتی پاراست، خوایە ئەم چاوەی چاکتر و تیژتر بکەی دواتر ئەو چاوەی چاکترین چاو بوو)[١٠٠٧].

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە ژمارەیان دەگەیشتە سی کەس خۆڕاگربوون لە ڕووی هێرشە یەك لەسەر یەکەکانی دوژمن بۆ ئەوەی کەم کەم پاشەکشە بەرەو شاخی ئوحود بکەن[١٠٠٨].

---

(١٠٠٥) أخرجه: البخاري (٣٨١١،٤٠٦٤)، ومسلم (١٨١١)، وأحمد (١٠٥/٣) وفي (الفضائل) (١٥٦٧)، والحاكم (١١٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي. واللفظ للمسلم و الزيادة للحاكم.

(١٠٠٦) أخرجه:الطبراني (الكبير) (١٥،١٨/١٩)، والبيهقي في (دلائل النبوة) (٢٣٤/٣)، وابن هشام في (السيرة) (٣٤/٣)، وقال الهيثمي(المجمع) (١١٣/٦) فيه من لم اعرفهم، واورده الاصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٤٢٤/٢) وقال محققه: إسناده ضعيف.

(١٠٠٧) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٥/١٩)، وأبو نعيم (الدلائل) (٤١٧)، والبيهقي(الدلائل) (٢٥١،٢٥٣/٣)، وابويعلى (١٥٤٩)، وابن هشام (السيرة) (٣٦/٣) (٦١٤) وقال محققاه: فالقصة بهذه الطرق التي اوردناها حسنة، وقال الحافظ العراقي في (الاحياء) (٣٨٧/٢): في إسناده اضطراب، وقال الشيخ الألباني في تخريج (بداية السول) (ص:١٤): له طريقتين اخريتين يتقوي بهما، وقال الارناؤوط في تخريج (الزاد) (١٩٨/٣): رجاله ثقات.

(١٠٠٨) انظر: (البداية والنهاية) لابن كثير(٢٣/٤).

## كوشتنی ئوبەی كوڕی خەلەف

لەم كاتەدا ئوبەی كوڕی خەلەف هێرشی هێنایە سەر موسوڵمانان، مەبەستی بوو بڕیارە كۆنەكەی جێ بەجێ بكات كە بریتی بوو لە كوشتنی پێغەمبەر ﷺ، وردەكاری ئەم باسەش لەم سێ ڕیوایەتەی زانایانی ژیاننامە داهاتووە:

### ١-عوروەی كوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت:

(ئوبەی كوڕی خەلەف لە مەككە سوێندی خواردبوو كە دەبێت پێغەمبەری خوا بكوژێت، وە ئەم هەواڵەش گەیشتبووەوە بە پێغەمبەر ﷺ و فەرموو بووی: (بەڵكو من ئەو دەكوژم (إن شآء الله). لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا ئوبەی كوڕی خەلەف هەموو لاشەی بەئاسن داپۆشی بوو وە سەروكڵاوی ئاسنینی پۆشی بوو تەنها چاوی دیار بوو، هێرشی هێناو وتی: ڕزگارنەبم گەر محمد ڕزگاری بێت هێرشی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، موصعەبی كوڕی عومەیر لە پێشی پێغەمبەر ﷺ وەستابوو بۆ پارێزگاری كردنی، موصعەب كوژرا، پێغەمبەر ﷺ چاوی بەئەڵقەیەكی كراوەی نێوان كڵاو (درع)ەكەی لەسەر قورقوڕاگەی ئوبەی كەوت، ڕمێكی بۆ هەڵدا و لەو جێگەیەدا و لەسەر ئەسپەكەی خستیە خوارەوە و بەڵام خوێن لە جێ برینەكەی نەهاتەدەر، هاوەڵانی هەڵیان گرتەوە وەك گا دەیبۆڕاند و پێیان وت: بۆ وا بێ غیرەتی ئەوە تەنها رووشاویەكە؟ ئەویش بەڵێنەكەی پێغەمبەری ﷺ بۆ گێڕانەوە كەوتبووی: من ئوبەی دەكوژم. پاشان وتی: سوێند بەخوا ئەو ئازارەی ئێستا بەمنەوەیە گەر بەخەڵكی هەموو حیجازە وەبێت هەموویان دەمرن. ئەوە بوو دواترئوبەی مرد)[١٠٠٩].

### ٢-موسای كوڕی عوقبە ﷺ لەسەعیدی كوڕی موسەیبەوە دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

(....لەو ڕۆژەدا ئوبەی تەنها چاوی دیاربوو بەسەر ئەسپەكەیەوە هێرشی دەهێناو دەی وت: ڕزگارم نەبێت گەر محمد ڕزگاری بێت، هەندێك لە موسوڵمانان ڕێگەیان پێ گرت، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردن كە ڕێگەی بۆ چۆڵ بكەن، موصعەب بەرەو

---

(١٠٠٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٥٨/٣)، وأبو نعيم (الدلائل) (٤١٥).

ڕووی چوو شەهید بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ چاوی کەوت بەئەڵقەیەکی کراوەی سەر قورقوراگەی ئوبەی، ڕمێکی تێگرت و بەر قورقوراگەی کەوت و لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و خوێن لە برینەکەی نەدەهات..... و پاشان ئوبەی لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ مەککە لەناوچوو)[1010].

**٣-ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەفەرموێت:**

ئیبنو شیهابی زوهری رحمه الله بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە دەفەرموێت: (کاتێك پێغەرمبەر ﷺ لە شیوەکەدا بەرەو شاخەکە پاشەکشەی دەکرد، ئوبەی کوڕی خەلەف پەیدا بوو دەی وت: محمد ئەمڕۆ ڕزگارم نەبێت گەر تۆ ڕزگارت بێت، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك لە ئێمە بۆی بگەڕێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی گەڕێن، کاتێك نزیك بووەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕمەکەی لەحاریثی کوڕی صومە وەرگرت و ڕووی کردە ئوبەی، و گوڕی بۆ خوارد کە تێیگرێت ئێمە هەموو پەرش و بڵاو کەوتین بەم لاولادا، پاشان تێی گرت و دای لە ئەڵقەکراوەکەی و درعەکەی و بەر قورقوراگەی و لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و چەندەها تەقلەی دا)[1011].

بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا تەنها ئەم کەسەی بە دەست کوژراوە، بەمەش ئەم کەسە توندترین سزا دەدرێت لە دۆزەخدا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أشدُّ الناسِ عذابًا يومَ القيامةِ رجلٌ قتل نبيًّا أو قتله نبيٌّ))[1012] واتە: توندترین سزا کە سزای خەڵکی پێ دەدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکە، کە پێغەمبەرێکی کوشت بێت یان بە دەستی پێغەمبەرێك کوژرا بێت).

هەروەها ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

---

(١٠١٠) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٣١)، والبيهقي (الدلائل) (٢١١/٣)، والحاكم (٣٢٧/٢) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وأورده القاضى عياض في (الشفاء) برقم (١٠٢٩) وقال محققه: حسن.

(١٠١١) أخرجه: البيهقي(الدلائل) (٢٣٨/٣)، والطبراني (الكبير) (٧٥٩٥) وأبو نعيم (الدلائل) (٤١٤)، وابن هشام (السيرة) (٣٨/٣) وله شواهد كثيرة انظرها في: (تخريج الاحياء) (٣٨٧/٢)، و(الزاد) (١٩٩/٣)، و(فقه السيرة) لغزالي (ص:٢٧٦)، و(الشفا) لقاضي عياض رقم (١٠٣٩) وقال محققه: حسن.

(١٠١٢) أخرجه: أحمد (٤٠٧/١)، والطبراني (الكبير) (١٠/ ٢٦٦)، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح الجامع) (١٠٠٠)، و (الصحيحة) (٢٨٠).

((اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ علَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسولُ اللهِ ﷺ في سَبيلِ اللهِ ))[(١٠١٣)] واتە: توڕەبوونی خوا توندە لەسەر ئەو کەسەی کە پێغەمبەری خوا دەیکوژێت لە پێناوی خوادا)).

## بریندار بوونی پێغەمبەر ﷺ

لە کاتی پاشە کشەکردنی موسوڵمانان بەرە و شاخی ئوحود، موشریکەکان زیاتر هێرشەکانیان توندترکرد بۆ سەرخودی پێغەمبەر ﷺ، تا لە کۆتاییدا چەناگەی پێغەمبەر بریندار بوو وە یەکێك لە دانەکانی شکا و لێوی پیرۆزی لە ناوەوە بریندار بوو، وە سەر ئەژنۆکانیشی ڕووشا، وە کەوتە چاڵێك لە چاڵەکانەوە، ئەمانە لەچەندین فەرموودەدا هاتوون دوای کۆکردنەوەو ڕێکخستنیان بەم جۆرە دەبێت:

ئەنەس ﷺ دەفەرمویێت: (پێغەمبەر ﷺ لەجەنگی ئوحوددا [دەم و چاوی بریندار کرا][(١٠١٤)] [وچەناگەی بریندار کرا تا خوێن بەلای دەمیدا هاتە خوارەوە][(١٠١٥)] وە یەکێك لەدانە خڕێکانیشیان شکاند [وە لەقوڵیشی درا][(١٠١٦)] [وە تاسی کڵاوەکەی سەریشی لێدرا و شکا][(١٠١٧)] پێغەمبەریش ﷺ خوێنەکەی بەدەم و چاویەوە (واتە: لێو و چەناگەیەوە) دەسڕی و دەی فەرموو: ((كيف يُفلِحُ قومٌ خَضَبوا وَجْهَ نبيِّهم بالدَّمِ [وَكَسروا رباعيتَهُ])[(١٠١٨)] وهو يَدعوهُم إلى رَبِّهم)) واتە: چۆن ڕزگار دەبن کەسانێك کە دەم و چاوی پێغەمبەرەکەیان خەڵتانی خوێن کردووە [و دانی خڕێشیان شکاندووە] لە کاتێکدا کە ئەو بانگیان دەکات بۆلای خوای خۆیان. وە دەی فەرموو: ((اشتدَّ غَضبُ اللَّهِ على [قومٍ دمَّوا][(١٠١٩)] وجهَ رسولِ اللَّهِ ))[(١٠٢٠)] واتە: خوا زۆر تووڕەیە لەسەر ئەوانەی کە دەم وچاوی

---

(١٠١٣) أخرجه: أحمد (٨٢٢١)، والبخاري (٤٠٧٣)، ومسلم (١٧٩٣).

(١٠١٤) أخرجه: أحمد (١٢٨٣١) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري.

(١٠١٥) أخرجه: أحمد (١١٩٥٦) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وابن سعد (٤٢/٢)، وابويعلى (٣٧٣٨)، وابن حبان (٦٥٧٤).

(١٠١٦) أخرجه: الترمذي (٣٢٠٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٠١).

(١٠١٧) أخرجه:البخاري (٤٠٧٥) عن سهل بن سعد c)).

(١٠١٨) أخرجه: أحمد (١٣٦٥٧)، وقال محققه إسناد على شرط مسلم، مسلم (١٧٩١)،وابن حبان (٦٥٧٥)، و ابو يعلى (٣٣٠١).

(١٠١٩) أخرجه: البخاري (٤٠٧٢).

(١٠٢٠) أخرجه: البخاري(٤٠٧٦).

پێغەمبەری خوایان خوێناوی کردووە. وە لەڕیوایەتێکی تردا دەیفەرموو: ((اشتدَّ غضبُ اللَّهِ على قومٍ هشَّموا البيضةَ على رأسِ نبيِّهم وَهوَ يدعوهم إلى اللَّهِ))[1021] واتە: خوا زۆر تووڕەیە لەوانەی، کە تاس کڵاوی ئاسنیان لەسەر پێغەمبەرەکەیاندا شکاندووە، کە ئەو بانگیان دەکات بۆلای خوا.

لە ڕیوایەتێکی تردا عومەری کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا فەرمووی: ((اللَّهُمَّ العَنْ أبا سُفيانَ، اللَّهُمَّ العَنِ الحارِثَ بنَ هِشامٍ، اللَّهُمَّ العَنْ صَفوانَ بنَ أُميَّةَ [كيفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ، وَكَسَرُوا رَبَاعِيَتَهُ، وَهو يَدْعُوهُمْ إلى اللهِ؟]...))[1022] قال: فنزلت ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ (آل عمران)، فتاب الله عليهم فاسلموا وحسن اسلامهم]))[1023] واتە: خوایە نەفرەت بکە لە ئەبو سوفیان، خوایە نەفرەت لە حەرثی کوڕی هیشام بکە، خوایە نەفرەت لەصەفوانی کوڕی ئومەییە بکە [چۆن ڕزگار دەبن کەسانێك کە پێغەمبەرەکەیان خوێناوی کردووە و دانی خڕێیان شکاندووە، کە ئەو بانگیان دەکات بۆ لای خوا، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: تۆ هیچ کارێکت بەکاری ئەوانەوە نییە، چونکە یا تەوبەیان لێوەردەگرێ و موسڵمان دەبن وە یان ئازارو سزایان دەدات، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بێ باوەڕیی چونکە بەڕاستیی ئەوانە ستەمکارن.

پاشان خوا تەوبەی لێ قبوڵ کردن و موسوڵمانێکی زۆر باشیان لێ دەرچوو). وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت کە ئەو ئایەتە دابەزی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللَّهمَّ اغفِرْ لقومي فإنَّهم لا يعلَمونَ))[1024] واتە: خوایە لەو خزم و کەسانەم خۆش بە ئەوانە نەزانن.

لە هەندێك ڕیوایەتی لاوازدا ناوی ئەو کەسانە هاتووە کە پێغەمبەریان ﷺ بریندار کرد:

---

(١٠٢١) أخرجه: البزار (١٧٩٣)، وأبو يعلى (٥٩٣١)، وقال الهيثمي في المجمع (١٠٠٩٨) رواه البزار و إسناده حسن.

(١٠٢٢) أخرجه: مسلم (١٧٩١).

(١٠٢٣) أخرجه: الترمذي (٣٠٠٢)، وقال: حسن غريب، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٠٢)،وله شواهد عند البخاري (٤٠٦٩).

(١٠٢٤) أخرجه: ابن حبان (٩٧٣) وقال محققه الاناؤوط: إسناده حسن.

### ١-ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت:

عەبدوڵڵای کوڕی قومەئە بەردێکی هاویشتە پێغەمبەر ﷺ و نەوچەوانی بریندار کرد، و دانی خڕیّ شکاند وتی: بگرە لە ئیبنو قەمیئەوە، پێغەمبەر ﷺ خوێنەکەی بەدەم وچاویەوە سڕی و فەرمووی: (خوا کەرت کەرتت بکات) ئەوە بوو لە دوای گەڕانەوەی خوای گەورە بەرانێکی کێوی بەسەردا زاڵ کرد، بەر شۆقیدا تا کەرت کەرتی کرد)[١٠٢٥].

### ٢-ئیبنو شیهابی زوهری ﷺ دەفەرموێت:

(عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص دانی پێغەمبەری ﷺ شکاند و دەم و چاوی خوێناوی کرد، پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کرد و فەرمووی: (خوایەساڵی بە سەردا نەیەتەوە و بەکافری بمرێت) ئەوە بوو ساڵی بەسەردا نەهاتەوە و بە کافری مرد)[١٠٢٦].

### ٣-ئیبنو هیشام لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

(عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص بەردێکیدا لە دانی خڕێی خوارەوەی لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ وە لێوی خواروی بریندار کرد، وە عەبدوڵڵای کوڕی شیهابیش نەوچەوانی بریندار کرد، ئیبنو قەمیئەش سەر ڕوومەتی بریندار کرد، دوو ئەڵقە لە ئەڵقەکانی (المغفر)ی لەسەر ڕوومەتی گیربوو، وە کەوتە چاڵێك لەو چاڵانەی کە ئەبو عامر هەڵی کەندبوو بۆ ئەوەی موسوڵمانانی تێبکەون بێ ئەوەی ئاگاداربن، عەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ دەستی پێغەمبەری گرت و طەڵحەی کوڕی عوبەید لاشەی بەرز کردەوە تا هەستایەوە، مالیکی کوڕی سینان خوێنەکەی بەدەم و چاوی پێغەمبەرە وە هەڵمژی و پاشان (تفی کردەوە) و ڕۆی کرد...)[١٠٢٧]. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (کە ئەبو سەعیدی خودری خوێنەکەی هەڵمژیوە و پاکی کردەوەتەوە)[١٠٢٨].

---

(١٠٢٥) أخرجه: عبد الرزاق (٩٦٤٨)، والطبراني (الكبير) (٥٦٩٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٩٦)، فيه حفص وهو ضعيف.

(١٠٢٦) أخرجه عبد الرزاق (٩٦٥١) والبيهقي (الدلائل) (٢٦٥/٣) وهو مرسل.

(١٠٢٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣٢/٣) برقم (٦٠٨) وقال محققة: فيه ربيع بن عبد الرحمن قال البخاري: منكر الحديث.

(١٠٢٨) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٦٦/٣).

## ٤-لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو بەکری صدیقەوە ﷺ دەفەرموێت:

(... گەیشتینە لای پێغەمبەر ﷺ دانی شکا بوو وەدەم و چاوی بریندار کرا بوو وە دوو ئەڵقە لە ئەڵقەکانی (المغفر)ەکەی چوو بووە ناو ڕومەتی یەوە.. من ویستم لێی بکەمەوە، بەڵام ئەبو عوبەیدە سوێندی لێ خواردم کە وازی لێبهێنم، ئینجا ئەبو عوبەیدە هات و نەیویست بە دەستەکانی ڕایان بکێشێ نەوەك ئازار بگات بە پێغەمبەر، بۆیە قەپی لێ گرت بەدانەکانی و ئەڵقەیەکیانی دەرکرد و دانێکی کەوت... دواتر ئەڵقەکەی تریانی بە دانی ڕاکێشا و ئەو دانەی تریشی کەوت...)[١٠٢٩].

وەلە ڕیوایەتێکی تردا کە لاوازدا هاتووە (کە نوسیبەی کچی کەعبی مازنی کە ناسراوە بە دایکی عەمار پارێزگاری لە پێغەمبەر کرد لە جەنگی ئوحوددا تا لە زۆر لاوە بریندار کرا)[١٠٣٠]. بەڵام ڕاستە وایە کە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بە فریشتەکان پاراستووە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.....وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ......﴿٦٧﴾﴾ (المائدة).

ئەمەش بەڕوون و ئاشکرایی لە فەرموودەکەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصدا هاتووە کە فەرموویەتی: (لە جەنگی ئوحوددا چاوم کەوت بە دوو کەس کە پۆشاکی سپیان لەبەردا بوو یەکێکیان لای ڕاستی پێغەمبەرەوە بوو، ئەوی تریان لەلای چەپی یەوە بوو، زۆر بەتوندی دەجەنگان و پارێزگاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد وە (هەرگیز پێشتر ئەوانم نەدیبوو) وە دواتریش ئەوانم هەر نەدیەوە واتە: ئەو دوانە جبریل ﷵ و میکائیل ﷵ بوون[١٠٣١].

وە لە دوو ڕیوایەتی لاوازی تردا هاتووە کە خوای گەورە تیرو شمشێری موشریکەکانی لە پێغەمبەر ﷺ دوور خستۆتەوە.

---

(١٠٢٩) أخرجه: البزار (١٧٩١)، والطيالسي (٩٩/٢)، وابن حبان (٦٩٨٠) وقال محققه: إسناده ضعيف، وأخرجه أيضاً: الحاكم (٣٧٥/٣) وقال الذهبي: فيه متروك، وابن هشام (السيرة) (٣٢/٣)، والبيهقي في (الدلائل) (٢٦٣/٣)، وعبد الله بن أحمد (الفضائل) (٢٥٩) وقال محققة: إسناده ضعيف جداً.

(١٠٣٠) أخرجه: ابن سعد (٣٠٣/٨)، وابن هشام (السيرة) (٣٤/٣) عن الواقدي وهو متروك.

(١٠٣١) أخرجه: أحمد (١٤٦٨)، والبخاري (٤٠٥٤)، ومسلم (٢٣٠٦)، وابن حبان (٦٩٨٧).

### ١-ئیمامی زوهری ﷺ دەفەرموێت:

(خوای گەورە ڕوخساری پێغەمبەرەکەی پاراست لە حەفتا لێدان بە شمشێر لە جەنگی ئوحود دا)[١٠٣٢].

### ٢-نافیعی کوڕی جوبەیر ﷺ دەفەرموێ

(گوێم لە پیاوێکی موهاجرین بوو کە دەیوت: تەماشای تیری موشریکەکانم دەکرد دەبارینە سەر پێغەمبەر ﷺ کە لە ناوەڕاستیاندا بوو، کە خوای گەورە هەمووی لێ دوور دەخستەوە).

وە عەبدوڵڵای کوڕی شیهابم بینی کە موشریك بوو دەیوت لەو ڕۆژەدا محمدم نیشان دەن ڕزگارم نەبێت، گەر ئەو ڕزگاری ببێت، لە و کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لەلایەوە وەستا بوو، کە لێ تێپەڕ بوو صەفوان ڕەخنەی لێ گرت کە لە پەنایدا بوو بۆ هیچی لێ نەکرد، ئەویش سوێندی دەخوارد و دەیوت: والله نەم بینی سوێند ئەخۆم بە خوا کە ئەو لێمان پارێزراوە [١٠٣٣].

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ بەو هەموو برین و ماندوو بونەوە لە پاشەکشەکردنەکەیدا بەرەو ئوحود ویستی بەسەر بەردێکدا سەرکەوێت، بەڵام نەیتوانی چونکە دوو درعیشی لەبەردا بوو، تا طەڵحە پشتی بۆ دانەواندەوە و بەسەر پشتیدا سەرکەوت.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ویستی بەسەر بەردێکی شاخەکەدا سەرکەوێت، کە ویستی هەڵسێت نەی توانی، چونکە کەوتبووە ساڵەوە و دوو (درع)ی لەبەر دابوو، طەلحە (بە چۆکا کەوت) و بەرزی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ بەسەر پشتی طەلحەدا سەرکەوت بۆ سەر بەردەکەو زوبێر دەڵێت گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەی فەرموو: (أَوْجَبَ طلحةُ)[١٠٣٤] واتە بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو).

---

(١٠٣٢) أخرجه: عبدالرزاق (٩٧٣٦)، وقال الحافظ في (فتح الباري) (٤٧٣/٧): مرسلٌ قويٌ.

(١٠٣٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٦٤/٣) عن الواقدي في (المغازي) (٢٣٧/١) وهو متروك لا يحتج به.

(١٠٣٤) أنظر: سيرة ابن هشام (٤١/٣) برقم (٦٢٢) والحديث أخرجه:أحمد (١٦٥/١)، والترمزي (١٦٩٢)، وابن حبان (٦٩٧٩) وقال محققه: إسناده قوي، وابن أبي عاصم (السنة) (١٤٣٢) وقال محققه إسناده حسن، وإبويعلى (٦٧٠)، والحاكم (٢٥/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وعبد الله بن أحمد (فضائل الصحابة) (١٢٩٠) وقال محققه:إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني: (صحيح أبي داود) (٢٣٣٢)، و(المشكاة) (٦١١٢).

# دوا هێرشی موشریکەکان بۆ گرتنی بەرزایەکانی چیای ئوحود

دوای ئەو هەموو شەڕە، کۆمەڵێك لە هاوەڵە قارەمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بە چوار دەوری پێغەمبەردا کۆبوونەوە و بەرگرییەکی زۆریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئالەو کاتەدا موشریکەکان دوا هێرشی خۆیان ئەنجامدا بۆ گرتنی بەرزاییەکانی چیای ئوحود و پەلاماردانی موسوڵمانان لە پشتەوە:

عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (.... موسوڵمانان لەو حاڵەدا بوون شەیتان وەسوەسەی بۆ دەکردن و غەمباری دەکردن، کە بە بەرچاوی خۆیانەوە ئەو برایانەیان شەهید کران و باسی کوژراوەکانیان لە یەکتر دەپرسی لەو کاتەدا تەواو غەم و پەژارە دایگرتبوون، ئینجا خوای گەورە موشریکەکانی هێنانەوە سەر تا ئەو هەموو خەفەت و ناڕەحەتی یەیان لێ دوور بخاتەوە، لە ناکاودا تەماشایان کرد وا دوژمن لە سەریانەوە دەیانەوێت سەری چیاکەیان لێ بگرن ئالەو حاڵەدا هیچ غەم و خەفەتێکیان لەدڵدا نەما...

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللهم لَيْسَ لَهُمْ أن يَظْهَرُوا عَلَيْنا)) واتە: خوایە بۆیان نی یە ئەوانە بەرز بن بەسەرماندا پاشان دوعای کرد وهاوەڵانی هاندا بۆ پەلاماردانیان و خۆی و [(عومەری کوڕی خەطاب و تاقمێك لە موهاجرین] بۆیان سەرکەوتن بە شیوەکەدا تا گەیشتنە لای دوژمن و بەشەڕ هاتن لەگەڵیاندا تا ڕاویان نان و لەشاخەکە دایانبەزاننە خوارەوە)[١٠٣٥].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا دوعای دەکردو دەیفەرموو: ((اللَّهمَّ إنَّكَ إنْ تشَأْ لا تُعبَدْ في الأرضِ))[١٠٣٦] واتە: خوایە گەر ویستت لێ بێت ناپەرسترێیت لەزەوی دا).

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: (....پێغەمبەر ﷺ بەدوای هاوەڵانیدا بوو تەماشای کرد وا موشریکەکان لەسەر ڕێگاکەیانن، کەئەوانی بینی لە ڕوویاندان

(١٠٣٥) أخرجه: أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه الأناؤوط:إسناده حسن،والطبراني (الكبير) (١٠٧٣١)، والحاكم (٢٩٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن هشام (السيرة) (٤١/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٢٧١/٣).

(١٠٣٦) أخرجه: أحمد (١٥٢/٣)، ومسلم (١٧٤٣)، ابن حبان (٤٧/٧).

فەرمووی: ((اللهم إنْ تَشَأْ لا يُغلبكَ أحدٌ في الأرض. وقال: اللهم إنْ تَشَأْ لا تُعبد)) واتە: خوایە گەر ویستت لێ بێت کەس زاڵ نابێت بەسەر فەرمانتا لەسەر زەوی دا، خوایە گەر ویستت لێ بێت ناپەرسترێیت.

ئینجا موشریکەکان لێی دوور کەوتنەوەو پێغەمبەر ﷺ و کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی کە: (طەلحە و زوبەیر) یان تیادا بوو لە چوار دەوری پێغەمبەر ﷺ بوون و دەیان پاراست و بەرە و چیاکە کەوتبوونە ڕێ و لەگەڵ موشریکەکان بە جەنگ هاتبوون و هەموویان کوژران تەنها شەش یان حەوت کەس بە چواردەوری یەوە مابوونەوە[١٠٣٧].

ئالەم تەنگانە و نارەحەتی یانەدا خوای گەورە ڕاستی دووڕووەکانی خستە ڕوو، وە وەنەوزی نارده سەر باوەڕداران تا هێمن و ئارام ببنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾﴾ (آل عمران). واتە: خوای میهرەبان پاش ئەو خەم و خەفەتە قورسە، هێمنیی و ئاسوودەییەکی بۆناردن، خەوەنووچکەکەیان توش هات، هەندێکتانی گرتەوە و لەوخەم وخەفەتە حەوانەوە. دەستەیەکیش (دووڕووەکان) کە هەر خۆیانیان لا مەبەست بوو، لەخەوەنووچکەکە بێبەشبوون گومانی ناهەقیان بەخودا دەبرد وەکو گومانی سەردەمی جاهیلیەت و دەیانوت: ئایا ئێمە لەم کارە هیچمان هەیە؟ واتە: ئێمە بەزۆر هێنراوین، دەرنەدەچووین و ئەم حاڵەشمان تووش نەدەبوو پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر! ﷺ کەبێ گومان هەموو کارێك بەویستی خوایە، سەرکەوتن و سەرنەکەوتن. ئەوانە کاری نهێنی لەدڵ و دەروونیاندا دەشاردنەوە و لای تۆ دەرنیناخەن بۆ نموونە دەڵێن: ئەگەر ئێمە شتێکمان بەدەست بوایە، هەرگیز نەدەهاتین بۆ دەرەوەی مەدینە و لێرەیش بەکوشت نەدەچووین ئەی پێغەمبەر! ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لەماڵی خۆشتان بووبان و نەهاتنایە گۆڕەپانی جەنگەوە، هەمان ئەوانەی وا کوشتنیان لەسەر نووسراوە، دەهاتنە جێی تەخت بوونی لاشەیان

(١٠٣٧) أخرجه: البيهقي في (الكبرى) (١٣٥٦٣)، وفي (دلائل النبوة) (٢١١/٣).

و لەوێ مەرگیشیان تووش دەبوو، بۆیە خوا ئەو شتانەتان بەسەر دێنی، دەیەوێ دڵ ودەروونتان تاقی بکاتەوە، خواش لە ڕازو نیازی دڵەکان زانا و ئاگادارە.

ئەبو طەلحەی ئەنصاری ﷺ دەفەرموێت: (وەنەوزو خەو هەموومانی گرتبووەوە لە ڕیزەکانماندا لە جەنگی ئوحود [سەرم بەرز کردەوە.. و تەماشام کرد هەموو یەکێکمان بەملاو بەولادا دەکەوت بە هۆی ئەو وەنەوزەوە] [وە منیش یەکێك بووم لە وانەی کە ئەو وەنەوزەیان تووش هات، تا زۆر جار شمشێرەکەم لە دەست دەکەوتە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوە] [بەڵام کۆمەڵەکەی تر واتە دووڕووەکان تەنها هەر خەمی خۆیان بوو، چونکە ترسنۆك ترین و بێ دەسەڵات ترین کەسان بوون گومانی خراپیان دەبرد بە خوای گەورە وەك گومانی نەفامی لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکی زۆر بەگومان و دوودڵ بوون لە فەرمانەکانی خوای گەورە)[١٠٣٨].

زوبەیریش زیاتر هەڵوێستی مونافیقەکان ڕوون دەکاتەوە لەگەڵ وەنەوزی موسوڵمانەکان و دەفەرموێت: (دەت بینیم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم لە جەنگی ئوحوددا، کاتێك ترسێکی زۆر ڕووی تێ کردبووین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەنەوزو خەوێکی قورس دایگرتبووین، کەس نەما بوو لە ئێمە ملی لەسەر سنگی نەبێت. واتە هەموو سەریان بەلادا کەوتبوو لە خەودا، بەڵام سوێند بە خوا لەو کاتەدا وەك خەو گوێم لە وتەکەی موعتیبی کوڕی قوشەیری مونافق بوو کە دەیوت: ئەگەر ئێمە شتمان بەدەست بوایە ئا لێرەدا نەدەکوژراین. من ئەم قسەیەم لە یاد بوو تا خوای گەورە ئەمەی ڕوون کردەوەو فەرمووی: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٥٤﴾ (آل عمران))[١٠٣٩].

---

(١٠٣٨) أخرجه: أحمد (٢٩/٤)، والبخاري (٤٠٦٨،٤٥٦٢)، والترمذي (٣٠٠٧-٣٠٠٨)،والطبراني (الكبير) (٤٧٠٠)، وابن حبان (٧١٨٠)، والحاكم (٢٩٧/٢) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي والبيهقي (٢٧٢/٣).

(١٠٣٩) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢٧٣/٣)، والحافظ في (المطالب العالية) (٤٢٥٩)، والبوصيري في (اتحاف الخيرة) (٦٢٤٥)، وقال ابراهيم العلي في (صحيح السيرة) (٣٦٩): إسناده جيّد.

## شێواندن و هەتککردنی لاشەی شەهیدەکان

موشریکەکان دوای ئەوەی لەلایەن موسوڵمانەکانەوە پەلامار دران، لەشاخەکە هێنرانە خوارەوە، و هیچ ئومێدێکیان بەوە نەما شاخەکەیان لێبگرن و لەناویان بەرن، ئینجا کەوتنە هەتککردن و شێواندنی لاشەی شەهیدەکانی موسوڵمانان و تورەیی و قینی خۆیان بەوان دەرِشت، وەك عورووەی کوڕی زوبەیر و موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموون: (..... موشریکەکان لە شاخەکە گەڕانەوە و کەوتنە هەتك کردن و شێواندنی کوژراوەکانی موسوڵمانان، گوێ و لووت و دامێنیان دەبڕین، و سکیان هەڵدەدڕین، وایان دەزانی کە پێغەمبەر ﷺ و گەورە هاوەڵانیان لە ناو بردوون)[١٠٤٠].

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (ئینجا هیندی کچی عوتبەش لەگەڵ ئەو ژنانەی کە لەگەڵی دابوو کەوتنە هەتك کردنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و گوێ و لووتیان دەبڕین، و تا هیند چەند ملوانکە و پاوانەی دروست کرد لە گوێ و لوتی بڕاوی شەهیدەکان و ملوانکە و گوارە و پاوانە ئاڵتونەکەی خۆیدایە وەحشی، وە سکی حەمزەی هەڵدڕی و جگەری دەرهێنا و پارچەیەکی بە دان لێ کردەوەو جووی، بەڵام نەیتوانی قوتی بدات بۆیە فڕێی داو تفی کردەوە)[١٠٤١]. ئەمەش بەهۆی ئەوە وە بوو کە هیند نەزری کردبوو کە دەبێت لە جگەری حەمزە بخوات، وەك عورووەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (...وەحشی لەگەڵ هینددا بوو سکی حەمزەی بۆ هەڵدڕی و جگەرەکەی دایە، چونکە هیند ئەمەی نەزر کردبوو لەسەر خۆی، لەدوای ئەوەی کە حەمزە باوکی کوشت لە جەنگی بەدردا)[١٠٤٢].

وە سەعدیش ﷺ گوێ و لوتی عەبدوڵلای کوڕی جەحشی بینی بەدەست موشریکەکانەوە، ئەوجا زانی کە بەڕاستی دوعاکەی کە لە پێشی شەڕەکەدا هەردووکیان

---

(١٠٤٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٢٧٢،٢٠٦).

(١٠٤١) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٤٧) برقم (٦٣٢)، وقد ورد ذلك من حديث ابن مسعود أخرجه: أحمد (٤٤١٤) وقال الارناؤوط:حسنٌ لغيره وقال في تخريج (زاد المعاد) (١/٥٠٣): إسناده صحيح، وصححه العدوي في (فضائل الصحابة) (ص:١٩١) عن طريق ابن سعد في (الطبقات) (٣/١/٦).

(١٠٤٢) أخرجه البيهقي (الدلائل) (٣/٢٨٢).

کردیان قەبوڵ بووە، سەعد دەفەرموێت: (عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لە سەرەتای شەڕەکەدا دوعای کرد و وتی: خوایە ڕووبەڕووی پیاوێکی موشریکی پڕ چەکی زۆر بە توانام بکەیت تا لە پێناوی تۆدا لەگەڵیدا بجەنگێم، و پاشان بمکوژێت و گوێ و لووتم لێ بکاتەوە، بۆ ئەوەی کە سبەینێ پێت گەیشتم پێم بڵێیت: کێ لووت و گوێچکەی بڕیت؟ منیش بڵێم: لە پێناوی تۆدا وە لە پێناوی پێغەمبەرەکەتدا ﷺ، تۆش دەڵێیت: ڕاستت کرد.

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە دواییدا بۆ کوڕەکەی دەگێڕایەوەو دەیوت: کوڕی خۆم بەڕاستی دوعاکەی عەبدوڵڵا لە دوعاکەی من باشتر بوو لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا بینیم هەردوو گوێی و لووتی بە پەتێکەوە هەڵواسرابوو بە دەستی یەکێکەوە بوون لە موشریکەکان)[١٠٤٣].

## شانازی کردنی ئەبو سوفیان دوای تەواو بوونی جەنگەکە

لە دوای تەواو بوونی جەنگەکە ئەبو سوفیان بەشانازییەوە وەستاو، قسەی لەگەڵ ئەو موسوڵمانانە کرد کە مابوونەوە لەسەر شاخەکەو گاڵتەی پێ کردن، موسوڵمانەکانیش سەرەتا وەڵامیان نەدایەوە، تا ئەبو سوفیان خۆبەزل زانینی نیشان دا، پاشان ئازایانە وەڵامیان دایەوە تاتوڕە و ناڕەحەتیان کرد، ئەم بەسەر هاتەش لە چەندەها ڕیوایەتدا هاتووە دوای کۆکردنەوەیان و ڕێکخستنیان بەم جۆرە دەبێت:

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەفەرموێت: ([ئەبو سوفیان چووە سەر بەرزاییەکی][١٠٤٤] [خواری شاخەکەو هاواری دەکرد][١٠٤٥] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە [ئەمە لەشەودا بوو][١٠٤٦] هاواری دەکرد و دەیوت: ئایا موحەممەدتان لەناو دایە؟ ئەمەی سێ جار دووبارە

---

(١٠٤٣) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٢٥/١١)، والحاكم (٧٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وأبونعيم (الحلية) (١٠٩/١)، والبيهقي (الكبرى) (٣٠٧/٦)،وابن سعد (٦٣/٣)،وقال الحافظ العرقي في (تخريج الأحياء) (٣٢١/٤) إسناده جيد،وقال الحافظ في (الفتح) (٢٤٨/٦):أخرجه الحاكم والبيهقي بإسناد صحيح،وقال الهيثمي (المجمع) (١٥٦٥٣):رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح واللفظ للحاكم والطبراني.

(١٠٤٤) أخرجه:ابن حبان (٤٧٣٨) وقال محققه: إسناد صحيح على شرط البخاري.

(١٠٤٥) أخرجه: أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه: إسناد حسن، وصححه الشيخ الألباني في (تخريج فقه السيرة) (ص:٧٩).

(١٠٤٦) أخرجه: النسائي في (الكبرى) برقم (٨٦٣٥)، (وهوضعيف).

کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، پاشان ئەبو سوفیان وتی: ئایا کوڕەکەی ئەبو قوحافەتان تێدایە (واتە: ئەبو بەکری صدیق)؟ ئەمەشی سێ جار دووبارە کردەوە، و دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی وەڵامی مەدەنەوە، پاشان وتی: ئایا کوڕەکەی خەطابتان تێدایە [واتە عومەر]؟ ئەمەشی سێ بارەکردەوە، و دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی وەڵامی مەدەنەوە، پاشان ئەبو سوفیان [ئاوڕی دایەوە بەلای سوپاکەیدا] وتی: ئەوانە کوژراون [گەر زیندوو بوونایە وەڵامیان دەدایەوە] لەو کاتەدا عومەریش خۆی پێ نەگیراو وتی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا ئەوانەی تۆ ناوت هێنان هەر هەموویان زیندوون، و ئەوەندەت بۆ ماوەتەوە ناڕەحەتت بکەن، ئەبو سوفیان وتی: کوڕەکەی خەطاب کارێکی باشمان بەسەر هێنان ئەی کوا موحەمەد، ئەی کوا ئەبو بەکر؟ عومەریش وتی: ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەش ئەبو بەکرە ئەمەش منم، ئەبو سفیان وتی: ئەم ڕۆژە بەڕۆژی بەدر و شەڕیش هەر جارەی یەکێك تیایدا سەرکەوت و دەبێت [ڕۆژێك سەرکەوتن بۆ ئێمە دەبێت، ڕۆژێکیش سەرکەوتن بۆ بەرامبەرەکەمان دەبێت، ڕۆژێك کامەران دەبین، وە ڕۆژێك خەفەت بار دەبین فلان کوژراوتان بە فلانە کوژراومان وە فلان کەس بە فلان کەس][١٠٤٧] [وە ئەمڕۆش بە ڕۆژی بەدر][١٠٤٨].

عومەریش وتی: [وەك یەك نین کوژراوەکانمان لە بەهەشتدایەو کوژراوەکانتان لە دۆزەخ دایە] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە [پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەك یەك نین کوژراوەکانمان زیندوون ڕۆزی دەدرێن بەڵام کوژراوەکانتان لە ئاگردا سزا دەدرێن][١٠٤٩].

[ئەبو سوفیان وتی: ئێوە وا دەڵێن گەر بەقسەی ئێوە بێت بەڕاستی زەرەرمەند و ڕیسوا بووین][١٠٥٠] بەڵام ئێوە دەبینن کوژراوەکانتان هەتك کراون من فەرمانم بەو کارە نەکردووە و پێشم ناخۆش نەبووە [و ئەوەش لەبەر فەرمانی گەورەکانمان نەبووە] [وە منیش نە فەرمانم پێ کردوون بەو کارە، وە نە ڕێگەشم لێ گرتوون، وە

(١٠٤٧) أخرجه: أحمد (٤٤١٤) وقال محققه الأرناؤوط: حسن لغيره، وأخرجه: ابن سعد (١٦/٣)، وابن أبي شيبه (٤٠٢/١٤).

(١٠٤٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٠٧٣١) وقال الهيثمي (المجمع) (١١١/٦):فيه عبد الرحمن ابن أبي زناد وقد وثق على ضعفه.

(١٠٤٩) نفس المصدر السابق.

(١٠٥٠) أخرجه: أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن.

ئەو کارەم نەویستوە و پێشم ناخۆش نەبووە] [پاشان ئەبو سوفیان توورەیی و فیزی نەفامی گرتی وتی: ئەوەش ڕوویداو پێشمان ناخۆش نەبوو]، ئینجا دەیوت: بەرز بێت هوبەل بەرز بێت هوبەل.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆ وەڵامی نادەنەوە))؟ وتیان چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((بڵێن خوا بەرزترو بە شکۆترە))، ئینجا ئەبو سوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیە و عوزا بۆ ئێوە نی یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆ وەڵامی نادەنەوە))؟ وتیان چی بڵێین ئەی پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((بڵێن (الله) پشت گیرمانەو ئێوە پشت گیرتان نی یە))[1051].

پاشان ئەبو سوفیان وتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئەی عومەر ئایا موحەمەدمان کووشتووە؟ عومەریش وتی: نەخێر خوا ئاگادارە ئێستا ئەو قسەکانت دەبیستێت. ئەبو سوفیان وتی: هەواڵی تۆ بە ڕاست ترو چاك تر دەزانم تا ئیبنو قومەئە.. کاتێك ئەبو سوفیان و سوپاکەی خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە و بەڕێ کەوتن، ئەبو سفیان هاواری کرد: ساڵی ئاینده لەبەدر پێتان دەگەینەوە، پێغەمبەریش ﷺ بە یەکێك لە هاوەڵانی فەرموو: کە پێی بڵێت (بەڵێ ئەوە بەڵێن بێت لە نێوان ئێمە و ئێوە دا)[1052].

## گەڕانەوەی سوپای موشریکەکان

سوپای موشریکەکان گەڕانەوە بەرەو شاری مەککە، پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی نارد بە دوایاندا بۆ چاودێری کردنیان، ترساندنیان تا بیر لە گەڕانەوە نەکەنەوە بۆ پەلاماردانی شاری مەدینە.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (.... دوای ئەو کارەساتەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی تووشی هاتن لەئوحود سوپای موشریکەکان گەڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ ترسا لە گەڕانەوەیان دووبارە بۆیە بەهاوەڵانی فەرموو: ((مَن يذهَبُ في أثَرِهم؟)) واتە: کێ

(١٠٥١) أخرجه: البخاري (٤٠٤٣،٣٠٣٩)، وعبد الرزاق (٩٧٣٥)، أحمد (٢٦٠٩) وقال محققه:إسناده حسن، والحاكم (٢٩٦/٢) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢٦٩/٣).

(١٠٥٢) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٥/٣)، وعن موسى بن عقبة و (٢٨٢/٣) عن عروة بن زبير وإبن هشام (السيرة) (٥٠/٣) (٦٣٤).

بەدوایاندا دەڕوات؟ حەفتا پیاو لە موسوڵمانان کە ئەبو بەکرو زوبەیریان لەناودا بوو ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ ئەو کارە و پێغەمبەر ﷺ ئەوانی نارد بەدوای سوپای موشریکەکاندا ڕۆیشتن)[١٠٥٣].

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبەیر وردەکاری پاشەکشەی موشریکەکان، دواتریش ناردنی سەعد بەشوێن پێیاندا ڕوون دەکەنەوەو دەفەرموون: (موشریکەکان زانییان کە پێغەمبەر ﷺ زیندووە، وە هاواریان لە هەندێ لە گەورە پیاوانی هاوەڵانی کردو زانیان ئەوانیش هەر زیندوون، ئەو کات خوا بێ هیوای کردن و گەڕانە بۆ لای شوێن چادرەکانیان، موسوڵمانان نەیاندەزانی موشریکەکان بەنیازن بەرەو کوێ بچن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەوانتان بینی سواری پشتی ئەسپەکانیان بوون و وشترەکانیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا، ئەوە دەیانەوێ نزیك ببنەوە لە خانوو قەڵاکانی مەدینە کەژن و منداڵەکانمانی تێدایە، سوێن بە خوا گەر بەو کارە هەستن بەشەڕ دێم لە گەڵیاندا لەناو شاری مەدینەدا، وە ئەگەر ئەوان سواری پشتی وشترەکانیان بوون و ئەسپەکانیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا ئەوە دەیانەوێ ڕاکەن و دەرباز بن)).

سوپای موشریکەکان کە پشتیان کردە موسوڵمانان و بەڕێ کەوتن وگەڕانەوە، پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی بە شوێن پێیاندا نارد و فەرمووی: ((هەواڵی ئەوانمان بۆ بزانە)) سەعد خێرا بە دوایاندا ڕۆیشتوو و هەواڵی زانین و پاشان گەڕایەوە وتی: ئەوانم بینی سواری پشتی وشترەکانیان بوو بوون و دەڕۆیشتن، ئەسپەکانیشیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا. ئەو جا موسوڵمانان دڵیان خۆش بوو بەڕۆیشتنی دوژمن)[١٠٥٤].

پاشان پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، ئیبنو هیشام دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە دوای شەڕی ئوحود نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن بە دانیشتنانەوە بە هۆی برینداربوونی، موسوڵمانانیش هەموویان بە دانیشتنەوە لە دوای پێغەمبەرەوە

---

(١٠٥٣) أخرجه:البخاري (٤٠٧٧).

(١٠٥٤) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/ ٢١٣، ٢٨٢) موصولًا، وهو الراجح، وقد روى ابن اسحاق بغير إسناد ان الذي بعثه هو (على بن ابي طالب) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٥١/٣) وهو ضعيفٌ و(التأريخ) لطبري (٥٢٧/٢) وهو ضعيف ومفعل.

ﷺ نوێژیان کرد)[١٠٥٥].

لەپاش تەواو بوونی شەڕەکە ژنانی ناو شاری مەدینە خواردن و نان و ئاویان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەهێنا، موسای کوڕی عوقبەو عورەی کوڕی زوبەیر دەفەرموون: (ژنانی موهاجرین و ئەنصار ئاو و خواردنیان بە شان هەڵگرتبوو فاطمەی کچی پێغەمبەریان ﷺ لە ناو دابوو (دەیان هێنا بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆ شوێن شەڕەکەی ئوحود))[١٠٥٦].

عومەری کوڕی خەطابیش دەفەرموێت: (ئوم سولەیط یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کە گۆزەی پڕ ئاوی بەشان بۆ دەهێنایین لە ڕۆژی ئوحود دا)[١٠٥٧]. (حەمنەی کچی جەحشیش ئاوی دەدایە تینووەکان و برینداراەکانمانی تیمار دەکرد)[١٠٥٨].

ئەنەسیش ﷺ دەفەرموێت: (بینیم عائیشەی کچی ئەبو بەکر و ئوم سولەیم... گۆزەی پڕ ئاویان دەهێنا بەسەر شان و دەیاندا بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، و پاشان دەگەڕانەوە و پڕ ئاویان دەکردەوەو دەیان هێنایەوەو دەیاندا بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ)[١٠٥٩].

وە فاطمەی کچی پێغەمبەریش ﷺ لەناو ئەو ژنانەدا بوو، کاتێك هات و بینی دەم و چاوی باوکی خوێناوییە و خوێنەکەی بۆ سڕی، موسای کوڕی عوقبە و عوروە دەفەرموون: (فاطمەش لەناو ئەو ژنانەدا بوو، کاتێك باوکی بەو هەموو خوێنەوە بینی باوەشی پیا کرد و دەستی کردە ملی و خوێنەکەی بە ڕوخساری یەوە دەسڕی، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ علَى قَوْمٍ دَمَّوْا وجْهَ رَسُول اللهِ ﷺ ، واشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ علَى رجل قَتَلَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ)) واتە: تووڕەیی خوا توند تر بووە لەسەر کەسانێك کە ڕوخساری پێغەمبەرەکەیان خوێناوی کردووە، تووڕەیی خوا توند تربووە لەسەر پیاوێك کە بەدەستی پێغەمبەری خوا ﷺ کوژرا بێ.

---

(١٠٥٥) أنظر: (السيرة) لإبن هشام (٤٢/٣) برقم (٦٢٤) وفيه عمر مولى غفره وهو ضعيف كما في (التقريب) (٥٩/٢).

(١٠٥٦) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٤/٣، ٢٨٣).

(١٠٥٧) أخرجه: البخاري (٤٠٧١).

(١٠٥٨) أخرخه: ابو يعلى (المسند) (٧٦٢)، وقال الهيثمي (المقصد العلى) (٨٠/١): رجاله رجال الصحيح.

(١٠٥٩) أخرجه: البخاري (٧٨/٦) (٣٨١١)، ومسلم شرح النووي (١٨٩/١٢).

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەفەرموێت: پاشان پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فإنَّهُمْ لا يَعْلَمُونَ)). واتە: (خوایە لە خزمەکانم خۆش ببە ئەوانە نەزانن)[١٠٦٠].

ئەم باسەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ و وەستاندنی خوێنی برینەکانی ڕوخساری باوکی بەڕێزی ﷺ لە سێ فەرموودەی تردا بە ڕوون و ئاشکرا تر هاتووە:

### ١-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەفەرموێت:

(کاتێك موشریکەکان شەڕگەکەیان بەجێ هێشت و لە موسوڵمانان دوور کەوتنەوە (و گەڕانەوە بۆ مەککە) ئەو کات ژنان بەهاناو فریاکەوتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی یەوە چوون، و فاطیمەی کچی پێغەمبەریشیان ﷺ لەناودا بوو، کە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت دەستی کردە ملی و جێگەی برینەکانی (ڕوخساری) بەئاو دەشۆرد، بەڵام زیاتر خوێنی لێ دەهات، کە ئەمەی بینی پارچەیەکی لە حەسیرەکەی کردەوەو سوتاندی و (سوتوەکەی) کردە سەر برینەکان و خوێنەکەی وەستانەوە)[١٠٦١].

### ٢-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دیسان دەفەرموێت:

(دەم و چاوی پێغەمبەر ﷺ بریندار کراو دانی شکاو کڵاوە ئاسنەکەشی لە سەردا شکا.... فاطیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ هات و جێ خوێناوییەکەی دەشۆرد، عەلی کوڕی ئەبو طالبیش ﷺ بە قەڵغانەکەی ئاوی دەهێناو دەیکرد بەدەستی فاطیمەدا بۆ شۆردنی برینەکە، فاطیمە کە بینی ئاوەکە خوێنەکە زیاد دەکات پارچەیەك لەحەسیرێکی (کۆنی) هێنا و سوتاندی، تا بوو بە سوتوو پاشان لکاندی بە برینەکەوە و خوێنەکەی وەستایەوە)[١٠٦٢].

### ٣-زوبەیر ﷺ دەفەرموێت:

(..... پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب ﷺ کرد کە بچێت ئاوی بۆ بهێنێت لە (المهراس) [واتە: ئەو چاڵەی کە ئاوی بارانی تیا کۆدەبێتەوە]، عەلی چوو لە قەڵغانەکەیدا هەندێ ئاوی بۆ هێنا، پێغەمبەریش ﷺ ویستی لێی بخواتەوە بەڵام بۆنێکی لێ دەهات بۆیە لێی گەڕاو فاتیمەش خوێنەکەی دەم و

(١٠٦٠) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٤،٢٨٣/٣)

(١٠٦١) أخرجه: الطبراني (المعجم الكبير) (٥٨٢٣).

(١٠٦٢) أخرجه:البخاري (٤٠٧٥)، ومسلم (١٧٩٠)، وابن ماجه (٣٤٦٠) واللفظ لمسلم والزيادة لابن ماجه.

چاوی پێ شۆرد، و پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ((اشتَدَّ غضَبُ اللهِ على مَن دمَّى وجهَ رسولِ اللهِ ﷺ))[١٠٦٣] واتە: (توڕەیی خوا توند تر بووە لەسەر کەسانێك کە دەم و چاوی پێغەمبەری خوایان خوێناوی کردووە).

لەوێدا پێغەمبەر ﷺ شایەتی باشی بۆ هەندێك لە هاوەڵانیدا بۆ ئەو ڕۆڵەی کە هەیان بوو لە جەنگەکەدا، موسای کوڕی عوقبەو عوروەی کوڕی زوبەیر دەفەرموون: (....عەلی ﷺ شمشێرەکەی خوێناوی بوو بوو دایە دەست فاطیمەو وتی: بگرە ئەم شمشێرە بەڕاستی خراپ نەبوو، پێغەمبەریش ﷺ کە ئەوەی بینی فەرمووی: ((گەر تۆ شەڕی باشت کردبێت بەڕاستی عاصمی کوڕی ثابت و حاسی کوڕی صومە و سەهلی کوڕی حونەیفیش شەڕێکی باشیان کرد)). پاشان فەرمووی: ((پێم بڵێن خەڵکی چی یان بەسەر هات و بۆ کوێ چوون.... بەڵام موشریکەکان هەرگیز جارێکی تر ناتوانن زیانی وامان پێ بگەیەنن (ئێمە چۆکیان پێ دادەدەین))[١٠٦٤].

ئیبنو عەباس ﷺ لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێت: (عەلی شمشێرەکەی هێنا خوار بوو بوو، دایە دەست فاتیمەو وتی بگرە ئەو شمشێرە سوپاس کراوە، بەڕاستی داخی لە دڵمدا نەهێشت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((گەر تۆ شەڕی باشت بە شمشێرەکەت کردبێت، بەڕاستی سەهلی کوڕی حونەیف و ئەبو دوجانەو عاصمی کوڕی ثابت و حاسی کوڕی ئەلصومەش شەڕی باشیان کرد)))[١٠٦٥].

## بەسەرکردنەوەی کوژراو و بریندارەکان

پاشان پێغەمبەر ﷺ لە شاخەکە لەگەڵ هاوەڵانی هاتە خوارەوە، هەموو بەشداربووانی شەڕەکە گەڕانەوە گۆڕەپانی شەڕگەکە بۆ بەسەر کردنەوەی بریندارو کوژراوەکان.

---

(١٠٦٣) أخرجه: أحمد (١٦٥/٣) وعبدالله بن أحمد (الفضائل) (١٢٩٠)، البخاري (٤٠٧٦)، والترمذي (١٦٩٢)، والحاكم (٣٧٣/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٦٩٧٩) وقال محققه: إسناده حسن، وقال البوصيري (اتحاف الخيرة (٦٢٤٦): إسناده صحيح، واللفظ لابن حبان.

(١٠٦٤) أنظر: (الدلائل النبوة) للبيهقي (٢١٤/٣، ٢٨٢).

(١٠٦٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (٥٥٦٤، ١١٦٤٤)، والحاكم (٣/ ٢٠٤) وصححه على شرط البخاري ووافقه الذهبي، وابن هشام (السيرة) (٦١/٣)، وقال الهيثمي (المجمع) (١١٦/٦):رجاله رجال الصحيح.

پێغەمبەر ﷺ سەرەتا تێپەڕی بەلای عەمری کوڕی جەموحی قاچ شەل و بینی بە شەهیدی وا لاشەکەی کەوتووە فەرمووی: ((أنِّي أنظرُ إليك تمشي برجْلِك هذه صحيحةً في الجنَّةِ))[١٠٦٦] واتە: دەڵێت لەبەر چاومی وا تەماشات دەکەم بەم قاچەت بە ساغی دەڕۆیت بەناو بەهەشتدا).

پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ بوو بەلای لاشەی موصعەبی کوڕی عومەیردا بە شەهیدی ئەبو هورەیرە ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لەکاتی گەڕانەوەی لە ئوحود تێپەڕ بوو بەلای موصعەبی کوڕی عومەیردا شەهید بوو بوو لەسەر لاشەکەی وەستا، دوعای بۆ کرد و پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ٢٣ ﴾ (الأحزاب))[١٠٦٧]. واتە: لە نێوان ئیمانداران، پیاوانێك هەن ئەو پەیمانەی داویانە بەخودا راستگۆیانە لەسەر ژیان، هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردووە ومردووە، هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەك گۆران و لاری رووی تێنەکردوون.

. هەروەها پێغەمبەر ﷺ چوو بەلای لاشەی حەمزەی مامی دا، کە چۆن شەهید کرابوو هەردوو گوێی بڕا بوو وەلاشەکەی شێوێنرا بوو. ئەنەس ﵁ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحوددا تێپەری بەلای حەمزەدا، بینی هەردوو گوێی بڕرا بوو وەلاشەی شێوێنرا بوو فەرمووی: ((لولَا أنْ تَجِدَ صفِيَّةُ فِي نفسِها ! تركتُهُ حتَّى تأكُلُه العافِيَةُ ، حتى يَحْشُرَهُ اللهُ مِنْ بطونِ الطَّيْرِ والسباعِ)) واتە: گەر لەبەر ئەوە نەبێت کە صەفیە (واتە خوشکەکەی) ناڕەحەت دەبێت، ئەوا لێی دەگەڕام تا (باڵندەو دڕندەکان) جەستەیان دەخوارد تا خوای گەورە کۆی دەکردەوە لەناو سکی باڵندەو دڕندەکان)[١٠٦٨].

---

(١٠٦٦) أخرجه: أحمد (٢٢٥٥٣) وقال محققه: إسناده حسن، وصححه الشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٢٨٢).

(١٠٦٧) أخرجه: الحاكم (٢٠٠/٣) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٢٨٤/٣) وقال ابن كثير في (البداية) (٤٥/٤): حديث غريب، وفي روايه أخرى: عمر ﵁ قال (نظر رسول الله ﷺ إلى مصعب بن عمير مُقبيلاً وعليه إهاب كبشٍ قد نتطق به، فقال رسول الله ﷺ: ((أنظروا إلى هذا الرجل الذي نوَّر اللهُ قلبه، لقد رأيتهُ بين أبويهِ يغدواونهِ باطيب الطعام و الشراب فدعا حبُ الله و رسولهِ إلى ماترون)). أخرجه: أبو نعيم (الحلية) (٧٩/٦)، وقال الحافظ العراقي في تخريج (الأحياء) (٢٨٧/٤): إسناده حسن.

(١٠٦٨) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٤٤/٣)، وأبو داود (٣١٣٦)،والحاكم (١٩٦/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني (حمه الله) في (صحيح ابي داود) (٣٦٨٩)، و (السلسلة الضعيفة) (٢٨/٢).

له ڕیوایەتێکی تردا زوبەیر ﷺ دەفەرمویێت: (لەدوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود، ئافرەتێك بە ڕاکردن هات تا نزیك بوو بچێتە سەر کوژراوەکان پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبوو، کە چاوی پێیان بکەوێت بۆیە فەرمووی: (ئەو ئافرەتە، ئەو ئافرەتە) زوبەیر ﷺ دەفەرمویێت: هەر لە دوورەوە ناسیمەوە کە ئەوە صەفیەی دایکمە، پێش ئەوەی بگاتە سەر کوژراوەکان، پێشم لێ گرت، بەڵام ئەو ئافرەتێکی بەهێز بوو بە دەستی یەك چەپۆکیدا بەسەر سنگما و پێی وتم دوور کەوەرەوە لێم هەی زەوی نەتگرێتە، خۆ منیش وتم: پێغەمبەر ﷺ ئەمەی لێ داوا کردوویت، ئینجا وەستاو دوو پۆشاکی دەرهێنا و وتی هەواڵی کوژرانی حەمزەی برام پێ گەیشتووە و ئەم دوو پۆشاکەم هێناوە تا بیکەنە (کفن) بۆی)[١٠٦٩]. سەبارەت بەم باسە دوو ڕیوایەتی تر هەن بەڵام لاوازن:

### ١-لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی:

(تەماشای حەمزەیان کرد سکی هەڵدڕا بوو، وە هیند پارچەیەك لە جگەرەکەی لێ کردبووەوە، بەڵام نەیتوانی بوو بیجوێ و فڕێیدا بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا هیچی لێ خواردووە؟)) وتیان نەخێر فەرمووی: ((حەمزە هیچ شوێنێکی ناچێتە ناو ئاگرەوە)))[١٠٧٠].

### ٢- لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی:

(پێغەمبەر ﷺ وەستا لەسەر لاشەی حەمزە لەو جێگەیەی کە تێیدا شەهید بوو بوو بینی کە هەر دوو گوێ و لووتی بڕرا بوو وە لاشەکەی شێوێنرا بوو، تەماشای ئەمەی دەکرد، کە لە ژیانیدا تەماشای شتێکی وا دڵتەزێنی نەکردبوو، فەرمووی: ((رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ ، فَقَدْ كُنْتَ وَصُولا لِلرَّحِمِ ، فَعُولا لِلْخَيْرَاتِ ، وَلَوْلا حُزْنُ مَنْ بَعْدَكَ عَلَيْكَ لَسَرَّنِي أَنْ أَدَعَكَ حَتَّى تَجِيءَ مِنْ أَفْوَاجٍ شَتَّى....))[١٠٧١] واتە: بەزەیی خوات لەسەر بێت، بەڕاستی خزم و کەس و کارت بەسەر دەکردەوە، چاکەکار بوویت بۆ هەموو کارێکی چاکە،

(١٠٦٩) أخرجه: أحمد (المسند) (١٤١٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، والبزار (١٧٩٧، ٩٨٠)،و ابو يعلى (٦٨٦)، والبيهقي (الكبرى) (٤٠١/٣).

(١٠٧٠) أخرجه: أحمد (المسند) (٤٤١٤) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف والحديث حسن لغيره.

(١٠٧١) أخرجه: ابن سعد (١٣/٣)، والطبراني (الكبير) (١٠٦/٣)، والحاكم (١٩٧/٣) وضعفه الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٥٥٠).

گەر دڵگرانی کەسانی دوای خۆت نەبێت پێم خۆش بوو لێت گەڕێم تا لەچەند جێگەیەکی جیاوە کۆ دەکرایتەوە).

ئەنصاریەکان ﷺ بڕیاریاندا تۆڵە بۆ کوژراوەکانیان بکەنەوە کە سووکایەتی یان پێ کرابوو وە لاشەکانیان شێوێنرا بوو، ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەفەرموێت: (لە جەنگی ئوحوددا شەست و چوار کەس لە ئەنصارو شەش کەس لە موهاجرین کە حەمزەیان لەناودا بوو کوژرا بوون، و سوکایەتی بە لاشەکانیان کرا بوو، بۆیە ئەنصار وتیان: گەر بکەونە ژێر دەستمان تۆڵەی ئەمانیان لێ دەکەینەوە، کاتێك ڕۆژی ئازاد کردنی شاری مەککە هاتە پێش ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾﴾ (النحل) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نصبر ولا نعاقب))[١٠٧٢] واتە: ئارام دەگرین و تۆڵەیان لێ ناکەینەوە). پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كفُّوا عنِ القومِ إلاَّ أربعةً))[١٠٧٣] واتە: لە هەموویان گەڕێن تەنها چوار کەسیان نەبێت).

پێغەمبەر ﷺ مژدەیدا کە حەنظلە و حەمزە فریشتەکان شۆردویانن. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّ صاحبَكم حَنظلةَ تغسِلُه الملائكةُ فسَلُوا صاحبتَه)) واتە: حەنظلەی هاوڕێتان فریشتە دەیشوات، پرسیار لە هاوسەرەکەی بکەن، هاوسەرەکەشی وتی: حەنظلە لەشی گران بوو هەر کە گوێی لە خۆ ئامادەکردن بوو بۆ جەنگ چووە دەرەوەو خۆی نەشۆرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەبەر ئەوە بووە کە فریشتە شۆردوویانە)))[١٠٧٤].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك حەمزەی کوڕی عەبدولموطلب و حەنظلە کوژران هەردووکیان لەش گران بوون، پێغەمبەر ﷺ

---

(١٠٧٢) أخرجه: أحمد (١٣٥/٥)، ووصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٣٧٧).

(١٠٧٣) أخرجه: أحمد (٢١٢٣٠) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، والترمذي (١٣٣/٤)، والحاكم (٣٥٩/٢) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٨٧) وقال محققه: إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (٢٩/٢).

(١٠٧٤) أخرجه: الحاكم (٢٠٤/٣) وصححه، وابن حبان (٧٠٢٥) وقال محققه: حديث صحيح، وحسنه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٦).

فەرمووی: ((رأيتُ الملائكةَ تُغَسلُ حمزةَ بنَ عبدِ المطلبِ، وحنظلةَ بنَ الراهبِ))[١٠٧٥]. واتە: بینیم فریشتە حەمزەی کوڕی عەبدولموطلیب و حەنظلەی کوڕی ڕاهبیان دەشۆرد).

لەو بەسەر کردنەوەدا پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە حاڵی سەعدی کوڕی ڕەبیع کرد و پیاوێکی بۆ ئەو مەبەستە نارد، زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا منی نارد بۆ هەواڵ زانینی سەعدی کوڕی ڕەبیع و فەرمووی: ((إن رأيتَهُ فأقرِئهُ منِّي السَّلامَ وقل لَهُ يقولُ لَكَ رسولُ اللَّهِ كيفَ تجدُكَ؟)) واتە: ئەگەر سەعدت بینی سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ پێغەمبەر پێت دەڵێت ئێستا حاڵت چۆنە؟ زەید دەڵێت بەناو کوژراوەکاندا گەڕام تا دیمەوە لە ئاخر هەناسەدا بوو، جێی حەفتا لێدانی شمێر و ڕم و تیری پێوە بوو، وە پێم وت سەعد پێغەمبەر ﷺ سەلامت لێ دەکات وە پێت دەڵێت: حاڵت چۆنە؟ سەعد وتی: سەلامی خوا لە پێغەمبەر بێت، پاشان سەلامیش لە تۆ بێت پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا هەست بە بۆنی بەهەشت دەکەم، بە خزمەکانم ئەنصارم بڵێ: تا ئێوە چاوتان لە تروکاندا بێت عوزرتان نی یە لای خوا کە شتێك بەر پێغەمبەر ﷺ بکەوێت. زەید دەڵێت: پاشان گیانی دەرچوو)[١٠٧٦].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ مژدەی دایە جابر کە عەبدوڵڵای باوکی دوای شەهید بوونی فریشتەکان بەباڵیان سێبەریان بەسەرەوە کردووە، جابر ﷺ دەفەرموێت: (لاشەی باوکمیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و لەبەر دەستیا دانرا و [بە پۆشاکێکدا پۆشرا بوو]،چووم تا پۆشاکەکە لەسەر دەم و چاوی لاببەم، خزمەکانم ڕێگریان کردم، ئینجا دەنگی گریانێك هات وترا: ئەو کچەکەی عەمرە یان خوشکەی عەمرە (واتە: پوری جابر)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لِم تَبكي.... ما زالَتِ الملائِكَةُ تظلُّهُ بأجنحَتِها [حتَّى رفعَ])) واتە: بۆ دەگریت، مەگری بەردەوام فریشتە سێبەریان بۆ دەکرد بە باڵەکانیان تا بەرز کرایەوە).

---

(١٠٧٥) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٩٤)، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٣/٣): إسناده حسن، وحسنه الارناؤوط في تحقيق ابن حبان (٧٠٢٥)، وحسنه أيضاً الشيخ الألباني في (احكام الجنائز) (ص:٧٥)، و(الارواء) (٧١٣)، و(صحيح الجامع) (٣٤٦٣).

(١٠٧٦) أخرجه: الحاكم (٢٠١/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وحسن إسناده محققا (سيرة ابن هشام) (٥٢/٣) برقم (٦٣٦)، وصححه صاحب (صحيح السيرة) برقم (٣٤٩).

له ڕیوایەتێکی تردا جابر ؓ دەفەرموێت: (باوکم کە کوژرا لەشەڕی ئوحود دا، پۆشاکەکەم بەسەر ڕوویەوە لائەدا و دەگریام، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ داوایان لێ دەکرم کە نەگریم، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هیچی نەدەوت، پورم زۆر بۆی دەگریا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تَبْكِيهِ، أَوْ لا تَبْكِيهِ، ما زَالَتِ المَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بأَجْنِحَتِهَا، حتَّى رَفَعْتُمُوهُ)) واتە: بۆی بگریەیت یاخود بۆی نەگریەیت بەردەوام فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەریان بەسەروە دەکرد تا بەرزتان کردەوە)[1077].

وە هەر لەو کاتەدا ڕافعی کوڕی خەدیجیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ تیرێك لەسەر سینگی یان قوڕگی دابوو، پێغەمبەریش ﷺ مژدەی دایە کە شایەتی بۆ دەدات لە قیامەتدا کە ئەو شەهیدە، ڕافعی کوڕی خەدیج ؓ دەفەرموێت: (بەشداریم لە جەنگی ئوحوددا کرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە بچووکی زانیم بۆیە ویستی بمگێڕێتەوە بەڵام مامم (ئوسەیدی کوڕی ظەیر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تیر هاوێژە، ئینجا ڕێگەی دام، بەشداریم کرد، ئەوە بوو (تیرێك بەسەر سینگی یا قوڕگی کەوت)، مامی هێنای بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: برازاکەم تیرێکی بەر کەوتووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((إنْ أحبَبْتَ أَنْ نخْرِجه أخرجناهُ، وإنْ أَحْبَبْتَ أَنْ نَدعُهُ، فإِنَّهُ إِنْ مَاتَ وَهو فِيْهِ مَاتَ شَهِيْداً))[1078] واتە: گەر پێت خۆش بێت بۆی دەربکەین ئەوا بۆی دەردەکەین، وە گەر پێت خۆشە لێی دەگەڕێین، چونکە گەر ئەو بمرێت و ئەوەی لە جەستەدا بێت بە شەهیدی دەمرێت).

له ڕیوایەتێکی تردا خێزانەکەی ڕافعی کوڕی خەدیج زیاتر ئەم باسەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: (ڕافع لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بوو لە جەنگی ئوحود داو تیرێکی تێگیراو بەر سەر سنگی گۆی مەمکی کەوت، و هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تیرەم لێ دەرکە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((يا رافعُ إنْ شِئْتَ نزَعْتُ السَّهمَ والقُطْبَةَ جميعًا وإنْ شِئْتَ نزَعْتُ السَّهمَ وترَكْتُ القُطْبَةَ وشهِدْتُ لك يومَ القيامةِ أنَّك شهيدٌ)) واتە: ڕافع گەر ویستت لێ بوو ئەوا تیرەکە و نوکەکەی هەردووکیان دەردێنم، وە ئەگەر ویستت لێ بوو تیرەکە دەردەکەم و نوکە (ئاسنەکەی) دەرناکەم

---

(١٠٧٧) أخرجه: أحمد (٢٩٨/٣)، وعبدالرزاق (٦٦٩٣)، والحميدي (١٢٦١)، والبخاري (١٢٤٤، ٢٨١٦)، ومسلم (٢٤٧١) والنسائي (١٣/٤)، والطيالسي (١٧١١)، وابن حبان (٧٠٢١).

(١٠٧٨) أخرجه: الطبراني (المعجم الكبير) (٥٦٩،٤٢٤٠).

و شایەتیت بۆ دەدەم لە قیامەتدا کە تۆ شەهیدیت. ڕافعیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها تیرەکە دەرهێنە و نوکەکەی واز لێ بێنە و شایەتیم بۆ بدە لە قیامەتدا کە من شەهیدم. ئینجا پێغەمبەر ﷺ تەنها تیرەکەی دەرکردوو نوکەکەی دەرنەکرد [ڕافیع لەدوای ئەوە ئەو نوکە تیرەی هەر لە جەستەدا بوو ژیا تا زەمانی (خیلافەتی) معاویە ﷺ، لە پڕدا خوێنی بەربوو لە جێگە نووکەکەدا و لە دوای نوێژی عەسر مرد])[١٠٧٩].

پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە هەموولایەکدا بڵاوبوونەوەو بەدوای کوژراو و بریندارەکانیاندا دەگەڕان، عەمری کوڕی ثابتی کوڕی وەقش (الاصیرم) یان دۆزیەوەکە بەسەختی بریندار بوو بوو، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك هەندێك لە پیاوانی بەنی عەبدول ئەشهل) بەدوای کوژراوەکانیاندا دەگەڕان بە (الاصیرم) گەیشتن وتیان: سوێن بە خوا ئەوە (الاصیرم)ە چی هێناویەتی یە ئێرە، ئێمە لە مەدینە ئەومان بە جێ هێشت چونکە ئەو باوەڕی بەم ئاینەی ئێمە نەبوو.

پرسیاریان لێ کرد: چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ ئایا بۆ پشتگیری لە خزمەکانت هاتوویت، یان ئیسلامت پێ قەبوڵە و لە پێناوی خوادا هاتوویت؟ وتی: باوەڕم بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو موسوڵمان بووم و ئیسلامم قەبوڵ کرد، پاشان شمشێرەکەم هەڵگرت و بەیانی زوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتم، پاشان جەنگام تا ئاوهام بەسەر هات، ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو بەسەر دەستیانەوە مرد، و هاتن ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إِنَّهُ لَمِنْ أَهل الجَنة))[١٠٨٠] واتە: ئەو لەوکەسانەیە کە خاوەنی بەهەشتن).

هەرلەوێدا چۆن پێغەمبەر ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ ئەصیرم دا، ئاوەهاش شایەتی دۆزەخی بۆ پیاوێکدا ناوی (قُزمان) بوو، ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عاصمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادە بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێکمان لەگەڵ هاتبوو، کەس نەیدەزانی ئەو لە کوێیە پێی دەوترا (قُزمان)، پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو پیاوەیان لا

(١٠٧٩) أخرجه: أحمد (٢٧١٢٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وأخرجه أيضاً: الطبراني (الكبير) (٢٣٩/٤) برقم (٤٢٤٢)،وقال البوصيري في (مختصر الأتحاف)،(٤٧٧/٦) برقم (٥٠٦٠): رواه أبو داود الطيالسي بإسناد حسن.

(١٠٨٠) أخرجه:أحمد (٢٣٦٣٤) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وأخرجه أيضاً:أبو داود (٢٥٣٧)، والبيهقي (الدلائل) (٢٤٧/٣)، وابن هشام (السيرة) (٤٦/٣) برقم (٦٣٠).

بکردایە دەیفەرموو: ئەوە دۆزەخی یە واتە: ((یەکێکە لە کەسانی ناو دۆزەخ)). کاتێ جەنگی ئوحود هاتە پێش (قُزمان) لەگەڵمان بوو زۆر بەتوندی دەجەنگاو هەر خۆی حەوت یان هەشت کەس لە موشریکەکانی بەدەستی خۆی کوشت و زۆر پیاوێکی بەتوانا بوو، تا بەخەستی بریندار بوو..... ئینجا هەندێك لە پیاوانی موسوڵمان پێیان دەوت: مژدە بێت (قُزمان) سوێند بە خوا رۆڵێکی باشت هەبوو ئەمرۆ؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: بە چی مژدەم دەدەنێ، سوێند بەخوا تەنها لەبەر پلەو پایەی خزمەکانم جەنگاوم و گەر لەبەر ئەوان نەبووایە من هەرگیز نەدەجەنگام. بەو شێوەیە بەبرینەکانییەوە مایەوە، تابرینەکانی زۆر نارەحەتیان کرد ئینجا تیرێکی لە کیفەکەی دەرهێناو خۆی پێ کوشت)[١٠٨١].

## ناشتنی شەهیدەکان

بەم جۆرە جەنگی ئوحود کۆتایی هات بە شەهید بوون و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان، چەندەها بۆچوون هەیە لە دیاری کردنی ژمارەی شەهیدەکان:

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: چل و نۆ کەس لە موسوڵمانان شەهید بوون، بەڵام عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: چل و چوار کەس لە موسوڵمانان شەهید بوون)[١٠٨٢].

ئیبنو ئیسحاقیش ﷺ دەفەرموێت: (تێکڕای شەهیدەکانی موسوڵمانان لە رۆژی ئوحوددا شەست و پێنج پیاو بوون)[١٠٨٣]. بەڵام وتەی ڕاستتر و بەهێز تر ئەوەیە کە ژمارەی شەهیدەکان حەفتا پیاو بوون، وەك بەراء ﷺ دەفەرموێت: (.... حەفتایان لە موسوڵمانان شەهید کرد)[١٠٨٤].

---

(١٠٨١) أخرجه:ابن هشام (السيرة) (٤٤/٣) برقم (٦٢٧) مرسلًا،واصل القصة ثابت عند البخاري برقم (٤٢٠٢،٦٦٠٧)، ومسلم (٩٨، ١١٢)، وأحمد (٣٣١/٥)،والطبراني (الكبير) (٢٩٦/١)، وعبدالرزاق (٩٧٤٣)، و القصه عند البخاري وعبدالرزاق والبغوي والبيهقي وقعت بغزوة (خيبر)، وعند مسلم وابن حبان وقعت في غزوة (حنين)، وجزم ابن اسحاق وابن الجوزي والحافظ في (الاصابة) (٧١٢٣) وابن قتيبة (المعارف) (ص:١٦١): ان ذلك وقعت في غزوة أُحد. ولعل القصة تكررت والله أعلم.

(١٠٨٢) أنظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٢٧٩/٣).

(١٠٨٣) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٨٣/٣).

(١٠٨٤) أخرجه: البخاري (٣٠٣٩).

ئەنەسی کوڕی مالیکیش ﷺ دەفەرموێت: (موسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا حەفتایان لێ کوژرا وە لە (بئر المعونة)شدا حەفتایان لێ کوژرا، لەجەنگی (اليمامة)شدا حەفتایان لێ کوژرا)[(١٠٨٥)].

وە ئوبەی کوڕی کەعبیش ﷺ دەفەرموێت: (لە جەنگی ئوحوددا شەست و چوار پیاو لە ئەنصار کوژراو شەش پیاو لە موهاجرین کوژرا)[(١٠٨٦)].

وە ژمارەی موشریکەکانیش، سێ بۆچونی جیاوازی لەبارەوە هەیە:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (موشریکەکان لە جەنگی ئوحوددا بیست و دوو پیاویان لێ کوژرا)[(١٠٨٧)]. بەڵام عوروە دەفەرموێت: (نۆزدە پیاو لە موشریکەکان کوژرا، و موسای کوڕی عوقبەش دەفەرموێت: (شانزە پیاو لە موشریکەکان کوژرا)[(١٠٨٨)].

وەچۆنێتی ناشتنیان بەو جۆرە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا شەهیدەکان لە گۆڕەپانی جەنگەکە بنێژرێن و تەرمەکانیان نەبرێنەوە بۆ شاری مەدینە، جابر ﷺ دەفەرموێت: (هەندێك لە تەرمی شەهیدەکان گوازرانەوە بۆ شاری مەدینە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە تەرمی کوژراوەکان بهێنرێنەوە و لە جێی شەهید بوونیاندا بنێژرێن)[(١٠٨٩)].

وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: (من لەناو مەدینەدا بووم، کاتێك کوڕە پورەکەم تەرمی باوکم و خاڵمی بەسەر وشترەکەیەوە هەڵگرتبوو، دەیویست بیهێنێتەوە ناو شاری مەدینە تا لەگۆڕستانەکەیدا بینێژێت، بەڵام پیاوێك دوای کەوتبوو بانگی دەکردو دەیوت: پێغەمبەری خوا فەرمانتان پێ دەکات تەرمی کوژراوەکان بگێڕنەوەو لەو جێیەی لێی کوژراون بیاننێژن. ئینجا ئێمەش هەردوو تەرمەکەمان گێڕایەوەو [ناشتمان لەگەڵ کوژاوەکانی تردا لەو جێگەیەی کە لێی کوژرابوون])[(١٠٩٠)].

(١٠٨٥) أخرجه: البخاري (٤٠٧٨).

(١٠٨٦) أخرجه: أحمد (٢١٢٣٠) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن.

(١٠٨٧) انظر: (السيرة) لابن هشام (٨٥/٣).

(١٠٨٨) أنظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٢٧٨/٣).

(١٠٨٩) أخرجه: ابو داود (٣١٦٥)، والنسائي (٢٨٤/١)، والترمزي (١٧١٧)، وابن ماجه (٢٥١٦)، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح ابي داود) (٢٧١٠)، و(صحيح الترمذي) (١٤٠١)،و (صحيح ابن ماجه) (١٢٣٠).

(١٠٩٠) أخرجه: أحمد (٣٩٧/٣)، وابن حبان (٣١٨٤) وقال محققه: إسناده حسن، والبيهقي (الدلائل) (٢٩٢/٣).

**پێغەمبەر ﷺ لای کوژراوەکان وەستا و مژدەی پێ دان، عەبدوڵڵای کوڕی سەعلەبەی کوڕی صوعەیر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەسەر کوژراوەکانی ئوحود وەستا و فەرمووی: (( أنا شَهيدٌ على هؤلاءِ أنَّهُ ما مِن جريحٍ يُجرَحُ في سبيلِ اللَّهِ إلَّا واللَّهُ يبعثُهُ يومَ القيامةِ يَدمى جُرحُهُ اللَّونُ لونُ دَمٍ والرِّيحُ ريحُ مِسْكٍ.....)) واتە: من شایەتم لەسەر ئەمانە کە هەر برینداریێك لە پێناوی خوادا بریندار کرابێت، ئەوا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا برینەکەی خوێنی لێ دەتکێت، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە. (واتە: میسك بۆن خۆشترین بۆنە))[١٠٩١].**

**پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە شەهیدەکان نەشۆردرێن و بەجل و بەرگەکانیانەوە بنێژرێن، جابر ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ادفِنوهم في دمائِهِم - يَعني يومَ أُحُدٍ - ولم يغسِّلْهم . وفي روايةٍ فقالَ : أَنا شَهيدٌ علَى هؤلاءِ ، لفُّوهم في دمائِهِم))[١٠٩٢] واتە: بیان نێژن بە خوێنەکانیانەوە، مەیان شۆرن (من شایەتم بەسەر ئەوانەوە بیان پێچنەوە بە جەستە خوێناویەکانیانەوە).**

**وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ ئەمە دووپات دەکاتەوە و دەفەرموێت: (شەهیدەکانی ئوحود نەشۆردران و هەر بە جلە خوێناوییەکانیانەوە نێژران)[١٠٩٣].**

**کوژراوەکان زۆر بوون و کفن و پۆشاك کەم بوون لەبەر ئەوە دوو پیاویان سێ پیاویان دەخستە یەك کفنەوە، ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (کوژراوەکان زۆر بوون و کفن و پۆشاکیش کەم بوون، بۆیە پیاوێك یان دوو پیاو و سێ پیاو دەخرانە یەك کفنەوە)[١٠٩٤].**

**بەڵکو هەندێك لە شەهیدەکان وەك باوکی جابر و موصعەب و حەمزە (کفن)ە کەیان بەشی جەستەیانی نەدەکرد بۆیە ناچار گژوگیایاندا بەسەر هەردوو قاچیاندا:**

---

(١٠٩١) أخرجه:ابن أبي شيبة (٣٦٧٨٧)، وأحمد (٤٣١/٥) (٢٣٦٥٨) وقال محققه:حديث صحيح: أسناده حسن، و البيهقي (الدلائل) (٢٩٠/٣)، وابن هشام (السيرة) برقم (٦٤٤) وقال محققاه:إسناده حسن.

(١٠٩٢) أخرجه: البخاري (١٦٥/٣)،وأبو داود (٦٠/٢)، والنسائي (٢٧٧/١)، و الزيادة لابن سعد (١/٣) وإسناده صحيح كما قال الشيخ الالباني في (أحكام الجنائز) مسألة (٣٢) (ص:٧٢).

(١٠٩٣) أخرجه: أحمد (١٢٨/٣)، و أبو داود (٣١٣٧)،وصححه الشيخ الالباني في (صحيح أبي داود) (٢٦٩٠)، و (أحكام الجنائز) (ص:٧٤).

(١٠٩٤) أخرجه: ابوداود (٣١٣٦)،وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٨٩).

**١-جابر** ﷺ **دەفەرموێت:** (باوکم پۆشاکێکی (نمرة) کرا بە کفن بۆی ئەویش دەم و چاوی پێ داپۆشرا، و گیای (الحرمل) درا بەسەر هەردوو قاچیدا)[١٠٩٥].

**٢-خەباب** ﷺ **دەفەرموێت:** (موصعەبی کوڕی عومەیر لە جەنگی ئوحوددا شەهیدکرا و تەنها پۆشاکێکی (نمرة) هەبوو کرا بە کفن بۆی، کەسەری پێ دادەپۆشرا هەردوو قاچی دەردەچوو، کە هەردوو قاچی پێ دادەپۆشرا سەری دەردەچوو بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((غَطُّوا بهَا رَأْسَهُ، واجْعَلُوا علَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ))[١٠٩٦] واتە: سەری پێ داپۆشن و هەندێك گیای بۆن خۆشی (الاذخر) بدەن بەسەر هەردوو قاچیدا).

**٣- وە هەر لە خەبابەوە** ﷺ **دەفەرموێت:** (حەمزە ﷺ شەهید بوو هیچ نەبوو بکرێت بەکفنی تەنها پۆشاکێکی خەت خەت نەبێت، کە دەدرا بەسەریدا بەشی هەردوو قاچی نەدەکرد، دەدرا بەسەر هەردوو قاچیدا بەشی سەری نەدەکرد، تا پۆشاکەکەماندا بەسەریدا و هەندێ گیای (الاذخر)ماندا بەسەر هەردوو قاچیدا)[١٠٩٧].

کفنەکەی حەمزە ﷺ دوو کفن بوو کە صفیە ﷺ پێشتر هێنا بووی بۆ حەمزەی برای ﷺ، زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك جەنگی ئوحود تەواو بوو ئافرەتێك بە خێرایی هات ئەویش صفیە بوو، وتی: ئەم دوو پۆشاکەم بۆ حەمزەی برام هێناوە چونکە هەواڵی کوژرانەکەیم پێ گەیشتووە هەردووکی بکەن بە کفن بۆی.

زوبەیر ﷺ دەفەرموێت: دوو پۆشاکەکەمان هێنا تا بیکەینە کفن بۆ حەمزە، تەماشامان کرد پیاوێکی ئەنصاری لە پەنای حەمزەدا کوژراوە و لاشەکەشی وەك حەمزە شێوێنراوە، ئێمەش پێمان ناخۆش بوو وە شەرممان کرد، کە هەردوو پۆشاکەکە بکەین بە کفن بۆ حەمزە، و ئەنصارییەکەش کفنی نەبێت، ئێمەش وتمان با پۆشاکێکیان بکەین بە کفن بۆ حەمزە، ئەوی تریان بکەین بە کفن بۆ پیاوە ئەنصارییەکە، ئینجا هەردوو پۆشاکەکەمان بە ئەندازەی یەکتر گرت یەکێکیان لەوی تریان گەورە تربوو، بۆیە تیرو پشکمان بۆ کردو هەردووکیانمان کفن کرد لەو پۆشاکەی کە بۆی دەرچوو)[١٠٩٨].

(١٠٩٥) أخرجه: مالك (٤٧٠/٢)، وابن سعد (٥٦٢/٣)، وصحح إسناده الارناؤوط في تعليقه على (زاد المعاد) (٢١٦/٣).

(١٠٩٦) أخرجه: ابوداود (٢٨٦٧، ٣١٥٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٧٠٥،٢٥٠٠)

(١٠٩٧) أخرجه: أحمد (٣٥٩/٦)، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز) مسألة (٣٦) (ص:٧٨).

(١٠٩٨) أخرجه: أحمد (١٤١٨) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وحسنه أيضاً الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز)

لەم ڕیوایەتەوە وا دەردەکەوێت کە یەك پیاو دوو پیاو و سێ پیاو نەکراونەتە یەك (کفن)ەوە، بەڵکو لەناویاندا بەشکراوە، و هەر یەکەیان پارچە کفنێکیان بەر کەوتووە، وەك ئیبنو تەیمیە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ یەك پۆشاکی بەش دەکرد لە نێوان کۆمەڵێکدا، و هەریەکەیان بە پارچەیەك کفن دەکرا لە ناچاری دا)[1099].

سەبارەت بە نوێژ کردن لەسەر شەهیدەکانی ئوحود (ڕیوایات) زۆرە، هەندێکیان وا دەگەیەنن کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کردوون، هەندێکی تریان وا دەگەیەنێت کە نوێژی لەسەر نەکردوون، لە هەندێکیاندا وا دەگەیەنێت، کە تەنها نوێژی لەسەر حەمزە ﷺ کردووە، لێرەدا بەڵگەی هەمووان دەهێنینەوە و پۆختەی ڕاستی باسە کە دەخەینە ڕوو:

لەم دوو ڕیوایەتەی خوارەوەدا وا دەردەکەوێت کە نوێژیان لەسەر نەکراوە:

**١- ئەنەس ﷺ دەفەرموێت:** (شەهیدەکانی ئوحود نوێژیان لەسەر نەکرا و نەشۆردران و بە خوێنەکانیانەوە نێژران)[1100].

**٢-جابر ﷺ دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ دوو پیاوی لە کوژراوەکانی جەنگی ئوحود کۆکردەوە لەیەك گۆڕدا و نەشۆردران و نەنوێژی لەسەر کردن)[1101].

وە لەم چەند ڕیوایەتەی خوارەوەدا وا دەردەکەوێت کە نوێژیان لەسەر کراوە:

- **ئەنەس ﷺ دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ نوێژی نەکردوە لەسەر هیچ یەکێك لە شەهیدەکانی ئوحود تەنها حەمزە نەبێت)[1102].
- **ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت:** (تەرمی شەهیدەکانیان دەهێنا و دەکەس دەکەس ڕیزیان دەکرد لەلای حەمزە و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر دەکردن،

---

مسألة (٣٩) (ص:٨١).

(١٠٩٩) انظر: (عون المعبود) للشمس آبادي (١٦٥/٣).

(١١٠٠) أخرجه: ابوداود (٣١٣٥)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٨٨).

(١١٠١) أخرجه: البخاري (١٣٤٣).

(١١٠٢) أخرجه: ابوداود (٣١٣٧)،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٩٠).

پاشان ئەوەیان لا دەبرد و دەی تریان دەهێنا دیسان لە پەنای حەمزەدا ڕیزیان دەکرد و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر دەکردن و حەمزە هەر لە جێی خۆی بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر حەمزە کرد و نۆ جار (الله أكبر)ی لەسەر کرد و پاشان شەهیدەکانیان دەهێنا و ڕیزیان دەکردن و لەگەڵ ئەوانیشدا هەر نوێژی لەسەر دەکرد)[١١٠٣].

- **جابر** ؓ **دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ حەمزەی هێنا و نوێژی لەسەر کرد و پاشان شەهیدەکانیان هێناو لەلای حەمزەوە دایان دەنان و نوێژی لەسەر دەکردن)[١١٠٤]

- **عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر** ؓ **دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا فەرمانی کرد پۆشاکێك درا بەسەر حەمزەدا و پاشان نوێژی لەسەر کرد و نۆ جار (الله أكبر)ی لەسەر کرد، پاشان پۆل پۆل شەهیدەکان دەهێنران و لەپەنای حەمزەدادا دەنران و نوێژی لەسەر دەکردن، ومنوێژی لەسەر حەمزەش دەکرد لە گەڵیاندا)[١١٠٥].

- **ئیبنو مەسعود** ؓ **دەفەرموێت:** (پێغەمبەر ﷺ حەمزەی دانا، پیاوێکی ئەنصاریان هێنا لە پەنای حەمزەدا دایان ناو پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد، پاشان ئەنصاریەکەیان لابرد، و یەکێکی تریان هێنا و لای حەمزە دایان نا و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد، پاشان ئەو کەسەشیان لابرد... وە بەم جۆرە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ حەفتا جار نوێژی لەسەر حەمزە کرد)[١١٠٦].

سەبارەت بەم باسە ئیمامی تورمذی ؒ دەفەرموێت: (زانایان جیاوازیان هەیە سەبارەت بە نوێژ کردن لەسەر شەهیدەکان، هەندێکیان دەفەرموون: نوێژ لەسەر شەهید ناکرێت ئەمەش وتەی خەڵکی مەدینە و شافعی و ئەحمەدە، وە هەندێکی

---

(١١٠٣) أخرجه: ابن ماجه (١٥١٣)، والحاكم (٣/ ١٩٧)، والبيهقي (١٢/٤)،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٢٢٨).

(١١٠٤) أخرجه: أحمد (٤٦٣/١)، والحاكم (١١٩/٢)، وصحح إسناده الارناؤوط في تعليقه على (زاد المعاد) (٥٠٣/١).

(١١٠٥) أخرجه: الطحاوي (المعاني الآثار) (٢٩٠/١)، وصححه الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز) (ص ١٠٦).

(١١٠٦) أخرجه: أحمد (٤٤١٤) وقال محققه الارناؤوط:حسن لغيره.

تریان دەفەرموون: نوێژ لەسەر شەهید دەکرێت ئەمەش وتەی خەڵکی کوفە و ثەوری و ئیسحاقە)[١١٠٧].

ئیمامی طەحاوی ﷺ دەفەرموێت: (بەدووپات کردنەوەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لەسەر شەهیدەکان، جگیربووە کە شەهید نوێژی لەسەر دەکرێت)[١١٠٨].

ئیمامی ئەحمەدیش ﷺ دەفەرموێت: (نوێژکردن لەسەر شەهید باشترە وە ئەگەر نوێژیشیان لەسەر نەکرێت هەردەبێت)[١١٠٩].

ئیبنو قەیمیش ﷺ دەفەرموێت: (ڕاستی ئەم باسە لە وەدایە کە سەرپشکین لەوەی کە نوێژی لەسەر بکرێت یان نا، چونکە فەرموودە و ئاسەوارێکی زۆر هەن لەسەر هەردوولا)[١١١٠].

کەوابوو دەتوانرێت نوێژ لەسەر شەهید بکرێت، وە دەتوانرێت نوێژیشی لەسەر نەکرێت، بەڵام نوێژکردن لەسەری باشترە، شێخ ئەلبانی ﷺ دەفەرموێت: (گومانی تێدانیە، کە نوێژکردن لەسەر شەهیدەکان باشترە لە نوێژنەکردن لەسەریان، چونکە نوێژ (دووعا، وعیبادەتە)[١١١١].

لە دوای کۆکردنەوەی شەهیدەکان و نوێژکردن لەسەریان باسی ناشتنیان هاتە پێش، بێگومان سوپای موسوڵمانان برینداری زۆریان هەبوو، زۆرماندوو بوون، وە نەیان دەتوانی ئەو هەموو گۆڕە ئامادە بکەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردن (کە شەهیدەکان دوو دوو یان سێ سێ بخرێنە یەك گۆڕەوە بەڵام گۆڕەکان قوڵ وچاك بن)[١١١٢].

هیشامی کوڕی عامر ﷺ دەفەرموێت: ئەنصار لە ڕۆژی ئوحوددا هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان: بەڕاستی بریندارمان زۆرە وە زۆرماندووین (وە هەڵکەندنیش

(١١٠٧) أنظر: (سنن الترمذي) باب (ماجاء في ترك الصلاة على الشهيد) الحديث (١٠٣٦).

(١١٠٨) انظر: (شرح معاني الاثار) للإمام الطحاوي (٥٠٤/١).

(١١٠٩) انظر: (فتح الباري) للحافظ ابن حجرالعسقلاني (٢١٠،٢١١/٣).

(١١١٠) انظر: (تهذيب السنن) لابن القيم (٢٩٥/٤).

(١١١١) انظر:احكام الجنائز وبدعها) للشيخ الالباني المسألة (٥٩) (ص:١٠٨).

(١١١٢) أخرجه:احمد (٢٣٦٦٠) وقال محققه الارناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

زۆرسەختە لەسەرمان) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((حفِروا [واعمِقوا] وأوسِعوا واجعَلوا الرَّجُلَينِ والثَّلاثةَ في القَبرِ احفروا...وَقَدِمُوا أَكثَرَهم قرآناً)) واتە: گۆڕەکان هەڵکەنن وە قوڵیان، بکەن وە فرەوانیان بکەن و دووان و سیان بیان خەنە یەك گۆڕە وە کێیان قورئانی زۆرتر لەبەرە پێشی خەن بۆ ناو گۆڕەکە.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((انْظُروا أكثَرَهم جَمعًا لِلقُرآنِ لە گێڕانەوەیەکی تردا: [أَيُّهُم كَانَ اقرأ للقرآن][1113]. فاجْعَلُوهُ إمام صاحبهُ في القبرِ، فَكَانُوا يَدْفِنُونَ الاثنينِ والثلاثةَ في القبرِ))[1114] واتە: تەماشاکەن کێیان قورئانی زۆرتر کۆکردووەتەوە (واتە.لەسینگی دا) یاخود (کێیان قورئانی باشتر خوێندووەتەوە) ئەوەیان پێشی هاوڕێکەی بخەن بۆ ناوگۆڕەکە. ئیتر بەوجۆرە دوان وسیان دەنێژران لەیەك گۆڕدا).

لە ڕیوایەتێکی تردا هیشامی کوڕی عەمر دەفەرموێت: (لە شەڕی ئوحود دا، کۆمەڵێك لە موسوڵمانان شەهیدبوون، وکۆمەڵێکیشان بریندار بوون [ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا هەڵکەندنی گۆڕ بۆ هەریەکەیان زۆر لەسەرمان گرانە] [جاچی دەفەرموێت؟] فەرمووی: گۆڕیان بۆ هەڵکەنن وە فراوانیان کەن [وە قوڵیان کەن] [و چاکیان کەن] دوان و سیان بیان خەنە یەك گۆڕەوە، ئەوەیان کە قورئانی زۆرتر لەبەرە پێشی بخەن بۆ ناو گۆڕەکە). [هیشام دەفەرموێت: (باوکم شەهید بوو بوو لەگەڵ دووکەسی تردا، خرانەیەك گۆڕەوە و باوکم قورئانی زۆرتر لەبەر بوو بۆیە پێش خرا])[1115].

---

(١١١٣) لە ڕیوایەتێکی (لاواز)دا هاتووە عن ابن عباس رضي الله عنهما : (امر رسول الله ﷺ بالشهداء ان يدفنوا بعد نزع الحديد والجلود عنهم): أخرجه: ابوداود(٣١٣٤) وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (٦٨٦).

(١١١٤) أخرجه: أحمد (٤٣١/٥)، وأبو داود (٣٢١٥)، والترمذي (١٧١٣)، النسائي (١٥/٤)، ابن ماجه (١٥٦٠)، والبيهقي (الدلائل) (٢٩٩/٣،٢٩٦)، وابن هشام (السيرة) (٦٤٤) وقل محققاه: إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح ابو داود) (٢٧٥٤)، و(صحيح الترمذي) (١٤٠٠)، و(صحيح النسائي) (١٨٩٩).

(١١١٥) أخرجه: ابوداود (٧٠/٢)، والنسائي (٢٨٤/١،٢٨٣)، والترمذي (٣٦/٣) (١٠٣٦)، وصحح إسناده الشيخ الالباني وألف بين رواياته في (احكام الجنائز) مسألة (٩٣) (ص:١٨١).

# پێغەمبەر ﷺ لە خوا دەپاڕێتەوە لە دوای تەواو بوونی جەنگەکە

لە دوای تەواوبوونی جەنگەکە و ناشتنی شەهیدەکان، پێغەمبەر ﷺ داوای لە هاوەڵانی کرد، کە لە دوایەوە بەڕیز بوەستن، پاشان دوعای کرد لە کافرەکان و سوپاس و ستایشی خوای کرد: ڕیفاعەی زورقی ﷺ دەفەرموێت: (لە جەنگی ئوحوددا و لە دوای پاشەکشە کردنی موشریکەکان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ڕێك بوەستن تا سوپاس وستایشی خودا بکەم) هاوەڵانیش لە دوایەوە لە چەند ڕیزێکدا وەستان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللهم لكَ الحمدُ كُلِه، اللهم لاقابضَ لما بسطتَ، ولاباسط لما قبضت، ولاهادي لما اضللتَ، ولامُضلَ لِمَنْ هَدَيت، ولامعطي لما منعت، ولامانع لما اعطيت، ولامُقرِّبَ لما باعدتَ، ولا مباعد لما قربت. اللهم ابسط علينا من بركاتك ورحمتك وفضلك ورزقك اللهم اني اسالك النعيم المقيم الذي لايحولُ ولايزول، اللهم اني اسألك النعيم يوم العَيلَة، والأمن يوم الخوف - في رواية- [يوم الحرب]، اللهم عائذٌ بك مِنْ شرّ ما أعطيتنا، وشرّ مامنعتَ مِنّا، اللهم حبّب إلينا الايمان و زينّهُ في قلوبنا، وكرِّه إلينا الكفر والفسوقَ والعصيان، واجعلنا من الراشدين.اللهم توفنا مسلمين، واحينا مسلمين، والحقنا بالصالحين غير خزايا ولا مفتونين.اللهم قاتل الكفرة الذين يكذِّبونَ رسُلكَ، ويصّدونَ عن سبيلك، واجعل عليهم رجزك وعذابك...اللهم قاتل الكفرة الذين اوتوا الكتاب وفي رواية [اللهم قاتل كفرة أهل الكتاب] إله الحق[آمين]))[١١١٦].

واتە: خوایە سوپاس هەمووی هەر بۆ تۆیە، خوایە ئەوەی تۆ دەیبەخشیت کەس ناتوانێت بیبڕێت وە ئەوەی تۆ دەیگریتەوە کەس ناتوانێت بیبەخشێت، وە ئەوەی ڕێنمایی بکەیت کەس ناتوانێت گومڕای بکات، وە ئەوەی تۆ گومڕای بکەیت ڕێ نیشاندەری نییە، وە ئەوەی تۆ بیبەخشی ڕێگری نیە، وە ئەوەی تۆ ڕێگری بکەیت بەخشینی نیە، وە نزیك کەرەوە نیە بۆ ئەوەی کە تۆ دوورت کردردۆتەوە، و دوور کەرەوە نیە بۆ ئەوەی کە تۆ نزیکت کردۆتەوە.

---

(١١١٦) أخرجه: البخاري في (الادب المفرد) (٦٩٩)، والنسائي (الكبرى) (١٠٤٤٥)، وأحمد(١٥٤٩٢)، والبزار (١٨٠٠)، والحاكم (٢٣/٣-٢٤) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وابن ابي عاصم (السنة) (٣٩٠)، وقال محققه: إسناده صحيح، والطبراني (الكبير) (٤٥٤٩) وفي (الدعاء) برقم (١٠٧٥)، وأبو نعيم (الحلية) (١٢٧/١٠)،وصحح الحديث الشيخ الألباني رحمه الله في (صحيح الادب المفرد) (٥٣٨)، وفي (فقه السيرة) (ص:٢٨٤).

خوایە بەرەکەتەکانی خۆت و بەزەیی و میهرەبانی و ڕۆزی خۆت بکەرەوە بەسەرماندا، خوایە من داوای نیعمەتەکانی هەتا هەتایت لێدەکەم کە گۆڕان و نەمانی بەسەردا نایەت. خوایە من داوای نیعمەتەکانت لێدەکەم لە ڕۆژی تەنگانەدا، وە داوای ئاسایشیت لێدەکەم لە ڕۆژی جەنگ و ترسدا، خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەخراپە و لە زیانی ئەوەی پێت بەخشیوین، وە خراپە و زیانی ئەوەی کە لێت قەدەغە کردووین. خوایە باوەڕ خۆشەویست بکە لامان، بیڕازێنەرەوە لە دڵەکانماندا، وە تاوان و بێ باوەڕی و خراپەمان لاناشیرین بکە و بمانخەرە ڕیزی هۆشمەندەکانەوە، خوایە بە موسوڵمانی بمان مرێنە، وە بە موسوڵمانی زیندوومان بکەنەوە وە بمان گەیەنەرە پیاوچاکان، بەبێ سەرشۆڕی و هەڵگەڕانەوە. خوایە ئەو کافرانە بە کوشتن بەرە کە پێغەمبەرەکانت بە درۆ دەخەنەوە و خەڵکی دوور دەخەنەوە لە ڕێگە و ئاینەکەت، خوایە ئەشکەنجە و سزای خۆتیان پێبگەیەنە. خوایە کافرەکانی خاوەن (کتێب) بە کوشتن بەرە ئەی خوای ڕاست (ئامین) خوایە لێمان وەرگرە).

## گەڕانەوە بۆ ناو شاری مەدینە

لە دوای ئەم نزا و پاڕانەوە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەو هەموو برینداری و ماندووبوونەوە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە و دانیشتوانی شارەکە لە ژن و منداڵ بەرە و پیریان هاتن:

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پاشان پێغەمبەر ﷺ بەرەو شاری مەدینە گەڕایەوە، و حەمنەی کچی جەحشی پێگەیشت، و خەڵکی هەواڵی شەهید بوونی عەبدوڵلای کوڕی جەحشی برایان پێگەیاند ئەویش وتی: (إنَّا للَّهِ وإنَّا إليهِ راجعونَ)، پاشان هەواڵی شەهید بوونی (حەمزەی کوڕی عەبدولموطلیبی خاڵیان پێگەیاند ئەویش دیسان وتی (إنَّا للَّهِ وإنَّا إليهِ راجعونَ) پاشان هەواڵی شەهید بوونی (موصعەبی کوڕی عومەیری) مێردیان پێگەیاند هاواری کرد و زۆر نارەحەت بوو پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (مێرد جێگەیەکی تایبەتی هەیە لای ژن....) بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە[١١١٧].

(١١١٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٩/٣)، وابن ماجه (١٥٩٠)، والحاكم (٦١/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٣٠١/٣)، والطبري (التأريخ) (٥٣٣/٣)، وابن سعد(١٩١/٨).والحديث ضعيف كما قال الشيخ الالباني في (ضعيف ابن ماجه) (٣٤٧).

وە هەرلەم باسەشدا ئیبنو ئیسحاق ﷺ شتێکی تر دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ تێپەڕبوو بەلای ئافرەتێك لە (بەنی دینار) کە براکەی و باوکەکەی و مێردەکەی هەموو شەهید کرا بوون لە ئوحود لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، کاتێك کەهەواڵی شەهید بوونی ئەو سیانەیان پێگەیاند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بەسەرهات؟ وتیان: ئەو زۆرچاکە ئەی دایکی فڵان کەس، ئەو سوپاس بۆ خوا چۆنت پێ خۆشە ئاوهایە. ئافرەتەکەش وتی: نیشانم بدەن تا تەماشای بکەم، ئەوانیش نیشانیاندا و ئافرەتەکەش، کە بینی وتی: هەموو ناڕەحەتیەك لە دوای بینینی تۆ بچوك دەبێت)[1118].

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا دەنگ و باسی وا بڵاوبووەوە بەناو خەڵکی دانیشتووی مەدینەدا وترا: موحەمەد کوژرا، تا هاوار لە ناو شاری مەدینەدا بەرزبووەوە، تا ئافرەتێك لە ئەنصار چووە دەرەوە، و تەرمی باوکی و کوڕەکەی و مێردەکەی و براکەی کەنازانم کامیان لە پێشدا بەرویدا هات ئافرەتەکە وتی ئەمانە تەرمی کێن؟ وتیان باوکت، و براکەت، و مێردەکەت، و کوڕەکەتن، وتی ئەی پێغەمبەری خوا چی بەسەر هات؟ وتیان: ئەوەتە لە پێشتەوەیە تا بردیان بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتەکە لایەکی جل وبەرگەکەی پێغەمبەری گرتوو پاشان وتی باوك و دایکم فیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا هیچ بەلامەوە گرنگ نیە تۆ دەبینم بێ زیانیت)[1119].

کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو کۆڵانەکانی مەدینە، گوێی لە ئافرەتانی ئەنصاربوو کە مێرد و خزمە شەهیدەکانی خۆیان دەلاواندەوەو بۆیان دەگریان، بەڵام کەس نەبوو بگری بۆ حەمزەی غەریبی دوور لە کەس و کاروخزم. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم باسە پێویستە شێوازی گێڕانەوەکەی (أَهلُ السّیر) بهێنین وە پاشان شێوازی گێڕانەوەکەی (أهل الحدیث) بۆ باشترحاڵی بوون لە بەسەرهاتەکە:

---

و(السلسلة الضعيفة) (٣٢٣٣)، و(ضعيف الجامع) (١٩٦٠).

(١١١٨) أخرجه: الطبري (التأريخ) (٥٣٢/٢)، وابن هشام (السيرة) (٦٠/٣) رقم (٦٥١) وقال محققاه: مرسل، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٢/٣)، وحسن إسناده صاحب (صحيح السيرة) برقم (٣٩٢).

(١١١٩) أخرجه: الطبراني (الاوسط) (٩٧٨)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٨٧): رواه الطبراني في الاوسط عن شيخه محمد بن شعيب ولم اعرفه وبقية رجاله ثقات.

١-**(أهل السير)** وەك: موسای کوڕی عوقبە ﷺ و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەفەرموون: (کاتێك پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە ناو مەدینە و بە کۆڵانەکانیدا تێپەڕ بوو گوێی لە گریانێکی زۆر بوو، فەرمووی: ((ئەمە چی یە))؟ وتیان ئەوە ئافرەتانی ئەنصارن بۆ شەهیدەکانیان دەگرین [پێغەمبەریش ﷺ لە گریانی ئەوان حەمزەی مامی بەبیرهاتەوە و داوای لێخۆش بوونی بۆ کردو فەرمووی: (بەڵام حەمزە کەس نیە ئەمڕۆ بۆی بگری لە مەدینەدا) پیاوانێکی ئەنصار وەك سعدی کوڕی موعاذ، و سعدی کوڕی عوبادە، و موعاذی کوڕی جەبەل، وعەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە گوێیان لەم وتەیەی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە گەڕانەوە بۆ خانووەکانیان و هەموو ئەو ئافرەتانەیان کۆکردەوە کە بۆ شەهیدەکانیان دەگریان و پێیان وتن: سوێند بە خوا نابێت بگرین بۆ شەهیدەکانتان تا بۆ حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ نەگرین، چونکە باسی ئەوەی کردووەکە حەمزە هیچ کەسێکی نیە بۆی بگری لە مەدینەدا.

هەمووان ڕازی بوونی پێغەمبەریان پێ خۆش بوو]، ئینجا عبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هەموویانی هێنا بۆلای ماڵی پێغەمبەر ﷺ، کاتێك پێغەمبەر ﷺ گوێی لەو گریانە بوو فەرمووی ئەمە چی یە؟ ئەوانیش بۆیان گێڕایەوە، کە ئەنصاریەکان هەموو ئافرەتەکانیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بۆ حەمزە بگرین. پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن و بە چاکە باسی کردن و (ڕازی بوون لەوانەی کە فەرمانیان داوە بەڕازی بوونی پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((ما هَذا أَرَدْتُ وَمَا أُحِبُّ الْبُكَاءَ)) واتە: من ئەمەم نەویستووە و گریانم پێخۆش نیە، پاشان داوای لێکردن کە دەست لە گریان هەڵگرن و نەگرین)[١١٢٠].

٢- **(اهل الحديث)**: ڕیوایەتیان کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ کاتێك گەڕایەوە لە ئوحود گوێی لە ئافرەتەکانی ئەنصاری بوو (لە بنی عەبدول ئەشهەل)[١١٢١] دەگریان بۆ (مێردەکانیان کە شەهید ببوون)[١١٢٢].

لە گێڕانەوەکەی ئیبنو ئیسحاقدا ﷺ: [پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسك هاتە خوارەوە

---

(١١٢٠) انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٣٠٠،٢١٦).

(١١٢١) أخرجه: أحمد (٤٩٨٤) وقال محققه: إسناده حسن، وقال ابن كثير في (البداية) (٤/٤٨)،على شرط مسلم.

(١١٢٢) أخرجه: الحاكم (١٩٥/٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

لە چاوی و گریا][١١٢٣] وە فەرمووی: ((لکنَّ حَمزةَ لا بَواكِيَ له!)) واتە: بەڵام حەمزە کەس نیە بۆی بگری ئافرەتانی ئەنصاریش هەموو هاتن و بۆ حەمزە گریان، و پێغەمبەر ﷺ خەوی لێ کەوت تا (لە شەودا هەستا لە خەو وگوێی لە گریانیان بوو)[١١٢٤]، وە فەرمووی: ((أنتُنَّ هاهنا تبكينَ حتى الآنَ؟!))[١١٢٥] لەگێڕانەوەیەکی تردا: ((ويحهنّ ، ما انقلبْن بعدُ))[١١٢٦] إنَّهُنَّ لَها هَنا] [لَمْ يَزَلْ يبكيَن [يندُبنَ حَمزَةَ] بَعْدُ مُنذُ اللَّيلةِ؟!][١١٢٧] حتى الآن، مُروهنَّ (فَلْيُسْكتنَ)[١١٢٨]. ((وليَرجِعْنَ، ولا يَبْكينَ على هالكٍ بعدَ اليومِ.)) واتە: ئێوە لێرەن و تا ئێستا نەگەڕاونەتەوە و دەگرین بۆ حەمزە تا ئەم کاتەی شەو (پێیان بڵێن: با بێ دەنگ بن) و بگەڕێنەوە و لەسەر هیچ کەسێکی مردوو لەمڕۆ بە دواوە نەگرین. ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: ئافرەتانی ئەنصار ئەوەیان تیایە تا ئیستا بۆ هەر مردوویەك بگرین لە پێشدا بۆ حەمزە دەگرین)[١١٢٩].

## ڕاوەدوونانی موشریکەکان تا ناوچەی (حمراء الأسَد)

لە دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود، و شکستی موسوڵمانان، سەروەریان لەکەدار بوو، پێویست بووکە هێرشێکی ڕاوەدوونان ئەنجام بدرێت بە دوای سوپای موشریکەکان دا، ئەوە زۆر پێویست بوو لە دوای گەیشتنی هەندێك هەواڵ کە باسی لەوە دەکرد کە گوایە موشریکەکان دەیانەوێت بگەڕێنەوە و شاری مەدینە تاڵان بکەن و ئەوەی تیاماوە لەناوی بەرن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ موسڵمانانی هاندا تا خۆیان ئامادەبکەن بۆ ڕاوەدوونانیان، وە داوای لێ کردن تەنها بەشداربووانی ئوحود بەشداری لەم ڕاوەدوونانەدا بکەن جگە لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا.

(١١٢٣) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٩/٣) برقم (٦٤٨).

(١١٢٤) أخرجه: أحمد (٥٥٦٣) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن.

(١١٢٥) أخرجه: احمد(٥٦٦٦) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن.

(١١٢٦) أخرجه: ابن ماجه (١٥٩١) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجه) (١٢٩٣).

(١١٢٧) أخرجه: أحمد (٥٥٦٣)وقال محققه: إسناده حسن.

(١١٢٨) أخرجه: الحاكم (٣٨١/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وحسن إسناده الارناؤوط في تحقيقه لـ(مسند أحمد) تحت الحديث رقم (٥٥٦٣).

(١١٢٩) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٨٦)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠١١٠): فيه يحيى بن مطيع ولم أعرفه وبقية رجاله ثقات.

موسوڵمانان بەو هەموو برین و ماندوو بوونەوە هەموو بەڕێکەوتن تا گەیشتنە ناوچەی (حمراء الأسد) کە هەشت میل واتە چوارده کیلۆمەتر دووره لە مەدینەوە، لەوێ ماوەیەك مانەوەو موشریکەکان ترسان و دەس بەرداری گەڕانەوە بوون وردەکاری ئەم باسەش (أهل السيرة) هێناویانە لەگەڵ (أهل الحديث)دا و دوای ڕێکخستنیان باسەکە بەم جۆرە دەبێت:

موسای کوڕی عوقبە ﷺ و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ بە (إسناد)ی خۆیان گێڕاویانەتەوە و فەرموویانە: [پیاوێکی خەڵکی مەککە هاتەلای پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەریش پرسیاری ئەبوسوفیان و سوپاکەی لێ کرد، ئەویش وتی: دابەزیمە ناویانەوە گوێم لێیان بوو لۆمە و گازندەی یەکتریان دەکرد و هەندێکیان بە هەندێکیان دەوت: هیچتان نەکرد، تیژی و دڕکەکانیانتان شکاند و پاشان بەجێتان هێشتن و لەناوتان نەبردن، هێشتا هەندێك سەرانیان تیاماوە خەڵکانتان بۆ کۆبکەنەوە.

لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو عەباس ﷺ وا دەفەرموێت: (ئەبو سوفیان و موشریکەکان ئوحودیان بەجێ هێشت و بەڕێ کەوتن تاگەیشتنە ناوچەی (الروحاء) (کە سی و شەش میل لە مەدینەوە دووره) لەوێدا ئەبو سوفیان وتی: نە موحەمەدتان کوشت، وە نە ژنەکانتان لەگەڵ خۆتان هێنا، خراپترین کارتان ئەنجام دا.... با بۆ یان بگەڕێینەوە، ئەم هەواڵەش گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ][(١١٣٠)].

لە ڕیوایەتەکەی عائیشەدا ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەوەی ئەو شکستەی بەسەردا هات لە ئوحود دا، و موشریکەکان ڕۆیشتنەوە، پێغەمبەر ﷺ ترسا لەوەی کە بگەڕێنەوە بۆیە فەرمووی: ((مَنْ يُنْتَدَبُ لِهَؤُلاَءِ فِي آثَارِهِمْ حَتَّى يَعْلَمُوا أَنَّ بِنَا قُوَّةً؟)) واتە: کێ خۆی تەرخان دەکات تا بە شوێن پێیاندا بڕوات تا موشریکەکان بزانن، کە هێشتا خاوەن گوڕ و هێزین)، لەوێدا حەفتا کەس خۆیان تەرخان کرد تا بە دوایاندا بڕۆن، کە ئەبو بەکر و زوبەیر یان لە ناودا بوون واتە: ئەمان وەك پێشینەی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتوون پاشان پێغەمبەر و ﷺ پاشماوەی سوپاکە بە دوای ئەواندا هاتوون)[(١١٣١)].

(١١٣٠) أخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٦٣٢)، والنسائي (التفسير) (١٠٣) وقال محققه: حديث صحيح، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١١٣): رجاله رجال الصحيح غير محمدبن منصور وهو ثقه، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٢٨/٨): أخرجه: ابن مردوية والنسائي ورجاله رجال الصحيح، وقال السيوطي في (اسباب النزول) (ص:٦١) وفي (الدر المنثور) (١٠١/٢): أخرجه:النسائي وابن ابي حاتم والطبراني بسند صحيح.

(١١٣١) أخرجه: البخاري (٤٠٧٧)، ومسلم (٢٤١٨)، وابن ماجه (١٢٤)، والحاكم (٢٩٨/٤).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە موسوڵمانانندا، کە هەموو خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕاوەدوونانی موشریکەکان، بۆ ئەوەی کە ئەم هەواڵە بگاتەوە بە ئەوان، موسوڵمانانیش بەو هەموو برینداریەوە[١١٣٢] ئامادە باشی خۆیان ڕاگەیاند و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کەس لەگەڵماندا نەیەت تەنها ئەوانە کە لە شەڕدا بەشدار بوون). عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وتی لەگەڵتاندا بێم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر...

(پاشان جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەگەڵتاندا هاتم بۆ بەشداربوون لە شەڕەکە، بەڵام باوکم منی گەڕانەوە، و زۆر داوای لێکردم کە ئافرەتەکانمان جێ نەهێڵم، ئەمەش بەهیوای ئەو شەهید بوونەی بوو کە بەدەستی هێنا، وە بۆ ئەوەی من بمێنمەوە تا قەرزەکانی بۆ بدەمەوە و تا ئاگام لە میراتیەکەی بێت، وە من پێم خۆشە ڕوو بکەیتە هەر شوێنێك منت لەگەڵدا بم، ئێستاش ڕێگە نادەیت کەست لەگەڵدا بەشدار بێت تەنها ئەوانەی کە پێشتر لەگەڵتدا بەشدار بوون بۆیە داوات لێ دەکەم کەڕێگام بدەیت تابەشدار بم لەم ڕۆیشتنە دا؟ پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەیدا بەشداری بکات)[١١٣٣].

(پاشان موسوڵمانان هەموو خۆیان ئامادەکرد و بەڕێکەوتن بە دوایاندا تا گەیشتنە ناوچەی (حمراء الأسد) و بیری ئەبو عوتەیبە، موشریکەکان ئەم هەواڵەیان پێ گەیشت و نەگەڕانەوە پاشان موسوڵمانەکان بەفەزڵی خوا گەڕانەوە بە سەربەرزی و شکۆمەندیەوە و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ﴾ (آل عمران))[١١٣٤]. واتە: ئەوانەی کەلەپاش بریندار بوونیشیان وەڵامی خودا و پەیامبەریان دایەوە ئەوانەیان کە ئاکاری چاکیان کرد و، دوای پەیامبەر کەوتن لە (حمراء الأسد)دا، پارێزگاری سنوورەکانی خوا بوون، پاداشتێکی گەورەو فراوانیان بۆ هەیە.

(١١٣٢) وكان من بينهم من به جراحات كثيرة: فقد كان بعبدالرحمن بن عوف عشرين جرحاً (انظر: (جوامع السيرة) (ص: ١٢٨)، وكان بـ أسيد بن حضير(سبع) جراحات (انظر الاصابة (١٨٥)، وكان في بني سلمة (اربعون) جريعا، بالطفيل (ثلاثة عشر) جرحاً وكذلك بكعب، وبخراش بن صمة (عشر) جراحات، وبقطبة بن عامر (تسع) جراحات، وبطلحة (اربعة وثلاثون) جرحاً(انظر: (الطبقات) لابن سعد (٣٢/٢)، و (امتاع الاسماع) للمقريزي (١٦٧/١).

(١١٣٣) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٢١٧/٣، ٣١٣)، وفي (السنن الكبرى) (١٤٧/٧) وقال البيهقي:...وكتبناه موصولا بإسناد حسن.

(١١٣٤) أخرجه: البخاري (٤٠٧٧)، ومسلم (٢٤١٨)، وبعضه من رواية الطبراني (الكبير) (١١٦٣٢)، والنسائي (التفسير) (١٠٣) وقال محققه: حديث صحيح.

ئیبنو ئیسحاق ﵀ ئەم باسە بە وردتر باس دەکات و دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی دووشەمە و سێ شەمە و چوار شەمە لەوێدا مایەوە، هەر لەوێدا مەعبەدی کوڕی ئەبو مەعبەدی خوزاعی پێگەیشت لەو ڕۆژەدا خوزاعە تێکڕا بە موسوڵمانان و موشریکیەکانیەوە هەموو لایەنگرو دڵسۆزی پێغەمبەر ﷺ بوون لە ناوچەی توهامەدا و هیچ هەواڵێکیان لێ نەدەشاردەوە.

مەعبەد ئەو ڕۆژە هێشتا هەر موشریك بوو، بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی محمد سوێند بە خوا زۆر دلگران بووین بەوەی کە تووشت هات و ئەو هاوەڵانەت کە شەهید بوون، زۆر پێمان خۆش بوو کە خوا سەلامەتی کردیت لەو جەنگەدا. پاشان مەعبەد پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە (حمراء الأسد) بەجێ هێشت بەرەو مەککە ڕۆیشت، تا لە ناوچەی (الرّوحاء)دا بە ئەبو سوفیان و سوپاکەی گەیشت لەو کاتەدا ئەوان بڕیاری گەڕانەوەیان دابوو.... ئەبو سوفیان کە مەعبەدی بینی پێی وت: چ هەواڵی ئەو ڕێگایەت لایە ئەی مەعبەد؟ مەعبەدیش وتی: محمد و تێکڕای هاوەڵانی دەرچوون و بە شوێنتاندا دەگەڕێن و ئەوەندەی لەگەڵدایە تا ئێستا ژمارەی ئەوەندە زۆرم نەدیوە زۆر تورە و بە داخن لێتان، ئەوانەش کەلەگەڵیدا نەهاتبوون بۆ جەنگەکە هەموو پەشیمان بوون لەو کارەیان، ئەوەندە لێتان بە ڕقن تا ئێستا شتی وام نەدیوە. ئەبو سوفیان وتی: ئەوە ئاگات لە خۆتە دەڵێی چی؟ مەعبەد وتی: سوێند بە خوا وا بزانم فریا ناکەویت ئێرە بەجێ بهێڵیت تا سەری ئەسپەکانی ئەوانت لێ دەردەکەوێت.

ئەم هەواڵە ئەبو سوفیان و سوپاکەی سارد کردەوە لە گەڕانەوە، وە لەڕێدا چەند کاروان چیەکی خێڵی عەبد قەیسی پێگەیشت و پێی وتن: بەرەو کوێ دەچن؟ وتیان: بەرەو مەدینە. ئەبو سوفیان وتی بۆچی دەچن بۆ ئەوێ؟ وتیان: بۆ بازرگانی دەچین. ئەبو سوفیان وتی: ئێوە نامەیەکی من بگەیەننە محمد منیش چەند بارێك مێوژتان دەدەمێ گەر ئێوە هاتنە بازاڕی (عوکاظ)؟ وتیان: باشە ئەبو سوفیان وتی: گەر بە محمد گەیشتن پێی ڕاگەیەنن، کە ئێمە بڕیارمان داوە جارێکی تر هێرشیان بهێنینەوە سەر تا پاشماوەکانیان ڕیشەکێش بکەین.

کاروانە کە بەڕێکەوتن و لەناوچەی (حمراء الاسد) بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتن و نامەکەی ئەبو سوفیانیان پێگەیاند، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ

الوَكِيلُ))[١١٣٥]، پاشان لە ڕۆژی چوارشەمەدا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی شکۆمەندانە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە.

لە ڕیوایەتێکی لاوازدا هاتووە کە لە گەڕانەوەدا شاعیری موشریکەکان ئەبو عیزەی جومەحی و معاویەی کوڕی موغیرە کوژراون بە دەستی موسوڵمانان. ئەبو عوبەیدە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەرﷺ لە گەڕانەوەیدا لە (حمراء الاسد) وە پێش گەیشتنەوەی بە شاری مەدینە، دوانی دەست گیرکرد کە ئەوانیش موعاویەی کوڕی موغیرەی کوڕی عاص لەگەڵ ئەبو عیزەی شاعیری موشریکەکان (کە لە بەدردا پێغەمبەر ﷺ بێ بەرامبەر ئازادی کرد بە مەرجێك بەشداری هیچ چالاکیەك نەکات دژ بە موسوڵمانان) ئەبو عیزە وتی: محمد ئازادم کە؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی وت: ((لا وَاللهِ لاتَمسح عارضيك بِمَكة بَعدها وتقولُ: خَدَعْتُ مُحمدًا مَرّتين)). واتە: نەخێر سوێند بە خوا جارێکی تر دەست بە هەردوو لای سمێڵتا ناهێنیت بڵێیت محمدم دووجار خەڵەتان پاشان لە ملی درا)[١١٣٦].

عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرکردەی ناوداری دووڕووەکان لە یەکەم جومعەی دوای جەنگی ئوحوددا ویستی نیازپاکی و لایەنگری خۆی وەك جاران دووپات بکاتە بۆ پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان، دوای ئەوە کە سێیەکی سوپاکەی لە گۆڕەپانی جەنگدا گێڕایەوە.

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی یەکێك بو لە پیاو ماقوڵانی تیرە و هۆزەکەی خۆی، لە هەموو کۆبونەوەی جومعەیەکدا لە ناو هەمووانیدا هەڵدەسا و لایەنگری و سەرخستنی خۆی بۆ پێغەمبەر دووپات دەکردەوە.... تا ئەوە بوو ئەو کارە نابەجێیەی ئەنجامدا لە ئوحوددا و سێیەکی سوپاکەی گەڕاندەوە. لە دوای ئەوە وەك جاران دیسان ویستی لە جومعەدا هەڵسێت لە ناو خەڵکەکەدا و لایەنگری خۆی دووپات بکاتەوە، عەبدوڵڵا ئەمجار کە ویستی هەڵسێت، موسوڵمانان لە هەموو لایەکەوە ویەقەیان گرت و پێیان وت: دانیشە ئەی دوژمنی خوا تۆ ئەو پیاوەنیت دوای ئەوەی ئەو کارەت ئەنجام دا؟!

(١١٣٥) انظر: (السيرة) لابن هشام (٦٣،٦٤/٣) (٦٥٨) وقال محققاه: إسناده معضل، و(التأريخ) للطبري (٥٣٥/٢)، و(الدلائل) للبيهقي (٣١٥/٣).

(١١٣٦) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦٥/٣) (٦٦٠) وقال محققاه: إسناده منقطع، وأخرجه ايضاً: البيهقي (الدلائل) (٢٨١/٣)، وفي (السنن الكبرى) (٦٥/٩) (٣٢٠/٦) وقال: إسناده ضعيف، وضعفه الشيخ الألباني في (الارواء) (١٢١٥).

عبدوڵڵاش بەسەر خەڵکدا هەنگاوی دەنا بۆ چوونەدەرەوە لە مزگەوت و دەی وت: هەستاوم لایەنگری بکەم دەڵێی قسەی ناشیرینم کردووە. پیاوێکی ئەنصاری لە دەرگای مزگەوتدا پێی گەیشت و پێی وت: کورە بگەڕێرەوە تا پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات؟ وتی: وەڵا نامەوێت داوای لێخۆش بوونم بۆ بکات)[١١٣٧]. ئەم باسەش نزیکە لەئایەتێکی خوای گەورەوە کە لە وەصفی ئەو دوو ڕووانەدا دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ ﴾ (المنافقون).

هاوەڵانی پێغەمبەر هەڵوێستیان نا جۆر بوو سەبارەت بەو دوو ڕووانەی کە گەڕابوونەوە لە جەنگی ئوحود، زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەرەو ئوحود ڕۆیشت کەسانێك لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون گەڕانەوە).

هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ سەبارەت بەوان دوو کۆمەڵ بوون: کۆمەڵێکیان دەیان وت: (دەیان کوژین)، کۆمەڵەکەی تریان دەیان وت: نا نایان کوژین، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (النساء) واتە: چیتانە سەبارەت بەو دووڕووانە دوو دەستەن؟ بۆ بەتێکڕا بڕیاری کوفریان نادەن خۆ خودا ژێرەو ژووری کردوون و بەکافر دایناون، بشزانن کە کافرن و تۆڵەیان هەر کوشتنە، ئایە کەسێك خودا گومڕای کرد بێت، ئێوە دەتانەوێ ڕێی ڕاستی نیشان بدەن؟! دیارە هەر کەسێك خودا خۆی گومڕای بکات، ناتوانیت هەرگیز هیچ ڕێگەیەك بۆ دەربازبوونی بدۆزیتەوە. دواجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إنَّها طَيْبةُ، وإنَّها تَنْفي الخَبَثَ، كما تَنْفي النارُ خَبَثَ الفِضَّةِ))[١١٣٨] واتە: ئەوە شاری طیبە (واتە مەدینە) یە، کە پیسی فڕێ دەدات وەك چۆن ئاگر ژەنگ و پیسی زیو فڕێدەدات).

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (بە ڕاستی ڕۆژی ئوحود ڕۆژی تووش بوون و تاقیکرنەوە و پاك کردنەوە بوو خوای گەورە باوەڕدارانی تیادا تاقی کردەوە، وە

(١١٣٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٦٦/٣) (٦٦١) بإسناد مرسل عن الزهري، وأورده البيهقي (الدلائل) (٣١٨/٣)، وابن كثير (البداية) (٥٩/٤).

(١١٣٨) أخرجه: أحمد (٢١٥٩٩، ٢١٦٣٦)، وابن أبي شيبة (٤٠٦/١٤)، والبخاري (٤٠٥٠)، ومسلم (٢٧٧٦)، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٢/٣) واللفظ لأحمد.

تیایدا ئەو دووڕووانەی کە بەزمانیان باوەڕی خۆیان ئاشکرا دەکرد، بێ باوەڕیان لە دڵیاندا دەشاردەوە ئالە و ڕۆژەدا خوا ئاشکرا و ڕسوای کردن. وە ئەوە ڕۆژێك بوو کە خوای گەورە هەندێك لە پیاوچاکانی خۆی ڕێزدار کرد و پلە و پایەی شەهیدی پێ بەخشین)[1139].

## پلەی بەرزی شەهیدەکانی ئوحود

شەهیدەکانی شەڕی ئوحود چەند تایبەت مەندیەکیان هەیە لەوانە:

١-سەروەری و گەورەیی هەموو شەهیدەکانی دونیایان تێدایە: جابر ﷺ دەی گێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ تَعالى يَوْمَ القيامَةِ حمزةُ بن عبد المطلب...))[1140] واتە سەروەری هەموو شەهیدەکان لای خوای گەورە لە قیامەتدا حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیبە.

٢-شەهیدەکانی ئوحود لە ناو سکی چەند باڵندەیەکی سەوز دان دەچنە ڕووبارەکانی بەهەشت و لەبەروبومەکانی دەخۆن و دەگەڕێنەوە بۆ لای چرا ئاڵتونیە هەڵواسراوە کان لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران) واتە: وا مەزانن ئەو کەسانەی لەڕێی خوادا کوژران، مردوون، بەڵکو زیندوون و لای پەروەردگاریان بژێوی وەردەگرن.

ئیبنو عەباس ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لمَّا أُصِيبَ إِخْوَانُكُمْ بِأُحُدٍ جعلَ اللهُ أَرْوَاحَهُمْ في جَوْفِ [أجواف] طَيْرٍ خُضْرٍ تَرِدُ أَنْهارَ الجنةِ وتَأْكُلُ من ثِمارِها وتَأْوِي إلى قَنادِيلَ من ذَهَبٍ [مُعَلَّقَةٍ] في ظِلِّ العرشِ فلمَّا وجَدُوا طِيبَ مَشْرَبِهِمْ ومَأْكَلِهِمْ [وحُسْنَ مَقيلِهم] وحُسْنَ مُنْقَلَبِهِمْ قالوا يا لَيْتَ إِخْوَانَنا يَعْلَمُونَ بِما صنعَ اللهُ لَنا لِئَلَّا يَزْهَدُوا في الجِهادِ ولا يَنْكُلوا عَنِ في رواية [عند] الحَرْبِ وفي رواية [مَنْ يَبلغ إخوانَنا [عنّا] إنّا في الجنّة نَرزقُ] فقال اللهُ عزَّ وجلَّ أنا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ فأنزلَ اللهُ عزَّ وجلَّ هؤلاءِ الآياتِ على رسوله: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران))[1141].

---

(١١٣٩) أنظر: سيرة ابن هشام (٦٧/٣).

(١١٤٠) أخرجه: الحاكم (١٩٩/٣) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ ألالباني في (صحيح الجامع) (٣١٥٧).

(١١٤١) أخرجه: أحمد (٢٣٨٨) وقال محققه: حديث حسن، وابن أبي شيبة (٢٩٤/٥)، وابن أبي عاصم (السنة) (١٩٥)، وأبو داود (٢٥٢٠)، والحاكم (٨٨،٢٩٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (١٦٣/٩)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢١٩٩) واللفظ لأحمد والحاكم.

واتە: برایانتان کاتێك پێکران و شەهید کران لە ئوحود دا، خوای گەورە ڕۆحەکانیانی کردە ناو باڵندەیەکی سەوزەوە دەچێتە ڕووبارەکانی بەهەشت وە لە میوەی درەختەکانی دەخوات، وە دەگەڕێتەوە بۆ لای چرا ئاڵتونیە هەڵواسراوەکانی ژێر سێبەری عەرش، شەهیدەکان کە ئەو جێگەو خواردن و خواردنەوە باشەیان دی وتیان: خۆزگە برایانمان دەیانزانی کە خوای گەورە چی بۆ کردووین، تا کۆڵنەدەن لە خەبات کردن، نەبەزین لە کاتی جەنگدا [کێ بە برایانمان ڕادەگەیەنێت کە ئێمە لە بەهەشت داین و ڕۆزیمان پێدەدرێت]؟ خوای گەورەش فەرمووی من لەجیاتی ئێوە پێیان ڕادەگەیەنم ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبنو مەسعود ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: ((أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بالعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إلى تِلكَ القَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إليهِم رَبُّهُمُ اطِّلَاعَةً، فقالَ: هلْ تَشْتَهُونَ شيئًا؟ قالوا: أَيَّ شيءٍ نَشْتَهِي وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا، [فيقولُ: سَلوني ما شِئتُمْ، قالوا: ربَّنا، ماذا نسألُكَ ونحنُ نَسرحُ في الجنَّةِ في أيِّها شِئنا؟] فَفَعَلَ ذلكَ بهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِن أَنْ يُسْأَلُوا، قالوا: يا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا في أَجْسَادِنَا حتَّى نُقْتَلَ في سَبيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ ليسَ لهمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا))[(١١٤٢)]. واتە: ڕۆحی شەهیدەکانی ئوحود لە ناو باڵندەیەکی سەوزدان کە جێگەکەی چەند چرایەکی هەڵواسراوە بە عەرشەوە دەردەچێت بە ناو بەهەشتدا بۆ هەر جێگەیەك کە ویستی لێ بێت، پاشان دەگەڕێتەوە بۆلای ئەو چرایانە..... و خوای گەورە پێی فەرموون: ئارەزوتان لە چ شتێك هەیە؟ ئەوانیش وتیان: ئارەزوومان لە چ شتێك هەبێت؟ ئێمە دەچین بەناو بەهەشتدا بۆ ئەو جێگەیەی کەخۆمان ویستمان لێیەتی؟ [خوای گەورە دەفەرموێت داوام لێبکەن چیتان دەوێت؟...] سێ جار بەم جۆرە پرسیاری لێکردن. ئەوانیش زانیان کە وازیان لێ ناهێنرێت تا داوانەکەن وتیان: خودایە دەمانەوێت ڕۆحەکانمان بگەڕێنیتەوە ناو لاشەکانمان تا جارێکی تر لەپێناوی تۆدا بکوژرێین کەبینرا [ئەوان هیچ پێویستیەکیان نیە و تەنها ئەو داوایەیان هەیە] وازیان لێ هێنرا.

کەوابوو ئەم پۆلە شەهیدەی ئوحود لە ناو بەهەشت دان بەڵام سەرجەم شەهیدانی

(١١٤٢) أخرجه: مسلم (صحيح) (١٨٨٧)، والترمذي (٣٠١١)، وابن ماجه (٢٨٠١).

تری موسوڵمانان لە قەراغی ڕووبارێکن لای دەرگای بەهەشت، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((الشُّهداءُ على بارقِ نهرٍ ببابِ الجنَّةِ في قبَّةٍ خضراءَ يخرُجُ إليهم رزقُهم مِن الجنَّةِ بُكرةً وعشيًّا))[١١٤٣] واتە: شەهیدەکان لە قەراغ ڕووبارێکدان لە دەرگای بەهەشت، لە گومەتەیەکی سەوز دان ڕۆزییان بۆ دەهێنرێت لە بەهەشتەوە هەموو بەیانیان و ئێوارانێک.

٣- لە شەهیدانی ئوحوددا هەیە کە بەبێ پەردە لەگەڵ خوادا گفتوگۆی کردووە، جابری کوڕی عبدوڵڵا ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك عبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرامی باوکم شەهیدکرا پێغەمبەرم ﷺ) پێگەیشت و فەرمووی: (يا جابر مالي أراك منكراً)؟ واتە: جابر بۆ چی دەتبینم پەشێوو دڵ شکاوی؟ منیش وتم: ئەی پێغەمبەری ﷺ خوا باوکم شەهید بووە (قەرزاری و خێزان و منداڵی بەجێ هێشتووە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أفلَا أبشِّرُكَ بما لقيَ اللَّهُ بِهِ أباكَ ؟ وفي رواية: [ألا أُخبرك ما قال اللهُ لأبيك]))؟ واتە: ئایا مژدەت بدەمێ و پێت ڕاگەیەنم کە باوکت چۆن بە خوا گەیشتووە و چی پێ وتووە؟ منیش وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما كلم اللهُ أحدًا قَطُّ إلا من وراءِ حجابٍ ، وأحيى أباكَ فَكَلَّمَهُ كِفاحًا ، فقالَ : تمنَّ عليَّ أعطيكَ قالَ: يا ربِّ تُحييني فأُقتَلَ فيكَ ثانيةً . قالَ الرَّبُّ تبارك وتعالى : إنَّهُ قد سَبقَ منِّي أنَّهم لا يُرجَعونَ قالَ : يا ربِّ فأبْلِغْ مَن ورائي)) قال جابر: فأنزل الله تعالى:﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران))[١١٤٤]. واتە: خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ کەس نەکردوە تەنها لە ودیوی پەردەوە نەبێت، بەڵام باوکی تۆی زیندوو کردەوە و ڕووبەڕوو گفتوگۆی لەگەڵدا کرد بێ پەردە و فەرمووی: ئاوات بخوازە و داوام لێ بکە با بت دەمێ؟ عبدوڵڵا وتی: خودایە زیندووم بکەرەوە تا دووبارە لە پێناوتا بکوژرێم، خوای گەورە فەرمووی: پێشتر بڕیارم داوە کە ئەوان جارێکی تر بۆ ئەوێ ناگەڕێنەوە، عبدوڵڵا وتی: خوایە ئەم هەواڵەمان بگەیەنەرە ئەوانەی دوامان.

---

(١١٤٣) أخرجه: أحمد (٢٦٦/١)، وابن أبي شيبة (٢٩٠/٥)، وابن جرير (٢٣٢٣) والطبري (التفسير) (٢٣٢٣)، والطبري (الكبير) (١٠٨٢٥)، والحاكم (٧٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٧٤٢).

(١١٤٤) أخرجه: الحميدي (١٢٦٥)، الترمذي (٣٠١٠)، ابن ماجه (١٩٠)، وابن حبان (٧٠٢٢)، ةوقال محققه: إسناده جيّد، والحاكم (٢٠٣/٣) وصححه و وافقه الذهبي، والبزار (٢٧٠٦)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٠٨) , و(صحيح ابن ماجه) (١٥٧)، و(ظلال الجنة) (٦٠٢).

جابر ﷺ دەفەرموێت خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾(آل عمران). لاشەی ئەو شەهیدانەش هەروەك خۆی مایەوە زەوی نەی فەوتان، جابر ﷺ دەفەرموێت: (باوکم بینی لە گۆڕەکەیدا کاتێك هەڵمان دایەوە وەك خەوتوو وابوو وە جەستەی هیچ نەگۆڕا بوو وە تێك نەچوو بوو نەکەم نەزۆر، پێیان وت: ئەی کفنەکانیت بینی؟ وتی: کاتێك نێژرا تەنها پارچە پۆشاکێك هەبوو دەم و چاوی پێ داپۆشرا و گیای (الحرمل) درا بەسەر قاچەکانیدا، دوایی ئەو پۆشاکەشمان دی وەك خۆی بوو، وە گیایە (الحرمل)ە کەشی وەك خۆی هەر لەسەر هەر دووقاچی مابوەوە لەدوای چل و شەش ساڵ)[١١٤٥].

پێغەمبەر ﷺ گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی ناو نا (گۆڕی براکانمان) وە گۆڕستانی (بەقیع)ی مەدینەی ناو (گۆڕی هاوەڵانمان).

٤- ڕەبیعەی کوڕی هەدیر دەڵێت: (طەلحەی کوڕی عوبەیدیلا پێی وتم: (لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چووینە دەرەوە [بۆ گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود]، ڕۆیشتین تا سەرکەوتین بەسەر (حرة الواقم) لە ناوچەی (بیداء) لەوێشەوە شۆڕبووینەوە بەرەوخوار و بەلای هەندێك گۆڕی نزمدا ڕۆیشتین وتمان ئەمە گۆڕستانی براکانمانە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (([هذِهِ] قُبُورُ أَصْحابِنا)) واتە: ئەوە گۆڕستانی هاوەڵانمانە، پاشان لەوێ دەرچوین تاگەیشتینە گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هذِهِ قُبُورُ إِخْوانِنا) (واتە: ئەوە گۆڕستانی برایانمانە)[١١٤٦].

٥-پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتایبەتی سەردانی گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی دەکرد

ئەبوهورەیرە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی دەکرد، هەرکە دەگەیشتە لای خوارەوەی شیوەکە دەی فەرموو: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾(الرعد)، واتە: سڵاوتان لێ بێت بۆ ئەو ئارامگریەتان کە دوا جار باشترین جێگەتان بەرکەوت. پاشان ئەبو بەکریش ﷺ لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ هەروای دەکرد، وە عومەریش ﷺ لە دوای ئەبوبەکر ﷺ هەر وای دەکرد، عوسمانیش ﷺ لە دوای عومەرە وە هەروای دەکرد)[١١٤٧].

---

(١١٤٥) أخرجه: ابن سعد (الطبقات الكبرى) (٥٦٢/٣)، ومالك (الموطأ) (٤٧٠/٢) و سنده صحيح كما قال الارناؤوط في تحققه (زاد المعاد) (٢١٦/٣).

(١١٤٦) أخرجه: أحمد (١٣٨٧) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن، وأبو داود (٢٠٤٣)، وصححه الشيخ الألباني (رحمه الله) في (صحيح ابي داود) (١٧٩٧).

(١١٤٧) أخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣٠٦/٣).

٦-پێغەمبەر ﷺ پێش وەفاتی هات بۆ سەر گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود وەك ماڵ ئاواییەك و بۆ دواجار نوێژی لەسەرکردن، عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە مەدینە چووە دەرەوە بۆسەر گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود و نوێژی مردووی لەسەر خوێندن، پاشان گەڕایەوە و چووە سەرمینبەرەکەی [ئەمەش وەك ماڵ ئاواییەك بوو لەزیندووەکان و مردووەکان])[١١٤٨].

٧-پێغەمبەر ﷺ هەر کات باسی شەهیدەکانی ئوحود بکرایە، خۆزگەی دەخواست کە (ئەویش لەگەڵیاندا شەهید بووایە، جابر ﷺ دەفەرموێت: هەر باسی شەهیدەکانی ئوحود بکرایە گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((أَمَا واللهِ لَوَدِدتُ أَنِّي غُودِرتُ [أي: استشهدت] مع أصحابِ نُحْصِ الجَبلِ))[١١٤٩]. واتە: بەڵام من سوێند بە خوا پێم خۆش بوو لەگەڵ هاوەڵانی دامێنی چیاکە بڕۆیشتمایە (واتە: شەهید بوومایە).

٨-پێغەمبەر ﷺ خێزانی شەهیدەکانی ئوحودی بەسەر دەکردەوە. بەشیری کوڕی عەقرەبە ﷺ دەفەرموێت: (گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا و پێم وت: باوکم چی لێ هات؟) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((استُشهِد رحمةُ اللهِ)) واتە: شەهید بوو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت. ئیتر منیش گریام، پێغەمبەر ﷺ منی گرت و دەستی هێنا بە سەرمدا، لەگەڵ خۆی سواری کردم و پێی فەرمووم: ((اسكُتْ [ما يُبكيك] أما ترضَى أن أكونَ أنا أبوكَ وعائشةُ أمُّكَ؟))[١١٥٠]. واتە: بێ دەنگ بە (چی دەتگریەنێت) ئەی ڕازی نابیت کەمن باوکت بم وە عائیشەش دایکت بێت).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ سەردانی خێزانی حەمزەی ﷺ کرد. موحەمەدی کوڕی یەحیا لە خەولەی کچی فەهد کە خێزانی (حەمزەی کوڕی عەبدولموطلیب ﷺ، دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لە دوای شەهیدبوونی حەمزە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ سەردانم و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا من پێم خۆش بوو کە پێت بگەم تا پرسیاری شتێکت لێ بکەم، بۆیان باس کردووم تۆ حەوزێکت هەیە لە نێوان ئەوێ

(١١٤٨) أخرجه: البخاري (١٣٤٤)، ومسلم (٢٢٩٧،٢٢٩٦) واللفظ له.

(١١٤٩) أخرجه: أحمد (١٥٠٢٥) وقال محققه الارناؤوط:إسناده حسن، والحاكم (٧٦/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٥/٣).

(١١٥٠) أخرجه: البخاري (التاريخ الكبير) (٧٨/٢/١)، وابن عساكر (التاريخ) (٣٧٧/٣)، والبزار (٣٨٥/٢) (١٩١٠)، وحسن إسناده الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٤٩).

وە تائەوێ دەبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَجَلْ وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ أَوْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ أَنْ يَرِدُهُ قَوْمَكِ)) واتە: بەڵێ خزمانی تۆ خۆشەویست ترین کەسانن لای من کە بێن ولێی بخۆنەوە.

خەولە رضي الله عنها دەڵێت: خواردنێکم لە لەگەنێکدا (یاخود قاپێکدا) لێ نزیك کردەوە کە دەستی بۆ برد گەرمای خواردنەکە گەیشت بەدەستی و سوتاو فەرمووی: ((ئاە)) پاشان فەرمووی: ((ابْنُ آدَمَ إِنَّ أَصَابَهُ بردٌ قَالَ: حَسٌّ وَإِنَّ أَصَابَهُ حرٌ قَالَ: حَسٌّ))(١١٥١) واتە: ئادەمیزاد گەر گەرمی بەرکەوێت دەڵێت: ئاە، وە ئەگەر ساردیشی بەرکەوێت هەر دەڵێت ئاە.

---

(١١٥١) أخرجه:الطبراني (الكبير) (٥٨٩/٢٤)، وابن ابي عاصم (السنة) (٧٠٥)، وقال الشيخ الالباني في تحقيقه(ظلال الجنة) (٧٠٥): إسناده صحيح على شرط الشيخين.واللفظ للطبراني.

# ناوەڕۆک